بیرەوەری

# ئەو کاروانەی



## بۆ هەواری ئێمە نەچوو



دەربارەی چەند ئەڵقەیەکی نادیار لە مێژووی
ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک

سالار ڕەشید

# ئەو کاروانەی
# بۆ هەواری ئێمە نەچوو

## دەربارەی چەند ئەڵقەیەکی نادیار لە مێژووی
## ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک

# ئەو کاروانەی
# بۆ هەواری ئێمە نەچوو

ناوی نووسەر: سالار ڕەشید

بابەت: بیرەوەری

دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەمەد

بەرگ: سەڵاح فەتحوڵا

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٢٠

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

چاپ: چاپخانەی تاران

بیرەوەری

# ئەو کاروانەی
# بۆ هەواری ئێمە نەچوو

## دەربارەی چەند ئەڵقەیەکی نادیار لە مێژووی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک

سالار ڕەشید

٢٠٢٠

## پێڕستی بابەتەکان

# وتەیەك

لەڕاستیدا دەمێک ساڵە لە فکری ئەوەدام، ئەوەندەی چاوی خەیاڵ بڕ ئەکات، بەشێک لەو ڕووداو و یادەوەرییانەی ژیان ئیدی بخەمە سەر کاغەز و وەک چمکێک لە مێژووی نەوەیەکی یاخی، لە فەوتان ڕزگاری بکەم. بێگومان ڕۆژگار گەلێک لەوانەی شۆردووەتەوە، یان لە تاریکی و لێڵی خستوون، بەڵام هەر چەندێکیشی قوتار بکەین هەر زەرەر نییە.

ئەزانم درەنگ تەواو بووم و درەنگ کەوتووم، وەلێ بۆ منێک فرسەت لە پشووی کارەکەم بهێنم و تەماح لە سەعاتە خەوی ڕۆژانەی خۆم بکەم، تاوەکوو چەند دێڕێک بخەمە توێی کەشکۆڵێکەوە، هەر مەمنوونم.

ئەگەرچی گەلێک بیرەوەری هەن بە ناچاری بە تەنها لە کن تۆیە وهەر تۆ دەبێت دەمی هەمبانەی لێ بکەیتەوە، وەلێ گەلێکی دیکەی بیرەوەریش هەن، هیی دووان وە یان چەندانە. من هەر لە سەرەتاوە ئەوەم لەپێش خۆم دانابوو، ئەم نووسینە ئەرکی ئەوەیە، بیرەوەرییەکانی خۆم بە تەنها لە خۆ نەگرێت. هەر بۆیە بە جیا لەوەی دەیان هاوڕێ و دۆستم بۆ ئەم بیرەوەرییانە دواندووە، جێگایەکی تایبەتی و سەربەخۆشم لە پاشکۆی ئەم پەڕاوەدا بۆیان تەرخان کردووە، چونکە هێندێک بیرەوەری هەن، هەر کەسە خۆی لە کەسێکی دی چێتری لێ دەزانێت، وە یان هەر یەکە لە گۆشەی خۆیەوە لێی دەڕوانێت و هەر کەسە دیوێکی دەبینێت.

ئەوا ئێستا لەپاش چوار ساڵ دوا دێڕەکانی ئەم بیرەوەرییانەمان بە کۆتا گەیاند و خۆشم بە وێنەی خوێنەرێک دەورێکم کردەوە. هەستم کرد لە لایەکەوە گەلێک دەرس و ئەزموونی گرنگ و پڕ بایەخی لەپشت سەر ناوە، لە لایەکی دیکەوە باجی ئەوانە و ژمارەی قوربانییەکانیشی بارتەقای کێوێک دەبن.

گەورەترین ئەزموون و ئەنجامگیری من لە دەورکردنەوەی ئەم بیرەوەرییانەدا ئەوەیە: ئینسان بە سرووشتی خۆی ئازادی و یەکسانی دەوێ، وەلێ بەشێکی زۆری ئەوان ئەو ئازادییەیان لێ زەوت کراوە و نایەکسانییان بەسەردا سەپێنراوە، هەر بۆیە لەو ڕۆژەوە کاروانی خەباتی ئەوان لەو پێناوەدا بەڕێ کەوتووە.

هەر کاتێکیش ئەو کاروانەی ئەوان بە ئاقارێکی دیکەدا بردرابێت و فیداکاری و قوربانییەکانیان زەوت کرابێت، ئەوا با بۆ دەورەیەکیش زەبری خۆی وەشاندبێت و مودەتێک تۆوی نائومێدی چاندبێت، وەلێ ئەوان سەرلەنوێ تێ هەڵدەچنەوە و ڕێگا دەگرنەوە بەر.

هەر بۆیە گرنگترین خاڵێک لێرەدا ئەوەیە، خەڵکی چەوساوە و بێبەش لەو نێوەدا چ میکانیزمێک بگرنە بەر، تاوەکوو خەبات و ڕەنج و قوربانییەکانیان بە تاڵان نەبرێن و بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان پێچ و دەورەی زۆر نەکەن و ئیدارەیەک بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بەرپا بکەن کە خۆیان حاکمی خۆیان بن و هیچ کەس و دەستگا و دامەزراوەیەک لە بانسەری ئەوانەوە و لەبری ئەوان حوکم نەکات.

ماوەتەوە ئەوە بڵێم، ئەو ڕووداو و هەڵوێست و بەرخورد و ململانێیانەی من لێرەدا باسم کردوون، بە باش و خراپییەوە ئێمە خاوەنین و بەشێکە لە مێژوو و ناسنامەی ئێمە. بەداخێکی زۆرەوە کاروانی ئێمە بەو شوێنە نەگەیشت کە ئێمە گەرەکمان بوو، شەڕی ئێمەش لەو ڕۆژگارەدا هەر بۆ بەرگرتن بەو ئاکامە بوو کە خەڵکی بەدوور لە ویست و ئیرادەی خۆی ئێستا تێی کەوتووە.


سالار ڕەشید

(سالح عەزیز ڕەشید)

سویسرا

s.rasheed60@hotmail.com


٢٠٢٠/٢/١٦

# ئاوڕدانەوەیەکی خێرا لە ڕابردوو

دوای ئەوەی سێ ساڵی خوێندنم لە ناوەندیی کاوە تەواو کرد، چوومە سانەویی ئیمام قاسم. ئەو سێ ساڵەی خوێندنم لە ناوەندیی کاوە، ئەکاتە ساڵەکانی ١٩٧٣-١٩٧٥.

ناوەندیی کاوە لە شاری کەرکووک کەوتبووە دامێنی گەڕەکی ئازادی و ئیسکانی تازە و دەیرواننیە سەر باروتخانە و ڕێگای سلێمانی. ئەم خوێندنگایە ناوەندی بوو بە تەنها، واتە تەنها سێ پلەی خوێندنی تێدا هەبوو، بۆیە بۆ پلەکانی دی خوێندن دەبوو بۆ خوێندنگایەکی دیکە بچووینایە، ئەویش سانەویی ئیمام قاسم بوو کە هەر خۆیان بۆیان دەستنیشان کردبووین و ئیشوکاری گواستنەوەکەش هەر خۆیان ڕێکیان خستبوو.

ئەم سێ ساڵە پڕ بوو لە تێکەولێکە و جەنجاڵی، پڕ بوو لە ڕووداوی گەورە و ئاڵوگۆڕی گورج و خێرا و نائارامی. هەر ئەوەی کە لە قۆناغی سەرەتاییی خوێندنەوە چووبوومە ناوەندی، خۆی بۆخۆی ئاڵوگۆڕێکی گەورە بوو لە ژیانی من و باقی خوێندکاران. چونکە ئیتر ئەو خوێندنگا و ئەو خوێندکار و مامۆستایانەی کە چەندین ساڵە پێکەوەن و پێیان ئاشنای جێ دەهێڵیت و دەکەویتە نێو کۆمەڵێک خەڵکی دیکەوە کە زۆربەیان ناناسی و لە خوێندنگا سەرەتاییە جۆراوجۆرەکانەوە هاتوون و بە کۆمەڵێک مامۆستا ئاشنا دەبیت کە پێشتر نەیانتناسیوە و پێیان ئاشنا نیت. ئیدی هەتا بەم شتە نوێیانە ئاشنا دەبیت، لەگەڵیان ڕادێیت و شوێن و جێی خۆت دەناسی، ماوەیەک لە نائارامی و ناهاوسەنیگی ئەبێ تەی کەیت. دێتەوە بیرم، مامۆستای وانەی مێژوومان مامۆستا سەرتیپ بوو، هاتە پۆلەوە و کۆمەڵێک وەرەقەی بەدەستەوە بوو، ئەنجامی تاقیکردنەوەی مانگی یەکەمی هێنابووەوە و پێش هەر شتێک وتی، ساڵح عەزیز کێیە؟ من دەستم هەڵبڕی و وتم: بەڵێ مامۆستا منم! بە ڕێز و چاوی لێڕازیبوونەوە وەرەقەکەی خۆمی پێ دام، بینیم هەشتا لە سەدم وەرگرتووە. ئەوە نمرەی یەکەم بوو لە پۆلەکەدا و بۆ وانەی مێژوو و لە دەستی مامۆستا سەرتیپ ئەوە زۆر بوو. واتە: تا ئەو دەمە هێشتا مامۆستا

خوێندکارانی بەنێو نەدەناسی. ئەو ساڵە لە چوار وانە عەفوو بووم و یەکێک بووم لە خوێندکارە هەرە باشەکان.

من کاتێک کە لە دایک بووم، دایکم ناوی "سالار"ی لێم نا، کاتێک کە نزیکی چوونە مەکتەبم بوو، باوکم لە جنسی ناوەکەمی کردووە بە ساڵح، بۆ ئەوەی منداڵێکی ساڵح دەرچم! هەر لە سەرەتای چوونە مەکتەبم بوو، ڕۆژێکیان بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان کە کابرایەکی کورتەڵەی ئەستووری گرژ و مۆن بوو، هاتە پۆلەوە و ناومانی خوێندەوە. ناوی منی خوێندەوە، وەلێ من هیچ وەڵامم نەدایەوە، چونکە من هێشتا بەو ناوەی خۆم ئاشنا نەبووم! هاتە لامەوە و وتی: تۆ ناوت چییە؟ وتم: سالار، زلەیەکی لە بناگوێم سرەواند و بەتووڕەیییەوە گوتی: بڕۆ بانگی باوکت بکە!

من لە سەرەتادا و هەتا پۆلی سێی سەرەتاییشم تەواو کرد کە خوێندن بە زمانی عەرەبی بوو، خوێندکارێکی خراپ بووم و هەر ئەوەندە بوو ناجیح ئەبووم، بەڵام لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی خراپتر بووم و پەکم کەوت و دەرنەچووم (لێرە لەم وڵاتانەی ئەورووپا ناڵێن: دەرنەچوو، یان ڕاسب بوو، بەڵکوو دەڵێن: ئەو پۆلەی دووبارە کردەوە). بەڵام بۆ خۆشبەختیی من، ئەو ساڵە بەرنامەکانی خوێندن بوونە کوردی کە بەتەواوەتی دڵ و دەروونمی فێنک کردەوە و ئەو مۆتەکەیەی ئەو چوار ساڵەی خوێندنی عەرەبی لەسەر سینگم ڕەواندەوە. ئیتر لەوە بەدوا بوومە کەسێکی دیکە و تەنانەت کە لە بەکەلۆری پۆلی شەشەمی سەرەتاییی قوتابخانەکەی ئێمە بەسەر کەرکووکدا یەکەم بوو، من لەسەر ئاستی قوتابخانەکەمان دووەم بووم. دوو خوێندکاریش لەیەک کاتدا یەکەم بوون، یەکێکیان ئازاد محەمەد، کوڕی مامۆستا محەمەدی جێگری بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان کە لە هەمان کاتدا مامۆستای وانەی ئینگلیزیشمان بوو. دووەمیان نەوزاد محەمەد ساڵح، برازای مامۆستا قادر. مامۆستا قادر کە دواتر لە کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان پێکەوە کارمان کرد و پاشان گیرا و ئیعدام کرا.

کەواتە بەیانی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ هیچ چاکەیەکی بۆ من نەبووبێ، ئەو چاکەیەی بووە کە خوێندنی کردە کوردی. ئاخر زەوق و میزاجی من بەهیچ جۆرێک

لەگەڵ: دار، دور، دود ... داران، نور ... رباب، بدری ... بوق، بریق، قمر ... مرزوق بزاز، قدوری براد ... وێک نەدەهاتنەوە. دەروونی من بە: دارا دوو داری دی ... دۆی دادە ئاوی زۆرە ... مێوژی نایاب، مام زۆراب ... مام ورچ و ئەو جلوبەرگانەی لەبەری دادە و مام زۆرابدا بوون و ئەو وێنە ڕەنگاوڕەنگانەی لە دووتوێی کتێبەکەدا بوون پاراو دەبوون! بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم، ئەو گۆڕانە بووە هۆی ئەوەی لە وانەی عەرەبیش باش بم و تەنانەت دێتەوە بیرم، کاتێک پۆلی پێنجەمی سەرەتاییم تەواو کرد، باوکم خستمییە لای مەلا و زۆر سەرکەوتوو بووم.

مامۆستاکەم ناوی مەلا نیهاد بوو، دوو فەقێی دیکەیشی هەبوو، ئەوانیش جەمالی حاجی ئەحمەد و جەمالی مەلا عەلی بوون. لە سەرەتادا هەر چوار جزم (جزء)ەکانی عەمـمە، تەبارەک، قەد سەمیع و وەزارییاتم خوێند کە بە ناميلكەی بچووک و سەربەخۆ هەبوون. دوای ئەوە بۆ جزمەکانی دی دەبوو قورئان بکڕم، کە هەر ٣٠ جزمەکەی لە دووتوێی پەرتووکێکدا بوون. بۆیە لەگەڵ مامۆستاکەم پێکەوە بۆ کتێبخانەی محەمەد ئەمین عەسری ڕۆیشتین. لە یادگارەوە بۆ بازاڕ حەسیرەکە، دوکانەکەی حەسیب خەیات، حەمامی ئەتڵەس، فافۆنفرۆشەکان، قازانپاکەرەکان، مزگەوتی نەعمان، ئاسنگەرەکان، مزگەوتی منارە نەخشینە و موتابچییەکان، قەیسەری و دوکانی سەڕاجیی حەسیب قادر سەڕاج،[1] ئەوجا کتێبخانەکەمان بە دەستی ڕاست دەهاتە پێش و تۆزێک ئەولاتر و بە دەستی چەپدا قالیبازاڕ یان بازاڕ عەرەبەکان بوو.

بەڵێ! ئیتر لەو کتێبخانەیەدا قورئانێکمان کڕی، دیارە هەر ئەو کاتە مامۆستاکەم فێری کردم کە نابێت بڵێم قورئانێکم کڕی، بەڵکوو دەبێت بڵێم، قورئانێکم هەدیيە کرد (کرا)، چونکە بە قورئانەوە کڕین و فرۆشتن گوناهە! دیارە ئێمە بە پارە کڕیمان و لەباری عەمەلییەوە هیچ پەرتووکخانەیەک بە خۆڕایی و بە هەدیيە بە کەسی نەئەدا و پێویست بە درۆ ناکات.

---

١. ئەم دوکانە یەکێکە لە ناودارترین سەڕاجییەکانی شاری کەرکووک و عێراق کە لە ساڵی (١٩٣٤)ەوە دانراوە. لەم دوکانەدا جۆرەها کیفی دەمانچە، تفەنگ و فیشەکلغ بە جوانترین و چاکترین شێوە دروست دەکرێن. ئەوەی شایانی باسە، پیشەسازیی پێستە یەکێکە لە کۆنترین ئەو پیشانەی کە سەدان ساڵە شاری کەرکووک ناوبانگی پێ دەرکردووە.

ئەم کتێبخـانەیە کتێبـی دیکەیشـی هەبـوو، وەکـوو: ڕۆسـتەم و زۆراب، ئەمیـر ئەرسـەلان، لەیلـێ و مەجنـوون، شـیرین و فەرهـاد، یوسـف و زولێخـا، چەڵتـووتی، قەڵای خەیبەر، مەولوودنامە، مەلای مەزبووره، دیوانی شیعری نالی، مەحوی، سالم، ئەحمەد بەگی ساحێب قڕان، ئەحمەد بەگی جاف، تاهیر بەگی جاف ...

چاپی ئەم کتێبانە گەلێک ناشیرین و نارێک بوون. لە ڕووی ڕێنووسیشەوە هەر گەلێک سـەقەت بـوون. لە کـاتی خوێندنەوەدا تەواو لێیـان بێـزار و وەڕس دەبـووی. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانە، ئەم کتێبخانەیە بۆ کەرکووک زۆر گرنگ بوو، چونکە ئەم کتێبخـانەیە لە سـەردەمی پاشـایەتییەوە هەبـووە و بەو هـۆیەوە گەلێـک کەس فێـری خوێنـدن و نووسـینی زمـانی کـوردی بـوونە کە لەو دەورانەدا قوتابخـانەی کوردی لەم شارەدا نەبووە.

خاوەنی ئەم کتێبخانەیە چاپخانەیەکیشی هەبوو، ئەم کتێبانەی هەر لەوێدا چاپ دەکرد. لەسەر هەر کتێبێکیش دەینووسی: ئەم کتێبە لەسەر نەفەقەی مـحەمەد ئەمین عەسری چاپ کراوە و حەقی لە چاپدانەوەی بۆ خاوەنەکەی مەحفووزە.

ئیتر جێ و شوێنی ئەو کتێبخانەیەم زانی و گەلێک جاران بۆ کتێبکڕین سەردانیم دەکـرد، لە کتێبەکـان ورد دەبـوومەوە، هەڵگێـڕ و داگێـڕم دەکـردن و شـتێکم بەدڵ بووایە دەمکڕی.

بە هەر حـاڵ قورئـانم کـڕی و بەرگ و نەخـش و چـاپەکەی گەلێـک سـەرنجیان ڕاکێشـام و گەلێـک جـوان و قەشـەنگ بـوون. دواتـریش دایکـم بە قوماشـێکی سـەوز بەرگێکی بۆ دروست کرد.

ئیـدی چـوومە سـەر خوێنـدنی بەشـەکانی دیـکەی و لەنێـو دوو مانگـدا هەر ٣٠ جزمەی قورئانم خەتم کرد، چونکە ئەگەر مامۆستا هەر ڕۆژەی بیست لاپەڕەیەکی پێم بـدایە، ئەوا خۆشـم لە مـاڵەوە بە شۆڕوشـەوقەوە بیسـت لاپەڕەی دیـکەم لـێ دەخوێنـــدەوە. هەر لەو دەمەوە ئیـــدی دەســـتم بە نـــوێژکردن و ڕۆژووگـــرتن و دەورکردنەوەی قورئان و هاموشۆی مزگەوت کرد.

ئەبێ ئەوەش لەیاد نەکەم، کۆمەڵێک مامۆستای چاک و خەمخۆریش، بە تـایبەتی لە ســـەردەمی پـــۆلی پێـــنجەم و شەشـــەمدا، ئەوەنـــدەی دی هەوای خوێنـــدن و

فێربوونیـان سـازگار کردبـوو. ڕەنـگە ئەوانـیش مەسـتی ئەو ئـاڵوگۆڕە بـووبن کە بەسـەر بەرنـامەی خوێندنـدا هـاتبوو! خۆ بەڕێـوەبەری قوتابخانەکەشمان، مامۆسـتا مەحموود، باوکی کاوە مەحموود کە ئێستا سکرتێری حیزبی شیووعیی کوردستانە، هەتا بڵێی مرۆڤێکی جددی و پاک و سەنگین بوو.

لەنێـو ئەو مامۆسـتایانەدا، بـێجگە لە فێرکردنـی زانیـاری و زانسـت، دوو دانە مامۆسـتا لە کایەکـانی دیـکەی ژیـان کـاریگەریی گەورەیـان بەسـەر منەوە هەبـوو، ئەوانیش مامۆسـتای زمـانی کـوردی، ئیسـماعیل ڕۆژبەیـانی و مامۆسـتای مێـژوو و جوگرافیا، سەلاح مام عەباس بوون.

مامۆستا ئیسماعیل[2] بۆخۆی شاعیر و چیرۆکنووس بوو، جارجارە لە پۆل و لە وانەی کوردیـدا شـیعرەکانی خۆیشـی بۆمـان دەخوێنـدەوە. هەروەهـا گرنگـی بە پەخشـان ئەدا و داوای لـێ ئەکـردین، هەسـتین پەخشـانەکانمان بە دەنگـی بەرز بخوێنینەوە. پاشـان سـەرنجەکانی خۆی پێمـان ئەدا و هەڵە و کەموکوڕییەکانی بۆ ڕاست ئەکردینەوە، ئەمە جگە لەوەی هانی ئەداین، کتێب بخوێنینەوە.

لەو بـوارەدا دوو هـاوڕێی پۆل دەرکەوتبـوون، ئەوانـیش سـەلاحەدین ئیسـماعیل مـحەمەد جەبـاری (سـەلاح ڕەنجـدەر) و مـحەمەد عەزیـز (مـحەمەد کوردسـتانی کە بـاوکی بە عەزیـز نەوتفرۆش دەناسـرا) بـوون. ئەم دوو قوتـابییە خۆیـان بە شـاعیر دەزانـی و هەر کاتێـک شـیعرێکی نوێیـان بنووسـیبایە، لە پـۆل دەیانخوێنـدەوە و مامۆستاش سەرنجی خۆی لەسـەریان ئەدا. ئەمـانە بۆ ئێمە وەک کۆڕی ئەدەبی وا بوون و کاریگەریی گەورەیان بەسەرمانەوە هەبوو.

قوتابخانەکەمان، قوتابخانەی سەرەتایی نالی بوو کە پێشتر و پێش ساڵی ١٩٧٠ نـاوی ئیمـان بـوو، کەوتبـووە نێـو گەڕەکـی عاشـوور و پشـتی بە گۆڕسـتانی شـێخ محێدینەوە دابوو. ئەم قوتابخانەیە کتێبخانەیەکی خنجیلانەی هەبوو، هەر بە تەنیشت ژووری بەڕێوەبەرەوە. ئەوانەی ئارەزووی خوێندنەوەیان هەبووایە کە پێی دەوترا،

---

٢. مامۆستا ئیسماعیل ڕۆژبەیانی لە ڕێکەوتی ٢٠٠٢/٣/٢٩دا بەهۆی نەشتەرگەرییەکی هەڵەوە کە بۆ برینی گەدە بۆی ئەنجام دەدرێت، کۆچی دوایی کرد.

موتـــاڵەعەی خـــارجی، ئەچـــوون لەو کتێبخـــانەیە کتێبیـــان وەردەگـــرت و پـــاش خوێندنەوەی دەیانگەڕاندەوە.

مـن کتێبم زۆر خـۆش دەویسـت و زۆر ئـارەزووی خوێنـدنەوەم دەکـرد. کتێـب لەسـەر مێـژووی کـورد، شـیعر، چیـرۆک و بەسـەرهاتم دەخوێنـدەوە. یەکێـک لەو کتێبانەی دێتەوە بیرم، کتێبێک بـوو بە نێوی شـانۆی نـاو مـاڵ، ئەم کتێبە کۆمەڵێک چیرۆکـی لە خـۆ گرتبـوو. هەر ئەو دەمە بـوو، لەگەڵ چەنـد هاوڕێیەکـدا ویسـتمان یەکێک لە چیرۆکەکانی نێو ئەو کتێبە بکەینە تەمسیلی. بۆ ئەو مەبەستە لە گەڕەک دەرچووین و بۆ چۆڵەوانییەک چووین، پێیان دەگوت، حەمە شنە کە دەکەوتە لای ژووروووی گەڕەکـی یادگـار و نزیـک گـردەکەی ئـازادی. ڕۆڵەکانمـان دابەش کـرد و پرۆڤەمان لەسەری کرد و ڕیکۆردەرێکیشمان لەگەڵ خۆمان بردبوو، تۆمارمان کرد.

یەکێکـی تـر لەو کتێبـانە کە گەلێـک سـەرنجڕاکێش بـوو، کتێبێـک بـوو بە نێـوی "جەنگاوەرێکی ڤێتنامی" کە محەمەدی مەلا کەریـم کردبووی بە کوردی. کاریگەریی ئەو کتێبە چونکە بەسەرمەوە زۆر بوو، ئەوا ئێستا و لەدوای ٤٧ ساڵ هەندێک باس و ڕووداویـم هەر لە یـادە. کـاتی خـۆی ڤێتنـام لەلایەن ئەمەریکـاوە داگیـر کرابـوو، خەڵکی ڤێتنـام بەرخـۆدانێکی بێوێنەیـان بـۆ ڕزگـاریی وڵاتەکەیـان کـرد و زیـاتر لە ملیۆنێک ئینسان بوونە قوربانی. جا ئەم کتێبە باسـی خەبـاتی یەکێک لەو قارەمانانە بە ناوی نیۆن ڤان ترۆی ئەکات کە چۆن دەیەوێت بۆمبێک لەژێر پردێکدا بچێنێت، تـاوەکوو ئەو کـاتەی مەکنەمـارا، حـاکمی ئەمەریکـا لەو عەیـامەدا بەسـەریدا تێپەڕی، بیتەقێنێـتەوە و لەنێـوی بەرێـت. وەلـی دەگیـرێ و زینـدانی دەکـرێ، ڕا دەکـات و دەگیرێتەوە ... ئێسـتاش لەبیرمە، لە کاتی لێکۆڵینەوەدا لێی دەپرسـن: بۆمبەکانـت لە کوێن؟ ئەویـش لە وەڵامـدا دەڵێـت: لە هەر جێگـایەک دۆلار هەبێـت، بـۆمبیش لەوێ هەیە!

ئیـدی خـۆمیش کەوتـمە گەڕان بەدووی کتێبـدا و لەو تەمەنەدا و لە گەڕەکـی یادگارەوە بۆ سەنتەری شار و بۆ شەقامی جمهووری کە کتێبخانەکانی کەرکووکی لـێ بـوو، دەچـووم و تەماشـای کتێـبم دەکـرد و ئەوەی بەدڵـم بـووایە دەمکـڕی.

دواتریش کە گەورە بووم، بۆ شارەکانی سلێمانی، بەغدا و مووسڵ ئەچووم و هەر جارەی کۆڵێک کتێبم ئەهێنایەوە و هەتا ئێستاش ئەو عەشقە هەر بەردەوامە.

مامۆستاکەی تر واتە، مامۆستا سەلاح وانەی مێژوو و جوگرافیای پێ دەوتینەوە و زۆر بەجوانی بابەتەکانی ڕوون دەکردەوە. ڕەنگە هەر بە هۆی ئەوەوە بووبێت کە من زۆر حەزم بە جوگرافیا بوو و ساڵ نەبوو لێی عەفوو نەبم. دێتەوە یادم، لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی نەخشەی عێراق و نیشتمانی عەرەبیم لەسەر کاغەزێک کێشا و پاشان بە هۆی کاربۆنەوە بۆ سەر دوو پارچە مەعاکس گواستمەوە، ئینجا بە موشارێکی بچکۆلەی دانورد بەسەر سنوورەکانیاندا ڕۆیشتم. پاشان هێنایانم بە کەتیرە لەسەر دوو پارچە مەعاکسی لاکێشەیی چەسپم کردن. بەو جۆرە دوو نەخشەی قشت و ڕێک دەرچوون.

ماڵی مامۆستا سەلاح لەپشت ماڵی ئێمەوە بوو، ماڵی باوکیشی هاوسێمان بوو و یەک دیوارمان بەین بوو. ئەم خێزانە، خێزانێکی خوێندەوار و خاوەن وەزیفە و مەدەنی بوون. مامۆستا سەلاح هونەرمەند بوو، مووزیکژەن بوو، ئامێری ئۆکۆردیۆنی لێ دەدا و لەگەڵ تیپی مۆسیقای سۆلاف بوو. ئەو ساڵانەی کە هاتوومەتە باسی، دەکاتە ساڵەکانی خوێندنی (١٩٧١-١٩٧٢)، (١٩٧٢-١٩٧٣) کە من ئەو دەمە پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی بووم.

ئەو ساڵانە بۆ خەڵکی کوردستان ساڵانێکی خۆش و پڕ لە شادی بوون. دەکەوتنە نێو ئاگربەستی دوای بەیانی ١١ی ئازاری ساڵی (١٩٧٠)ەوە. چوار ساڵی ئارام و بێ شەڕوشۆڕ، چوار ساڵی پڕ لە ئاهەنگ و گەشتوگوزار، چوار ساڵی پڕ لە چالاکیی ئەدەبی و هونەری، چوار ساڵی پڕ لە کۆڕ و سیمینار و پڕ لە چاپەمەنیی کوردی.

پێش ئەوەی بێمە سەر چالاکیی هونەریی مامۆستا سەلاح و بەشداریی ئێمە لەو چالاکیانەدا، ئەبێ باسی چالاکییەکی سەرەتاییتریش بکەم.

ئێمە پۆلی چوارەمی سەرەتایی بووین، ساڵی یەکەمی خوێندنی کوردی بوو، مامۆستا قادر مەردانی هونەرمەند[٣] هات بۆ قوتابخانە و پۆلەکەمان و ماوەیەک

---

٣. مامۆستا قادر مەردان لە ڕێکەوتی ٢٠١٤/٦/٩ کۆچی دوایی کرد.

پرۆڤەی سروودی "کەو"ی پێمان کرد، بەو نیازەی بۆ تەلەفزیۆنی کەرکووکمان ببات و لەوێ بۆمــان تۆمــار بــکەن، بەڵام دوایــی نــازانم لەبەرچــی لەســەری بەردەوام نەبووین و بە ئەنجام نەگەییشت! قادر مەردان خـۆی گـۆرانیبێژ بـوو، بە گـۆرانی "بێئومێدی"[٤] ناوی دەرکردبوو و ئامێری کەمانچەشی دەژەنی.

هەر وەکوو وتم، مامۆستا سەڵاح ئەندامی تیپی مۆسیقای سۆلاف بوو. من پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم، مامۆستا سەڵاح دەنگی کۆمەڵێک قوتابی تاقی کردەوە، بۆ ئەوەی کۆرسـێکی بـۆ گـۆرانی و سـروود لـێ هەڵبژێـرێ و لە چالاکیەکـانی تیپـی مۆسیقای سۆلاف بەشدارییان پێ بکات. سـەرەنجام شـەش کەسی جیا کردەوە کە مــن یەکێــک بــووم لەوانە. ئەوەنــدەی بێــتەوە بیــرم، نــوورەدین ســاڵح حوســێن (باوەنوور)، فوئاد جەماڵ باخەوان، ئەحمەد مەحموود ...یان تێدا بوو.

لە قوتابخـانەیەکی سـەرەتایی کچـانیش لە گەڕەکـی ڕەحیمـاوا، کۆمەڵێک کچیـان هەڵبژاردبوو کە پێکەوە کۆرسێکی ڕێکوپێکی تەواوی پێک دەهێنا. بەو جۆرە ئێمە بـووینە کۆرسـی گـۆرانی و سـروودی ئەو تیپە و بەشـداریی گشـت ئەو ئاهەنـگ و بۆنانەمـان دەکرد کە ئەو تیـپە لەنـاو شـاری کەرکـووک و دەوروپشـتیدا بەشـداری تێیاندا بکردایە.

ئەوەندەی من بێتەوە بیرم، تیپی مۆسیقای سۆلاف ئەم هونەرمەندانەی تێدا بـوو: شـەوکەت ڕەشـید (کلارنێت)، مامۆسـتا سـەڵاح عەبـاس (ئۆکۆردیۆن)، مامۆستا ڕەزا (کەمــان)، عەبــدول ئــیلاە (کەمــان)، عەبــاس مــحەمەد (گــۆرانیبێژ)، عەلــی عەزیــز (گۆرانیبێژ) ...

هەر وەکـوو باسـم کـرد، ئەو دەمە کەوتبـووە نێـو چـوار سـاڵی ئاگربەسـت و دانوسـتانی نێـوان پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و حکـوومەتی بەعـس، ئاهەنـگ و بۆنەی زۆری تێدا بوو کە ئێمە بەشداریمان تێیانـدا دەکرد. ئەوەی من بێتەوە بیـرم، بەشداریمان لە ئاهەنگێکدا کرد کە لە قوتابخانەی سەرەتایی سـەڵاحەدین لە گەڕەکـی شۆڕیجە ساز کرابوو، پێم وابێ، لە ساڵی ١٩٧١دا بوو. هەر لەوێدا کۆمەڵی هـونەر و

---

٤. مستەفا زەنگەنە، مامۆستای زمان و ئەدەبی کوردی لە ئامادەیی شۆڕیجە، شیعری ئەو گۆرانییەی نووسی بوو.

ویژەی کوردیی لقی کەرکووک شانۆگەریی "بەهاری دزراو"ی پێشکەش کرد کە لە سیناریۆی سەلمان فایەق کاکەیی و دەرهێنانی حوسێن نەسراوی بوو، "جیهاد دڵپاک"یش ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەبینی.

لە "سانەویی ئیمام قاسم"یش بەشداریمان لە ئاهەنگێکدا کرد، بە هەمان شێوەی ئەوەی قوتابخانەی سەرەتایی شۆڕیجە بوو. هەروەها لە ئاهەنگێکی ئێجگار گەورەدا بەشداریمان کرد کە لە شارۆچکەی چەمچەماڵ و بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە ساز کرابوو کە پێم وابێ لە ساڵی ١٩٧٣دا بوو.

ئەم ئاهەنگە وەکوو دوو ئاهەنگەکەی تر نەبوو، لە هۆڵی قوتابخانەکان بەڕێوە ببرێت و بە بلیت بێت، بەڵکوو لە دەشتاییەک بەڕێوە برا و کراوە و جەماوەری بوو. لەم ئاهەنگەدا شانۆگەریی کاوەی ئاسنگەر و گۆرانی شیرین بەهارە پێشکەش کران. ئەم گۆرانییە لەلایەن کوڕێکی گەنجەوە پێشکەش کرا، تەمەنی خۆی لە ١٦-١٧ساڵان دەدا. دێتەوە بیرم، ئێمە هەموو تیپەکە بە مۆزیکژەن و گۆرانیبێژ و کۆرسەوە، بە کچان کوڕانەوە هەر هەموو خۆمان پەستانە نێو پاسێکی ١٨ نەفەری و لە کەرکووکەوە بۆ چەمچەماڵ ڕۆییشتین. کاتێک کە گەڕاینەوە، دنیا تاریک داهاتبوو، دایک و باوکم بە قەلەقی لە چاوەڕوانیدا بوون.

ئێمە کۆرسی گۆرانییەکان بووین و سروودیشمان دەوتەوە. لەنێو ئەوانەدا و ئەوەی بێتەوە یادم، سروودی:

ئێمە پارتین، ئێمە پارتین، ئێمە خاوەن باوەڕین
بۆ نەوەی کورد، بۆ نەوەی کورد ڕابەرین
شۆڕشێکی خوێناویمان شایەدە
چەند دلێر و نەبەرد و جەنگاوەرین

لە چەند ڕۆژی دوای ئاهەنگەکە، ڕۆژنامەی ئەلتەئاخی "التآخي"، بڵاوکراوەی پارتی دیموکراتی کوردستان بە زمانی عەرەبی هەواڵی ئاهەنگەکەی بڵاو کردەوە و وێنەی ئێمەیشی لەگەڵ دانابوو. کاتێک کە ئەو هەواڵەم بیست، یەکسەر چووم بۆ کتێبخانەی دارا دانەیەک لەو ڕۆژنامەیەم کڕی و گەلێک پێی دڵخۆش بووم.

ئەو کتێبخانەیە خاوەنەکەی ناوی دارا بوو، کەوتبووە سەر فلکەی قەڵا، کە سینەمای خەیام و "نادی سۆلافی"یشی لەسەر بوو. لە ساڵانی دواتر ئەو جێگایەی کە نادی سۆلافی لێ بوو، کرایە ئەمنی کەرامە، کە شوێنی ئەشکەنجە و مەرگی هەزاران لاوی شۆڕشگێڕی ئەو شارە بوو.

ئەوەی شایانی باسە، شەوکەت ڕەشید[5] پرۆڤەی پێمان دەکرد و لەسەر تەختەڕەشێک شیعری گۆرانی و سروودەکانی بۆ دەنووسینەوە و ئێمەش دەمانوتەوە و لە هەر جێگایەک نەشازییەک لە ئاوازەکەیدا هەبووایە، ڕامانی دەگرت و بۆی ڕاست دەکردینەوە و پێمانی دووبارە دەکردەوە، هەتا بەتەواوی بۆ ئاهەنگەکە ئامادە دەبووین. ئەو جێگایەش کە لێی کۆ دەبووینەوە و پرۆڤەمان تێیدا دەکرد، یانەی تیپی مۆسیقای سۆلاف بوو، کە دەکەوتە سەر شەقامی جمهووری لە نێوان سینەما سەلاحەدین و کەباب عەبدوڵای ئێستا. ئەو جێگایە دوای تێکچوونی مفاوەزات لە ساڵی ١٩٧٤ بووە بنکەی پارتی دیموکراتی کوردستان کە عەزیز عەقراوی سکرتێری بوو، ئێستاش کراوە بە باڵەخانە و "ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی دیالۆگ"ی تێدایە.

بەڵێ! کاتێک، پەردەی سەر سەکۆ لا ئەدرا، لە هۆڵەکان بە سەدان کەس و لە ئاهەنگی پێدەشتەکان بە هەزاران کەس بەدانیشتن و بەپێوە چاوەڕێی چالاکی ئێمە بوون. چاوەڕێ بوون تا بزانن چ سروود، گۆرانی، شانۆ و نوکتە و وتەیەکیان پێشکەش دەکرێت. ساتێک حەماس، ساتێک دڵتەنگی و فرمێسک، ساتێکیش ئارامی و پێکەنین و چەپڵە بوو.

لە ئاهەنگی هۆڵی سانەویی ئیمام قاسم بوو، پاش ئەوەی گۆرانییەکمان پێشکەش کرد، پەردەی شانۆ دادرایەوە و هەموو بەرەو دواوە بۆ هۆڵی پشتەوە و شوێنی پشوو و پرۆڤە و میکیاج گەڕاینەوە، شەوکەت ڕەشید تووڕە و پەست بوو، دەموچاوی خۆی تێکدا و شکڵێ ناشیرینی بە خۆی دا، لاسایی یەکێکی دەکردەوە کە

---

٥. شەوکەت ڕەشید عیزەت لە ساڵی ١٩٣٢ لە گەڕەکی مەڵکەندیی شاری سلێمانی لە دایک بووە. لە ساڵی ١٩٦٣ لەگەڵ کۆمەڵێک کەسی دیکە تیپی مۆسیقای سۆلاف لە شاری کەرکووک دادەمەزرێنێت. لە ڕێکەوتی ١٩٩١/٤/١٧ بە نەخۆشی کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی لە گۆڕستانی شێخ محێدینی شاری سلێمانی بە خاک دەسپێردرێت.

لە ڕیزەکانی پێشەوەی سەر کورسیی هۆڵەکە دانیشتبوو، ئەیوت، ئەو خەڵکە هەمووی چەپڵە لێ ئەدات، ئەویش وەک بت دانیشتووە و جووڵە ناکات!

شەوکەت ڕەشید کابرایەکی گاڵتەچی و دەم بە نوکتە بوو، جارێکیان باسی هونەرمەند ئەنوەر تاهیری کرد کە لە تیپی باواجیی کۆیە ئامێری قانوونی لێ ئەدا، جا وتی: لە ئاهەنگێکدا لەسەر شانۆ بووین، پارچەیەک مۆسیقامان پێشکەش کرد، دوای ئەوەی تەواو بووین، هەموو سەر شانۆمان چۆڵ کرد و بەرەو ژووری پشتەوە ڕۆیشتین، بەڵام ئەنوەر تاهیر نوقمی ئاواز و مۆسیقاکەی خۆی ببوو، ئاگای لە هەموو شت بڕابوو و لە قانوون لێدان هەر بەردەوام بوو. ئێمەش چی بکەین؟! ناچار چووین فەرشەکەی ژێریمان وردە وردە ڕاکێشا تا هێنامانە ئەمدیو پەردەوە. ئەوجا بە ئاگا هات و وتی: ئەوە کوو من هاتمە ئێرە؟ ئێمەش دەستمان کردە پێکەنین و وتمان: ئەوە فەرش ئەتووی هێنایە ئێرە!

دێتەوە بیرم، بۆ ئەوەی شەرم نەکەین، وە یان چاومان لە کەسێک گیر نەبێت و پێوەی مەشغووڵ نەبین، ئەیانگوت: لە کاتی وتنەوەی سروود و گۆرانی، بڕواننە گۆشە و سووچی هۆڵەکە!

ئەم چالاکییە هونەرییانە و تێکەڵی لەگەڵ موزیک و موزیکژەن، گۆرانی و گۆرانیبێژ، شانۆ و شانۆکار، لەگەڵ جۆرەها ئالەتگەلی مۆسیقی، ئاواز و مێلۆدی، خۆنواندن لەبەردەم سەدان و هەزاران کەس، گەڕان و بینینی ئەم گەڕەک و ئەو گەڕەک، ئەم شار و ئەو ناوچە، بۆ ئێمە منداڵانی (١١-١٣) ساڵان، منداڵانی بێبەش لە هەر چت، تاقیکردنەوە و ئەزموونێکی فرە گەورە بوو. بۆ ئەو دەم و دەورانە بۆ کەم منداڵ هەڵدەکەوت، لەلایەک بەو شتگەلە چاو و گوێی بکرێتەوە و زمانی بێتە گۆ، لەلایەکی دیش وەختێکی خۆش و بەکەیفی هەبێ و سەرگەرمییەکی بۆ ساز بێت.

بەو شێوەیە، لە لایەک کاریگەریی مامۆستای شاعیر و چیرۆکنووس ئیسماعیل ڕۆژبەیانی و لەلایەکی دی مامۆستای هونەرمەند و مووزیکژەن سەلاحی مام عەباس مۆری خۆیان بە زیندەگی و کەسایەتی منەوە نا.

ماموستاکانمان بۆ فێرکردنی ئێمە گەلێک بەهەوڵ بوون، بەڵام ئەوەی کە گەلێک خراپ بوو، لێدان و فەلاقەیان بەکار دەهێنا. دوو پۆلی یەکمان هەبوو، یەکێکیان ماموستا هاشم ماموستای بوو، قوتابی بە بەروپشت بە تەختەڕەشەکەدا هەڵدەواسی و دارکاری دەکرد. ئەوی دیکە ماموستا پیشۆ کە دیان بوو، ماموستای ئێمە بوو، نایەتە بیرم بەو جۆرە بووبێت.

لە پۆلی دووی سەرەتایی بووم، ئەبوو چەند جارێک وانەیەکی قیرائە بنووسمەوە، وا ڕێکەوت، باپیرم مەلا میوانمان بوو، داوام لێی کرد، وانەکەم بۆ بنووسێتەوە، ئەویش وتی: باشە بۆم بهێنە! واجبەکەی گشت بۆم تەواو کرد! کاتێک بۆ بەیانی ماموستا عوسمان لێمانی پرسییەوە و سەیری دەفتەرەکەی منی کرد، پرسیاری کرد و وتی، کێ ئەو دەرسەی بۆت نووسیوەتەوە؟ وتم: خۆم نووسیومەتەوە ماموستا. ئێ خۆ دیارە ئەوە دەستوخەتی من نییە، بەڵام من ئەوەم نەدەزانی، بۆیە ئەو وازی نەهێنا و منیش هەر نکۆڵیم لێی کرد. چەند پێنووسێکی خستە نێوانی پەنجەکانی دەستمەوە، پاشان نێولەپی گچکە و ناسکمی خستە نێو نێولەپی گەورە و بەهێزی خۆیەوە و دەستوپەنجەمی توند گوشی و ئەشکەنجەمی دا، ناوبەناو دەستی شل ئەکرد و دووبارە دەی گوشییەوە، تاوەکوو ناچارمی کرد، ڕاستییەکەی بڵێم! ئێ دەستوخەتی مەلا بە عالەم ئاشکرا دیارە!

باپیرم مەلا مەحموود باوکی دایکم، مەلای گوندی گوڵمکەوە لە ناوچەی شوانی سەرخاسە بوو، خەڵکی ڕێزیان لێ دەگرت و گەورەترین سوێندیان ئەوە بوو کە دەیانگوت: بە قورئانەکەی مەلا مەحموود.

جارێکیان چووم بۆ لادێ و لە ماڵی باپیرم بووم، ئێوارە بوو دنیا تاریک داهاتبوو، من لە تەنیشت باپیرم بووم، لە سەربان بەدیار چرایەکی کزەوە دانیشتبووین. ئافرەتێک کە خەنجەرێکی پێ بوو، بە هەڵەداوان هات و گوتی، ماموستا بەقوربانت بم، بەشکوو دوعایەکی دەمگورگبەستم بۆ بکەیت، ئەم ئێوارەیە ڕانەکەمان گەڕاوەتەوە و کاوڕێکمان بەجێ ماوە. باپیرم خەنجەرەکەی لێ وەرگرت و لە کێلان دەری هێنا، ئایەتێکی[6] بەسەردا خوێندەوە و خستییەوە جێی خۆی و

---

٦. سوورەتی "الشمس" بۆ بەستنی دەمی گورگ بەکار دەهێنرێت.

دایەوە دەستی. دوای دوعاکە ژنەکە ئارام بووەوە و هەستا ڕۆییشت. ئیتر نازانم بۆ بەیانی کاوڕەکەیان دۆزییەوە، یان نا! ئەگەر گورگ بیخواردایە، ئەوە ئەیانگوت: ئەوە درەنگ دوعاکەمان بۆ کردووە و فریای نەکەوتووە! ئەگەریش لە لاپاڵ و شیو و کۆندەرەیەکیشدا بیانـدۆزیبایەتەوە، ئەوە دەیانگوت: دوعـای مامۆسـتا کـاری کردووە و دەم و نەفەسی باشە و دەمی گورگانی بەستووە!

نەنکم "فاتم"یش سەیزادە و خاوەن سەرجەلە (شەجەرە) بوو. بۆ منداڵبوون و گشت جۆرە نەخۆشییەکی گەورە و زارۆکان، دەرمانی حەوت دەردان بوو. سەرجەلە وەبەر نەدەکەوت و هەر ڕۆژەی میوانی ماڵێک بوو.

حاجی کاکەڕەش خەڵکی ئاوایی بوو، بەهۆی ژن و ژنخوازییەوە خزمایەتیمان لە نێواندا هەبوو، لە گوندیش ماڵەکەی بەقەد ماڵی باپیرمەوە بوو، مرۆڤێکی باوەڕدار و زۆر چاک و بێوەی بوو. مام حاجی بانگدەری ئاوایی بوو، دەنگێکی زیقن و نەشازی هەبوو. جارێکیان مامۆستای قوتابخانەی گوندەکە لە وانەی ئاییندا پرسیارێک لە قوتابییانی پۆلەکە دەکات: کێ ئەزانێت پێغەمبەر ناوی چییە؟ قوتابییەکانیش دەست هەڵدەبڕن و دەیکەنە مامۆستا! مامۆستا! مامۆستاش دەست بۆ قوتابییەک درێژ دەکات و دەڵێ: ئادەی کوڕم! قوتابییەکە هەڵدەستێتە پێوە و دەڵێ: مامۆستا پێغەمبەر ناوی حاجی کاکەڕەشە! دوای ئەوە ئەم ڕووداوە بۆ مام حاجی ئەگێڕنەوە، ئەویش ئەڵێ: بەشکوو خوا لەدڵی نابێت!

جا ئێمە باسی بەرخوردی مامۆستامان لەگەڵ تەلەبەدا دەکرد و دەرگای دیکەمان لێ کرایەوە.

بەیانیان زوو کە بۆ قوتابخانە دەچووین، زەنگی قوتابخانە لێی ئەدا و هەر هەموو لە مەیدان کۆ دەبووینەوە و ڕیزمان دەبەست، بەمەیان دەگوت: ئیستیفاف. ئیدی مامۆستایەک بۆ پاکوخاوێنی بەسەر ڕیزەکاندا دەسووڕایەوە و کۆنترۆڵی خوێندکارانی دەکرد. دەبوو هەموو هەردوو دەستمان بە تەنیشت یەکەوە جووت بکەین، بە جۆرێک کە هەردوو پەنجەکەڵەمان بکەوێتە ژێرەوە، تاوەکوو هەشت پەنجەکەی دی بکرێ لەگەڵ یەک بەکراوەیی و ڕاکشاوی جووت بن. ئەبوو دەستەسڕێکیش لەژێر هەشت پەنجە ڕاکشاوەکەدا بە هەردوو پەنجە کەڵەمان

بگرین. مامۆستا حەیزەرانێکی بەدەستەوە بوو، بە بەردەم قوتابییەکاندا تێدەپەڕی و بەدیقەتەوە سەیری نینۆک و دەستوپەنجەی قوتابییەکانی دەکرد. ئەگەر کەسێک نینۆکی درێژ بووایە، دەستەسڕی پێ نەبووایە، یان دەستی پاک نەبووایە، مامۆستا حەیزەرانێکی بەسەر دەست و پەنجەی ناسکیدا دەکێشا.

لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییدا بووین، مامۆستا حەکیم وانەی ئایین و کۆمەڵایەتی پێ دەگوتینەوە. مامۆستا حەکیمماڵیان لە شۆڕیجە بوو، لەو مامۆستایانە بوو کە لە مەلایەتییەوە کرابوون بە مامۆستا. داوایان لە باپیرم مەلاش کردبوو کە ببێتە مامۆستا، بەڵام ئەو پێی وابوو، ناجائیزە و نەیکرد.

مامۆستا حەکیم هەموو ڕۆژێک خۆی و هەردوو کوڕەکەی واتە، حیکمەت و لوقمان، لە شۆڕیجەوە بۆ ئیمام قاسم و بۆ قوتابخانەی نالی بەپێ دەهاتن. کابرایەکی جددی بوو، توانای ڕۆشنکردنەوە و تەوزیحی وانەکانی بەهێز بوو، من گەلێک جار سەد لە سەدم لەو دوو وانەیەی ئەو وەردەگرت، کە دیارە بۆ ئەو دوو وانەیە هەر وا سانا نەبوو، چونکە سەد لە سەد زیاتر لە ماتماتیک وەردەگیرا.

مامۆستا حەکیم شێوازێکی لە لێدان هەبوو، ئەویش ئەوە بوو، قوتابییەکەی دەبردە لای تەختەڕەشەکەوە و پشتی پێوە دەنووساند، بانگی چاودێر و هاوکارەکەی دەکرد کە بێن و هەر یەکەی لاقێکی بگرن و بەرزی بکەنەوە تاوەکوو ژێر پێی بەبارێکدا بکەوێ کە ڕووی لە قوتابیانی پۆلەکە بێت. ئینجا خۆی بە حەیزەران دەکەوتە لێدانی ژێر پێی و شین و مۆری دەکردەوە.

جارێکیان حیکمەتی کوڕی وانەکەی ئامادە نەکردبوو، بە هەمان جۆر فەلاقەی کرد. ئەوەش نیشانەی ئەوە بوو کە لە نێوان ئێمە و کوڕەکانیدا جیاوازی ناکات.

دوای ئەوەی سەرەتاییم تەواو کرد، ئیدی لەگەڵ حیکمەت و لوقمان لێک دابڕاین، چونکە ئەوان بۆ خوێندنی ناوەندی چوونەوە گەڕەکی خۆیان. دوای ساڵانێکی زۆر و لە زانکۆی سلێمانی و لە بەشە ناوخۆییەکاندا جارێکی تر لەگەڵ حیکمەت یەکمان گرتەوە. من لە فیزیا بووم و ئەو لە کیمیا. بەڵام لەگەڵ لوقمان هەر ئەو دابڕانە بوو، ئیتر جارێکی دی چاومان بە یەک نەکەوتەوە. لوقمان بووە دکتۆر و لە کاتی کیمیابارانی هەڵەبجەدا کار و ماڵی لەوێ بوو.

مامۆستا حەکیم لەدوای خانەنشینی، دوکانێکی هەر لە گەڕەکی خۆیان دانابوو. سەروەختێ کە ماڵم لە ڕەشیداوا بوو، جارجار دەچوومە کنی و ئەحواڵپرسیم دەکرد.

لە ساڵی ١٩٩٣دا مامۆستا حەکیم و پێنج مەلای دیکە بۆ بەغدا بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ سەدام حوسێن بانگهێشت دەکرێن، بەڵام ئەمان ئەو چاوپێکەوتنە ڕەت دەکەنەوە، بۆیە ئەمنی کەرکووک دەچێتە سەریان و هەر یەکە لە ماڵی خۆی دەستگیر دەکات و لە پاش ٣ ڕۆژ ئازار و ئەشکەنجە، دەیانکوژن و تەرمی هەر یەکەیان لە جێگایەک فڕێ دەدەن. کوڕی یەکێک لە مەلاکان دەیەوێت ژمارەی ئۆتۆمبیلی ئەمنەکان بگرێت کە بۆ گرتنی باوکی هاتبوون، ئەویش لەگەڵ خۆیاندا دەبەن و بە هەمان دەردی باوکی دەبەن.

ئەوەندەی بە مامۆستا حەکیم دەگەڕێتەوە، دوای ئازار و ئەشکەنجە و دەرکردنی هەردوو چاوی، گولەبارانی دەکەن و تەرمەکەی لەژێر پردی سێ، پردی ولادە فڕێ دەدەن.

هەر وەکوو لە سەرەتادا باسم کرد، قوتابخانەی سەرەتایی 'نالی'م تەواو کرد و چوومە ناوەندیی کاوە. لە ١٨/٩/ ١٩٧٣ ساڵی خوێندن دەستی پێ کرد، ئەو دەمە وا بوو، لەو ڕۆژەدا پشووی هاوین دەگەیشتە کۆتایی و قوتابخانەکان دەکرانەوە. ئەو کاتانە گەرما شکاوە، وەلی هێشتا هەر گەرمە، پاشی دوو هەفتە یەڵا دنیا فێنک دادێت. ئیدی ڕۆییشتن و پیاسە و قەدەملێدان خۆشە و پیاو وەڕس نابێت، من ئەو هەوایەم پێ خۆشە.

هاوینی کەرکووک ئێجگار گەرمە، سەری کەچەڵ دەسووتێنێت، ڕەنگە هەر لەو سۆنگەیەوە بێت، خوێندکاران سێ مانگ و نیو پشوویان هەیە، خۆ ئەگەر پیاو ئیشی نەبێت، ئەوا لە سەعات نۆی بەیانییەوە تاوەکوو پێنجی دوانیوەڕۆ دەرناچێتە دەرەوە و ئەخەوێت. بەڵام بۆ ئێمەی منداڵ وا نەبوو، نەئەخەوتین و وەکوو سەگی پاسووتاو دەسووڕاینەوە و لە سەرکۆڵان ڕادەوەستاین، یان بەو قرچەی گەرمایە خەریکی تۆپێن بووین. قاچوقولمان هەمووی دەبوو بە برین و خۆڵ و تۆزی ساحەی دەچووە سەر و لێمانی پیس دەکرد و هەموو ڕۆژێکیش دەکولایەوە. ئیدی

چڵک و کێمی دەکرد و سێ مانگەی هاوین پێمانەوە دەبوو، نە خۆمان بیرمان بۆ ئەوە دەچوو کە دەکرێ ئەوە دەرمان بکرێ و چار بکرێ، نە کەسێکیش لای لێمان دەکردەوە. بەس نییە ئێمە کوڕان ئەوەندەمان هەبوو، خۆ کچان هەر لەنێو ماڵ و چواردیوارێکدا بوون، هەموو چوونە دەرەوە و پیاسەیەکیان بەردەرکی ماڵ و سەرەتاتکێیەک بوو، دەستبەقژداهێنان و خۆتەکاندنێک ئیشارەت بوو! ئەو دەمە خوێندن ئیلزامی نەبوو، کەم بوون ئەو کچانەی ڕێگەی مەکتەبیان پێ ئەدرا، تا لەو ڕێگەیەوە دوو کۆڵان ئەولاتر ببینن، تەنانەت گەلێک لە کوڕانیش نەدەچوونە بەر خوێندن.

من و شوکری و فەیمی خوشکم کە لەگەڵ یەکەمیان ساڵێک و لەگەڵ دووەمیان سێ ساڵم بەینە، پێکەوە چووینە مەکتەب. جارێکیان لە پۆلی دووەمی سەرەتایی مامۆستا لە شوکری دابوو، ئیدی لە پاش ئەوە مەکتەبی بەجێ هێشت و نەچووەوە. ئەو شێوازە لە فێرکردن و پەروەردە ئاراستەی زیندەگی ئەوی گۆڕی و چارەنووسی بە جێیەکی دیکە سپارد.

هەرچی فەیم بوو، خوێندکارێکی زیرەک بوو، لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی دەریانکرد، چونکە مامەکانم ناڕازی بوون و فشاریان بۆ باوکم هێنابوو کە دەبێ دەربکرێ، چونکە ئەوە شوورەیییە و کچ و مەکتەب و خوێندەوارییان نەگوتووە، دەبێت بگەڕێتەوە بۆ جێگەی ئەسڵی خۆی کە چواردیواری ماڵە!

ئەو دەمە ژیان لە سادەیی سادەتر بوو، ئێمە ژیانمان بەباشی دەچووە ڕێوە. باپیرم حاجی ڕەشید کە بە ڕەشە بیبەر دەناسرا، ماڵی لە گەڕەکی یادگار بوو، دایک و باوکیشم هەر لەگەڵ وان دەژیان، پاشان باوانم دەچنە حەمەشنە و خانوویەکی تەجاوز دروست دەکەن. ئەو گەڕەکە دەکەوتە لای ژووری گەڕەکی یادگار بە ئاراستەی بارووتخانە و نزیک گردەکەی ئازادی. ئەو خانووانە، خانووی جمهووریشیان پێ دەگوت، پاش چەند ساڵێک و لە پاش کوودەتای بەعسییەکان لە ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ حەرەس قەومی دەریان دەکات و وەک باقیی شوێنەکانی دی خانووەکانیان دەڕووخێنێت.

من لەو گەڕەکە و لە ساڵی ١٩٦٠ لە دایک بووم. ڕۆژ و مانگی لەدایکبوونم دیار نییە، وەک نیوەی خەڵکی عێراق لە یەکی حەوت لە دایک بووم. من ئێستا لە سویسرا ئەژیم و ئەوا لێرە ٢٢ ساڵم وەپشتسەر ناوە. خەڵکی ئەم وڵاتە ڕۆژی لەدایکبوونیان زۆر بۆ گرنگە، ئیلا دەبێ یادی بکەنەوە، ئەگەر دەمێکیش بێت دایک و بابیان نەبینیبێ، ئەوا لە ڕۆژی لەدایکبوونیاندا سەردانییان هەر دەکەن و بەشدارییان لەگەڵدا دەکەن. کەسێک نادۆزیتەوە ڕۆژی لەدایکبوونی خۆی نەزانێ. ئێ باشە قەیدی نییە، باوک و دایکم وەک سەدا نەوەد و نۆی خەڵکیی ئەو دەمە نەخوێندەوار بوون، بەڵام خۆ باپیرم مەلای دوانزە عیلم بوو! خۆش ئەوەیە لە یەکی حەوتدا ئەگەر ڕێت بکەویتە فەرمانگەیەک، هەر بە سەیرکردنی پسوولەکەت، یەکسەر پیرۆزباییت لێ دەکەن، لە کاتێکدا خۆت لەبیرت نییە! یان جاری وا هەیە، دەچیتە سەر کار و بەپێی سیستەمی ئێرە کارتی ئیشەکەت وەک هەموو ڕۆژێکی تر دەخەیتە نێو دەستگایەکەوە، تا حوزوورت بۆ بنووسێ، لەو کاتەدا لەسەر شاشەیەکی بچکۆلەی سەر دەستگاکە دەنووسێت: ڕۆژی لەدایکبوونت پیرۆز بێت! جا دە وەرە، خۆت ئاگات لەو ڕۆژە نەبێت! بە هەر حاڵ.

ئیدی خانە و لانە تێکوپێک چوو، هەر خانە و لانە نا! خەونەکانیش. دایک و باوکم بە ئێمەوە گەڕاینەوە ماڵی باپیرم لە یادگار و لە کۆڵانی مزگەوتەکەی مەلا جەبار. مەلا جەبار ئەکاتە باوکی موعتەسەم ساڵەیی نووسەر و محەمەد ساڵەیی شێوەکار. هەر وەکوو دەگێڕنەوە، کاتی خۆی بە دەستپێشکەری مەلا جەبار ئەو مزگەوتە دروست کراوە. ئەو هاتووە کۆمەکی لە خەڵکی گەڕەک کۆ کردووەتەوە و ئەو مزگەوتەی پێ دروست کردووە. ئەڵێن باپیرم حاجیش کۆمەکی کردووە. ئەوانە بە بیرەوەریی من نین، وەلێ ئەوەم دێتەوە بیر کە چۆن ماڵی شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزانی و خەلیفە عەلی ... زۆریان پێ ناخۆش بوو کە خەڵکی دەیگوت: مزگەوتەکەی مەلا جەبار. ئەو دەمە ڕێگای سلێمانی بەوێدا تێدەپەڕی و پاشان بەرەو کەرترێنە. ئەڵێن گوایە کاروانیی، کاتێک دەگەییشتە ئەو هەورازەی کەرترێنە، لەبەر ڕکی ڕێگا و باری قورسیان، کەرەکان دەترین، هەر بۆیە پێیان گوتووە، کەرترێنە.

ئیدی نزیکەی دوو ساڵێک لەگەڵ ماڵی باپیرم دەبین، من بە حاڵ دێتەوە بیرم. دێتەوە بیرم و ئەڵێی خەوە، باپیرە گەورەم کە پیرێکی چاوشین بوو، پێیان دەگوت، محە عەجەم، لە حەوشەی ماڵی باپیرم ڕایەخێکیان بۆ ڕائەخست و لەسەری درێژ ئەبوو. لەو ماوەیەدا باوکم زەوییەک هەر لە گەڕەکی یادگار و لە کۆڵانی ماڵی شێخ دەکڕێت و دەیکات بە خانوو. ئەو دەمەی ئێمە ئەو خانووەمان دروست کرد، هێشتا ماڵی شێخ نەهاتبووە ئەو گەڕەک و کۆڵانە و بەرامبەرمان هەمووی چۆڵی بوو، پاشان ئەگەییشتە باخەکان و ماڵی حاجی ڕەفیق و ئامۆزاکان. ئەو گەڕەکە بۆیە پێی دەڵێن یادگار، بەناوی کەسایەتییەکی ئەو گەڕەکەوە، ناوی مام یادگار بوو. باوک و باپیرم پەیوەندییان لەگەڵ مام یادگار زۆر بوو، من مام یادگارم دێتەوە بیر، ماڵیان لە عاشوور لە نزیک دوکانەکەی عەودل نەجاڕ بوو، لەگەڵ باوکم بۆ ماڵیان چوومە.

باوک و دایکم لە سەرەتادا توانیویانە تەنها دوو هۆدە و هەیوانێک بنیات بنێن، پاشان هەندێک جێگای تریان بۆ ئیزافە کرد. هەتا ساڵانێکی زۆر هۆدەیەکیان بەکرێ ئەدا و خۆشمان هەموو لە تەنها هۆدەیەکدا بووین. چوار منداڵی یەکەمی لێ دەرچێت، باقییەکەی هەر لەوێ لە دایک بوونە و ئیدی هەر هەمووش هەر لەو خانە و لانە و لەو کۆڵان و گەڕەکە گەورە بوونە.

لەو کۆڵانە، ماڵی شێخ لە هەمبەری ماڵی ئێمەدا بوو، نزیکەی تەوای ئەو لایەی گرتبووەوە، چونکە شێخ چوار ژنی هەبوو، یەکێکیان نەبێت، ئەوانی تری لەگەڵدا بوو. بۆ هەر یەکێک لەوانە، خانوویەکی دروست کردبوو، تەکێکەش لە ناوەندا بوو. ئەڵقەی زیکر و تەهلیلە گشت شەوانێکی سێشەممان و جومعان گەرم بوو. خەلیفە عەلی، خەلیفەی پلە یەکی شێخ بوو، ئەو زیکرەکەی بەڕێوە دەبرد و فووی پێدا دەکرد و ڕیتمی دەگۆڕی و کۆتایی پێ دەهێنا. دەروێشەکانیش قژی درێژیان لێ بەرئەدایەوە و بەگوێرەی ڕیتمی تەپڵ و دەفەکە، سەریان با ئەدا و ئەمدیو و ئەودیویان پێ دەکرد. یەکێک زەرگی لە گووپ و لە زمانی ئەدا، یەکێک زەرگی لە کەلەکەی ئەدا و ئاودیوی ئەکرد، یەکێک گڵۆپی دائەخرمان، یەکێک یاری بە مار ئەکرد و لە ناکاودا قەپی لێ دەگرت و سەری دەقرتاند و لاشەکەی فڕێ ئەدا، یەکێکی دیش لەسەر چۆک دائەنیشت و خەلیفە عەلی بە چەکوشێکی دار،

خەنجەرێکی لەسەر تەپڵاکی سەری دادەکوتی ... جار و باریش شێخ قادر و شێخ قەلەندەر بۆ سەرگەرمیی خۆیان، ئەهاتنە ناوەوە و تەپڵ و دەفیان لێ وەردەگرتن و بە دەست و بازووی بەهێزیان و لێزانانە ئەوەندەی دی زیکرەکەیان گەرمتر دەکرد و حەماسی دەروێشانیان بە عاسماندا دەبرد. زیکر تەواو دەبوو، بەڵام هێندێک حاڵی لێ دەهات و هەر بەری نەدەدا، گەرەکی بوو وەلائی زیاتر پیشانی شێخ بدا.

لەم سێرەمۆنی و ڕێوڕەسمەدا شێخ لەسەر کورسییەک دانیشتووە و دەڕوانێتە زیکرەکە، دەروێشە سوورەش بەوبەرەوە وەلائی خۆی بۆ شێخ نوێ دەکاتەوە و بە دەنگێکی بڵند و بە سۆزێکی خۆش دەست پێ دەکات: ئۆخەی ئۆخەی کەریم گیان

مالْم کردووە لە بووبان

عەسکەری تۆم کەریم گیان.

پاشان چەند جارێک هاوار دەکات: نوێژنەکەر کەرە، نوێژنەکەر کەرە!

ئەوانە گشت لەنێو کۆڵان و بە بەرچاوی ئێمەی منداڵەوە دەچوونە ڕێوە، نە مۆڵەتیان لە دەرودراوسێ وەردەگرت و نە باکیان بە دەروونی ناسکی منداڵان هەبوو! قەیدی چییە، ئەوان ئەگەر دەیانەوێت زیکری خودای خۆیان بکەن، با بیکەن و ئازاد بن، بەڵام دوور لە گوێی خەڵک و چاوی منداڵ.

وای لێ هاتبوو ئێمەی منداڵانیش کەوتبووینە نێو فەزای ئەوانەوە، زەرگمان دروست دەکرد، دارێکمان گۆ دەکرد و تێلێکی قایم و ڕەقمان ڕاست دەکردەوە و سمپارەمان دەکرد و هەردوو سەرەکەیمان تیژ دەکرد، سەرێکیمان دەچەقاندە نێو گۆیەکە و گۆیەکەشمان بە زنجیر و بە فلسی سوور و بزمارە زەردە دەڕازاندەوە. لە دار و تەنەکە و پەلکی دارخورماش خەنجەرمان دروست دەکرد.

لەو ڕۆژگارە و لەو کۆڵانەدا تەنها ماڵی مامۆستا عەلی (شێخ عەلی) تەلەفۆنی هەبوو، خەڵکیش ئەوەندە پێویستیی بە تەلەفۆن نەبوو، ئەگەر یەکێک تەلەفۆنی بۆ بکرایە، ئەوا یەکێک لە ماڵی مامۆستا ئەچوو ئاگاداری ئەکردەوە. شێخ عەلی لە پۆلی سێیەمی سەرەتایی مامۆستام بوو.

لەو کۆڵانەدا، تەنها ماڵی کاک عەبدوڵا تەلەفزیۆنیان هەبوو. بۆ تەماشاکردنی تەمسیلی بە تایبەت ئەوانەی عەلیڤەنی و مامەلی ڕوومان لێ دەکرد. کاک عەبدوڵا

کرێکاری کۆمپانیای نەوتی کەرکووک بوو، پاسکیلێکی هەمبەری هەبوو، ئەسپێکی کوێتی دەهێنا، بۆ سەرکار پێی دەچوو. ماڵی شێخ عەول کەریمیش لە ماڵە گەورە تەلەفزیـۆنێکی گچکەیـان هەبـوو کە شاشـەکەی هەر بەقەدەر ناولەپێـک دەبـوو، جاروبار دەچووینە ئەوێش، بەلام دەیانگوت، پێیان خۆش نییە خەڵکی بزانێت کە ماڵی شێخ تەلەفزیۆنیان هەیە!

گەڕەکەکەمـان، یادگـار گەورە نەبـوو، هەر وا چـوار پێـنج کۆلانێـک دەبـوو، کۆڵانەکەشمان هەر وا ٢٠٠-٣٠٠ مەترێـک دەبـوو. لەو کـۆلانە بچـووکەدا دوو مەلا (مەلا جەبار، مەلا عەلی)، دوو حاجی (حاجی ئەحمەد، حاجی عەزیز)، ڕیزێک شێخ (شێخ سدیق ئالتوونچی، شێخ عەلی و ماڵی شێخ عەول کەریم) و تەکیکەش ڕیزێک خەلیفە و ئەرتەشێک لە دەروێش هەبوون. لە بۆنەکانیشدا ئیدی دەروێشی ماڵی شێخ لە گشت لایەکەوە تەنانەت لە گوند و شارەکانی کوردستانی ئێرانیشەوە، لە ڕومادی و فەلووجەی عەرەبنشینەوە بۆ زیارەت خۆیان دەترنجاندە ئەو تەکیەوە و کۆلان جمەی ئەهات و دەرزیت هەڵدایە بەر زەوی نەدەکەوت!

خانووەکەی ئێمە هەر وەکوو پێشتر باسم کرد، لە سەرەتادا تەنها لە دوو ژوور و هەیوانێـک پێـک هـاتبوو، ژێـر قاڵـدرمەیەک چێشـتخانەکەی بـوو، بەلام دواتـر بەشێکیان لێ جیا کردەوە و کردیانە خانووەیەکی سەربەخۆ و بەکرێیان دا. ژێری ئەو خانووە ژێرزەوییەکی لێ دروست کرابوو کە بە دەست خۆمانەوە بوو. هەر لەو کۆلانەی خۆمان و چەند خانوویەک ئەولاتر خانوویەکی ترمان دروست کرد، ئەویشمان بەکرێ دا.

دایـک و بـاوکم پـێکەوە و دەسـت لە نێودەسـت خەریکـی کـاری ئاژەڵـداری و ماستفرۆشی بوون، ژیانمان بەوانەوە دەچووە ڕێوە. دایکم لە باوکم زیاتر و باوکم لە دایکم زیاتر ڕەنجیان ئەدا و ماندوو ئەبوون، کارەکانیش فرە بوون، فەترەی وا هەبـوو ٨-٩ مانگـا و گۆلـک، ١٥-٢٠ مەڕ و بەرخ، بـزن و کـار، ٢٠-٣٠ مـامر و جووجەڵە، مراوی و قاز و سۆنە، کەڵەشێر و عەلەشیش و گوێدرێژێکمان هەبووە. کارەکـان زۆر بەتەرتیـب بـوون، مانگـا و گـوێرەکە بـۆ ژێـرزەوی، پەزەکـانیش بـۆ سـەربان و جێگـای تـایبەتی، پەلەوەرەکـانیش نێـو کـولانە و ژووری دیـکەی لە قـوڕ

دروستکراو و نێو حەوشە. ئێ خانەوادەش لەولاوە بوەستێ کە بە دایک و باوکەوە ١٤ سەر نەفەر بووین. بەو جۆرە ئەگەر بچوویتایە ئەو ماڵە، ئەوا ئەکەوتیتە نێو شارێک و نێو کەشتییەکەی نووحەوە.

قووقەی کەڵەشێر و گارەگاری مریشکی هێلکەکەر و گمەی کۆتر و جووکەجووکی چۆلەگەی سەر گوێسەبانە بۆڕەی مانگا و زەڕەی کەر و باڕەی مەڕ و باعەباع و قاڕەقاڕی بەرخ و کارژۆلان ... پێکەوە سەمفۆنیایەکی بێوێنەیان چێ دەکرد!

بەڵێ! ئەمانە کاریان زۆر دەویست، گشت ڕۆژێک دایک و باوکم پێش مەلابانگدان لە خەو ڕادەبوون، ئاو و ئالیکدان و دانپێدان و پاکردنەوە و دۆشینی بەیانیان و ئێوارانی ئەو هەموو چێڵە، شیر کولاندن، لە جامیلکەخستن، هەوێنکردن و گەرمداپۆشینی کاری بەردەوام و نەبڕاوە بوون. هەر دەمێکیش ئالیک و دانەوێڵە نزیک تەواوبوون بایەن، باوکم کا و جۆی دەکڕی و دەیهێنایەوە. دایکم لەگەڵ باوکم بە دەستبار، یان هەر خۆی و بەکۆڵ فەردە جۆی دادەگرت و دەیبردە ژوورەوە! دایکم ئافرەتێکی بە هەرەکەت بوو، گورجوگۆڵ، ئازا، بەهێز، بەغیرت، پتەو و لەشساغ بوو، جاری وا بووە، شەو ژان گرتوویەتی و دەمەو بەیان منداڵی بووە و بۆ نیوەڕۆکەی چووەتەوە بەر کار و ئەو هەموو چێڵەی دۆشیوە!

گەلێک جار ڕووی داوە، مانگایەکمان لە زایینداوە، دایک و باوکم شەو تا بەیانی بێدار بەدیارییەوە بوونە و کۆمەکیان کردووە، جاری واش بووە گۆلکەکە لە زگی دایکیدا سووڕاوە و خراپ هاتووە، پەنایان بۆ حەمەی بەیتاڵخانە بردووە و بەو نیوەشەوە گازیان کردووە.

کاک محەمەد خۆی فەڕاشی بەیتەرێ بوو، وەلی کاری دکتۆریشی دەکرد! ئیدی دەمەو بەیان کاتێک لەخەو ڕا دەبووین، فرۆ و کەڕەمان[7] لەسەر سفرەی نانخواردنی بەیانی دەبینی، بەوەدا دەمانزانی مانگایەکمان زاییوە.

---

٧. فرۆ: ژەک، فرچک، فرشک، هەوەڵ شیر دوای زایین.

کەڕە: بەو فرۆیە دەگوترێت، دوای ئەوەی زۆر دەکولێنرێت، خەست دەبێتەوە و شێوەی پەنیر وەردەگرێت.

مانگایەکی هۆڵەندیمان هەبوو، لە ماڵێکمان کڕی ناویان لێ نابوو: غازی، ئیدی لەلای ئـێمەش هەر بە مانگـا غـازی دەناسـرا. مانگـای هۆڵەنـدی وەک مانگـای کوردەواری نەبوو، زل و زەخم بوو، زۆر گرانبەها بوو، بە هەموو کەس نەدەکڕدرا.

مانگا غازی ڕۆژانە دوانزە کیلۆ شیری ئەدا، کارگەیەک بوو بۆخۆی، بنگوانی پڕ کۆشـێک بـوو، دایکـم لەبەر چـاونەفەس تـوورەگەیەکی بـۆ بنگـوانی کردبـوو تێـی هەڵدەکێشـا. ڕۆژێکیـان گـۆلکی مانگـا غـازی چـووە سـەربان، ئەمـلا و ئەولامـان لـێ گـرت، بـۆ ئەوەی بەرەو لای قاڵـدرمەکانی بەریـن و بچێـتە خـوارەوە، بەڵام ئەو بەنێوانمانـدا وەکـوو ئاسـک قەڵەمبـازێکی دا و خـۆی خسـتە نێـو حەوشـەی مـاڵە هاوسێکەمانەوە! پێش ئەوەی مردارەوە بێت، بـاوکم سـەری بڕی بۆئەوەی فریـای چەقۆی بخات. ئەو ڕووداوە بۆ ئێمە ئێجگار خەمنـاک بـوو، ئـاخر مانگا غازی لەلای ئێمە زۆر خۆشەویست بوو.

لەدوای ئەو ڕووداوە ترسی ئەوەمان لێ نیشت، مانگـا غـازی شـیر نەدات و ڕێگە نەدات کە بیدۆشی! چونکە هەموو ڕۆژێک بۆ دۆشینی، دەبوو گۆلکەکەت بۆ بردایە، تـا لە تەنیشـتی بێت و بیلێسـێتەوە! بۆیە دایکم کەوڵـی گۆلکەکەی لە کا پەسـتاند و هەمـوو ڕۆژێـک بـۆ مانگادۆشـین دەچـوو لە بەردەم مانگـا غـازی دادەنـا و ئەو دەیلێسایەوە و ئەمیش دەیدۆشی.

مەلای گوندی سەیدان ئاشنای باوکم بوو، زۆر جار کە بۆ شـار دەهـات، دەبـووە میوانی ئێمە و شەو لە ماڵمان دەمایەوە. دوای چەند سـاڵێک لەو ڕووداوە مەلا بـووە میوانمـان. بـاوکم باسـی ئەو ڕووداوەی بـۆ کـرد و گـوتی: مانگـایەکی زۆر چـاکی هۆڵەندیمان هەبـوو، نـاوی مانگـا غـازی بـوو، مەلا وتـی: ئەلحەمـدولیلا. بـاوکم وتـی: ڕۆژانە دوانـزە کیلـۆ شـیری ئەدا، مەلا وتـی: ئەلحەمـدولیلا. بـاوکم وتـی: گـۆلکێکی هەبـوو، دەتگـوت ئاسـکە، مەلا وتـی: ئەلحەمـدولیلا. بـاوکم وتـی: گـۆلکەکەی چـووە سەربان و خۆی فڕێدایە حەوشـەی مـاڵە هاوسـێکەمانەوە و مردارەوە بـوو، مەلا بـۆ ئەوەش هەر وتی: ئەلحەمدولیلا!

دایک و باوکم بڕوایان وابوو، مانگا غازی بە نەفەسەوە بووە!

لە کن ئێمە ئەوە عادەت بوو، بەیانیان لەوەختدا لە خەو هەڵسین و پێکەوە نانی بەیانیمان بخۆین، هەر وەکوو چۆن فراڤین و نانی ئێوارانیشمان هەر پێکەوە بوو. شێوازی کار و کاسبی ئێمە درەنگ لە خەو هەستان و خاووخلیچکی کردبوو بە نەنگ! هەر بە هۆی شێوازی کارەکەشمانەوە، خواردنی بنەڕەتیی بەیانیانمان ماست بوو، کە بۆ ڕۆژێکیش لێمان نەبڕاوە، ئیدی شیر و هێلکە و لە بەهارانیشدا کەرە لە بەردەستدا بوون.

بەهاران چونکە ماستی مەڕ و بزن دەکەوتنە بازاڕەوە، ماستەکەی ئێمە بە ڕادەی وەرزەکانی دی فرۆشی نەبوو، بۆیە دایکم بەری چێشتەنگاو و هەر لەنێو حەوشەدا، مەشکەی دائەنا و هەرچی ماستێک کە مابووەوە و نەفرۆشرابوو، لە مەشکەی دەخست و دەیژەنی. ئێمەش بەدیارییەوە هەڵئەترووشاین و چاوەڕێ بووین هەتا تەواو دەبوو. کە تەواو دەبوو، بە داردۆژنگەکە مەشکەکەی بڵند دەکردەوە گوریسەکەی گورج دەکردەوە و لە سێپایەکەی دەبەست. مەنجەڵێکی گەورەی لەبەردەم کلکی مەشکەکە کە بە پارچە بەنێک توند بەسترا بوو دادەنا. ئینجا بەنەکەی دەکردەوە و دۆیەکە بەخوڕ دەهاتە خوارەوە بۆ نێو مەنجەڵەکە. پاشان جارێکی دیکە بەفراوێک و چەند کڵۆ بەفرێکی بە قوڕگی مەشکەکەدا دەکرد و چەند شڵقێکی لە مەشکەکە ئەدا. ئینجا دەمە گەورەکەی دەکردەوە، تۆپەڵێکی گەورە و گردی کەرەی زەرد دەردەپەڕی و دەکەوتە نێو مەنجەڵەکەوە. کەرەی ماستی مانگا زەرد و هی مەڕ سپییە. کەرەکەی بە دەست تۆپەڵ دەکرد و ئێمەش دەستمان بە نان و کەرە خواردن و دۆ خواردنەوە دەکرد.

ئادار مەشکە لە کار

مەشکەم مەشکەی مانگایە، لۆلەپ لە دار خورمایە
دەیژێنم لە بێلایە، ئەورۆ دەنگی چاک نایە
هەی ماڵە بابم مەشکێ، هەی عەمر و چاوم مەشکێ
مەشکەم مەشکەی مانگایە، ڕۆنی زۆری تێدایە
کابان لە بەر بێلایە، شڵقی لە مەشکەی دایە
هەی ماڵە بابی من بێ، هەی عەمر و چاوی من بێ[8]

---

٨ لۆلەپ: لۆرەلەپ: داری لووسی گرۆڤەر بۆ پێش و دواوەی مەشکە، کە داردۆژنگی بە زمانە تێ خراوە.

# ئاگربەست، شەڕ و شکست

هەر وەکوو لە سەرەتادا باسم کرد، لە ساڵی ١٩٧٣ قوتابخانەی سەرەتاییم بەجێ هێشت، بە زۆرێک لە هاوڕێکانمەوە، بە مامۆستا و پۆل و باخچە و گۆڕەپان و تەنانەت بە کتێبخانە چکۆلەکەی و بە تیپی مۆسیقای سۆلافیشەوە. خوێندنی ناوەندیم لە ١٩٧٣/٩/١٨ لە قوتابخانەی کاوە دەست پێ کرد. بەڵام بۆ سەرەتای مانگی ئازاری ١٩٧٤ چەندی بەینە؟ هەر وا کەمتر لە شەش مانگێک!

نەوشیروان مستەفا لە کتێبەکەیدا دەڵێ: ئەو چوار ساڵەی لە بەیانی ئازاردا بۆ بڵاوکردنەوەی قانوونی ئۆتۆنۆمی دیاری کرابوو، بەرەو تەواوبوون ئەچوو. بەعس سوور بوو لە کاتی خۆیدا قانوونەکە بڵاو بکرێتەوە، سەرکردایەتیی پارتی ئەیویست دوای بخات. بیروبۆچوونی هەردوو لا لەسەر زۆر مەسەلەی بنەڕەتی جیاواز بوو، هیچ لایەکیان بڕوای بەوی تر نەمابوو.مانگی مارتی ٧٤ گفتوگۆی سەرکردایەتیی بارزانی و بەعس چووە ناو کۆڵانێکی داخراوەوە. بە تایبەتی دوای چوونی ئیدریس بۆ بەغدا بۆ بینینی سەدام و گەڕانەوەی بەبێ ڕێکەوتن.[٩]

هەر لە سەرەتای ئەو ساڵەی خوێندن و لەنێو ئەو چەند مانگەدا، ئاماژەکان گشت ڕوویان لەوە بوو کە ئارامی ئەو دەڤەرە دیسان دەشێوێ و بۆنی شەڕ و کوشتار و ماڵوێرانی بە گژ خەڵکیدا دەهات. وردە وردە خەڵکی ترسی لێ نیشت و تەگبیری ئەوەی دەکرد، شار بەجێ بهێڵێ و بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی "شۆڕش" بگوازێتەوە.ئەوە هەر ناوچە و شار و گەڕەکەکەمان نەبوون شپرزە بوون، بەڵکە خوێندنگاکەشمان، ئەو ماڵەی تیایدا دەمانخوێند، شپرزە و بێڕەنگ کەوت. مستەفا وەیسی بەڕێوەبەر و گەلێک لە مامۆستاکانمان ئەو ماڵ و شارەیان بە ئێمەی خوێندکارانیشەوە بەجێ هێشت. لە ناوەندییەکانی شارۆچکەکانی دەوروبەری

---

داردۆژنگ: داری ئەملا و ئەولای مەشکە، کە بە زمانە دەخرێتە ناو لوولەپەوە.

گرۆڤەر: خڕ وەک تۆپ، درێژۆکەی لووس و بێسووچ، ئیستیوانەیی.

بێلا: ئەنوا، بارانەگر، هەیوان.

(هەنبانە بۆرینە، فرهنگ کردی-فارسی، هەژار، چاپی سێیەم، سروش، تهران، ١٣٨١)

٩. لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، نەوشیروان مستەفا ئەمین، ساڵی ١٩٩٧، ل ١٩.

کەرکووکەوە کۆمەڵێک خوێندکار و مامۆستا بۆ لای ئێمە گوێزرانەوە، قەرەباڵغی و هوسەیەکی وا دروست بوو، سەگ ساحێبی خۆی نەدەناسییەوە.

سەرەتا ئەبێ ئەوە بڵێین، بەیانی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ بەرەنجامی ڕێکەوتنی حکوومەتی بەعس و پارتی و بارزانی بوو. ئەو ڕێکەوتنەش بەرەنجامی هاوسەنگیی هێزی نێوان ئەو دوو لایەنە، لەنێو فەزای کێشمەکێش و کێبەرکێی هێزە ناوچەیی و جیهانییەکان لە پێناوی قازانجی سەرمایە و دەسەڵات و هەژموونی خۆیان لەو بڕگە مێژووییەدا بوو.

حیزبی بەعس بە ڕێبەرایەتیی بەکر-سەدام تازە و لە ڕێکەوتی ١٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨ هاتبووە سەر حوکم. ئەمە بۆ جاری دووەم بوو، ئەم حیزبە خۆی بە دەسەڵات بگەیەنێت. واتە، ئەم حیزبە ئەزموونێکی لەوەوبەری هەیە و گشت هەوڵێکی خۆی بەگەڕ دەخات، تاوەکوو حوکمداریی خۆی جێ بخات و ڕووداوی لەدەستدانی دەسەڵاتی پێش پێنج ساڵ بەر لە ئێستای دووبارە نەبێتەوە.

سەرەتا کە ئەمانە هاتن، خۆیان لە هەموو ئەوانە ڕزگار کرد کە لەنێو حیزب و حکوومەتدا مایەی کێبەرکێ و ترس و گومان بوون. پاشان نەخشەیان بۆ بەحیزبیکردنی سوپا و پۆلیس و دەستگا ئەمنییەکان کێشا و دەستگای هەواڵگرییان بەنێو کون و کەلەبەری ئەم دامەزراوانەدا بڵاو کردەوە. بەم کارەیان لەمپەریان خستە بەردەم ئەو شێوازە باوانەی کوودەتا کە لەو وڵات و ناوچانەدا ببوون بە باو.لەسەر ئاستی وڵاتە عەرەبییەکان، خۆی وەکوو حیزبێکی عەرەبپەروەر و ناکۆکیکار لە کێشەی فەلەستین پێناسە دەکرد و سەرەنجام لەم ڕێگەیەوە توانی ڕای گشتیی خەڵکی ئەو وڵاتانە بۆ خۆی بەدەست بهێنێت.بۆ ئەوەی بتوانێت نەخشە و پلانەکانی بۆ بەهێزکردن و داکوتاندنی خۆی بەباشی و بەشێنەیی بباتە پێشەوە، پێویستی بە چەند ساڵێکی ئارامیی نێوخۆی عێراق هەبوو. بۆ ئەم کارەش ئەبوو تفەنگەکان لە کوردستاندا بێدەنگ بکات.لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، بۆ پەیداکردنی پشتیوانیی مادی و مەعنەوی، بۆ دامەزراندنی سوپایەکی پۆشتە و پەرداخ و پڕ چەک و پشتیوانیی نێودەوڵەتی، پێویستی بە یەکێتیی سۆڤیەت و ڕێکەوتن لەگەڵیدا هەبوو، کە لەم ڕێگەیەشەوە دەتوانێت ڕێکەوتن لەگەڵ حیزبی شیووعیی عێراقیشدا

مەیسەر بکات و دژبەریکی خۆی کەم بکاتەوە و هاوکاریکی خۆی زیاد بکات و لە پارتی و بارزانیشی دوور بخاتەوە، بە شێنەییش ئەم حیزبە (ح. شیووعی) لە بنکە جەماوەرییەکەی دابماڵێ و سووک و ڕیسوای بکات.

بەڕێوەبردن و بەسەرکەوتنگەیاندنی ئەم هەموو کار و نەخشە و پلانانە، پێویستی بە ئیمکانیاتێکی گەورە و زەبەلاحی ماڵی هەبوو. بۆیە باشترین هەنگاو "خۆماڵیکردن"ی کۆمپانیاکانی نەوت بوو، هەر وەکوو لە ڕێکەوتی ١ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢دا پێی هەستا.

کەواتە، بنەمای ڕێکەوتنی حکوومەتی عێراقی لە ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠دا، هاوسەنگیی هێزی نێوان ئەو دوو لایەنە لەو بڕگە مێژووییەدایە، نەک بڕوابوون بە چارەسەری کێشەی میللی لە کوردستاندا. بەو پێیە، لە ئەگەری ئاڵوگۆڕی هاوسەنگیی هێزی نێوان ئەو دوو لایەنە، ئەو ڕێکەوتنەش ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت.

حکوومەتی بەعس بە پلان و نەخشەیەکی هەمە لایەنە، لە هەوڵی قورسکردنی تای تەرازووی خۆیدا بوو، بەڵام پارتی و بارزانی لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا نەک هەر هاوسەنگیی هێزی خۆیان نەپاراست، بەڵکە بوونە هێزێکی ئاوەها کە شای ئێران لە هاوینی ساڵی ١٩٧٢دا و لە چاوپێکەوتنێک لەگەڵ ڕۆژنامەوانێکی فەرەنسیدا بە شانازییەوە بڵێت: مانەوەی بزووتنەوەی کوردی وەک زەمبەلەی ئاو لە دەستی مندایە، هەر کاتێک بمەوێت، ئەیکەمەوە یان ئەیگرمەوە.[10]

بێگومان شای ئێران لە خۆڕا وای نەگوتووە، چونکە پارتی و بارزانی کارێکیان کرد، بۆ بچووکترین پێویستی پشت بە ئێران ببەستن و بەتەواوەتی بکەونە کۆشیانەوە. تەنانەت شای ئێران لە چاوپێکەوتنێک لەگەڵ کیسنجەردا دەڵێت: بارزانی پەیمانی پێ داوین، بەبێ ڕەزامەندیی ئێمە بەهیچ کارێک هەڵنەستێت.[11]

پارتی و بارزانی ئەگەر گەرەکیان بوایە، لە چوار ساڵی ئاگربەستدا دەیانتوانی نەخشەیەکی وا دابنێن، لە کاتی ڕێکنەکەوتن و هەڵگیرساندنەوەی شەڕدا، لە کاتی

---

١٠. الحركة التحررية الكوردية وصراع القوى الأقليمية والدولية ١٩٥٨-١٩٧٥، أيوب بارزاني، دار النشر حقائق المشرق-جنيف، الجزء الثاني، ص ٤٧٠.

١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥٠.

بەستنی هاوکاری و کۆمەک و پشتیوانی دەرەکیدا، ئاوەها لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا وەکوو بەفری بەر هەتاو نەتوێنەوە.

بەجیا لە هەر شیکارییەکی چینایەتی بۆ ئەو حیزب و بزووتنەوە و ڕابەرایەتییە، گەورەترین کێشەی ئەو بزووتنەوەیە ئەوە بوو کە بارزانی بە تەنها و تاکلایەنە بڕیاری ئەدا[١٢] و سەرکردایەتیی پارتی مەگەر زۆر بە کەمی نەبێت، خاوەنی ڕا و بڕیار نەبوو.

ئەو بزووتنەوەیە ئەوەندە وەخت و ئیمکانیاتی ماڵی و چەکوچۆڵی لە بەردەستدا بوو کە بتوانێت سوپایەکی پڕ مەشق و تۆکمە پێکەوە بنێت و لە کاتی هەڵگیرساندنەوەی شەڕدا توانای مانەوە و خۆڕاگری هەبێت.

ئەو بزووتنەوەیە ئەوەندە پارە و پووڵی لەژێر چنگدا بوو کە بتوانێت پرۆژەی گەورەی پێ دابمەزرێنێت و ببێتە سەرچاوەیەکی سابتی بەدەستهێنانی داهات و ئیمکانیاتی ماڵی بۆ بەڕێوەبردنی پێویستییەکان و خەرجیی بزووتنەوەکە.

وەلێ بە پێچەوانەوە، پارتی و بارزانی لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا نەک هەر هاوئاهەنگیی ڕیزەکانی خۆیانیان نەپاراست، بەڵکە بەهۆی هەڵاواردنی نێوان بارەگای بارزانی و باقی سەرکردایەتیی، تەواوی سەرکردایەتی و بەرپرسان لەگەڵ ئەندامان و پێشمەرگەی ئاسایی، هەڵاواردن لە نێوان خێڵی بارزان و خێڵەکانی دیکە لە ماف و دەسەڵات و ئاستی زیندەگییاندا، بووە هۆی بێئومێدی و دڵساردیی خەڵکێکی ئێجگار زۆر لەو بزووتنەوە و ڕابەرایەتییە. ئەم ڕابەرایەتییە لە بری سیاسەتی پشتبەخۆبەستن و خۆتەیارکردن بۆ ڕۆژێک کە دەرگا و دەروازەکانیان لێ کڵۆم دەکرێن، کارێکیان کرد کە بەتەواوی بکەونە نێو مستی شای ئێرانەوە. ئەمە لە کاتێکدا چەندین جار ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوانە بە بارزانی گوتراوە، ئەگەری ڕێکەوتنی شا و سەدام لە ئارادایە.

سەدام حوسێن لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٣دا داوای لە بارزانی کرد کە مەسعوودی کوڕی بۆ بەغدا بنێرێ، تاوەکوو پێکەوە دابنیشن و لەسەر هەندێک

١٢. تقييم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها والدروس والعبر المستخلصة منها، الدكتور محمود عثمان، الطبعة الثانية، ١٩٧٧، ص ١٣١.

پرس گفتوگۆ بکەن، بەڵام مەسعوود نەچوو. دوای ئەوەی سەدام لە چوونی مەسعوود بێئومێد دەبێت، خەبەر بۆ بارزانی دەنێرێت و پێی دەڵێت: با هەڵوێستەکانتان وامان لێ نەکەن، نیوەی شەتول عەرەب و هەندێک ناوچەی دیکە بدەین بە ئێران، لە بەرامبەردا ئێران وازتان لێ بهێنێت و کۆمەکتان لێ ببڕێت.[13]

سەدام حوسێن لە دواکۆبوونەوەی خۆی لەگەڵ ئیدریس بارزانیدا داوا دەکات، با بێن بەشداری لە کەرکووک و نەوتەکەیدا بکەن. بەڵام ئیدریس ڕازی نابێت و پێی دەڵێت: ئێمە لەوە بەهێزترین کە ئێوە چاوەڕێی دەکەن، ئێمە ناچارتان دەکەین، هەموو خواستەکانمان بۆ جێبەجێ بکەن. سەدام لە وەڵامدا ئەڵێت: ئەگەر شەڕ هەڵگیرسایەوە، ئەوا ئێمە براوە دەبین. ئەگەر زانیمان لە نێوانی دوو بژاردە داین: لەدەستدانی عێراق یان شەتول عەرەب، ئەوا واز لە شەتول عەرەب دەهێنین، بۆ ئەوەی عێراق بەو شێوەیە بمێنێتەوە کە ئێمە دەمانەوێت.[14]

شای ئێران تا ئەو جێگایە پاڵپشتیی بزووتنەوەی پارتی و بارزانی دەکات کە وەک هۆیەکی فشار بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی لە هەمبەر حکوومەتی عێراقیدا بەکاری بەرێت، بە تایبەتی ئەو لەوە دڵنیایە، بە هۆی بارزانی مستەفاوە هەموو شتێک لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدایە. بۆیە لە کۆبوونەوەیەکی نێوان شا و سەرۆکی ئەمەریکی نیکسۆن و کیسینجەردا، شا دەڵێت: ئێمە ناهێڵین بەعسییەکان و کوردەکان و شیووعییەکان بگەنە ڕێکەوتن ... ئێمە ڕێگە نادەین.[15]

سەرەنجام لە ڕێکەوتی ١٩٧٤/٣/١١دا پەیوەندیی نێوان حکوومەتی بەعس و پارتی و بارزانی پچڕا و کۆتایی پێ هات. شەڕ دەستی پێ کردەوە و نزیکەی ساڵێکی خایاند. لە سەرەتادا هێزەکانی سوپای عێراقی هێزی پێشمەرگەی پارتییان ماندوو کرد، بەڵام بە کۆمەک و پشتیوانی شا، توانییان خۆیان بگرنەوە. چونکە شای ئێران هێشتا پێویستی بەو شەڕە هەیە و تا ئەو دەمەی خێری بۆ ئەداتەوە و بە ئامانجەکانی خۆی دەگات، دەبێت دەستی پێوە بگرێت.حکوومەتی بەعس هەر

---

١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠.

١٤. الحركة التحررية الكوردية وصراع القوى الأقليمية والدولية ١٩٥٨-١٩٧٥، أيوب بارزاني، دار النشر حقائق المشرق-جنيف، الجزء الثاني، ص ٥٠٩.

١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٤٨.

وەکوو زووتر بە بارزانی گوتبوو: ئەگەر دەست بەشەڕ بکەنەوە، ساڵێک شەڕتان لەگەڵدا دەکەم، ئەگەر نەمتوانی بەسەرتاندا زاڵ بم، ئەوا لەگەڵ ئێراندا ڕێک دەکەوم.[16]

سەرەنجام لە ڕێکەوتی ١٩٧٥/٣/٦ ڕێکەوتنی جەزائیر مۆر کرا. بەپێی ئەو ڕێکەوتنە، عێراق نیوەی شەتول عەرەب و هەندێک ناوچەی دیکە بە شای ئێران ئەدات و لەبەرامبەردا شا واز لە هاوکاری و پشتیوانیی بزووتنەوەی پارتی و بارزانی دەهێنێت و دەروازەکانی سنووریان لەسەر دادەخات.

بۆ ئەم مەسەلەیە، شای ئێران پێشتر نەک هەر ڕاوێژی بە بارزانی نەکرد، بەڵکە لە نزیکبوونەوەی خۆی و حکوومەتی عێراقی و نیاز و هەنگاوەکانیشی ئاگاداری نەکردبووەوە. بارزانیش وەکوو هەر کەسێکی دیکەی ئاسایی نێو کۆمەڵ لە دەستگاکانی ڕاگەیاندنی جیهانییەوە گوێبیستی ئەو ڕێکەوتنە بوو.

بارزانی بۆ دیدەنی شا چوو بۆ ئێران، لە تاران چاوەڕێی کرد، هەتا لە جەزائیر گەڕایەوە. لە ١٢ی ئەو مانگەدا بارزانی و دکتۆر مەحموود عوسمان و موحسین دزەییان بۆ لای شا برد. سەرەتا بارزانی وەکوو نەریتی گشت جارێکی، دەستی شای ماچ کرد و دانیشت. پاشان شا باسی ڕێکەوتنەکەی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی عێراق بۆ بارزانی و یاوەرەکانی کرد و وتی: بەپێی ئەو ڕێکەوتنە ئیدی من ناتوانم هیچ کۆمەکێکتان بکەم. ئێستا ئێوە سێ بژاردەتان لە بەردەمدایە: یەکەم، دێنە ئێرانەوە، ئەوا وەکوو هاوڵاتی ئێران ڕەفتارتان لەگەڵدا دەکەین. دووەم، دەچنەوە و خۆتان ڕادەستی عێراق دەکەنەوە، بەڵێنم لە سەدام وەرگرتووە، کەستان نەکوژێت. سێیەم، درێژە بەشەڕ ئەدەن، ئەوە ئارەزووی خۆتانە، بەڵام من سنوورتان لەسەر دائەخەم و هیچ کۆمەکێکتان ناکەم.

پاشان ویستی ڕای بارزانی وەربگرێت و بزانێت پەرچەکرداری ئەو چییە و بە نیازی چییە. بارزانی وتی: ئێمە میللەتی تۆین، مادام تۆ لە ڕێکەوتنەکە ڕازیت و قازانجی ئێرانی تێدایە، کە دایکی ئێمەشە، ئێمە هیچ قسەیەکمان لەسەری نییە. ئێمە

---

١٦. لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، نەوشیروان مستەفا ئەمین، ساڵی ١٩٩٧، ل ٢٩.

لەژێر فەرمانی ئێوە داین، بڵێ: بمرن! ئەمرین و بڵێ: بژین! ئەژین. ئێمە دڵسۆزی ئێوە بووین و دڵسۆزی ئێوەین و دڵسۆزی ئێوە دەمێنینەوە.[17]

دوای ئەوە بارزانی لە ڕێکەوتی ١٩٧٥/٣/١٣دا گەیشتەوە کوردستان و کۆبوونەوەی بە مەکتەبی سیاسی و بەشێک لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و فەرماندەکان کرد، بەڵام پێش ئەوەی کۆبوونەوەکان بگەنە کۆتایی، لە ڕێکەوتی ١٩٧٥/٣/١٩دا برووسکە بۆ هێزەکان کرا کە شۆڕش و بەرگری کۆتاییان پێ هات و هەرچی چەکی قورس هەیە، داغانی بکەن.[18] ئیدی هەر کەسە ئازادە دەچێتە ئێرانەوە و وەکوو پەنابەر ڕوو لەوێ دەکات، یان ئەڕواتەوە و خۆی ڕادەستی دەوڵەتی عێراق دەکاتەوە.

واتە، بژاردەی سێیەم کە شا خستییە بەردەمی بارزانی، بارزانی نەیخستە بەردەمی حیزب و جەماوەرەکەی!

لەملا و ئەولا دەنگی بەرگری و بەردەوامی بەرز بووەوە، وەلێ بارزانی ڕێگەی پێ نەدا و هەڕەشەی لێ کرد و بەری پێ گرت.[19]

دکتۆر مەحموود عوسمان دەیگێڕێتەوە و ئەڵێت: بیانووی بارزانی بۆ ڕاگرتنی شەڕ و چۆڵکردنی مەیدانەکە ئەوە بوو کە گوایە: پیلانێکی نێودەوڵەتی لەبەرامبەر کورد لە ئارادایە، بەڵام بەهیچ شێوەیەک ئەوە وا نەبوو.[20]

زۆر هەوڵ درا بارزانی بەوە ڕازی بکرێت کە لە شەڕ و بەرگری بەردەوام بێت و ئەو خەڵکە بە زەلیلی نەخاتە بەر دەستوپێی حکوومەتی دڕندەی بەعس، لە کاتێکدا

---

١٧. تقييم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها والدروس والعبر المستخلصة منها، الدكتور محمود عثمان، الطبعة الثانية، ١٩٧٧، ص ١٠٤. لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، نەوشیروان مستەفا ئەمین، ساڵی ١٩٩٧، ل ٢٩. الحركة التحررية الكوردية وصراع القوى الأقليمية والدولية ١٩٥٨-١٩٧٥، أيوب بارزاني، دار النشر حقائق المشرق-جنيف، الجزء الثاني، ص ٥٠٤.

١٨. تقييم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها والدروس والعبر المستخلصة منها، الدكتور محمود عثمان، الطبعة الثانية، ١٩٧٧، ص ١٣٢.

١٩. الحركة التحررية الكوردية وصراع القوى الأقليمية والدولية ١٩٥٨-١٩٧٥، أيوب بارزاني، دار النشر حقائق المشرق-جنيف، الجزء الثاني، ص ٥٤٨-٥٤٩. چۆن چەپکێک و کام مێژووی کۆمەڵە؟! مەلا بەختیار، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانە: دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، ساڵی ٢٠١٢، ل ١٣٢.

٢٠. تقييم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها والدروس والعبر المستخلصة منها، الدكتور محمود عثمان، الطبعة الثانية، ١٩٧٧، ص ٦٦.

ئەگەری ئەوە زۆر بوو، لەپاش چەند مانگێک لە بەرگری، حکوومەتی عێراق ئامادەی ڕێکەوتن بێت لەگەڵیاندا.عیسمەت شەریف وانلی نامەی بۆ بارزانی نارد و تکای لێ کرد، بەڵام بێسوود بوو.[21] جەلال تاڵەبانی دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: لەپێش کۆتاییهاتنی بزووتنەوەی کوردی، لە بەیرووت چاوم بە پریماکۆڤ کەوت، داوای لێم کرد کە لە بەرگری بەردەوام بین و تەسلیمی خواستەکانی شا نەبین. هەروەها وتی: ئەگەر بزووتنەوەی کوردی خۆی ڕادەست بکاتەوە، ئەوا خۆی شایەدی لەسەر خۆی ئەدات کە پاشکۆ و بەکرێگیراوە. ئەگەر لە بەرگری و بەرخۆدان بەردەوام بێت، ئەوا دەتوانین لە نێوان بزووتنەوەی کوردی و بەغدادا نێوەندگیری بکەین و بڵێین، ئەوانە سەر بە ئێران نین، بەڵکوو بزووتنەوەیەکی کوردین. لەو بارەیەوە نامەیەکم بۆ بارەگای بارزانی نووسی، بەڵام ئەوان لە وەڵامدا وتیان، تۆ واز لەو کارە بهێنە، چونکە ئەوانە ئەیانەوێت فریومان بدەن.[22]

سەرەنجام بارزانی لە ڕێکەوتی ١٩٧٥/٣/٢٥دا بەسواری ئۆتۆمبیلێکی ڕانجرۆڤەر و بە یاوەریی پاسەوانەکانی بۆ دواجار و بۆ هەمیشە کوردستانی بەجێ هێشت[23] و بە قەڵەمبازێک خۆی گەیاندە نێو خاکی ئێرانەوە.

لە کاتێکدا دکتۆر مەحموود عوسمان ئەڵێت، ئیمکانی بەرگری هەبوو، چونکە هێزێکی چەکداری ڕێکخراوی ٦٠ هەزار کەسی و هەزاران چەکداری دیکەی میلیشیایی لەژێر فەرمانی بارزانیدا بوون. ١٥ ملیۆن فیشەکی تفەنگ و ڕەشاش و هەزارەها گولەتۆپی هاوەن و مووشەکی بازۆکا لەژێر دەستدا بوون. بە دەیان ملیۆن دۆلاریش لە خەزێنەی "شۆڕش"دا بوون.[24]

---

٢١. الحركة التحررية الكوردية وصراع القوى الأقليمية والدولية ١٩٥٨-١٩٧٥، أيوب بارزاني، دار النشر حقائق المشرق-جنيف، الجزء الثاني، ص ٤٦٨.

٢٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣٧.

٢٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥١.

٢٤. تقييم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها والدروس والعبر المستخلصة منها، الدكتور محمود عثمان، الطبعة الثانية، ١٩٧٧، ص ٧٥.

کاتێک بارزانی ئاودیوی ئێران بوو، نزیکەی ٧٠ ملیۆن دۆلار لە خەزێنەی "شۆڕش" (کە هەر لە ماڵەکەی خۆیدا بوو)دا هەبوو، لەگەڵ خۆیدا ئاودیوی کرد.[٢٥]

سەرباری ئەو هەموو هەڵوێست و بەرخوردە نێگەتیڤانەی کە شای ئێران لە بەرامبەر بارزانی و بزووتنەوەکەیدا نواندی، کەچی بارزانی لە چاوپێکەتنەکانی لەگەڵ ڕۆژنامە ئێرانییەکاندا هەمیشە مەدح و سەنای شا و دەوڵەتی ئێرانی دەکرد و ڕەزامەندیی خۆی بۆ پەیماننامەی جەزائیر پیشان ئەدا و ئەوەی ڕادەگەیاند، کاری ئەو تەواو بوو! لە کاتێکدا بارزانی هیچ زۆرێکی لەسەر نەبوو و ئەو جۆرە قسانە زیادە و نا پێویست بوون.[٢٦]

شەهید ئارام (شاسوار جەلال) ساڵێک لەدوای ئەو شکستە، هەڵسەنگاندنێک بۆ ئەو ڕووداوە دەکات و دەڵێت: "زۆربەی خەڵکی لەو باوەڕەدان کە تاکە هۆی کاریگەر و بنچینەیی ئاشبەتاڵ، ڕێکەوتنەکەی نێوان عێراق و ئێران بوو. ڕاستە ئەو ڕێکەوتنە دواپاڵ بوو بە بزووتنەوەکەوە نرا و بەرەو هەڵدێری هەزاربەهەزاری برد. واتە، ئەو پاڵە دەوری عامیلی کاریگەری دی، بەڵام ئەو پاڵە بەهیچ جۆرێک تاکە هۆ و هۆی بنچینەیی ئاشبەتاڵ نەبوو، بەڵکوو گەلێک هۆی بنچینەیی و گرنگ پێش ئەو ڕێکەوتنە لەسەر یەک کەڵەکە ببوون و تا دەهات زیاتر ناوجەرگی بزووتنەوەکەی ئەخوارد و پووچی ئەکردەوە.

ڕێکەوتنەکەی ئێران و عێراق تەنیا ئەو کاتە ئەتوانێت دەوری کاریگەر ببینێت کە ئەو هۆ بنچینەیی و گرنگ و کاریگەرانە دەوری تەواوی خۆیان دیبوو و وایان لە بزووتنەوەکە کردبوو کە تەنیا قاوغێکی بەتاڵی زەبەلاحی لێ مابووەوە و بۆ ڕووخاندنی تەنها پاڵێکی وەکوو ڕێکەوتنەکەی ئێران و عێراقی بەس بوو."[٢٧]

ئەو ڕووداوانە گشت بەخێرایی لە مانگی ئازاردا ڕوویان دا.

---

٢٥. الحركة التحررية الكوردية وصراع القوى الأقليمية والدولية ١٩٥٨-١٩٧٥، أيوب بارزاني، دار النشر حقائق المشرق-جنيف، الجزء الثاني، ص ٥٢٢، ٥١٦.

٢٦. تقييم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها والدروس والعبر المستخلصة منها، الدكتور محمود عثمان، الطبعة الثانية، ١٩٧٧، ص ١٠٦.

٢٧. هەڵبژاردەیەک لە نووسینەکانی شەهید ئارام، بەشی یەکەم، کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان-عێراق، نووسینگەی ڕاگەیاندن، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، کانوونی دووەم ١٩٨٠، ل ١٥.

دێتەوە یادم، ئەو دەمە من پۆلی دووەمی ناوەندی بووم، لە گۆڕەپانی خوێندنگاکە لەگەڵ هاوپۆلێکم پیاسەمان دەکرد، ڕووی لێم کرد و وتی: ئەزانی شۆڕش تەوایەوە و هەموو شتێک تەواو بوو؟! وتم: نەخێر! چۆن، ئەوە بەڕاستە؟ وتی: بەڵێ، ئەوە هەمووی وا تەسلیم ئەبێتەوە!

ڕۆژگارێکی ئێجگار ناخۆش بوو، هەوری ماتەم ئاسمانی کوردستانی بەتەواوەتی گرتبوو، هەر کەسێکت بگرتایە وەکوو ئەوە وا بوو، حەوت کەسی لێ مردبێت. هەتا ماوەیەکی زۆر تەلەفزیۆنەکانی عێراق ڕیزی دووروودرێژی پێشمەرگەی پیشان ئەدا، چەکەکانیان ڕادەست دەکرد و دەچوونە کەنارەوە. دێتەوە بیرم، بۆ هەر تفەنگێک ٥٠ دیناریان دەبەخشی. هی وا هەبوو چەکەکەی ئەشکاند، یان فڕێی ئەدایە نێو گۆمێک، زێیەکەوە، هی واش هەبوو بێجگە لە تفەنگەکەی خۆی، چەند تفەنگێکی دیکەیشی پەیدا ئەکرد و پارەی پێ وەرئەگرت. تا وای لێ هات، چەکیان لەو کوردستانەدا بڕی، بە جۆرێک، کاتێک یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بزووتنەوەی چەکداری دەست پێ کردەوە، بۆ چەکێک بە حەوادا دەچوو.

حکوومەتی بەعس هەستی بە سەرکەوتنێکی ئێجگار گەورە دەکرد. ناحەقیشی نەبوو! ئاخر کەم نییە، دەیان هەزار چەکدار لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا بەبێ شەڕ و شکان، لوولەی چەکەکانیان شۆڕ بکەنەوە و لەبەر دەست و پێتدا بە زەلیلی و بە کلۆلی بکەون.

کاتی خۆی لە ڕێکخستن کاسێتێکی مام جەلالمان بۆ هات، باسی ئەو ڕووداوەی ئەکرد کە چۆن ئەبێ ئەو ژمارە زۆرە بە خۆیان و چەکەکانیانەوە خۆیان ڕادەستی حکوومەتی بەعس بکەنەوە، ئاخر ئەگەر دەیان هەزار چەکدار نا، دەیان هەزار کەڵەشێر بەرەڵای ئەو شاخ و کێوانە بکەیت، حکوومەتی عێراق چەندین مانگی ئەوێت، هەتاوەکوو دەیانگرێتەوە!

سەرەنجام ئەوانەیان لە خزمەتی سەربازی بەخشی و لە پەروەندەکەیاندا نووسییان: ئەوانەی بۆ ڕیزی نیشتمان گەڕانەوە و پێیان دەگوترا: عائیدوون!

# کۆمەڵە

کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان (کۆڕەک) وەک ڕێکخراوێکی چەپ و مارکسی لە ساڵانی حەفتاکان و نیوەی یەکەمی ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو نەخش و ڕۆڵی بەرچاو و کاریگەری لە بزاوتی چەپ و مارکسیستی لە کوردستانی عێراقدا گێڕا و توانی سەرنجی زۆرێک لە کرێکاران، زەحمەتکێشانی شار و لادێ، لاوان، خوێندەواران و ڕۆشنبیران بۆ خۆی ڕابکێشێ و فەزای کۆمەڵگا بەرەو چەپ وەرچەرخێنێ و خۆشی بە هۆی قارەمانێتیی ئەندامەکانی لەڕاست ئەشکەنجەی نێو زیندانەکانی بەعس و لەبن پەتی قەنارە و گیانبازیی پارتیزانەکانی، خۆشناو و جێ متمانە بوو. ڕاستییەکەی ئەو دەمە لەنێو ڕای گشتیی خەڵکیدا مارکسیبوون شانازی بوو.

کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان کەی، لە کوێ و کێ دایمەزراند؟ زەوینەی پەیدابوون و سەرهەڵدانی چی بوون؟ ئەو ناوانەی لە درێژەی عومری ئەم ڕێکخراوەدا بە خۆیەوە بینی، چی بوون و بۆچی؟ ئەو قۆناغانەی ئەم ڕێکخراوە پێیدا گوزەری کرد، هەتا دەگاتە ئەو دەمەی حەل کرا، چی بوون؟ ...هتد. ئەمانە کۆمەڵە پرسیار و پرسێکن قسەوباس، چاوپێکەوتن و نووسینی جۆراوجۆر و وەک یەک و دژبەیەکی لەسەر هەیە، کە دیارە سەرباری لەبیرچوونەوە و نەبوونی دۆکیۆمێنت، مەرامی سیاسی و بەرژەوەندی و هەوا و هەوەسیش دەستی خستووەتە نێویانەوە. ڕوونکردنەوە و بەدواداچوونی ئەم پرسانەش ئەرکی ئەم نووسینەی ئێمە نییە، مەگەر بە شێوەی چاوخشانێکی خێرا نەبێت.

ساڵانی شێستەکانی سەدەی بووری، ساڵانی کڵپەسەندنی ناڕەزایەتییەکان و ڕاپەڕین و شۆڕشەکان بوو لە دنیادا کە سازمان و پارتگەلی چەپ و 'کۆمۆنیستی' ڕابەرایەتی و ڕێنوێنییان دەکردن، لەوانە شۆڕشی ڤێتنام، کۆریا، کووبا کەمبۆدیا، لاوس، هەروەها شۆڕشی فەلەستین و شۆڕشی فەرهەنگیی چین، دواتریش مەرگی ئەفسانەیی گیڤارا لە ساڵی ١٩٦٧ و پاشان شۆڕشی لاوان لە ساڵی ١٩٦٨ کە بەتەواوی سیستەم و دەسەڵاتی سەرمایەداریی ئەورووپا و بە تایبەتی وڵاتی فەرەنسای هێنایە لەرزین.

ئەمانە گشت فەزای دنیایان بەرەو چەپ وەرگێڕا و مارکسیزم و کۆمۆنیزمیان کردە دیاردەیەکی خۆشناو کە لە پێناوی ڕزگاریی کرێکاران، جووتیارانی هەژار، زەحمەتکێشان، گەلانی بندەست، بەرابەریی ژنان لەگەڵ پیاوان و ئازادیی مرۆڤ بە گشتی تێ دەکۆشن.

ئەو هەلومەرجە نوێ جیهانییە کاریگەرییەکەی بە جۆرێک بوو کە تەنانەت گەلێک لە بزووتنەوە میللی و پارتە بۆرژواییەکانیش خۆیان ئاوێزانی مارکسیزم و کۆمۆنیزم بکەن و بیکەنە ئاڵا و پەرچەمی تێکۆشانیان.

ئەم بارودۆخە کوردستانی عێراقیشی گرتەوە.

چینی کرێکار لە عێراق و کوردستانیش لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەوە سەری هەڵدابوو. پاشان بەهۆی ڕیفۆرمی زەوییەوە کە لە ساڵەکانی دوای کوودەتای ١٩٥٨دەستی پێ کرد و لە ساڵی ١٩٧٠دا تەواو کرا، جووتیاران لە زەویوزارەکانیان دەستکۆتا کران و بەلێشاو ڕوو لە شار و بازاڕەکانی کار ئەکەن. ئەم پرۆسەیە وای کرد، پەیوەندییەکانی سەرمایەداری زاڵ بێت و ناکۆکیی سەرەکی خۆی لە ناکۆکیی نێوان کار و سەرمایەدا بەرجەستە بکاتەوە و چینی کرێکار بە وێنەی چینێکی کامڵ و بەرچاو بێتە کایەوە و مانگرتن و ناڕەزایەتییەکانیشیان ببێتە جێگەی سەرنج و بایەخ.

لەو دەمەدا لە کوردستان پارتی دیموکراتی کوردستان بە هەردوو باڵەکەیەوە واتە، باڵی سەرکردایەتیی بارزانی ناسراو بە مەلایی و باڵی مەکتەبی سیاسی ناسراو بە جەلالی، حیزبی شیوعیی عێراقی بە هەردوو باڵەکەیەوە، واتە: باڵی لیژنەی مەرکەزی سەر بە بلۆکی سۆڤیەت و باڵی قیادەی مەرکەزی سەر بە بلۆکی چین لە کوردستاندا هەبوون.

ئەو بارودۆخە نوێ جیهانییە بە هاوشانی ئەو ئاڵوگۆڕەی لە پەیوندییەکانی بەرهەمهێنان و ناکۆکی و ململانێی چینایەتیدا هاتە کایەوە، کاریگەری لەسەر کۆمەڵێک لاوی خوێندەوار و ڕۆشنبیری ئەو دەمە کە چالاک و هەڵسووڕاوی سیاسیی نێو پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی مەکتەبی سیاسی و بە تایبەتی لق و ناوچەی سلێمانی و هەندێک لە خوێندکارانی کورد لە زانکۆی بەغدا دانا.[٢٨]

---

٢٨. فوئاد قەرەداغی، مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، بەشی دووەم و کۆتایی، سازدانی: کەمال ڕەئووف، هاوڵاتی، ژمارە ٤١٢، ٢٠٠٨/٤/٩، ل ٤.

ئەم کۆمەڵە کەسە بۆخۆیان لەو حیزبە و لە شێوازی کارکردنی بێزار و ناڕازی و بە ڕەخنە بوون و بە جۆرێک دژایەتیی سیاسەتەکانیان دەکرد. کۆمیتەی ناوەندیی حیزبەکەشیان خۆشیی بەمان نەدەهات و ڕێبازی ماوییانەی ئەمانی قبووڵ نەبوو.[29]

ئەم کۆمەڵە خەڵکە لە حیزبەکەیان بێئومێد بوون و پێیان وا بوو ڕزگاریی کورد بەو حیزبە تەقلیدییەی کە هەیانە وەدی نایات و ئەو حیزبە ناتوانێت سەرکردایەتیی "بزووتنەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی کوردستان" بکات. بە تایبەتی ئەو حیزبە خۆی داوەتە پاڵ حکوومەتی عێراقی کە حکوومەتێکی هار و دڕی دژ بە مافەکانی گەلی کوردە و ماف و ئازادیی گەلی کورد لەلای ئەو دیل و بارمتەیە و خەبات لە پێناوی مافەکانی گەلی کورد هیچ مانا و ناوکێکی نییە.

لە بەرامبەریشدا باڵەکەی دیکەی پارتییە، کە چەندین ساڵ بوو ئەمان لەگەڵیاندا ناکۆک بوون و سەرەنجام حیزبەکەیان لەگەڵیان کەرت کرد و چەندین ساڵیشە شەڕی خوێناوییان لەگەڵیاندا هەیە.

ئەم کۆمەڵە کەسە ئەم باڵەیان بەتوندی ڕەت دەکردەوە و سەرکردایەتیی بارزانییان بە خێڵەکی و خۆسەپێن و پاشکەوتوو و گرێدراوی شای ئێران و ساواک و ئیسرائیل و ئەمەریکا دەدایە قەڵەم و پێیان وابوو دەستکەلا و بەرژەوەندپارێزی ئەوانن و ناتوانن مەسەلەی کورد بە جێیەک بگەیەنن. لەو ساڵانەی دواییشدا کە شۆڕشی گەلانی بندەست هەر وەکوو باسمان کرد، لە گەلێک ناوچەی دنیادا لەژێر هێزی چەپگەرایی و لە بەرەی وڵاتانی بەنێو سۆشیالیستیدا دژی ئیمپریالیزم و چەوسێنەرانی وڵاتان و میللەتان کڵپەی سەندبوو و بەو پێیەش ئەمەریکا ناحەز و ناشیرینی لای گەلانی ژێردەست بوو، ئەوەندەی دی پارتیی باڵی بارزانی لەلای خەڵکانی هۆشیار و خوێندەواری شارییەوە بێزراو و ناحەز بوو.

لەو دەورانەشدا ناکۆکیی نێوان پارتیی باڵی مەکتەبی سیاسی و هەردوو باڵەکەی حیزبی شیوعیی عێراقی (لیژنە و قیادەی مەرکەزی) توندبوونەوەی بە خۆیەوە بینیبوو، چونکە ئەوان پشتگیریی پارتیی باڵی بارزانییان دەکرد[30] و پێشیان وا بوو،

---

٢٩. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپی سێیەم، سلێمانی، ساڵی ١٩٩٨، ل ٩٨. فوئاد قەرەداغی، ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژمارە ٤١١، ٢٠٠٨/٤/٦، ل ٤.

٣٠. هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

ئەم حیزبانە ناتوانن وەڵام بە کێشەی کورد بدەنەوە و بەرامبەر بە کورد و کێشەی میللی لە کوردستاندا هەڵەی زۆریان کردووە و گاڵتەیان بە قەومییەت کردووە.

ئەم کۆمەڵە خەڵکە ئەگەرچی لە سەرەتادا لەژێر کاریگەریی شۆڕشی کوبا و سەرکەوتنەکەیان و پاشان مەرگی ئەفسانەیی ئەرنستۆ گیڤارادا بوون، بەڵام وردە وردە کەوتنە ژێر کاریگەریی شۆڕشی چین و ماو تسیتۆنگەوە.[31]بە تایبەتی لەدوای ئەوەی کۆمەڵێک لە تێکۆشەرانی ماویی ئێرانی کە لە حیزبی توودەی ئێرانی بە ناوی "سازمانی ئینقیلابیی حیزبی توودەی ئێران دەر خارجی کیشوەر" (دواتر ناوەکەیان بوو بە: حیزبی ڕەنجبەرانی ئێران) جوودا ببوونەوە و هاتبوونە شاری سلێمانی و بۆ ماوەیەکی زۆر لە بەکرەجۆ لەپاڵ مەکتەبی سیاسی و لەلای مام جەلال مانەوە و توانییان لەو بارودۆخە ساز و ئامادەیە بۆ وەرگرتنی ئەندێشەی ماو تسیتۆنگ، کاریگەری گەورە لەسەر مام جەلال و بەشێک لە کادرانی پارتی دابنێن.[32]

ئیدی وردە وردە ئەمانە بوون بە بزووتنەوە و باڵ و فراکسیۆنێکی نێو پارتیی باڵی مەکتەبی سیاسی و لەنێو گرووپ و ئەڵقەی ڕۆشنبیریدا خۆیان ساز دا و کەوتنە گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەی نووسراوەکانی ماو.

لەو سەروبەندەدا پێویستیی هاتنەکایەوەی بڵاوکراوەیەک کە گوزارشت لەو ڕەوتە بکات و وەڵام بە کێشە تیۆرییەکانی بداتەوە هاتە کایەوە. هەر بۆیە لە ساڵی ١٩٦٩دا گۆڤاری ڕزگاری وەک ئاڵای ئەو ڕەوتە پەیدا بوو.

هەفتەنامەی ڕزگاری ناوەکەی مام جەلال هەڵی بژاردبوو، خاوەنی ئیمتیازەکەی نەوشیروان مستەفا و سەرنووسەرەکەی شازاد سائیب بوو.[33]ئەم گۆڤارە ١٣ ژمارەی لێ دەرکرا و ڕۆڵی گەورەی لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ و دنیابینیی ماو تسیتۆنگ گێڕا و هەموو ئەندامە ماوییەکانی نێو پارتی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و هەر بەو پێیەش بە گۆڤاری ماوییەکان ناوی دەرکرد.ئەوەی شایانی گوتنە، کتێبە

---

٣١. ئاسۆی شێخ نووری شێخ ساڵح، کوردستانی نوێ، ٢٠١١/١٢/٨.

٣٢. فوئاد قەرەداغی، گۆڤاری سڤیل، ژمارە ٢٠٨، ٢٠١٣/١١/٣٠. نەوشیروان مستەفا ئەمین، گۆڤاری گولان، ژمارە ٧٠٧.

٣٣. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپی سێیەم، سلێمانی، ساڵی ١٩٩٨، ل ٩٧.

سوورەکەی "ماو تسیتۆنگ"یش بە نێوی چەپکێک لە وتەکانی ماو هەر لەو زەمانەدا و لەو چاپخانەیەی کە گۆڤاری ڕزگاری لێ چاپ دەکرا، بە چاپ گەییشت.[٣٤]

ئەم کتێبە نەوشیروان مستەفا لە زمانی عەرەبییەوە کردبووی بە کوردی و کاریگەرییەکی گەورەی لەو دەمە و لە سالآنی دوای دامەزراندنی کۆمەڵەش بەجێ هێشت. ئەم گۆڤارە هەتاوەکوو دەرچوونی بەیانی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ بەردەوام دەبێت و پاشان لەسەر داوای پارتی و بارزانی دادەخرێت.[٣٥]

هەر بۆ وەلآمدانەوە و پڕکردنەوەی پێویستییە فکرییەکانی ئەم ڕەوتە، بێجگە لەوەی بەشێک لە هەڵسووڕاوانی ئەم ڕەوتە هاتوچۆی سەفارەتەکانی چین و کۆریا دەکەن و نووسراوەکانی ماو و کیم ئیل سۆنگیان لەوێ بە خۆڕایی دەست دەکەوت، کتێبخانەی ئەلفکرول جەدید (بیری نوێ)یشیان لە شاری بەغدا کردەوە.

ئەم کتێبخانەیە لەلایەن مام جەلالەوە دامەزرا و مۆڵەتەکەی بە نێوی دارای شێخ نووری شێخ ساڵحەوە بوو، وەلێ خاڵە شەهاب (شەهابی شێخ نووری شێخ ساڵح) و کەسانی سەر بە "سازمانی ئینقیلابی حیزبی توودەی ئێران دەر خارجی کیشوەر" بەڕێوەیان دەبرد. ئەم کتێبخانەیە سەرباری ئەوەی کتێب و نامیلکەی چەپ و مارکسی و ماوی تێدا دەست دەکەوت و هەر لەوێشەوە بۆ شارەکانی سلێمانی، کەرکووک و هەولێر دەبران، شوێنی کۆبوونەوە و بەیەکگەییشتنی ئێوارانی ئەو ڕەوتە و گفتوگۆ و جەدەلیان بوو.[٣٦]

هەر لە درێژەی کار و هەڵسووڕانی ئەم ڕەوتەدا، گەلێک جار مام جەلال لە بارەگای گۆڤاری ڕزگاری لە شاری سلێمانی[٣٧] و لە بارەگای مەکتەبی سیاسیی پارتی لە شەقامی فەلەستینی شاری بەغدا سیمیناری بۆ لایەنگران و هەوادارانی

---

٣٤. ئاسۆی شێخ نووری شێخ ساڵح، کوردستانی نوێ، ٢٠١١/١٢/٨.

٣٥. نەوشیروان مستەفا ئەمین، گۆڤاری گوڵان، ژمارە ٧٠٧. فوئاد قەرەداغی، مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی-لینینی، بەشی یەکەم، هاوڵاتی، ژمارە ٤١١، ٢٠١١/٤/٦. ڕەفعەتی مەلا (محەمەد ڕەفعەت عەبدولڕەحمان) نهێنییەکانی ژیانی نەوشیروان مستەفا، گۆڤاری جیهان. حاجی مەمۆ (عەباس محەمەد حوسێن)، گۆڤاری سڤیل، ١٧ی نیسانی ساڵی ٢٠١١، ل ٣.

٣٦. کۆمەڵە و یەکێتی، عارف کەریم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ل٣٢. ئاسۆی شێخ نووری شێخ ساڵح، کوردستانی نوێ، ٢٠١١/١٢/٨.

٣٧. ڕەفعەتی مەلا، نهێنییەکانی ژیانی نەوشیروان مستەفا، گۆڤاری جیهان.

بیری ماو دەگرت و وانەی تێدا دەگوتەوە[38] و کاریگەری گەورەی لە ڕۆشنکردنەوە و بڵاوکردنەوەی ئەو دیدگا و تێڕوانینەدا هەبوو.

ئەم ڕەوتە بەو جۆرە و بەشێنەیی ڕێگای خۆی گرتبووە بەر و خەریکی مشتومالی خۆی بوو و خۆشخەیاڵی ئەوە بوو کە دەتوانن بەو ئاراستەیەدا حیزبەکەیان بگۆڕن و بیکەنە حیزبی دید و دڵخوازی خۆیان،[39] وەلێ تا ئەو دەمە بە هۆی پشتگیری نەکردنی مەکتەبی سیاسیی حیزبەکەیانەوە، لەو کارەدا سەرکەوتوو نەبوون.[40] لەدوای ئەوەش ڕێکەوتنی پارتی و بارزانی لەگەڵ حکوومەتی عێراق و دەرچوونی بەیانی ١١ی ئازاری بەسەردا هات، کە هەموو کارەکانی ئەوانی تێک دا و تووشی شۆک و شپرێوی کردن و لە ترسی تۆڵەسەندنەوەی بارزانیش، ژمارەیەکی زۆریان کوردستانیان بەجێ هێشت و لە شاری بەغدا گیرسانەوە.[41]

ئەم ڕێکەوتنە بووە هۆی سەرکەوتنێکی گەورە بۆ پارتیی باڵی مەلایی و خودی بارزانیی مستەفا و شکستێکی گەورەش بۆ پارتیی باڵی جەلالی و خودی مام جەلالیش. هەروەها ئەو ڕێکەوتنە ئەم حیزب و ڕەوتەی تووشی قەیران و بنبەست کرد و لەسەر گەلێک مەسەلە ناکۆکی خستە نێویانەوە. سەرەنجام لەژێر داوا و فشاری بارزانیی مستەفادا نێوی حیزبەکەیان گۆڕی و پاشان حەلیان کرد و تێکەڵ بە پارتی بوونەوە.

بەو شێوەیە هەڵسووڕاوانی ڕەوتی ماوی نێو پارتیی باڵی مەکتەبی سیاسی ڕووبەڕووی هەلومەرجێکی زۆر سەخت و ئاڵۆز بوونەوە. لە لایەکەوە لە شوێن و ڕێگە و جێگەی خۆیان هەڵکەنران و ئاوارە و پەرتەوازەی بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراق بوون و بەو پێیەش پەیوەندییەکانیان هەڵوەشانەوە و گۆڤار و ڕۆژنامە و چاپخانەیەک کە هەیان بوو، لە دەستیان دا. لە لایەکی دیکەوە ئەمانە هێشتا لەگەڵ حیزبێکن کە سەرباری ئەوەی بە فەرمی ئەندامن تیایدا، وەلێ لەگەڵیشیدا ناکۆک و ناتەبان و ڕابەرایەتیی ئەو حیزبە لەگەڵ تێڕوانینی نوێی ئەماندا

---

٣٨. کۆمەڵە و یەکێتی، عارف کەریم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ل ٣٢.

٣٩. فوئاد قەرەداغی، دەربارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، بەشی دووەم، دیمانە: ڕزگار ڕەزا چووچانی، گۆڤاری سڤیل، ژمارە ٢٠٩، ٢٠١٣/١٢/٧.

٤٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤١. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دژە و کۆسپی سەر ڕێی جێبەجێکردنی پێویستییەکانی "بزووتنەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی کوردستان"ن، کە خۆی لە پارتی پێشڕەو، بەرەی گەل، لەشکری ڕزگاریدا دەبینێتەوە. ئەمە سەرباری ئەوەی ئەم حیزبە کەوتە نێو بەرداشی پارتی-بارزانی و حکوومەتی بەعسیشەوە.لەم بارودۆخەدا هەڵسووڕاوانی ئەم ڕەوتە بە گشتی مانەوەی پارتەکەیان بە ڕێگری بەردەم پرۆژەکەی خۆیان دەزانی و کاریان بۆ ئەوە دەکرد، تێکەڵی پارتی-بارزانی ببنەوە و کۆتاییش بە دووبەرەکی و خوێنڕشتن بهێنن، کە سەرەنجام و لە کۆتایی ئەو ساڵەدا هەر واش کرا.[٤٢]

بەو شێوەیە ڕێکەوتنی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ بۆشاییەکی بۆ ئەم ڕەوتە دروست کرد و کاریگەری لەسەر ئەوە دانا، ئەو بۆشاییە بە ڕێکخراوی دڵخوازی خۆیان کە خۆی لە کۆمەڵەی مارکسی لینینیی کوردستان-عێراق ئەندێشەی ماو تسیتۆنگ دەبینییەوە، پڕ بکەنەوە. واتە، ئەو ڕێکەوتنە پەلەی لە پێکهێنانی کۆمەڵەدا کرد.[٤٣]

کۆمەڵە بە دەستپێشکەریی گرووپەکەی خاڵە شەهاب دادەمەزرێت. ڕۆژێکیان لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٠دا خاڵە شەهاب و فازیلی مەلا مەحموود بۆ لای فەرەیدوون عەبدولقادر دەچن کە ئەو دەمە لە وەزارەتی شارەوانی فەرمانبەر دەبێت. لەوێ ئەوان لەسەر ئەوە پێک دێن کە قسەکانیان بۆ کردار بگوێزنەوە و بۆ ئەو مەبەستە ڕێکخراوێکی مارکسی دابمەزرێنن. بیر لەوەش دەکەنەوە، بۆ بەئاکام گەیاندنی کارێکی لەو جۆرە، ئەو کەسانە کێن کە پەیوەندییان پێوە بکەن.[٤٤]

فازڵی مەلا مەحموود بۆ لای مام جەلال ئەچێت و ئەو بابەتەی لەگەڵدا باس دەکات. مام جەلال ئەو تەرحەی پێ پەسەند دەبێت و پێشنیار و ڕێنوێنی خۆیشی دەخاتە ڕوو.

سەلامی خەیات (سەلامی مەلا ئەحمەد گەرمیانی) دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: "فازیلی مەلا مەحموود لە سووریا بە منی گوتووە کە ئەو مام جەلالی کردووە بە کۆمەڵە"[٤٥]

---

٤٢. ڕەفعەتی مەلا، نهێنییەکانی ژیانی نەوشیروان مستەفا، گۆڤاری جیهان.

٤٣. نەوشیروان مستەفا ئەمین، گۆڤاری گوڵان، ژمارە ٧٠٧.

٤٤. فەرەیدوون عەبدولقادر، کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، چاپ: دەستگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٢، ل ٧٩-٨٠.

٤٥. سەلامی خەیات، گفتوگۆ، سازدانی کامەران ئیسحاق پەری، دەزگای شرۆڤە، ١٦ی ئابی ساڵی ٢٠٠٨.

هەروەها فازیلی مەلا مەحموود بۆ لای نەوشیروان مستەفا دەچێت و هەمان باسی لەگەڵدا دەکاتەوە. نەوشیروان لە وەڵامدا دەڵێت: مادام بە مام جەلالتان گوتووە، من بەشداری تێدا ناکەم، چونکە ئەو ئیشی لەگەڵدا ناکرێت.[٤٦] ئەمە بە جیا لەوەی نەوشیروان مستەفا ناوهێنانی ئاشکرای 'مارکسیی لینینی-بیروباوەڕی ماو تسیتۆنگ'ی قبووڵ نەبووە.[٤٧]

بەپێی گێڕانەوەکان فوئاد قەرەداغیش دیسانەوە لەو بارەیەوە لەگەڵ مام جەلال قسەی کردووە، پاشان مام جەلالیش لەگەڵ گشت گرووپەکان قسەی کردووە. هەر وەکوو فوئاد دەڵێت: 'تا سەرەنجام بە هەوڵی مام جەلال نوێنەرانی هەر سێ گرووپەکە بۆ پێکهاتن و نەهێشتنی ساردیی نێوانیان، پێکەوە دانیشتن. لەو کۆبوونەوەیەدا کە لە ماڵی مامۆستا مەحموودی مەلا عیزەت کرا، دوای گفتوگۆ و ڕاز و گلەیی لە یەکتری، لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە پەیوەندییان گەرم بکەنەوە و کارێکی هاوبەش بۆ پێکهێنانی ڕێکخستنێکی مارکسیی لینینی بکەن. بەڵام هەر زوو گرووپی کاک نەوشیروان و مامۆستا مەحموود پەشیمان بوونەوە، چونکە لەلایەک ناوهێنانی ئاشکرای مارکسیی لینینی-بیروباوەڕی ماو تسیتۆنگیان قبووڵ نەبوو، لەلایەکی دیکەوە تێبینییان لەسەر هەڵسووڕاوێکی چالاکی گرووپەکەی شەهید شەهاب هەبوو. جگە لەوانەش پێیان وابوو، دوو گرووپەکەی تر هەر یەک گرووپە و بەبێ ئەمان کاری ڕێکخراوەییان کردووە.'[٤٨]

سەرەنجام دەستەیەک لەو گرووپانەی کە لەسەر ڕۆنانی ڕێکخراوێکی مارکسیی لینینی ڕێک کەوتبوون، یەکەمین کۆبوونەوەی خۆی لە ڕێکەوتی ١٩٧٠/٦/١٠ لە ماڵی فەرەیدوون عەبدولقادر لە گەڕەکی ڕاغیبە خاتوونی شاری بەغدا گرێ دەدات.

لەو کۆبوونەوەیەدا هەر یەکە لە خاڵە شەهاب (شەهابی شێخ نووری شێخ ساڵح)، دلێر سدیق عەبدوڵا (ئەندازیار دلێر سدیق کۆیی)، فازیلی مەلا مەحموود، فوئاد قەرەداغی (فوئاد ئەنوەر عومەر)، فەرەیدوون عەبدولقادر فەرەج و مام جەلال

---

٤٦. فەرەیدوون عەبدولقادر، کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، چاپ: دەستگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٢، ل ٧٩-٨٠ کۆمەڵە و یەکێتی، عارف کەریم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ل٣٩.

٤٧. فوئاد قەرەداغی، مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، بەشی دووەم و کۆتایی، سازدانی: کەمال ڕەئووف، هاوڵاتی، ژمارە ٤١٢، ٢٠٠٨/٤/٩، ل ٤.

٤٨. فوئاد قەرەداغی، مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، بەشی دووەم و کۆتایی، سازدانی: کەمال ڕەئووف، هاوڵاتی، ژمارە ٤١٢، ٢٠٠٨/٤/٩، ل ٤.

بەشداری دەکەن و ئەوە بە کۆبوونەوەی دامەزراندن دێتە ژماردن و ئەوانەی تیایدا بەشدارییان کردووە، بە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە ناو دەبرێن.

لێرەوە دەتوانین بەو ئەنجامگیرییە بگەین کە "سەرلەبەری گێڕانەوەکان، حیکایەتێک لەمەڕ دامەزراندنی کۆمەڵە پووچەڵ دەکەنەوە. ئەو حیکایەتەی لە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەی ڕەنجدەران لە ساڵی ١٩٨٠دا لە مالیمۆس گێڕدرایەوە و وەکوو پرۆسەی دامەزراندنی کۆمەڵە جێگیر کرا. کورتەی حیکایەتەکە ئەوە بوو، کۆبوونەوە و یەکگرتنی سێ گرووپی مارکسیستی: گرووپی مام جەلال، گرووپی شەهید شەهاب و گرووپی نەوشیروان مستەفا لە ساڵی ١٩٧٠دا کۆمەڵەیان دامەزراندووە."[٤٩]

هۆنینەوەی حیکایەتێکی بەو چەشنە بێگومان لە نێوانی سێ کەسدا ناترازێت، ئەوانیش مام جەلال، نەوشیروان مستەفا و فەرەیدوون عەبدولقادرە. ئەم سێ کەسە لەو کۆنفرانسەدا ئامادە بوونە و بەچاکی ئاگادارن، ڕۆنانی کۆمەڵە بەو شێوەیە نەبووە و نەوشیروان مستەفا و گرووپەکەی لە دامەزراندنیدا بەشدارییان نەکردووە، بەڵام ئەو مێژووە دەشێوێنن و بەو جۆرە ناوزەدی دەکەن. خۆ گومانێک لەوەدا نییە کە نەوشیروان مستەفا و کار و هەڵسووڕانەکانی، ڕۆڵی گەورە و گرنگیان لە خۆشکردنی زەمینەی هاتنەکایەوە و دامەزراندنی کۆمەڵەدا گێڕاوە، وەلێ ئەو لە سەروبەندی دامەزراندنی کۆمەڵەدا، ئامادەگی نەبووە و بەشداری تێدا نەکردووە. ئەوان ئەیانتوانی ئاوها باسی ئەو مێژووە بکەن، هەر وەکوو لەڕاستیدا خۆی چۆن بووە.

لێرەدا گشت کەسێک ئەوەی بۆ دەبێتە پرسیار: شێواندنی ئەو مێژووە بۆچی و چ پێویستییەکیان پێی هەبووە؟

بۆ هەر کەسێک لەو دەورانەدا ئاگای لە دۆخی ئەو دەمی کۆمەڵە و فەزای نێوخۆیی ئەو ڕێکخراوە و کێشمەکێشی نێو هێڵەکانی بووبێت، لەوەش حاڵی دەبێت کە ئەو شێواندنە بۆ ئەو زۆرانبازییە بەکار براوە و بۆ ئەوە بووە، نەوشیروان مستەفا لە هەمبەر هێڵی ئارامی، وەکوو خاوەندێکی ئەسڵی و شەرعی کۆمەڵە

---

٤٩. پشکۆ نەجمەدین، لە پەراوێزی مێژووی کۆمەڵەدا.. خوێندنەوەیەک بۆ کتێبی "کۆمەڵە لە سێدارەوە بۆ ڕاپەڕین"، فێبریوەر و مارسی ٢٠١٣.

بناسێنن و لەوێشەوە ئۆتۆریتە و ماف و دەسەڵاتی زیاتری پێ ببەخشن و سەرەنجامیش کۆمەڵە بەو ئاقارەدا بەرن کە خۆیان گەرەکیانە.

بە هەر حاڵ، ئەم ڕەوتە ئەگەرچی هێشتا هەر لەنێو پارتیی باڵی مەکتەبی سیاسیدایە و ئەفرادەکان (خاڵە شەهابی لێ دەرچێت)ی ئەندامی ئەو حیزبەن، ڕێکخراوی دڵخوازی خۆی دامەزراند. هەڵسووڕاوانی ئەم ڕەوتە بە شەخسی مام جەلالیشەوە پێیان باش بوو، ئەم حیزبە حەل بکرێت و هەر بەو ئاراستەیەشدا کاریان کرد.[50] وەلێ مام جەلال دوای ئەوەی لە ڕێکەوتی ١٩٧٠/١١/٤دا بۆ بەشداریکردن لە چلەی ماتەمینی جەمال عەبدولناسر بۆ وڵاتی میسر دەچێت، بەتەواوەتی ڕا و بۆچوونی دەگۆڕێت و لە کۆنگرەدا گەلێک هەوڵ ئەدات کە پارتەکەیان هەڵنەوەشێننەوە، بەڵام بێسوود ئەبێت.[51] ئەم هەڵوێستەی مام جەلال و ئاڵوگۆڕێک کە لە تێڕوانینی ئەودا هاتە کایەوە، جێگای پرسیار و تێڕامانە! بەو پێیەی، دوای شکستی بزووتنەوەی چەکداریی کوردستان بە ڕێبەرایەتیی بارزانیی مستەفا لە ساڵی ١٩٧٥دا و هاتنە مەیدانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە ڕێبەرایەتیی تاڵەبانی و ململانێ و زۆرانبازیی تاڵەبانی لەگەڵ کوڕانی بارزانی بە هەمان نەفەس و ڕیتمی ساڵانی جەلالی و مەلایی، بەو ئەنجامگیرییەمان دەگەیەنێت: لە دیدی تاڵەبانییەوە، لە ئەگەری تێکچوون و هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتنی نێوان پارتی و بارزانی لەگەڵ حکوومەتی بەعسدا، زۆرانبازی لەگەڵ پارتی و بارزانی، وە یان داواکردنی هێندێک خواست و شەریکبوونەوە لە فەرمانڕەوایەتی لەگەڵ حکوومەتی بەعسدا، بە حیزبێکی پانوپۆڕی جەماوەری دەکرێت، نەک بە ڕێکخراوێکی چکۆلەی چینایەتیی عەقائیدی وەکوو کۆمەڵە. لەڕاستیدا دیدی مام جەلال بۆ کۆمەڵەش هەر وا بوو، سەرەنجام حیزبێکی فراوانی لێ دروست بکرێت کە لەمپەڕی چەپەوە بۆ ئەوپەڕی ڕاستی تێدا بێت و بە بیروباوەڕی کۆمەڵە موتووربە و بۆنخۆش بکرێت.

---

٥٠. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپی سێیەم، سلێمانی، ساڵی ١٩٩٨، ل ٩٨. فوئاد قەرەداغی، دیسان دەربارەی نووسینەوەی مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵە، هاوڵاتی، ژمارە ٤٣٧، ٢٠٠٨/٧/٦.

٥١. ململانێ لەگەڵ ژیاندا، د. عەبدولستار تاهیر شەریف، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی ئارابخا، کەرکووک، ٢٠٠٨، ل ١٤٥.

پێشتر و لەنێو باسەکەماندا کەم و زۆر چووینە سەر ئامانجێک کە لەپشت دامەزراندن و ڕۆنانی 'کۆمەڵە'وە بوو، وەلێ گرنگە لێرەدا، ئێستێکی بۆ بکەین و بڕێک زیاتر لەوە بکۆڵینەوە: کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان-عێراق بۆچی؟

سەرەتا ئەبێ جارێکی دیکە ئەوە بخەینەوە یاد و جەختی لەسەر بکەینەوە، ئەم ڕەوتە لە هەناوی پارتی-باڵی مەکتەبی سیاسی کە نوێنەر و نمایندەی بۆرژوا-ناسیۆنالیستی کوردستان بوو، چەکەرەی کرد و سەری هەڵدا و هەتاوەکوو ڕێکەوتنی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ش، خۆشخەیاڵ بوون بەوەی، دەتوانن بە ئاراستەی حیزبێکی شێوە نوێی مارکسی گۆڕانکاری لە حیزبەکەیاندا بکەن و بەو ئاقارەیدا بەرن. بەڵام بە هاتنەکایەوەی ئەو ڕێکەوتنە و ئەگەری یەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکەی پارتی، بیرۆکەی دامەزراندنی حیزبی پێشڕەوی مارکسیی لینینی لە دەرەوەی حیزبەکەیان پەرەی سەند.[٥٢]

کەواتە: ئەم ڕەوتە کاری بۆ ئەوە کردووە، پارتی-باڵی مەکتەبی سیاسی بکات بە حیزبێکی مارکسی-لینینی. دیارە پراکتیک دەریخست کە ئەوە ناکرێ و خۆشخەیاڵییە. بەڵام لە حاڵێکدا ئەگەر بیانتوانیبایە بیروباوەڕی خۆیان بەسەر ئەو حیزبەشدا زاڵ بکەن، دیسانەوە ئەو حیزبە مەتەریاڵی حیزبی مارکسی-لینینی نەبوو و نەیدەتوانی ببێتە ئامرازێک بۆ ڕزگاریی کرێکاران، بەڵکوو هەر وەکوو حیزبێکی ناسیۆنالیستی دەمایەوە کە دەستکەوتێک بۆ چینی بۆرژوازیی کوردستان بەدەست بهێنێت و هیچی دیکە. ئەمە بە جیا لەوەی دامەزراندنی حیزبی کرێکاریی کۆمۆنیستی لە سەر بنەمای چین نەک نەتەوە و لە چوارچێوەی یەکەیەکی ئابووریی سیاسیی قانوونی دادەمەزرێت. واتە، کوردستان بە جیا لە ویست و ئارەزووی ئێمە، بەشێکە لە وڵاتی عێراق و عێراقیش سەرجەم یەکەیەکی ئابوورییە و دەسەڵاتێکی سیاسی بەڕێوەی دەبات. بە واتایەکی دیکە، چینی کرێکاری عێراق سەرجەم لە چوارچێوەی ئەو سیستەمە ئابووری-سیاسییەدا ڕووبەڕووی چەوساندنەوە بووەتەوە، بەو پێیە ئەو چینە لە چوارچێوەی ئەو وڵاتەدا یەک حیزبی سەرتاسەریی پێویستە.

---

٥٢. فوئاد قەرەداغی، دەربارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، بەشی دووەم، دیمانە: ڕزگار ڕەزا چووچانی، گۆڤاری سڤیل، ژمارە ٢٠٩، ٢٠١٣/١٢/٧.

ئـالێرەوە دەگەیـنە ئەو دەسـتەواژە بەربـڵاوەی کە زۆر جـار بەسـەر زاری هەڵسـووڕاوانی ئەم ڕەوتەوە بـوو: "مـن بـۆ خزمەتکردنـی نەتەوەکەم مارکسـیزمم قبووڵە".

مام جەلال وەکوو یەکێک لە ڕابەرانی کاریگەری ئەو ڕەوتە، بڕوای بە حیزبێکی پانوپۆڕی فراوان هەبوو، واتە، حیزبێکی ناسیۆنالیستی، نەک "چینایەتی". تەنانەت لەو کاتانەشدا کە کۆمۆنیزم خـاوەنی ئۆتـۆریتەی خـۆی بـووە، ئەوپەڕەکەی ئەو وتـوویەتی: دامەزرانـدنی حیزبێکـی شۆڕشـگێڕی فراوانـی موتـووربەکراو بە بیروباوەڕی مارکسی.

فەرەیدوون عەبدولقادر باسی مام جەلال دەکات و دەڵێت، شـایانی باسە چەند جارێک هەسـتم بە گلەیـی مـام جەلال سـەبارەت بە بیروبۆچـوونی کـاک شـەهاب کردووە کە گـوایە مەسـەلەی خەبـاتی چینـایەتی بەسـەر نەتەوایەتیدا زاڵ کـردووە. ئەوەش وای کردووە، لە مەسەلەی "تێزی سێ جیهانی"دا ڕیزبەندیی ناکۆکییەکان وا لـێ بکـات، خەبـات دژی ڕژێمـی عێـراق لە نـاکۆکیی سـەرەکییەوە بکەوێـتە ئاسـتی ناکۆکی ناسەرەکییەوە.[٥٣]

ئالێرەشـدا دیسـانەوە بەڕوونـی تێڕوانینـی مـام جەلال دەرئەکەوێـت، ئەویـش بەکارهێنـانی بیروبـاوەڕی مارکسـی و مـاوی تەنهـا بـۆ بەدەسـتهێنانی هێنـدێک دەسکەوت بۆ بۆرژوازیی کورد و حیزبی مارکسیشی هەر بۆ ئەو مەبەستە بووە، نەک بۆ ڕزگاریی کرێکاران و زەحمەتکێشان.

نەوشیروان مستەفا وەکوو یەکێک لە ڕابەرانی کاریگەری ئەو ڕەوتە، بڕوای بە حیزبێکی پانوپۆڕی جەمـاوەری هەبووە و ئەڵێت هیچ کاتێک بڕوام بە کۆمۆنیزم نەبـووە و ئەگەر لە دەورانێکیشـدا مارکسـیزمم قبـووڵ بووبێـت، ئەوا هەر بـۆ خزمەتکردنی نەتەوەکەم بووە.

عـارف کەریـم وەکوو یەکێک لە کـادرە سـەرەتاییەکانی ئەو ڕەوتە دەڵێت: "مـن لەوەتەی چـاوم لەگەڵ سیاسـەتدا کـردووەتەوە، هەر کوردسـتانی و نەتەوەیـی بیرم

---

٥٣. فەرەیدوون عەبدولقادر، کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، چاپ: دەستگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٢، ل ٨٧

کـردووەتەوە، ئەگەر بیروبـاوەڕێکی تریشـم هەڵبژاردبێـت، تەنهـا بـۆ ئەوە بـووە، خزمەتی مەسەلەی نەتەوایەتی پێ بکەم و هیچی تر".[54]

حـاجی مەمـۆ وەکـوو کـادرێکی سـەرەتایی و دیـاری ئەو ڕەوتە دەڵێـت: (ئـێمە کۆمەڵەمان بۆ ڕزگارکردنی ئەو میللەت و وڵاتە بە پێویست بینیوە)[55]

فەریـد زامـدار یەکێـک لە ئەنـدامانی ئەڵـقە ڕۆشـنبیرییەکانی کـۆمەڵە و کـادرە سـەرەتاییەکانی ئەو ڕێکخـراوە دەڵێت: لە یەکەمـین کۆبوونەوەمـان لەدوای بەیـانی ١١ی ئـازاری سـاڵی ١٩٧٠دا، شـەهید جەعـفەر عەبدولواحیـد پێی ڕاگەیانـدین، ئیـدی لەمەودوا وەکـوو ڕێکخراوێکـی سیاسـیی مارکسـیی لینینـی کـار دەکەیـن. کۆمەڵێـک هۆکاریشی باس کرد کە یەکێک لەوانە: کۆمەڵە بۆ ڕابەرایەتیکردنی شۆڕشـی کـورد لە کوردسـتانی عێـراقە، چـونکە ئەو شۆڕشـە بەو سـەرکردایەتییەی کە ئێسـتا هەیە، ڕەنگە نەتوانێت سەرکەوتن بە دەست بهێنێت.[56]

فوئاد قەرەداغی، یەکێکە لە هەڵسووڕاوانی ئەو ڕەوتە و یەکێکە لە دامەزرێنەران و ڕابەرانـی کۆمەڵە و یەکێکە لەو چەند کەسـەی لەپاش سـاڵێک لە کۆمەڵە دەست دەکێشـێتەوە، چـونکە ئەم لایەنگـر و تەرەفـداری عێراقیبـوونی حیـزب بـووە، دەڵێت: (دوای لێبووردنەکەی بارزانی و هەواڵی نزیکبوونەوە و گفتوگۆ و سـارێژکردنەوەی زامەکـانی شـەڕی نـاوخۆ لە نێـوان هەردوو حیزبـدا، ئومێـدێکی خۆشـخەیاڵانە هـاتە ئاراوە کە بتوانین وەکوو دوو حیزب پێکەوە بژین و هەر حیزبە هەوڵی بەدیهێنـانی بەرنـامەی خـۆی بـدات. ئەو کـاتە ڕایەکـی وەهـام لەلا دروسـت بـوو کە بۆ پێکهێنـانی بەرەیەکـی نیشـتمانیی یەکگرتـوو خەبـات بکەیـن. بـۆ ئەم مەبەسـتە نـامیلکەیەکم بە ناونیشـــانی، "بەرەو یەکێتیـــی ڕیزەکـــانی گەلـــی کـــورد" نووســـی. لەم نـــامیلکە دەستنووســـەدا پێشـــنیازی بەرەیەکـــی یەکگرتـــووی نەتەوەیـــیم لە نێـــوان هەردوو باڵەکەی پارتیـدا کـرد. دەستنووسەکەشـم دایە دەسـت مـام جەلال، بە هیـوای ئەوەی وەکـوو پـرۆژەیەک پشـتگیری لـێ بکـات و لە کـۆمیتەی ناوەندیـدا بیخـاتە ڕوو، یـان دوای پێـداچوونەوەی دایبڕێـژێتەوە و بیخـاتە بەردەم ڕای گشـتیی حیـزب. بەڵام

---

٥٤. کۆمەڵە و یەکێتی، عارف کەریم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ل ٩٦.

٥٥. حاجی مەمۆ، دیمانە، سازدانی: ڕزگار ڕەزا چووچانی، گۆڤاری سڤیل، ١٧ی نیسانی ساڵی ٢٠١١.

٥٦. فەرید زامدار، دیسان دەربارەی مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان، هـاوڵاتی، ٢٠٠٨/٨/٢٩.

دەستپێکردنی وتووێژی نێوان هەردوو باڵی پارتی لەو کاتەدا و پێداگریی بارزانی لەسەر یەکخستنەوەی پارتی بە هەردوو باڵەکەیەوە لە یەک حیزبدا، یان ڕاستر بڵێین، چوونەوەی ئێمە بۆ ژێر سایەی سەرکردایەتیی خۆی، خەونی بەرەی یەکگرتووی نەهێنایە دی و دەستنووسەکەش لای مام جەلال مایەوە)[٥٧]

کەواتە، هەر لەو دەورانەدا کە کۆمەڵەی تێدا دامەزرا، ئامانجی فوئاد قەرەداغی و خەون و کۆششی ئەو، پێکهێنانی بەرەیەکە لە نێوان پارتیی باڵەکەی خۆی و باڵی سەرکردایەتیی بارزانی و ڕاشکاوانە بەدوای "یەکێتیی ڕیزەکانی گەلی کورد"ەوەیە کە ئەو یەکێتییەش لای ئەو یانی، یەکێتی لەگەڵ ئەو باڵەی، ئەمان بە کۆنەپەرست و بە ئەڵقەلەگوێی ئێران و ئەمەریکایان دەزانی! ئەمە بە جیا لەوەی قسەیەک لەسەر چینەکان و ناکۆکیی چینایەتی لە کۆمەڵگای کوردستاندا نییە و خەبەرێکیش لە چینی کرێکار و یەکگرتنی ئەو چینە لە ئارادا نییە!

فوئاد ئەڵێت، بۆیە کۆمەڵە دامەزرا، چونکە نە حیزبەکەی خۆمان و نە پارتیی باڵی بارزانیمان بە شایستەی سەرکردایەتیی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کورد دەزانی و نائومێد بووین لەوەی، لە سایەی ئەو دوو حیزبەدا کورد بە مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆی بگات.[٥٨]

کەواتە، دامەزراندنی حیزب لە لای فوئادیش لەو دەمەی کە کۆمەڵەیان دامەزراندووە، بۆ بە دەستهێنانی "مافەکانی گەلی کورد"ە، نەک بۆ ڕزگاریی چینی کرێکار و نەهێشتنی کاری بەکرێ و دامەزراندنی کۆمەڵگای سۆشیالیستی کە ئامانجی حیزبە کۆمۆنیستەکانە.

کەواتە، ئەگەرچی مارکسیزم بیروباوەڕی ڕزگاریی چینی کرێکار و ڕێکخراوی مارکسیستی بۆ ڕێکخستن و یەکگرتووکردنی چینی کرێکار و بۆ تێکۆشان و بەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی بێ چین و چەوساندنەوەیە، کەچی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان-عێراق ئەو ڕێکخراوە بۆ یەکگرتووکردنی میللەتی کورد و بۆ تێکۆشان و بەدەستهێنانی مافەکانی میللەتی کورد دادەمەزرێنن. ئەمەش

---

٥٧. فوئاد قەرەداغی، مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، سازدانی: کەمال ڕەئووف، هاوڵاتی، ژمارە ٤١٢، ٢٠٠٨/٤/٩، ل ٤.

٥٨. فوئاد قەرەداغی، دەربارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، بەشی دووەم، دیمانە: ڕزگار ڕەزا چووچانی، گۆڤاری سڤیل، ژمارە ٢٠٩، ٢٠١٣/١٢/٧.

له باری واقیعییەوه یانی: هەڵخڕاندن و بەسیجکردنی خەڵک بەگشتی بۆ قازانجی چینی بۆرژوازیی کوردستان و بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانی ئەوانە کە لەو بارودۆخەدا یانی: شەریکبوونەوە لە دەسەڵاتی ناوەندیدا.

لەڕاستیدا کۆمەڵە وەکوو بیروباوەڕیش ڕێکخراوێکی مارکسیی لێنینی نەبووە، بەڵکوو ماویستی بووە. بیروباوەڕ و دیدگای "ماو"یش ناسیۆنالیستی بووە، نەک کۆمۆنیستی.

کۆمەڵە دەیگوت، ماو ڕابەرێکی کۆمۆنیستییە و درێژەپێدەری کارەکانی مارکس، ئەنگڵس، لێنین و ستالینە و لەگەڵ هەلومەرجی کوردستاندا زیاتر دێتەوە، بۆیە ڕێکخراوەکەمان مارکسیی لێنینی ئەندێشەی ماو تسیتۆنگە. هەروەها دەیانگوت، کوردستان وڵاتێکی داگیرکراو، یان نیمچە داگیرکرا و نیمچە دەرەبەگییە، بۆیە قۆناغی شۆڕشەکەمان قۆناغی ڕزگاریی نیشتمانیی دیموکراتییە.

قۆناغی ڕزگاریی نیشتمانی بۆ ڕزگارکردنی نیشتمانی کوردستان و شۆڕشی دیموکراتیی گەلی بۆ کۆتاییهێنان بە پاشماوەی سیستەمی دەرەبەگایەتییە. بۆ بەسەرکەوتنگەیاندنی ئەم ئەرکەش لە ئەندێشەی ماو تسیتۆنگدا سێ بنەما پێویستن: پارتی پێشڕەوی چینی کرێکار، بەرەی گەل، هێزی چەکداری شۆڕشگێڕ.

کەواتە، دامەزراندنی کۆمەڵە وەکوو ڕێکخراوێک بۆ ئەوە بوو، ببێتە ناوکۆکەی پێکهێنانی پارتی پێشڕەو، بۆ فەراهەمکردن و وەدیهێنانی یەکێک لەو سێ بنەمایە.

بەپێی ئەو لێکدانەوەیە، قۆناغی شۆڕش لە کوردستاندا لەگەڵ هی عێراق جوودایە، کوردستان وڵاتێکی داگیرکراوە و بزووتنەوەکەی بزووتنەوەیەکی ڕزگاریی نیشتمانییە، بۆیە چینی کرێکاری کوردستان پێویستی بە حیزبی کوردستانی هەیە، نەک حیزبی کرێکارانی سەرتاسەری عێراق.

لەسەر بنەمای ئەم لێکدانەوانە، کۆمەڵەی مارکسیی لێنینی سەر بە ئەندێشەی ماو بوو، وە دەبوو سنووری کاری کوردستانی عێراق بێت، نەک عێراق.

لەنێو کۆمەڵەدا دەستەواژەیەک زۆر بەسەر زارەوە بوو، دەمانگوت: کرێکارانی کورد دوو چەوساندنەوەیان بەسەرەوەیە، چینایەتی و نەتەوایەتی، بەڵام هەرچی کرێکارانی عەرەبە (یان عێراقە) تەنها چەوساندنەوەی چینایەتییان بەسەرەوەیە. ئەمەش دیسانەوە وەکوو بیانوویەک وا بوو، بۆ ئەوەی کۆمەڵە کوردستانی بێت نەک عێراقی.

لەڕاستیدا ئەمە بیانوویەکی کاریکاتۆری و ئێجگار لاواز بوو، چونکە پێکهاتەی وڵاتانی دنیا هەر وایە و هەر یەکەی بگریت لە چەندین نەتەوە و ڕەگەز و ئایین و ئایینزا پێک هاتووە. بەو پێیە بێت، ئەبێ ژنانی کرێکار حیزبی کۆمۆنیستی جودایان هەبێت، چونکە ئەوانیش لەژێر دوو جۆرە چەوساندنەوەدان: چەوساندنەوەی چینایەتی و جیاوازیی ڕەگەزی.

بەو پێیە بووایە، ئەبوو لینین حیزبی سەرتاسەریی ڕووسیای دانەمەزراندایە و کرێکارانی هەر نەتەوەیەک لە وڵاتی ڕووسیا، حیزبی جوودای کرێکارانی نەتەوەی خۆیانیان پێک بهێنایە. نەک هەر لینین، بەڵکە ماو تسیتۆنگ و باقی ماوییەکانی دیکەی دنیاش هەر وایان نەکرد.

جارێکیان لە ڕێکخستنەوە، کاسێتی دەورەیەکی کادرانمان پێ گەییشت، یەکێکیان هیی مام جەلال بوو، کە تیایدا جەخت لەسەر دەستەواژەیەکی ماو تسیتۆنگ دەکاتەوە کە دەڵێت: "لا یمکن للشعب الكادح ان يتحرر، الا اذا تحررت الامة". واتە: هەتا گەل ڕزگار نەبێت، ئەستەمە خەڵکی زەحمەتکێش ڕزگاری بێت.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، لێرەدا ماو تسیتۆنگ مەبەستی لە ڕزگاربوونی گەلی چینە بە گشت نەتەوەکانییەوە، هەر وەکوو چۆن ئەوترێت گەلی عێراق کە بە مانای گشت نەتەوەکانی نێو عێراق دێت.

لەڕاستیدا ئەم دەستەواژەیە بۆ فریودانی کرێکاران و زەحمەتکێشان بوو، بۆ ئەوە بوو پێیان بڵێت: ئەی کرێکاران و خەڵکی زەحمەتکێش، ئەبێ ئەوە بزانن، سەرەتا ئەبێ گەلەکەتان ڕزگار بکەن! لەبەرامبەر سەرمایەداران و خاوەنکاران نابێت هیچ داخوازییەکی کرێکاری بهێننە گۆڕ! نابێت بزووتنەوەی داخوازییەکانتان بۆ کرێی زیاتر و سەعاتکاری کەمتر و بیمە ... بەڕێ بخەن! چونکە جارێ وەختی ئەوانە نییە و نابێت ناکۆکیی نێوخۆی گەلەکەمان زەق بکەینەوە. جارێ وەختی ڕزگارکردنی گەلەکەمانە و هێشتا ئێمە وەکوو ئەوە واین، گشتمان لەنێو کەشتییەکدا بین و چارەنووسی هەموومان بەیەکەوە بەند و بەستراوە. ئەگەر ئەو کەشتییە نقووم بێت، ئەوا هەموومان تێدا دەچین. هەتا گەلەکەمان ڕزگار نەبێت، ئێوەش ڕزگارتان نابێت، قۆناغی ئێستا قۆناغی ڕزگاریی گەل و نیشتمانە، لە پاش ئەوە خەباتی چینایەتی دەست پێ دەکات!

هەر لێرەوە کافییە کە بزانین ئەندێشەی ماو تسیتونگ فری بەسەر مارکسیزم و چینی کرێکارەوە نییە، بەڵکوو بیروباوەڕ و ئایدیۆلۆژییەکی بۆرژوا-ناسیۆنالیستییە و هیچی دیکە.

من دێتەوە یادم، لەنێو کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵەدا بووین، کەسێک دەستی بڵند کردبووەوە کە بواری پێ بدەن لەمەڕ بەرنامەی کۆمەڵەوە قسە بکات، من بە دەنگی ناسیمەوە فەتاح کوێخا ڕەزا بوو .

فەتاح و من یەکتریمان دەناسی، وەلێ هیچ پەیوندییەکی ڕێکخراوەییمان لە نێواندا نەبوو. فەتاح دوو پێشنیاری هەبوو: یەکەم، لە بەرنامەی کۆمەڵەدا جیایی دین لە دەوڵەت جێگیر بکرێت. دووەم، سەعاتکاری کرێکاران لە هەفتەیەکدا بە ٤٠ سەعات دیاری بکرێت.

پێم وابێت بۆ خاڵی یەکەم هیچ نەوترا و قسەی لەسەر نەکرا، وەلێ بۆ خاڵی دووەم، فەرەیدوون عەبدولقادر هاتە گۆ و گوتی: ئەگەر سبەیرۆژ کوردستان ئازاد بوو، کرێکاران نەک هەر نابێت سەعاتکاریان بۆ کەم بکرێتەوە، بەڵکوو پێویستە کاری زۆرتریش بکەن، چونکە ئەو دەمە کوردستان پێویستی بە ئاوەدانکردنەوە هەیە.

جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت و پەروەردە و فێرکردن، یەکێکە لەو پرسگەلەی کە بۆرژوازی لە وڵاتانی ئەورووپا زیاتر لە قەرنێکە بە عەمەلی کردووەتەوە .

٤٠ سەعات کار لە هەفتەیەکدا حکوومەتی بەعسیش دانی پێدا دەنا، کەچی فەرەیدوون عەبدولقادر دامەزرێنەر و ڕابەری "ڕێکخراوێکی کرێکاری"، گەرەکێتی کوردستان بە کرێکاران ئازاد بکات و دواتریش بێگارییان پێ بکات!

هەر وەکوو پێشووتر باسمان کرد، دامەزرێنەران و تیۆریسینانی کۆمەڵە کاتێک شیکارییان بۆ کۆمەڵگای کوردستان دەکرد دەیانگوت، کوردستان وڵاتێکی داگیر و دابەشکراوە و بەزۆر بە وڵاتانی دەوروپشتییەوە لکێندراوە.

ڕاستە کوردستان لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە لە نێوان وڵاتانی ئیمپریالیست، زلهێز و شەڕکەر بە ویست و قازانجی خۆیان بە وڵاتانی دەوروپشتییەوەیان لکان، بەڵام کوردستان پێش ئەوەش هەر وڵاتێکی یەکگرتوو نەبووە و هەر دابەشکراو بوو. کوردستان پێش ئەوە کۆمەڵێک میرنشینی تێدا بووە و هەر میرنشینێک دەسەڵات و قەڵەمڕەوی جوودای خۆی هەبووە و گەلێک

جارانیش بوونەتە لایەنگر و تەرەفداری ئەم وڵات و ئەو ئیمپراتۆرییەت و لە دژی یەکتری جەنگاون.

بە هەر حاڵ، دوای ئەوەی سنووری ئەو وڵاتانە کێشرا و هەر پارچەیەکی کوردستانیش بە یەکێک لە وڵاتەکانی دەوروپشتییەوە لکێندرا، یەکێک لەو پارچانە بە عێراقەوە لکێندرا و عێراقیش هەر هەموو بەو پارچەیەی کوردستانیشەوە بوو بە وڵاتێکی ژێردەست و کۆڵۆنی یان نیمچەکۆڵۆنیی بەریتانیا.

بە کورتییەکەی، ئەوە شیکارییەکی دروست و بابەتی و زانستی نییە، کوردستانی عێراق بۆ نموونە، بە چین و ڤێتنام و کۆریا بچوێنی و پێت وابێت کۆڵۆنی یان نیمچە کۆڵۆنییە. ئەوە شیکارییەکی ئارەزووگەرانەی بۆرژوا-ناسیۆنالیستی کوردە، بۆ ئەوەی بڵێت، هەلومەرجی خەباتی کرێکاران لە وڵاتی کۆڵۆنی و نیمچەکۆڵۆنی و داگیرکراو لەگەڵ هەلومەرجی خەباتی کرێکاران لە وڵاتی کۆڵێنیال و داگیرکەر جوودایە و لێرەوە بەو ئەنجامگیرییە بگات کە: کرێکارانی کوردستان پێویستییان بە حیزبی پێشڕەوی چینی کرێکاری کوردستان هەیە.

کەواتە، باڵی چەپی بۆرژوا ناسۆنالیستی کوردستان لەلایەکەوە بۆ بەهرەبەرداری لە ئۆتۆریتەی مارکسیزم و کۆمۆنیزم لە دنیادا، ئاڵای ئەوان بەرز دەکاتەوە، بەڵام لە لایەکی ترەوە دەکەوێتە ژێر ئەو گوشارەوە کە مادام ئەوان باسی مارکسیزم و کۆمۆنیزم و چینی کرێکار دەکەن، کەواتە دەبێت لەنێو حیزبی سەرتاسەری کرێکارانی عێراقدا بن. بۆیە بۆ خۆدەربازکردن لەژێر ئەو گوشارە، وتیان کوردستان وڵاتێکی ژێردەست و کۆڵۆنییە، وەلێ عێراق وا نییە.

مێژووی زێتر لە نیو سەدەی بزووتنەوەی کوردایەتی ئەوەی بەڕوونی پیشان داوە کە ئەم بزووتنەوانە لەگەڵ شیکارییەکەی خۆشیاندا ڕاستگۆ نەبوونە، ئەگەرنا، ئەوا دەبوو ئەوانیش چاویان لە دانوستان نەبووایە و بە وێنەی چین، ڤێتنام و کۆریا ... جەنگی ڕزگارییان نەوەستایە، هەتاوەکوو کوردستانیان لە حاڵەتی کۆڵۆنی و نیمچە کۆڵۆنی دەرئەهێنا.

زۆر جار ناکۆکی لەسەر ئەوەش دروست ئەبوو، ئایا حکوومەتی بەعس فاشییە، یان ڕەفتار فاشییە؟ بە شێوەیەکی گشتی ڕەواجیان بەوە ئەدا کە حکوومەتی عێراق ڕەفتار فاشییە.

ئەبێ جارێکی دیکە و لەم مەسەلەیەشدا ئەوە بڵێین، ئەم شیکارییەی کە دەیانگوت حکوومەتی عێراق ڕەفتار فاشییە، شیکارییەکی زانستی و بابەتی نەبوو، بەڵکوو دیسانەوە مەبەستێکی سیاسی لە پشتەوە بوو، ئەویش بۆ ئەوە بوو کە بوارێک بۆ دانوستان و شەڕیکبوونەوە لە دەسەڵاتدا بهێڵنەوە. لە کاتی ڕێکەوتن و شەریکبوونەوەدا دەگوترا، ئێستا ئەو حکوومەتە، ڕەفتارە فاشییەکەی نەما!

ئێستا و پاشی ئەو لێکۆڵینەوەیە، ئیتر ڕۆشنە بۆچی ئەوانەی کاریگەرییان بەسەر کۆمەڵەوە هەبوو، جەختیان لەسەر کوردستانیبوونی کۆمەڵە دەکردەوە. تەنانەت کەسێکی وەکوو مام جەلال هەر لە سەرەتاوە بە فازڵی مەلا مەحموودی گوتووە: ئەگەر کوردستانین، کارتان لەگەڵدا دەکەم، ئەگەر نا، نایکەم.[59]

هۆکاری جەختکردنەوەی ئەوانە لەسەر کوردستانیبوونی کۆمەڵە بە یەک دێڕ: چونکە ئەوانە ناسیۆنالیست بوون و بەشوێن بنیاتنانی ڕێکخراوێکی ناسیۆنالیستیشەوە بوون. ئەوان کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستانیان بۆ مەسەلە نەبوو، چ جای بگات بە یەکێتی و هاوخەباتی کرێکاران و زەحمەتکێشان لە تەواوی عێراقدا. لە حاڵێکدا ئەوان هەردەم بە دووی فرسەتێکەوە بن کە بۆ هێندێک دەستکەوت لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا گفتوگۆ بکەن، ڕێکخراوێک بۆ ئەوان گونجاوترە کە لەسەر ئاستی کوردستاندا بێت و باسی ئاڵوگۆڕ لە عێراقدا نەکات.

کۆمەڵە نێوی مارکسیی لینینیی-ئەندێشەی ماو تسیتۆنگی لە خۆ نابوو، چونکە بارودۆخی جیهان لەو سەردەمەدا، بۆ گەیشتن بە ئامانجی ناسیۆنالیستییانەی ئەوان، هەڵگرتنی ئەو ناوە باشترین بژاردە بوو.بەڵام ئایا کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان-عێراق هەر لە سەرەتاوە سنووری کار و هەڵسووڕانی خۆی دیاری کردبوو؟سەرەتا دەبێ باسی ئەوە بکەین، ناوی کۆمەڵە لە کۆبوونەوەی دامەزراندنیدا و لەسەر یەکەمین دەستووری خۆیدا چی بوو؟

فوئاد قەرەداغی کە یەکەمین دەستووری کۆمەڵەی نووسیوەتەوە.[60] دەڵێت: دڵنیام لەوەی کە دوای وشەی کوردستان 'داش عێراق' هەبوو.[61]

---

٥٩. ئاوات زەکی عەبدولغەفوور، کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، چاپ: دەستگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٢، ل ١٦٢.

٦٠. فوئاد قەرەداغی، دیسان دەربارەی نووسینەوەی مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵە، هاوڵاتی، ژمارە ٤٣٦، ٢٠٠٨/٧/٢.

واتـا، نێـوی تەواوی کـۆمەڵە بریتـی بـووە لە: کـۆمەڵەی مارکسـیی لینینیـی کوردستان-عێراق ئەندێشەی ماو تسیتۆنگ.

کەواتە، بەپێی نێوەکەی بێت، کۆمەڵە ڕێکخراوێکی مارکسیی لینینی بۆ کرێکارانی سەرتاسەری عێراق نە بووە، بەڵکە بە تەنها بۆ کرێکارانی کوردستانی عێراق بووە.

بەڵام فوئـاد ئەڵێت، ئێمە کێشـەمان لەسـەر ئەوە نەبووە کە کۆمەڵە لە ئێسـتادا ڕێکخراوی کرێکارانی کوردستانی عێراق بێت، بەڵکوو کێشـەکەمان لەسـەر ئەوە بـوو کە ئایا کۆمەڵە دەستەیەکی بزووتنەوەی نوێی کۆمۆنیستی دەبێت لە عێراقدا و بۆ پێکهێنـانی حیزبێکـی کۆمۆنیسـتی لە سەرانسـەری عێراقـدا خەبـات دەکـات، یـان ڕێکخراوێـک دەبێـت بـۆ پێکهێنـانی حیزبێکـی کۆمۆنیسـتیی کوردسـتانی کە سـەرکردایەتیی شۆڕشـی ڕزگـاریی نەتەوایەتیی کـورد (شۆڕشـی دیمـوکراتی نـوێ) بکات.[٦٢]

دیـارە کە ڕابەران و دامەزرێنەرانـی کـۆمەڵە تێکـڕا کـورد بـوون و کـادران و ئەنـدامانێکیش کە بە دەورووپشـتی ئەمـانەوە بـوون و دواتـر پـێکەوە کەرەسـتەی بنیاتنانی ئەو ڕێکخراوەیان پێک هێنا، هەر کورد بوون و خەڵکی کوردستان بوون و بە فیعلی ئەو ڕێکخراوە لە کوردستانی عێراقدا بووە.

کەواتە، هەتـا ئێرە ئاسـاییە کە کۆمەڵە "کوردسـتان-عێـراق" بێت، نەک عێراق و ئەو ناوەش هیچ شتێکمان بۆ ڕوون ناکاتەوە و نـابێتە بەڵگە و نیشـانەی ئەوەی کە کۆمەڵە کوردستانییە، وە یـان لە داهـاتوودا نـابێتە هێزێـک لەو هێزانەی کە حیزبێکـی سەرتاسەریی عێراقی بنیات دەنێن.

کەواتە، قسـەکە لەسـەر ئەوەیە: ئایـا کـۆمەڵە لە درێـژەی خەبـاتی خۆیـدا هەوڵ ئەدات لە دوارۆژدا ببێـتە حیزبـی کرێکـارانی کوردسـتانی عێـراق، یـان نەخێـر لەگەڵ دەسـتە و تـاقمی دیکەی مارکسـیی لینینیی عێراقیـدا، حیزبـی کرێکـاریی عێراقـی پێـک دەهێنێت؟

---

٦١. فوئـاد قەرەداغـی، مێـژووی دامەزرانـدنی کـۆمەڵەی مارکسـیی لینینـی، بەشـی یەکەم، سـازدانی: کەمـال ڕەئووف، هاوڵاتی، ژمارە ٤١١، ٢٠٠٨/٤/٦، ل ٤.

٦٢. فوئـاد قەرەداغـی، دەربـارەی دامەزرانـدنی کـۆمەڵەی مارکسـیی لینینـی، بەشـی دووەم، دیمـانە: ڕزگـار ڕەزا چووچانی، گۆڤاری سڤیل، ژمارە ٢٠٨، ٢٠١٣/١١/٣٠.

واتە: ئایا کۆمەڵە لە سەروەختی پێگەیشتنی هەلومەرجی پێکهێنانی حیزبێکی کرێکاریی عێراقیدا دەبێتە دەستەیەک لەو دەستانەی کە ئەو حیزبە بنیات دەنێن؟

بەگوێرەی گفتوگۆی ئەو کەسانە کە لەو دەم و دەورانەدا لەنێو بابەتەکاندا بوون، وا دەردەکەوێت ئەو مەسەلەیە لە سەرەتادا بەتەواوی یەکلا نەکرابێتەوە و قسەی ڕوون و ڕاشکاوی لەسەر نەکرابێت. هەروەها پێ دەچێت، ئەو کەسانەی دواتر وەکوو عێراقی دەردەکەون و بەو هۆیەوە واز لە کۆمەڵە دەهێنن، لە سەرەتادا بەو مەسەلەیە زۆر هەستیار نەبووبێتن و پێداگرییان لەسەر ئەو پرسە نەکردبێت.

فوئاد قەرەداغی لەو بارەیەوە دەڵێت: "خاڵێک کە ناڕۆشنی لەسەر هەبوو، مەسەلەی ناسنامەی ڕێکخراوەکە و سنووری کارکردنی بوو ... وردەکاریی ئەم ناڕۆشنییە لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەدا بەتەواوی و بەم شێوەیە نەبوو. کەسێک بەوردی لەم ڕووەوە باری سەرنجێکی تایبەتی نەبوو و مشتومڕیشی لەسەر نەدەکرا. بەڵام دواتر و دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک کارکردن، ناکۆکی لەم ڕووەوە سەری هەڵدا ..."[٦٣]

کەواتە، لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەدا تەنها ئەوەندە گرنگ بووە، دەستەیەک کادری هاوفکری ماویی نێو پارتیی باڵی مەکتەبی سیاسی کە بە باڵی خۆیان و باڵی بارزانی و بە هەردوو باڵەکەی حیزبی شیوعیش ڕازی نین، پێکەوە جارێ ڕێکخراوێک پێک بهێنن.

بەڵام ڕێکخراوێکی لەو بابەتە، هەر ئەوەندە و هەر بە هۆی ئەوەی بانگەشەی مارکسیبوون بۆ خۆی دەکات، تۆوی ناکۆکی و لەتبوون و پەرتبوونی لە هەناوی خۆیدا حەشار داوە، چونکە ڕێکخراوی مارکسیی لینینی لە سەر بنچینەی چین نەک نەتەوە ڕۆ دەنرێت و یەکەی ئابووریی سیاسیی قانوونی دەکاتە چوارچێوەی کار و هەڵسووڕانی. ئەویش لەبەر ئەوەی، پێی وایە هەلومەرجی خەباتی چینایەتی لە هەر یەکەیەک لەو یەکانە وەک یەکە و هەر یەکەیەکیش لەگەڵ ئەوانی دی جیاوازە، ئەگەر وا نەبووایە، ئەوا تەنها یەک ڕێکخراوی سەرتاسەریی جیهانییان ڕۆ دەنا.

بە هەمان شێوە، کرێکارانی جۆراوجۆری ئەم نەتەوە و ئەو نەتەوە لەنێو یەکەیەکی ئابووریی سیاسیی قانوونیدا، یەک هەلومەرجی خەباتی چینایەتییان هەیە

٦٣. فوئاد قەرەداغی، مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، بەشی دووەم و کۆتایی، سازدانی: کەمال ڕەئووف، هاوڵاتی، ژمارە ٤١٢، ٩/٤/٢٠٠٨، ل ٤.

و راستەوخۆ ڕووی لە دەسەلاتی سیاسی ئەو یەکەیەیە، بۆیە دەبێت لە ڕێکخراوێکی یەکگرتووی سەرتاسەریشدا یەک بگرن.

ئەم مەسەلەیە زۆربەی هەرە زۆری ئەو ناکۆکی و لەتبوون و پەرتبوون و وازهێنانە تاک و کۆیانەی نێو کۆمەڵە بە درێژایی مێژووی خۆی ڕوون دەکاتەوە، هەتا بە حەلکردنی یەکجارەکیشی هەڵدەگەڕێتەوە.

بەدەربڕینێکی دیکە: کۆمەڵە وەکوو ڕێکخراوێکی ناسیۆنالیستی، کاتێک کە دێت مارکسیزم-لێنینیزم دەکاتە ئاڵا و پەرچەمی خۆی، کەسانێک بەو هۆیەوە دێنە نێو ڕیزەکانییەوە، پاشان لەو بیروباوەڕە قووڵ دەبنەوە، هەست بەو ناکۆکییە دەکەن و تێ دەگەن کە ئەو دنیابینییە لەگەڵ ئەو ڕێکخراوەدا جووت نایاتەوە.

بۆیە ئەندامان و هەڵسووڕاوانی نێو کۆمەڵە بەو ڕادەیەی لە کۆمۆنیزم و کرێکار نزیک بوونەتەوە، ناکۆکییان لەگەڵ کۆمەڵەدا بۆ دروست بووە و سەرەنجام وازهێنان و دوورکەوتنەوە ڕووی داوە.

ئێمە لێرەدا نامانەوێ مێژووی کۆمەڵە بنووسینەوە، بۆیە تەنها لەو دەرگایانە ئەدەین کە خۆمان مەبەستمانە و ڕەنگبێ هەتا هەنووکە زۆر ڕۆشن نەبووبن، وەیان بە جۆرێکی دیکە شرۆڤەیان بۆ کرابن.

ئێمە ئەتوانین مێژووی کۆمەڵە لە ڕوانگەی ڕێباز و دنیابینییەکەیەوە بە سێ قۆناغ دابەش بکەین:

یەکەم: قۆناغی ماوی بە ڕێبەرایەتیی خاڵە شەهاب.

دووەم: قۆناغی نزیکبوونەوە لە مارکسیزم-لێنینیزم بە ڕێبەرایەتیی شەهید ئارام.

سێیەم: قۆناغی خاڵیکردنەوەی کۆمەڵە بە ڕێبەراتیی نەوشیروان مستەفا ئەمین.

قۆناغی یەکەم بە دامەزراندنی کۆمەڵە دەست پێ دەکات و بە گرتنی خاڵە شەهاب و هاوڕێکانی کۆتایی پێ دێت.

لە سەرەتادا و لە کۆبوونەوەی دامەزراندنی کۆمەڵەدا، ئەگەرچی ڕایەکی وا هەبوو کە کۆمەڵە سکرتێری بۆ دانەنرێ و ڕابەرایەتییەکی بە کۆمەڵی هەبێت، وەلێ بەهۆی پێداگریی مام جەلال و گرووپەکەیەوە سکرتێر دادەنرێت و مام جەلالی بۆ دیاری دەکەن.

بەڵام مام جەلال ناتوانێت وەکوو سکرتێر کارەکانی خۆی جێبەجێ بکات، چونکە یەکەم، لە سەرەتادا سەرقاڵی گفتوگۆ و تێکەڵکردنەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو

لەگەڵ باڵی سەرکردایەتیی بارزانی. دووەم، دوای ئەوەی ئەو دوو باڵە تێکەڵ بوونەوە، مام جەلال و چەند کەسێکی دیکە (لەسەر داوای بارزانی) دەبوو لە نزیک بارەگای بارزانی نیشتەجێ بن، کە دیارە ئەوەش جۆرێکە لە دەستبەسەری و بەو هۆیەوە بواری جموجووڵی لێ ئەبڕێت. سێیەم، لە ساڵی ۱۹۷۲دا مام جەلال عێراق بەجێ دەهێڵێت و دەچێتە دەرەوە کە بێگومان ئەو لەو دوورەوە بۆی ناکرێت وەک سکرتێر ڕۆڵی خۆی بگێڕێت.

هەر بۆیە لەو دەورانەدا خاڵە شەهاب سکرتێری فیعلیی کۆمەڵە بووە.

خاڵە شەهاب بڕوای بە دید و تێڕوانینی ماو تسیتۆنگ و تێزی سێ جیهانیش هەبووە. بەپێی ئەو تێزە ناکۆکیی سەرەکی لەگەڵ حکوومەتی بەعسدا نییە و ئیمپریالیزمی ئەمەریکی و "سۆشیال-ئیمپریالیست"ی ڕووسی ناکۆکیی سەرەکین. هەر بۆیە ئەگەر کۆمەڵە لە دەورانی دوای شکستی بزووتنەوەی چەکداری لە کوردستان لە ساڵی ۱۹۷۵ بیریان لەوە کردبێتەوە، لەسەر جۆرێک لە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لەگەڵ حکوومەتی بەعس ڕێک بکەون، ئەوا هەر ئەم تێڕوانینە بنەمای ئەو نیازەیان بووە.[٦٤]

کۆمەڵە لەم دەورانەدا، بەهۆی ئەوەی لە نێوان مەنگەنەی بەعس و پارتیدا بوو، زۆر بەنهێنی کاری دەکرد و خۆی بۆ کۆمەڵگا ئاشکرا نەکردبوو. هەر بەو هۆیەوە کار و هەڵسووڕانیشی زۆر بەرتەسک و کەم بوو.

کاتێک کە ڕێکەوتنی نێوان حکوومەتی بەعس و پارتی و بارزانی تێک دەچێت و شەڕ دەست پێ دەکاتەوە، سیاسەتی زاڵی کۆمەڵە ئەوە بوو کە ئەو شەڕە، شەڕێکی ڕەوای خەڵکی کوردە دژی حکوومەتی بەعس، بەڵام سەرکردایەتییەکەی کۆنەپەرستە، بۆیە ئەرکی کۆمەڵەیە بەشداری تێدا بکات و لە هەوڵی لابردنی ئەو سەرکردایەتییەدا بێت.

ئەندامان و کادرانی کۆمەڵە سەرباری ئەوەی بە ژمارە زۆر کەم بوون، ئینجاش زۆر بێ پلان و بەرنامە و وەکوو هەر خەڵکێکی دیکەی ئاسایی ڕوویان لە دەرەوە کرد[٦٥] و هیچ کار و کاریگەرییەکیان نەبوو.

---

٦٤. گفتوگۆ لەگەڵ جەبار مستەفا، مێژوویەک لە یادەوەریدا، ئێدیتۆر:سالار ڕەشید، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ۲۰۱۵، ل ٤٠.

٦٥. حاجی مەمۆ، هەولێر و کۆمەڵە و هەندێک وردەکاری، هاوڵاتی، ۳۱ی ئابی ۲۰۰۸.

دیـاره ئەو شـیکارییەی کـۆمەڵە بـۆ ئەو بـزووتنەوە چەکـدارییە کـردی، زۆر نادروست و نازانستی بوو، چونکە خەباتکردن بۆ لابردنی ستەمی میللی ئەگەرچی خۆی لە خۆیدا خەباتێکی ڕەوا و پێشکەوتنخوازانەیە، وەلێ ئەوە بە مانای ئەوە نییە هەر پارت و بزووتنەوەیەک بانگەشەی بۆ لابردنی ئەو ستەمە کرد و جەنگی، ئیدی ئەو جەنـگە بە ڕەوا بزانیت. دوای سـاڵێک لە شـەڕ و بەرگـری، بە هـۆی ڕێکەوتنـی عێراق و ئێرانەوە، پـارتی و بـارزانی بڕیاریـان دا کۆتـایی بە بەرگری بهێنن. هەڵەی گەورەی کۆمەڵە بۆ ئەو دەمە و بۆ جـاری دووەم ئەوە بـوو، ئەوانیش وەکوو ئەو خەڵکە خۆیان ڕادەست دەکەنەوە و لە بەرگری و بەرخۆدان بەردەوام نابن و لەگەڵ عامی دەچنە شامی.

ئەو بڕیارەی کۆمەڵە سەرەنجام بە نرخێکی ئێجگار گەورە تەواو دەبێت و کاتێک کە دەستیان دایەوە چەک، تەنها بۆ نموونە: بۆ یەک تفەنگ بە حەوادا دەچوون.

دوای ئەوەی ڕێبەرایەتی و ئەندامان و کادرانی کۆمەڵە بۆ نێوشـارەکان گەڕانەوە و پاشـی چەنـد مانگێک کەوتـنە بەر شـاڵاوی گـرتن، کوردسـتانیان بەجـێ هێشـت و ڕوویان لە ئێران کرد. سـەرەنجام ئێران دەیانگرێت و ڕادەسـتی عێراقیـان دەکاتەوە. خـاڵە شــەهاب و دووان لە هاوڕێکـانی لە سـێدارە دەدرێـن و ئەوانـی دی حـوکمی زینـدانیی جۆراوجـۆر دەدرێـن. بەو هـۆیەوە ڕێکخسـتنەکانی کـۆمەڵە تەرتەووەرتە دەبن و سەرلەبەری هەڵدەوەشێنەوە.

ئەمەش دیسانەوە هەڵەیەکی گەورە بوو بۆ ئەو دەمە، کۆمەڵە تێی کەوت.

ئەم هەڵە و هەڵوێسـتانە سـەرجەم لە دەورانـی ڕێبەرایەتیـی خـاڵە شــەهاب و هاوڕێکانی دیکەی لە ڕابەرایەتیی کۆمەڵە لەو قۆناغەدا بوو.

خـاڵە شـەهاب و هاوڕێکـانی پـێش ئەوەی کوردسـتان بەجـێ بهـێڵن و بچـنە نێـو ئێرانەوە، کۆمیتەیەک لە ئەبووشـەهاب (ئیحسـان نەجـم محێدین)_وەکـوو بەرپرسـی هەرێمـی سـلێمانی، ئـازاد هەورامـی (ئـازاد عەبدولمەجیـد عەبـدولغەفار) وەکـوو بەرپرسی هەرێمی کەرکووک، ئەرسەلان بایز وەکوو بەرپرسـی هەرێمی هەولێر بۆ ڕابەرایەتیکردنــی ڕێکخســتنەکانی کــۆمەڵە پێــک دەهێــنن، بەڵام ئەم کــۆمیتەیە لە کارەکانیدا سەرکەوتوو نابێت.

لە دۆخێکی ئاوەها سەخت و دژواردا، شەهید ئارام (شاسوار جەلال سەعید غەنی) و چەند هاوڕێیەکی هەر بە دەستپێشکەری خۆیان کۆمیتەیەک پێک دەهێنن و دێنە مەیدان و لە ماوەیەکی کورتدا دەتوانن کۆمەڵە دروست بکەنەوە.

ئارام یەکێک بوو لە ئەندامە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە و خاوەنی نەزەر و لێکدانەوەی ڕۆشنی خۆی بوو. لە زۆر مەسەلە و هەڵوێستی سیاسیدا ڕەخنەی لە ڕابەرایەتیی کۆمەڵە هەبوو، هەر بۆیە لەنێو کۆمەڵەدا ئەرکێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە[٦٦] و پشتگوێ و پەراوێز خراوە.[٦٧] تەنانەت ئەو دەمەی ڕابەرایەتیی کۆمەڵە کوردستان بەجێ دەهێڵێ و لەدوای خۆی کۆمیتەیەک پێک دەهێنێ، هەر وەکوو باسمان کرد، ئارام یەکێک نابێت لە ئەندامانی ئەو کۆمیتەیە و ئەوی لێ ئاگادار ناکەنەوە. وەلێ زۆر جار لە بارودۆخی سەخت و لە توندپێچەکاندا ڕابەری ڕاستەقینە و نادیار و پەراوێزخراو دێتە پێشەوە و ئاشکرا دەبێت.

هاتنە مەیدانی ئارام وەکوو ئەوە وایە، کۆمەڵە نەک هەر لە ڕووی ڕێکخستنەوە سەرلەنوێ دروست بکرێتەوە، بەڵکە لە ڕووی ڕێباز و فکریشەوە سەرلەنوێ دابڕێژرێتەوە.

ئارام پێی وابوو ماویزم ڕێبازی ڕاستەقینەی مارکسیزم نییە و پێویستە تەنها وەکوو ئەزموونێک لەبەرچاو بگیرێت. هەر بۆیە پاشکۆی 'ئەندێشەی ماو تسیتۆنگ'ی لە ناوی کۆمەڵە کردەوە و تەنها مارکسیی لینینی هێشتەوە.

ئەگەرچی بیروباوەڕی ماوی دوورە لە مارکسیزم-لینینیزمەوە و ناکرێت تەنانەت وەکوو ئەزموونێکیش تێی بڕوانی، وەلێ بۆ ئەو دەورانە کە بیروباوەڕی ماوی تەواوی فکری کۆمەڵە و ڕێکخراوە چەپەکانی وڵاتانی ئاسیا، ئەفەریقا و ئەمەریکای لاتینی زەوت کردبوو، دوورکەوتنەوە لە ماویزم و بە حیساب نەهێنانی وەکوو سەرچاوەیەکی مارکسی، هەنگاوێکی نەک هەر زۆر هۆشیارانە بوو، بەڵکە ئێجگار نەترسانەش بووە.

ئەو هەنگاوەی ئارام نای، دیسانەوە یانی دوورکەوتنەوە لە تێزی سێ جیهانیی ماو تسیتۆنگ و ڕزگارکردنی کۆمەڵە لەو ناکۆکی و پارادۆکسەی کە چەندین ساڵ

---

٦٦. ئارام و بزووتنەوەی شۆڕشگێری کورد، نووسین و ئامادەکردنی محەمەد شێخ عەبدولکەریم سۆڵەیی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٢٨٧.

٦٧. حاجی مەمۆ، دیمانە، سازدانی: ڕزگار ڕەزا چووچانی، گۆڤاری سفیل، ١٧ی نیسانی ساڵی ٢٠١١.

بوو گیرۆدەی ببوو. ئارام جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، ناکۆکیی ئێمە لەگەڵ حکوومەتی بەعس، ناکۆکیی سانەوەی نییە، بەڵکە سەرەکییە.

بێگومان لە سەرەتادا ئارامیش وەکوو باقی هەڵسووڕاوانی ئەو ڕەوتە، بڕوای بە بیر و ئەندێشەی ماو تسیتۆنگ وەکوو سەرچاوەیەکی ئەسڵی هەبووە و تەنانەت لە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٧١دا بەنیاز بوونە بۆ کۆمیتەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە نێزافەی بکەن.[٦٨] بەڵام وای پێ دەچێت، لەپاش چەند ساڵێک تێڕوانینی ئەو گۆڕانی بەسەردا هاتبێت، هەر وەکوو دەبینین چۆن دواتر لەگەڵ ڕابەرایەتیی کۆمەڵەدا لە هێندێک پرس و مەسەلەدا ناکۆک و ناتەبا بووە.

گەڕانەوەی ئارام بۆ مارکسیزم-لینینیزم و دوورکەوتنەوە لە ماویزم هەر وا نرووشمێک نەبوو لەلای ئەو، هەر بۆیە ئەگەر سەرنج بدەین، ئارام لە ژمارە (١)ی بلاوکراوەی ئاڵای شۆڕش لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٧دا، بەبۆنەی شەستەمین ساڵڕۆژی نووسینەوەی کتێبی "دەوڵەت و شۆڕش" لەلایەن "لینین"ەوە، هەڵسەنگاندنێک دەربارەی ئەو کتێبە دەنووسێت و لە چەندین شوێنی دیکەش ئاماژە بە وتە و تێڕوانینەکانی لینین دەکات.

ئەگەرچی ئارام هێشتا لە دیدگای ماوییی قۆناغبەندیی شۆڕش و چوار چینەکەی شۆڕشی نیشتمانیی دیموکراتیی ڕزگاری نەبووبوو، وەلێ ئەمە لەو هەنگاوە گرنگەی ئەو نای، کەم ناکاتەوە. بەڵام لێرەشدا ئەبێ ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بکەین:

ئارام دەڵێت: "لەم سەردەمەدا کە بۆرژوازی نەک هەر گوڕی شۆڕشگێڕانەی سەردەمی شۆڕشی بۆرژوازی تێدا نەماوە، بەڵکوو بووەتە چینێکی کۆنەپەرست و چەوسێنەر و مومکین نییە سەرکردایەتیی شۆڕشی دیموکراتی بکات، چ جای شۆڕشی سۆشیالیستی".[٦٩]

واتە، لەلایەکەوە ئارام پێی وا بووە، بۆرژوازی لەم سەردەمەدا نەک هەر وەکوو سەردەمی شۆڕشە بۆرژواییەکان شۆڕشگێڕ نییە و توانای وەڵامدانەوەی پرسە دیموکراتیکەکانی نییە، بەڵکوو کۆنەپەرست و ڕێگریشە، لە لایەکی دیکەوە بەم

---

٦٨. فوئاد قەرەداغی، دەربارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، بەشی سێیەم و کۆتایی، دیمانە: ڕزگار ڕەزا چووچانی، گۆڤاری سڤیل، ژمارە ٢١٠، ٢٠١٣/١٢/١٤.

٦٩. ئارام، ئاڵای شۆڕش، ژمارە ١، ئەیلوولی ١٩٧٧.

تێڕوانینەی تیژی "گەشەی ناسەرمایەداری" ڕەت دەکاتەوە کە پێی وا بوو، حیزبی بەعس و دەسەڵاتەکەی بە کۆمەکی دەوڵەتی سۆڤیەتی دەتوانێت هەنگاو بەرەو دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی سۆشیالیستی هەڵبگرێت.

خاڵێکی دیکەی زۆر گرنگ کە هەتا ئێستاش مشتومڕی زۆری لەسەرە و هەر یەکە بەگوێرەی حەز و ئیشتیا و بەگوێرەی بەرژەوەندیی خۆی بەملا و بەولادا دەیبات، دید و تێڕوانینی ئارام بۆ سنووری کاری کۆمەڵەیە. بە مانایەکی تر، ئارام کوردستانی بووە یان عێراقی؟

مەلا بەختیار ئەڵێت: "دوور و نزیک، چەند لەگەڵ شەهید ئارام بووم، شەوانم لەگەڵ بەسەر بردووە، ڕۆژم لەگەڵ کردووەتەوە، سەدان کۆبوونەوە و دانیشتن و پێکەوەقسەکردنمان هەبووە، باسی جیهان، عێراق، مارکسیزم، کوردستان، لایەنەکان و ململانێکان، ئەوەی هەبووە و پێشبینی کردووە، بۆی باس کردووم، بۆ یەک جاریش هەستم پێ نەکردووە، ئارام باوەڕی بە حیزبی سەرتاسەریی کرێکارانی عێراق هەبووبێت."[٧٠]

ئەوەی جێگای سەرنجە لێرەدا ئەوەیە، مەلا بەختیار باسی هەستی خۆیمان بۆ دەکات، لە کاتێکدا بۆ یەکلاکردنەوەی بابەتییانەی پرسێکی لەم جۆرە، هەست حیسابی لەسەر نییە! بەڵام ئەوە جێگای پرسیارە، ئەگەر ئارام لەسەر ئەو هەموو بابەتانە قسەی بۆ کردووە کە بێگومان پێکەوە بوونە و قسەیان کردووە، بۆچی ڕا و بۆچوونی خودی ئارام باس ناکات و پەنا بۆ هەستەکانی خۆی دەبات؟!

حاجی مەمۆ لە چاوپێکەوتنێکدا ئەڵێت، ئارام لە بەیاننامەی شوباتدا ئەڵێت: "... ئێمە وەک کۆمەڵە کاتێک دەتوانین بڕیار بدەین کوردستانیین یان عێراقیین، بە کردەوە خاوەنی دیراسە، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی ورد لە هەموو پرسە ئایدیۆلۆجی و سیاسی و ئابوورییەکان بین."[٧١]

هەروەها حاجی مەمۆ لە هەمان چاوپێکەوتندا باسی ئەو نووسینەی مەلا بەختیار بە ناوی "هەڵوێست"ەوە دەکات کە کاتی خۆی بەنهێنی بڵاوی کردەوە و دەڵێت: "...

---

٧٠. مەلا بەختیار، چۆن چەپکێک و کام مێژووی کۆمەڵە؟! بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، ساڵی ٢١٢، ل ٩٧.

٧١. حاجی مەمۆ، دیمانە، سازدانی: ڕزگار ڕەزا چووچانی، گۆڤاری سڤیل، ١٧ی نیسانی ساڵی ٢٠١١.

یەکێـک لەو کەسـانەی کە لە کۆنفرانسـەکەدا دەرچـوو، نووسـراوێکی لەسـەر کوردسـتانی و عێراقیبـوون نووسـیبوو، تـا ڕادەیەک ڕەخـنەی لە مەسـەلەی کوردسـتانی گرتبـوو، بەو چوارچێـوەیەی کە برادەرانـی تـر باسـیان کردبـوو. بەگوێرەی ئەو بیروباوەڕەی خۆی هەیبووە، باسی ئەوەی کردبوو، ئەو پرسانە بە توێژینەوەی قووڵ و لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر کۆمەڵی کوردستانی و عێراقییەوە بەندن.[72]

کەواتە، ئەو تێڕوانینەی کە لەنێو نووسراوەی "هەڵوێست"دا هاتبوو، هەمان ئەو تێڕوانینە بوو کە لەنێو "بەیاننامەی شوبات"دا هەبوو. ئەمەش شتێکی لۆژیکییە، چونکە "هەڵوێست" لە لایەن لایەنگرانی خەتی ئارامەوە نووسرابووەوە و "بەیاننامەی شوبات"یش لەلایەن خودی ئارامەوە نووسرابوو.

هەروەها بەهۆی ئەو تێڕوانینەوە کە لە نووسراوەی "هەڵوێست"دا هاتووە، تێڕوانینی نێو "بەیاننامەی شوبات"یش پشتڕاست دەبێتەوە، چونکە ئەمان لایەنگری ئارامن و تێڕوانینی ئەو دووبارە دەنووسنەوە.

ئالێرەوە ئیدی بەو ئەنجامە ئەگەین، ئارام هەتا ئەو دەمەی گیانی بەخشیوە، نە کوردستانی و نە عێراقی بووە، چونکە ئەو پێی وابووە بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو مەسەلەیە، پێویست بەوە دەکات لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی هەمە لایەنە بکرێت.

کەواتە، ئارام هەر بەو ڕادەیەی کوردستانی بووە، بە هەمان ڕادەش عێراقی بووە، بە پێچەوانەشەوە، هەر بەو ڕادەیەی عێراقی نەبووە، بە هەمان ڕادەش کوردستانی نەبووە.

کەواتە، ئەگەر لێکۆڵینەوە بۆ کۆمەڵگای عێراق و کوردستان کرا و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە بەوە گەیشت کە کرێکارانی عێراق و کوردستان پێویستییان بە حیزبێکی سەرتاسەریی مارکسیی لینینیی عێراقی هەیە، ئەوا ئارام خەباتی بۆ پێکهێنانی ئەو حیزبە دەکرد و دژ نەبووە.

فوئاد قەرەداغی دەڵێت: "ئارام لە ڕێگەی هاوڕێ ئەوڕەحمانی حاجی مەلا سدیقی قەرەداغی (گۆران قەرەداغی)یەوە چەند جارێک پێشنیازی کردبوو بچینەوە ناو

---

٧٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

کۆمەڵە بە بیروباوەڕی خۆمانەوە، واتە، بە فکری عێراقییەوە. ئێمە لە دەمی ئەوەوە دەمانبیست، فکری ئارام زۆر لە فکری ئێمەوە نزیکە. بە گوتەی ئەو، ئارام لەسەر پێویستیی یەک حیزبی مارکسیی لینینی لە سنووری هەر دەوڵەتێکدا فکری ڕۆشن بوو. هەندێک جاریش بە گاڵتە و پێکەنینەوە، سەردەمی دامەزراندنی کۆمەڵە و ئەو ناکۆکییانەی بوونە هۆی کەرتکردنی، بە سەردەمی کۆمەڵەی عەهدی بائید ناو دەبرد.[73]

بەپێی لێکۆڵینەوەیەک کە لە پێشدا کردمان، ئارام هێشتا خۆی لەسەر پێویستی یەک حیزبی مارکسی لینینی لە سنووری دەوڵەتی عێراقدا ساغ نەکردبووەوە و ئەوەی بۆ دوای لێکۆڵینەوە هێشتبووەوە. بەڵام ئەوەیان دروستە کە ئارام لە فکری ئەوانەوە زۆر نزیک بووە. هەر ئەمانەشە وای لە ئارام کردووە، داوا لەو کەسانە بکات کە لە ساڵی ١٩٧١دا بەهۆی تێڕوانینی عێراقییانەوە لە کۆمەڵە جوودابوونەوە، دووبارە و بە تێڕوانینی خۆیانەوە بێنەوە نێو کۆمەڵە.

کەواتە، ئەگەرچی ئارام لە فکری ئەوانەوە زۆر نزیک بووە، بەڵام هەر وەکوو ئەوان نەبووە، چونکە ئەوان خۆیان یەکلا کردبووەوە و عێراقی بوون.

ئێستا با بڕێک ڕۆچینە نێو نووسینەکانی خودی ئارام خۆیەوە کە باشترین بەڵگە و نیشانەن بۆ دید و تێڕوانینی ئەو و بزانین چی دەڵێت: "سەبارەت بەوەی، کە شۆڕشەکەمان بریتی **نییە** لە **بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی تەسکی گەلی کورد**، **بەڵکوو شۆڕشی دیموکراتیی گەلی عێراقە** و لە کوردستانەوە بەهۆی تەقینەوەی ناکۆکییەکانەوە، هەروەها لە سایەی باشهەڵکەوتنی خاکی کوردستان دەستی پێ کردووە و بۆ ئەوەی بە عەمەلی ئەمە جێبەجێ بکرێت، بەپێی ئەو واقیعە نەخشە بۆ مەسەلەی بەرەی یەکگرتووی گەل بکێشین و لە ڕێی **خەباتی یەکگرتووی هێزە شۆڕشگێڕەکانی گەلی عێراقدا** کۆتایی بە دەسەڵاتی **بەعسی فاشیست** بهێنین و لەجێی ئەمە دەسەڵاتی دیموکراتیی گەل دامەزرێنین. کاتێک، کە گەلی عێراق لە

---

٧٣. فوئاد قەرەداغی، مێژووی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، بەشی دووەم و کۆتایی، سازدانی: کەمال ڕەئووف، هاوڵاتی، ژمارە ٤١٢، ٩/٤/٢٠٠٨، ل ٤. فوئاد قەرەداغی، دەربارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، بەشی سێیەم و کۆتایی، دیمانە: ڕزگار ڕەزا چووچانی، گۆڤاری سڤیل، ژمارە ٢١٠، ٢٠١٣/١٢/١٤.

سایەی ئەم سیستەمەدا بە دیموکراسیی ڕاستەقینە شاد ئەبێت، **ئینجا وە تەنیا ئەو کاتەش** کورد بە **هەموو** مافەکانی خۆی دەگات"[74]

لێرەدا ئارام بەڕۆشنی ئەڵێت، شۆڕشەکەمان بزووتنەوەیەکی تەسکی نەتەوەیی نییە و چارەنووسی کورد لە عێراقدا بەند و گرێدراوی چارەنووسی خەڵکی باقیی عێراقە و خەباتی نەتەوەی کورد بۆ لابردنی ستەمی میللیش بەند و گرێدراوی خەباتی خەڵکی عێراق بۆ دیموکراتییە. سرووشتی ڕژێمەکەش فاشییە و بە گفتوگۆ و دانوستان کێشەی ستەمی میللی کورد چارەسەر نابێت، بەڵکە دەبێت ئەو ڕژێمە بڕووخێنرێت و دەسەڵاتێکی دیموکراتی لە شوێن دابنرێت. ئارام لێرەدا بەدیاریکراویش باسی ئەوە دەکات، ڕووخاندنی ئەو ڕژێمە لە ڕێگەی خەباتی یەکگرتووی هێزە شۆڕشگێڕەکانی گەلی عێراقەوە دەبێت و تەنانەت شێواز و فۆرمی ئەو یەکگرتنەش بەڕۆشنی دیاری دەکات، ئەویش "بەرەی گەل"ە.

کەواتە، لە دیدی ئارامەوە، کێشەی کورد لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا، بەند و گرێدراوی کێشەی سەرجەم خەڵکی ئەو وڵاتەیە کە تیایدا دەژێت و بەو پێیەش کێشەی میللیی کورد لە کوردستانی عێراقدا بەند و گرێدراوی خەباتی سەرجەم خەڵکی عێراقە بۆ دیموکراتی. ئارام لە شوێنێکی دیکەدا بەڕۆشنی باسی کێشەی میللیی کورد لە پارچەکانی دیکەی کوردستاندا دەکات و دەڵێت: "سەبارەت بەوەی کە گەلی کورد و کوردستانی نیشتمانی بەپێی بەرژەوەندیی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستانی ناوچەکە دابەش کراوە، **هەر بەشێکی لە چوارچێوەی سیاسی و ئابووریی دەوڵەتێکدایە** و لەگەڵ گەلانی تری ناو ئەو دەوڵەتەدا دووچاری **یەک ڕژێم بوون** و چینە کۆنەپەرستەکانی گەلانی ئەو دەوڵەتە **بە چینە کۆنەپەرستەکانی کوردیشەوە** لەو وڵاتەدا گەلانی ئەو وڵاتە ئەچەوسێننەوە، بە **هەموویان ئامانجێکی ناوکۆییان** هەیە، کە بریتییە لە هەڵتەکاندنی دەسەڵاتی چینە کۆنەپەرستەکان و دامەزراندنی دەسەڵاتی دیموکراتییانەی گەل، کە لە سایەیدا چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و هەروەها هەموو چەوساندنەوەیەکی تر نەمێنێ ..."[75]

---

٧٤. ئارام و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کورد، نووسین و ئامادەکردنی محەمەد شێخ عەبدولکەریم سوڵەیی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ١٦٤.

٧٥. هەڵبژاردەیەک لە نووسینەکانی شەهید ئارام، بەشی یەکەم، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، کانوونی دووەم، ساڵی ١٩٨٠، ل ٦٦.

پاشان ئارام ئەڵێت: "یەکێتیی خەباتی مارکسییە لینینییەکانی عێراق کە ئەمڕۆ لە وڵاتەکەماندا چەندین ڕێکخراو و گرووپ و دەستە و کەسانی مارکسیی لینینی هەن و پێویستە خەبات بکرێت بۆ پەیداکردنی **باشترین و مومکینترین شێوە** خەباتی یەکگرتوو"[٧٦]

دوای ئەوەی ئارام شیکاری ئەوەی کرد کە چارەنووسی سەرجەم خەڵکی عێراق بە کوردستانیشەوە بەند و گرێدراوی ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی ناوەندییە، بە پێویستی دەزانێت کە مارکسیست-لینینستەکانی عێراقیش، وەکوو پێشڕەوانی چینی کرێکاری عێراق پێکەوە بەو کارە هەستن و خەباتیان بە یەکەوە گرێ بدەن و یەک بگرن. وەلێ لێرەدا ئارام بە ڕۆشنی باسی جۆری ئەو یەکگرتنەی نەکردووە و باسی ئەوەی نەکردووە کە بە چ جۆرە فۆرمێک مارکسییە لینینییەکانی عێراق یەک بگرن. چونکە ئەو یەکگرتنە ئەشێ یەکگرتن بێت لە چوارچێوەی یەک حیزبی مارکسیی لینینی و ئەشێت یەکگرتنی دوو حیزبی مارکسیی لینینی بێت لە فۆرمی بەرەیەک وەیان هەر شێوازێکی دیکەدا.

بەڵام هەر لەنێو ئەو قسانەدا و لە هەمان کاتدا جەختی لەوە کردووەتەوە کە دەبێت ئەو خەباتە یەکگرتووانەیە بە باشترین و مومکینترین شێوە بە کردەوە دەربهێنرێت.

کەواتە، بەلای ئارامەوە، ئەگەر پێی وابوو باشترین و مومکینترین فۆرم، حیزبی مارکسیی لینینی کرێکارانی سەرتاسەری عێراقە، ئەوا ئەو هەنگاوی بۆ دەنێت و هیچ گرفتێکی نییە.

ئەگەر تێبینی بکەین، ئەوەی بەهیچ جۆرێک لە فکری ئارامدا بەدی ناکرێت، پێکهێنانی حیزبی چینی کرێکار لەسەر ئاستی کوردستانی گەورەدایە.

ئارام وەکوو مارکسیستێک بڕوای تەواوی بە ڕزگاربوونی نەتەوەی کورد لە جەور و ستەم هەبوو، بەڵام ئەو کەسێکی نەتەوە پەرست نەبوو. ئەو بڕوای نەک

---

٧٦. ئارام و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کورد، نووسین و ئامادەکردنی محەمەد شێخ عەبدولکەریم سۆڵەیی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ١٦٨.

هەر بە ڕزگاریی نەتەوەی کورد، بەڵکە بڕوای تەواوی بە ڕزگاریی گشت نەتەوە ژێردەستەکانی جیهان و هاوخەباتییان هەبوو.

ئەو هێشتا بڕیاری نەدابوو حیزبێکی کوردستانی یان عێراقی پێک بهێنێت، ئەو بابەتەی بە لێکۆڵینەوەی هەمە لایەنە لە کۆمەڵگای عێراق و کوردستانەوە، یان بە بارودۆخی "شۆڕش" لە ناوەڕاست و باشووری عێراقەوە گرێ دابوو. بێجگە لەوەش ئەو کەسێک بوو، زۆر حیسابی بۆ "ئەرزی واقیع" ئەکرد و زۆر دژی "کلێشەسازی و دۆگماکاری" بوو.

لێرەدا جێگای خۆیەتی زۆر بەکورتی قسەیەک لەو دید و تێڕوانینەش بکەین، یەکەم: ئارامیش هەر وەکوو باو بوو، هەبوونی باسکی چەکدار و دەستپێکردنی چالاکیی سەربازی بە شۆڕش ناو بردووە کە لێکدانەوەیەکی نادروست و گومڕاکەرانەیە. دووەم: بۆ دیاریکردنی سنووری کاری حیزبێکی کۆمۆنیستی لە وڵاتێکدا و لەنێویشیاندا عێراق، ئەوە یەکلا بووەتەوە کە لە جوگرافیا و یەکەیەکی ئابووری-سیاسی-قانوونیدا حیزبێکی سەرتاسەری پێویستە و لێکۆڵینەوەی زیاتری گەرەک نییە، ئەمە بە جیا لەوەی ئەو کارە بە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی چەکداری لە باقیی ناوچەکانی دیکەی عێراقەوە گرێی نەخواردووە.

کەواتە: ئارام کوردستانی نەبوو، هەر وەکوو چۆن عێراقیش نە بوو. بەڵام هەنووکە وێنایەکی وا دزێو بە عێراقیبوون دراوە، ئەوانەی ئەم ڕاستییەش دەربارەی ئارام دەزانن، نکۆڵی لێ دەکەن و دەڵێن، ئارام کوردستانی بووە. ئەوە تەزویرێکی گەورەی فکری ئارامە.

ئارام عێراقیبوونی پێ نەنگ نەبوو. ئەوە ناسیۆنالیستەکانی کوردن ئەوەیان کردووە بە عەیبە، ئەوەش تەنها بۆئەوەی وەکوو ناسیۆنالیستێکی کوردستانی شەریکی دزییەکانی عێراق ببنەوە و بەنێوی کوردستانەوە داوای پشکی زیاتر بکەن و بیخۆن و خەڵکی کرێکار و زەحمەتکێشی کوردستانیش برسی و ڕەزیل، داماو و بەدبەخت بکەن، هەر وەکوو کردیان.

بەڵێ، بەلای ئارامەوە ئەسڵ ئەوە بوو، خەباتی چەوساوەکان چۆن باشتر و زووتر دەچێتە پێشەوە. ئەگەر ڕێکخراوی مارکسیست-لێنینستەکان لە ناوەڕاست و

باشووری عێراق ڕێکخراوتر بووایە و خەباتی بچووایەتە ئاستێکی دیکەوە، ئەوا ئارام بێ هیچ گومان و دوودڵییەک، کۆمەڵەی دەکردە فەسیلێک بۆ دامەزراندنی ئەو ڕێکخراوە عێراقییە.

ئێستا بێجگە لەم مەسەلە فکرییانە، خاڵێکی زۆر گرنگ و پرشنگدار سەبارەت بە کەسایەتیی ئارام و ئیرادە و بڕوای پتەوی ئەوە بە بیروباوەڕەکەی کە ناکرێت باسی نەکەین و بازی بەسەردا بدەین، ئەویش ڕۆنانی دەستەی چەکدار و بڕیاری دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدارییە. دۆخی کوردستان لەدوای شکستی بزووتنەوەی چەکداریی کوردستان بە ڕێبەرایەتیی پارتی و بارزانی ئێجگار سەخت و دژوار بوو، ڕەشبینی و بێئومێدی باڵی بەسەر تەواوی خەڵکی کوردستاندا کێشا بوو. حکوومەتی بەعس لەوپەڕی بەهێزی و ڕەونەقی خۆیدا بوو. بەدەستهێنانی تفەنگێک بۆ چەکدارکردنی پێشمەرگەیەک و تایپێک بۆ نووسینەوەی بەیانێک ئەستەم بوو. باسی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداریت بکردایە، پێیان وابوو ئەوە خەونە و بە پێکەنینێکی تەنزئامێزەوە پێتیان دەگوت: مەلا مستەفا بە سەد هەزار چەکدارەوە هیچی پێ نەکرا، ئێستا ئێوە چیتان پێ دەکرێت!

لە دۆخێکی ئاوەهادا ڕابەرایەتیی کۆمەڵە ئاشکرا بووە و کوردستانی بەجێ هێشتووە و ئاودیوی ئێران بووە. ئارام ئەو کارەی ئەوان بەهەڵە دەزانێ و ڕەخنەی توندیان لێ دەگرێت و خۆی دێتە نێو مەیدانەکەوە.

'ئارام'یش هەر بە وێنەی خاڵە شەهاب و باقیی ڕابەرایەتیی کۆمەڵە ئاشکرا دەبێت و دەستگا ئەمنییەکانی بەعس تاقیبی دەکەن. وەلێ ئەو بەو حاڵەشەوە توانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بنێتەوە سەرپێ و دەستەی چەکداریش دابمەزرێنێ. دوای ئەوەی کارەکانی هێنایەوە ئوسووڵ، بڕیاری دا خۆیشی بچێتە شاخ و لەوێوە سەرپەرشتیی خەباتی ڕێکخراوەیی و چەکداریی کۆمەڵە بکات.

ئەوەی ئارام لەو دۆخەدا کردی، شێت، یان مرۆڤێکی بیروباوەڕ پۆڵایینی نا ئاسایی دەیکات. بۆیە ئارام ئەفسانە بوو!

ئارام لە نیوەڕوانێکی ڕێکەوتی ١٩٧٨/١/٣١دا لە گوندی تەنگیسەر گیانی بەخشی. بە گیانلەدەستدانی ئارام، وردە وردە ئەو قۆناغەش کۆتایی پێ دێت.

هێشتا ئارام شەهید نەبووبوو، یەکەمین کۆبوونەوەی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە برادۆست دەبەسترێت. ئارام بۆ ئەو کۆبوونەوەیە ناچێت. نوێنەرانی کۆمەڵە لەوێدا بریتی بوون لە: سالار عەزیز، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی، عومەری حاجی عەبدوڵا.

بەپێی گێڕانەوەی نەوشیروان مستەفا، ئەمانە داوا لە نەوشیروان ئەکەن، بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگیی هێزی نێوان کۆمەڵە و بزووتنەوە لەنێو سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا، ئەویش یەکێک بێت لە نوێنەرەکانی کۆمەڵە.

نەوشیروان مستەفا ئەڵێت، چەند هەوڵم دا کە من نەبمە نوێنەری کۆمەڵە و پێیانم وت: لێتان ناشارمەوە، "من باوەڕم بە کۆمۆنیزم نییە" ... بەڵام قسەکانی من هیچ سوودێکی نەبوو. هەروەها ئەڵێت: "مام جەلالیش ڕای وا بوو کە پێویستە من لەناو کۆمەڵەدا بمێنمەوە، بۆئەوەی بەباری باشەدا کاریان تێ بکەم.[٧٧]

بەڵام مەلا بەختیار ئەڵێت: سەیر ئەوەیە، لە یەکەمین کۆبوونەوەی سەرکردایەتی دوای گەڕانەوەی مام جەلال لە ئابی ساڵی ١٩٧٧ لە دۆڵی گۆستێ، کاک نەوشیروان خۆی بەناوی کۆمەڵەوە ڕاگەیاند. کە هاتە سەر هەڵبژاردنی نوێنەری لایەنەکان بۆ سەرکردایەتی، شەهید عەلی عەسکەری، "بایز ئاغا"ی وەکوو یەکێک لە کاندیدەکانی بزووتنەوە هەڵبژارد، کاک نەوشیروان بەناوی کۆمەڵەوە ڕەتی کردەوە.[٧٨]

پێ دەچێت، سەرکردایەتیی کۆمەڵە ... ئەم هەڵوێستەی نەوشیروان مستەفایان لە بەرانبەر نوێنەرە بە ئەزموون و ناسراوەکانی "بزووتنەوە"دا پێ خۆش بووبێت.[٧٩] هەروەها پێ دەچێت، خودی شەهید ئارامیش دژی ئەم کارە نەبووبێت، بە تایبەتی ئارام هێندە بڕوای بە توانا و توانستی خۆی هەبووە و هێندە جەختی لەسەر سەربەخۆیی فکری و ڕێکخراوەیی کۆمەڵە کردووەتەوە، هیچ ترس و بیمێکی لەو ڕووە نەبووە، کەسێکی وەکوو نەوشیروان ببێتە نوێنەر و نماییندەی کۆمەڵە. بەڵام

---

٧٧. نەوشیروان مستەفا ئەمین، لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، ساڵی ١٩٩٧، ل ١٧٢.

٧٨. مەلا بەختیار، چۆن چەپکێک و کام مێژووی کۆمەڵە؟! بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، ساڵی ٢١٢، ل ٣٧٧.

٧٩. پشکۆ نەجمەدین، لە پەراوێزی مێژووی کۆمەڵەدا.. خوێندنەوەیەک بۆ کتێبی "کۆمەڵە لە سێدارەوە بۆ ڕاپەڕین"، فێبریوەر و مارسی ٢٠١٣.

نەیدەزانی لە حاڵەتی تێچوونی خۆی، ئەوە چ گرفتێکە و ئەو قەڵایەی ئەو چۆن بەسانایی فەتح دەکرێت.

بە هاتنی نەوشیروان مستەفا بۆ نێو کۆمەڵە و پاشان شەهیدبوونی ئارام، قۆناغی سێیەمی کۆمەڵە دەست پێ دەکات یانی: قۆناغی خاڵیکردنەوەی کۆمەڵە و ڕێبەرایەتیی نەوشیروان مستەفا ئەمین.

لە ڕێکەوتی ١٩٨٧/١١/٥دا کۆبوونەوەی فراوانی ڕێبەرایەتی و کادرانی کۆمەڵە لە گوندی شێنێ دەبەسترێت. لەم کۆبوونەوەیەدا نەوشیروان مستەفا وەکوو کەسی یەکەمی کۆمەڵە هەڵدەبژێردرێ و دەستەواژەی "مارکسیی لینینی" لە ناوی کۆمەڵە دەکەنەوە و ئەیکەن بە، "کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان-عێراق".[٨٠]

نەوشیروان مستەفا بڕوای بە کۆمۆنیزم و ڕێکخراوی سەربەخۆی چینی کرێکار نەبوو. لە کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵەدا کە من خۆم لەوێ بووم، نەوشیروان ڕاشکاوانە و لەبەردەم تەواوی ئەندامانی کۆنفرانسدا گوتی: کۆمۆنیزم گەڕ و گول، سووک و سەلیم بووە!

نەوشیروان مستەفا بڕوای وا بوو، لەگەڵ کەسانی وەکوو دکتۆر خالید و عەلی عەسکەری ڕێکخستنێکی تازە بەگوێرەی پێویستییەکانی شۆڕشەکە دابمەزرێنن کە جێگەی بزووتنەوە و کۆمەڵە و خەتی گشتی بگرێتەوە.[٨١]

مامۆستا جەعفەر ئەڵێت: "کاک نەوشیروان لە ساڵی ١٩٧٨ لایەنگری ئەوە بوو، ئەندامە پاک و خاوێن و دڵسۆزەکانی ناو هەر سێ باڵەکەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە نزیک ناوچەی سێسنوور کۆنگرەیەک ببەستن و ئەو حیزبە ڕابگەیەنرێت".[٨٢]

مام جەلالیش کە پێی خۆش بووە نەوشیروان مستەفا لەنێو کۆمەڵەدا بێت و هانی داوە، دیسانەوە بڕوای هەر وەکوو نەوشیروان مستەفا بووە.

ئەوەبوو لە باسەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٠دا و چەند مانگێک لەپاش ڕۆنانی کۆمەڵە، چۆن مام جەلال لە کۆنگرەی پارتی-باڵی جەلالیدا هەوڵی زۆری داوە ئەو پارتە حەل نەکرێت.

---

٨٠ برایم جەلال، چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، چاپخانەی ڕوون، ساڵی ٢٠١١، ل ٢٣٢-٢٣٥.

٨١ نەوشیروان مستەفا ئەمین، لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، ساڵی ١٩٩٧، ل ١٧٢.

٨٢ مامۆستا جەعفەر، هەورێکی نەزۆک و مێژوویەکی ناکۆک، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠١١، ل ٦٤.

عەبدولستار تاهیر شەریف لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەیگێڕێتەوە و دەڵێت، لە ڕێکەوتی ١٩٧٢/٤/١٤ بۆ سەردانیکردنی مام جەلال چووم بۆ گەڵاڵە. مام جەلال پێی وتم، بەڵکوو بتوانن لە بەغدا کارێکی وا بکەن، هێزەکەی خێزانم بە ناوی چارەسەرکردنەوە بۆ بەیرووت بنێرن ... هەروەها هەوڵ بدەن ئەندامە کۆنەکانی پارتیی جەماعەتەکەی خۆمان لە یەکتری نەپچڕێن و ئاگاداری یەکتری بن، تا شتێک دروست دەکەین.[٨٣]

فەرەیدوون عەبدولقادر باسی نامەیەکی مام جەلال دەکات کە لە ساڵی ١٩٧٣دا لە دەرەوەی وڵاتەوە بۆ کۆمەڵەی ناردووە و ئەڵێت: "وردتر ئەڵێم، ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەمێک بوو هەنگاوی بۆ دەنرا. بیرۆکەکەی لە ساڵی ١٩٧٣ لە نامەیەکدا بۆی نووسیبووین، کە ڕێکخستنێکی فراوان بۆ جوولانەوەی کوردستان پێویستە، بە مەرجێک بە کۆمەڵە موتووربە بکرێت (نموونەیەکی نوێ لە حیزبی شۆڕش و ڕزگاری). ئەو کاتە ئەم نامەیە هەلایەکی نایەوە و وا لێک درایەوە، ئەگەر وا بکەین، هەموو ئەو خەونە جوانانەی بە کۆمەڵەوە ئەیانبینین، ئەبنە تراویلکە و واقیعی جەلالی و مەلایی لە بەرگێکی تردا دێتە کایەوە.[٨٤]

نەوشیروان مستەفا باسی سەرەتای دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥دا دەکات و ئەڵێت: "مام جەلال لە سەرەتادا ڕای وابوو، هەموو تێکۆشەرانی کورد لە چەپەوە بۆ ڕاست لە یەک ڕێکخراوی فراواندا یەک بخرێن.[٨٥]

ئێستا ئیدی نەوشیروان مستەفا کەسی یەکەمی کۆمەڵەیە و ئاشکراشە کە چۆن بیر دەکاتەوە. ئێستا ئیدی مام جەلال لەپشت نەوشیروان مستەفاوەیە و ئاراستەی دەکات و ئاشکراشە کە چۆن بیر دەکاتەوە.

یانی ئەم دوو کەسایەتییە کاریگەرە (مام جەلال و نەوشیروان مستەفا) بڕوایان بە کۆمۆنیزم، مارکسیزم-لینینیزم، حیزبی چینایەتی و سەربەخۆی چینی کرێکار، پارتی پێشڕەو، بەرەی گەل و لەشکری گەل نەبووە. ئەمانە بڕوایان بەوە بووە، لە

٨٣ ململانی لەگەڵ ژیاندا، د. عەبدولستار تاهیر شەریف، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی ئارابخا، کەرکووک، ٢٠٠٨، ل ١٨١.

٨٤ فەرەیدوون عەبدولقادر، کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، چاپ: دەستگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٢، ل ١٠٥، ١١١.

٨٥ نەوشیروان مستەفا ئەمین، لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، ساڵی ١٩٩٧، ل ٤٢.

هەر سێ باڵەکەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان حیزبێکی فراوان بۆ "هەموو چینەکان" و بۆ "هەموو مەیلەکان" لەمپەڕی چەپەوە بۆ ئەوپەڕی ڕاست دابمەزرێنن. واتە، بیریان لەوە کردووەتەوە "کۆمەڵە" لەنێو ئەو حیزبەدا بتوێننەوە و حەلی بکەن.

هەر بۆیە ئەوانەی پێداگرییان لەسەر مانەوە و سەربەخۆیی فکری و ڕێکخراوەیی کۆمەڵە کردووە بە وێنەی شەهید ئارام و هاوەڵانی، کۆسپی گەورەی بەردەم ئەم نەخشە و نیازە بوونە.

هەر وەکوو گوتمان، لە هەنگاوی یەکەمدا و لە کۆبوونەوەی فراوانی کۆمەڵەدا، بە بیانووی ئەوەی ناوی کۆمەڵە بۆ سەرکردایەتیکردنی شۆڕشی کورد نەگونجاوە و لەگەڵ سەلیقەی تاکی کورددا نایەتەوە، لە "کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان-عێراق"ەوە گۆڕییان بە: "کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان-عێراق".

لە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە، لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨١دا، پاشکۆی "داش عێراق" لە ناوەکەی دەکرێتەوە و دەیکەن بە:

"کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان".

هەر لە هەمان کۆنفرانسدا، لۆگۆیەک بۆ کۆمەڵە دائەنێن، چەکوش و داس و ئەستێرەیەک دەخەنە نێو چوار بازنەوە، چواربازنەکە لە خوارەوە کەلییەکی دەبێت، لەو کەلییەدا وێنەی گوڵەگەنمێک (یان، گوڵە جۆیەک) دادەنرێت.

چەکوش و داس و ئەستێرەکە ئارمی گشت حیزبە کۆمۆنیستەکان بوو لە دنیادا. چەکوش و داسەکە، ئاماژەیە بۆ خەباتی یەکگرتووانەی کرێکاران و جووتیاران و ئەستێرەکەش هێمایە بۆ خەباتی نێونەتەوەیی کرێکاران.

جا لێرەدا کۆمەڵە ئەو ئارمە دەخاتە نێو چوار بازنەوە کە هێمایە بۆ چوار پارچەکەی کوردستان و گوڵەگەنمەکەش ڕەنگبێ بە مانای ئەوە بێت، کوردستان وڵاتێکی کشتوکاڵییە.

لە کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵە لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٨٢دا، تەواوی ئارمەکە دەپێچنەوە، بە چەکوش و داس و ئەستێرە و هەر چوار بازنەکەشەوە.

لە یەکی ئایاری ساڵی ١٩٨٤دا بەیاننامەیەک بە بۆنەی ڕۆژی هاوپشتیی جیهانیی کرێکارانەوە بەم ناونیشانە بڵاو ئەکەنەوە:

"با ۱ی ئایار جەژنی یەکگرتن و ئاشتی بێ!"[86]

بێگومان لێرەدا مەبەستی یەکگرتنی هێز و لایەنە کوردییەکان و ئاشتیی نێوان ئەوان بوو کە لەو کاتەدا یەکێتی لەگەڵ حکوومەتی بەعس ئاگربەستی هەبوو، نەک یەکگرتنی کرێکارانی جیهان!

لە کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە، لە مانگی تەممووزی ساڵی ۱۹۸٤دا، لۆگۆ کۆنەکە دیسانەوە دەهێننەوە مەیدان، بەڵام ئەم جارەیان چوار بازنەکە بەبۆشی و بەبێ چەکوش و داس و ئەستێرەکە. گوڵەگەنمەکەش لەو کەلییەی خوارەوەی بازنەکان لابراوە و بازنەکان بوونەتە چوار بازنەی تەواو.

دیارە ئەم ئاڵوگۆڕانە ڕەنگدانەوەی ئاڵوگۆڕێکە کە بەسەر کرۆکی کۆمەڵەیاندا هیناوە و هەنگاو بەهەنگاو لە ناوەڕۆکەکەیان خاڵی کردووەتەوە.

بێگومان بە هاوشانی ئەم ئاڵوگۆڕانە و تەریب لەگەڵیاندا، هەنگاو بەهەنگاو دەسەڵات و جێگاوڕێگای فراکسیۆنی هێڵی ئارامیشیان لاواز کرد، وە یان هەر نەهێشت.

ئێستا ئیدی خەریکە هەموو شتێک ئامادە دەبێت و ئەو وەختە نزیک دەبێتەوە کە چەنای چەند ساڵ بوو مام جەلال و نەوشیروان مستەفا خەونیان پێوە دەبینی و تەقەلایان بۆ دەکرد کە پێی بگەن، ئەویش تواندنەوەی کۆمەڵە و دامەزراندنی حیزبێکی فراوانی جەماوەری لەمپەڕی چەپەوە بۆ ئەوپەڕی ڕاست.

سەرەنجام کۆمەڵە لە کۆبوونەوەیەکی فراوان لە ساڵی ۱۹۸۸ لە قاسمەڕەش حەل دەکرێت و لەنێو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا ون دەکرێت.

ئەمە دواپەردەی شانۆگەرییەکە بوو، ئالێرەدا دادرایەوە.

لە گفتوگۆیەکی "ڕووداونێت" لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر لە ڕێکەوتی ۲۰۰۹/۳/۲ پرسیار دەکرێت:

ڕووداونێت: بەڵام زۆر لە بنکەی جەماوەریی کۆمەڵە دژی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەکە بوون؟

---

۸٦ بیبلۆگرافیای کتێبی نهێنیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، نەوزاد عەلی ئەحمەد، چاپخانەی هەولێر، ل ۱۲۱.

فەریدوون عەبدولقادر: بەڵێ زۆر دەنگی ناڕازی هەبوون، بەڕاستی ئێمە هەوڵێکی زۆریشمان دا بۆ ئەوەی برادەران بەو بڕیارە ڕازی بکەین، هەندێک بەئاسانی قەناعەتیان نەدەکرد.[87]

لە گفتوگۆیەکی گۆڤاری گوڵان لەگەڵ نەوشیروان مستەفا، سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوە و تواندنەوەی کۆمەڵە پرسیار دەکرێت:

گوڵان: خۆت قەناعەتت بە هەڵوەشاندنەوەکە هەبوو؟

نەوشیروان: بەڵێ ئەو زەمانە قەناعەتم پێی هەبوو، بەڵام ئەزموون دەریخست کە شتێکی هەڵەمان کردووە.

گوڵان: هەستت کرد کە غەدرێکت کردووە؟

نەوشیروان: ئێستا، واتا ئەو دوو سێ ساڵە هەست دەکەم کە کارێکی هەڵەمان کردووە.[88]

ئێستا لێرەدا ئەو پرسیارە خۆی قوت دەکاتەوە:

دوای هەوڵ و کۆشش و ماندووبوونێکی زۆر و پلان و پیلان و نەخشەدارشتن و هەڕەشە و چاوسووركردنەوە و ئازاردان و گرتن و زیندانی و ڕاونانی ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامان و کادرانی کۆمەڵە بۆ لابردنی ئاستەنگ و کۆسپەکانی بەردەم هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە و پاشان حەلکردنی. ئینجا لەپاش چەندین ساڵ لە هەڵوەشاندنەوە و تواندنەوەی کۆمەڵە لەنێو یەکێتی و دامەزراندنی حیزبی فراوانی جێ دڵخوازی خۆی ... نەوشیراون مستەفا پەشیمانە! بۆچی؟

سەرەتا ئەبێ بپرسین: مەبەستی نەوشیروان مستەفا لە کام "کۆمەڵە"یە؟

بێگومان ئەو کۆمەڵەیەی کە لە مارکسیزم و کرێکار و چەپ داماڵرا و کرایە ڕێکخراوێکی ناسیۆنالیستیی ڕووت بۆ کوردایەتی.

واتە: کۆمەڵەی ئەو عەیامەی کە لەنێو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا توێنرایەوە، لەگەڵ یەکێتی بەگشتی هیچ جیاوازییەکی نەمابوو.

---

٨٧ ڕووداونێت، فەرەیدوون عەبدولقادر، گفتوگۆ، ٢٠٠٩/٣/٢.

٨٨ گۆڤاری گوڵان، ژمارە ٧٠٧، هەولێر، ٢٠٠٨/١١/٣.

ئێ باشه، ئەگەر کۆمەڵە و یەکێتی وەکوو یەک بن و جیاوازییەکیان لە نێواندا نەمابێ، ئیدی نەوشیروان مستەفا لە چی پەشیمانە، خۆ ئەوەتا یەکێتی ماوە؟!

بێگومان بۆ ئەوەی لە ململانێ و زۆرانبازیی نێوان خۆی و تاڵەبانیدا بەکاری بهێنایە.

لەڕاستیدا ئەگەر نارەزایەتیی ڕابەرایەتیی کۆمەڵە لەسەردەمی "ئارام"دا نەبووایە، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەو شێوەیە و بە وێنەی نیمچە بەرەیەک پێک نەدەهێنرا، بەڵکوو هەر لە سەرەتاوە یەک حیزبی فراوانیان دروست دەکرد و کۆمەڵەشیان لەنێودا دەتواندەوە، هەر وەکوو لەدوای چەندین ساڵ هەر ئەو کارەیان کرد. بۆیە بەناچاری وتیان، باشە نیمچە بەرەیەک دروست ئەکەین و ناویان لێ نا، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، گوایە سەرەنجام ئەو نیمچە بەرەیە دەبێتە بەرە.

مام جەلال بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو فۆرمە نامیلکەیەکی بە زمانی عەرەبی بەنێوی، "یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆچی؟" دەرکرد.

شەهید ئارام ئەو فۆرمەی پێ باش بوو، بۆیە هەر خۆیشی بۆ زمانی کوردی وەری گێڕا.

لەڕاستیدا ئەوە هەر بۆ ڕازیکرنی کۆمەڵە بوو لەو کاتەدا، نەک بە مەبەستی جێبەجێکردنی. ئەگەرچی دواتر ئارام هەستی بەوە کردبوو و دەیزانی ڕووبەڕووی چ گرفت و ئاستەنگێکی گەورە دەبێتەوە.

یەکێتییش، وە یان وردتر بڵێین، مام جەلال بۆیە بەو ڕووخسارە خۆی دەنواند، چونکە بۆ خۆی هیچ ڕێکخستنێکی نەبوو، ئەبوو کۆمەڵە ئەو کارەی بۆ بکات. لەوەش بەدەر، کۆمەڵە ڕۆڵێکی گەورەی لە گێڕاندنەوەی ئۆتۆریتە بۆ مام جەلال گێڕا، بە تایبەتی لەنێو لاواندا کە کاریگەریی ڕووداوە دڵتەزێنەکانی ساڵانی نیوەی دووەمی شێستەکانیان بەسەرەوە نەبوو.

# سانەویی ئیمام قاسم

هەر وەکوو لە سەرەتاوە باسم کرد، دوای ئەوەی سێ ساڵی خوێندنم لە ناوەندیی کاوە تەواو کرد، چوومە سانەویی ئیمام قاسم کە ئەکاتە ساڵی خوێندنی ١٩٧٦-١٩٧٧. دیسانەوە کۆمەڵێک هاوڕێم بەجێ هێشت و بە کۆمەڵێکی دی ئاشنا بووم. یەکێک لەو هاوڕێیانەی کە پێی ئاشنا بووم، ئەسعەد عەزیز سۆفی بوو کە دواتر لەنێو کاری نهێنی و ژێرزەمینیدا بە "شێخ دارا" ناسرا.

سانەویی ئیمام قاسم کەوتبووە نێوجەرگەی بازاڕی حەسیرەکە و بە ماڵەکانی بلاخ دەورە درابوو. لە جادەی سەرەکیی بازاڕی حەسیرەکە (ئەو جادەیەی بە بەردەم کڵێسەکەدا تێدەپەڕی و دەگەیشتە گەراجی فۆردەکانی سلێمانی و پاشان بەرەو مونەزەمە و ئەمنی کەرامە و سینەما خەیام و پردی یەکەم) دەپەڕیمەوە، بەنێو یەک دوو کۆڵانی باریک و پڕ لە خانووی کۆن و کۆم و لار و جۆگەی سەربەتاکی پیسی پڕ لە سیان هەتا دەگەیشتمە ماڵی ئەسیریی شاعیر.

"بێرە کوردستان عەزیزم گەر تۆ سەیرانت دەوێ

بتبەمە قەندیل ئەگەر گوڵزاری کوێستانت دەوێ"

ئیدی دوای ئەوە بە چەند هەنگاوێک دەگەیشتمە سانەویی ئیمام قاسم. کاتێکیش کە لە مەکتەب بەر ئەبووین، بە لایەکەی تری قوتابخانەکە لەگەڵ ئەسعەد بەرەو ماڵ دەگەڕاینەوە. ئەو لایەی دی قوتابخانەکە هەر وا پەنجا مەترێک کەمتریش لە جادەی بازاڕی گەورە، یانی بازاڕی حەلواچییەکان و ئاسنگەرەکانەوە دوور بوو. کاتێک دەگەیشتینە سەر جادەی بازاڕی گەورە، کە بە دەستی چەپدا و لەسەر سووچەکە دوکانێکی سەعاتفرۆشی لێ بوو، بۆ یەکەمجار باوکم سەعاتێکی مارکەی سووری سویسری بە سێ دینار و ڕوبعێک لەوێ بۆم کڕی، کە ئەو دەمە من لە پۆلی سێیەمی سەرەتایی بووم. بەرامبەریشت ڕێک دوکانەکەی حەسیب خەیات بوو. بۆ یەکەمجار باوکم لای ئەو خەیاتە جلێکی کوردی بۆم دایە دوورین، ئەو دەمە من لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییدا بووم. ئێمە بە دەستی ڕاست لامان ئەدا و هەتا ئەگەییشتینە کتێبفرۆشێک کە کۆشکێکی بچکۆلانە بوو، کەوتبووە سەر سووچی

ـەستەچەپی شـوێنی بەیەکگەیشـتنی هەردوو جـادەی سـەرەکیی حەسـیرەکە و جادەی بازاڕی گەورە یان حەلواچییەکان.

(بـازاڕی حەلواچییەکـان کە بـازاڕی گەورەشـی پـێ دەگـوترا، لە حەسـیرەکەوە ـەستی پێ دەکرد و لە ئاسنگەرەکان نزیک حەمامی حاجی باقی کۆتـایی پـێ دەهـات. ئەم بازاڕە مەڵبەند و شادەماری بازرگانیی کەرکووک و پێکڕا هەمـوو چین و تـوێژە کۆمەلایەتییەکـانی شـارەکەی لە خـۆ دەگـرت. زۆربەی دوکانـدارەکان نیشـتەجێی گەڕەکە پێچاوپێچەکانی دەوروبەری بـازاڕەکە یـان گەڕەکەکـانی قەلا بـوون، کە دوو ـەرگـای دەکەوتە سـەر بـازاڕەکە. گەڕەکەکـانی حەلـواچی و بـلاخ و سـەقاخانە و پەمووچییەکـان و چـای مەحەللاسـی لە گـوزەرە بەناوبانگەکـانی دەوروبەری ئەم بازاڕەن. ماڵ و گەڕەکەکان هەمـوو بە یەکەوە لکـابوون و ئەغڵەبە دوو سـێ مـاڵ بە یەکەوە لە خانوویەکـدا ژیانیـان دەگوزەرانـد و بە هەمووشـیانەوە یەک ئاودەسـتیان هەبـوو ...... بەیانیـان تاریـک و ڕوون پیکابەکـانی چـیمەن و عەلیبەیـان و تیمـار و گورگـان و لادێکـانی تـر دەگەیشـتنە حەلواچییەکـان. بـۆن و بەرامـی پـونگە و ڕیحانەڕەشەی سەر مەنجەڵە ماست و پەنیری پێستە و تەماتەی بڕکدار و کاڵەک و شەمامە و کالیار و خرچان و نیوەتەنەکەی کا و هێلکە و تەڕە و سەوزەی تر، بە بۆنی ئاوڕشـێن و گسـکلێدانی بەردەم دوکانەکـان و چـای دەمکـراوی مـام وەیسـە و سەدا و هەلای ئەو مریەمەی چاوی جوانەی سولاح داودە و بۆنی جگەر و گۆشـتی برژاوی کەریـم و سینییە حەلـوای سپیی ڕەوفە کوێر تـێکەڵ دەبـوون. کەرنەڤاڵێـک بوو، هەموو بەیانییەک ئەهلی بـازاڕی دەخسـتە سـەر هەوا و هەوەسـی دوکانداری. زۆریشـی نەدەخایانـد، خـاوەن کەرەکـانی خانەکـانی سـمایل خـانچی و خانەسـپی و خـانی سـەی مـحەمەد پەیـدا دەبـوون و کەرەکانیـان پـیش خۆیـان دەدا بەرەو حەسیرەکە و لەپاش خۆیـان لەسـەر جـادە تـازە مـاڵراو و ئاوڕشـێنکراوەکە هێڵێکـی درێژکـراوەی تەرسـەقولیان دەنەخشـاند و جێـپەنجەی خۆیـان لە بـۆن و بەرامە گشتییەکـەدا بەجێ دەهێشـت. ئاسـۆی مـام وەیسـە دەیگـوت: ڕێگـای کاکێشـان ئەمەیە کە لە ئاسنگەرەکانەوە دەست پێ دەکات و لە حەسیرەکە کۆتایی پێ دێت.

ئەم سرووتەی کە هەموو بەیانییەک بێ گۆڕانکاری وەکوو خۆی دووبارە دەبووەوە، بەشێک بوو لەو ئاوازە پڕ گرێوگۆڵەی کە ژیانی خەڵکەکەی دەستەبەر دەکرد و پەیمانێکی کۆمەڵایەتی بوو کە ڕۆژگار بۆی ئیمزا کردبوون و لە سایەیدا درێژەیان بە ژیان و وەچەی خۆیان دەدا.

وەکوو چۆن لە سەرەتای شانۆگەریدا ئەکتەرەکان دێن و خۆیان دەناسێنن و دەکشێنەوە، لەم بازارە جەنجاڵەشدا لەگەڵ ڕووناکبوونەوەی هەوادا، هەموو پێکڕا دەڕژانە ئەم گوزەرەوە. هەرا و زەنای هەڵدانەوەی دەڕابە و وڕە و فرەفرِی پیکاب و جێبە کۆنەکان و زەڕە و پرمەی کەر و هات و هاواری کۆڵبەرەکان و زرمە و ڕمبەی بارداگرتن، هەمووشی هەر دەینەڕاند، سا یان لەبەر جەنجاڵی بازاڕ، یان لە خۆشی گەیشتنی ئەو هەموو بەروبوومەی کە وردە وردە دەگەییشتە بەرەوە. ئەم دیمەنە هەموو ڕۆژەیە بە نمایشێک دەچوو کە دەرهێنەرێک بە دەستی ئەنقەست خوڵقاندبێتی و بینەری پێ سەرسام بکات)[٨٩]

بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان مامۆستا ئیحسان بوو، گەردوونی کوڕی هاوپۆلم بوو. مامۆستا ئیحسان کابرایەکی سەنگین بوو، هەموو پێنجشەممانێک لە گۆڕەپانی قوتابخانەکە کۆ دەبووینەوە و بە عەرەبی وتاری بۆمان ئەدا، عەرەبیزانێکی بەتوانا و قسە ڕەوان بوو.ئەو دەمە ئیتر حکوومەتی بەعس کەوتبووە نێو شار و دەستی بە تەعریب کردبوو، ناوی گەڕەک و شەقام و قوتابخانەی ئەگۆڕی، مامۆستای پیس و بەعسی لە خوێندنگاکان ئەچاند، من بەزۆری و تا ئەو دەمەش هەر بە جلی کوردییەوە بۆ دەوام ئەچووم، ئیدی ئەویش کەوتە ژێر فشارەوە.

ڕۆژێکیان مامۆستا ئیحسان لە ڕاڕەوەکاندا پێم گەییشت و بانگی کردم، وتی: ئەم شەرواڵە چییە لەپێت کردووە؟

وتم: بۆچی مامۆستا؟!

بە پەستییەکەوە وتی: کوڕم تۆ تەلەبەی یان غەلوورفرۆشی؟! ئیتر جارێکی تر ئەم جلە لەبەر نەکەیت!

---

٨٩ حەسیرەکە.. دە چرکە پێش مردن، ڕۆمان، کەمال عەبدولا، چاپخانەی رؤی للطباعة والنشر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧، ل ١٥-١٦.

# ئەسعەد عەزیز سۆفی (شێخ دارا)

خوێندن لە سانەویی ئیمام قاسم دەستی پێ کرد، دانەدانەی خوێندکارەکانی لێ دەرچێ، باقییەکەی بۆ من نەناس بوون. دوو پۆلی چوارمان هەبوو، بە ڕێکەوت ئەسعەد و من بەر یەک پۆل کەوتین. لەگەڵ ئەسعەد هەر زۆر زوو بووینە هاوڕێ و هاودەم و هەر زۆر زوو بووینە کەسانی جێ متمانە و جێ ڕاز و نیازی یەک. لە پشووی نێوان وانەکاندا کە ١٠ دەقیقە بوو، پێکەوە لە گۆڕەپانی قوتابخانەکە پیاسەمان دەکرد و باسی شیعر و ئەدەب و دواتریش مێژووی کورد و سیاسەتمان دەکرد. هەردووکمان شەیدای کتێب و خوێندنەوە بووین. من شیعریشم ئەنووسی و کەشکۆڵێکم پڕ کردبووەوە، بەڵام هیچ نەبوون، هەر ئەوەتا خۆم ناوم لێ نابوون شیعر. هاوڕێ پۆلێکمان هەبوو ناوی عەدنان (عەدە گەرعە) بوو، شیعری "دوانزە وانە بۆ منداڵان"ی عەبدوڵا پەشێوی لەبەر بوو، بەدەم پیاسەوە بۆمانی دەخوێندەوە، من گەلێکم لەلا خۆش بوو، زۆر پێی سەرسام بووم و هەر دوانزەیم لەبەرم کرد:

منداڵەکان!
ئەی برسییە ژین تاڵەکان
لەسەر سینگە نەوتاوییەکەی بابەگوڕگوڕ
نزیک تاڤگەی سەرەوژووری زێڕینی گڕ
گڵکۆیەکی بچکۆلەم دی
لێی نووسرابوو:
ئالێرانە منداڵێکی چاوگەشی کورد
لەبرسا مرد!

ئەم شیعرە لە فێستیڤاڵی شیعری کوردی لە کەرکووک لە ڕێکەوتی ١٩٧٢/٣/٢٢ خوێندرایەوە و پلەی یەکەمی بە دەست هێنا.

دیارە مەبەستی پەشێو ئەوە بووە، بە هۆی ئەوەی کەرکووک لەژێر دەسەڵاتی بەعسە، داگیرکەرە، عەرەبە بۆیە منداڵانی کورد لە کەرکووک برسیین! ئیتر پێی

وابووه، منداڵانی غەیرە کورد، واتە، منداڵانی تورکمان، عەرەب، کلدانی، ئاشووری و ئەرمەنی ... تێر بوونە! وە یان با بڵێین، منداڵانی عەرەب تێر بوونە و ئەوانی دی برسی، بەڵام ئەم پەیوەندی بە منداڵانی غەیرە کوردەوە نییە و خۆی تەنها بە خاوەنی منداڵانی کورد دەزانێ! خۆ ئەگەر ڕۆژگارێک هاتە بەر، کەرکووک کەوتە ژێر قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایانی کوردەوە، ئەوا هاوکێشەکە پێچەوانە دەبێتەوە و ئەو دەمە منداڵانی کورد تێر و باقییەکەی برسی دەبن! وەلی هەنووکە کەسێک ماوەتەوە ئەوە درک نەکات کە ئەو تێزە چەندە خەیاڵییە؟! بەڵێ! هەر بەو ڕادەیەش چەندە نامرۆڤانەیە، چەند دژە منداڵانە. ئەوەتا چاڵە نەوتەکانی کەرکووک لەژێر چەکمەی جەندرمەی کورددایە و لە منداڵی مشتێک مافیا بەولاوە منداڵی هیچ کەسێکی دی خێری لێ نابینێ! ئەوەتا بە چاوی خۆمان دەیبینین کە چۆن ئێستاکەش منداڵان لەسەر هەمان ئەو سینگە نەوتاوییەی کەرکووک، بێجگە لە هەوای ژەهراوی، هیچی تریان بە نسیب نەبووە! گەلۆ هەوای ژەهراویش سینگ و سی منداڵان وەک یەک چاو لێ دەکات!

بە هەر حاڵ! ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هاوڕێیەتیی ئەسعەد و من بەتینتر ئەبوو، وای لێ هات بیر لەوە بکەینەوە، بڵاوکراوەیەکی سەردیوار دەر بکەین و نێوەڕۆکەکەیشی بەو جۆرە بێت کە ئاوێنەی بیر و هزر و کەفوکوڵی هەناوی دوو خورتی تژی لە تیشک و خاڵی لە ئازادی بێت.

ئیتر هاتین بابەتەکانمان ئامادە کرد و چونکە ئارەزووم بوو، نەخشەسازی و هێلکارییەکەی من کردم و بەهۆی خەتخۆشیشەوە بابەتەکانیش خڕ من نووسیمنەوە. من بە شیعرێک بەشداریم کردبوو، کە هەر هی خۆم بوو، بەڵام ناوێکی خوازراوی لەسەر بوو، ئەویش "نەسرەوت" بوو، هەرچی ئەسعەد بوو، بە پەخشانێک بەشداری کردبوو، بەنێوی "نیو سەعات پێش لە سێدارەدان".

پاشان دەبوو بیبەین بۆ لای ئیتیحاد (یەکێتیی قوتابییانی بەعس) تاوەکوو مۆڵەتی هەڵواسینی بۆ وەربگرین. چووین بردمان و دامانە دەستیان. دوای ئەوەی سەیریان کردبوو، ناردیان بەشوێنماندا. ئەسعەد و من هەردوو پێکەوە بۆ ژووری ئیتیحاد چووین، دووان لە ئیتیحادییەکان، بەهجەت و کەریم کە هەردووکیان هەر کورد بوون، لەگەڵمان دانیشتن و تێبینییەکانی خۆیان پێمان وت. وتیان، یەکەم: ئەو

شیعره بەبێ ناوی ئاشکرا ناکرێت بڵاو بکرێتەوە. دووەم: ئەو پەخشانە ئەبێ لادەن و ڕێگەی پێ نادرێت. بەو جۆرە بڵاوکراوەکەیان بەلوولکراوی پێمان دایەوە و بێئومێد گەڕاینەوە. ئەو پەخشانەی کە ئەسعەد نووسیبووی، باسی هەست و ورەی تێکۆشەرێکی دەکرد کە تەنها نیو سەعاتێکی ماوە پەتی سێدارەی لە مل بکرێت. بەڵام سەد مەخابن، تەنها چەند ساڵێک دوای ئەو ڕووداوە، ئەوەی ئەو مرۆڤە لەو پەخشانەدا وێنای کردبوو، بەکردەوە پێیدا گوزەری کرد و بەبێ ئەوەی ئەو نیو سەعاتەیشی پێ بدەن، لە سێدارە درا. "نەسرەوت"یش ئەو ناوە بوو کە دواتر من لە خەبات و تێکۆشان دەنێو کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان وەک نێوی نهێنی بۆ خۆمم هەڵبژارد. هەر لەسەر ئەم ناوەش لە زیندانی هەیئەی خاسەی کەرکووک ئەسعەد ئەشکەنجەیەکی ئێجگار زۆر دەکرێ، تا پێیان بڵێ، "نەسرەوت" کێیە و ماڵی لە کوێیە.

ئەو دەمە من بەردەوام خەریکی کتێبخوێندنەوە بووم، ئەو ساڵە بوو ڕۆمانی "ژانی گەل"ی ئیبراهیم ئەحمەدم خوێندەوە. بۆ من گەلێک سەرنجڕاکێش بوو، بە ڕووداوەکانی و بە شیوازی داڕشتن و زمانەکەی گەلێک سەرسام بووم، پێم خۆشە هەنووکە و لەپاش ٤٤ ساڵ جارێکی دی بیمەوە میوانی، تا بزانم لە ئێستادا چی لەبارەیەوە دەڵێم. کتێبێکی تر کە هەر ئەو دەمە خوێندمەوە، "کوردستان و کورد"ەکەی دکتۆر عەبدولڕەحمانی قاسملۆ بوو. ئەم کتێبە ئەسعەد وێی دام و منیش بەوردی خوێندمەوە. ئەم پەڕاوە و ئەو لێکۆڵینەوە ئابوورییەم بەلاوە زۆر پڕ بایەخ و ناوازە بوو. کتێبی دیکەم دەربارەی کورد و مێژووی کورد خوێندبووەوە، وەلی ئەم کتێبەی قاسملۆ شتێکی دیکە بوو، ئەمە لێکۆڵینەوە بوو، پشتی بە کتێبی "سەرمایە"ی کارل مارکس بەستبوو، شیکردنەوەی بۆ ئابووری و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لە کوردستان دەکرد و باسێکی شیکاریی ئاکادیمی بوو. بەڵام ئێتر چۆنی پێکابوو، ئەوەیان نازانم و ئەگەر هەنووکە دەوری بکەمەوە چی لەسەر دەڵێم، ئەوە چتێکی دیکەیە.

ئەو دەمە نەمدەزانی کە من لەنێو ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی "کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان"م و ئەم پەڕاوەش یەکێکە لە باسە ڕۆشنبیرییەکانی نێو ئەو ئەڵقانە. ئەو دەمە تەمەنم تەنها ١٦ ساڵان بوو. بۆ خۆشم هەر کتێبێکی دیکەم لەمەڕ

ئەدەب و مێژوو و سیاسەت ببینیایە، دەمکڕی و دەمخوێندەوە. ڕۆژنامەی هاوکاری، هەفتەنامەی پاشکۆی عێراق، گۆڤاری بەیان و ڕۆشنبیریی نوێ، هەفتەنامەی بیری نوێ ... هەموو ژمارەکانیم دەکڕین و هیچ کاتێک وەختی دەرچوونیانم لەبیر نەدەکرد.

ڕۆژنامەی هاوکاری، عەبدوڵا عەباس سکرتێری نووسینی بوو، هەفتەنامەی پاشکۆی عێراق، لەتیف هەڵمەت و سەبری بۆتانی سەرپەرشتییان ئەکرد. گۆڤاری بەیان، سەلاح شوان، بورهان قانع و مەحموود زامدار دەریان ئەکرد. گۆڤاری ڕۆشنبیریی نوێ و هەفتەنامەی بیری نوێ، حیزبی شیووعیی عێراقی دەری ئەکردن. من هەر لە پۆلی سێیەمی ناوەندی بووم، جارێکیان لەگەڵ خاڵۆم مەلا کەماڵ بۆ بەغدا چووین و سەردانی دەستگای ڕۆشنبیریی کوردیمان لە مەیدانی خەللانی کرد. هەر لەوێ ئابوونەی شەش مانگم دا و بەشداریم لە هەردوو گۆڤاری بەیان و ڕۆشنبیریی نوێ کرد و مانگانە لە بەغداوە بە پۆست بۆیان ڕەوان دەکردم و دەیانهێنانە بەردەرگا. هەروەها لە هەر شوێنێک ژمارە کۆنەکانی "بەیان"م دەست بکەوتبایە، دەمکڕی و پێم خۆش بوو تەواوی ژمارەکانیم هەبێت. ڕۆژنامەی "هاوکاری" لەدوای خوێندنەوەی هەڵم دەگرت و دەمپاراست.

ئەو دەمەی لە سانەویی ئیمام قاسم بووم، هەفتەنامەی پاشکۆی عێراق بە زمانی کوردی دەرئەچوو، ئەم پاشکۆیە خوێنەری زۆر بوو، کوشکێکی چکۆلە لەسەر ڕێگەکەماندا بوو، هەروا چەند سەد مەترێک لە مەکتەبەکەمانەوە دوور بوو، ئەمزانی چ ڕۆژێک و کەی دەکەوێتە بازاڕەوە، بۆیە لە پشووی ١٠ دەقیقەیی نێوان وانەکاندا فرسەتم دەبینی و بەڕاکردن دەگەیشتمە ئەو کۆشکە و دانەیەکم لێی دەگرت، ئەگەر نا، تەواو دەبوو و چنگم نەدەکەوت.

ئەمە سەرباری ئەوەی هەر ماوەناماوەیەکیش چەرخ و دەورەیەکم بە کتێبخانەکانی ئەوبەر و شەقامی جمهووری دەکرد. سێ کتێبخانە لە سەر شەقامی جمهووری بوون: لەو سەرەوە کتێبخانەی دارا، پاشان کتێبخانەی ئاسۆ و گەل، بەرامبەر بە کتێبخانەی گەل لەسەر سووچەکە و بەرامبەر بە مۆبیلیاتی شوکر

نەجارِ کتێبخانەی هەندرێن هەبوو. لەوسەریشەوە بەرامبەر بە کتێبخانەی دارا و بە دیوی ئەودیو و لە سەرەتای شەقامی عەلەمێن، کتێبخانەی دارولوەتەنییە هەبوو.

ئەوە بێجگە لە چەند کتێبخانەیەکی دیکەی ئەمـلا و ئەولا، وەکوو کتێبخانەی فەلەستینییە لە مەحاکم و کتێبخانە بچکۆلانەکەی دایی ئەمین لە بەرامبەر مەیدانی پاسەکانی ئیسکان.

هەموو ڕۆژێک کە لە دەوام دەبووینەوە، ئەسعەد و من بەپێ و بە پیاسە بەرەو ماڵ دەچووینەوە. ماڵی ئەوان لەسەر ڕێگای من بوو، لە جادەی حەسیرەکە دەپەڕینەوە، چایخانەکەی حاجی عوسمانمان بەجێ دەهێشت و بە بەردەم مزگەوتی نائیب ئۆغڵی تێدەپەڕیین و ئەگەییشتینە دوکانەکەی مەلا نووری باوکی مامۆستا فەوزی و پاشان چایخانەکەی ئەشرەف چایچیمان جێ دەهێشت، ئەوسا جادەی سەرەکیمان بەرئەدا و بۆ ناو ماڵەکان لە هەورازەکە سەرئەکەوتین، دوای ئەوە بە دەستی ڕاست دەچووینە نێو کۆڵانێکەوە و هەر وا ٢٠٠ مەترێک ئەڕۆییشتین، ماڵی ئەسعەد بە دەستی چەپدا بوو.

ئیدی گشت ڕۆژە ئێمە بەدەم قسەوە، بەدەم باسی شۆڕش و خەبات و مارکسیزمەوە، بەدەم پرسی ئاشبەتاڵ و دەستپێکردنەوەی "شۆڕش"ەوە، لەنێو دۆزەخێکی ڕاستەقینەوە، بە ورەیەکی بڵند و بڕوایەکی بەتینەوە، ئاسۆی ئازادی و ڕزگاری و یەکسانیمان دەهاتە بەرچاوان.

ئەو دەمە دەمی دوای شکستی پارتی و بارزانی بوو کە بەناچار شکستی کۆمەڵگای کوردیش بوو، فەزایەکی ڕەش باڵی بەسەر کوردستاندا کێشابوو، بێئومێدی زەقترین دیاردەی کۆمەڵی کوردەواری بوو، خەڵکێکی ئێجگار زۆر ملیان دابوو، بەعس کەوتبووە جێبەجێکردنی نەخشە و پلانەکانی، خەریکی ڕاگواستنی گوندەکان و دروستکردنی ئۆردووگا زۆرەملێکان بوو، خەریکی ڕاکێشانی جادەی سەربازی بۆ گوندەکان و ناوچە شاخاوییەکان بوو، بەرپرسانی بەعس ئەچوونە دوورترین جێگای کوردستان و کۆبوونەوەیان بە گوندنشینەکان دەکرد و خەڵکیان دەکردە بەعسی، باسی هەڵگیرساندنەوەی "شۆڕش" و پەیدابوونەوەی پێشمەرگە نوکتە و درۆیەکی گەورە بوو، خۆ ئەگەر بە درۆش وەرنەگیرایە، ئەوا بە ئاه و

حەسرەتەوە دەگوترا: مەلا مستەفا بە سەدهەزار چەکدارەوە هیچی پێ نەکرا، ئێستا ئەمانە دەتوانن چی بکەن!

سەرەتا من پارتی و یەکێتیم لێک جوودا نەدەکردەوە، هەموویانم وەک یەک چاولێ دەکرد، لە ئەنجامی توانەوە و تەسلیم بوون، برینێکی قوولّ لە هەناومدا هەبوو، بەلای منەوە گرنگ ئەوەیە "شۆڕش" پەیدا بێتەوە، پێشمەرگە چیا ئاوەدان بکاتەوە، بە بەعس بڵێین، ئێمە هەر هەین ... ئاخر "عائدون الى الصف الوطني" ئەو دەستەواژەیە بوو کە کەسایەتیی ئێمەی ئەوەندەی تر تێک دەشکاند! ئەوەندەی دی ئێمەی کەساس و زەلیل ئەکرد!

دێتەوە بیرم پارتیش مەفرەزەیەکی ناردبووە خوارەوە کە پێک هاتبوو لە قالە فەرەج، تەحسین شاوەیس، حەمەی شێخ حەسەن بەفراو، عاسی ڕەئووف ... ئەمانە زۆر بەنهێنی لە گوندەکانی ناوشوان دەسووڕانەوە، بە جۆرێک بەڕۆژ خۆیان دەشاردەوە و بەشەویش ئەم گوند و ئەو گوندیان دەکرد، کتێبی قوتابخانەکان چونکە بە عەرەبی بوو، دەیانسووتاند، کوێخای گوندەکانیان دارکاری دەکرد.

من ئەو دەمە ئاگاداری ئەوە بووم کە چۆن چوونەتە سەر کوێخا وەیسی کلاوقوت و مارهەنجنیان کردووە. خزمێکی خۆم لەو دەمەدا هاوڕێی قالە فەرەج بوو، هاوکارییانی دەکرد، جاروبارێش لەگەڵیان جەولەی دەکرد. جارێکیان سەعاتێکی سیتیزینی ژاپۆنی زۆر نایابی پێم دا، وتی ئەوە قالە فەرەج لە کرماشان بە ٣٠ دینار کڕیویەتی و بە دیاری بە منی داوە، بەڵام من نامەوێ لە دەستی بکەم، چونکە لای خەڵکی دەناسرێتەوە.

هەر لەو سەروبەندەدا بوو، ئەم مەفرەزەیە لە گوندی کلاوقوت لەنێو "خانووە هاوچەرخەکان" کەمینێکیان بۆ ئەو ڕەفیق حیزبییانە دانا کە کۆبوونەوەیان بە خەڵک دەکرد و دەیانکردن بە بەعسی. ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن.

کاتێک ئەم ڕووداوانەم لەگەڵ ئەسعەد باس دەکرد، ئەو بەو مەفرەزەیە و بەو کار و چالاکییانە نەک هەر دڵخۆش نەبوو، بەڵکوو زۆر بەتوندی ڕەخنەشی لێیان دەگرت. منیش ئیتر لە ئەنجامی ئەو قسەوباسانە و خوێندنەوەی ئەو نامیلکانەی کە باسی پارتی و بارزانی تێدا بوو، وردە وردە ئەو جیاوازییانەم بۆ ڕۆشن دەبوونەوە.

ئیتـــر زۆریشـــی نەبـــرد، تـــا لە ڕێکەوتـــی ١٩٧٧/٧/٢٣دا، ئەم مەفـــرەزەیە لە نەخشەیەکی داڕێژراودا حەمەغەفوور ئاغجەلەری و هاوڕێکانیان لە گوندی کانیبی و لە شـیرین خەودا کۆمەڵکوژ کـرد و بـوونە جـاش و مەفرەزە خاسـە و هـارترین پیاوی بەعس.

ئەو دەمەی ئەم قسەوباســەمان کــرد، مــاوەیەک بــوو جــار جــار لە دەرەوەی قوتابخانەش یەکترمان دەبینی و بە چەند سـەعات پیاسـەمان دەکرد و موناقەشـەی سیاسیمان دەکرد. ئەم قسانەشمان لە یەکێک لەو جارانەدا کرد و دێتەوە بیرم ڕێک لە جادەی تەنیشت گۆڕستانی شێخ محێدین و ڕێک لە ئاست مـاڵی ئازاد هەورامیدا بوو.

ئەمە سەرەتای ئاڵوگۆڕێکی گەورە بوو لە ژیانی مندا و ئیدی بەردەوامیش لەپاڵ ئەم قسەوباسانەدا بەردەوام خەریکی خوێندنەوەش بووم.

ڕۆژێکیـان لەدوای ئەوەی دەوامـی مەکتەب تەواو بـوو، وەکوو هەر جارێکی دی بە پیاسە و بەدەم قسەکردنەوە پێکەوە لەگەڵ ئەسعەد بەرەو ماڵ گەڕاینەوە و لەنێو قسەکانیدا وتی: کتێبێکم بۆت داناوە، لەگەڵمدا وەرە، تـا پێت بدەم. منیش وتـم، چاکە ... ئیدی ڕۆیشـتین، هەتـا گەیـیشـتینە بەردەم ماڵیان. من لە بەردەرگـا چاوەڕێم کـرد، ئەو چـــووە ژوورەوە، زۆری پـــێ نەچـــوو هـــاتەوە و کتێـــبەکە کە لە زەرفێکـــی هاویشتبوو، دایە دەستم، منیش خستمە نێو جانتای مەکتەب و خوداحافیزیم لـێ کرد و لە کـۆڵانەکەی ئەوانەوە بە دەسـتی ڕاسـت بە کـۆڵانە هەورازەکەدا سـەرکەوتم و پاشان بە کۆڵانی مـاڵی سـەی عـومەر و شـوانەی تەنسـیق و قوتابخـانەی سـەرەتایی نالی و دوو باخچەکەی عاشوور هەتا گەیشتمەوە کۆڵان و ماڵی خۆمان.

نـازانم لە ڕێگـا سـەیری کتێبەکەم کـرد، وە یـان نـا، بەڵام کە گەیـیشـتمەوە مـاڵ یەکســەر دەرم هێنــا و لێــی ڕامــام و کەوتــمە لاپەڕە هەڵـدانەوە و ســەیرکردن و خوێندنەوەی سەرباسەکانی، کتێبەکە بەهیچ کتێبێکی تری نەدەکرد. کتێبێکی چکۆلەی پڕ نێـولەپێ، بەرگێکـی نـایلۆنی ڕەنگـی سـوور، چـاپێکی وردی جـوان و ناسـک، بە ڕەنگێکی زەردی ئـاڵتوونی لێی نووسرابوو: "چەپکێک لە وتەکانی ماو"، وەگێڕانێکی

ڕوون و کوردییەکی ڕەوان و بێ گرێوگۆڵ، بەڵام ناوی وەرگێڕ و چاپخانە، نۆبە و ساڵی چاپ و ژمارەی سپاردنیان هیچ بەسەرەوە نەبوو.

دوای ئەوە کەوتمە خوێندنەوەی و هەر زوو خەتمم کرد، هەستم کرد، ئەو باسانە لەو باسانە ناچن کە هەتا ئەو دەمە من موتالام کردوون، گەلێک لە باسەکانیشی ئەوانەن کە ئەسعەد زۆر جار لە کاتی یەکتربینین و پیاسەکردندا بۆمی باس دەکرد. کورتەی باسەکانی نێو کتێبەکەم بۆ ئەسعەد گێڕایەوە و موناقەشەمان کرد، وەلێ من پێم خۆش بوو، خۆمیش دانەیەک لەو کیتابچەیەم هەبێت، بۆیە چووم ـە کتێبخانەکان بۆی گەڕام و بە ئاگادارییەوە سۆراخیم کرد، سەرەنجام لە کتێبخانەی هەندرێن چنگم کەوت.

خاوەنی کتێبخانەی هەندرێن، کابرایەکی بەتەمەنی لەسەرخۆ و بەڕێز بوو، دوایی بۆم دەرکەوت، زۆربەی کتێب و کیتابچە و ناملیکەکانی ماوی هەبوو، لە بەشی دواوەی کتێبخانەکە بە شێوەیەکی نیمچە نهێنی داینابوون، وەکوو: الديمقراطية الجديدة، فی التناقض، حرب الطويل الامد، حول الديالكتيک ...

ئیتر هەر جارناجارێک بۆ ئەو کتێبخانەیە دەچووم و پرسیاری ئەو کتێبانەم دەکرد، خاوەنەکەیشی وای لێ هاتبوو ئەیگوت، بڕۆ پشتەوە بۆ خۆت بگەڕێ، منیش ئەچووم و ئەوەی مەبەستم بوو هەڵم دەبژارد و هەر کاتێک هەستم بکردایە، کتێبخانەکە کەسی لێ نییە و چۆڵە، بە سەفتەیەک کیتابەوە دەرئەچووم و پارەکەیم ئەدا و ئەهاتمە دەرەوە و سەیرێکی دەورووپشتم ئەکرد و بەرەو ماڵ ئەگەڕامەوە.

کتێبەکان گەلێک هەرزان بوون، هەر وا پارەیەکی ڕەمزی بوون، یەکی بە ١٠-١٥ فلس بوون، "چەپکێک لە قسەکانی ماو"ی لێ دەرچێت، باقییەکەی بە زمانی عەرەبی بوون و لە پەکین چاپ کرابوون. کتێبی "چەپکێک لە قسەکانی ماو" لەلایەن ئیبراهیم ئەحمەد و نەوشیروان مستەفاوە کرابوو بە کوردی، دیارە ئەو دەمە من ئەوەم نەدەزانی.

لە کتێبخانەی "ئاسۆ"ش کتێبی "بژی سەرکەوتنی جەنگی گەل، لین پیاو" هەبوو کە لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە کرابوو بە کوردی. کتێبێکی دیکەش هەر بە کوردی هەبوو، وتارەکانی کیم ئیل سونگ بوون و لەلایەن "شەهید ئارام"ەوە

کرابوو بە کوردی. ئەو دوو کتێبەشم کڕی و هەردووکیانم خوێندەوە، بەڵام ئەوەی کیم ئیل سونگ بەلای منەوە هەر درێژدادڕی بوو.

جەبار ئاسۆ خاوەنی کتێبخانەی ئاسۆ کابرایەکی زۆر بەڕێز، سادە، ڕووخۆش، زیتەڵە و وریا بوو، لە کارەکەیشیدا زۆر چوست و چالاک و لێهاتوو بوو، هەمیشە ١٠-١٥ کەسێکیش لە دەوروپشتی بوون و خۆبەخشانە کۆمەکیان ئەکرد. لەبەردەم کتێبخانەکەش کۆمەڵ کۆمەڵ لە نووسەران، ئەدیبان و عاشقانی کتێب ڕادەوەستان و نوقمی قسەوباس و جەدەل بوون، هەتا شەلوکوت دەبوون و ئاوی پێیان دادەهات، ئینجا بۆ پشوودان و خواردنەوەی چایەکیش دەچوونە قاوەخانەی ئەلنەسر.

هەر جارە بۆ ئەوبەر بچوومایە، ئەبوو سەردانێکی ئەم کتێبخانەیەش بکەم، چونکە گەورەترین و زیندووترین کتێبخانە و کتێبفرۆشی کەرکووک بوو، لەڕاستیدا دڵی کەرکووک بوو. ئیدی کە ئەچوومە نێو کتێبخانەکەوە، چاوم بە تەواوی کتێبەکاندا دەگێڕا، ئەگەر کتێبێکم بەدڵ بووایە دەمکڕی. جاری واش هەبوو، ئەگەر داوای کتێبێکی یاساغم بکردایە، ئەوا لە کاتێکی گونجاودا نزیکی جەبار دەبوومەوە و بەئەسپایی لێم دەپرسی، ئەویش ئەچوو لە پشتەوەی کتێبخانەکە یان لەسەرەوە دانەیەکی بۆم دەهێنا و بە زەردەیەکەوە دەیدایە دەستم، بەڵام جاری واش هەبوو، بە دەنگێکی نەوی ئەیگوت:

جارێ چاوەڕێ بکە، مێشوولە هەیە!

جەبار ئاسۆ کابرایەکی زۆر دیپلۆماسیش بوو، مەگەر هەر ئەو بیتوانیبا لەنێو ئەو پەیوەندییانەدا هاوسەنگی نێوان بەدکاران و پیاوباشان و کارەکەی ڕابگرێ.

بەڵام من لەو بەردەمە ڕانەئەوەستام، کتێبەکەم ئەکڕی و سەیرێکی دەوروبەرم ئەکرد و بۆماڵەوە ئەگەڕامەوە، وە یان ئەچووم بۆ کتێبخانەکانی دیکە و هەموو جارێکیش لە کتێبخانەی گەل بیری نوێ و پاشکۆکەیم دەکڕی.

بێجگە لەو کتێبانە دوو کتێبی دیکە لەسەر ژیاننامەی لینین هەبوون کە یەکێکیان هی محەمەدی مەلا کەریم بوو. "جەلال دەباغ"یش "مانیفێستی حیزبی کۆمۆنیست"ی کردبوو بە کوردی و کتێبێکی دیکەیشی هەبوو بەنێوی، کورتەباسێکی ماتریالیزمی دیالێکتیک. بەو جۆرە دەبینین ئەو کتێبە مارکسییانە بە زمانی کوردی ژمارەیان

زۆر کەم بوون و لە پەنجەکانی دەست تێ نەدەپەڕین. لە کاتێکدا حیزبی شیووعیی عێراقی لەساڵی (١٩٣٤)ەوە دامەزراوە و دوای ئەویش چەندین حیزب و ڕێکخراوی مارکسیی دیکە پەیدا بوون، هەتا ئەگات بە کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان و دوای ئەویش چەندین ڕێکخراو، گرووپ و حیزبی دیکەی مارکسیستی پەیدا بوون، بەڵام ئەو کێشەیە هەتا هەنووکەش هەر وەک خۆی ماوەتەوە کە دەبوو بە پێچەوانەوە لانی کەم ئێستا ئاساری مارکس، ئەنگڵس و لینین هەر هەمووی بە کوردی لە بەردەست بوونایە، تاوەکوو ئەو تێکۆشەرە کۆمۆنیستانەی کە زمانی دایکییان کوردییە، بیانتوانیبا ڕاستەوخۆ دیراسەی بکەن، بەم کارەش لەلایەکەوە شارەزایی و ئاگادارییان لەو بوارەدا دەچووە سەر و کامڵ ئەبوو، لە لایەکی دی لە مارکسیزمی دەستی دوو ڕزگاریان دەبوو. لە هەمان کاتدا ئەوە ئەرکی ئەو حیزب و سازمانە کۆمۆنیستییانە بوو، سەرچاوە بنەڕەتییەکانی ئەو بیروباوەڕە بۆ کۆمەڵگا فەراهەم بکەن، تاوەکوو ئاسانکاری بۆ هەر کەسێک بکەن کە دەیەوێت لەو ڕووەوە زانیاری بەدەست بهێنێت و شارەزایی پەیدا بکات. بۆیە دەبوو ئەو حیزب و سازمانانە هەر لە سەرەتای کاریانەوە دەستگای وەرگێڕانیان دابمەزراندایە و بە بایەخەوە سەیری ئەو کارەیان بکردایە.

نەبوونی ئەو سەرچاوانە بۆ ئێمەی کوردی عێراق کێشەیەکی جددی بوو، چونکە لە کوردستانی عێراق خوێندن بە گشتی بە زمانی کوردی بوو، ئەگەرچی هەر چەند ساڵ جارێک گۆڕانی بەسەردا دەهات و جارێک نیوەی دەبووە عەرەبی و جارێک هەمووی و جارێک لە پۆلی فلانەوە و جارێک لە فلانە ناوچە و لەوی تر نا ...هتد. ئەمانە هەر هەموو وایان کردبوو، خوێندەواری کورد، عەرەبی زبانێکی باش نەبێت و نەتوانێت بەباشی کەڵک لە نووسراوەی عەرەبی وەربگرێ.

من ئەوەندەی بە خۆم دەگەڕێتەوە، کاتێک بە بیروباوڕی کۆمۆنیستی ئاشنا بووم و تینووی خوێندنەوە و قووڵبوونەوە بووم، ئەو ٤-٥ کیتاب و کیتابچەیەش کە بە زبانی کوردی هەبوون خوێندمەوە، ئیدی بەناچاری ئەبوو دەستێک بە زمانە عەرەبییەکەمدا بهێنم و مشتوماڵی بکەم. چونکە بە زبانی عەرەبی دەریایەک کتێب و وەرگێڕان هەبوون کە لەگەڵ کتێبخانەی هەژاری کوردیدا قابیلی بەراورد نەبوو.

له سەرەتادا و بۆ ماوەیەک گۆڤارێکی منداڵانم ئەکڕی بە ناوی موجەلەتی و لە پاڵیشیدا کتێبی دیکەی عەرەبیم دەخوێندەوە، هەتا وای لێ هات بڕێکی باش کەڵکم لێیان وەرگرت. بۆ نەگبەتیی ئێمە فەرهەنگی عەرەبی-کوردیشمان نەبوو، خاڵۆم کەماڵ لە بەغدا فەرهەنگی موختاری عەرەبی-عەرەبی بۆم هێنا، گەلێک سوودم لێ بینی و پاشان فەرهەنگی مونجیدی عەرەبی-عەرەبی بۆم هێنا کە چاکترین و مەزنترین فەرهەنگی عەرەبی بوو.

کابرایەک کە ناوی مام جەلال بوو، لەو دوو باخچەیەی خوار ماڵمانەوە کە من هەمیشە بۆ خوێندن بۆی دەچووم، باخەوان بوو، جارجارە پرسیاری وشەی عەرەبیم لەویش دەکرد.

مام جەلال پیرەمێردێکی لەڕ و لاوازی کۆمی چەماوە بوو، هەر وا مشتێک چلۆچێو بوو، هەر ئەوندە نەبوو لووتی لە زەوی نەدا، کەوا و چاکەتی دەپۆشی و قایشێکی چەرمی بەرەزوانە قەویشی لە ناوقەدە باریکەکەی دەبەست، زۆر لەسەرخۆ و بە سستی هەنگاوی دەنا، لە قسەکردنیشدا هەر وا خاو و لەسەرخۆ بوو. ئەم پیاوە خۆی هەڵئەنا و ئەیگوت: 'تفسیر الجلالین'ت بیستووە؟ ئەوە کتێبی منە! منیش ئەو دەمە هێشتا ناوی ئەو کتێبەم نەبیستبوو، نەمئەزانی ئەم کابرایە فشە ئەکات، یان گاڵتە ئەکات و پێم ڕائەبوێرێ! مام جەلال سەر بە حیزبی شیووعیی عێراقی بوو، هەمیشە ڕۆژنامەیەکی تەریقول شەعب (طریق الشعب)ی لە باخەڵدا بوو، بە دەنگێکی زیقن و سست و پچڕپچڕ پرسیاری لە من ئەکرد: 'تەریق'ت خوێندووەتەوە؟ منیش وەڵامم ئەدایەوە: نەخێر مام جەلال ئەو ڕۆژنامەیەم نەخوێندووەتەوە! پاشان سەیرێکی ئەکردم و هەندێک لێم ڕا دەما، ئینجا ئەیگوت: عومرت بە زەع چووە، تەریقت نەخوێندووەتەوە!

ئیدی زمانەکەم وای لێ هات، سوود لە کتێبی عەرەبی وەربگرم و بۆ کتێبکڕینیش بە کتێبخانەکانی کەرکووکەوە نەوەستام و زۆر جار ئەچووم بۆ بەغدا و هەر کتێبێکی کارل مارکس، فردریک ئەنگڵس، ڤلادیمیر ئیلیتیش لینین، جۆزیف ستالین، ماو تسیتۆنگ، هۆ شی مین، کیم ئیل سونگ، جۆرج دیمیترۆڤ، چێ گیڤارا و نووسراوی فەلەستینییەکانی وەکوو: ناجی عەلۆش و مونیر شەفیق و

وەرگێڕانەکـانی جـۆرج تەرابیشــی و گۆڤـاری ئەلـهەدەف "الهـدف"ی بەرەی گەلیـی جۆرج حەبەشم بەرچاو بکەوتبایەن، دەمکڕین.

خـاڵۆم "کەمـاڵ"یش کە مـاوەیەکی زۆر لە باشـووری عێراق سـەرباز بـوو، گەلێک جار لەگەڵ خۆیدا ئەو کتێبە مارکسییانەی بۆم دەکڕی و بەو هەمـوو بـازگە سـەخت و پڕ مەترسییانەدا بۆمی دەهێنایەوە بۆ کەرکووک.

ئەو دەمەش کە لە شاری سلێمانی لە زانکۆ بووم، بەرامبەر بە بەشـی نـاوخۆیی ئـێمە کتێبخـانەی گەلاوێـژ هەبـوو، کتێبـی نووسـەرانی مارکسـی زۆر هەبـوو، لە پشتەوەی کتێبخانەکە و بە شێوەیەکی نیمچە ئاشکرا دانرابوون، لەوێش گەلێک کتێبم کڕی.خاڵۆم کەماڵ هەر لە منداڵییەوە لای باوکی دەرسی دینی خوێندبوو، کاتێک کە بـاوکی کـۆچی دوایـی کـرد، ئەو مێردمنـداڵێک بـوو تـازە هەڵئەچـوو. خەڵکـی ئـاوایی داوایان لێ کرد، لەجیاتی باوکی ببێتە مەلایـان. هەر لەو سـەرەتایەدا بـوو، جارێکیـان مەلا کەماڵ پێشنوێژی بۆ پیاوانی ئـاوایی دەکات، ئەو لە پێشـەوە و ژمـارەیەکی زۆر لە پیر و ڕیشسپی لە پشت ئەوەوە ڕیز دەبەسـتن، مەلا کەمـاڵ بەو حـاڵەی خۆی کە تێـی کەوتـووە، پێکەنینـی دێ، خـۆی پـێ نـاگیرێ و لەپڕێکـدا ئەتەقێـتەوە و ئەداتە تریقەی پێکەنین و دەرئەپەڕێتە دەرەوە.

جارێکیـان کتێبـی "مبـادیء أولیـة فـی الفلسـفة"ی جـۆرج پـۆلیتزەرم دایە لای مەلا کەماڵ کە بیخوێنێتەوە، دوو بەرگی گەورە بوو، دوو جار هەر هەمووی خوێندەوە.

هـاوڕێیەتی مـن و ئەسـعەد ئیـدی گەیبـشتە ئەوەی متمـانەی تەواومـان بە یەکـدی هەبێت و هەموو شـتێکی نهێنـی لەلای یەکدی بـاس بکەیـن، وە یـان بـا بڵـێم، ئەسـعەد هەمـوو شـتێکی نهێنـیم لەلا بـاس بکـات، بە غەیـری ئەو نهێنییـانەی کە پێویسـتی نەدەکرد، چونکە ئێمە پەیڕەویمان لە پرەنسیپێک دەکرد، "بەگوێرەی پێویستی نهێنیت لە لا بێت"، ئەگەرچی زۆر جاریش وا نەبوو.

بە شـێوەیەکی ڕێکوپێـک و هەفتـانە شـوێن و کـاتی چاوپێکەوتنمـان دادەنـا و بـۆ خۆپاراستن لە چاوی بەدکاران هەر جارەش دەمـانگۆڕین. ئیتر دوای ئەوەی بە یەک دەگەیشتین، بەدەم پیاسەکردنەوە قسەوباسی سیاسـی و موناقەشـەمان دەسـت پـێ دەکـرد و دیسـانەوە هەر بـۆ خۆپاراسـتن بـۆ ئەو گەڕەک و ناوچـانە دەچـووین کە

خەڵکی لەوێ نامانناسنەوە. دیارە چاودێری ئەوەشمان دەکرد کە ئاخۆ کەسێک بەدوامانەوە نییە و لەژێر چاودێریدا نین. جاری واش هەبوو، ئێمە لە گەرمەی قسەوباسدا بووین، کەسێک بە تەنیشتماندا تێدەپەڕی، وە یان بەرەوڕوومان دەهات، ئێمە بۆ خۆپاراستن بابەتەکەمان بە بابەتی ئاسایی دەگۆڕی.

ڕۆژێکیان کە دەیکردە ڕێکەوتی ١٩٧٧/٧/٢٠ وەک هەر جارێکی تر یەکترمان بینی و لە عاشوورەوە بەڕێ کەوتین و گەییشتینە بەردەم عەلوەی شەعبی کە ئەو دەمە کەوتبووە سەر ئەو شەقامەی ئەمنی کەرامەی لەسەر بوو، ئەسعەد باسی ئەوەی هێنایە پێشەوە کە پێویستە ئێمە خەبات و تێکۆشانی خۆمان بۆ ڕزگاریی نیشتمان، بۆ ڕزگاریی کرێکاران و جووتیاران و ڕەنجدەران بە شێوەیەکی ڕێکخراو بەرینە پێشەوە ... بەم قسانە دڵم خورپەیەکی کرد و هەستم بەوە کرد، ئیدی ئەمەیان بابەتێکی جیاوازە و قەرارکردن بۆ کارێکی وا، یانی کارکردن لەنێو ڕێکخراوێک بەنهێنی دژی دەسەڵاتێکی پڕ لە زەبروزەنگ، یانی بڕیاردان بۆ گرتنەبەری ڕێگایەکی سەخت و پڕ لە مەترسی، بەلام هەستم بەوەش دەکرد، ئەمە کارێکی پیرۆز و مەزنە و کەسانی وەکوو ئێمە هەر دەبێ شان بدەنە بەر کارێکی وا. بە ئەسعەدم وت، ئەی شێوازی کارکردن و نهێنیکاریمان و زانین و نەزانینی هاوڕێیانی دیکەمان چۆن دەبێ؟ وتی، ناوێکی نهێنی بۆ خۆت هەڵدەبژێری و بەو ناوە دەناسرێیت، جگە لە من هیچ کەسێکی دی نازانێت ئەو ناوە نهێنییە کێیە! هەر ئەو ڕۆژە منیش بڕیاری کارکردنم دا و ناوی "نەسرەوت"یشم وەک ناوی خوازراو بۆ کاری نهێنی و ژێرزەمینی بۆ خۆم هەڵبژارد. ئیدی ئەو ڕۆژە گەلێک ڕێمان کرد و لای عەلوەکەوە بەرەو پردی تەبەقچەلی ڕۆییشتین و پاشان پەڕیینەوە بۆ ئەوبەری زێی خاسە و بەرەو قۆرییە و حەمام عەلی و پاریسی کەرکووک (عەرەفە) و پاشان گەڕاینەوە.

شێوازی کاری کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان لەو دەمەدا وا بوو، دوای ئەوەی لە پاکی کەسێک دڵنیا دەبوون و متمانەی تەواوی پێ دەکەن، دوای ئەوەی شۆڕشەوق و حەماسی شۆڕشگێڕانەیان تێدا بەدی دەکرد، واتە، لە هەڵسەنگاندن و لە دیدی کەسی ڕێکخەرەوە ئامادەگی ئەو کەسە بۆ کاری نهێنی و ڕێکخراوەیی هەست پێ دەکرا، بۆ ماوەی ٦ مانگ دەیانخستە نێو ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی

خویانەوە، بەبێ ئەوەی ئەو کەسە خۆی ئاگاداری ئەوە بێت و بەفەرمی پێی بڵێن. چونکە شێوازی کاری نهێنی ئەوەی دەخواست و دەبوو ئەو کەسە بەو تاقیکردنەوەیەدا تێپەڕێت. لەدوای تێپەڕبوونی ئەو ماوەیە، ئەگەر کەسی بەرپرس یکدانەوەی بۆ ئەو کەسە پۆزەتیڤ بێت، ئەوا موفاتەحە دەکرێت و بە فەرمی دەبێتە ئەندام و لە شانەیەکدا ڕێک دەخرێت. دەبێت ئەو کەسە بەگوێرەی توانای خۆی، مانگانە بڕێک پارە بە ڕێکخستن بدات کە پێی دەگوترا: ئابوونە، وە یان حەقی ئەندامەتی.

جاری واش هەبوو لە دەرەوە و لە شاخ، واتە ڕابەرایەتیی، داوای بڕێک پارە دەکرا و دەیانگوت، زۆر پێویستمان بە بڕی ئەوەندە پارە هەیە، بەڵکوو لەنێو خۆتان و لەنێو ڕێکخستن و لایەنگراندا لە ماوەی ئەوەندە ڕۆژدا بۆمانی تەگبیر بکەن. بیتەوە بیرم، هەر لەو سەرەتایەدا بوو کە من بووم بە ئەندامی کۆمەڵە، داوایەکی وا کرا و بە منیان گوت، ئەبێ نیو دینار کۆمەک بکەم، چۆن پەیدای دەکەم، ئەبێ بیکەم. نیو دینار بۆ منی خوێندکار و بۆ ئەو ڕۆژگارە کەم نەبوو. هەر لەو ڕۆژانەدا بوو، بەرێکەوت من لە سەرسووچی مزگەوتەکەی مەلا جەبار ڕاوەستابووم، کابرایەک هات پرسیاری کرد و وتی، ئەمەوێ بۆری ڕابکێشم، پێویستم بە کرێکارێک هەیە، تا چاڵەکەیم بۆ هەڵقەنێ. منیش لە دڵی خۆمدا وتم، دەی فرسەتێکی چاکە و باش هاتە پێش، ئیدی بە کابرام وت، زۆر باشە من دێم بۆت هەڵئەکەنم. کابرا ماڵی لەو سەرسووچەی کە باسم کرد، هەروا یەک کیلۆمەترێک دوور ئەبوو.

ئەو سەرسووچە بنکەی هەمیشەیی ئێمە بوو، هەموو ڕۆژێک دەمەو عەسران و سەرلە ئێواران من و ڕزگار سەلام و محەمەدی برای و نەوزاد فەتحوڵا و محەمەد ساڵەیی و لوقمانی برام و هەندێک جار ئەحمەد خورشید و جەبار حەسەن ... لەوێ ڕادەوەستاین و بە قسەوباسی ئاسایی ڕۆژگارمان بەسەر دەبرد. هێندێک جاریش ئەوانەی لە ئێمە بەتەمەنتر بوون، بۆ کاتێکی کەم لەگەڵمان ڕادەوەستان، وەکوو: محەمەد ئەحمەد حوسێن (محەمەد باجی عاسم) و فەرمان ئەمین گۆگجەیی ...

لەگەڵ کابرا بەڕێ کەوتم، هەتا گەیشتینە لای ماڵەکەیان. بێڵ و قازمەی هێنا و شوێنەکەی بۆم دەستنیشان کرد. منیش دەستم کردە ئیش و دەمەو عەسر تەواوم کرد، بەڵام من هەرگیز کرێکاریم نەکردووە و بێڵ و قازمەم نەوەشاندووە، چونکە

ئەوانە لێزانینی دەوێت و ئەبێ بزانی چۆن کلکەکەی دەگری، جا زەوییەکەش ڕەقان و بەردەڵان بوو، کاتێک تەواو بووم، نێودەستم یەکپارچە بووە تۆقلە و دەتگوت خوێت پێوە کردووە، بەڵام کێشەیەک نییە، گرنگ نیو دیناری کۆمەکەکەم پەیدا کرد، پاشان بردم بۆ ئەسعەد.

ئەو دەمە یەکێک لە کێشەکان ئەوە بوو، ئەندامان ئابوونەیان دوا ئەخست، بەڵام من لە ژیانمدا دوام نەخستووە و بۆ جارێکیش ئابوونە قەرزار نەبوومە. بەڵام ئەبێ ئەوەش بڵێم کە مەلا خەلیل (خەلیل عادیلە سوور) بۆ ئابوونەدان گەلێک لە من گورجتر بوو، ئەگەر بهاتبایە و کاتی کۆبوونەوەکەمان بکەوتبایەتە دوای سەرمانگەوە، ئەوا ئێوارە کە دنیا تاریک دادەهات و دوای نوێژی ئێوارە، ئەهات لە دەرگای ئەدا، کاتێک ئەچوومە دەرەوە لەگەڵ سڵاو و چاکوچۆنی و تەوقەکردندا ئابوونەکەی خۆی کە لە مشتی قایمی کردبوو، دەیخستە نێو مشتم و ئەڕۆی. بەڵێ، دەیزانی ئەو برە پارەیە لەو ڕۆژگارەدا حیسابی لەسەر دەکرێ و ئیشێکی پێ رایی دەکرێ! دەیزانی بەو برە پارەیە هێندێک خواردن، جلوبەرگ و پێڵاو، فیشەک و دەرمان بۆ پێشمەرگەیەک دابین دەکرێت.

بەو جۆرە و هەر لە تەمەنێکی کەمی خۆم و کۆمەڵە و سەرەتای کاری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و لە سەختترین ڕۆژە سەختەکانی کاری نهێنی و سیاسی لە مێژووی کوردستانی عێراقدا، کەوتمە نێو کۆڕی تێکۆشان و هەوراز و نشێوی ڕێگای سەختی خەبات.

ئەو دەمەی من لەنێو ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی کۆمەڵەدا بووم، تەمەنم ١٦ و کۆمەڵەش ٦ ساڵان بوو. هەرچی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، تەمەنی ساڵێک و چەند مانگێک بوو، شەهید ئارام تازە چووبووە دەرەوە و لە سەروبەندی ئیعدامکردنی خاڵە شەهاب و هاوڕێکانیدا بوو. ئەو ڕۆژەش کە من تێیدا بوومە ئەندامی کۆمەڵە، بەڕێکەوت ڕۆژی گەڕانەوەی مام جەلال و نەوشیروان مستەفا بوو بۆ کوردستان.

# ماڵی ئەسعەد

لێرە بەدواوە هاوڕێیەتی من و ئەسعەد پێی نایە قۆناغێکی دیکەوە. هەتا ئێرە من و ئەو دوو هاوڕێی زۆر نزیکی یەک بووین، پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و پتەو، ڕێز و قەدرێکی زۆر بۆ یەکتر، بڕوا و متمانەیەکی لەڕادە بەدەر بە یەکتر، قسەوباسی نهێنی و مەترسیدار ... بەڵام لێرە بەدواوە ئەو پەیوەندییانە شتێکی دیکەی هاتە سەر، ئەویش کاری سیاسیی نهێنیی ڕێکخراو و هاوبەش بوو کە لەسەر ئەو پەیوەندییانەی پێشوو، خۆی بنیات نا و ئەوانەی کردە ڕەگ و بنەمای خۆی.

ئەم پەیوەندییە نوێیە پەیمانێکی نوێیە و دەشێ لەو سۆنگەیەوە ئازار و ئەشکەنجەی زۆرت بۆ بێتە پێش و دەشێ هەر لەو سۆنگەیەوە و لە شەو و ڕۆژێکدا چارەنووس و تەواوی ئاراستەی زیندەگیت وەرچەرخێ، نەک بە تەنها هەر هیی خۆت، بگرە تەواوی ئەندامانی خێزانەکەشت!لێرە بەدواوە کۆبوونەوە و دانیشتنەکانیشمان گۆڕانیان بەسەردا هات و لە ڕێڕۆیشتن و پیادەڕەویی نێو جادەوبان و کووچە و کۆڵانەکانەوە بۆ نێوماڵ و نێو ژوور و هۆدە و گۆشە و کەنارەکان گواستەوە. دەشبوو هەر وا بێت، چونکە لەوێ بەدواوە پێویستی بەوە دەکرد بڵاوکراوەی نهێنی، گۆڤار و ئۆرگانی سازمانەکە و بابەتی نێو کتێب و کتێبچەی مەمنووع بخوێنینەوە و موناقەشەی بکەین، ئەمەش پێویستی بە جێوشوێن و پەناگەیەک هەبوو کە تێی دابنیشین و لە چاوی بەدکاران بەدوور بین. ئەو پەناگەیەش بۆ ئێمە ماڵی ئەسعەد بوو.ماڵی ئەسعەد خانوویەکی سادە بوو، سادە وەک هەژاران، سادە وەک خۆمان و هزر و بیرمان. ئەو خانگە وەک زۆربەی خانگەکانی ئەو دەمە لە قایە و گەچ دروست کرابوو، بە دەرگایەکی دوودەری باریک و بەرزی لە ئاسن دروستکراوەوە دەچوویتە ژوورەوە، سەرەتا بە دالانێکی بچووک دەستی پێ دەکرد و پاشان دەگەییشتیتە نێو حەوشەیەک، بەرامبەرت دوو ژوور و هەیوانێک و بە دەستی ڕاستی دالانەکەش ژوورێک و لە بان ئەم ژوورەش باڵەخانەیەک هەبوو. ئەم باڵەخانەیە، یان ئەو ژوورەی قاتی سەرەوە، شوێنی دانیشتن و کۆبوونەوەکانمان بوو.

ئەوەنــدەی مــن بــزانم، ئەســعەد ســێ بــرای لە خــۆی گەورەتــر و خوشــکێک و برایەکــی لە خــۆی بچــووکتری هەبــوو، هەر لەو ســەروبەندەدا بــوو بــاوکی مــرد. مــحەمەدی بــرا گەورەی دوکــانێکی لــێفەدووری لە حەســیرەکە، لە لاکــۆڵانێکی نێــوان گەراجــی ســلێمانیی ئەو دەمە و دوکــانەکەی حەســەن کەڵەمێــرد هەبــوو. لە وەختــی پشــووی قوتابخانەکانــدا ئەســعەدیش دەچــووە ئەو دوکــانە و لــێفەدووری دەکــرد. پیشەی لێفەدووری گەلێک سەخت و پیسە، لە لایەکەوە بە چینچکەوە کار دەکەیت و هەڵقونهەڵقون ئەکەیت و جومگەکانی ئەژنۆ و ی‌ڕبڕەکانی پشتت تێک دەشکێن، لە لایەکی دیکەوە تۆزی لۆکە و هەلاجی سینگت وێران دەکات.

جار جارێک بۆ ئەو دوکانەش بۆ لای ئەسعەد دەچووم و پێکەوە قسەوباسمان دەکرد. ئەو بەدەم لێفەدوورینەوە قسەوباس و موناقەشەی خۆی دەکرد، لە کاتێکدا من بەدەم کارکردنەوە باسی جددیم پێ ناکرێت و وەڕس دەبم. من پێم خۆشە لەو کاتەدا لەگەڵ بەرامبەرەکەم قنج و قیت دابنیشم و چاوم لە چاوی بێت.

من لە سلاوێک بترازێت، هیچ پەیوەندییەکی دیکەم لەگەڵ خانەوادەی ئەسعەددا نەبــوو، هەر کاتێــک مەوعیــدێکمان هەبــووایە، لە دەرگــام دەدا و ئەســعەد دەهــات و لەگەڵیــدا دەچــوومە ژوورەوە، لە دالانەکەوە بــۆ نێــو حەوشــە و پاشــان بە پێپیلکــانەیەکی قەڵــب و ڕک و کــوڕ بــۆ باڵەخــانەکە ســەردەکەوتم. باڵەخــانەکە سەندووقێکی کۆن و فەردەیەک ئارد و سەبەتەیەک نانەتیری و هەندێک شتومەکی ماڵ و چەند کورسییەکی نایلۆن و لە هاویناندا پانکەیەکی عەرزیی تێدا بوو. بەڵام پــانکە چــی پێــت دەکــرد، بە تــایبەتی ئــێمە کۆبوونەوەکانمــان دەخســتە قرچەقرچــی گەرمای نیوەڕۆوە، ئەو دەمەی خەڵکی لەبەر تینی گەرما ئۆقرەی لێ دەبڕا و سەری ناکردە دەرەوە و لەشی خاو دەبووەوە و بەناچاری دەخەوت. ئەوەش بۆ ئەوەی لە کاتی چوونەژوورەوە و هاتنەدەرەوەدا کەس نەمان بینێ و گومان لەو هاموشۆیەی ئــێمە نەکرێــت. ئیــدی ئەو ژوورە بەو حەلــحەلەی عاســمانەوە خۆرەتــاوی گەرمــی کەرکــووک بە چواردەوریــدا دەســووڕایەوە و چــاوی لــێ نەئەتroوکاند، نیشــانی لــێ دەگرت و دەیکردە مەنجەنیقێک هەر مەپرسە، ئێ هەوای پانکەش لە گڕە بەولاوە چیدی نەبوو. سەرباری گشت ئەمانە، جارجارێک دایکی ئەسعەدیش هەڵی ئەکوتایە

سەرمان و لە ترس و خۆفی خۆی و بە بەرچاوی منەوە ئەسعەدی سیاسەت ئەکرد و ئەڕۆی، ئەیزانی خەریکی چیین و ئەیگوت: واز بێنە، سەرمان بەقوڕا ئەکەیت!

ئەوان خۆیان بە بنەچە خەڵکی گوندی عەودالاَن بوون، لە ناوچەی قەڵاسێوکە و چەمی ڕەزان. قسەیەکی کوردی هەیە دەڵێت، پیازی عەودالاَن خواردنی هەیە، بردنی نییە، واتە، گەلێک ناسکە. بۆ کاتی خۆی ئەم دەڤەرە مەڵبەندی جەلالییەکان بوو، دایکی ئەسعەد ئەتواری جەلالییەکانیشی بینیبوو، حەزی بە چارەیان نەبوو. لەو کاتەدا کە دایکی ئەسعەد خۆی توند و تووڕە دەکرد، منیش گەلێک شەرمەزار ئەبووم و ئەکەوتمە ژێر فشارەوە، ئەسعەدیش لە من زیاتر و ڕەنگی تەواو دەگۆڕا، بەلاَم قسەپێکوتن و سیاسەتکردن چی دەکات، ئەوە بڕوا و قەناعەتە و وا بەسانایی لەق نابێت.هەر وەکوو گوتم، من هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵ خانەوادەی ئەسعەددا نەبوو، ڕۆژێک نەچووم لەنێویاندا دابنیشم و تێکەڵییان بکەم، نەیاندەزانی من کێم و کوێندەریم. جارێکیان بۆ ماڵی ئەسعەد چووم و لە دەرگام دا، کەسێک هاتە دەرەوە و پرسیاری ئەسعەدم لێی کرد، وتی: ئەسعەد لە ماڵ نییە. منیش وتم: ئەگەر هاتەوە، پێی بڵێ، سالار هاتبوو بەدواتدا ... دواتر ئەسعەد لەسەر ئەوەی من ناوی خۆمم بەو کەسە گوتووە، ڕەخنەی لێم گرت و وتی، نەئەبوو ناوی خۆتت پێ بگوتبا!

ئەم شێوازە لە کارکردن بۆ ئەوەیە، لە کاتی گرتن و لێپرسینەوەدا ئەندامێکی ئەو خانەوادایە ئەگەر لەلایەن دەستگا ئەمنییەکانەوە کەوتە ژێر گوشارەوە، یان لەخشتە برا، ناونیشان و جێگا و ڕێگات پێ نەزانێ و تووشی گرفت نەیەیت. بەلاَم لە باری واقیعییەوە ڕووداوی لەم تەرزە دەگمەنە.

ئەم شێوازە لە کارکردن، شێوازێکی چریکییە و نادروستە. کۆمەڵە خەباتکارێکی بێناونیشان، کۆمەڵە تارماییەک، پەیوەندییەکی سیاسیی سازمانییان بە یەکترەوە هەیە، بە چرپە خۆیان بە ژووردا ئەکەن و پاش چەند سەعاتێک بۆ دەرەوە فرتەی لێ ئەکەن، کەس نازانێت لە کوێوە هاتوون و بۆ کوێ دەچن! ئیدی ئەندامانی ئەو خانەوادەیە دەکەونە نێو بارێکی دەروونی ناخۆش و نائارامەوە. ئەمە شێوازی کار و پەیوەندیی تێکۆشەرانێک نین کە بە نیازی ئاڵوگۆڕ و شۆڕشن، شێوازی کار و

پەیوەندیی کۆمەڵێک کەسانی کوودەتاچین، چونکە شۆڕش بە پەنهانی ئەنجام نادرێت و بە کۆمەڵێک قارەمانی نەناسراو بەرپا ناکرێت. بۆیە دەبێت پەیوەندییە سیاسی و ڕێکخراوەییەکان لەژێر چەتر و ڕووپۆشی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بچنە بەرەوە. ئەو دەمە تێکۆشەران مرۆڤگەلێکی ئاسایی نێو کۆمەڵ و بە ناونیشانی خۆیانەوەن. ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە نەک هەر زیانبەخش نییە و نابێتە هۆی گرتن و زیندانی، بەڵکوو دەبێتە پەرژین و شوورایەکی قایمیش. لەلایەکی تریشەوە ئامانج و ئاوات و داخوازییەکانت کە لە بنەڕەتدا هی کرێکاران و زەحمەتکێشان و بەشمەینەتانە، جەماوەری دەبێتەوە و بنج دادەکوتێ و بۆ خەباتی ڕۆژانە و هەنووکەیی و بۆ ڕاپەڕین و شۆڕش هێز پەیدا دەکەن.

# بڵاوكراوە، ناميلكە، ئۆرگان و كاسێت

بەو جۆرە ئیدی بە شێوەیەكی دەوری و ڕێكوپێك، هەفتانە كۆبوونەوەی خۆمان ئەنجام دەدا و هەر جارەی بابەتێكمان باس و تاوتوێ دەكرد. بابەتەكانیشمان بابەتی نێو كتێبەكانی ماو تسیتۆنگ، مونیر شەفیق، ناجی عەلۆش و بڵاوكراوەكانی جەبهەی شەعبی سەر بە جۆرج حەبەش و بڵاوكراوەكانی كۆمەڵە بوون.

بڵاوكراوەكانی كۆمەڵە و یەكێتی زۆر نەبوون و زۆر جارانیش لە وەختی خۆیاندا دەرنەدەچوون، بابەتەكانیشیان ئەگەر بەچاوی ئەمڕۆوە تێیان بڕوانین، ئەوا گەلێك سادە و سەتحی و دوور لە فكر و مەعریفە بوون، كوالیتێتی چاپ و دیزاینیشیان گەلێك خراپ و پەرپووت بوون، بەڵام كاریگەرییان ئێجگار زۆر بوو!

ئەوانەی بابەتیان دەنووسی زۆر كەم بوون و لە پەنجەی یەك دەست تێ نەدەپەڕین. لە سەردانێكماندا بۆ قەندیل بۆ بنكە و بارەگاكانی یەكێتی و ناوەندیی كۆمەڵە لە پایزی ساڵی ١٩٨٢ لەگەڵ مام جەلال دانیشتین، لەنێو قسەكانیدا باسی نووسینی بۆ ڕادیۆ و بۆ بڵاوكراوەكان كرد و وتی: من و فەرەیدوون بە زمانی عەرەبی و نەوشیروان بە زمانی كوردی بابەت دەنووسین و بەزۆری هەر ئەم سێ كەسەین!

یەكێك لەو نوسراوانە، ناميلكەيەك بوو بە نێوی "یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان بۆچی؟".[٩٠] ئەم باسە مام جەلال بە زمانی عەرەبی نووسیبووی. وەك بێتەوە یادم، ئەم نووسراوەیە باسی ئاشبەتاڵ و دامەزراندنی یەكێتیی نیشتمانی وەك نیمچە بەرەیەك دەكرد كە دواتر گەشە دەكات و دەبێتە بەرەیەكی گەلی. باسی ئەوەی دەكرد، شۆڕشی نوێی ئەمجارە بەهێزی جەماوەر پشت ئەستوورە و دژی ئیمپریالیزم و ئەمەریكا و ئیسرائیل و كۆنەپەرستییە ... ئەم ناميلكەيە لەو دەم و

---

٩٠. بۆ یەكەمین جار ناميلكەی "الأتحاد الوطني الكردستاني لماذا؟" دەستی ئەبووشەهاب دەكەوێت. پاشان ئەویش لە ڕێگەی شەهید "ئازاد هەورامی"یەوە بە "كۆمیتەی هەرێمەكان"ی دەگەیەنێت، "شەهید ئارام"یش بۆسەر زمانی كوردی وەریدەگێڕێت.

اچۆن چەپكێك و كام مێژووی كۆمەڵە؟! مەلا بەختیار، بەرگی یەكەم، چاپی یەكەم، دەستگای چاپ و پەخشی حەمدی، ساڵی ٢٠١٢، ل ١٦٦، ٢٦٠).

دەورانەدا کاریگەری گەورەی هەبوو، چونکە بیرۆکەی دامەزراندن و هاتنەکایەوەی ڕێکخراوی یەکێتیی نیشتمانی ڕۆشن دەکردەوە. بۆیە قسەوباسی نێو ئەم نامیلکەیە، قسەوباسی نێو گشت شانە و ڕێکخستنەکانی یەکێتی بوو.

بڵاوکراوەیەکی دەوری بە نێوی 'وەرزنامەی کۆمەڵە'وە دەردەچوو کە هەر بە نێوەکەیدا دیارە، هەر وەرزەی ژمارەیەکی لێ دەردەچوو. ئەم بڵاوکراوەیە گۆڤار و ئۆرگانی کۆمەڵە بوو، بە شێوەی مەلزەمە چاپ دەکرا، واتە، لەسەر کاغەزی ئەی فۆر. ئۆرگانی کۆمەڵە، هەر بە نێوی 'کۆمەڵە'وە دەردەچوو، ئەمە جێگای 'وەرزنامە'ی گرتەوە. لە ژمارە ٤ی ئەم ئۆرگانەدا باسێکی دووروودرێژ لە سەر پارتی پێشڕەوی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان هەبوو. ئەم بابەتە لەلایەن 'نەوشیروان مستەفا'وە نووسرابوو، لەژێر کاریگەریی ئەندێشەی ماو تسیتۆنگ شیکردنەوەیەکی بۆ چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای کوردستان کردبوو.

ئەم ژمارەیە لە ئۆرگانی 'کۆمەڵە' لەگەڵ ژمارەکانی یەک و دوو و سێ پێکەوە و لە کتێبێکدا بە شێوەی کتێبی گیرفان و بە فۆنتێکی زۆر ورد و جوان چاپ کرابوو. ئەو دەمە دەنگۆیەکی وا هەبوو کە ئەو کتێبچەیە لە لایەن هاوڕێیانی خۆمانەوە بە شێوەیەکی نهێنی لە زانکۆی سلێمانی چاپ کراوە. ئەم کتێبچەیە بۆ ئەو دەمە و بۆ ئێمە گەلێک سەرنجڕاکێش بوو و کاریگەری زۆری لەسەرمان دانا.

چەند بابەت و نامیلکەی دیکەمان لەو دەورانەدا بۆ هات، وەکوو: کارەساتی هەکاری لە نووسینی نەوشیروان مستەفا، جۆشدانی خەبات لە نووسینی مام جەلال، کتێبێکی دکتۆر عەزەدین شەمزینی دەربارەی مێژووی کورد.

هەروەها هەندێک بابەتی دیکە لەنێو ڕێکخستندا دەستاودەستیان دەکرد، وەرگێڕان بوون و هەر بەدەست نووسرابوونەوە وەکوو: شیکردنەوەی چینایەتی بۆ کۆمەڵگای چین لە نووسینی ماو تسیتۆنگ، نووسراوێک دەربارەی کۆمۆنەی پاریس و هەڵە و ئەزموونەکانی، نووسراوێکی دیکە دەربارەی شۆڕشی یەکێک لە وڵاتەکانی ئەفریقا بوو.

لوقمانی براشم ئەو نووسینەی دەربارەی کۆمۆنەی پاریس بوو، بەجوانی نووسییەوە و بووینە خاوەنی نوسخەی خۆمان.

لوقمـــان دەســـتوخەتێکی زۆر جـــوانی هەبـــوو، گەلێـــک نـــامیلکە و نووســـراوی نووسـییەوە. دێتەوە بیـرم چەنـدین ژمـارەی گۆڤـاری "ڕزگـاری"م لە مـاڵی حامیـد عەبدوڵا ڕەزا (عەسکەری) دەست کەوت، گەلێک بابەتی تێدا بوو، چ نووسراوەکانی مـــاو تســـیتۆنگ، وە یـــان بابەتگەلێـــک کە لەژێـــر تیشـــکی تێڕوانینەکـــانی ئەودا نووسرابوونەوە، لوقمان هەموو ئەوانەی دووبارە بەدەست و بە چەندین نووسخە نووسییەوە و لە ڕیزەکانی ڕێکخستندا دەستاودەستمان پێ دەکردن.

لە ســاڵی ١٩٧٨دا دەورەیەکــی کــادران کــرایەوە، کە تیایــدا مــام جەلال، دکتــۆر مەحمــوود عوســمان، نەوشــیروان مســتەفا ...هتــد. کــۆمەڵە موحازەرەیەکیــان تێــدا وتبووەوە و لەســەر کاسێت تۆماریان کردبوون و پاشـان بۆ ئێمەیان ڕەوان کرد. لەنێو ئەوانەدا کاسێتی موحازەراتەکانی مـام جەلال و نەوشیروانمان پێ گەیشت. مام جەلال لەوێدا باسی یەکێتیی نیشتمانی و سیاسەتی پشتبەستن بەهێزی خەڵک و پەیوەندیی نێوان کۆمەڵە و یەکێتی و شۆڕشی ڕزگاریی نیشتمانی و پەیوەندییان بە خەباتی چینی کرێکارەوەی دەکرد و بۆ پاڵپشتیی قسەکانی، وتەکانی مـاو تسیتۆنگی بە عەرەبی دەهێنانەوە و پاشان وەریدەگێڕانە سەر زبانی کوردی.

هەرچـــی موحازەرەکـــانی نەوشـــیروان بـــوو، باســـی جوگرافیـــای ئـــابووریی کوردستانی گەورەی دەکرد و باسـی ئەوەی دەکرد، کوردسـتان خـاوەنی چییە و چ ئیمکانیـاتێکی ئـابووری هەیە و هەر نـاوچەیەک لە ناوچەکـانی کوردسـتان دەتوانێت چی بەرهەم بهێنێت و لە کاتێکدا ئەگەر کوردسـتان ئـازاد و سـەربەخۆ بـوو، چـۆن دەتوانێـت ئـابووریی خـۆی ئیـدارە بـدات. وەلـێ تۆمـاری موحازەرەکـانی دکتـۆر مەحموود عوسمانمان بۆ نەهات.

ئەم جۆرە سیمینار و خولانە و ئەو شێوازە لە ناردنی بابەت لە ڕێگەی تۆماری دەنگییەوە بۆ ئەو دەمە زۆر عەمەلی و کاریگەر بوو، چونکە لەلایەکەوە وەک هەر کاسێتێکی ئاسایی دەکـرا بەئاسـانی بگـوێزرێتەوە و ئەمدەسـت و ئەودەسـتی پـێ بکرێت و لەلایەکی دیکەوە کەسـانێکی نەخوێنـدەواریش دەکرا کەڵکی لـێ ببیـنن و کـاریگەر و زینـدوو بـوو. بەڵام ئەم شـێوازە زۆر کەم کەڵکـی لـێ وەردەگیـرا و

ئەوەندەی من بیتەوە یادم، تەنها هەر ئەو جارە بوو، وە یان لەڕاستیدا ئەو جۆرە خول و سیمینارانە لەنێو کۆمەڵەدا هەر نەبوو.

بێجگە لەمانە، جارجاریش بڵاوکراوەی "ڕێبازی نوێ" بە زبانی کوردی و ئەلشەرارە (الشرارة)مان بە زبانی عەرەبی بۆ دەهات کە ئەوانیش هەر بۆخۆیان بە ڕێکوپێکی دەرنەدەچوون و بە چەند مانگ جارێک ئەگەر ژمارەیەکیان لێ دەربکرادایە و چەند مانگ دوای ئەوە ئەگەر بە ئێمە بگەییشتبایەن.

ساڵانی دواتریش بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیی چەند لاپەڕەیی دەردەچوو کە هەر جارەی دەربارەی بابەتێک بوو، لەوانە: تەعریب و تەبعیس و تەهجیر، هاوڕێی کۆمەڵە ...هتد.

گۆڤاری کۆمەڵەشمان بۆ دەهات و دێتەوە بیرم لە یەکێک لە ژمارەکانیدا بابەتێکی مەلا بەختیاری تێدا بوو، سەبارەت بە کۆمەڵە و خەباتی چینایەتی. مەلا بەختیار ئەم وتارەی لەژێر ناوی نهێنی "باوکی ئاوارە"دا بڵاو کردبووەوە!

یەکێک لەو نەریتە خراپانەی کە لەنێو کۆمەڵە و دواتریش لە زۆربەی ڕێکخراوە چەپەکاندا هەبوو ئەوە بوو، نووسراوەکانی خۆیان بەبێ ناو، وە یان بە ناوی تاک و ناوی نە ناسراوەوە بڵاو دەکردەوە. دیارە بەهۆی لەئازادانەبوونی ئازادیی بیر و بڵاوکردنەوە و بەهۆی دۆخی سەرکوت و ئیستیبدادەوە بەناچاری ناوێکی نهێنی بۆ خۆت هەڵدەبژێری تا هەڵسووڕان و کار و چالاکی خۆتی لەژێردا بەریتە پێشەوە، بەڵام لەمە بترازێت، ئیدی هیچ پاساوێکی دیکە بۆ ئەو کارە نییە.

نووسینی وتار و دەرکردنی نامیلکە و کتێب بەرپرسیارێتییە، ئەگەر نووسەرەکەی خۆی بەخاوەنیان دەزانێت و لە پەیامەکەیدا جددییە، گەرە ناوی خۆی لەسەر دابنێت و ناوێکی سابتیش، نەک هەر جارەی ناوێک، تاوەکوو خوێنەر بابەتەکەی بەجددی وەربگرێت و لە هەر دەورانێکدا بزانێت فڵانە نووسەر و فڵانە ڕابەر ڕا و بۆچوونی چییە و هێڵی فکری ئەو و شێکارییەکانی لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە بەرچاوان ڕوون و لە بەردەست بن. هەر وەکوو چۆن لە کن خەڵکی ئەگەر کاڵایەک لۆگۆی کۆمپانیا و وڵاتەکەی پێوە نەبێت، بایەخی نابێت و بەگومانەوە تێی دەڕوانن، بۆ نووسین و بابەتگەلی سیاسیش هەر وایە، هەر وەکوو

چۆن کۆمپانیایەکیش بڕوای تەواوی بە بەرهەمەکەی خۆی هەبێت، خاوەنداری لێ دەکات و لۆگۆی خۆی لەسەر دادەنێت و پێی خۆشە خەڵکی لەگەڵ بەرهەمی کۆمپانیایەکی دیکە تێکەڵی نەکات، بۆ نووسەر و سیاسی و ڕابەرێکی جددیش هەر وایە.

هیچ پاساوێک بۆئەوە نییە، نەوشیروان مستەفا و فەرەیدوون عەبدولقادر بەبێ ناو و مام جەلال بەبێ ناو، یان بەناوی پیرۆت و مەلا بەختیار بەناوی باوکی ئاوارەوە نووسینەکانیان بڵاو بکەنەوە!

هەر وەکوو پێشتریش ئاماژەم پێی کرد، ژمارەی ئەو کەسانەی لەو ڕۆژگارەدا وتار و توێژینەوەیان نووسیوەتەوە، زۆر کەم بوونە و کەم کەس زاتی ئەوەی کردووە خۆی لە قەرەیان بدات. ڕەنگە قەڵەمەکەی نەوشیروان مستەفا لەو دەمەدا لە هەموو ئەوانی دی بە بڕشتتر بووبێت، ئینجا مام جەلال. فەرەیدوون عەبدولقادر سەرباری وتارەکانی کە بەبێ ناو بڵاوی دەکردنەوە، نامیلکەیەکی بە ناوی "پارتی پێشڕەوی چینی کرێکاری کوردستان"[91] نووسییەوە، دواتر سالار عەزیز بە نامیلکەیەک و بە ناوی "چەند سەرنجێکی ڕەخنەگرانە دەربارەی نامیلکەی پارتی پێشڕەوی چینی کرێکاری کوردستان"[92] وەڵامی دایەوە. مەلا بەختیار تەنها یەک بابەتیم بینی و ئازاد هەورامی هیچ ...هتد.

کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان لە ماوەی پێنج ساڵی تەمەنیدا کە شەهابی شێخ نووری لەو دەمەدا سکرتێر (لە باری فیعلییەوە)ی بوو، تەنها ٣ ژمارەی لە بڵاوکراوەی "ئاڵای سوور" دەرکرد: یەکەم ژمارە لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٧٣، دووەم ژمارە لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٣ و سێیەم ژمارە لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٤.[93]

شەهید ئارام لە سەردەمی خۆیدا، واتە، لە سەروەختی کۆمیتەی هەرێمەکاندا ئۆرگانێکی بە نێوی "ئاڵای شۆڕش"ەوە دەرکرد، تەنها یەک ژمارەی لێ دەرچوو.

---

٩١. بیبلیۆگرافیای کتێبی نهێنیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ١٩٧٥-١٩٩١، نەوزاد عەلی ئەحمەد، چاپخانەی دلێر، ل ٥٢.

٩٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٧١.

٩٣. برایم جەلال، چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، چاپخانەی ڕوون، ساڵی ٢٠١١، ل ٥١-٥٣.

# گواستنەوە و هەڵگرتنی شتە مەمنووعەکان

هەر وەکوو باسم کرد، کۆبوونەوە و دانیشتنەکانمان بێگومان دەبوو زۆر بەوریایی، بەئاگایی و بەنهێنییەوە بن، بەڵام لەوان گرنگتر پاراستنی بڵاوکراوە و چاپکراوە حیزبییەکان بوون. ڕەنگبێ دەگمەن بێت، کەسانێک لە کاتی کۆبوونەوەی حیزبییاندا گیرابن، خۆ ئەگەر لەو کاتەشدا بگیرێن و بەڵگەیەکیان پێ نەگیرێ، ئەوا کێشەیەک نییە، بەڵام هەر کاتێک لە ڕێگاوبان یان لە ماڵەوە بڵاوکراوەیەک بە یەکێک بگیرێ، ئیدی ئەوە نیشانە و بەڵگەی پەیوەندیی سیاسی و حیزبیی ئەو کەسەیە و سەرەداوێکە بە دەستی دەستگا ئەمنییەکانەوە، چونکە ئەوە بڵاوکراوە و چاپەمەنیی ڕێکخراوێکی سیاسیی نهێنی و مەمنووع و دژی دەسەڵاتە و لە جێگایەک چاپ کراوە و بەنهێنی لەنێو ئەو ڕێکخراوەدا دەستاودەستی پێ دەکرێت و کۆبوونەوەی لەسەر دەکرێت و خەڵکی پێ دەخرێتە سەر ئەو بیروباوەڕ و ڕێبازە و لە دژی ئەو دەسەڵات و حکوومەتە سازمان دەدرێن. واتە، ئەگەر بڵاوکراوەی ڕێکخراوێکت پێ گیرا، نیشانەی پەیوەندیی تۆ بەو ڕێکخراوەوەیە و هەتا ئێرە بۆ دەستگا ئەمنییەکان ئەوە ڕۆشنە کە تۆ سەر بە کام یەک لە ڕێکخراوەکانی دژی دەسەڵاتی، لەدوای ئەوە لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجە لەسەر ئەوە دەست پێ دەکات، ئەو بڵاوکراوەیەت لە کێ وەرگرتووە.

لە کاتی گرتن و زیندانیدا دوو مەسەلە وەک بەڵگە دێنە پێشەوە، ئەویش یەکەمیان، شایەدی و گەواهی کەسێکە بەسەرییەوە، دووەمیان، گرتنی بڵاوکراوە و چاپەمەنییە لەلای ئەو کەسە. ئەگەر کەسێک بۆ نموونە، لە ڕێگاوبان، لە بازگەیەک، لە کاتی بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەدا، وە یان لە کاتی نووسینی سەردیواردا بگیرێ، ئەوە ئیدی بەڵگەی یەکلاکەرەوەیە و تەک و جمی تێدا نییە، بەڵام ئەگەر کەسێک شایەدی بەسەرەوە بێت، دەتوانێت نکۆڵی بکات و بڵێ، ئەو شایەدییە ناڕاستە.

کەواتە، گواستنەوەی بڵاوکراوە و چاپەمەنی بەوریایی و چاکردنی جێگایەکی شاراوە و نهێنی بۆیان، پێویستییەکی گرنگی خۆپاراستن و بەردەوامیدان بە خەبات و تێکۆشان بوون.

بۆ گواستنەوەی بڵاوکراوە و گۆڤار و کتێب، زستانان هیچ کێشەیەکمان نەبوو، چونکە لە زستانانی پاڵتۆمان لەبەر دەکرد و دەمانتوانی بیخەینە نێو گیرفانی ناوەوەی پاڵتۆکەمان، وە یان لەژێر پشتوێنی پانتۆڵ، یان بەندەخوێنی

شـەرواڵەکەمان تەنگـی بکەیـن، بەڵام کێشـەمان وەرزەکـانی دیـکەی سـاڵ بـوو، بە تـایبەتی لە وەرزی هـاوین، چـونکە لەبەر گەرمـا تەنهـا یەک کراسمان لەبەر دەکـرد، بۆیە بەناچاری دەبوو لەنێو گۆرەوی و بە دەوری پووزمـانەوە شـەتەکی بدەین و دەلنگـی پـانتۆڵ یـان شــەرواڵەکەمان بەسـەریدا بـدایە. ئیتـر جـاری وا هەبـوو، جەرەبابەمان دەدا و هەتـا دەگەییشتینە جێ، ئازارمـان لـێ هەڵ دەستا، جاری واش هەبوو، شل دەبووەوە و خواخوامان بوو بگەینە جێ و نەیەتە خوارەوە. خۆ ئەگەر لەنێـو نایلۆنــت نەهاویشـتبا، ئەوا ئـارەقی هــاوین و ژێــر هەتــاوی کەرکــووک بڵاوکراوەکەی تەڕ دەکرد و عەدەم دەبوو. بێجگە لە بڵاوکراوە و ئۆرگـان و نـامیلکە حیزبییەکـان، وردە وردە کتێـبە حەرامکراوەکانیشـم زیـادی دەکـرد، بـۆیە دەبـوو، جێگایەکیش بۆ ئەوان چێ بکەم. هەر وەکوو لە سـەرەتادا باسـم کرد، ئێمە ئاژەڵدار بووین و کادانمان هەبوو، کادانەکەمان لە چاڵیدا بوو، سەندووقێکی تەختەم دروست کردبوو، دەرگـایەکم لە تەنیشـتەوە بۆ دروسـت کردبوو، ئەم سـەندووقەم لە دیـوی دەرەوەی کادانەکە خستبووە ژێر زەوییەوە بە جۆرێک کە دەرگاکەی لەنێو کـادانەکە بێـت و پاشــان ئەویشــمان بە کــا دادەپۆشــی، واتە، ئەگەر شــەنیان لە کــایەکەش وەردایە، هەروا ئاسان نەبوو پەی پێ ببەن. گەلێک جار ئەگەر مەترسییەکمان شـک ببـردایە، وە یـان دەنگـۆی پشـکنین و گەڕانمـان ببیسـتایە، ئەوا باشـتر خۆمـان قـایم دەکرد و هەموو شـتەکانمان کۆ دەکردەوە و لەو جێگایەمـان دەشـاردنەوە. بەزۆری دایکم کۆمەکی دەکردم و ئازا و گورج کایەکەی هەڵدەدڕی، تـا دەمـی سـەندووقەکە وەدەر دەکەوت و شـتەکانمان تـێ دەئـاخنی. ئەگەر بـاوکم ئاگـادار بـووایە، تـووڕە و ناڕەحەت دەبوو و بە پەستییەکەوە دەیگوت: ئاخر پێم ناڵێیت، تۆ ئەمانەت بۆچییە؟!

بێجگە لەوە، بۆ بڵاوکراوە کە تەنـک بـوو، دەرگـای کۆمەدییەکم تەرتیـب کردبـوو، بە جۆرێـک یەکێـک لە تەختەکـانی چوارچێـوەی دەرگـاکە کە دوو پـارچە مەعاکسـی بەسـەرەوە بـوو، بەینەکەیشـی بـۆش بـوو، بەیەک بـورغی قـایمم کردبـوو، بەئاسـانی دەمکردەوە و قایمم دەکردەوە. بەزۆری کە ئێوارە دادەهـات، ئەو بڵاوکراوەیەی کە دەرمهێنـاوە و خەریکـی خوێنـدنەوەیم، لەنێـو دەرگـای کـۆمەدییەکە دەم شـاردەوە، چـونکە بەزۆری هەڵکـوتین و چـوونە سـەر مـاڵان و پشـکنین لە شـەودا بـوون، بەو جۆرە من هەموو شەوێک لە ئامادەباشی و پێشوازی زرتەبۆز و گورگەکانی شەوی شاردا بووم!

# ئاڵوگۆڕێك لە پەیوەندییەكانمان

دوای ئەوەی بوومە ئەندام و چەند مانگێک بەسەر ئەوەدا تێپەڕی، ئەسعەد ئاگاداری کردمەوە، پەیوەندیی ڕێکخراوەییم لەگەڵ ئەودا نامێنێ و لەمەودوا پەیوەندیم بە هاوڕێیەکی دیکەوە دەبێت. ئیدی ڕێوشوێنی گواستنەوەی پەیوەندییەکەیان ڕێک خست و ئەو وشە نهێنییەش کە دەبوو لە نێوانی من و بەرپرسە نوێکەمدا بێت، پێم گوترا. من لە کاتی خۆیدا و لەماڵەوە چاوەڕوانی ئەو هاوڕێیەم دەکرد کە جارێک نازانم کێیە! لە کاتی دیاریکراودا لە دەرگا درا و چوومە دەرەوە، ڕوانیم هاوڕێیەکی خۆمە و ناوی "سەلاحەدین ئیسماعیل محەمەد"ە.[٩٤] ئیتر بەو شێوەیەی کە پێمان گوترابوو، وشەی نهێنیمان گۆڕییەوە و لە یەکتری ئاشکرا و دڵنیا بووین.سەلاحەدین ئیسماعیل هەر وەکوو لە سەرەتادا ناویم بردووە، لە پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی هاوپۆلی یەک بووین و بایەخی بە خوێندنەوەی کتێب زۆر دەدا و شیعری دەنووسی و نازناوی سەلاحەدین جەباری لە خۆی نابوو و لە کۆشی خانەوادەیەکی سیاسیدا گەورە ببوو.

باوکی سەلاح لە سەردەمی خۆیدا ئەندامی پارتی بووە، عەبدولستار تاهیر شەریف لە یاداشتەکانیدا و لە بیرەوەریی سەرەتای شەستەکاندا باسی دەکات و دەڵێت: "کاتێک لە کەرکووک دەرچووم، دنیا شەو بوو، چاوساغم ئیسماعیل پۆلیس بوو، کە بە ئیسماعیلە گۆج ناسرابوو. جارێکیان خەریکی مینێک دەبێت، ئاگر لە فتیلەکەی بەرئەدات، پاشان هەوڵ ئەدات فتیلەکە بکوژێنێتەوە، فریا ناکەوێت و کەپسوولی سەر فتیلەکە بە پەنجەکانیدا ئەتەقێتەوە و چەند پەنجەیەکی ئەپەڕێنێ.

ئیسماعیل یەکێک لە ئەندامە تێکۆشەر و نەترسەکانی پارتی بوو، دوای ئەوەی لە پۆلیسی دەرکرا، دوکانێکی عەتاری لە گەڕەکی ئیمام قاسم لە نزیک چایخانەکەی خورشید عوسمان ڕابی دانا. ئیسماعیل دەوری سەرەکی لە دەرکردنی ئەو

---

٩٤. سەلاحەدین ئیسماعیل محەمەد (سەلاح ڕەنجدەر) لەساڵی (٢٠١١)وە جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، پلەی سەربازیی عەمیدی هەبوو، لە ڕێکەوتی ٢٠١٩/١٠/٢٠ بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

ئەنـدامانەی پارتیـدا هەبـوو کە لە لایەن حکـوومەتەوە فەرمـانی گرتنیـان بـۆ دەردەچوو.[95]

لەگەڵ سەلاح تەنها هاوپۆل نەبووین، بەڵکە هـاوگەڕەکیش بووین و بە خـانەوادە یەکتریمان دەناسی، ئێمە لە کۆلانی ماڵی شێخ عەبدولکەریم بووین، ئەوان لە کۆلانی شێخەسوورەی پشتی ماڵی ئەوان. ڕەنگبێ ئەم ئاڵوگۆڕەش هەر لەوەوە بووبێت کە هاوگەڕەکین و پێ دەچێت هەر لە لایەن خودی ئەسعەدیشەوە داڕێژرابێت.

بەڵام ئەم پەیوەنـدییە زۆر کورتخـایەن بـوو، هەر جارێک وە یـان دوو جـار کـۆ بووینەوە، ئیدی ئەسـعەد ئاگـاداری کـردمەوە، پەیونـدی ڕێکخـراوەییم لەگەڵ سـەلاح کۆتایی پێ بهێنم و جارێکی تر قسەوباسی سیاسی لەگەڵدا نەکەم.

ئەم ڕووداوە بـۆ مـن سـەیر بـوو، نەمـدەزانی مەسـەلە چییە! لەبەر نهێنیکـاریش نەدەبوو پرسیار بکەم، وەلێ ئەوەندە حاڵی بووم کە ئەو هـاوڕێیە بە هەر هۆیەکەوە بووبێت، پەیوەنـدی بە ڕێکخسـتنەوە نەمـاوە و لە ئێمە دوورکەوتـووەتەوە، وە یـان دەرکراوە. سەلاح لەو ماوە کورتەدا دوو کتێبی دایە لام، یەکێکیان کتێبێکی ئەسـتوور بوو، کۆمەڵە وتارێک بوو، لە نووسینی هۆشی مینە و ئەوەی دیکەیـان ژیاننـامە و بیۆگرافی هۆشـی مینە خـۆی بـوو. ئەم دوو کتێبە هەردووکیـان بە زمـانی عەرەبـی بـوون. کاتێـک کە ئەسـعەد ئاگـاداری کـردمەوە، لە سـەلاح دوور بـکەومەوە، ئیـدی دەسـتم بەسـەر کتێبەکانیشـیدا گـرت. کـاتێکیش کە داوای کـردەوە وتـم، کتێبەکـانم سـووتاندوون. ئەو دەمە بەو حیسـابە ئەو مـافەم بە خـۆم دا کتێبەکانی زەوت بـکەم، ئەو کەسـە پەیوەنـدی بە ڕێکخسـتنەوە نەمـاوە و ئـێمە بەردەوام ئەبـین و لە کـاری سیاسیماندا پێویستیمان پێیان دەبێت! وەلی لەڕاسـتیدا ئەوە ڕەفتـارێکی نـابەجێ بـوو، دەبوو کتێبەکانی بۆ بگێڕمەوە.

هەر لە هەمـان کاتـدا و هاوزەمـان ئەسـعەد باسـی ئەوەیشـی لەلام کـرد کە هاوڕێیەک دەدرێتە لام و پەیوەندی بە منەوە دەبێت. بۆ ئەو مەبەستە ناونیشـان و وشەی نهێنیی لە نامەیەکی چوکلێتی پێچراودا پێم دا. دوای ئەوەی نـامەکەم کـردەوە

---

٩٥. ململانـێ لەگەڵ ژیانـدا، عەبدولسـتار تـاهیر شـەریف، بەرگـی یەکەم، چـاپی دووەم، چاپخـانە: ئارابخـا، کەرکووک، ساڵی ٢٠٠٨، ل ٧٣.

و زانیارییەکانم خوێندنەوە، ناونیشانەکەم لەلا ڕۆشن بوو، گەڕەکی ئازادی بوو، هەر وا بەپێی ١٠ دەقیقەیەک لە ماڵی خۆمانەوە دوور بوو، بەڵام ئەو ناوە بۆ من ناسراو نەبوو، ئەویش حامید عەبدوڵا ڕەزا بوو. دوای ئەوەی لە کاتی دیاریکراودا چووم بۆ ماڵیان و لە یەکدی ئاشکرابووین، دەرکەوت کە پێشتر دووربەدووریش یەکتریمان نەبینیوە. ئەو ڕۆژگارە بە بیرەوەری من دەکاتە پایزی ساڵی ١٩٧٧.

حامید لە کۆشی خانەوادەیەکدا گەورە ببوو کە هەر بۆخۆی کۆڕ و کوانووی گەرمی سیاسەت بوو. عەبدوڵا عەسکەری باوکی هەر لە نێوەڕاستی ساڵانی پەنجاکانی سەدەی بووریدا لەنێو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا دەستی بە کاری سیاسی کردووە و لە دەستپێکی 'شۆڕشی ئەیلوول' و لە شەڕی دەربەندی بازیانەوە بەشداری کردووە. لە کەرتبوونی پارتیدا لایەنگری باڵی مەکتەبی سیاسی بووە و لە هێزەکانی ڕزگاری و کەرکووک و کاوە ئامرهێز بووە.

ئەم ئاڵوگۆڕە لە ڕێکخستن هەر وەکوو باسم کرد، بۆ من ڕۆشن نەبوو، بەڵام بێگومان ئەسعەد ئاگادار بووە، وەلێ لەلای من هیچی باس نەکرد.

ئەو دەمە و پێش ئەم وازهێنان و ئاڵوگۆڕانە سەلاح پەیوەندی بە حامید و حامید پەیوەندی بە ئازاد فەقێ عەبدوڵاوە هەبووە، بەڵام ئەو دوو هاوڕێیە واز دەهێنن و بێگومان کەسانی دیکەشیان لەگەڵدا بووە کە من لێی ئاگادار نیم.

وا پێ دەچێت، ئەم هاوڕێیانە لەژێر کاریگەری نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا وازیان لە ڕیزەکانی کۆمەڵە هێنابێت، چونکە نەجمەدین بەهۆی جیاوازیی فکرییەوە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٦دا وازی لە پێشمەرگایەتی و لە کۆمەڵە هێنا و گەڕایەوە نێوشار و لەنێو ئەڵقە و گرووپە کۆمۆنیستییەکانی کۆتایی ساڵانی هەفتاکان و دەیەی هەشتاکاندا ناوێکی دیار و ناسراو بوو.[٩٦]

دوای ماوەیەک ماڵی حامید بۆ گەڕەکی فلکە باریان کرد و بە هۆی ئەوەی ماڵی ئەوان لەو دەمەدا لە ماڵی ئێمە گونجاوتر بوو، زۆربەی کۆبوونەوەکانمان هەر لە ماڵی ئەواندا دەکرد.

---

٩٦. مێژوویەک لە یادەوەریدا، سالار ڕەشید، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٥، ل ١٣٩.

لەو دەمەدا یوسف حازم محەمەد (هۆشمەند) درایە لای حامید. یوسف وەکوو خۆی باسی دەکات، لە ڕێکەوتی ١٩٧٧/٤/٩ لە ڕێگەی ئەسعەد عەزیز سۆفییەوە پەیوەندی بە ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە کردووە و لە سەردەمی شالاوی گرتنەکانی کۆمیتەی ئاگر هەر پەیوەندی بە حامیدەوە هەبووە و بەرپرسی ئەم هاوڕێیانە بووە: حەسەن ئەبوبەکر (شاخەوان)، کامەران ئەسعەد (کە دواتر بووە پێشمەرگە و شەهید بوو)، عومەر فەرەج.

یوسف بەر شالاوی گرتنەکان ناکەوێت و پاش سالانێک دەچێتە دەرەوە و لە حوزەیرانی سالّی ١٩٨٧بەرپرسی ڕێکخستن و ڕابەری سیاسیی کۆمیتەی دهۆکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بووە، لەو دەمەدا ئازاد هەورامی بەرپرسی ئەو مەڵبەندە بووە.

حەسەن ئەبووبەکریش لە ڕێگەی ئەنوەر عومەر شەریفەوە پەیوەندی بە ڕێکخستنەوە دەکات و لە کاتی شالاوی گرتنەکان بۆ سەر کۆمیتەی ئاگر بەرپرسی دوو هاوڕێ دەبێت: ئەبووبەکر سەی عومەر و عەبدولوەهاب حازم محەمەد.

ئەنوەر عومەر شەریف (هۆشیار) ناسراو بە حاجی ئەنوەر لە سالّی ١٩٧٨ لە ڕێگەی ئەسعەد عەزیز سۆفیەوە پەیوەندی بە ڕێکخستنەوە دەکات و پاشان پەیوەندییەکەی دەگوازرێتەوە بۆ لای حامید عەبدوڵا ڕەزا و دواتریش بۆ لای بەهرۆز خالید. واتە: لە کاتی شالاوی گرتنەکان ئەنوەر پەیوەندی بە بەهرۆزەوە دەبێت و بەرپرسی سەلامی هەندەسە دەبێت.

عەبدولوەهاب حازم محەمەد کە برای یوسفە، لە ڕێگەی ئەسعەد عەزیز سۆفییەوە پەیوەندی بە ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە دەکات و لە شالاوی گرتنەکان بۆ سەر کۆمیتەی ئاگر لە ڕێکەوتی ١٩٨١/١٠/٢٢دەگیرێ و سەرەنجام گولەباران دەکرێت.

ئەوەی شایانی باسە، لەدوای شالاوی گرتنەکان، ئەنوەر عومەر شەریف، حەسەن ئەبووبەکر و ئەبووبەکری سەی عومەر لە ڕێکخستن واز دەهێنن.

پەیوەندیی حامید و من هەر بەو جۆرە مایەوە هەتا سەردەمی خوێندنمان لە زانکۆ. لە سالّی خوێندنی ١٩٧٩-١٩٨٠ بۆ ماوەیەک شانەکەمان کردە سێ کەسی

(ئەسعەد، حامید، سالار) و ئەسعەد بەرپرسی شانەکە بوو، وەلێ دواتر و ماوەیەک بەر لە شالاوی گرتنەکان جارێکی دی شانەکەمان کردەوە بە شانەی دوو کەسی و حامید پەیوەندی بە منەوە هەبوو و ئەو کۆمەڵە شانەیەش کە پێشتر باسم کرد، هەر حامید بەرپرسیان بوو.

ئەمە کلێشەی یەکێک بوو لەو هێلانەی هەتا دەمی شالاوی گرتنەکان من بەرپرسی بووم و جگە لە عەبدولوەهاب کەسی دیکەمان لێ نەگیرا، کە زۆربەی هەرە زۆریان نەک هەر لە لایەن ئەسعەد عەزیز سۆفییەوە ناسراو بوون، بەڵکە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هەر لە لایەن خودی خۆیەوە بۆ ڕیزەکانی ڕێکخستن ڕێک خرابوون و خۆڕاگری ئەسعەد و عەبدولوەهاب ئەمانەی گشت لە گرتن ڕزگار کرد.

هەر وەکوو دەرئەکەوێت، لە سەردەمی شالاوی گرتنەکان بۆ سەر کۆمیتەی ئاگر، لەو ڕۆژگارە سەخت و ترسناکەدا، حامید ڕۆڵی گەورەی لە گرتنەوە و پاراستنی ئەو خەتەدا هەبوو.

# گرتنی ڕەمەزان و پشکنینی ماڵی ئێمە

ڕەمەزان عەریف ئەحمەد ئامۆزای دایکمە، لە ساڵی ١٩٧٨ لە حەوشەی ئێمە بوو، ئەو هەر خۆی و هاوژینەکەی بوو، منداڵیان نەبوو.

ڕەمەزان لەپێش تێکچوونی دانوستانی نێوان پارتی و بەعس لە ساڵی ١٩٧٤ ئەندام و پێشمەرگەی حیزبی شیووعیی عێراقی/ قیادەی مەرکەزی بوو. چارەنووسی پێشمەرگەکانی ئەو حیزبە لەدوای شکست و هەرەسی ئەو بزووتنەوە چەکدارییە لە ساڵی ١٩٧٥، هەر وەکوو چارەنووسی پێشمەرگەکانی پارتی بوو. ڕەمەزانیش وەکوو ئەو دەیان هەزار پێشمەرگانە هاتەوە و خۆی ڕادەستی حکوومەتی بەعس کردەوە و دەستی بەکارەکەی خۆی، بە نانەوایی کردەوە. پاشان بەشێک لە حیزبی شیووعیی عێراقی (قیادەی مەرکەزی) خۆیان لەژێر نێوی وەحدەتول قاعیدە (وحدة القاعدة) سازدایەوە و بڵاوکراوەیەکیشیان هەر بەو ناوەوە دەرکرد و لە دەرەوەش مەفرەزەی چەکداریان دروست کردەوە، ڕەمەزانیش دیسانەوە پەیوەندی پێیانەوە کرد و ئەندامی ئەوان بوو.

ڕەمەزان و من متمانەمان بە یەکتری هەبوو، قسەوباسی سیاسیمان پێکەوە دەکرد، تەنانەت ئەو باسی پەیوەندیی خۆی بۆ من کردبوو و بڵاوکراوەکانی وەحدەتول قاعیدەیشی پێم ئەدا، بەڵام من باسی پەیوەندیی خۆمم بۆی نەکرد و هیچ بڵاوکراوەیەکی کۆمەڵەشم پێی نەدا و باسی ئەوانەم بەهیچ جۆرێک بە پێویست و بە ڕاست نەدەزانی.ئەم حیزبە لە شاری سلێمانی بە نیازی چالاکییەک بوون و پلانیان دانابوو کە دەست بەسەر قاسەی زیووتی نەباتیدا بگرن. بۆ ئەم مەبەستە مەفرەزەیەکیان ڕەوانەی شار کردبوو، بەڵام یەکێک لە پێشمەرگەکان بە ناوی "سەلاح"ەوە خۆی تەسلیم بە دەستگا ئەمنییەکان دەکاتەوە و ناوی هەشت کەس لە ئەندامانی نێو شاریش ئەدات، کە دووانیان لە سلێمانی و شەشیان لە کەرکووک دەبن. یەکێک لەو شەش کەسەی کەرکووکیش ڕەمەزانە. ئەم هەشت کەسە لە لایەن بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی سلێمانییەوە دەگیرێن و سەرەنجام دوو کەسیان بە نێوی کەنعان و جیهاد حوکم دەدرێن و باقییەکەی بە هۆی واسیتەی باوکی یەکێکیان

بەناوی "مامۆستا ساڵح"ەوە، ئازاد دەکرێن. مامۆستا ساڵح، مامۆستای ئامادەیی پیشەسازیی کەرکووک بوو و خۆیشی یەکێک لە گیراوەکان دەبێت و باوکی بەرپرسی کۆمەڵەی هەرەوەزیی کەلار ئەبێت.

ڕەمەزان لەماڵەوە نا، بەڵکوو لەو چوارڕێیانەی پشتی ماڵی ئێمە، واتە ئەو چوارڕێیانەی کە دەکەوتە نێوان بەیتەرێکە و دوو چاپخانەکەی یادگارەوە، دەمەو ئێوارەیەکی ڕێکەوتی ١٩٧٨/٨/٧ دەگیرێ. وا دیارە لەژێر چاوەدێری دەستگا ئەمنییەکاندا بووە. کاتێک کە ڕەمەزانیان گرتبوو، عەبدوڵا ساڵح دەلۆیی دراوسێمان چاوی پێوە ببوو، یەکسەر هات و ئێمەی لێ ئاگادار کردەوە و وتی، ئەمنەکان لەو پشتە ڕەمەزانیان گرت.ساڵانێک دواتر عەبدوڵا و سابیری برای، کە هەردووکیان لەیەک حەوش و خانوودا بوون و لەگەڵ ئێمە دیوارێکمان بەین بوو، لەگەڵ تاهیری برای ئەگیرێن و هەرسێکیان بێسەروشوێن دەکرێن.

من هەر ئەو کاتە ژمارەیەکی وەحدەتول قاعیدەی ڕەمەزانم لەلا بوو، لەبەینی کۆمەڵێک کتێبی ئاسایی لەنێو دەلاقەیەک دامنابوو، چووم ژوورەکەی ڕەمەزانیش گەڕام و ژمارەیەکی دیکەشم دۆزییەوە و هەردووکیانم سووتاند. دوای ئەوەی دنیا تەواو تاریک داهات، مەفرەزەیەکی ئەمن هەڵیانکوتایە سەر ماڵمان و دەستیان بە پشکنین کرد، نەک هەر ژوورەکەی ڕەمەزان، بەڵکوو ژوورەکانی ئێمە و ئەو دەلاقەیەش کە کتێبەکانی من و ئەو بڵاوکراوەیەی تێدا بوو. سەیری کتێبەکانیان گشت کرد و تەنها هەڵوێستە و پرسیاریان لەسەر یەکێکیان کرد، ئەویش کتێبێکی عەبدولوەهاب ئەلکەییالی بوو دەربارەی مێژووی فەلەستین، هیچ بەڵگەیەکیان دەست نەکەوت و ڕۆیشتن.

بەو جۆرە عەبدوڵا وەک فریشتەیەک فریامان کەوت، ئەگەر نا، منیش بە بڵاوکراوەیەکی ئەو حیزبەوە دەگیرام و حیسابی ئەندامی ئەوانم بۆ دەکرا و تووشی زیندان و ئەشکەنجە و گێرەوکێشەی گورگەکان دەهاتم و بەڵگەیەکیشیان لەسەر ڕەمەزان دەست دەکەوت.

ئەو بڵاوکراوەیە هەر وەکوو بەنێوەکەیشیدا دیارە، بە زبانی عەرەبی دەردەکرا و یەکێک لەو باسانەی کە هەر ئەو دەمە جێگای سەرنجی من بوو و هەتا هەنووکەش

هەر شەپۆلی کێشە و دەردەسەرییەکانی ڕۆژگار نەیتوانیوە لە بیرەوەری منیان بشۆرێتەوە، باسێک لەمەڕ توانای ئابووریی عێراق و بەرهەمی نەوت بوو کە تێیدا هاتبوو: هەموو تاکێکی عێراقی ئەگەر لە ماڵەوە دابنیشێ و هیچ نەکات، هەموو ڕۆژێک یەک دیناری عێراقی بەردەکەوێت!

واتە: خێزانێکی پێنج نەفەری هەموو ڕۆژێک پێنج دینار و لە مانگێکدا ١٥٠ دیناری پێ دەبڕا، کە لەو ڕۆژگارەدا ئەو بڕە پارەیە ئێجگار زۆر بوو!

ڕەمەزان لە زیندان بەربوو، بەڵام دوای دوو ساڵ و دوای ئەوەی ناوی هاتەوە بۆ سەربازی، بە هۆی مـحەمەدی برای و لە ڕێگەی مامۆستا حەمید کاکەییەوە هەوڵی ئەوەی دا بچێتە دەرەوە و ببێتە پێشمەرگە.

نەخشەی چوونە دەرەوەیان بەو جۆرە بوو، ڕەمەزان و چەند کەسێکی تر لەلایەن مامۆستا حەمیدەوە ئاگادار کرابوونەوە کە بۆ گوندی چاڵاوی ناوشوان بچن و لەو دەوروبەرە خۆیان مات بکەن، هەتاوەکوو مەفرەزەیەکی پێشمەرگە کە شەهید بێستوونیان لەگەڵدا دەبێت، دەگەنە لایان. بەڵام پاش چەند هەفتە لە چاوەڕوانی و خۆ پەنادان لەو هەڵەتە، هیچ کەسێک بۆ لایان نایات، ئەمیش بێزار دەبێت و بەناچاری بۆ نێوشار دەگەڕێتەوە و هەوڵەکەی بێ ئاکام دەبێت.

لەدوای ئەوە ڕەمەزان مەسەلەی چوونە دەرەوەکەی بۆ پێشمەرگایەتی لەگەڵ من باس کرد و داوای ئەوەی کرد، ئەگەر دەکرێ، بەڵکوو تەزکییەی بۆ پەیدا بکەم. منیش بابەتەکەم لەگەڵ ئەسعەد باس کرد و پاش ماوەیەک لە نامەیەکی چوکلێتی داخراودا تەزکییەکەی بۆم هێنا، منیش دامە ڕەمەزان. ئەو ڕۆژەیش کە کەرکووکی بەجێ هێشت، هەتاوەکوو جادەی نێوان تاسلووجە و سووورداش لەگەڵیدا چووم و پاشان ئەو خۆی بە تەنها و بەپێ بەرەو ناوچەی چەمی ڕەزان و گوندی عەودالان بەڕێ کەوت و پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد. پاشان لە هەرێمی دوو کە عەلی بچکۆل فەرماندەی بوو، بووە پێشمەرگە.

مامۆستا حەمید کاکەیی لە گوندی گوڵمکەوە و پاشان چاڵاو مامۆستا بوو، کادرێکی بەتوانا و چالاکی کۆمەڵە بوو لە شاری کەرکووک، لە ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن دەستگاکانی ئەمنەوە دەگیرێت و شوێنبزر دەکرێت.

# ژووره بچکۆلەکە

هەر وەکوو لە سەرەتاشدا باسم کرد، خانەوادەی ئێمە گەورە و قەرەباڵغ بوو، خانووەکەمان دوو بەش بوو، بەشێکی لە قایە و گەچ و بەشەکەی دیکەی لە قوڕ دروست کرابوو. کاتێک کە بوومە پۆلی شەشەمی ئامادەیی و خوێندنم زۆر بوو، ژوورێکیان پێم دا و ئۆتۆنۆمی خۆمم وەرگرت. دوای ئەوەی چوومە زانکۆ و لە زانکۆ فەسڵیش بووم و هەتا ئەو دەمەی هاوسەرگیریم کرد و ئەو ماڵەم بەجێ هێشت، ئەو ژووره هەر ماڵە بچکۆلەکەی من بوو.

ژوورەکەی من ژوورێکی بچکۆلە بوو، هەر پێشمان دەگوت، ژووره بچکۆلەکە. ئەم ژووره لە بەشە قوڕەکە و لە خانووه قوڕەکان بوو، دیوارەکانی بە خشت و قوڕ، بان و دارەڕاکەیشی بە دار و حەسیر چێ کرابوو. پەنجەرەیەکی بچووکی داری هەبوو، دەیڕوانییە سەر حەوشەی ماڵەکەمان و دەرگایەکی داری قەدیمیشی هەبوو، لەگەڵ پەنجەرەکە هەردووک هی ئەو عەیامە بوو، حەرەس قەومی لە خانووی جمهووری دەریانکردین و پاشان لەگەڵ زەوی تەختیان کرد.

ژووره بچکۆلەکە بۆ من زۆر پێویست بوو، گەلێک پێی دڵخۆش بووم، لە ئەمبەر و ئەوبەرەکەی دوو لاکێش و لەبان ئەویش دوو دۆشەکی ئیسفەنجم ڕاخستبوو، لەوسەری دۆشەکەکانیش دوو بالیفی کوردیم دانابوون. کتێبەکانیشم زۆر بووبوون، ئیدی لە تاق و دەلاقەدا جێگایان نەدەبوونەوە، بۆیە ماوەیەک دوای ئەو ئۆتۆنۆمییە، ژووره بچکۆلەکە پێویستی بە کتێبخانەیەکیش هەبوو.

دەوروبەری ساڵی ١٩٨٠ بوو، سەلمانی مام کەریم کە هاوڕێی لوقمانی برام بوو، هات بۆ ماڵمان و پێویستییەکانی دروستکردنی کتێبخانەیەکی هێنا و هەر لەنێو حەوشەکەدا و لەگەڵ لوقمان کتێبخانەیەکی ڕێکوپێکیان لە ئاسن بۆ دروست کردم. ئەو کتێبخانەیە ڕێک لایەکی ژوورەکەی داگیر کرد و بووە کتێبخانەیەکی کۆک و زیاتر لە ٨٠٠ کتێبی لەباوەش گرتبوو کە بۆ ئەو دەمە کەم نەبوو، گەلێک لە هاوڕێ و دۆستەکانیشم کەڵکیان لێ بینی.

دوو ساڵ دوای ئەوە بوو، سەلمان بەشداری لەو چالاکییەدا کرد کە بۆ سەر چاپخانەکەی ئەشرەف چاپچی ئەنجام درا، من لە باسەکانی دواتردا دەچمە سەر وردەکاری ئەو ڕووداوە.

جارجارە لە بنمیچی ژوورەکەوە خۆڵ ئەهاتە خوارەوە و کتێب و دۆشەک و ئەو ناوەی خۆڵاوی دەکرد، بۆیە بیرم لەوە کردەوە بنمیچێکی دیکەی لەخوار بنمیچەکەی خۆیەوە بۆ دروست بکەم. تەختە و مەعاکس و بزمارم بۆ کڕی و لەگەڵ حامیدی هاوڕێم دەستمان کرد بە دروستکردنی. من لە باسەکانی پێشوودا باسی حامیدم کردووە.

ئیدی جارێ هەر لە زەوی چەرچووبەیەکی توندوتۆڵمان بۆ دروست کرد و بەدووریی یەکسان دارمان لەمسەر بۆ ئەوسەری چەرچووبەکە داکوتی و پاشان بۆ بنمیچەکە بڵندمان کردەوە و بە بزمار قایممان کرد، پاشان مەعاکسەکانمان بۆی بڕی و بە بزمار بە چەرچووبەکەمانەوە چەسپ کرد.

بەڵام زۆری نەبرد ئەو نێوانە واتە، نێوانی بنمیچی ژوورەکە خۆی و ئەو بنمیچەی ئێمە دروستمان کرد، بووە نیشتمانی مشک و مەیدانی تەراتێنیان. گەلێک جاران لە کاتی کۆبوونەوە و گەرمەی قسەوباس و موناقەشەی ئێمە، گوڕیان لێ دەسەندەوە و بۆ ساتێک ناوبڕێکیان بە ئێمە دەکرد.

ئەو ڕۆژگارە ئەوەندە سامناک بوو، لەسەر وتنی شتێکی سادە ئەگیرایت و زیندانی و ئەشکەنجە ئەکرای، هەر بۆیە ئەیانگوت، دیواریش گوێی هەیە! واتە، ئەبێ زۆر مەقەیەت بیت! ئێ مشکیش بە کۆڵێک گوێ سووکییەوە، بەڵام هەر وەکوو کاتی خۆی چۆن زیانیان بە مارکس گەیاند و دەستنووسەکەیان کرۆشت و کرتاند، بۆ ئێمە وا نەبوون و زۆر بێوەی بوون!

فریدریک ئەنگلس لە پێشەکی کتێبی "لودڤیگ فۆیەرباخ و کۆتایی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی"دا دەڵێت: کارڵ مارکس لە پێشەکیی پەرتووکەکەی (دەربارەی ڕەخنە لە ئابووریی سیاسی)، چاپی بەرلین ١٨٥٩، باسی ئەوە ئەکات کە چۆن لە ساڵی ١٨٤٥ لە برۆکسل پێکەوە بڕیاری ئەوەمان دا "هەردوو پێکەوە تێڕوانینەکانمان" (یانی تێگەییشتنی ماتەریالیستیانە بۆ مێژوو کە بە شێوەیەکی

سەرەکی لە لایەن مارکسەوە دارێژران) بە پێچەوانەی تێڕوانینە ئایدیۆلۆژییەکانی فەلسەفەی ئەڵمانی دابڕێژین و لە ناوەڕۆکی کارەکەوە حیسابی خۆمان لەگەڵ ویژدانی فەلسەفیی پێشوومان یەکلا بکەینەوە. ئەم نیازەی ئێمە بە شێوەی ڕەخنەگرتن لەو فەلسەفەیەی کە لەپاش هیگڵ پەیدا بوو، بە ئەنجام گەییشت. زۆر دەمێک بوو دەستنووسەکە (کە پێک هاتبوو لە دوو بەرگی گەورە بە قەوارەی هەشتیەک) گەییشتبووە جێگای چاپ، یانی ڤێستفالین، کاتێک ئێمەیان ئاگادار کردەوە، بەهۆی گۆڕانی هەلومەرجەکەوە مەحاڵە پەرتووکەکە لە چاپ بدرێ. بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە بە مەبەستی سەرەکیمان (کە ڕۆشنکردنەوەی مەسەلەکان بوو بۆ خۆمان) گەییشتبووین، ئەوا بە خۆشحاڵییەوە دەستنووسەکەمان خستە بەردەم ڕەخنەی مشکە کرتێنەرەکان.[٩٧]

ئیدی ژوورە بچکۆلەکە و چواردیوارە قوڕەکەی بووە جێژوانی دەیان تێکۆشەر و سەدان کۆبوونەوە، بووە ئەو پەنا و پاسار و قوژبنەی کە تێیدا باسی ئازادی و یەکسانی و ژیانێکی نوێ و باشترمان بۆ کرێکاران و بەشمەینەتان دەکرد.

ژوورە بچکۆلەکە، بەو بچووکییەی خۆیەوە بە تایبەتی لەدوای ڕۆنانەوەی کۆمیتەی ئاگر، بووە مەکۆ و پایتەخت و گەورەترین بنکەی سووری کۆمەڵە لە شاری کەرکووک.

---

٩٧. لودڤیگ فۆیەرباخ و کۆتایی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی، ئەنگلس، وەرگێڕانی: سالار ڕەشید، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی.ن.ک.)، ساڵی ٢٠٠٥، ل ٥.

# من و دین

بەو شێوەیەی کە لە سەرەتادا باسم کرد، لای مەلا قورئانم خەتم کرد و کەوتمە سەر نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و نێو کەش و هەوای ئاینەوە. ئەوەندەی بکرایە و بۆم بلوایە، نوێژەکانم بە کۆمەڵ دەکردن، چونکە خێریان زۆرتر بوون. لە ڕاستیشدا بێ هۆ نییە، نوێژی بەکۆمەڵ خێری زۆرتریان بۆ داناوە، چونکە ئەوە هاندەرێکە تاوەکوو موسڵمانان بۆ پەرستگا بچن و لەوێ چاویان بەیەکدی بکەوێت و ئاگایان لە حاڵ و خەبەر و باسی یەکتری و ناوچەکەیان هەبێت و تەگبیر و ڕاوێژ بکەن.

سەبارەت بە ڕۆژووگرتنیش ئەوا هیچم لێ نەدەخوارد و تەواوی مانگەکەم دەگرت. دێتەوە یادم، جارێکیان ئەمویست بۆ گوڵمکەوە بۆماڵی باپیرم مەلا و نەنکم سەی فاتم بچم، لە مانگی ڕەمەزاندا بوو، بەڕۆژوو بووم و دنیا لەبەر گەرمای هاوین گڕی گرتبوو، لەگەڵ خاڵۆم مەلا کەماڵ هەتاوەکوو ناوچەی مەقانی نێوان کەرکووک و چەمچەماڵ بە ئۆتۆمبیل ڕۆیشتین، پاشان لەوێوە دابەزین و بەپێ کوتامان هەتاوەکوو گەیشتینە ناو ئاوایی. ئەو کاتەی گەیشتین، نزیکەی ١٠ دەقیقەیەکی مابوو مەلا بانگ بدات، ئەگەرچی لەو ڕێگایە و بەبەر قرچەی گەرماوە تینوێتی بەتەواوی تینی بۆم هێنابوو، دەمم تەواو وشک و پەڵت ببوو، تفم بۆ قووت نەدەچوو، بەڵام ڕۆژووەکەم نەشکاند و چاوەڕێم کرد هەتا حاجی کاکەڕەش دەنگی بانگی لێ بەرز کردەوە.

من لە مەکتەب ئەگەر لە تەلەبە یەکەمەکانیش نەبووبێتم، ئەوە لە زیرەک و دیارەکان بووم، بەڵام ئەوەی خۆش بوو، بۆ ئەوەی پلەی باش لە وانەکاندا بهێنمەوە، نەزرم ئەکرد و ئەمگوت، ئەگەر لە فڵانە دەرس پلەی ٩٠ بهێنمەوە، دوو ڕکات نوێژی سوننەت ئەکەم! یانی، شەرت و شرووتم بۆ خودا دائەنا! وەلی من هەر بۆ خۆم بەتەبیعەت بە نوێژی فەرزەوە نەدەوەستام و گەلێک جاران لەدوای نوێژی فەرز، نوێژی سوننەتیشم دەکرد و لە مانگی ڕەمەزانیش لەدوای نوێژی عیشاوە نوێژی تەراویحشم دەکرد.

نوێژی تەراویح چونکە زۆر بوو، ئەبوو پەلەپەلی تێدا بکەیت، گەرموگوڕی و کەشێکی بەکۆمەڵی ڕۆحی خۆشی دەخوڵقاند.

لە یەکەمین ڕۆژەکانی هەردوو جەژنی ڕەمەزان و قوربانیشدا، دەمەو بەیان بەر لەوەی دنیا ڕووناک ببێتەوە و هەتاو تیشکی خۆی بهاوێت، بەرەو خانەی خودا، مزگەوت دەڕۆییشتم و دەچووومە سەرەوە بۆ سەر ئەو سەکۆیەی کە بەرامبەر بە مینبەری مامۆستای وتارخوێن بوو، لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە ئەڵقەیەکمان پێک دەهێنا و لەپشت مایکرۆفۆنەکەوە بە ئاوازێکی خۆشەوە دەستمان بە خوێندنی:

"ئەڵاهو ئەکبەر ... ئەڵاهو ئەکبەر ئەڵاهو ئەکبەر ... وەلیلاهیل حەمد" دەکرد. بەم سەدا و ئاوازە ئیدی هەموو دڵنیا دەبوون کە جەژنە و ئەوە ئیعلانی جەژنە. زۆریش حەزم دەکرد بانگ بدەم و خەیاڵم پێوە دەکرد، بەڵام چاوەڕێ بووم دەنگم گڕتر بێت. ئەو مزگەوتە، واتە مزگەوتەکەی مەلا جەبار، مەلا سدیقە شەل پێشنوێژ و وتارخوێنی بوو. مەلا سدیق تەمەنی سەری کردبوو، بەڵام هێشتا هاوسەرگیری نەکردبوو، دوایی داوای بێوەژنێکی گەڕەکی خۆمانیان بۆ کرد و لەم نێوانەدا قسە هات و قسە چوو، باس لەوە دەکرا هاوکوفی یەکدین، وە یان نا ... ئەوان شەلیی مامۆستایان وەک عەیبە دەرخستبوو، مامۆستاش لەبەرامبەردا عەیبی ژنەی بەوە دەرخستبوو کە ئەو بێوەژنە و ئەم بوخچەی نەکراوەیە! من بزانم، وشەی هاوکوف لە "کەف"ی تەرازووەوە هاتووە، کە بەمانای "لەپ" و بۆ تەرازوو بە مانای تای تەرازوو دێت و پێکەوە بە مانای "هاوتا" دێت. کەواتە ئەگەر ژن و مێردێک پلە و پایەیان وەک یەکدی بن، ئەوا دەڵێن: هاوکوفی یەکن و ئەگەر وەک یەکدی نەبن، ئەوا دەڵێن: هاوکوفی یەک نین.

لەو دەمەدا کۆمەڵێک گەنج هەبوون، هەندێکیان دەورەی فەقێیەتییان بینیبوو و دواتر لە کۆلێجی شەریعە دەیانخوێند، ئەمانە هاتوچۆی مزگەوتیان دەکرد و زۆر جار بانگیان ئەدا و دەنگخۆش بوون، لەوانە، مەلا ئەحمەدە سوور، مەلا عوسمان، هەروەها مەلا نیهاد و ئیبراهیم سەی محێدین (بلەی بەدیع)یش دەنگیان زۆر خۆش بوو.

"مەلا شوکر"یش هەر خوێندکاری کۆلێجی شەریعە بوو، هاتوچۆی ئەو مزگەوتەی دەکرد و تێکەڵاوی لەگەڵ هونەر و نواندنیشدا هەبوو، لە تەمسیلی

"مەرەزە"دا ڕۆڵی مام باپیری دەگێڕا، نایەتەوە بیرم ئەو بانگی دابێت، لەڕاستیشدا دەنگی بۆ قسەکردنیش کەرخ و نەساز بوو.

مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا عەلییە شەل ماڵیان ڕێک لە بەرامبەر ماڵی ئێمە بوو، محەمەد (خەسرەو)ی براگەورەی ئەگەرچی دەوروبەری دەساڵێک لە من گەورەتر بوو، بەڵام جۆرێک لە هاوڕێیەتیمان لەگەڵ یەکدا هەبوو. محەمەد دارتاش بوو، دوکانەکەی هەر لە کۆڵانی مزگەوتەکەدا بوو، گەلێک جار من ئەچووم بۆ دوکانەکەی و قسەوباسمان ئەکرد. ئەو کتێبی ئەخوێندەوە و کەسێکی وریا و زیرەک و دوور لە دین بوو، هەرگیز سەری بە فەرزی خودا نە ئەدا و سەری بە ماڵی خودادا نەدەکرد. دێتەوە بیرم کتێبی "بیرەوەرییەکانی گیڤارا"م لێی وەرگرت و خوێندمەوە کە بە زمانی عەرەبی بوو. ئەو لە سوپا لە بەشی چاندن و هەڵگرتنەوەی مین بوو، شارەزایی لە زۆر بابەتی سەربازی هەبوو، ئەو خولانەی کە بینیبووی گشت لە دەفتەرێکی گەورەدا نووسیبوونییەوە، من لێم وەرئەگرت و ئەمخوێندەوە و پرسیارم لەبارەیانەوە لێ ئەکرد. پێم وابوو، ئەگەر بچێتە دەرەوە و ببێتە پێشمەرگە، کەڵکی زۆری لێ وەردەگرن، بۆیە هانم ئەدا و هەوڵم لەگەڵ ئەدا کە بۆ پێشمەرگایەتی بچێت، بەڵام هەر وەکوو کورد دەڵێت: ئەوەی لای عەبد خەیاڵە، لای خوا بەتاڵە. جارێکیان بۆ ئەوەی ئیتر ئەو بابەتەی لەگەڵدا نەکەمەوە، وتی، دەباشە با هەردووکمان پێکەوە بچین ... خۆ ناشکرێ من پێی بڵێم، کاکە ئاکامی منیش هەر پێشمەرگایەتییە، وەلێ هەنووکە من خەریکی کاری نهێنی و حیزبیم و بۆ منیش ڕۆژی خۆی دێت، بە هەر حاڵ قسەمی بڕی و خاڵی لەدوای ڕستە دانا.

حاجی کۆسە و مام عەبدوڵا هیچ خانە و لانەیەکیان نەبوو، نەک هەر ئەوەندە، هەر کەسیشیان نەبوو، دەتگوت ئەمانە لە کونە دیوارەوە هاتوونەتە دەرەوە، ئەم دووانە لەژێر پێپلیکانەی مزگەوتەکەدا دەژیان، ئەو ژێرەیان وەک برا کردبووە دوو بەشەوە و هەر یەکەی لە بەشێکیدا بوو. حاجی کۆسە زل و زەخم بوو، ژوورەکەشی دەتگوت کونە سەگە، کە دەچووە ژوورەوە، دەبوو خۆی بنووشتێنێتەوە، جارجاریش کە دەمار ئەیگرت، زرمەی ئەهات. مام عەبدوڵا پیر و بەتەمەن بوو، نابینا بوو، خەڵکی دەستیان دەگرت و بەدەنگییەوە دەچوون، من

گەلێک جار دەستم دەگرت و کۆمەکم دەکرد، ئەو دوعای خێری زۆر بۆ ئەکردم و خەڵکیش پێیان ئەگوتم، دەک ڕەحمەت لەو دایک و باوکە، بەخوا منداڵێکی ساڵحە! بەڵام قوتوویەکی هەبوو بەڵغەمی تێ دەکرد، گەلێک پیس بوو، هەتا ئێستاش کە بیرم دەکەوێتەوە، دڵم لێی تێک هەڵدێ و خەریکە هێڵنج بدەم!

ساڵانە جارێک دوو جار فەرش و ڕایەخی ماڵی خودامان پاک دەکردنەوە، دەرمان دەکردنە دەرەوە و دەمانتەکاندن و دەماندانە بەر خۆر و هێندێک جاریش دەمانشۆردن. هەموو ساڵێک جارێکیش حەوزی مزگەوتمان پاک دەکردەوە. ئەو مزگەوتە حەوزێکی گەورەی بازنەیی هەبوو، بە چواردەوریدا و بە چیمەنتۆ سەکۆی بچکۆلەی بۆ دانیشتن و دەستنوێژ بۆ دروست کرابوو، لەبەرامبەر هەر سەکۆیەکیشدا بۆڕییەکیان لە حەوزەکە کوناودیو کردبوو، بەلووعەیەکیان پێوە بەستبوو. ئەم حەوزە سەربەتاک بوو، دەبوو ساڵانە کەڕەتێک خاوێن بکرێتەوە، چونکە چواردەوری دیوی ناوەوەی دەبووە قەوزە و خۆڵ و تۆز و پووش و پەڵاشیشی زۆر تێ دەکەوت.

من هەموو ڕۆژێک بۆ نوێژی بەیانیان هەڵدەستام، ئەگەر ڕۆژێک بەخەبەر نەهاتبایەم، لە دایک و باوکم تووڕە دەبووم، بۆچی هەڵیان نەستاندووم، جاری واش هەبوو لەبەرامبەردا باوکم تووڕە دەبوو، دەیگوت، سۆفییە ... سۆفی! باوکم ئەگەرچی حاجی بوو، بەڵام دینی هەر وەک کلتوور گرتبوو، وا دیار بوو من لەو تۆختر بم! بەڵام ئەو دەمە وەک هەنووکە دین دەگەڵ سیاسەت تێکەڵ نەبوو، نە حیزب و کۆمەڵەی دینی، نە ڕەوتی سەلەفی و وەهابی، نە شەرواڵی کورت و سمێڵی قوت و ڕیشی درێژ لە ئارادا بوون. دوای ئەوەی دوو ڕکات نوێژی بەیانیم دەکرد، چەند لاپەڕەیەک لە قورئانیشم دەور دەکردەوە و لە ماوەی حەوت ساڵی عیبادەتدا پێنج جاران قورئانم خەتم کرد و بۆ باپیرم و مردووانم دەکردە هەدییە.

ڕۆژێکیان ئەمانەم بۆ هاوڕێیەک (نیان نووری) لە سویسرا گێڕایەوە، وتی: وەڵا کاک سالار بەس نییە ئێستا وا نەماویت، ئەگینا خۆت ئەتەقاندەوە!

هاوشانی ئەمانە، خەریکی خوێندنەوەی پەرتووکە ئایینییەکانی وەک تەفسیری خاڵ و ئەوانەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و ئەوانی دیکە بووم. جارێکیشیان

لەگەڵ خاڵۆم مەلا کەماڵ بۆ دیدەنی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بۆ مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە بەغدا چووین، ئەو دەمە من پۆلی سێیەمی ناوەندی بووم. ڕەنگبێ هەر ئەو سەفەرەش بووبێت، پێکەوە بۆ دەستگای ڕۆشنبیری کوردی چووین، کە هەر لە بەغدا و لە مەیدانی خەللانی بوو. لەو دەستگایە گۆڤاری بەیان و ڕۆشنبیری نوێ دەرئەکران.

مـن لەو دەم و دەورانەدا بەردەوام خەریکـی خوێنـدنەوەی ڕۆژنـامە، گۆڤـار، نامیلکە و کتێب و بـابەتی شیعر، چیرۆک، ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، مێژوو، ئایین، بابەتی گشتی و هەمە جۆر بووم. هەتا گەیشتمە پۆلی چوارەمی ئامادەیی لە سانەویی ئیمام قاسم. هەر وەکوو پێشتریش باسم کرد، ئیدی لێرەوە دەرگـای خوێنـدنەوەی فکـری مارکسـیم لـێ کـرایەوە و کەوتـمە نێـو خوێنـدنەوەی بـابەتە فەلسـەفی، ئـابووری و سیاسـییەکانەوە. هەتـاوەکوو ئێـرە گشـت ئەو بابەتـانەی دەمخوێنـدنەوە، ئەدەب، مێـژوو و ئـایین دانوویـان پـێکەوە دەکـوڵان و دەنێـو مەنجەڵێکدا پێکەوە کێشـەیەکیان نەبـوو. وەلـی لێرە بەدواوە کـار هەر وا بەسـانایی نەدەچـووە پـێش، بـابەتە سیاسـی و ئابوورییەکـانیش بە هەر حـاڵ، بەڵام بـابەتە فەلسەفییەکان خەتی خۆیان دەکێشا و سنووربەندییان دەکرد.

لە کتێبخانەی ئاسۆ کتێبێکم بە نێوی "موجز مبسط فی الفلسفة الماركسية" کڕی، لە نووسینی نووسەری ڕووسی "ئەڤاناسیڤ" بوو. لە وەرگێڕانی "عەزیز سیباهی" و لە بڵاوکراوەکانی "نور" بـوو. کتێبێکی مامناوەندیی ئەستووری پەڕە بۆر بـوو. ئەم کتێبە هەر وەکوو بە نێوەکەیدا دیارە، بـابەتێکی فەلسـەفی بـوو، باسـی ماتەریـالیزمی دیالەکتیک و مێژوویی دەکرد. هەر کە گەیشتمەوە ماڵ کەوتمە سـەری و دەسـتم بە خوێندنەوەی کرد، لە ڕاستیشدا ئیشـتیام بـۆ گشـت بـابەتێکی مارکسـی ئێجگـار زۆر بـوو. هەسـتم دەکـرد، بابەتەکـانی نێـو ئەم کتێـبە تەنـانەت لە بـابەتە مارکسـییەکانی دیکەش جودایە، ئەو پرسانەی ئەم لێرەدا دەیوروووژێنێ، بـۆ مـن تەواو تـازە، نایـاب، نـاوازە و دانسـقە بـوون و دەسـتگای فکریـی منیـان بە تەواوی هەڵتەکانـد و داری بەسەر بەردییەوە نەهێشت. لەڕاستیدا دەستگای فکریـی مـن وەک دەستگای فکریی عامێ، خۆڕسک و نازانستی و کۆم و لار بوو، ئەگەر من سەد ساڵی دیش مژوولی

شیعر و ئەدەب بوومایە، مێشێک میوانی نەبوو، شتگەل هەر لەجێی خۆیان دەمان و هیچ جێگۆڕکێیەکیان پێ نەدەکران. پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوە بکەم کە مەسەلەکە ئەوەندەی بە بابەتەکەوە پەیوەست بوو، هێندە بە نووسەرەکەیەوە پەیوەست نەبوو، چونکە ئەگەر وا ڕێک بکەوتبا، لە سەرەتادا کتێبی "لودڤیگ فۆیەرباخ و کۆتایی فەلسەفەی ئەڵمانی"ی فریدریک ئەنگڵس یان "مبادیء أولیة فی الفلسفة المارکسیة"ی جۆرج پۆلیتزەرم بخوێندبایەتەوە، ئەوا دیسانەوە دەستگای تێڕوانینی خۆڕسکانەی منی دادەڕماند و هاڕەی پێ دەکرد.

بەڵێ! مادە پێش فکر، یان فکر پێش مادە کەوتووە؟ ماتەریالیست کێیە و ئایدیالیست کێیە؟ دیاردەکانی سرووشت و کۆمەڵی مرۆیی جێگیر و نەبزووت و لێک دابڕاون، یان بزووت و بەیەکدی بەند و پەیوەستن؟ ڕێکەوت و زەروورەت چین؟

بوونەوەرێک بە نێوی خوداوە هەیە؟ ئەگەر بەڵێ، خودا چییە؟ چۆن پەیدا بووە؟ پێکهاتەکەی چییە؟ لە کوێیە؟ ئەویش سەرەتا و کۆتایی هەیە؟ یان نەخێر، ئەزەلی و ئەبەدییە؟ دەی ئەگەر وایە، چۆن دەیسەلمێنی خودا لە فلانە جێگایە، لە فلانە شت پێک هاتووە، ئەزەلی و ئەبەدییە؟ ئەی ئەگەر شتێک بە نێوی خوداوە نەبێ، ئەم بوونەوەرە بە گشت پێکهاتەکانییەوە، بە زەوی، مانگ، ئەستێرە، ڕۆژ و هەسارەکان و مرۆڤ و باقی زیندەوەرەکانی دیکەوە چۆن دروست کران و کێ دروستی کردوون؟ چۆن دەچنە ڕێوە و چۆن دەچەرخێن؟ ئەی ئەگەر ئەڵێن، ئەو شتانە هەموو خودا دروستی کردوون، دەنا چۆن بەبێ دروستکراو دەبن، ئەی خودا بۆخۆی کێ دروستی کردووە و چۆن بەبێ دروستکراو دەبێ؟ ئایا نابێت، پرسیاری ئەوە بکەین کە خودا چۆن دروست بووە؟ نابێت لەو پرسە زۆر بکۆڵینەوە و زۆر پرسیار بکەین، چونکە گوناهە و تووشی گوناه دەبین؟ یان نەخێر ئەوە فرتوفێڵە و بۆ کڵۆمکردنی مێشک و هزرمانە؟ ئایا هزر و بیرمان ڕەها کەین و هەر پرسیارێک دەکەین بیکەین و چوارچێوە و سنووریان بۆ نەکێشین و لە هیچ پرسیارێک خۆ نەبوێرین و هیچ شتێک لە هەمبەر بیرکردنەوە، هزر و بیر، بە پیرۆز و موقەدەس نەزانین، وە یان نەخێر دەبێ پرسیارەکانمان چوارچێوە و سنوور نەبەزێنن؟

لێرەدا وای بە باش دەزانم پرسیارەکانم بوەستێنم و درێژە بە باسی پاشی ئەم بوومەلەرزە و ڕاچڵەکینە بدەم.

ئێ ... بەو جۆرەی کە بینیتان، شتەکان گشت لێک ترازان و هیچیان لە شوێن خۆیاندا نەمان، ئەوەی هەتا دوێکە جێگەی باس و خواس نەبوو، ئەمڕۆکە کەوتووەتە ژێر پرسیاری دادگای ئاوەز و لۆژیکەوە و باز بەسەر هیچ پرسیارێکدا نادات و هیچ تێپەڕ ناکات.

کاتێک کە هێشتا مێرمنداڵ بووم، باوکم لەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵی شێخ عەزەدینی کانیچنار بردمی و داوای لە شێخ کرد، نووشتەیەکم بۆ بکات، ئەویش نووشتەیەکی بۆم کرد و لە شێوەی سێگۆشەیەک قەدیان کرد و خستیانە نێو پەڕۆیەکی سەوز و دووریيانەوە و سنجاقێکیان لە گۆشەیەکی هەڵکێشا و لە بن باڵی چەپم و بە فانیلە سپییەکەمەوە بەندیان کرد. هەموو جارێک کە خۆم دەشۆری، نووشتەکەم لە فانیلەکەم دەکردەوە و لەسەر سەکۆی گەرماوەکەم دادەنا و پاش ئەوەی لە خۆشۆردن دەبوومەوە، بە فانیلە پاکەکەم بەند دەکردەوە.

باوکم و باپیرم ڕەشید و مامەکانم گشت دەروێشی شێخ عەزەدین بوون، نازانم ئایا ئەم شێخەش بەزمی زیکری هەبوو یان نا، وەلێ باوک و باپیر و مامەکانم دەروێشی زیکر نەبوون و جەژناوجەژن سەردانی مامە شێخیان دەکرد و باوکم زۆر جار منیشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. شێخ عەزەدین بە ڕەچەڵەک خەڵکی گوندی کانیچار بوو، ئەو گوندە کەوتبووە لاپاڵی دەستەڕاستی دەربەندی بازیان ئەگەر لە چەمچەماڵەوە بە ئاراستەی سلێمانی بڕۆیتایە.

هەرچی باوکمە، بە ڕەچەڵەک خەڵکی گوندی کانیسپیلکەیە. ئەو گوندە کەوتبووە سەر ئەو ڕێگایەی کە لە پێش ئەو دەربەندە بە دەستی چەپ بەرەو ئاغجەلەر دەچێت. واتە، خەڵکی یەک دەڤەرن و ڕەنگە ناسیاوی و تێکەڵاوییان بۆ دەورانێکی کۆن هەڵبگەڕێتەوە و هەر ئەوەش هۆکاری ئەو هاموشۆ و شێخ و دەروێشییە بێت.

ئەو نووشتەیە بەو جۆرە چەندین ساڵ لە بن باڵی چەپمدا بوو، چونکە گوایە دوو جۆرە فریشتە هەن، فریشتەی خێر لەسەر شانی ڕاست و فریشتەی شەڕ

لەسەر شانی چەپ خەریکی نووسینەوەی چاکە و خراپەن، جا ئەو نووشتەیە بۆ پاراستنی من و بەرگرتن بە خراپە و شەیتان و خراپەکاران بوو.

هەر وەکوو گوتم، شتەکان هیچیان لە شوێن خۆیاندا نەمان و هەموو شتێکیش کەوتە ژێر پرسیارەوە. ئەم نووشتەیەش، هاوڕێی پەنهانیم، لەو نێوەدا قوتاری نەبوو. دوای ساڵانێکی زۆر نووشتەکەم کردەوە و خوێندمەوە، دەبینم ئەم ئایەتانەی تێدا نووسراوە: "وان یکاد اللذین کفروا لیذلقونک بأبصارهم ...". ئەوسا تێگەییشتم، باوکم نووشتەی چی بۆم کردووە، چونکە دەمزانی ئەو ڕەچەتەیە و ئەو ئایەتانە بۆ چاوەزارن و بۆ پاراستنی مرۆڤە لە چاوی پیس. کاتی خۆی لە سەر کارتۆنێک ئەو ئایەتانە چاپ کرابوون و لە جام و چوارچێوە خرابوون و لە بازاڕ دەفرۆشران. کەم ماڵ هەبوو، ئەو تابلۆیەی نەبووبێت و لە ماڵەوە هەڵی نەواسیبێ، ئێمەش دانەیەکمان لەوە بە دیواری ماڵەوەدا هەڵواسیبوو.

بەڵێ! تێگەییشتم، باوکم لەبەر خۆشەویستی، دەیویست لە چاوی پیس بمپارێزێ و تیری چاوی بەدکارانم لێ بگێڕێتەوە! دوای خوێندنەوەی نووشتەکە، فڕێم دا و ئیدی یەکدیمان نەبینییەوە. وازم لە قورئانخوێندن هێنا و جاروبار هەر لەبەر باوکم و لەبەرچاوی ئەو بەرماڵم ڕادەخست و دوای ئەوەی ئەو لەو جێگەیە گوم دەبوو، بەرماڵم هەڵدەگرتەوە. بۆ ئیسپات وجودیش جاروبار بۆ مزگەوت ئەچووم و لە تەنیشت باوەگەورەمەوە نوێژم دائەبەست. ئاخر بۆ من هەروا سانا نەبوو، ماوەیەک لەسەر بەرماڵی ماڵ و مودەتێک لەسەر بەردەنوێژی مزگەوت و لەنێو سەفی نوێژی بە کۆمەڵ و گوێقولاخ بۆ مەلای میحراب نەبینرێم! بەڵێ! چونکم چاوی باوک و دایک و باپیرم و خەڵکی گەڕەک هەر وا ڕاهاتبوون و دەقیان گرتبوو. وەلێ خۆ ئەمە هەر واش ناچێتە سەر، ڕۆژێک و دووان، هەفتەیەک و دووان ... خۆ دەبێت خاڵێک دابنێم و واز لە بانگی نێو کوولەگە بهێنم. لە ڕاستیشدا ئەوە هەر خاڵی پاش ڕستە نەبوو، بەڵکە بەجێ هێشتنی پەرەگراف و هەڵدانەوەی لاپەڕێکی تەواو نوێ بوو.

پاش ماوەیەک باوکم هەستی بەوە کرد، لە نوێژ و تاعات و مزگەوت دوور کەوتوومەتەوە. ڕۆژێکیان پرسیاری کرد و وتی: کوڕم ئەوە ئێستا نابینم نوێژ

بکەیت و نایەیتە مزگەوت؟ منیش پێم خۆش نەبوو لەگەڵ حاجی باوکم بکەومە جددییاتەوە، بۆیە هەر بە شۆخی و بە بزەوە وەڵامیم دایەوە و گوتم: باوە! خۆت ئەزانی من ئەوە حەوت ساڵە نوێژ و تاعات ئەکەم و زۆربەی نوێژەکانیشم هەر بە جەماعەت کردووە، ئێ ... بۆ نوێژی جەماعەتیش دوو ڕیوایەت هەیە، یەکێکیان دەڵێت، هەر نوێژێکی جەماعەت ٢٥ دەرەجە و ڕیوایەتەکەی دیکە دەڵێت، ٢٧ دەرەجە خێری هەیە، جا دەوەرە زەرب و جەمعی بکە، بزانە چەند ئەکات و بزانە هەتاوەکوو ئاخیری عومرم بەشم ئەکات یان نا؟! باوکم کە گوێی لەم قسانە بوو، زۆر تووڕە بوو، وتی: های فەرمەسۆنە، فەرمەسۆن!

باوکم کابرایەکی نەخوێندەوار بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە ماتماتیک زۆر زیرەک بوو، بە زمانی عەرەبی و تورکمانیش قسەی دەکرد، بەڵام لە هەر جێیەک وشەیەکی لێ گیر بووایە، لەگەڵ کوردی تێهەڵکێشی دەکرد و دانەئەما. ئێجگار سادە و خاکی بوو، ئەگەرچی حاجی بوو، بەڵام ئایینی هەر وەکوو کلتوور گرتبوو. وەکوو دایکم نەبوو جیاوازی لە نێوان منداڵەکانیدا بکات، کوڕ و کچ، گەورە و بچووک بۆ ئەو هەر یەک بوون، هەر لە منداڵییەوە کەوتبووە نێو ئیشوکارەوە و بە کار و ڕەنجی خۆی و بە ڕەنج و ماندووبوونی دایکمەوە، ئیمکانێکی باشی پێکەوە نابوو. بەو هۆیەوە ئێمە ڕۆژێک نەبوونی و دەستەنگیمان بە خۆوە نەبینی. باوکم ئەگەرچی بڕوای بە سیاسەت و حیزبایەتی و خەبات و شتی لەو قەبیلە نەبوو و بەهۆی ئەزموونی زیندەگیی خۆیەوە، وەکوو عامی خەڵک دەیگوت، هیچ بەهیچ ناکەن و هەمووی هەر بۆ گیرفانی خۆیەتی و ئەوەی لە ژیاندا فریات بکەوێت، هەر کار و کەسابەت و گیرفانی خۆتە، وەلێ لەمپەری لەسەر کاری سیاسیی من دانەدەنا و ئاستەنگی بۆم نەدەهێنایە پێش و گەلێک جارانیش گاڵتە و بەزمی لەگەڵ هاوڕێکانم دەکرد. جارێکیان دکتۆر خالید (سەمیر نووری) لە ماڵمان بوو، لە کاتی هەستان و خوداحافیزیدا تووشی باوکم بووین، دەستمان کردە قسەکردن و باوکم ڕووی لە من کرد و وتی، ئەم هاوڕێیەت چی دەخوێنێ و دەبێتە چی؟ منیش وتم، باوە ئەوە دەبێتە دکتۆر. هەندێک دیقەتی دەستوپەنجە و لەپەکانی دا، پاشان وتی: دکتۆری چی، ئەوە دەستی ئەڵێی کوتەکە!

جارێکیـان عەزەدیـن مەجیـد (جەمـال ئەیـووب) لە ماڵمـان بـوو، چـونکە باسـی زۆرخۆری عەزەدینمـان بۆ بـاوکم زۆر کردبوو، بـاوکم ڕووی لە عەزەدین کرد و وتی، وەرە با لەسەر خواردن گرەوێک بکەین، بزانین کاممان زۆرتر ئەخۆین، ئەگەر هەر کەسێک دۆڕاندی، ئەوا دەبێت ئەو گیسکەی سەری دەبڕین لە کیسەی ئەو بێت. منیش کردمە گاڵتە و وتم، باوە نەکەی! وتی بۆ؟ وتم: ئێ ئەو پێش ئەوەی دەست بە خواردن بکات، ١٠ نان هەر بە وشکی ئەخوات! وتـی: هەی! بۆچییە، مانگای بازیانە، مانگای بازیان! (لەگەڵ حورمەتم بۆ کاک عەزەدین) جارێکیان چووم بۆ مـاڵی خالید بۆ کۆبوونەوە، هێشتا سەرەتای هاتوچۆی من بوو بۆ ماڵیان، باوکی خالیدم بینی و چاکوچۆنیمـان کـرد. دوای مـن، دوای ئەوەی ئەوێ بەجـێ دەهـێڵم، بـاوکی بە خالیـد ئەڵێ: ئەم هاوڕێیەی تۆ هەر بە دز ئەکات!

ئەگەرچـی ئەسـعەد لە کـۆمەڵەی مارکسـی لێنینـی ڕێکـخەر و سەرشـانەم بـوو، بەڵام هێشتا ئەو شتە فکرییەکانی هەر لەجێی خۆیاندا بوون و نوێژ و تەعاتی خۆی هەر دەکرد و لەگەڵ منیشدا سووکە بەرامبەرکێیەکی کرد، پاشـان بۆ خۆیشـی هـاتە سەر خەت و بە دوومدا هات و ئەویش خاڵێکی دانا.

کۆمەڵە ئەگەرچی بە حیسـاب ڕێکخراوێکی مارکسـی لێنینی و کۆمۆنیسـتی بـوو، وەلی هیچ باس و بابەتێکی لەسەر ئایین نەبوو، وە لە بەرنامەکەیـدا تێڕوانینی خۆی لەو ڕووەوە دیـاری نەکردبوو، لە ئۆرگـان و بڵاڤۆکەکانیـدا گوتـارێکی لەو چەشـنەی نەبوو، لە کۆبوونەوەکانیدا قسەوباسی لەو بابەتانەی نەبـوو. گەلێـک جـارانیش لەنێو خەڵکیدا ڕا و بڕوای خۆیـان لەسـەر ئـایین دەشـاردەوە، یـان ڕاشـکاوانە قسـەیان لە بـارەوە نەدەکرد و بەشـێک لە ئەنـدام و کـادر و سـەرکردەکانیشـی شوناسـی ئـایینیی وەکوو شێخ و مەلا و شـتی لەو قەبیلەیـان بۆخۆیـان هەڵدەبژارد، وەکـوو شـێخ دارا، مەلا بەختیـار، مەلا ئەحـمەد ... گەلێـک جـارانیش کە دەچـوونە گونـدەکان، دەچـوونە ڕیزی نوێژکەران و لەپشت مەلای دێوە نوێژیـان دادەبەست و خۆیـان وەک بڕوادار نیشـان دەدا. لەڕاسـتیدا کەمـیش نەبـوون ئەوانەی کە کـۆمەڵە بـوون و بـڕواداریش بوون، وەلێ لە ڕێکخراوێکی مارکسی و کۆمۆنیسـتیدا بڕوابـوون بە ئـایین، نـاکۆک و نادروستە. هەروەهـا بڕوانەبوون بە ئـایین و خۆنوانـدن وەک ئایینـدار و بڕواداریش هەر ناڕاسـت و نـا دروستە، بەڵام ئەوە بەو مانـایە نایـات، ئەگەر کەسـێک بـڕوای بە

دین هەبوو، ئیدی بۆی نییە و نابێ ببێتە ئەندامی سازمانێکی کۆمۆنیستی. لە پەیڕەوی نێوخۆی هیچ ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی و لە مەسەلەی ئەندامەتیدا خاڵی لەو بابەتە نییە. گرنگ ئەو کەسە بەرنامەی ئەو ڕێکخراوە پەسەند بکات، یان بۆ خاڵێک لە بەرنامەی ئەو ڕێکخراوە تێ بکۆشێ، جا ئەگەر ناکۆکییەک لە نێوان بڕوای ئایینی ئەو کەسە و بڕوای کۆمۆنیستیی ئەودا هەبێ، ئەوە کێشەی ئەو کەسە خۆیەتی و گرنگ ئەوەیە ئەو کەسە بە پراکتیک و کاری ڕێکخراوەیی خۆی دژی ئایین بووەتەوە و بەرەنجامی کاری ئەو ڕووی لە پووکانەوەی ئایینە.

لەڕاستیدا کۆمەڵە وەکوو ڕێکخراو خۆی لە قەرەی ئایین نەدەدا و توخنی نەدەکەوت، بەڵام چونکە هەڵگری بیروباوەڕی "کۆمۆنیستی" بوو، ئیدی دیراسەی ئەو فکر و فەلسەفەیە دەکرا، ئەویش ئاشکرایە لە بێبڕوایی و بێئاینییەوە سەردەردێنێ. بۆیە بە تەبیعەتی حاڵ زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی کۆمەڵە وەک هەر سازمانێکی دیکەی کۆمۆنیستی سەرەنجام نەک بڕوایان بە دین نەدەما، بەڵکە دژی دینیش بوون.

لەڕاستیدا ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی دەبێ بڕوای نەک هەر بە ئایین نەبێت، بەڵکە گەرە لەدژی دینیش بە ڕوونی و ڕاشکاوانە خەبات بکات. چونکە ئایین چینە کۆمەڵایەتییەکان و ناکۆکیی چینایەتی پەردەپۆش دەکات و پێشی وایە سەروەت و سامانی سەرمایەداران لە لایەن خوداوە پێیان براوە و مرۆڤەکانی هەر ئایینەش برای یەکدین، ئەگەرچی ئەم هەژار و بەلەنگاز و ئەو دەوڵەتمەند و سامانداره. ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی دەبێ پەردە لەسەر ئەو فریوکارییە هەڵبماڵێت و قامک بخاتە سەر سەرچاوەی نەبوونی و هەژاریی زۆربەی زۆری کۆمەڵ و هەبوونی و زەنگینی کەمایەتییەکی کەمی نێو کۆمەڵگا و پاشی ئەوە، کرێکاران و زەحمەتکێشان و ستەملێکراوان بۆ ئازادی و یەکسانی ڕێکخراو و ڕابەری بکات.

جاری وا هەیە، ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی بەربەرەکانێی لەگەڵ دیندا بە جۆرێکە، وەک ئەوەی ئەوە کار و وەزیفەی بنەڕەتیی ئەو بێت، لە کاتێکدا دەبێت ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی بە خەبات لە دژی نیزامی چەوسێنەرانەی سەرمایەداری و داکۆکیکەر لە کرێکاران و ستەملێکراوان بناسرێتەوە، ئەمە شوناسی بێت و هەر لێرەوە خەبات لە دژی خورافەی دینی مانای خۆی وەربگرێت. واتە، دەبێت شوناسی ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی شوناسێکی دژی سەرمایەداری بێت و لە ڕاستای خەبات لە دژی

سەرمایەداری، ئایینیش بکوتێتەوە، ئەویش لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئایین دەبێتە لەمپەر لەبەردەم ئەم خەباتە و ڕێگە لە هۆشیاربوونەوەی کرێکاران و بەشمەینەتان دەگرێ و زەینیان قورس دەکات. واتە، کۆمۆنیستەکان لە ڕێگەی تێکۆشانیان بۆ هۆشیارکردنەوە و یەکگرتووکردنی کرێکاران، دەبێت ئەو کۆسپ و لەمپەرانە کە دێنە پێشیان گسک بدەن، کە یەکێک لەوانە ئایینە. ئێمە لە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا وەک ڕێکخراو بەم کارەمان هەڵنەدەستاین، ئەمەش کۆمۆنیستبوونی ئێمەی دەخستە ژێر پرسیارەوە. ئیتر ئەگەر شتێکیش بەم ئاقارەدا کرابێت، ئەوە لە چوارچێوەی هەوڵ و کاری فەردیی ئەندامان یان هەندێک لە ئاستەکان و ئۆرگانەکاندا بوونە. ئەزانم لەو دەمەدا کەسانێک هەبوون و ئێستاش هەر هەن کە ئەوەیان پێ باش نییە و دەڵێن، کۆمەڵگای ئێمە لەژێر کاریگەریی ئیسلامدایە و بەو کارەمان ناتوانین جەماوەری ببینەوە و خەڵکی دوورمان لێ دەگرێت و لێمان دەتەکێنەوە! وەلی ئەوە ڕاست نییە و ئەزموونیش ئەوەی سەلماندووە.

سەرەتا دەبێت ئەوە بڵێین، ئەوە تەنها کوردستان و عێراق نییە کە ئایینی تێدا بێت، ئەوە بۆ گشت کۆمەڵگایەک هەر وایە و کاتی خۆی بۆڵشەڤیکەکان و لینینیش لە ڕووسیا بەرەو ڕووی هەمان کێشە بوونەتەوە. خاڵی گرنگ و بنەڕەتی ئەوەیە: ئایا کۆمۆنیستەکان لەو جێگایەی کە لێی هەن، توانیویانە بەهۆی تێکۆشانی جددیی خۆیانەوە بۆ پرسە گرنگەکانی کۆمەڵگا، متمانەی خەڵک بەدەست بهێنن و ببنە کەسایەتیی نێو کۆمەڵ، یان نا؟ ئەگەر کۆمۆنیستەکان توانییان ئەو جێگەوڕێگەیەیان لە کۆمەڵدا هەبێت، ئەوا تەبلیغیان لە دژی دین سانا دەبێت. وەلی منیش دەزانم، ئەگەر ئەو جێگاوڕێگایەیان لە کۆمەڵدا نەبوو، دژی دین و خورافە و کۆنەپەرستی و نەتەوەپەرستی بوونەوە، دەبنە گاڵتەجاڕ. چونکە ئەو شتگەلە لە کۆمەڵگادا ڕیشەیان هەیە و ئەوان دەتوان لەو دەمەیدا کە تۆ کەسایەتیت لاوازە، کۆمەڵگا لە دژی تۆ هەڵخرێنن و سواری سەرت بن.

من وتم، ئەزموونیش ئەوەی سەلماندووە ... ئێمە کاتی خۆی لە کۆمەڵەدا کە پڕۆپاگەندەمان لە دژی دین دەکرد، چونکە خاوەن کەسایەتی بووین، نەک بێزراو نەبووین، بەڵکە خۆشەویست و ڕەزا سووکیش بووین، خۆ ئەگەر کەسێک لە ڕووە دینییەکەوە هەر ڕای لێمان نەبووایە، ئەوپەڕەکەی بەڕێزەوە دەیگوت: بەخوا گشت

کـار و ئاکاریکتـان جـوانه، بەلام خـۆزگە نوێژیشـتان دەکـرد. چـونکە ئەو کەسـە نـوێژکردن بە یەکێـک لە ئاکـارە چاکەکـان دادەنـێ و پێـی وایە، ئەگەر ئەوەش بچووبایەتە پاڵ ئەوانی دیکە، ئیدی تەواوکەماڵ و پێرفێکتی، وەلی سـەرباری ئەوەش هەر پشتیوانتە.

کـاتی خـۆی کـۆمەڵەی ئێـران چـونکە بەکـردەوە نیشـانیان دابـوو، داکـۆکیکەری کرێکـاران و بەشـمەینەتانن و خـاوەن کەسـایەتییەکی بـاڵا بـوون، خەڵکـی عـامی و نەخوێنـــدەواری گونـــدەکان ســــەرباری پڕۆپاگەنـــدەی دژی دینـــی ئەوان، هەر خۆشەویست و جێگای پشتیوانی بوون.

تـازەترین ئەزمـوون، ئەزمـوونی کانتۆنەکـانی ڕۆژئاڤـایە کە چـۆن بەدەرکردنـی یاسـای بەرابەریـی نێـوان ژنـان و پیـاوان، دیـن و شـەریعەتیان خسـتە کەنـارەوە و ئەوەی بـۆ ئـازادی و سـەرفرازیی ژنـان پێویسـت بـوو، لە یاسـایەکی سـەردەمی و مۆدێرن دایان نا و ئەوەی ئیسلام و قورئان پێی ناخۆش بوو کردیان، بەلام چونکە ئەوان لە بەرخۆدانیاندا جێگای متمانە بوون و خاوەن کەسایەتییەکی باڵا بـوون، بە تـایبەتی بەرخـۆدانی ژنـانی کۆبـانی، کـێ وێـرای شـتێک بڵێت؟! ئەگەر مەلایەک یـان دووان نیگەرانییەکیـان دەربڕیبێت کە لە پاڵیشـیدا دیسـانەوە تێر مەدح و ستایشـیانی کردبێت، ئەوە شـتێکی هەر زۆر گچکۆکەیە. خۆ ئەگەر بهاتبـایە ئەوان و کەسـایەتیی ئەوان نەبـووایە، ئەوا مەلا و کۆنەپەرسـتانی ئەو کیشـوەرە دۆ و دۆشـاویان تـێکەڵ دەکرد و هەزار و یەک ناو و ناتۆرەی گەنیویان دەخستە پاڵیان.

پێویسـتە لێرەدا یەک خـاڵی زۆر گرنـگ بـاس بـکەم، ئەویـش ئەوەیە: وەسـتانەوە لەدژی هەر بیروبۆچوون و تێڕوانین و بڕوا و عەقیدە و ڕەوشـت و ئاکار و ئەتـوار و هەر عـادەت و شـتێکی بـاوی نێـو کـۆمەڵ کە ڕیشـەی خـۆی داکوتیـوە، تووشـی بەرامبەرکـێ و لە دژوەســـتانەوە و زەحمەتیـــت دەکـــات. واتە مەســـەلەکە هەر بە ئـایینەوە پەیوەسـت نیـیە. بـۆیە بـۆ جێخسـتنی ئاڵتەرناتیڤێـک بـۆ هەر یەکە لەوانە، کەسانی بە ئۆتۆریتە و جددی و چارەی ناسراو و خۆشنا و تێکۆشەری گەرەکە.

# مەلا خەلیل (خەلیل عادیل سابیر)

وەک بیتەوە بیرم، ساڵی ۱۹۷۸ بوو، لە دانیشتنێکدا ئەسعەد باسی ئەوەی لەگەڵدا کردم، هاوڕێیەک دەگوێزرێتەوە بۆ لای من و بەڵکوو بچم پەیوەندیی پێوە بکەم. بۆ ئەم مەبەستە نامەیەکی پێچراوی پێم دا، کە ناو و ناونیشانی ئەو هاوڕێیە و وشەی نهێنی نێوانمانی تێدا بوو. دواتر کە نامەکەم خوێندەوە، ئەو هاوڕێیەم دەناسی و هاوگەڕەکمان بوو، ئەویش مەلا خەلیل (خەلیل عادیلە سوور) بوو.

خەلیل یەکێک بوو لەو هاوڕێیانەی هەر لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانییەوە پەیوەندی کردبوو، هەروەها یەکێک بوو لەو هاوڕێیانەی یەکەمین بەیاننامە یانی بەیاننامەی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی لە شاری کەرکووک بڵاو کردبووەوە و خاوەن بڕوایەکی بەهێز و دیسیپلینێکی لە ڕادەبەدەر بوو. جارێکیان لە بەرەبەیانێکی زوودا کەسێک لە دەرگای دا، چوومە دەرەوە بینیم خەلیلە، دڵی زۆر خۆش بوو، باوەشی پێمدا کرد و هەواڵی ڕاپەڕین و ڕووخانی شای ئێران و ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستانی ئێرانی بۆم هێنا، کە لە ڕادیۆوە لێی ئاگادار ببوو.خەلیل دوای ئەوەی دواناوەندی پیشەسازی تەواو کرد و ناوی لە پەیمانگای نەوت دەرچوو، لەلایەن ڕێکخستنەوە داوای لێ کرا بچێتە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی، ئەویش وازی لە خوێندن هێنا و بڕیاری دا ببێتە پێشمەرگە.

لە ناوەڕاستی مانگی ۱۲ی ساڵی ۱۹۷۹دا خەلیل بە چاوساغی ئەسعەد دەگاتە گوندی عەودالان و بە مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی هەرێمی دوو کە غەریب عەسکەرییان لەگەڵدا دەبێت پەیوەست دەبێت. ئەسعەد هەر ئەو ڕۆژە خۆی دەگەڕێتەوە.

ئەو دەمە زانینی جێگا و شوێنی پێشمەرگە و مەفرەزەکانی هەر وا سانا نەبوو، بەڵام ئەسعەد دیار بوو، بێجگە لەوەی خۆی بە بنەچە خەڵکی گوندی عەودالان و ئەو دەڤەرە بوو، پەیوەندییەکی نزیکیشی لەگەڵ ئەو مەفرەزانەدا هەبووە و پێ دەچێت کەسانێکی جێمتمانە و سەر بە ڕێکخستنە نهێنییەکانی کۆمەڵەش ئەڵقەی نێوانی ئەسعەد و هەرێمی دوو و کەرت و مەفرەزەکانی بووبن. چونکە ئەو کارەی ئەسعەد تەنها ئەو کەرەتە نەبوو، بۆیە هەر دەمێک بیویستبا، دەیتوانی سۆراخیان

بکات و ڕێوشوێنیان پەیدا بکات. ئەو دەمە ئەسعەد و من هەردووکمان لە زانکۆی سلێمانی پێکەوە بووین.

چەند ڕۆژێک دوای ئەوە ئەسعەد سەرێکی ژێر پردەکەی نزیک مزگەوتی گەورە واتە، لای مریشکفرۆشەکان ئەدا، ئەو جێگایەی گوندنشینەکان هەر لە شەبەقەوە خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن و ماست و پەنیر و ڕۆن و کەرە و ژاژ و کەنگر و مامر و هێلکە و هەر چتێکی دی کە گەرەکیانە بۆ شاری بەرن و بیکەنە پارە و شەکر و چا و نوقڵ و نەباتی پێ بکڕن. لەوێدا ئەسعەد خەڵکی ئاوایی خۆیان دەبینێ و لەگەڵ کەسی جێمتمانەی خۆی قسە دەکات و هەواڵی مەلا خەلیل و ئەو مەفرەزەیەی پێ ڕادەگەیەنن، وەلێ هەواڵەکە ناخۆشە.

ئەسعەد هات بۆ لام و زۆر بێ تاقەت بوو وتی: دوێنێ (١٩٧٩/١٢/٢١) دەمەو عەسر جەیش و جاش هێرش دەکەنە سەر گوندی عەودالان و چواردەوری ئەو هێزە دەگرن کە 'مەلا خەلیل'یان لەگەڵدا بووە، پێشمەرگەکان بە هەر جۆرێک بووە، نێودێ بەجێ دەهێڵن و خۆیان دەگەیەننە هەڵەتەکە، 'مەلا خەلیل'یش بەگەڵیان دەکەوێت. وەلێ مەلا هێشتا چەکی وەرنەگرتووە و بێچەکە، بۆ یەکەمین جاریشە دەچێتە ئەو گوند و ناوچەیە و نابەڵەدە. شەڕ دەستی پێ کردووە و لە هەر چوارلاوە تەقە و دەسترێژە و لە ئاسمانیشەوە ئاگربارانە. ئەم لە ژیانیدا شەڕی نەبینیوە، ئەرێ ئەمە خەوە، یان ڕاستییە! بە هەر حاڵ ئەمە ڕاستییە و دوێنێ و ئەمڕۆ دوو دنیای تەواو لێک جوودان، کوڕ ئەو کوڕەیە خۆی ڕزگار بکات، بەڵام بۆ مەلا ئەستەمە، ئەوان هەر یەکە لە خەمی خۆیدا بووە، بە هەر دەردەسەرییەک بووە خۆیان قوتار کردووە و مەلا بێ هاوڕێ و هاوکار لەنێو ئەو دار و بەرد و ئاگردانەدا بە تاق و تەنها دەمێنێتەوە، جەیش و جاش دەگەنە سەری و بە برینداری و بە کۆڵێک کتێبی مارکسییەوە دەستگیری دەکەن.

ئەو دەمە هێشتا پێشمەرگە ئەزموونی شەڕی نێوگوندی نەبوو، زۆر بەنهێنی دەجووڵان و ئەم گوند و ئەو گوندیان دەکرد، لەپێش چاوی خەڵکی لە خوار ئاواییەوە دەردەچوون و پاشان بە دزییەوە بۆ ژوور ئاوایی هەڵدەگەڕانەوە و ئاراستەی خۆیان دەگۆڕی، ئەگەر شەوێک لە گوندێک بمانایەتەوە، دەبوو زۆر بەئاگا بن، خۆ ئەگەر پیاوچاکێک ئیخباری بکردبایەن، ئەوا ئیدی کارەسات بوو. شەڕی قازانیش هەر لە جوملەی ئەو شەڕانە بوو کە پێشمەرگە هێشتانەکوو فێری

ئەزموونی شەڕی نێوگوند نەبووبوو، وەلێ دواتر و بەناچاری فێری ئەزموونی شەڕی نێوگوند بوون. شەڕی هەیدەربەگ و ژاڵە و حەمک فێری کردن، مانەوە و سەنگەرگرتن دەنێو گوند بۆ ئەو دەمەی چواردەورت دەگیرێ، باشترین ڕێگای شەڕ و بەرخۆدانە. ئیدی لەو ڕۆژەوە هاوسەنگی هێز وەرچەرخا و گەمارۆدانی گوند بە جەیش و جاش کاریگەری خۆی لەدەست دا. بەڵام دەبێت ئاماژە بەوەش بکەین، ئەوە بێمافییەکی گەورەیە بەرامبەر بە دانیشتووانی بێچەک و مەدەنیی ئەو گوندە. بە هەر حاڵ ... مەلا خەلیل گیرا و ڕەوانەی دەستگای هەواڵگریی شاری سلێمانی کرا و لەپاش لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجە، ڕەوانەی هەیئەی خاسەی کەرکووک کرا. ئینجا لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەی تەواو لەم گرتووخانەیەوە بەتەواوی دەست پێ دەکات. بەڵام مەلا خەلیل هەر وا کەسێکی ئاسایی نییە کە ناوی بۆ سەربازی هاتبێتەوە و ڕووی لە پێشمەرگایەتی کردبێت، نەخێر! ئەو ئەندامێکی قەدیمی کۆمەڵەیە و چەندین ساڵ لە ڕێکخستنە نهێنییەکانی شار کاری کردووە و کۆمەڵێک نهێنی لە هەناودایە و لەو نێوەدا کۆمەڵێک خەڵکیش دەناسێ، یەکێکیان خۆمم کە هەتا ئەو دەمەی چووەتە دەرەوە بەرپرسی بوومە و یەکێکی تریان ئەسعەدە کە هەر دوێنێ بوو بە هاوکاری و چاوساغی ئەو گەییشتە نێو پارتیزانەکان!

لە هەیئەی خاسەی کەرکووک دەکەونە لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەی زۆر سەختی مەلا خەلیل. لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە پێشمەرگایەتی، ڕێکخستن و ئەو کۆڵە کتێبەی کە پێی گیرابوو لەگەڵدا دەکەن، بەڵام ئەم گشت ئەوانەی ڕەت کردبووەوە و گوتبووی: من پێشمەرگە نیم و بۆ میوانی هاتووم، ئەو کۆڵە کتێبەش هی ئەوان بووە و بەزۆر بەسەر منیاندا داوە.

کتێبەکان، کتێبی مارکسی بوون و چەپکێک لە قسەکانی ماو و "بژی جەنگی گەل"ی تێدا بوو، هەر هەمووشیان ئیمزای "مەلا خەلیل"یان بەسەرەوە بوون. لەسەر ئەم ئیمزایەش گەلێک ئەشکەنجەی ئەکەن و ئەڵێن، بەبێ هیچ گومانێک ئەوە ئیمزای تۆیە، بەڵام ئەو نکۆڵی دەکات و دان بەهیچ شتێکدا نانێت.

ئیدی قۆناغی لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجە تەواو دەکات، بەڵام بۆ بەدبەختی ئەو لەو سەروبەندەدا پێشمەرگەیەک لە پێشمەرگەکانی ئەو مەفرەزەیە بە ناوی تەهای مەلا تەیفوور خۆی ڕادەستی حکوومەت دەکاتەوە. ئەوەی شایانی باسە، لە ماوەی ئەو

چەند ڕۆژەدا کە مەلا خەلیل لەگەڵ ئەو مەفرەزەیەدا دەبێت، کۆمەڵێک زانیاریی شەخسی لای ئەو پێشمەرگانە باس دەکات.

پرسیار لە تەها ئەکەن و بەرەوڕووی "مەلا خەلیل"ی ئەکەنەوە، هەرچییەک کە دەیزانی، دەیگێڕێتەوە و دەڵێت:[98]

بەڵێ ئەم کەسە ئەناسم، ئەمە چەند ڕۆژێک پێش ئەو ڕووداوە، لەگەڵ کەسێکی ڕیشن لە شارەوە بۆ لامان هات، ئەم بووە پێشمەرگە و لەگەڵ ئێمە مایەوە، ئەوەی دیکەش بۆ شار گەڕایەوە.

هەروەها هەندێک زانیاریی دیکەی لەسەر هەڵسووکەوتی ئەم دابوو:

کاتێک کە چوو دەست بەئاو بگەیەنێ، نەیدەزانی بەباشی بەنەخوێنەکەی گرێ بداتەوە، کاتێک کە جەمەدانییەکەی کرایەوە، نەیدەتوانی بەجوانی بیبەستێتەوە![99]

ئیدی ئەو کابرایە بەتەواوی ڕیسەکەی لێ کردەوە بە خوری و لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەی سەخت دیسانەوە دەستی پێ کردەوە. وەلێ مەلا ئەم جارە و بە حزووری شایەدێکیش بەسەریەوە، جارێکی تر نکۆڵی لە هەموو شتێک دەکات و لەسەر ئەسعەد و من نەک هەر هیچ نادرکێنێ، تەنانەت لەسەر خودی خۆیشی دان بەهیچ شتێکدا نانێت!

سەرەنجام مەلا بە ٢٠ ساڵ زیندانی حوکم دەدرێت و ڕەوانەی گرتووخانەی ئەبووغرێب دەکرێت. دوای ئەوە من بۆ مواجەهەی چووم و گشت بەسەرهاتەکەی بۆم گێڕایەوە.

لەو چەند مانگەی کە مەلا خەلیل لەژێر ئەشکەنجەدا بوو، ئەسعەد و من ئەگەرچی دەوامی زانکۆمان هەر دەکرد، بەڵام زۆر بەئاگا و گوێقوڵاغ بووین، کەمتریش بۆ ماڵ دەچووینەوە.

مەلا خەلیل بە لێبووردنی گشتی لە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٧/١٧ بەر بوو.

---

٩٨. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز مەلا خەلیل (خەلیل عادیل سابیر).

٩٩. تەهای مەلا تەیفوور داکۆکی لە خۆی دەکات و دەڵێت: من لە سەرکردایەتییەوە بۆ کوشتنی قالە فەرەج نێردرام، بەڵام لە کەرکووک گیرام و لەژێر ئەشکەنجەدا وتوومە خەلیل وەک کەسێکی مەدەنی لەگەڵ ئێمەدا بووە. سەرەنجام حوکمی ئیعدام درام و پاشان بە هەوڵی کەسوکارەکەم کرایە حوکمی ئەبەدی. دوایی بە لێبووردنی گشتی ئازاد کرام و دووبارە بوومەوە بە پێشمەرگە.

ئەوەی شایانی گوتنە، ئەم پیاوە دوای ئەوەی لە زیندان ئازاد کرا، جارێکی دی هاتەوە بۆ لام و داوای پەیوەندی لێم کردەوە. ئەو دەمە ئێمە تازە خەریک بوو، لەدوای ئەو زەبرە گەورەیەی لە شالاوی گرتنەکان بۆ سەر کۆمیتەی ئاگر، بەژنمان ڕاست دەکردەوە و هێشتا تەپوتۆزی ڕووخسارمان نە سڕیبوو!

لەڕاستیدا ئەو هەڵوێستەی مەلا خەلیل کەموێنەیە، چونکە ئەو دوو کارەساتی گەورەی بە چاوی خۆی بینی، یەکەم: ئەو کارەساتە گەورەیەی کە بەسەر خودی خۆیدا هات، لە چوونە دەرەوە، لە بەجێهێشتن و گیرانی، لە زیندان و ئازار و ئەشکەنجە و خیانەتی پێشمەرگەیەکی تەسلیمبوو، هەتا دەگاتە حوکم و زیندەگی نێو زیندانی ئەبووغرێب. دووەم: ئەو کارەساتەی لەدوای ئەو بەسەر ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووکدا هات، کە بێجگە لە کەلاوەیەک هیچی دیکەی بۆمان لێ بەجێ نەهێشت و دۆخێکی وەها سامناک و تۆقێنەری پێک هێنا، مەگەر هەر ئەوانەی لەنێو ڕووداوەکاندا بوون، بزانن چ ئاخر زەمانێک هەستابوو.

ئەمەوێ لە پەیوەند بەم باسەوە، ئاماژە بە دوو خاڵ بکەم، یەکەم: لەپاش هێوربوونەوەی دۆخەکە و تەواوبوونی قۆناغی ئەشکەنجەی هاوڕێیانمان و حوکمدانیان، ئێمە کەوتینەوە کۆکردنەوەی پارچەکانمان. لەو دەمەدا بەهۆی ئەو دۆخە ترسناکەی بۆ ئێمە لە ڕێکخستنەکانی کەرکووک هاتە پێش، هاوڕێیانێک هەبوون، ئامادە نەبوون پەیوەندیمان لەگەڵدا بکەنەوە، تەنانەت هیی واشی تێدا بوو نکۆڵی لەوە دەکرد، پێشتر پەیوەندیی ڕێکخراوەیی هەر هەبووبێت! دووەم: ئەو دەمە بەهۆی ئەوەی من خۆم لە هەوڵی لێکگرێدانەوەی ئەندام و شانە و هێڵە لێکترازاوەکان بووم و ئاگاداری زۆری دۆخی ڕێکخستن بووم، ئەوەندەی من بزانم و زانیاریم هەبێت، یەک دانە لەو هاوڕێیانەی کۆمیتەی ئاگر کە گیران و حوکم دران و پاشان وەکوو مەلا خەلیل بە هەمان لێبووردن بەر بوون، نەهاتن داوای پەیوەندیمان لەگەڵدا بکەنەوە! لێرەدا من بەهیچ جۆرێک مەبەستم لۆمە و سەرکۆنەکردنی ئەوان نییە، چونکە دەزانم ئەوەی لە زیندان بەر بێت، ئەشێت لەژێر چاودێریدا بێت و بارودۆخێکی تایبەت و ناسکی هەیە، بەڵکوو مەبەستم، دەرخستنی بڕوا و بوێریی مەلا خەلیلە!

# ئەحمەد خورشید ڕەزا (ئاشتی)

لەگەڵ ئەحمەد هاوگەڕەک بووین، ئەو ماڵی لە پشتی ماڵی شێخ بوو، هەر بۆیە ئێمە نەک هەر خۆمان، بەڵکە خانەوادەی یەکدیشمان دەناسی و جێگەی باوەڕ و متمانەی یەکتری بووین.

ئەحمەد ئەگەرچی لە گەڕەک زۆرتر لەنێو کۆڕ و کۆمەڵی هاوڕێیانێکی دیکەدا بوو، وەلێ ئەوە وای نەکردبوو، کۆڕ و کۆمەڵەکانمان لێک دابڕاو بێت و تێکەڵیمان نەبێت. بە تایبەتی من بە هۆی کاری ڕێکخستنەوە، هەمیشە لە دەوروبەرەکەم ورد دەبوومەوە و ئەو کەسانەم لەبەرچاو دەگرتن کە بۆ کاری سیاسیی ژێرزەمینی گونجاو و شیاون.

ئەبێ ئەوەش بڵێم کە ئێمە لە دەوروبەرێکی خاوێن و پاکدا بووین و کەسانی ناپاک و جاسووس بە پەنجەی دەست دەژمێردران و لای ئێمە ناسراو بوون و لەنێو خۆشماندا باسمان دەکردن. تەنانەت جاری وا هەبوو، ناوی ئەو کەسانە لە دیواری ئاودەستخانەی مزگەوتی گەڕەک دەنووسرا و داوا دەکرا کە خەڵکی لێیان ئاگادار بن و خۆیان لێیان بپارێزن. بەڵام بۆ کاری سیاسیی ژێرزەمینی ئەگەرچی پاکیی مرۆڤەکان مەرجی ئەوەڵ بوو، بەڵام دڵگەرمی و ئامادەگی ئەو مرۆڤە بۆ کارێکی وا کە ئەگەری هاتنەپێشی هەموو سەختییەکی لەبەردەمە، مەرجی دووەم و گرنگ بوو. ە هەر حاڵ، هاوڕێیەتی ئەحمەد و من چووە قۆناغێکی تر و لێک نزیک بووینەوە و قسەوباسی سیاسیمان دەکرد و لەنێو ئەڵقەی ڕۆشنبیریی کۆمەڵەدا جێی گرت و ئەو کتێبانەم پێی ئەدا کە بۆ ئامادەکردنی کەسێک بۆ ڕێکخستن و ناسینی شۆڕشەوق و ئامادەیی پێویست بوون. ئەحمەد بە تاسەوە ئەو کتێبانەی لێم وەردەگرتن و لەپاش خوێندنەوەی گفتوگۆ و جەدەلمان دەربارەیان دەکرد. لەپاش بەسەربردنی ماوەی پاڵێوراوی، باسی خەبات و کاری پێکەوەیی و ڕێکخراوم لەگەڵدا کرد و ئەویش بە خۆشحاڵییەوە ئامادەیی خۆی دەربڕی و بووە ئەندامی کۆمەڵە.

ئەحمەد یەکێک بوو لەو هاوڕێیانەی کە بەتەواوی جێگە متمانەی من بوو، بۆ خۆی کەسێکی چالاک و هەڵسووڕاو بوو، منیش چەندین ئەندام و شانەم دایە لای و سەرەنجام بووە بەرپرسی پۆلێک بە نێوی پۆلی شەهید مام بێستوون و بەو پێیەش بووە ئەندامی کۆمیتەی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن.

ئەو پۆلەی کە ئەحمەد بەرپرسی بوو، بەشێک لە ئەندامەکانی لەلایەن خۆیەوە ڕێکخرابوون و بەشێکیشی لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕی پەیوەندیی ڕێکخراوەیی درابوونە لای.

ئەوەندەی لە یادەوەری ئەحمەد و مندا مابێت، پێکهاتەی ئەو پۆلە سەرەنجام بەم جۆرە بوو:

ئەسعەد کەریم (هاوڕێ): کرێکار لە کارگەی قیری لەیلان، گەڕەکی شۆڕیجە، لە ساڵی ١٩٧٩ لەلایەن "ئەحمەد"ەوە ڕێک خرا.

عەلی قادر (ئارام): جووتیار، گوندی کەوەڵە، لە ساڵی ١٩٨١ لە لایەن "ئەحمەد"ەوە ڕێک خرا.

کەریم حەمە عەلی (هۆگر): خوێندکار، ئامادەیی پیشەسازیی سلێمانی، لە ساڵی ١٩٨٢ لە لایەن "ئەحمەد"ەوە ڕێک خرا.

کاک ڕەشید: کرێکار بوو، ماڵی لە گەڕەکی ئیسکانی تازە بوو، بەرپرسی خەتێکی ڕێکخستن بوو.

محەمەد خەیروڵا ئەمین (ئاسۆ): خوێندکاری کۆلێجی کشتوکاڵی لە زانکۆی سلێمانی و دانیشتووی گەڕەکی ڕەحیماوای شاری کەرکووک بوو، لە ساڵی ١٩٨٢ لایەن "ئەحمەد "ەوە ڕێک خرا. بەرپرسی خەتێکی ڕێکخستن بوو.

نەوزاد فەتحوڵا عەبدولڕەزاق(هیوا): خوێندکار، گەڕەکی یادگار، لە لایەن من (سالار ڕەشید)ەوە ڕێک خرا و دواجار پەیوەندییەکەی بۆ لای ئەحمەد خورشید گوێزرایەوە. بەرپرسی خەتێکی ڕێکخستن بوو.

**کاک ڕەشید:** من کاک "ڕەشید"م نەئەناسی، وەلێ کاتی خۆی نامەیەکمان لە کەرتی ڕێکخستنی چەمچەماڵەوە پێ گەییشت و داوای دەکرد کە پەیوەندی بۆ کاک

ڕەشید دروست بکەینەوە، لەبیرم ماوە ماڵیان لە ئیسکانی تازە و کرێکار و شۆفێری شۆفڵ بوو.

ئەم خەتە کۆمەڵێک بوون، هەموویان کرێکار بوون و وەک تەمەنیش، کەسانی کامڵ و بەتەمەن بوون. ئەو ئەندامانەی کە پەیوەندییان بە 'کاک ڕەشید'ەوە هەبوو، ئەمانە بوون:عومەر کارەباچی (عومەر مام مەحموود بنەیی)، خالیدی برای عومەر کارەباچی، وەستا مەناف کوڕی وەستا سابیر، پۆلیسێک، برایەکی کاک ڕەشید.

ئەحمەد وتی: من ئەو دەمە ئەمانەم هەموو دەناسین، چونکە لە کاتی کۆبوونەوەی دووبەدوودا، کاک ڕەشید ناوی ئەم هاوڕێیانەی بەبێ ئاگایی بەدەمدا دەهات و باسیانی دەکرد!

من عومەر کارەباچی و خالیدی برایم دەناسی، مام مەحموودی باوکیان هاوسێمان بوو، کە ئەو دەمە هێشتا خالید'یش هەر لەگەڵ ماڵی باوکیدا بوو. ئەمانە بە ڕەچەڵەک بنەیی بوون و ئێمەش لەگەڵ بنەییەکاندا تێکەڵاویمان زۆر بوو.

دیتەوە بیرم من منداڵ بووم، تەمەنم هەر وا هەشت نۆ ساڵان دەبوو، کۆتایی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، دەمەو ئێوارەیەکی هاوین، دنیا تەواو تاریک ببوو، میوانێکی زۆری بنەییمان هەبوو، لە حەوشەکە دانیشتبوون، عومەر کارەباچیشیان لەگەڵدا بوو، ئەو دەمە ئەو جەلالی بوو، تفەنگێکی پێ بوو، لە بڕنەو گەورەتر بوو، لەسەر دووپایەک لەنێو حەوشەکە و لە تەنیشت خۆی دایناببوو، دووپایەکە ئاسن و بە لوولەی تفەنگەکەوە بوو، دەتوانی بیخەوێنێت و تفەنگەکە لە شان بکەیت، بۆ کاتی دانان و شەڕیش دەتوانی ڕایکێشیتە خوارەوە و دایبەستی. ئەو تفەنگە بۆ من جێگەی سەرنج بوو، هەر لەدوای ئەوە بوو، تفەنگێکم بە دار دروست کرد و لای سەرەویم هەڵکۆڵی و پارچە شیشێکم بۆی کردە لوولە و لەو چاڵە چەسپم کرد.

وەستا 'مەناف'یشم دەناسی، ماڵیان لە پشت ماڵی ئێمە و لە تەنیشت چایخانەکەی ئەحمەد قازان بوو. مەناف مرۆڤێکی زۆر لەسەرخۆ و سەنگین و بەڕێز بوو، بە پێچەوانەی وەستا سابیری باوکییەوە کە گەلێک تووڕە و توند و کەلەشەق بوو، هەتا خانوویەکی بۆ مان دروست کرد، چەندین جار ئیشەکەی بەجێ هێشت و پاشان باوکم ئەچوو ئاشتی ئەکردەوە و ئەیهێنایەوە.

ئەحمەد چەندین ئەڵقەی ڕۆشنبیریشی هەبوو کە لەم هاوڕێیانە پێک هاتبوون:

نەجات حاجی ڕەشید، نەوزاد فەتحوڵا عەبدولڕەزاق (شەهید هیوا)، مامۆستا ئارام، شەهید محەمەد حەمەغەریب، نەجمەدین مەجید.

وادیارە بەهۆی ئەوەی نەوزاد فەتحوڵا و ئەحمەد خورشید و من هاوڕێی یەک گەڕەک بووین، لە یەک کاتدا نەوزاد ئەڵقەی ڕۆشنبیری هەردووکمان بووە.

**محەمەد خەیروڵا ئەمین:**

هەر وەکوو پێشتر باسمان کرد، محەمەد لە لایەن "ئەحمەد خورشید"ەوە ڕێک خرابوو، بەڵام لە پاش ماوەیەکی کەم پەیوەندییەکەیمان بۆ لای تەحسین نامیق گواستەوە، چونکە هاوگەڕەک و نزیکی یەک بوون.

سەبارەت بە گوێزانەوەی هاوڕێیان، ئەگەرچی من گواستنەوەی هاوڕێیانی ڕێکخستنم بە باش نەدەزانی و هەتا بکرایە، پەیڕەویم لە کەمترین یەکترناسین دەکرد، وەلی هەندێک جاریش گواستنەوە سەرباری لایەنی خراپی، لایەنی باشیشی هەبوو، ئەویش بە وێنەی گواستنەوەی پەیوەندی محەمەد بۆ لای تەحسین.

لایەنی باشیی ئەم گواستنەوەیە ئەوە بوو، هاوگەڕەک و نزیکی یەک بوون، یانی بۆ هاتوچۆی یەکتری و کۆبوونەوە و هێنان و بردنی بەیان و بڵاوکراوە ساناتر و لە ڕووی ئەمنییەوە کەم مەترسی تر بوو. هەروەها بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخی گەڕەکەکە لە پەیوەند بە کار و هەڵسووڕانیانەوە، لە دیاریکردنی کەسانی پاک و خەباتکار و خۆنزیککردنەوە لێی، بە مەبەستی فراوانکردنەوەی هەرچی زیاتری دامەنەی ڕێکخستن لە لایەک و دەستنیشانکردنی پیاوانی ڕژێم و خەڵکانی ناپاک، بە مەبەستی ئاگاداری و خۆپارێزی لە لایەکی دیکەوە. بۆ حیزب و ڕێکخراوێک کە ڕێکخستنی نارەزایەتیی خەڵکی مەبەست بێت، بنیاتنانی شانەکان لەسەر بنەمای شوێنی کار و نیشتەجێبوونی کرێکاران و زەحمەتکێشان گرنگ و حەیاتییە. دیارە ئێمە وەکوو کۆمەڵەی ڕەنجدەران ئەوەمان نەخستبووە نێو دەستووری کاری خۆمانەوە و تەواوی هێز و توانستی خۆمان لە خزمەتی باسکی سەربازیدا، نەک ڕێکخستنی نارەزایەتیی نێو گەڕەک و کارخانەکان سەرف دەکرد. لێرەدا ئەبێ

ئاماژە بەوەش بدەم، ڕێکخراوە کۆمۆنیستییەکانی دوای ئەویش، ئەگەرچی جەختیان لەسەر ئەو خاڵە دەکردەوە، بەڵام لە کردەوەدا شتێکی ئەوتۆیان لە کۆمەڵە زیاتر نەکرد.

محەمەد خەیروڵا لە پاش ماوەیەک بووە بەرپرسی شانە و ئەندامی پۆلی شەهید عەلی ساڵح. ئەو دەمە ئەو پۆلە لە سێ خەت پێک هاتبوو، کە هەر یەکە لە فەتاح کوێخا ڕەزا و تەحسین نامیق عەبدوڵا تیایدا بەرپرسی ئەو دوو خەتەی تر بوون و تەحسین بەرپرسی پۆلەکە بوو. بەو پێیە تەحسین وەک بەرپرسی پۆلێک دەبووە ئەندامی کۆمیتەی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن.

یەکێک لەو هاوڕێیانەی ئەو هێڵەی لای فەتاح کوێخا، جەنگی عەزەدین مەحموود خانە بوو. ناوی نهێنی جەنگی "سالار" بوو، ئەمیش بەرپرسی دوو شانە بوو، ئەندامانی شانەی یەکەم بریتی بوون لە: عوسمان دەروێش، سوبحی قادر، عەلی تۆفیق. ئەوەی دیکە شانەیەکی فەردی بوو، هاوڕێیەک بوو بە ناوی، لەتیف عومەر (هەڵگورد)، ئەوەی شایانی گوتنە، ئەمانە گشت لەلایەن خودی جەنگییەوە ڕێک خرابوون.[١٠٠]

ئەو هاوڕێیانەی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە "محەمەد خەیروڵا"وە هەبوو، ئەوەندەی زانراوە ئەمانە بوون:

ئازاد عەبدولڕەحمان ئیبراهیم (بڕیار)، خوێندکاری زانکۆی تەکنەلۆجی بوو، ئەندامی کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە بوو. بەهرۆز خالید، خوێندکاری کۆلێجی ئیدارە و ئیقتیساد لە زانکۆی سەلاحەدین بوو، ئێستا لە ئەڵمانیایە. تەیب عەزەدین سادق (سمکۆ) ماڵیان لە ڕەحیماوا بوو، ئێستا لە سوێدە. کامەران (ناوی باوکی ئیبراهیم یان شوکور بوو) ماڵیان لە تەپە بوو، خوێندکاری کۆلێجی پەروەردەی زانکۆی مووسڵ بوو. تەحسین (دارا)، ماڵیان لە ڕەحیماوا بوو، خوێندکاری ئامادەیی زێوەر بوو. نووری، کوڕێکی گەنج، لە تەمەنی هەرزەکاریدا بوو، ماڵیان لە ڕەحیماوا بوو، محەمەد یەکجار کۆبوونەوەی لەگەڵدا کردبوو، چونکە کێشەی زۆر بوو. فەرهاد مەحموود عەزیز (هەڵکەوت)، ماڵیان لە ڕەحیماوا بوو، ئێستا لە کەرکووکە.

---

١٠٠. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز جەنگی عەزەدین مەحموود خانە.

# هیوا سدیق (هیوای شێخ سدیق ئاڵتوونچی)

هیوا یەکێکی دیکە بوو لەو هاوڕێیانەی کە پەیوەندی بە منەوە هەبوو. ئێمە هاوسێی یەکدی بووین و یەک دیوارمان بەین بوو. وەک بێتەوە یادم لە ساڵی ١٩٧٨ یان ١٩٧٩ بوو، دوای بەسەربردنی ماوەی پاڵێوراوی موفاتەحەم کرد.

ئەم خانەوادەیە بە ڕەچەڵەک خەڵکی شاری کۆیە بوون، "شێخ سدیق"ی باوکی هیوا ئاڵتوونچی بوو، دوکانەکەی لە نێو ئاڵتوونچییەکانی بازاڕی عەسری و کەسێکی زەنگین و بە ئیمکان بوو. "هیوا"ش هەندێک جار ئیشی تێدا دەکرد و کۆمەکی باوکی ئەکرد، وەلێ بەهیچ جۆرێک حەزی بەو پیشەیە و بە دەوڵەمەندی نەبوو، بگرە گەلێک جاران بێزاری و وەڕەزی خۆی لەو کارە دەردەبڕی و نارەحەتی خۆی لە فەزای پیسی نێو ئاڵتوونچییەکان لە کن من باس دەکرد.

هیوا لە خوێندن کەسێکی زیرەک بوو، لەژێر کاریگەریی من چووە کۆلێجی یاسا لە بەغدا و دواتر بۆ کۆلێجی ئیدارە و ئیقتیساد دای گرت و پاشان تەواوی نەکرد.

هیوا لە کاری سیاسیشدا زیرەک بوو، گرنگی بە خوێندنەوە و خۆپەروەردەکردن دەدا، کەسێکی نهێنیپارێز و بە دیسیپلین بوو. هەندێک جار لە ڕاکێشانی بەیاننامەکانمان بە ڕۆنیۆی سەرەتایی یارمەتی ئەدام.

ئاوات عەلی (ئاواتی شێخ عەلی) لەلایەن هیواوە ڕێک خرابوو، پێکەوە شانەیەکیان پێک هێنابوو، هیوا بەرپرسی شانەکە بوو.

ئەوەی شایانی باسە لەگەڵ ئاوات لە یەک گەڕەک و کوڵان بووین و باوکی ئەو لە قۆناغی سەرەتایی مامۆستام بوو.

# لوقمان عەزیز ڕەشید (هەڵۆ)

لوقمان برامە، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٧٨ یان ١٩٧٩ لە لایەن منەوە بۆ یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان ڕێک خرا و لە لایەکی دیکەوە و لە ڕێی محەمەد ئەحمەد حوسێن (محەمەد باجی عاسم) کە هاوگەڕەک بووین، پەیوەندی بە ڕیزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردبوو. ئەو کەرتەی ئەوان ناوی کەرتی شەهید سیروان بوو کە محەمەد ئەحمەد ڕەحمان (محەمەد کەلارە یان محەمەد ئاڵتوونچی) بەرپرسی بوو.

پاش ماوەیەک پەیوەندییەکەیم بۆ لای خۆم و بۆ کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن گواستەوە.

لوقمان لە سەرەتادا بەرپرسی سێ شانەی دووکەسی بوو، بەناوی: جەنگی حاجی غەفوور، سیروان عەزیز فەلامەرز (سیروان دیسکۆ)، حەمید عومەر کاکەڕەش. حەمید خەڵکی گوندی گوڵمکەوە و پوورزای ئێمە بوو، خوێندکاری ئامادەیی سەورە بوو لە شاری کەرکووک.

ئەوەی شایانی باسە، ئەم سێ هاوڕێیە هەر لە لایەن خودی 'لوقمان'ەوە ڕێک خرابوون و سێ شانەی فەردییان پێک هێنا بوو.

لەدوای شاڵاوی گرتنەکان بۆسەر کۆمیتەی ئاگر، لوقمان بووە بەرپرسی خەتێکی دیکەی ڕێکخستن کە بەو هۆیەوە پچڕابوونەوە و پێک هاتبوو لە تەیب تەلانی (تەیب عەزەدین سادق) و پێنج هاوڕێی دیکە.

**تەیب تەلانی (تەیب عەزەدین سادق):**

تەیب تەلانی کە ئەو دەمە ناوە نهێنییەکەی 'سمکۆ' بوو، یەکێک بوو لەو هاوڕێیانەی پچڕابووەوە و بە نامەیەک ناو و ناونیشانی گەیشتە دەستی ئێمە و پاشان پەیوەندییەکەیمان بۆ پێک هێنایەوە.

تەیب یەکێک بوو لە ئەندامە بزێوەکانی ڕێکخستن و سەرەتا پەیوەندی بە کۆمیتەی ئاگرەوە دەبێت و پاشان دەپچڕێتەوە و دوای ئەوە پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی دەرەوە دەکات و لە هەندێک دەوران لەیەک کاتدا پەیوەندی بە چەند جێگاوە دەبێت. بۆ نموونە فەترەیەک بێجگە لەوەی پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی

دەرەوە دەبێت و لەگەڵ تیپەکانی دەرەوە کاری پێشمەرگانەی نێوشاریش دەکات، هەر لە ڕێکخراوی کەرکووک پەیوەندیی بە دوو لای جیاواز و بە دوو هاوڕێوە دەبێت، کە یەکێکیان لوقمان عەزیز ڕەشید و ئەوەی تریان ئیبراهیم نوورەدین نەسرەت (پۆلا) دەبن. بۆیە ئێستا نازانم، کاتێک ناو و ناونیشانیمان بۆ هات، کێمان لەو دوو هاوڕێیە ڕاسپاردووە کە پەیوەندی پێوە بکات. دیارە لەو خەتەی لای ئیبراهیمەوە و پاش ماوەیەک پەیوەندییەکەی بۆ لای محەمەد خەیروڵا ئەمین دەگوێزرێتەوە. لە هەمان کاتدا پەیوەندی بە 'لوقمان'ەوە دەبێت و لوقمانیش پەیوەندی بە منەوە دەبێت. بێگومان ئێمە وەکوو ڕێکخراوی کەرکووک، وە یان دروستتر من وەکوو بەرپرسی ئەو کەرتە و ئەو خەتانە، ئاگام لەو هەموو پەیوەندییانەی تەیب نەبووە کە بۆخۆی هەڵەیەکی گەورەیە و جێگای مەترسیین. بە تایبەتی تەیب ئەرکێکی دیکەیشی لەسەر بوو، ئەویش بەرپرسی پۆستی ڕێکخراوی کەرکووک بوو، لە ڕێگەی 'لوقمان'وە. چونکە ئەو کارەی ئەو پڕ مەترسیترین کارەکانی ڕێکخستن بووە و هەمیشە لەبەردەم ئەگەری ئاشکرابوون و گرتندا بووە. بۆیە دەبووایە نەک هەر ئەو هەموو پەیوەندییەی نەبووایە، بەڵکوو دەبوو زۆر بەنهێنی و ئاگاداریشەوە جووڵە بکات. پێویستە لێرەدا باسی ئەوەش بکەم، پەیوەندیبوون لە چەند لاوە بەو شێوەیەی تەیب هەیبووە دەگمەنە و من بۆخۆم لە کاتی خۆیدا نەک هەر نەمبینیوە و نەمبیستووە، بەڵکوو تەنانەت وێناشم نەکردووە.

هەر وەکوو وتم، تەیب کاری بەریدی ڕێکخراوی کەرکووکی دەکرد و لەو نێوانەدا تووشی ڕووداوی زۆر ترسناک و سەیر هاتووە.

تەیب کەسێکی زۆر بوێر و گورجوگۆڵ و بەدەستوبرد بوو، باکی نەک هەر لە هیچ نەبوو، بەڵکوو ترسی هەر نەدەناسی.

تەیب سەرباری کاری بەرید، بەرپرسی خەتێکی ڕێکخستنیش بوو، بەم ناوانەوە:

کاکەمەد کاکەڕەش قەساب، باهیرعەبدوڵا جەعفەر (شێخ باهیر)، سەلام فازڵ سادق (ئاسۆ)، جەمال عەزەدین (شوان ئاوارە)، لوقمان محەمەد کەریم.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بکەم، بۆ کەسێکی وەکوو تەیب کە بەرپرسی پۆستی ڕێکخستن بووە، نەدەبوو هیچ شانە و خەتێکی پێوە بووایە، ئەگەرچی کاتێک پەیوەندی بە ئێمەوە کرد، ئەو شانانەی هەر پێوە بوو.

## مەریوان چیمەنی (عوسمان غەفوور محێدین)

سالّی ۱۹۷۹ بوو، ئەسعەد باسی ئەوەی کرد، کەسێکم پێ دەناسێنێ، تا هاورێیەتی بکەم و بیخەمە نێو ئەڵقە رۆشنبیرییەکان و پاشان لە "کۆمەڵە"دا رێکی بخەم. منیش رەزامەندیم دەربڕی و لەسەر ئەوە رێکەوتین کە فلانە رۆژ لەگەڵ ئەو هاورێیە لە باخچەکەی خوار ماڵی ئێمە چاوەڕێ بن، منیش بچم بۆ ئەوێ و بچم بۆ لایان، بە جۆرێک کە لەلای ئەو هاورێیە وا دەربکەوێت، من هەر بە رێکەوت بۆ ئەوێ چوومە و ئەوانم بینیوە. ئیدی من لە وەختی خۆیدا بۆ ئەو باخچەیە چووم و بەپێی ئەو نەخشەیەی کە دامانابوو، چووم بۆ لایان و ئەسعەد "عوسمان"ی پێم ناساند.

عوسمان بە رەچەڵەک چیمەنی بوو، لە شاری کەرکووک دادەنیشت، کرێکار بوو، ئیشی لیفەدووری دەکرد، ئەو دەمە تەمەنی هەر وا خۆی لە ۱۷ ساڵان دەدا، خوێندەواری هەبوو، کەسێکی وریا و خاوەن نەزەر بوو، لەگەڵ مارف لیفەدوور (وریا سوور) پێکەوە کاریان کردووە و شوێنی کارەکەی نێوەندی پەیوەندیی هاورێیانی کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان بووە، حەمید مەحموود محەمەد (مام بێستوون عەسکەری)، حەمید محەمەد ئەمین مراد کەرکووکی (پشتیوان)، کە لە گوندی مامرەش گیانی بەخت کرد، حوسێن ئەحمەد لەرزانە و سالار بۆگدی هاموشۆی ئەوێیان کردووە و لە کاتی قسەوباس و گفتوگۆی ئەم کۆمەڵە خەڵکە، گوێبیستیان بووە و ئاشنایەتی بە بیری سیاسی، چەپ، مارکسی و کۆمەڵە پەیدا کردووە.

پاش چەند مانگێک ئەسعەد، عوسمانی بۆ کۆمەڵە موفاتەحە کرد و یەکسەریش دایە لای من و منی کردە بەرپرسی. ئەم کارەی "ئەسعەد"م زۆر پێ ناخۆش بوو، چونکە ئێمە وا رێکەوتبووین کە من رێکی بخەم! پاشان لە رووی نهێنیکارییەوە، ئەو کارە نادروستە و ئەو بەخۆڕایی و بەبێ ئەوەی پێویست بکات، ناسنامە و پەیوەندیی رێکخراوەیی خۆی لە لای عوسمان ئاشکرا کرد. دیارە ئەو هەڵانە لە رۆژانی ئاسایی دەرناکەون، بەڵام لە رۆژانی تەنگانە و ئاشکرابوون و راوەدوونانی خەباتکاران، کۆڵێکی قورس و بارێکی گرانە و ئەبێتە تەوق بە ملتەوە.

بە هەر حاڵ! عوسمان بووە ئەندامی کۆمەڵە و پەیوەندی بە منەوە هەبوو. دێتەوە بیرم، ئەو دەمەی من لە زانکۆی سلێمانی بووم، عوسمان لەگەڵ "مەدحەت"ی

برای ئیشی دەکرد و دوکانی لیفەدوورییەکەیان لە گەڕەکی ئازادی بوو. دیارە ئێمە ئێوارەی ڕۆژی پێنجشەممە لە سلێمانییەوە بۆ کەرکووک دەگەڕاینەوە و بۆ ڕۆژی دوای ئەوە، واتە لە ڕۆژی هەینیدا، خۆم دەشۆری و بەهۆی ئەوەی قژەکەم هێشتا هەر شێی هەبوو، وە ئەو دەمە دەستگای قژوشکردنەوە نەبوو، خوترەیەکم بە وێنەی لەچک لە سەر و ملم دەئالآند و دەچووم بۆ لای عوسمان. لەبەر ئەوەی مەدحەت گومانی ئەوەی لە من کردبوو، من کابرایەکی تەنزیمیم و ترسی تووشبوونی عوسمانی برا بچووکی هەبوو، پێی خۆش نەبوو من هاتوچۆی ئەوێ بکەم و حەزی بە چارەی ئێمەمانان نەدەکرد. منیش کە دەمزانی ئەو بەو گرژ و مۆنییەوە سەیرم دەکات، ئیدی نەئەچوومە ژوورەوە و هەر لە بەردەم دوکانەکە وەختی کۆبوونەوەکەم بە عوسمان دەوت و دەڕۆییشتم. ئەویش لەودیو دوکانەکەوە گوێی هەڵئەخست، بەڵکوو شتێک بژنەوێ، ئیتر لەدوای ڕۆییشتنی من لەگەڵ عوسمان ئەیکردە شەڕ و هەرا و پێی ئەوت، ئەمە بۆچی دێت بۆلات، ئەوە چی پێت وت، ئەوە بۆ وای وت ...؟ ئیتر چوونەکانم خێری پێوە نەبوو و لەدوای خۆم شەڕێکم بۆ عوسمان بەجێ دەهێشت!

جارێکیان ئەسعەد بۆ ئەو دوکانە و بۆ سەردانییان ئەچێت، ئەو بەهۆی کاری لیفەدوورییەوە بێجگە لە عوسمان مەدحەتیشی دەناسی، چەند دەقیقەیەکی پێ ناچێت، مەفرەزەیەکی ئەمن هەڵئەکوتێتە سەریان، دووان لەوانە خۆیان بە دوکانەکەدا ئەکەن، یەکێکیان پرسیاری نرخی لیفە لە عوسمان ئەکات و ئەوی دی داوای ناسنامە لە ئەسعەد دەکات. پاشان ئەسعەد دەگرن و لەگەڵ خۆیاندا ئەیبەن. ئەسعەد چونکە هەمیشە ڕیشێکی گەورەی بەردابووەوە، جێگای سەرنج و گومان بوو.دەمودەست عوسمان بۆماڵمان هات و هەواڵەکەی پێم گەیاند. ئیدی هەتا درەنگانێکی شەو ئەسعەد لەلای خۆیان لە دائیرەی ئەمن گل ئەدەنەوە و ئازاری ئەدەن، پاشان ئازادی دەکەن.

عوسمان پەیوەندییەکەی لەگەڵ مندا هەر مایەوە، هەتا ئەو دەمەی بووە سەرباز و پاش ماوەیەک بڕیاری دا کە بچێتە دەرەوە و ببێتە پێشمەرگە.

لە ڕێکەوتی ١٩٨١/٧/٢١دا ئەسعەد، عوسمانی گەیاندە چەمی ڕەزان و نێو پێشمەرگە و پارتیزانەکان، ئیتر خەباتی ژێرزەمینی عوسمان و فسکەفسکی بەردەم دوکانی لیفەدوورییەکە و شەڕفرۆشتنی مەدحەت و ئیحراجی من تەواو بوو، سەرەنجامیش مەزەندەکەی "مەدحەت"یش ڕاست دەرچوو.

# ئەسعەد و من و زانکۆ

ئەسعەد و من پۆلی پێنجەمی ئامادەییمان لە سانەویی ئیمام قاسم تەواو کرد، بەڵام ئەم خوێندنگایە پۆلی شەشەمی ئامادەیی نەبوو، بۆیە دەبوو بۆ بەردەوامیی خوێندن بۆ ئامادەیی عەبدولمەلیک بن مەروان بچین. ئەم خوێندنگایە پێشووتر نێوی ئامادەیی کوردستان بوو، بەڵام لە درێژەی سیاسەتی بەعەرەبکردندا نێوەکەیان وەکوو گەلێک نێوی تری خوێندنگا و گەڕەک و شەقام و تەنانەت دوکانەکانیش گۆڕی. ئەبێ لێرەدا ئەوەش بڵێم، ئەم سیاسەتە تەنها کوردی نەگرتەوە، بەڵکە نەتەوەکانی تریشی گرتەوە، وەلێ ڕۆشنە، بەشی شێر بەر کورد کەوت. من دێتەوە بیرم لە دوکانێکی بەرگدروو جاروبار پانتۆڵم ئەدایە دووریـن، دوکانەکە نێوی بەرگدرووی ئارارات بوو، خاوەنەکەی تورکمان بوو، لە کاتی پرۆسەی بەعەرەبکردنی شاری کەرکووک، ناوی ئەم دوکانەشیان گۆڕی، چونکە ئارارات نێوی چیایەک بوو لە تورکیا.

لە پۆلی شەشەمی ئامادەیی دەستمان کردە خوێندن، پرۆگرامی خوێندنمان چڕ و پڕ و فراوان و زۆر و قورس بوو، ساڵێکی چارەنووسسازیش بوو، لەو ساڵەدا کۆبوونەوەکانمان کەم کردبووە و تەواوی وەختمان بۆ خوێندن تەرخان کردبوو. ئەسعەد و من هەردووک لە خوێندنی مەکتەب زیرەک بووین و بایەخی زۆرمان بە خوێندن ئەدا و بیرمان لەوە دەکردەوە نمرەی کۆلێجی پزیشکی بەدەست بهێنین و ببینە پزیشک، نەک بۆ ئەوەی قات و قەرەوێت لەبەر بکەین و بۆنی خۆش لە خۆ بدەین و نەخۆشەکانی بیمارستان بە بیستنی جیکەی پێڵاوەکانمان گوێقوڵاخ بن! نەخێر! بیرمان لەوە دەکردەوە هەر لەدوای تەواوکردنی خوێندن بچین لە دۆڵێک، لە ئەشکەوتێک، یان لە گەڕی پێشمەرگانە، بە جلی خاکی و بۆنی ئارەقی ڕێگاوە، تیماری برین و نەخۆشیی پێشمەرگە و خەڵکی هەژار و نەداری گوند و ئاواییەکان بکەین!

ساڵ هات و ساڵ ڕۆی، زۆرمان خۆ هیلاک کرد، وەلێ بەداخەوە نە من و نە ئەسعەد ئەو نمرەیەمان نەهێنا، کە مەبەستمان بوو. نمرەکەی ئەسعەد لەوی من بەرزتر بوو، بەڵام چونکە تەنها کۆلێجی پزیشکی لە فۆرمەکەدا پڕ کردبووەوە، نەک ناوی لە کۆلێجی پزیشکی، بەڵکە لە هیچ جێگایەک دەرنەچوو! من دەرسێکم هێشتبووەوە، نمرەکانی تر لە ڕێک چاوەڕوانی خۆمدا نەبوون و بەڕاستیش کەمتر

بوون لە ئاستی فیعلی خۆم، دوودڵ بووم، ئەو ساڵە بهێڵمەوە و پۆلی شەش دووبارە بکەمەوە، یان نا! سەرەنجام هەڵەم کرد و خۆم نەهێشتەوە.

ناوەکان بۆ زانکۆ و کۆلێجەکان دەرچوون، ئەسعەد و من لە کەرکووکەوە چووین بۆ سلێمانی، ناوەکانمان بە دیواری زانکۆوە هەڵواسرابوون، حەشاماتێکی زۆری لێ بوو، هەموو لە بارێکی دەروونی ناخۆشدا بووین، ڕۆژێکی چارەنووسسازە، ئاخۆ لە کوێ ناومان دەرچووبێت؟!

من ناوی خۆمم دۆزییەوە و لە کۆلێجی زانستەکان بەشی فیزیا ناوم دەرچوو، هەرچی ئەسعەد بوو، هەر وەکوو باسم کرد، ناوی لە هیچ شوێنێک دەرنەچووبوو! ئەو ڕۆژە زۆر دڵتەنگ بووین ... ئەسعەد مافی ئەوەی هەبوو جارێکی تر داوا بکات و فۆرم پڕ بکاتەوە، ئەگەرچی ئەو کۆلێجی زانستیی بەشی جیۆلۆجی وەری ئەگرت، بەڵام لە خۆشی من فیزیای نووسی و لە فیزیا وەرگیرا.

بەڵێ هەردووک بووینە خوێندکاری فیزیا، وەلێ ئەوەی بۆمان گرنگ و جێبایەخ نەبوو، خوێندن بوو، ئەسعەد لە من خراپتر و گەلێک جار نەک هەر بۆ موحازەرەکان نەدەهات، بەڵکە بۆ تاقیکردنەوەکانیش نەدەهات!

ساڵی یەکەم ناوم لە بەشی ناوخۆیی لە جێگایەک دەرچوو، کە پێشتر ئینحیساری تووتن بوو، کەوتبووە پشت تەلاری "حەسیب ساڵح"ەوە. لە ژوورێکدا بووم نۆ قەرەوێڵەی دووقاتی تێدا بوو، واتە، هەژدە کەس لە ژوورێکدا، هەموو جۆرە نەتەوە و ئایین و ئایینزایەکی تێدا بوو. سێ برادەری تەوێڵەییم لەگەڵدا بوو، هەر یەکەیان سەر بە حیزبێک بوو، بەرزان: یەکێتی، سۆران: پارتی، موعتەسەم: شیووعی، جاری وا هەبوو موناقەشەی توندیان لەگەڵ یەکتری دەکرد، من هیچیان لێ حاڵی نەدەبووم، بەڵام زووزوو دەیانگوت: تەلاقم کەوتبێ! بەرزان لە خولی یەکەمدا بووە ئەندام پەرلەمان، سۆران بووە پێشمەرگەی پارتی و گیانی لەدەست دا، موعتەسەم بووە پێشمەرگەی حیزبی شیووعی و دوایی چووە دەرەوەی وڵات.

هەرچی ئەسعەد بوو، بە هۆی کێشەی وەرگرتنەکەیەوە، ناوی درەنگ هاتەوە و لە بەشە ناوخۆییەکی دیکەش ناوی دەرچوو، بەڵام بۆ قۆناغی دووەمی خوێندن بە یەکەوە بووین و لە یەک بەشی ناوخۆیی و ژووردا بووین.

ئەم بەشە ناوخۆییە کەوتبووە سەر بازاڕی عەسری و لە هەمبەر کتێبخانەی گەلاوێژ و لە سێگۆشەیەکدا کە پێشمان جادەی سالم، پشتمان جادەی مەولەوی و سەری سێگۆشەکەش سەیری سەرای دەکرد. دەرگای بەشە ناوخۆییەکەمان لەگەڵ

کتێبخانەکەدا تەنها جادەکەی نێوان بوو. منی سەوداسەری کتێب گەلێک جاران بۆ ئەو کتێبخانەیە ئەچووم و بە سەعات کتێبم هەڵگێڕ و داگێڕ دەکرد و بە وێنەی هەنگ بە شوێن شیلەی کتێبەوە بووم. ئەو دەمە ئەگەرچی کتێبە مارکسییەکان یاساغ کرابوون، وەلێ لەو کتێبخانەیەدا هەر هەبوون و لەپشتەوە و کەمێک دوور لە چاوان دانرابوون. ئەگەرچی بابەتی کتێبەکان قولابی چاوەکانمی لە خۆی گیر دەکرد، وەلێ ناوبەناویش دەبوو ئاگام لە دەوروبەرەکەشم بێت و بزانم کەسێکی جێگومان لە نزیکم نییە و نەکەوتوومەتە ژێر چاودێرییەوە. پێم وابێ، خاوەنی ئەو کتێبخانەیە کۆنە شیووعی بوو، ناوەکەیم لە یاد نەماوە.

هەر لەو ساڵەدا و لەو سەردانانەمدا بۆ ئەوێ، کتێبی سەرمایەی "کارل مارکس"م پێشچاو کەوت، نرخەکەی ٩ دینار بوو، ئەو پارەیە بۆ ئەو دەمە گەلێک زۆر بوو، بەڵام هەر کڕیم. ئەو دەمە لە زانکۆوە ٣٠ دینار و لەماڵەوەش ١٠ دینارم بۆ دەهات، هەرچیم دەکرد، هەر تەواو نەدەبوو، برادەری وا هەبوو، باری دارایی ماڵەوەیان باش نەبوو، بەو پارەیەی کە لە زانکۆ پێی دەدرا، کۆمەکی ماڵەوەیشی دەکرد.

بۆ ئەوەی بزانین هێزی ٩ دینار لەو دەمەدا چەند بوو، با بەهای هەندێک شتۆکەی ئەو دەمەتان بۆ باس بکەم: بەیانیان زوو لە خەو ڕادەبووین و هەر بەپێ بەنێو بازاڕ و بەرەو مزگەوتی گەورە و پاشان لەوێوە بەرەو ژوور هەڵدەکشاین و دەگەیشتینە زانکۆ. ئەم ڕێگایە دوور نەبوو، پێم وابێت هەر وا دەوری کیلۆمەترێک دەبوو. ئەو جا بۆ چێشتخانەی نێو زانکۆ دەچووین و بە ڕیزێکی دووروودرێژی مارمارۆکەیی دەگەیشتینە پێشەوە و نیسکێنەیەکمان بە ٥٠ فلس واتە، یەک درهەم دەکڕی. ئەو دەمە دەنگۆی ئەوە هەبوو، ئەو نیسکێنەیە مادەی کافووری تێ کراوە، تاوەکوو ئارەزووی سێکسی مرۆڤ سست بکات! ئەگەر ئارەزووی نیسکێنەشمان نەکردایە، ئەوا دوکانێکی قەیماغفرۆش هەر لەسەر ڕێگەکەمان بوو، ڕێک لە تەنیشت چێشتخانەکەی عەلییە سوور و بەرامبەر بە سینەمای ڕەشید، لوولەیەک قەیماغ و قیچۆکەیەک هەنگوین و دوو چایی بە دوو سەموونی گەرمەوە بە ١٢٥ فلس. بۆ خواردنی ئێوارانیش هەر بەو دەستە و چەند هەنگاوێک بەولاتر، خۆمان بە کۆڵانی دەستەڕاستدا دەکرد، چێشتخانەی شارا چاوەڕێمان بوو. لێرەدا برنج و شلەیەکمان دەخوارد، جا باڵە مریشکێکیشی تێدابوو، بە ١٧٥ فلس. سەری هەفتەش کە بۆ کەرکووک دەگەڕاینەوە، بۆ کرێپاس ٣٠٠ فلسمان ئەدا. خۆ ئەگەر ئەو هەفتەیە بۆ

کەرکووک نەگەڕاینایەتەوە، ئەوا بۆ خواردنی بریانی بۆ چێشتخانەی جەمال، بۆ خواردنی یاپراخ بۆ چێشتخانەی میران و بۆ خواردنی کەبابیش بۆ کەباب بەکر دەچووین. ڕاستییەکەی نرخی ئەوانەم لە یاد نەماوە، بەڵام دەزانم لە نرخی فەسڵێکی سەرمایە زێتر نەبوون!

بە هەر حاڵ، کتێبی "سەرمایە"م کڕی و بە دوو قەڵەمباز خۆم گەیاندەوە بەشی نێوخۆیی و ئەوجا لەمسەر بۆ ئەوسەر چاوێکی خێرام پێیاندا خشاند و پاشان لە دۆڵابەکەم نا. ئەم کتێبە گەلێک وەرگێڕانی هەبوو، ئەوەی من لە وەرگێڕانی محەمەد عیتانی بوو، وەلی دەگوترا، وەرگێڕانەکەی "خانەی پێشکەوتن"ی مۆسکۆ لەوانی دی چاترە. ئەم وەرگێڕانەی کە من بوومە خاوەنی، پێنج کتێبی ئەستوور بوون و تەجلید کرابوون، هەر یەکە لەوانەش، دەنێو خۆیاندا لە دوو کتێب پێک هاتبوون.

سەری هەفتە وەرگەڕا و خۆم کۆ کردەوە کە بۆ کەرکووک بگەڕێمەوە. ئەو جارەیان تەنها بووم و هاوڕێم تەنها کتێبەکانی سەرمایەی کارل مارکس بوو، هاوڕێ چ هاوڕێ؟! نەک هەر هاودەنگی نییە بۆ من، بگرە ئەشێ لە کونی ڕەشیشم توند کات و ئەشکەنجە بە نسیبی خۆم و ماڵوێرانی بە نسیبی کەسوکارەکەمدا بکات.

کتێبەکانم خستە کیسە نایلۆنێکەوە، سەربەتاکە و دیارە کە ئەوانە کتێبن. ئەو دەمە لە نێوان کەرکووک و سلێمانی بێجگە لە سەیارەی فۆرت، پۆڵۆنی و پاسی ١٨ نەفەری، پاسی مەسڵەحەش هەبوو. بۆ پشکنین و لێکۆڵینەوە پاسی مەسڵەحە باشتر بوو، چونکە ئەوانی تر هەموو دەبوو دابەزییتایە و یەک یەک سەیری کەلوپەلەکانتیان دەکرد و پرسیاریان لێت دەکرد و سەردەکەوتی. بەڵام هەرچی پاسی مەسڵەحەکە بوو، هەر لەنێو پاسەکە و لە شوێنی خۆت لێکۆڵینەوەیان لەگەڵتدا دەکرد.

بە پاسی مەسڵەحە بەرەو کەرکووک بەڕێ کەوتم، ڕێگای نێوان سلێمانی-کەرکووک سێ بازگەی پیسی لەسەر بوو، بەڵام ئەوەی کەرکووک لە هەمووی پیستر بوو. کتێبەکانم لە بەردەم خۆم داناوە، تەنها لە بازگەی بانی مەقان نەبێت، لەوانی دی پرسیاریان لێم نەکرد. لە بازگەی بانی مەقان باش بوو ئینزیباتێک نەک ئاساییش هاتە سەرەوە، داوای پێناسەی لێم کرد، پێناسەکەم پێی دا، سەیری کرد و دایەوە دەستم، پاشان دەستی بۆ کیسەکەی بەردەمم درێژ کرد و وتی ئەوە چییە؟ وتم: ئەوە کتێبە، ئیتر هیچی دیکەی نەگوت و لێم تێپەڕی ...

# ستالین و من و ئەسعەد

هەر هەمــان ســاڵ، ســاڵی دووەمــی خوێنــدن (١٩٨٠-١٩٨١)مــان لە زانکــۆ، لە کتێبخــانەیەکی تەنیشــت ئۆرزدیبــاکی شــاری ســلێمانی دوو کتێــبم کــڕی، یەکێکیــان کتێبێکــی پلێخــانۆڤ (گیــۆرگی ڤــالێنتینۆڤیش) و ئەوی دیکەیــان کتێبێــک بــوو لەســەر ژیاننامە و بیۆگرافی جۆزێف ستالین. کتێبێکی قەبە و ئەستوور، وێنەیەکی گەورە و زەقی ســتالین بە جووتێــک ســمێڵی بــابڕەوە بەســەرەوە بــوو، چمکــی ســمێڵەکانی بە جۆرێــک لــوولی خواردبــوو، هێنــابوویەوە ســەر یەک تەڵ. ئەمــانە و کۆمەڵێــک کتێبــی دیکەشــم هەر لەو مــاوەیەدا کڕیبــوون، بەنیــاز بــووم لەم ســەری هەفــتەیەدا لەگەڵ خۆمیان ببەمەوە.

ئەم جارەیان هەر خۆم و کتێب نەبووین، لەگەڵ ئەسعەد قەرار بوو پێکەوە بۆ کەرکووک بگەڕێینەوە. خۆمان کۆ کردەوە و لە بەشــی نــاوخۆییەوە بەرەو گەراجــی کەرکووک بەپێ بەڕێ کەوتین. ئەو دەمە گەراجی کەرکووک هێندە لێمانەوە دوور نەبوو، کەوتبــووە ســەرووی مزگەوتــی گەورە و لە پشــت تەلاری دادگــای ئەو دەمە بوو. جانتاکەی من بەهۆی کتێبەکانەوە گەلێک قورس بوو، دوای ئەوەی گەییشــتینە نیوەی ڕێگا، ئەسعەد هەستی بەوە کرد و زۆری لێم کرد کە دەبێت جانتــاکەی مــن هەڵبگرێ. بە هەر حــاڵ ئەو جانتــاکەی خۆی دایە مــن و منــیش ئەوەی خــۆمم پــێ دا، بەدەم قســـەکردنەوە ڕۆییشـــتین هەتـــا گەییشـــتینە نێـــو گەراج، لە بیـــرم نیـــیە بـــۆ دەستبەئاوگەیاندن بوو یان بۆچی بــوو، بــۆ تۆزێــک لێــی دوور کەوتمەوە، کاتێــک کە گەڕامەوە بینیم دوو ئینزیبات لێی ئاڵاون و جانتاکەیان داپشکاندووە و دەیگەڕێن. کاتێک ئەسعەد منی بینی بەرەوە لای ئەو ئەچم، ئیشارەتێکی بۆم کرد کە بۆلای نەچم. ئیدی منیش لێی نزیک بوومەوە، وەلی وام دەرنەخست کە پێکەوەین و یەکدی دەناسین. کتێبەکانیان یەک لەدوای یەک سەیر کرد، کاتێک کە گەییشتە کتێبەکەی ستالین، کێشەکە قووڵ بووەوە، دەستیان کردە پرسیار و لێکۆڵینەوە و پێیان گوت:

تۆ نازانی ئەم کتێبانە یاساغن!

ئەویش لە وەڵامدا وتی: نەخێر من چوزانم، لە کتێبخانەکانی بازاڕ هەن و من لەوێ کڕیومن!

سەرەنجام وتیان: نەخێر وا نییە! نابێت تۆ ئەم کتێبانە بخوێنیتەوە، ئێستا ئەچین تەلەفۆن ئەکەین، بێن بۆ زیندانت ببەن!

یەکێک لە ئینزیباتەکان بەرەو بیرۆی گەراجەکە ڕۆییشت، گوایە ئەچێت تەلەفۆن ئەکات، پاش قەدەرێک گەڕایەوە و وتی، ئەوە تەلەفۆنم کرد، ئێستا دێن بۆ زیندانت ئەبەن! ئیدی جانتاکەیان هەڵگرت و کەمێک لەو جێگەیەی لێی وەستابووین، دووریان خستەوە و کەمێک سووڕیان دا. لەنێو قسە و پرسیارەکاندا ئەسعەد هەستی بەوە کردبوو، ئەمانە شیعە مەزهەبن، وتبووی:

سوێند بە عەلی و حوسێن من نەمزانیوە ئەم کتێبانە یاساغن!

هەر لەو کاتەدا بوو، ئۆتۆمبیلێکی شورتەی نەجدە خۆی بەنێو گەراجەکەدا کرد و بە ئەسپایی و بە بێهەستی لەو لاکەی تری گەراجەکەوە دەرچووە دەرەوە و ڕۆی. ئیدی من دڵنیا بووم کە نایانەوێت بەگرتی بدەن. دوای ئەوە بە ئەسعەدیان وتبوو، باشە بڕۆ کتێبەکان لە شوێنێک دابنێ، ئەوسا وەرەوە و سەفەری خۆت بکە.

ئەسعەد گەڕایەوە بۆ بەشی ناوخۆیی و کتێبەکانی دانا و گەڕایەوە بۆ لای من. منیش بێتاقەتیی خۆمم بۆی دەربڕی کە بەهۆی کتێبەکانی منەوە تووشی ئەو گێچەڵە بوو، بەڵام ئەوە بەلای ئەوەوە زۆر ئاسایی بوو، چونکە ڕێگایەک ئێمە گرتوومانەتە بەر، ئەشێ ڕۆژێک بێت لەسەر یەکتری تووشی ئازار و ئەشکەنجەی زۆر ببین و تەنانەت ژیانی خۆشمان لە پێناوی یەکتریدا دابنێین، کە سەرەنجام هەر واشی لێ هات.

دوای ئەوە سواری سەیارە بووین و پێکەوە بۆ کەرکووک گەڕاینەوە ...

# ژیانی ناوخۆیی بەشی ناوخۆیی

هەر وەکوو باسم کرد، ساڵی دووەمی خوێندن ئەسعەد و من لە ژوورێکدا بووین، دوو هاوڕێی تریشمان بە ناوەکانی: نوسرەت ئەبووبەکر نامیق و سەربەست لەگەڵدا بوون.

نوسرەت لەگەڵ ئێمە لە کۆلێجی زانستەکان و لە بەشی فیزیادا بوو، خەڵکی کەرکووک، گەڕەکی شۆڕیجە بوو. هاوینێکیان نوسرەت و من پراکتیک (تەتبیق)ێکمان بۆ ماوەی مانگێک لە ئۆفیسی کۆمپانیای نەوتی باکوور لە شاری کەرکووک و لە گەڕەکی عەرەفە لەسەر کۆمپیووتەر (بەرمەجە) کرد. ئەو دەمە کۆمپیووتەر وەک هەنووکە نەبوو، لە ئاستێکی سەرەتاییدا بوو، دەبوو بە دەست لەسەر کارتی تایبەتی، هاوکێشەکان بنووسین، پێیان دەگوت زمانی فۆرتران. ئەو پراکتیکە لە کۆلێجەوە بۆمانیان دانابوو.

هاوڕێیەتی و تێکەڵیی نوسرەت و من زۆر بوو، ساڵێکیان قەرار بوو پێکەوە بۆ شاری ڕانیە بۆ لای حەوێز محەمەد ئەمین بچین، بەڵام من بۆم نەگونجا و نەڕۆییشتم. ئەو هەر خۆی بە تەنها ڕۆییشت و لەوێ لەگەڵ حەوێز و چەند هاوڕێیەکی دیکە گەشتێکی دەربەند ئەکەن. ئۆتۆمبیلەکەیان لەو ڕێگایە هەڵدەگەڕێ و نوسرەت گیان لەدەست ئەدات و ئەوانی تر بریندار و شەلوشیت دەبن. دوای ئەوە تەرمەکەی بۆ کەرکووک ئەهێننەوە، وەلێ ناونیشانی ماڵی نوسرەت نازانن و بە ناونیشان و بە چ حاڵێک ماڵی ئێمەیان دۆزیبووەوە. لە دەرگا درا، لەو کاتەدا من لە سەربان بووم، ئەو سەربانەی دەیڕوانییە کۆڵان، سەرێکم کێشا و چەند کەسێکم بەرچاو کەوت، یەکێکیانم ناسییەوە و چوومە دەرەوە، وتیان حاڵ و مەسەلە ئاوها بووە! دەستیان بۆ سەر جادەکەش درێژ کرد و وتیان، ئەوەش تەرمەکەیەتی وا لەوێ ڕامان گرتووە! من تووشی شۆک بووم، کارەساتێکی زۆر دڵتەزێن بوو! ئاخر قەرار بوو، هاوسەفەری یەک بین! چۆن هەر وا کتوپڕ ئەمە ڕووی دا؟! پاشان وتیان، بەڵکوو لەگەڵماندا بێیت، بیبەینەوە.

نوسرەت، دایک و باوکی نەمابوو، هەر خۆی و برایەکی لە خۆی بچووکتری هەبوو، ناوی بەرزان بوو، خەریکی کاری لێفەدووری بوو، ماڵیان لە شۆڕیجە نزیک پردی سێ بوو، باپیری لەژیاندا مابوو، لە گوندی باوا دەژیا، جارێکیان لەگەڵ نوسرەت سەردانیمان کرد.

نوسرەت لەگەڵ "ئەسعەد"یش زۆر هاوڕێ بوو، نازانم پەیوەندیی ڕێکخستنیان هەبوو، وە یان نا. لە هاویناندا خەریکی ئیشی کاشی بوو، مرۆڤێکی ئیشکەر وەستایەکی دەستڕەنگین و سەرکەوتوو بوو. هەموو جارێک کە سواری سەیارە ببووینایە، زۆر حیسابی بۆ خۆی دەکرد و سەلامەترین شوێنی بۆخۆی هەڵدەبژارد.

هەرچی سەربەست بوو، لە دیانەکانی کۆیە بوو، سەر بە حیزبی شیووعیی عێراقی بوو، لە ساڵی ١٩٨٢ کاتێک کە بۆ سەردانی هاوڕێیانی زیندانیم بۆ ئەبووغرێب چووم، ئەویشم لەوێ بینی، زیندانی بوو.

ژوورێکی دیکە بە تەنیشتمانەوە بوو، چوار کەسی تێدا بوو: حیکمەت مامۆستا حەکیم، پێشتر باسم کردووە کە چۆن لە پۆلەکانی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی خۆی هاوپۆل و باوکیشی مامۆستامان بوو، خالید محەمەد فاتیح (سەمیر نووری)، تەحسین تاهیر جەبار ئەمین و حوسێن ستار ئەمین. من "حوسێن"م دەناسی و لە سانەویی ئیمام قاسم هاوپۆلی یەک بووین. حوسێن ئامۆزای باوکی تەحسین بوو، هەردووکیان خەڵکی گوندی تەپەلوو بوون.

لە ژوورێکی دیکەی ئەولامانەوە کەسێکی هەڵەبجەیی هەبوو، ناوی شێخ دارا بوو، لەگەڵ یەکێکی دیکە کە خەڵکی خانەقین بوو، ئەم دووانە زۆر بەخۆ و بەهەرەکەت بوون، پێکەوە ئێواران کە دنیا تاریک دادەهات، چاودێری ئەو خوێندکارانەیان دەکرد کە سەر بە یەکێتیی قوتابیانی بەعس بوون و خوێندکارانیان ئازار ئەدا، دەموچاوی خۆیان هەڵدەپێکا و لە پەنایەکدا دەیانگرتن و دارکارییان دەکردن. ئەم دووانە دیار بوو سەر بە ڕێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون و لەگەڵ ئەسعەد پەیوەندییان زۆر خۆش بوو.

له ژوورێکی دیکەی هەمان بەشی ناوخۆیی هاوڕێیەکی ترمان لەگەڵدا بوو، نێوی هەژار تاها (کاوانی) بوو، ئەمیش لە خوێندن هەر لەگەڵ ئێمەدا بوو، پاشان هەر لە ڕێگەی منەوە هاتە نێو ڕێکخستنەوە.

له ژوورێکی هەمان بەشی ناوخۆیی سێ هاوڕێی دیکە هەبوون، یەکێکیان ناوی ڕێدار بوو، خەڵکی هەولێر بوو، یەکێکی تریان ناوی عەبدوڵا حەسەن ئیسماعیل بوو، ئەمیش هەر هەولێری بوو، کاتێک لە ساڵی ١٩٨٢ سەردانی هاوڕێکانم لە زیندانی ئەبووغرێب کرد، ئەویش لەوێ زیندانی بوو.

عەبدوڵا سەربە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوو، لە شاڵاوێکی گرتن بۆ سەر ئەو ڕێکخراوە، ئەویش بەرکەوتبوو.

هاوڕێیەکی دیکەمان هەبوو ناوی سادق کەریم (ڕاستگۆ) بوو، بە بنەچە کەرکووکی بوو، بەڵام هەر لە بەغدا گەورە ببوو، ئەو ساڵە لە بەغداوە خۆی بۆ زانکۆی سلێمانی گواستبووەوە، ئەمیش هەر لە یەکێک لە ژوورەکانی ئەو بەشە ناوخۆییە بوو.

سادق پەیوەندی بە یەکێتیی خوێندکارانی کوردستانەوە هەبوو، کاتێک کە ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکاران بەر زەربە کەوت، لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێکانی شاری بەجێ هێشت و چووە دەرەوە، پاش چەند ساڵێک وازی هێنا و گەڕایەوە سەر خوێندن و پاشان لەگەڵ عەزەدین مەجید محەمەد (جەمال ئەیووب) و من ئەڵقەی ئۆکتۆبەرمان دامەزراند، کە یەکێک بوو لەو کۆمەڵە ئەڵقە و ڕێکخراوانەی نێو بزووتنەوەی چەپ و کۆمۆنیستیی ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو.

ئەم هاوڕێیانە و چەندانی دیکە لەو بەشە نێوخۆییە لەگەڵماندا بوون کە بۆ ئێمە و بۆ کاری سیاسی و ڕێکخراوەییمان زەمینەیەکی زۆر لەبار و گونجاو بوو، چونکە: یەکەم، بە شێوەیەکی گشتی ئێمە دەنێو ژینگەیەکی خاوێنی سیاسیدا بووین و ئەو خەڵکانە ئەگەر دڵگەرمی و ئامادەیی کاری سیاسیشیان نەبووایە، کەسانێکی دژی ڕژێم و بێوەی بوون و کاری تەبلیغی ئێمە لەو نێوەندەدا گەلێک بەسانایی و

بەبێ مەترسی دەچووە پێشەوە. دووەم، ئەو خەڵکانە لاو بوون و لە چاو کەسانی بەتەمەنتر و کامڵ زووتر و ئاسانتر دەخزانە نێو کاری سیاسی و ڕێکخراوەییەوە.

دێتەوە بیرم، جاروبار ئەسعەد لەگەڵ چەند هاوڕێیەکدا هەتا درەنگانێکی شەو دادەنیشتن و کتێبی "چەپکێک لە قسەکانی ماو"ی دادەنا و دەیخوێندەوە و موناقەشەی دەکرد.

جارێکیان ئەسعەد هەر لەنێو ئەو بەشە ناوخۆییەدا بڵاوکراوەی بڵاو کردەوە، دیارە ئەو ژوورانەی دیاری کردبوو کە دەیویست بڵاوکراوەکانی تێدا فڕێ بدات. بڵاوکراوەکە بە مانای تەواوی وشە، بڵاوکراوە نەبوو، بەڵکوو نووسینەوەی چەند درووشمێک و ناوی ڕێکخراوەکە بوو، واتە، زیاتر پڕۆپاگەندەکاری بوو.

کارەکانی ئێمە تەنها بەو دوو ژوورە و ئەو بەشە ناوخۆییەوە قەتیس نەمابوو، بەڵکە ئەو دوو ژوورە بە تەبیعەت ببووە ناوەند و مەکۆی کاری سیاسیمان و لە چەندین بەشی نێوخۆیی و بەشەکانی دیکەی خوێندنەوە بۆی دەهاتن و گەلێک جار قسەوباس و موناقەشەی سیاسی تێدا دەکرا.

ئەسعەد و من هەڵسەنگاندنێکمان بۆ ئەو هاوڕێیانە کرد و دوو کەسمان دانا، کە زیاتر لێیان نزیک ببینەوە و بۆ کاری ڕێکخستن لە بەرچاویان بگرین، ئەوانەش: تەحسین تاهیر جەبار و خالید محەمەد فاتیح (سەمیر نووری) بوون.

ئیدی بەو جۆرەی کە لەسەری ڕێک کەوتین، ئەو لە تەحسین نزیک بووە و سەرەنجام موفاتەحەی کرد، منیش لە خالید نزیک بوومەوە و سەرەنجام موفاتەحەم کرد و هەتا کاتی وازهێنانی هەر پەیوەندی بە منەوە هەبوو. ناوی نهێنی خالید، پۆلا بوو.

لە کاتی شاڵاوی گرتنەکان بۆسەر کۆمیتەی ئاگر و گیرانی ئەسعەد، تەحسین تاهیر کە پەیوەندی بە "ئەسعەد"ەوە دەبێت دەپچڕێتەوە. کاتێک ویستم ڕێکخستنەکان ساز بدەمەوە، نامەیەکم ئامادە کرد و ناونیشانی تەحسینم تێدا نووسی و دام بە خالید کە بچێت پەیوەندی بەو کەسەوە بکات کە ناوی لە نامەکەدا هاتووە. خالید بێجگە لەوەی لە بەشی ناوخۆیی لەگەڵ تەحسین پێکەوە بوون، خەڵکی ناوچەیەک و خزمی یەکتریش بوون. کاتێک خالید ئەچێتە لای تەحسین و

نامەکەی پێ ئەدات، تەحسین سەیری پێ دێت کە ئەو پەیوەندییە چۆن زانراوە و ئەکەوێتە گیرەگیرِ و پرسیارکردن ... سەرەنجام ئامادە نابێت، دووبارە پەیوەندی بکاتەوە واز دەهێنێ.

ئەگەرچی تەحسین ئامادە نەبوو، پەیوەندیمان لەگەڵدا بکاتەوە، بەڵام کەسێکی دڵسۆزی دەوروپشتی ئێمە بوو. لەو سەردەمانەدا زۆر جار و هەر جارەی بەهۆی بەرادەرێکەوە گەڕی ناوچە و گوندەکانی دەوروپشتی کەرکووکم دەکرد، لەوانە گوندەکانی: تەپەلوو، باوا و بناری گل و مەرزیخەی ناوچەی شێخ بزێنی و ... هتد. لەو گەڕانەدا و لەنێو کۆڕ و کۆمەڵی جووتیارانی گوندنشیندا کە بەهۆی هاوڕێکانمەوە شوێنی بڕوا و متمانەی من بوون، پڕۆپاگەندەم بۆ کۆمەڵە و بیروباوەڕەکەمان دەکرد.

بەهۆی تەحسینەوە چەندین جار چوومەتە گوندی تەپەلوو، لەگەڵ باوک و برا و ئامۆزاکانی بووینە ئاشنا و بەبێ ترس گفتوگۆم لەگەڵیاندا دەکرد.

دێتەوە بیرم، لەو دەورانەدا کەرتی چواری جەباری و مامە ڕیشە تازە لەو ناوچەیە سەریان هەڵدابوو، ترس و بیمێکی زۆریان خستبووە دڵی هێزەکانی ڕژێمەوە، بۆیە بەدوای چارەسەرێکدا دەگەڕان، تاوەکوو پێش بە کار و چالاکییەکانیان بگرن. بۆ ئەو مەبەستە دەستیان دایە چەکدارکردنی گوندنشینەکان و ڕاهێنانیان تاوەکوو هەر گوندە لە شوێن خۆیەوە ڕێگە لە پێشمەرگە بگرێت، بچێتە نێویەوە.

لەو کاتەدا بوو، چووم بۆ لای تەحسین و شەوێک لەماڵیان مامەوە. ئەو کاتە تازە چەکیان بەسەر گوندەکەیان و کەسوکارەی ئەمیشدا دابەش کردبوو. گفتوگۆ و مشتومڕێکی زۆرم لەگەڵیاندا کرد، من ئەمگوت: ئەگەر پێشمەرگە ویستیان بێنە نێو ئاواییەوە، نابێت ئێوە دەستیان لێ بکەنەوە ڕێگەیان لێ بگرن! ئەوانیش ئەیانگوت: ئاخر ئەو چەکە شەرەفی ئێمەیە و چۆن ڕێگە بدەین، هەر وابە سانایی بێن و چەکمان بکەن! ئەوە بێجگە لەوەی، سبەی ڕۆژ لە لایەن حوکمەتەوە، تووشی لێپێچینەوەش دەبین!بەڵام بە داخەوە، دوای ئەوە بە چەند ساڵێک بیستمەوە، مام تاهیر باوکی تەحسین بووە بە ئامرمەفرەزەی جاش خەفیفە و تەحسینی

هاوڕێشمان بووەتە هاوکاری. هەر وەکوو گوتم، بێجگە لەوەی ئەسعەد و من لەو بەشە ناوخۆییە کۆمەڵێک کەسمان ناسی، وەلێ کەسانێکی دیکەی زۆریش لە بەشە ناوخۆییەکانی دیکەوە بۆلامان دەهاتن و لەوێدا گەلێک قسەوباس دەکران و بۆ کاری سیاسیی ئێمە زەمینەیەکی گەورە و گونجاو بوو.

هەر لەو سەروبەندەدا بوو ئەسعەد، ئەنوەر حەمەمینی ناسی و لێی نزیک بووەوە و سەرەنجام هێنایە ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە.

ئەنوەر خوێندکاری کۆلێجی کشتوکاڵی و خەڵکی کەرکووک و گەڕەکی شۆڕیجە بوو، دواتر لەگەڵ ئەسعەد شانەیەکی چەکداریان پێک هێنابوو، لە کاتی چالاکییە سەربازییەکانی کۆمیتەی ئاگر، ئەمانیش پلانیان دانابوو، حەمە جەریدە لەنێو بەرن. هەردووکیان چووبوونە ئەو شوێنەی کە حەمە جەریدە بۆی دێت، وەلێ بەهۆی ئەوەی ئەو ڕۆژە حەمە بۆ ئەوێ نایات، کارەکەیان سەرناگرێت.

لە کاتی گرتنەکانی کۆمیتەی ئاگر، "ئەنوەر"یش دەگیرێ، بەڵام بەهۆی ئەوەی زانیاری کەمی لەسەر دەوترێت، بە زیندانی بیست ساڵ حوکم دەدرێت، ئەگەر بهاتبایە و ئەسعەد زانیاری کاری سەربازی لەسەر بدرکاندایە، ئەویش حوکمی ئیعدامی بۆ دەردەچوو.

من، "ئەنوەر"م دەناسی و زۆر هاوڕێم بوو، مرۆڤێکی زۆر میهرەبان و عاتیفی بوو، پەپوولەیەک بوو بۆخۆی، پیاوێک بوو لە پەشمەک، بەهیچ جۆرێک کاری سەربازی لەگەڵ ئەودا نەدەهاتەوە، پێم وانییە بیتوانیبا، پێ بە مێروولەیەکدا بنێ، بۆیە بە بڕوای من، ئەسعەد لەو هەڵبژاردنەیدا بە هەڵەدا چووبوو.

# تەحسین نامیق عەبدوڵا (هەردی)

تەحسین نامیق یەکێک بوو لەو هاوڕێیانەی لە بەشە ناوخۆییەکانی دیکەوە بۆ لای ئێمە دەهات و ئەو ساڵە من ئەوم لەوێ ناسی و هەر زوو بووینە هاوڕێی نزیک و جێمتمانەی یەک. سەرەنجام لەنێو ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی کۆمەڵەدا جێگای گـرت و پەیوەنـدیی سیاسـیی ئـێمە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ تونـدوتۆڵتر دەبـوو، قسەوباسـەکانمان تـایبەتتر دەبـوونەوە و هەتـا کـار گەییشـتە ئەوەی بـۆ کـۆمەڵە موفاتەحەی بکەم.

تەحسین مرۆڤێکی هێمن و لەسەرخۆ و خاوەن باوەڕ بوو، کەسێکی وریا و زیرەک بوو، بۆ پێگەیاندنی خۆی لە ڕووی تیۆرییەوە هەوڵی جددی ئەدا و خاوەن نەزەر بوو.

دوای ئەوەی تەحسین بووە ئەندامی کۆمەڵە بە چەند مانگێک، شاڵاوی گرتنەکان بـۆ سـەر کـۆمیتەی ئـاگر دەسـتی پـێ کـرد، ئەو خەتەی لای مـن بەرنەکەوت و "تەحسین"یش هەر پەیوەندی بە منەوە هەبوو.

لەدوای ئەوەی سـەرلەنوێ خۆمـان سـازدایەوە و ژمارەمـان زیـادی کـردەوە، لە زۆرێـک لەو ئـاڵوگۆڕە ڕێکخراوەییـانەی دەمـانکرد تەحسـین یەکێـک بـوو لەو هاوڕێیانەی بەرپرسیارێتی زیاترمان دەخستە ئەستۆ، هەر لە بەرپرسی شانە و پۆل و کەرتەوە، هەتـا گەییشـتنی بە ئەنـدامێتی کـۆمیتەی بـاڵای ڕێکخسـتنی شـار، یـانی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک.

کاتێک کە لە یەکێتی وازمان هێنا، تەحسین لەگەڵمان بوو، بەڵام ئەو دووبارە و لەدوای ڕاپەڕین جارێکی دیکە پەیوەندی دەکاتەوە.

تەحسـین لە یەکێـک لە کابینەکـانی حکـوومەتی کوردسـتان بریکـاری وەزیـری کشـتوکاڵ بـوو، ئێسـتاش بەرپرسـی پەیوەنـدییەکانی دەرەوەی یەکێتیـی نیشـتمانیی کوردستانە.

# خالید محەمەد فاتیح (سەمیر نووری)

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشووودا قسەم لەسەر کردووە، خالید یەکێک بوو لەو هاوڕێیانەی لەو بەشە ناوخۆییەی کە دەکەوتە سەر جادەی سالم و لەسەر بازاڕی عەسری بوو، یەکتریمان ناسی. ئەو ساڵە من لە قۆناغی دووەمی زانکۆ و ئەویش تازە لە کۆلێجی پزیشکی وەرگیرابوو. ژوورەکەمان بەتەنیشتی یەکترەوە بوو، هەر هەمـوو زۆر تـێکەڵاوی یەکتـری بـووین. خالیـد لەنێـو خێزانێکـی زەحمەتکـێش و گەرەکێکی زەحمەتکێشی وەک گەرەکی شۆڕیجە گەورە ببوو، لە تافی خۆیدا و لە گوندەکانی ناوچەی گەرمیان کاک محەمەدی باوکی هەڵسووڕاوێکی چالاکی حیزبی شیووعیی عێراقی بوو، هەتا سەر ئێسقان دژی ئاغا و بەگ و سەرمایەدار بوو، ئەم پێگە چینایەتییە وای کردبوو، خالید بەسانایی بیروباوەڕی ئێمە قبووڵ بکات.

لەگەڵ خالیـد زۆر زوو کەوتیـنە نێـو قسـەوباس و جەدەلەوە، دێـتەوە یـادم موناقەشـەکانمان لە سـەرەتادا لە مەسـەلەی دینەوە دەستی پێ کرد، چونکە بینیم خالید لەگەڵ خۆیدا بەرماڵێکی هێناوە و پێنج فەرزەی نوێژ ئەدا ئەکات، لەپاش دوو جـار موناقەشـە و بەس، ئەو بەرمـاڵەی بە جۆرێک پێچـایەوە، هەتـا هەنووکە و بۆ یەک جاری دی ڕای نەخستەوە.

خالیـد لە ژیـانی ڕێکخراوەییـدا کەسـێکی زۆر نهێنیکـار و بە دیسـیپلین بـوو، هەروەهـا جددی و هەڵسووڕاو بوو، بەتەواوی جێگەی متمـانەی من بوو، چەندین کەسی هێنـایە نێو ڕیزەکـانی ڕێکخستنەوە و منیش لە زۆرێک لەو نەخشـانەی بۆ ڕێکخسـتن دامانئەنـان، ئەوم لە بەرچـاو دەگرت. هەر بۆیە سـەرەنجام لە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووە بەرپرسی چەند شانەیەک و بەو پێیەش بووە ئەندامی پۆل و لە یەکێتیی خوێندکارانی کوردسـتانیش بـووە بەرپرسـی لقـی کەرکـووک و ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان.

خالیـد لە پـایزی سـاڵی ١٩٨٣دا کەوتە ژێـر کـاریگەریی یەکێتیـی تێکۆشـانی کارگەران و سەرەنجام وازی لە کۆمەڵە هێنـا، وەلێ لەنێو یەکێتیی خوێندکاراندا بۆ مـاوەیەک دوای ئەوەش هەر مـایەوە، بەو حیسـابەی ئەمیـان ڕێکخراوێکی پیشـەییە، ئەگەرچی سەربە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیشە.

خالید ئێستا لە وڵاتی کەنەدا دەژیت و سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی چەپی عێراقە.

# ئەسعەد و کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە

کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە ڕێکەوتی ١٩٨١/٥/٧ لە گوندی مالیمۆس بەسترا.

ئەم کۆنفرانسە ١٨٥ ئەندام کە نوێنەرایەتیی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەیان لە شار و شارۆچکە و ئۆردووگا و گوند و نێو هێزی پێشمەرگە و دەرەوەی وڵاتدا دەکرد، بەشدارییان تێدا کرد.[١٠١] لە ڕێکخستنەکانی کەرکووکەوە تەنها دوو کەس وەک نوێنەری ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر بەشدارییان تێدا کرد، ئەوانیش ئەسعەد عەزیز سۆفی و عومەر قادر عەلی بوون.[١٠٢]

ئەو دەمە ئەسعەد و من خوێندکاری زانکۆی سلێمانی بووین و لە بەشی ناوخۆیی خوێندکاران، لە یەک ژوورێکدا بووین.

---

١٠١. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپی سێیەم، ساڵی ١٩٩٨، ل ١٩٨.

١٠٢. گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد حەسەن خورشید (حەمەی سانییە) و فایەق عومەر ڕەسووڵ.

**تێبینی:** عومەر قادر عەلی لە گفتوگۆیەک لەگەڵ مندا باسی ئەوەی کرد کە لە شاری کەرکووکەوە خۆی و ئەسعەد عەزیز سۆفی بۆ کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە چوونە و خۆی وەکوو نوێنەری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک و "ئەسعەد"یش وەکوو نوێنەری "لقی کەرکووکی کۆمەڵەی خوێندکاران". هەروەها هەمان قسەی لە کتێبی "هەستنامەی زیندان، ئەمیرە محەمەد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٧، ل ٣٥١"دا دووبارە کردووەتەوە. بەڵام دوای گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد حەسەن خورشید و فایەق عومەر ڕەسوول، هەردووکیان جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەسعەد عەزیز سۆفی وەکوو نوێنەری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک بەشداریی کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەی کردووە. هەروەها فایەق عومەر ڕەسوول لە وەڵامی پرسیارێکدا: بۆچی ئەو پێنج ئەندامەی کۆمیتەی ئاگر، وە یان تۆ کە بەرپرسی ئەسعەد بوویت، وەکوو نوێنەری کۆمەڵە لە شاری کەرکووک بۆ کۆنفرانس نەچوون؟ وتی: چونکە بە هۆی وابەستەییمان بە ئیشوکار و دەوامەوە بۆ ئێمە گونجاو نەبوو، بەڵام بۆ ئەسعەد و عومەر گونجاو بوو، ئەوان هەردووکیان خوێندکاری زانکۆ بوون. هەروەها وتی: من خۆم ئەوانم وەکوو نوێنەری کۆنفرانس دیاری کرد.

پێویستە لێرەدا من چەند خاڵێکی دیکەش ڕۆشن بکەمەوە: یەکەم، کۆمەڵەی خوێندکاران لەو دەمەدا ناوی: "یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان" بوو، نەک "کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان".

دووەم، لە کۆنفرانسی کۆمەڵەدا، ئەگەر نوێنەری ڕێکخراوە پیشەییەکان بەشداری بکەن، ئەوا نوێنەری ڕێکخراوەکان بەشداری دەکەن، نەک نوێنەری لقەکانیان! بەڵام ئەشێت، ئەسعەد عەزیز سۆفی بێجگە لەوەی وەکوو نوێنەری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک بەشداری کردووە، وەکوو نوێنەری یەکێتیی خوێندکارانی کوردستانیش بەشداری کردبێت.(سالار ڕەشید)

لەو ڕۆژگارەدا ڕۆیشتن بۆ ئەو ناوچانە و گەیشتن بە شوێنی کۆنفرانس هەر وا سانا نەبوو. بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانس زیاتر لە هەفتەیەکت پێ دەچوو، ئەمە سەرباری زەحمەتیی ڕێگا و مەترسی و پێشهاتەکانی.

ئەو ماوەیە ئەسعەد لە دەوام و تاقیکردنەوەکان دابڕا، هەر وەکوو چۆن گەلێک جاری دیکەش بۆ دەوام و تاقیکردنەوەکان نەدەهات. لەڕاستیدا ئەسعەد ئەگەر بۆ دەوامیش بهاتبایە، ئەوا هەر بە جەستە لە کۆلێج و کلاسەکانیدا بوو، وەکوو تر، هەموو هزر و بیری ئەو لەلای کاری سیاسی و سەربازیی کۆمەڵە بوو، وە تەواوی ژیان و زیندەگی خۆی بۆ خەبات و تێکۆشان تەرخان کردبوو.

کۆنفرانس (یان هەندێک پێی دەڵێن: کۆنگرە) لە ژیانی سیاسیی حیزب و ڕێکخراوەکاندا گرنگیی خۆی هەیە، چونکە ئەوە کۆبوونەوەی نوێنەرانی گشت ڕێکخستنەکانە و هەر بڕیارێک کە لەوێدا دەدرێ، دەبێتە بڕیاری فەرمی و هەر سیاسەت و هێڵێکی فکری کە لەوێدا دادەڕێژرێن، ئیدی بۆ لەوەولا کاری پێ دەکرێت و ئەوانەی لەوێشدا هەڵدەبژێردرێن، دەبنە ڕابەر و بەڕێوەبەری ئەو ڕەوت و ڕێبازە.

کۆمەڵە هەر لە دامەزراندنییەوە تاوەکوو بەو ڕۆژە دەگات، بە گەلێک هەوراز و نشێودا تێپەڕیوە و لە ڕووی فکر و تێڕوانینیشەوە ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە. لە سەرەتای دامەزراندنییەوە هەتا دەگاتە گرتنی ڕابەرایەتیی ئەو ڕێکخراوە، یانی خاڵە شەهاب و هاوڕێکانی. پاشان هاتنە پێشەوەی کۆمیتەی هەریمەکان بە ڕابەرایەتیی ئارام و هاوڕێکانی و ئەو ئاڵوگۆڕەی بەسەر کۆمەڵەیاندا هێنا، هەتا بە هاتنەوەی نەوشیروان مستەفا و گیانلەدەستدانی ئارام دەگات.

لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٧٧دا سەرکردایەتیی کۆمەڵە لە برادۆست کۆبوونەوەیەک گرێ ئەدەن و نەوشیروان مستەفا دەکەنە ئەندامی کۆمەڵە و لە هەمان کاتدا ڕابەری خۆشیان.

ئەگەرچی ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان و هاوڕێیانی ئارام بۆ خۆیان ئەو داوایە لە نەوشیروان مستەفا دەکەن، بەڵام جێگیربوونی نەوشیروان مستەفا لە ترۆپکی تەلاری ڕێکخراوی کۆمەڵەدا، سەرەتای بەجێگەیاندنی نیاز و مەرامەکانی

جەلال-نەوشیروانە، یانی داشۆردنی کۆمەڵە لەو تۆزکۆکە ڕەنگە سووورە و لەو بڕە چەپـگەری و ڕادیکـاڵییەتەی کە پێـوەیەتی و سـەرەنجام حەلکردنـی کـۆمەڵە و تواندنەوەی لەنێو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا.

لەدوای ئەوە نـاوی کۆمەڵەیـان گـۆڕی و پاشـان گرووپـی زینـدان ئـازاد کـران و دووبارە لەسەرکردایەتیی کۆمەڵە جێگیر کرانەوە و نەوشـیروان مسـتەفاش بەهـۆی توانـا و پـڕ ئەزمـوونی خـۆی و بە پشـتیوانی تەواوی مـام جەلال و لەولاشـەوە هاوڕێیـانی ئـارام بەهـۆی ناڕۆشـنی و خۆشـخەیاڵی و بێتواناییـان لە ڕووی فکـر و سیاسەت و نووسینەوە، وردە وردە جێگە و ڕێگەیان لەبەرامبەر گرووپی زینـدان و نەوشـیروان مسـتەفادا لەق و لاواز ببـوو، هەر ئەوەنـدە مـابوو، بە کۆنفرانسـێک ئەو ئـاڵوگۆڕانە لە فکـر و تێـڕوانین و لە ئۆتـۆریتە و دەسـەڵات و هاوسـەنگی هێـز بە فەرمی بکەن و شەرعییەتی پێ بدەن.

کەواتە، کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە، کۆنفرانسی بە فەرمیکردن و بەشـەرعیکردنی سڕینەوەی تێڕوانینەکانی ئارام و لەکارخستنی دەسەڵات و جێگەوڕێگەی هاوڕێکانی و دوورخسـتنەوەی هەرچـی زیـاتری کـۆمەڵە بـوو لە ڕەنـگ و ڕووخسـاری مارکسیستی و چینایەتی و هەنگاوهەڵگرتن ڕووە و پووکاندنەوە و تواندنەوەی.

ئەسـعەد لە کۆنفرانس گەڕایەوە، شۆڕوشـەوقێکی لە ڕادەبەدەری کەوتبووە بەر و ئەوەندەی دی ئاکتیڤ و چالاک ببوو.

دیـار بـوو ئەسـعەد لەنێـو فەزای کـۆنفرانس و کێشـەی نێـوان هاوڕێیـانی ئـارام لەلایەک و نەوشـیروان مسـتەفا و گرووپـی زینـدان لە لاکەی دی، یـان بـا بڵێـین، "کێشەی نێوان کوردستانی و عێراقی"، ئەو بەلای کوردسـتانیدا لای دابوو، وە لەژێر کاریگەریی نەوشیروان مستەفادا بوو.

ئەتوانم بڵێم، ئەسـعەد هەتـا ئەو دەمەی پەتـی سـێدارەی لە مـل کـرا، هەر لەسـەر ئەو تێـڕوانینەی خـۆی مـایەوە، چـونکە دێـتەوە یـادم، یەکێـک لەو جـارانەی کە بـۆ دیـداری ئەو بـۆ بەشـی سـێدارەی زینـدانی مووسـڵ چـووم، باسـی کوردسـتانی و عێراقـی لەگەڵ منـدا هێنـایە پێشـەوە و نەزەری خـۆی بەو جـۆرە بەیـان کـرد: "عێراقچێتی سەرەتانە".

# ڕاگواستنی زانکۆ

ساڵی ١٩٨١ کە ئەیکردە ساڵی دووەمی خوێندنمان لە زانکۆ، گەلێک شەو پێشمەرگە خۆی بە شاردا ئەکرد و لە جێگایەکیان ئەدا، یان کەمینیان لەنێو شاردا دائەنا. شەوێکیان خۆیان بە شاردا کرد و بە قازیفە سەرایان داگرت، قرمەژنی گولە و زرمەی ئارپیجی گوێمانی کاس کرد. ئەو شەوە چەکدارێکی پێکراوی ڕژێم هەتا درەنگانێکی شەو لە پەنا دیواری بەشە ناوخۆییەکەی ئێمە هەر نرکە و ناڵە و زاڵەی بوو.

شەوێکی تر پێشمەرگەکانی پاسۆک خۆیان بە نێوشاردا کرد و لە بەشێکی ناوخۆیی خوێندکاران کە کەوتبووە قەراغ شارەوە، خوێندکارانیان گرد کردبووە و قسەیان بۆ کردبوون.

ئەو ماوەیە مولازم موحسین[١٠٣] بە خۆی و چەکدارەکانییەوە شاریان شێواندبوو، بە ڕۆژ لەنێو بازاڕ و جادەوبان خەڵکیان ئازار ئەدا و بەشەویش هەر خەریکی تەراتێن بوون.

یەکێک لە کارەکانی مولازم موحسین، گرتن و ئازاردانی ئەو کەسانە بوو کە ڕیشیان دەهێشتەوە و جلوبەرگ و پشتوێنی ڕەشیان دەکرد. ڕۆژێکیان لە نێوبازاڕ و نزیک چێشتخانەی شارا تووشی ئەسعەد ئەبن و بە بۆنەی ڕیشەکەیەوە تاویان لێ دابوو کە بیگرن، بەڵام ئەسعەد خۆی بەدەستەوە نادات و ڕائەکات، ئەوانیش بەو کۆڵانە باریک و تەنگ و پێچاوپێچانەدا ئەنیشنە سەری، وەلێ نایگرن و ڕزگاری ئەبێت.

بەداخەوە، یەکێک لە هەڵە گەورەکانی ئەم پیاوە گەورەیە، ئەو ڕیشەی بوو کە ساڵ دوانزەی مانگ بەریدابووەوە و نەیدەتاشی. ڕیشەکەی ئەویش بە جۆرێک گەورە و دیار بوو، هەندێک کەس هەر پێیان دەگوت: ڕیشە، یان ئەسعەدە ڕیشە!

---

١٠٣. مولازم موحسین (موحسین عەزیز عەلی)، لە ڕێکەوتی ١٩٥٤/٥/٢ لە دایک بووە و بە ڕەچەڵەک فەلەستینی بوو. یەکێک بوو لە ئەفسەرە دیارەکانی ئاسایشی بەعس لە شاری سلێمانی و دەستی بە خوێنی سەدان کەس سوور بوو. پاش ئەوە بۆ شاری کەرکووک دەگوێزرێتەوە و هەتا سەروەختی ڕووخانی حکوومەتی بەعس لە ساڵی ٢٠٠٣ هەر لەوێ دەمێنێتەوە و هەتا پلەی موقەدەم پلەکەی بەرز دەکرێتەوە.

هەر بە هۆی ئەم ڕیشەوە چەندین جاری تر بووەتە جێگای سەرنج و گومان و گرتن و ئەشکەنجە و سەرەنجامیش لە کاتی شالاوی گرتنەکانی ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر هەر بەو ڕیشە دەناسرێتەوە و دەستگیر دەکرێت. لەڕاستیدا ئەو دەبوو بە پێچەوانەوە بەو هەموو بەرپرسیارێتی و بەو گشتە هەڵسووڕانەیەوە، سیمایەکی زۆر ئاسایی و هەڵسوکەوتێکی گەلێک نۆرماڵی هەبووایە.

هەر لەو ماوەیەدا مەفرەزەکانی نێوشار کەوتنە کوشتن و ئیغتیالکردنی ئەو مامۆستا و خوێندکارە بەعسییانەی کە لەنێو زانکۆدا هەڕەشەیان لە خوێندکاران و مامۆستایان و فەرمانبەرانی زانکۆ دەکرد و فەزایەکی ناجۆر و ناساز و پڕ لە ترس و خۆفیان پێک هێنابوو. بەپێی گێڕانەوەی ئازاد غەریب (سیروان)، ئەسعەد پلاندارێژەری ئەو چالاکییانە بووە.

ئازاد غەریب کە خەڵکی "سلێمانی"یە و لەو دەمەدا خوێندکاری قۆناغی چوارەمی کۆلێجی ئەندازیاری لە زانکۆی سلێمانی بووە و لە ڕێکخراوی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستاندا پەیوەندی بە ئەسعەدەوە هەبووە، ئەو ڕووداوانەمان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە:

(ڕۆژێکیان ئەسعەد کامێرایەکی بچووکی بۆ هێنام و وتی، پێویستیم بە وێنەی ژمارەیەک مامۆستای بەعسی هەیە، ئەوانەی لەگەڵ کورد زۆر توند بوون و بە ئاشکرا ڕقی خۆیان نیشان دەدا. بەهۆی ڕێکخستنەکانمانەوە ناوی ١٠ مامۆستای عەرەبمان بۆ هات، وێنەی هەر هەموویانم بە هاوکاریی هاوڕێکانم گرت، لەوانە: ڕاگری کۆلێجی کشتوکاڵ، مامۆستایەکی کۆلێجی پزیشکی و مامۆستایەکی سەقافەی قەومی، پاشان هەموو وێنەکانم دایە ئەسعەد. سێ ڕۆژی پێ نەچوو، لە بەردەم مزگەوتی قامیشانی کانیی ئاسکان ڕاگری کۆلێجی کشتوکاڵ و هاوڕێکەی لەناو بران، لەدوای دوو ڕۆژی دیکە دکتۆرێکی کۆلێجی پزیشکی کە پێیان دەوت، دکتۆر بۆق لەنێو برا، هەر لە فلکەی کانیسکان لە ماوەی یەک هەفتەدا پێنج بەعسیی گەورە لەنێو بران. ئەوەی من بزانم و دواتر ئەسعەد بۆی گێڕامەوە، ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک بە جلوبەرگی جەیشی شەعبییەوە کە هەمووشیان زمانی عەرەبییان دەزانی، ئەو کارانەیان ئەنجام دا)

بەو شـێوەیە ژیـانی مامۆسـتا و خوێنـدکارانی بەعسـی لە زانکـۆی سـلێمانی، ئەوانەی خوێندکارانیان ئەخستنە ژێر گوشار و ئازاریان ئەدان، کەوتە بەر هەڕەشـە و هـیچ ئـارامی و ئاساییشـێکی بـۆ نەمـایەوە، بـۆیە بیریـان لەوە کـردەوە زانکـۆ بگوێزنەوە، سەرەنجام بڕیاریان دا و جێبەجێیان کرد.

هەر وەکوو پێشتریش ئاماژەم پێی کرد، ئەسعەد و من هەردووکمـان لە خوێندن پـێکەوە بـووین و لە بەشـی نـاوخۆییش لە یەک ژوورێکـدا بـووین، وەلـێ بەهـیچ جۆرێک باسـی ئەو کـار و چالاکییـانەی بـۆ نەکردووم و مـن خـۆم هـیچ زانیـاری و ئاگادارییەکم لەو ڕووەوە نەبووە و نییە. بەڵام مـن شـارەزای خەسڵەتی ئەو پیـاوە بـووم، ئەمزانـی دەسـت بـۆ هەمـوو جۆرە چـالاکییەک ئەبـات و هەمیشـە سـەرقاڵ و پڕکـار و هەمەکـار بـوو، بە چـالاکی سـەربازی و ئیغتییالاتیشـەوە. هەروەهـا ئەوە ئەزانـم کە ئەسـعەد گەلێـک جـار نەک هەر بـۆ محازەرەکـان، بەڵـکە بـۆ تاقیکردنەوەکانیش نەدەهـات و غایب ئەبـوو. بـۆیە بەدووری نـازانم، ئەو چالاکییـانە گشت کاری ئەو و نەخشەی ئەو بووبن و هەر ئەویش ئەندامانی لیژنەی ئیغتییـالاتی کەرکووکی بۆ سلێمانی هێنابێت و کارەکانی تەگبیر کردبێت.

پێویسـتە لێـرەدا ئامـاژە بـۆ ئەوەش بـکەم، مـن پێشـتر باسـی ئەوەم کـرد کە برادەرێکـی هەولێـری لە بەشـی نـاوخۆیی بە نێـوی عەبـدوڵا حەسـەن ئیسـماعیل لەگەڵمانـدا بـوو، ئەویـش لە هەمـان کاتـدا و بەهـۆی ئاشـکرابوونی ڕێکخسـتنەکانی کۆمەڵە لە شاری هەولێر گیرابوو، لە زیندان لەگەڵ ئەسـعەد یەک دەگرنەوە و بۆی گێڕامەوە و وتی:

"سەبارەت بە شـەهید ئەسعەد، مـاوەیەک لە هەیئەی خاسـەی کەرکووک پێکەوە بووین، لەبیرم نەمـاوە ئەو مـاوەیە چەنێک بـوو، بەڵام لەو ڕۆژانەدا شـتێکی لای مـن درکاند و وتی: هەندێک جار لە تەقەکانی شەوانەی ناوشاری سلێمانی و ئەنجامدانی چالاکی من لەگەڵیاندا بووم"

# ئێمە و زانکۆی ڕاگوێزراو

خوێندنی ئەو ساڵە (١٩٨٠-١٩٨١)مان تەواو بوو، پشووی هاوینی بەسەردا هات و چووینەوە بۆ کەرکووک. وەلێ ئەسعەد و من هەردووک چەند ماددەیەکمان مابوو، دەبوو بۆ دەوری دووەم بچینەوە و دووبارە ئیمتیحانی لێ بدەینەوە.

زانکۆی سلێمانی تەواو، بڕیار دراو کۆتاییان پێ هێنا، ئیدی ئەوە دواجار بوو، بچینە ئەو هۆڵ و کلاسانەوە. دەوری دووەم هاتە پێشەوە، ئەسعەد و من هەردووک پێکەوە بەرەو شاری هەولێر، شاری قەرات و منارە، بۆ زانکۆی ڕاگوێزراو کە نێویان لێ نابوو زانکۆی سەلاحەدین بەڕێ کەوتین. وەلێ زانکۆی چی؟ بەس بە زانکۆی نەدەکرد، هەر کۆلێجەیان فڕێدابووە سووچێکەوە!

سەرەتا کە چووینە ناو هەولێرەوە کۆلێجی ئەندازیاریمان بەدەستی ڕاستی جادەکە تووش هات و قیچەک ئەولاتر کۆلێجی زانستەکان بوو، لەوێ گوتمان، کاکە دابەزین هەیە ... چووینە ژوورەوە، گەلێک دڵتەنگ بووم، دڵم دەگوشرا، دەتگوت شارێکە و هەر ئەو ڕۆژە لە جەنگ ڕزگاری بووە و هێشتا داروپەردووی لێ پاک نەکراوەتەوە. لەنێو مەیدان و داڵان و ڕاڕەوەکان و نێوان بیناکان گشت کتێب و کەلوپەلی لابوور و پێویستییەکانی دیکەی زانکۆ بوون، گشتیان لەو گۆڕەی خراون و بەوە دەچوو گەلێک پەلەپەلیان لێ کردبێت! هێشتا ڕێک نەخرابوون و جێگە و ڕێگەیان نادیار بوو.

شوێنی خەومان هەر لەوێ لەنێو کۆلێج بۆ دیاری کرا و لەوێ ماینەوە هەتا تاقیکردنەوەکانمان تەواو کرد.

ئێمە لە حاڵێکی وادابین و بۆ چەند ڕۆژ و هەفتەیەک چووینەتەوە، ئەسعەد لەگەڵ برادەرێکی تر نەخشەی ئەوەی دانا، دیوارەکانی ناو کۆلێج بە بۆیە بنووسێتەوە، لە کاتێکدا ئەو برادەرە هیچ پەیوەندییەکی ڕێکخراوەیی لەگەڵ ئێمەدا نەبوو! بەلام سەرەنجام نەیانکرد و سەری نەگرت. ئاخر ستەمە، بەو هەموو بەرپرسیارێتییەوە تۆ بێیت، خۆت بە کارێکی لەو جۆرەوە بئاڵێنی، لە هەمووی خراپتریش، لە بازنەیەکی وا چکۆلە و خۆشت لەنێو بازنەکەدا بیت!

# کۆمیتەی ئاگر لە مێژووی کۆمەڵەدا

دوای ئەوەی "کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی-عێراق ئەندێشەی ماو تسیتۆنگ" لە ساڵی ١٩٧٠ ڕۆ نرا، کەرکووک پێگە و ناوەندێکی گرنگی ئەو بوو، چونکە کەرکووک بێجگە لەوەی هەر لە دەستپێکەوە بە هۆی لەئارادابوونی ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی چەند ساڵێک لەوەوبەرەوە، ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەندامان و کادران بۆ ئەم ڕێکخراوە نوێیە، لەم شارەدا ئامادە بوون، کەرکووک هەر بۆخۆیشی شارێکی گرنگ و بایەخدار بوو.

کەرکووک لە ڕووی ژمارەی دانیشتووانەوە یەکێک بوو لە شارە زۆر گەورەکانی عێراق و لەپاش بەغدای پایتەخت و شارەکانی بەسرە و مووسڵ دەهات. شارێکی پیشەسازی بوو، بەهۆی ئەوەی شارێکی دەوڵەمەند بە نەوت، خاوەنی کۆمپانیای دەرهێنانی نەوت و کرێکارانی پیشەسازی نەوت بوو، ژمارەی کرێکاران و زەحمەتکێشانی بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی دیکەی وەکوو سلێمانی، هەولێر و دهۆک زۆرتر بوون. ئەمەش بۆ سازمانێک کە خۆی بە سازمانی کرێکاران و زەحمەتکێشان بەحیساب بهێنێت و کارکردن لەنێو ئەواندا و ڕێکخستن و ڕابەریکردنی ئەوانی لە دەستووری کاری خۆیدا جێ خستبێت، پڕ بایەخ و حەیاتییە.

هەروەها کەرکووک لە ڕووی هەڵکەوتەی جوگرافییەوە دیسانەوە گرنگ بوو، چونکە ئەڵقەی لێکگرێدانی هەردوو شاری سلێمانی و هەولێر و ئەڵقەی لێکگرێدانی کوردستان بە ناوەندی عێراقەوە بوو.

خاڵێکی دیکەی گرنگ بۆ کۆمەڵە ئەوە بوو، کۆمەڵە بۆخۆی باڵی چەپی "باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان (جەلالی)" بوو، وە لە هەناوی ئەوانەوە وەدەر هاتبوو، ئەویش بۆخۆی لەم شارەدا خاوەنی پێگە و سەنگ و قورسایی بوو.

هەر بۆیە لەدوای دامەزراندنی "کۆمەڵە"وە، فەرەیدوون عەبدولقادر فەرەج بۆ دامەزراندنی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک ڕادەسپێردرێت. ئەویش بە ماڵەوە بۆ کەرکووک دەگوازێتەوە و لە گەڕەکی ڕێگای بەغدای نوێ نیشتەجێ دەبێت.[١٠٤]

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٣دا کۆبوونەوەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و بەشێک لە کادرەکانی لە شاری کەرکووک دەبەسترێت. لەو کۆبوونەوەیەدا کۆمیتەی سەرکردایەتی لە شەهابی شێخ نووریی شێخ ساڵح (خاڵە شەهاب)، جەعفەر عەبدولواحید و فەرەیدوون عەبدولقادر فەرەج بۆ سەرپەرشتیکردن و ڕابەریکردنی تەواوی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە پێک دەهێنرێت.

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاری ئەوە دەدرێت، ئۆرگانێک بە نێوی "ئاڵای سوور"ەوە بۆ کۆمەڵە دەربکرێت و "خاڵە شەهاب"یش بەنهێنی لە کەرکووک نیشتەجێ بێت و لە نزیکەوە سەرپەرشتیی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بکات.[١٠٥]

بەو جۆرە سکرتێری کۆمەڵە (خاڵە شەهاب) زۆربەی کاتەکانی بەنهێنی لە کەرکووک لە ماڵی فەرەیدوون عەبدولقادر فەرەج، ئیبراهیم جەلال و ئیحسان نەجم محێدین (ئەبوو شەهاب) دەبێت. چونکە ئیدی کەرکووک بووبووە چەقی خەباتی نهێنیی کۆمەڵە و شارەکانی سلێمانی، هەولێر، مووسڵ، بەغدا و خانەقینی بە سانایی بە یەکەوە دەبەستەوە.[١٠٦]

ئەوەی شایانی گوتنە، ئەو کۆبوونەوەیە وەرچەرخانێکی گەورەی لە ژیانی ڕێکخراوەیی کۆمەڵەدا پێک هێنا.[١٠٧]

لە هەمان کاتدا کۆبوونەوەیەک بۆ کادرەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک بە سەرپەرشتیی خاڵە شەهاب بەڕێوە دەچێت و لەوێدا بڕیاری دامەزراندنی کۆمیتەیەک بۆ ڕێکخستنەکانی ئەم شارە دەدرێت و فەرەیدوون عەبدولقادر فەرەج دەبێتە یەکەمین بەرپرسی، کە ئەو دەمە لە شارەوانی کەرکووک کارمەند دەبێت.[١٠٨]

---

١٠٤. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز عەلی بچکۆل.

١٠٥. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، برایم جەلال، چاپخانەی ڕوون، ساڵی ٢٠١١، ل (٥٠-٥١).

١٠٦. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز محەمەد حەسەن خورشید (حەمەی سانییە).

١٠٧. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، برایم جەلال، چاپخانەی ڕوون، ساڵی ٢٠١١، ل (٥٠-٥١).

١٠٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١.

لەپاش چوار ساڵ (١٩٧٠-١٩٧٤)ی ئاگربەست و دانوستان لە نێوان دەسەڵاتدارانی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان بە ڕێبەرایەتیی بارزانیی مستەفا و بە بنبەستگەیشتنی، ئاماژەکان گشت ڕوویان لەوە بوو، دیسانەوە جەنگ لە کوردستاندا دەست پێ دەکاتەوە.

لە سەرەتای مانگی مارتی ساڵی ١٩٧٤دا سەرکردایەتیی کۆمەڵە ڕاگەیاندنێکی نێوخۆیی لە ڕیزەکانی خۆیدا بڵاو کردەوە و تیایدا هاتبوو، کە هەڵگیرساندنەوەی شەڕ مسۆگەرە و ئەم شەڕە لە لایەن خەڵکی کوردستانەوە شەڕێکی ڕەوایە، چونکە بەشێکە لە خەباتی خەڵکی کوردستان بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی، بەڵام سەرکردایەتیی بزووتنەوەکە کۆنەپەرستە، بۆیە بەشداریکردن لە شەڕەکەدا بە ئەرکی خۆمان دەزانین، بەو ئامانجەی کە سەرکردایەتییەکەی وەلا بنێین و حیزبێکی مارکسیست-لینینست سەرکردایەتییەکەی لە ئەستۆ بگرێت.[١٠٩]

ئیدی فەرەیدوون عەبدولقادر فەرەج تا ئەو دەمەی لە سەرەتای مانگی ٣ی ساڵی ١٩٧٤دا لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێکانی دەچێتە دەرەوە، بەرپرسی کۆمیتەی ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک دەبێت.[١١٠]

بەو شێوەیە زۆربەی هەرە زۆری ئەندامان و کادرانی کۆمەڵە لە کەرکووک وەکوو باقی شارەکانی دیکەی کوردستان، بەو بزووتنەوە چەکدارییەوە پەیوەست دەبن. لە هەمان کاتدا بۆ سەرپەرشتیکردنی ئەو ڕێکخستنانەی کە لە شاری کەرکووک ماونەتەوە، ئیحسان نەجم (ئەبوو شەهاب) دیاری دەکەن. بەڵام ئەمیش لەدوای ٢-٣ مانگێک شار بەجێ دەهێڵێت و دەچێتە دەرەوە. لەپاشان ئەحمەد کرێکار (حەمە کەریم عەلی ڕەزا) دەبێتە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لەم شارەدا.[١١١]

---

١٠٩. مێژوویەک لە یادەوەریدا، سالار ڕەشید، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٥، ل ٢٨.

١١٠. چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، برایم جەلال، چاپخانەی ڕوون، ساڵی ٢٠١١، ل ٦١.

١١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز عەلی بچکۆل. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز محەمەد حەسەن خورشید (حەمەی سانییە).

لەدوای ساڵێک لە جەنگ و لەپاش هەرەسی بزووتنەوەی چەکداریی پارتی و بارزانی، ئەندامان و کادرانی "کۆمەڵە"ش وەکوو ئەو خەڵکە بۆ نێو شارەکان، بۆ جێگەورێگەی خۆیان دەگەڕێنەوە.

عەلی بچکۆل (عەلی محەمەد قادر) وەکوو یەکێک لە کادرە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە کە بەشداری لەو بزووتنەوە چەکدارییەدا کردبوو، بۆ شاری کەرکووک دەگەڕێتەوە و بۆ ماوەی چەند مانگێک و تا ئەو دەمەی ئەندامانی سەرکردایەتیی کۆمەڵە ئاشکرا دەبن و ڕوو لە ئێران دەکەن، دەبێتە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لەم شارەدا.

لەدوای ئەوە ئازاد هەورامی (ئازاد عەبدولمەجید عەبدولغەفار) دەبێتە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک.[١١٢]

محەمەد حەسەن خورشید دەڵێت:

لە ساڵی ١٩٧٥دا کاک ئەحمەد کرێکار و من شانەیەکی سەرەکی بووین، کاک عەلی بچکۆل سەرپەرشتی دەکردین ...

کاک "عەلی بچکۆل" و هاوڕێکانی پێش ڕۆیشتنیان بەرەو ئێران کە جارێ ئازاری نسکۆی شۆڕشی ١٩٧٥ی کوردستان لە دەروونی جەماوەردا گینگڵی ئەدا، کاک ئەحمەد کرێکار و منی بە شەهید ئازاد هەورامی ناساند. تاوەکوو دەرچوونە دەرەوەی کاک ئازاد، پەیوەندیی ڕێکخستنم هەر بەوەوە هەبوو. لەپاش ڕۆیشتنی کاک ئازاد لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٦دا بۆ پێشمەرگایەتی، پەیوەندیم بە کاک ئەحمەد کرێکارەوە هەبوو.

پێش ئەوەی کاک ئازاد بچێتە دەرەوە، کۆمیتەیەک لەم چەند کەسەی خوارەوە بۆ سەرپەرشتیکردنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتی لە شاری کەرکووک پێک دەهێنرێت:

١) ئەحمەد کرێکار (حەمەکەریم عەلی ڕەزا)، بەرپرسی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتی لە شاری کەرکووک.

٢) حەمەی ئایشە (مەلا محەمەد شەریف مامڕەشی)، ئەندام.

---

١١٢. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز عەلی بچکۆل.

٣) حەمید محەمەد کاکەمەد (حەمید شورتە، حەمیدی گومرک، حەمیدە سوور)، ئەندام.

٤) محەمەد حەسەن خورشید (مامۆستا محەمەد، حەمەی سانییە)، ئەندام.

٥) عەلی مغاویر (عەلی حوسێن)، ئەندام.[١١٣]

لەپاش کارەساتی هەکاری لێکپچڕانێک لەنێو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شارەکاندا هاتبووە کایەوە، بۆ لێکبەستنەوەی ئەم ڕێکخستنانە، بڕیار دەدرێت کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ پێک بهێنرێت. لە ساڵی ١٩٧٩دا ئەو کۆمیتەیە بە سەرپەرشتیی مامۆستا جەمال تاهیر پێک دەهێنرێت.[١١٤]

'ڕێکخراوی کەرکووک'یش ماوەی نزیکەی ٦ مانگێک بوو، پەیوەندییەکانی خۆی بە ناوەندیی کۆمەڵەوە پچڕابووەوە. بۆ لێکگرێدانەوەی ڕێکخستن و کاراکردنەوەی پەیوەندی و چالاکییەکانی لەگەڵ کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆدا، سەرەداوێک دەدۆزرێتەوە و سەرەنجام بۆ ئەو مەبەستە، دلێر ئەحمەد شوکری (سەلیم سەرسپی) وەک نوێنەری کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ لەگەڵ محەمەد حەسەن خورشید وەک نوێنەری ڕێکخراوی کەرکووک چەند جارێک کۆ دەبنەوە. لەو کۆبوونەوەیەدا محەمەد شێوەی کارکردن و چالاکییەکانی ڕێکخراوی کەرکووکی کۆمەڵە و یەکێتی باس دەکات. 'دلێر'یش ڕێنماییەکانی ناوەندیی کۆمەڵە و کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ و شێوەی نوێی کارکردن بە گشتی، ڕوون دەکاتەوە و ئەڵێت: هەوڵ ئەدەین پەیوەندیی نێوان شارەکان و کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ و ناوەندیی کۆمەڵە توندوتۆڵتر بکەینەوە. هەروەها ئەڵێت: ناوەندیی کۆمەڵە بەنیازە، بۆ ئاڵوگۆڕی نامە لە نێوان شارەکان و کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ و ناوەندیی کۆمەڵە و هەرێمەکانی پێشمەرگە، بۆ هەر شارێک مۆرێکی تایبەت بە خۆی دروست بکات. بۆیە ئێوە بۆ ڕێکخراوی کەرکووک ناوێک دیاری بکەن، بۆ ئەوەی مۆرێکتان بۆ دروست بکرێت و ئیتر هەر بەو ناوەوە ئاڵوگۆڕی نامەکانتان بکەن.'محەمەد'یش لە کۆبوونەوەی ڕێکخراوی کەرکووک، لە سەرەتای مانگی سێ یان چواری ساڵی

---

١١٣. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز محەمەد حەسەن خورشید (حەمەی سانییە).

١١٤. مەلا بەختیار، چۆن چەپکێک و کام مێژووی کۆمەڵە؟! بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ساڵی ٢١٢، ل ٣٨٣.

١٩٧٨له مـاڵی ئەحمـەد کرێکـار و بە ئامـادەبوونی هەر یەک لە ئەحمـەد کرێکـار، حەمـەی ئایشـە، قسەوباسـەکانی نێـو ئەو کۆبـوونەوەیە دەخـاتە ڕوو. لـە دوای تـاوتوێکردنی ئەو پرسـە بەو ئەنجامە دەگەن، نێوی ڕێکخراوی کەرکووک بکەن بە "کۆمیتەی ئاگر".[115] ئەوەی شایانی باسە، ئەم کۆمیتە پێنج کەسییە، کۆبوونەوەکانی پێکەوە و دەستەجەمعی نابێت، بەڵکوو کۆمیتەیەکی لێکدابڕاو و مونفەسیل دەبێت. واتە، ئەحمەد کرێکار وەکوو بەرپرسی کۆمیتەکە، بە دوو جار و بەجیا لەگەڵیاندا کۆ دەبێتەوە، جارێک لەگەڵ حەمەی ئایشە و محەمەد حەسەن خورشید، جارێکی دیکە لەگەڵ حەمید محەمەد کاکەمەد و عەلی مغاویر.[116]

لە مـانگی نیسـانی سـاڵی ١٩٨٠دا مـحەمەد حەسـەن خورشـید ئەگیـرێ و حـوکمی ئیعدام ئەدرێ و پاشـان حـوکمەکەی دەکـرێتە ئەبەدی. لە نێوەڕاسـتی هەمـان سـاڵدا "حەمەی ئایشە"ش دەگیرێ و پاشان بێسەروشوێن دەکرێت.

ئەوەی شـایانی باسـە، ئەم دوو ئەنـدامەی کـۆمیتەی ئـاگر لەژێـر ئەشـکەنجە و لێکۆڵینەوەدا هـیچ زانیـارییەک ئاشکرا نـاکەن و ڕێکخسـتنەکانی کۆمەڵە دەپارێزن و هیچ زیانێکیان پێ ناگەیەنن.

لەدوای ئەمـانە و لە تەمـووزی سـاڵی ١٩٨١دا عەلـی مغـاویر دەگیرێـت و لە پـاش ٢٦ ڕۆژ زیندانی ئازاد دەکرێت.[117]

لەپـاش ئـازادکردنی عەلـی مغـاویر، ئەحـمەد کرێکـار زۆر هەوڵ ئەدات، چـاوی بە عەلـی مغـاویر بکەوێـت، وەلـێ ئەو هەر خـۆی بەدەسـتەوە نـادات و خـۆی لـێ دەشـارێتەوە. سـەرەنجام ئەحـمەد کرێکـار دەتوانێـت، عەلـی مغـاویر لە مـاڵی حەمیـد محەمەد کاکەمەد (عەلی مغاویر لەگەڵ حەمید هاوزاوای یەکترن) ببینێت. بەڵام عەلی مغـاویر هەر وەکـوو چـۆن خـۆی بە شـێت پیشـانی خەڵکی ئەدات، هەر بەو جـۆرە خـۆی پیشـانی ئەحـمەد کرێکـاریش دەدات! لەو بینینـەدا ئەحـمەد کرێکـار پرسـیاری زیندانیکردن و ئازادکردنەکەی لێ دەکات، ئەویش لە وەڵامـدا دەڵێت: خـۆم لـێ کـردن بە شێت و بەبێ ئەشکەنجە ئازادیان کردم! بەڵام ئەحمەد کرێکـار بـاوەڕی پێ ناکـات

---

١١٥. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز محەمەد حەسەن خورشید (حەمەی سانییە).

١١٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١١٧. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ئەحمەد کرێکار (حەمەکەریم عەلی ڕەزا).

و ئەو هەستەی لەلا دروست دەبێت کە نهێنییەکانی ڕێکخستنی درکاندبێت. بۆیە هەر ئەو جارە دەیبینێت و پاشان شار بەجێ دەهێڵێت و ئەڕواتە دەرەوە.[118]

ئەحمەد کرێکار لە ڕێکەوتی ١٩٨١/٨/٢٠دا شاری کەرکووک بەجێ دەهێڵێت و سەرەتا دەچێتە گوندی چالاو، چونکە خانەوادەکەی لەوێ دەبێت.[119]

ئەوەی شایانی باسە، هەفتەیەک پێش ئەوەی ئەحمەد کرێکار بچێتە دەرەوە، کۆمیتەی ئاگر لەژێر چاودێری و ڕێنوێنیی مامۆستا جەمال تاهیر و بە ئامادەبوونی دلێر ئەحمەد شوکری لە سێ کەس پێک دەهێنرێتەوە کە ئەوانیش: ئەسعەد عەزیز سۆفی (شێخ دارا)، بەکر سدیق (مامۆستا کاکەڕەش) و عومەر قادر عەلی (نەبەز) بوون و لەنێویاندا مامۆستا کاکەڕەش دەکرێتە بەرپرسی کۆمیتەکە.[120]

بەو پێیە بێت، تەمەنی ئەم کۆمیتەیە نزیکەی دوو مانگێک بووە و بەس.

---

١١٨. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز محەمەد حەسەن خورشید (حەمەی سانییە).

١١٩. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ئەحمەد کرێکار (حەمەکەریم عەلی ڕەزا).

١٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز عومەر قادر عەلی.

# کەرکووك گڕی گرت

دوای ئەوەی تاقیکردنەوەکانی دەوری دووەممان لە زانکۆی تازە ڕاگوێزراو لە هەولێر ئەنجام دا، ئەسعەد و من بۆ شاری کەرکووک گەڕاینەوە. لێ شار گڕی گرتبوو، ڕۆژانی دواتر و دواتر هەر وا و زیاتر، هەر ڕۆژەی ئەمنێک، جاسووسێک، موختارێک دەکوژرا.

ڕۆژێکیان پێش نیوەڕۆ بیستم: کەسێکی بچکۆلەی لاواز "ستار"ی لەنێو دوکانەکەی خۆی لە حەسیرەکە دایە بەر دەمانچە و بەنێو حەشامەتەکەدا خۆی بە کۆلانەکانی "سەی سەروەر"دا کرد و لە چاو ون بوو!

ئەیانگوت، ئەم "ستار"ە تۆڕی سیخوڕی لە ناوچەکانی عەسکەر و گۆپتەپە و قەلاسێوکە هەیە و کاری جاسووسی و هەواڵگری بۆ ڕژێم ئەکات.

ڕۆژێکیان لە ژوور ماڵی ئێمە و لە باروتخانە ماتۆڕسوارێک نارنجۆکێک فڕێ ئەداتە نێو ڕەبابییەک و پاشان شۆڕ دەبێتەوە و بەتیژی بە کۆلانی مزگەوتەکەدا تێ دەپەڕێ و ڕووەو عاشوور دەڕوات. خەڵکێکی زۆر ئەمەیان بینیبوو و دەیانگوت، ئەوە جەنگە بووە!

جەنگی کوڕی سەی نەجمەدین خەڵکی گەڕەکی ئێمە بوو، هەموو گەڕەکەکە دەیانناسی.

پاشان من بیستمەوە، بە هۆی ئاشکرابوونی ئەو چالاکییەوە فەهمی ئەمین ڕەشید ئەو ماتۆڕەی بە سەیارەکەی خۆی بۆ گەڕەکی تسعین گواستووەتەوە، تا بیشارێتەوە!

چێشتەنگاوێکیان لەنێو گۆڕستانەکەی شێخ محیدین لەسەر ڕێگای بەرتەکێ مەجید موختار ئەدەنە بەر دەمانچە و دەیکوژن.

مەجید موختار ماڵیان لە ئیسکانی کۆن بوو، ئەیانگوت، ئەم کابرایە کۆنە شیووعی بووە، بە گەنجەکانی ئەگوت، وەرن با سەیری نێولەپتان بکەم، بۆ ئەوەی بزانم ئێوە چین، هەروەها ئەیانگوت ئەم کابرایە دەستی لە بەگرتدانی خەڵکدا

هەبووە. سەرداری کوڕی لە ناوەندیی کاوە هاوپۆلم بوو، ئینسانێکی چاک و بێوەی بوو، لەناو خەڵکیشدا هەر دەوترا، کوڕەکانی ئینسانی چاکن.

ئەو دەمە دەگوترا، ئەوەی ئەو کارەی ئەنجام دا، کاتێک لەلای بەرتەکی بەرەو ڕووی مەجید موختار ئەبێتەوە، دەمانچەکەی هەڵدەکێشێ و پێی دەڵێت: مەحکەمەیە! ئەویش بە جەبار ئەڵێت: هەی نا مەرد! مەلا محێدین لە دوورەوە و لە پشت کێلی قەبرێک چاودێری کارەکەی کردووە.

یوسف حازم محەمەد گێڕایەوە:

ئەو ڕۆژەی بەنیازی کوشتنی ستار بوون، پێش نیوەڕۆ بوو، ئەسعەد هات بۆ لام و وتی، بەنیازی ئەو کارەین و من دەمانچەم پێیە، وەرە با پێکەوە بۆ حیمایەی چالاکییەکە بچینە ئەو دەورە، بەڵام پێش ئەوەی کارەکە ئەنجام بدرێ، ئێمە ئەوێمان بەجێ هێشت و بەرەو بەرتەکی ڕۆیشتین. پاشان کارەکە ئەنجام درا!

هەر لەو سەروبەندەدا بوو، جارێکیان لە ماڵی ئەسعەد کۆبوونەوەمان هەبوو، ئەسعەد دەمانچەیەکی "مەکارۆف"ی لەنێو سەندووقێکی شەترەنج دەرهێنا و وتی، ئەوە لە تەپەوە بەنێو خاسەدا هێناومە.

دێتەوە یادم، ئەو دەمە دەیانگوت، چالاکییەکانمان بەزۆری بە دەمانچەی مەکارۆف دەکەین، چونکە سەرباری ئەوەی قەوارەکەی گونجاوە، ڕاوەستانیشی نییە! کاتی خۆی لە سووپای عێراقیدا دەمانچەی مەکارۆف بە نائیب زابتەکان دەدرا. هەر لە هەمان کاتدا ئەسعەد لیستێکی پیشانم دا، نێوی ئەو کەسانەی تێدا بوو کە بڕیار بوو لەنێو ببرێن، بەڵام ئەمە وەک خەو دێتەوە یادم ...

دەگێڕنەوە و دەڵێن، لەدوای کوشتنی مەجید موختار و لە کاتی چوونە سەر قەبران و ناشتنیدا، پیاوانی بەعس هەڕەشەیان داوە و گوتوویانە: ئیتر بەسە!

وای پێ دەچێت، لەدوای ئەوەوە ئەمنی کەرکووک بڕیاری دابێت، هێرش بکات و دەست بە گرتنمان بکات، بە تایبەتی ئەوان پێشووتر و بە هۆی عەلی مغاویرەوە زانیاری و سەرەداوی زۆریان لە بەردەستدا هەبوو.

# شاڵاوی گرتنەکان دەستی پێ کرد

شاڵاوی گرتنەکان بۆ سەر ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر دەستی پێ کرد و یەکەمین کەس فەهمی دەگیرێت.

فەهمی ئەمین ڕەشید، ئەو دەمە لە ئاژانسی دەنگوباسی عێراقی کە کەوتبووە نێو باڵەخانەی خان خەلیلییەوە فەرمانبەر بوو. بە مەزەندە لە ڕێکەوتی ١٤/١٠/١٩٨٢دا دەچنە سەری، دەستگیری دەکەن و بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووکی دەبەن. لەوێ پێی دەڵێن:

ئەگەر هاوکاریمان بکەیت و زانیاریمان پێ بدەیت، ئەوا قەرەویێتەکەی ملت ناکەینەوە! ئەویش دەمی هەمبانەی بۆ کردبوونەوە.

فەهمی بێجگە لەو کەسانەی کە پەیوەندیی ڕێکخستنی لەگەڵیاندا هەبوو، ژمارەیەکی دیکەیشی هەر دەناسی، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە هێڵی سەربازیدا کاریان دەکرد و ڕاستەوخۆ چالاکییەکانیان ئەنجام ئەدان. ئەوەش چونکە بۆ جێبەجێکردنی چالاکییەکانیان ئۆتۆمبیلەکەی ئەمیان پێویست بوو.

لەدوای گرتنی فەهمی چەند ڕۆژێک بەئارامی تێ دەپەڕێت. پاشان فارووق عومەر وەلی دەگیرێت و شاڵاوی گرتنەکان بەچڕی دەست پێ دەکات.

فارووق و فەهمی هاوگەڕەک بوون و پەیوەندیی ڕێکخستنیشیان هەر پێکەوە بووە.

جەلال حەمید ڕۆستەم دەیگێڕێتەوە:

"جارێکیان لە ماڵی فارووق دانیشتبووم، لەپڕێکدا فەهمی خۆی کردە ژوورەوە، من یەکسەر مەوزووعەکەم گۆڕی، فارووق و فەهمی لەگەڵ یەکتری کەوتنە قسە، فەهمی باسی زەلامێکی کرد، فارووق وتی:

ئەوە کێیە؟

فەهمی: چییە، خۆت غەشیم ئەکەیت؟! ئەوەی کە چوویتە سەری و دەمانچەکەت جووتەی کرد!

دوای ئەوەی فەهمی ڕۆییشت، بە فارووقم وت:

فارووق! ئەمە خەتەرە، ئەم شتانە چۆن باس دەکرێت؟!

فارووق: نا! مادام لەگەڵ منی، سیقەی هەیە.[121]

کاتێک فەهمی ئەگیرێت، فارووق ئاگادار ئەبێت، بەڵام خۆی ناشارێتەوە و ماڵ بەجێ ناهێڵێت! چونکە هەر وەکوو خۆی گوتوویەتی، نایەوێت بە هۆی ئەوەوە دایک و خوشکی بگیرێن. هەروەها گوتوویەتی، ئەگەر ئەو خۆی بشارێتەوە، ئەوا شتەکان لەسەر فەهمی ئیسپات دەبن.[122]

لە درێژەی شاڵاوەکەدا جەنگی نەجمەدین نووری، عەبدولجەبار فەرەج ساڵح، محێدین حوسێن حەسەن ... دەگیرێن. هەروەها ئەسعەد عەزیز سۆفی بە مەزەندە لە ڕێکەوتی ١٩٨٢/١٠/١٩ دەگیرێت.

ئەسعەد ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی بگیرێ، بە پەلە و سەرپێیی بۆ لای من (سالار ڕەشید) بۆ ماڵەوە هات. چێشتەنگاوێکی ڕۆژێکی پاییزە بوو، تازە گەرمای تاقەتپڕووکێنی هاوینی کەرکووکمان تێپەڕاندبوو، کەسێک لە دەرگای دا، کاتێک کە چوومە دەرەوە، ڕوانیم ئەسعەدە! پێم سەیر بوو، لە دڵی خۆمدا گوتم، دەبێ بۆچی هاتبێ؟! خۆ قەرارە سبەی ئێمە لە ماڵی ئەوان یەکتری ببینین و کۆبوونەوەمان هەیە ... ئەمانە گشت بەتیژی و لە چرکە ساتێکدا بەر لەوەی پێی بگەم، بە مێشکمدا تێپەڕین. دوای چاکوچۆنی و ئەحواڵپرسی وتی:

"کۆبوونەوەکەی سبەینێ ناکەین، دۆخەکە باش نییە، منیش ئەچم بۆ هەولێر و ماوەیەک خۆم لەوێ ئەشارمەوە" ...

---

١٢١. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز جەلال حەمید ڕۆستەم.
ئەوەی شایانی گوتنە، هەتا ئەو دەمەی ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر دەگیرێن، جەلال پەیوەندی ڕێکخراوەیی هەر بە فارووقەوە دەبێت، بەڵام فارووق هیچ ئیعتیرافێک لەسەر جەلال ناکات.

١٢٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

حکـوومەتی بەعـس لەو ڕۆژانەدا هێزێکـی زۆری ئەمنیشـیان لە بەغـداوە بـۆ پەلامـاردان هێنـابووە کەرکـووک و نەخشـەیەکی بەریـن و شـاڵاوێکی فراوانیـان بە دەستەوە بوو. وەلی من لەلای خۆمەوە دڵنیا بووم کە مەترسییەک بۆسەر مـن نییە، چونکە تاقە کەسێک کە مـن بناسـێت و ئاگای لە پەیوەندی و شـانە و هێڵەکانی لای من بێت، ئەسعەدە، ئەویش بە حیساب چوو بۆ هەولێر و ئیختیفایە ...

بەڵام بەداخەوە لەدوای ماڵئاواییکردنی ئەسـعەد لە مـن و بەڕێکەوتـن بـۆ شـوێنی مەبەسـت، مەفرەزەیەکـی ئەمـن کە ئەشـرەف چاپچیـان لەگەڵـدا دەبێـت و ئەسـعەد دەناسـێتەوە، لەلای قوتابخـانەی ناوەنـدیی مەیسـەلوونی کچـان لە تەنیشـت بەڕێـوەبەرایەتیی ئەمنـی کەرامە ئەسـعەد لەنێـو تەکسـییەکدا بەدی دەکـات و دەیگرێت.[١٢٣]

ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٢/١٠/٢٠ موەفەق، بەرپرسی ئەمنی ئەو نـاوچەیە لە دەرگـای ماڵی سەردار سەعید ئەمین ئەدات و پرسیاری بەکر سدیق (مامۆستا کاکەڕەش)ی لێ دەکات، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: من نازانم.

دوای ئەوە سەردار بە پەلە بۆ مـاڵی عـومەر قـادر دەچێت و لە دەرگایـان دەدات، عـومەر دێـتە دەرەوە و سـەردار هەواڵەکەی پـێ دەگەیەنێـت. عـومەر پێـی دەڵێـت: خەمت نەبێت کاکەڕەش چەند ڕۆژێکە لە ماڵی ئێمەیە! پاشان عومەر، سـەردار لەگەڵ خۆیـدا ئەبـاتە ژوورەوە، سـەردار کـاکەڕەش دەبینـێ و چـۆنیەتیی ڕووداوەکەی بـۆ دەگێڕێتەوە.[١٢٤]

ڕۆژێک لەدوای ئەوە و لە بەرەبەیانی ڕێکەوتی ١٩٨٢/١٠/٢١دا دەچنە سـەر مـاڵی عومەر قادر عەلی و دەستگیری دەکەن.

کەواتە، ئەو بەیـانییەی عـومەر دەگـرن، کـاکەڕەش لە مـاڵی ئەوان دەبێـت و لەو کـاتەدا کە دەدەن بەسـەریاندا، ئەو خـۆی لەژێـر قەرەوێـڵەکەدا دەشـارێتەوە، وەلـێ

---

١٢٣. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێزان: حامید عەبدوڵا ڕەزا (عەسکەری) و قادر سەی مستەفا.

١٢٤. سەردار سـەعید ئەمین، هەسـتنامەی زینـدان، ئەمیرە محـەمەد، چاپخـانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠١٧، ل ٣٤٤.

ئەمنەکان ناچنە نێو ژوورەکە و هیچ شوێنێک ناپشکنن. لەدوای ئەوەی ئەمنەکان عومەر لەگەڵ خۆیان دەبەن و دەڕۆن، کاکەڕەش دێتە دەرەوە و فرتەی لێ ئەکات.

هەر لە هەمان ڕۆژ و بە هەمان ئەو تەکسییەی کە عومەری تێدایە، دەچنە سەر ماڵی سەردار و دەیگرن.

هەر ئەو ڕۆژە و بەرەبەیان کاتێک فایەق عومەر ڕەسوول لە ماڵی خۆیان دێتە دەرەوە و ئەیەوێت بۆ دەوام بڕوات کە ئەو دەمە لە سەرکردایەتیی هێزی ئاسمانی نائیب عەریف دەبێت، مەفرەزەیەکی ئەمن بە تەکسییەکەوە پێی دەگەن و دەستگیری دەکەن.[١٢٥]

ئیدی بەو جۆرە و یەک لەدوای یەک، هەر ڕۆژەی کۆمەڵێک دەستگیر دەکرێت و گیراوەکان، ژمارەیەکی زۆریان تێپەڕاند.

گیراوەکان سەرەتا دەبرێنە بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووک و ئەشکەنجەیەکی ئێجگار زۆر دەکرێن.

لەو ماوەیەدا بەڕێوەبەری ئەمن (ڕائید ئیبراهیم علیوی) و یاریدەدەری کاروباری سیاسی ئەمن (نەقیب قاسم) بەردەوام لەلای زیندانییەکان، باسی عەلی مغاویر ئەکەن و ڕاپۆرتێک کە عەلی مغاویر بە دەستگا ئەمنییەکانی داوە، پیشانی زیندانییەکانی ئەدەن، بە تایبەتی ئەوانەی لەو هێڵەی لای عەلی مغاویر بوونە و پرسیاریان لێ دەکەن: ئەوە دەستوخەتی کێیە؟ ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: ئەوە دەستوخەتی عەلی مغاویرە. هەروەها بەردەوام ئەوە بەگوێی زیندانییەکاندا ئەدەن کە ئەو ڕاپۆرتە عەلی مغاویر پێی داون و ئەوانیش لە پاداشتی ئەوەدا ئازادیان کردووە. بێگومان دەستگا ئەمنییەکان شێوازی جۆراوجۆری ئەشکەنجە و لێکۆڵینەوەیان هەیە، ئەوەی لەگەڵ عەلی مغاویردا کردوویانە، یەکێکە لەو جۆرانە.

دوای ئەوەی عەلی مغاویر زانیاریی تەواو بە دەستگا ئەمنییەکان دەدات، ئازادی دەکەن، چونکە: یەکەم، دەزانن ئەم ئینسانە لە تێکۆشان خاڵی بووەتەوە و لەمەودوا هیچ مەترسییەکی لێ ناکرێت. دووەم، کاتێک دەستگا ئەمنییەکان بە زیندانییەکان

---

١٢٥. فایەق عومەر ڕەسوول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦٤.

دەڵـێن، ئەو ڕاپـۆرتە عەلـی مغـاویر بە ئـێمەی داوە، بـۆئەوەی بـاری دەروونـی زینـدانییەکانی پـێ بشـکێنن و وایـان لـێ بـکەن، نهێنییەکـانی خۆیـان ئاشـکرا بـکەن. کاتێکیش پێیان دەڵێن، لە پاداشتی ئەوە، ئێمە ئەومان ئازاد کردووە، بۆئەوەی ئەمـان فریو بدەن و بڵێن، ئەگەر ئێمەش وەکوو ئەو هاوکاریی دەستگا ئەمنییەکان بکەین، ئازاد دەکرێین. لەلایەکی دیکەشـەوە کارێکی وا دەکەن، لەجیاتی ئەوەی خۆیـان بێن عەلی مغاویر بکوژن، بە دەسـتی هاوڕێکانی خۆی بە کوشـتی ئەدەن، هەر وەکـوو کردیـان.ئەبێ لێـرەدا ئەوەش بڵێـین کە گیراوەکـانی ڕێکخسـتنەکانی کـۆمیتەی ئـاگر، بەهـۆی ئەو ڕاپۆرتەی عەلی مغـاویرەوە، لە خراپتـرین و سـەختترین جۆری گرتنـدا بـوونە. بێگومـان گـرتن شـێوازی زۆرە، یەکێـک لەو شـێوازانە ئەوەیە، تەنهـا بەهـۆی گومانلێکردنەوە و بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر ئەو کەسە هەبێت دەگیرێت. ئەمە سـووکترین جـۆر و حـاڵەتی گـرتنە. بەڵام گیراوەکـانی ڕێکخسـتنەکانی ئـێمە لە قورسـترین جـۆر و حـاڵەتی گرتنـدا بـوون، چـونکە کلێشـەی ڕێکخسـتن، یـانی تـۆڕی پەیوەنـدییەکانیان لەبەردەسـتی دەسـتگا ئەمنییەکانـدا بـووە. کاتێـک یەکەم کەس دەگیرێت، پرسیاری لـێ دەکەن، نـاوە نهێنییەکەی لە ڕێکخسـتندا چـی بـووە. ئیـدی تـا ئەو شوێنە زەحمەتە، ناوی نهێنی خۆی ئاشکرا بکات، لەدوای ئەوە، نـاوی نهێنـی ئەو کەسـە لە کلێشـەکەدا دەدۆزنەوە و پێـی دەڵـێن، کە بەرپرسـەکەی کێـیە و خۆشـی بەرپرسی چەند کەسە! ئیدی ئەو کەسە هیچ بـوارێکی تەک و جمی بۆ نـامێنێتەوە و دەسـتگا ئەمنییەکـان دڵنیـان کە ئەو زینـدانییە چەنـد کەس دەناسـێ و دەبێـت نـاوی چەند کەسیان بۆ ئاشکرا بکات.

شاڵاوەکە هەر بەردەوامە، هێزە سـەرکوتگەرەکان وەک سـەگی هـار کەوتـوونەتە پەلامار و شاریان بەسەریەکدا داوە و داریان بەسـەر بەردییەوە نەهێشتووە. ئەوەی بە چەنـدین سـاڵ خەبـات و تێکۆشـانی نهێنی پڕ لە ڕەنـج، خشـت بەخشـت بەسـەر یەکەوەمان نابوو، بە مانگ و نیوێک تەفروتونایان کرد.

دوای نـزیکەی دوو هەفتەیەک لە دەسـتپێکی شـاڵاوەکە، حامیـد عەبـدوڵا ڕەزا بـۆ ماڵمان هات و وتی: ئەرێ کاک سالار! من وام بیستووە کە ئەسعەدیش گیرا بێت!

منیش وتم: چۆن؟! ئەسعەد خۆی هاتە لام و گوتی: دۆخەکە خراپە، ئەچم بۆ هەولێر، ماوەیەک لەوێ خۆم دەشارمەوە.

ئیدی قەرارمان کرد بچین سۆراخێکی بکەین، بەڵام خۆ ناکرێت بۆ ماڵیان بچین، باش نییە و ڕەنگە لەژێر چاودێریدا بێت، بەڵکوو وا باشە بچین بۆ لای براکانی و لە شوێنی کار بیانبینین، ئەگەر گوتیان، بەڵێ ئەسعەد گیراوە و هەواڵەکە ڕاست بوو، ئەوا لەگەڵ حامید بڕیارمان دابوو، هەردووک پێکەوە شار بەجێ بهێڵین و بچین ببین بە پێشمەرگە. لەگەڵ حامید بۆ دوکانی لیفەدوورییەکەی محەمەدی برا گەورەی ئەسعەد چووین، داخرابوو. پاشان بۆ دوکانی فیتەرییی ئەحمەدی برای چووین، ئەویش داخرابوو ... بەو جۆرە کەسمان نەبینی و هیچ وەڵامێکی ئەسعەدیمان چنگ نەکەوت، وەلێ ئێمە هەر لە خۆمان دڵنیا نەبووین و ماوەیەک خۆمان شاردەوە.

ئەو دوو هەفتەیەی کە ئێمە تێیدا بێخەم بووین، ئەسعەد لەژێر گەورەترین ئەشکەنجەدا بوو، لەسەر ناوی ئێمە هەلاهەلایان کردبوو!بە هەر حاڵ! کەوتینە دوودڵی و ڕاراییەکی زۆرەوە، هیچمان لەلا ڕۆشن نەبوو، نە ئەوەتە بزانین گەیشتووەتە هەولێر و سەلامەتە، نە ئەوەتە دڵنیا بین کە گیراوە! بۆیە بۆ ماوەیەک دەوامی زانکۆم نەکرد و بۆ ماڵیش نەدەچوومەوە ... شوێنێکی واشم نەبوو، لێی بمێنمەوە و خۆمی تێدا پەنا بدەم. ئەو دەمە بە حوکمی ئەو تەمەنەی ئێمەی تێدا بووین، هاوڕێی خێزاندارمان نەبوو، پەیوەندییەکانمان هەمووی لەگەڵ کەسانی وەکوو خۆمان بوو کە لە ماڵەوە خاوەن بڕیار نەبوون و بگرە هەر بۆ خۆشیان بارێک بوون بەسەر ماڵەوەیاندا. چەند ڕۆژێک لە ماڵی مامی دایکم (عەریف ئەحمەد محەمەد) لە گەڕەکی ڕەحیماوا خۆم پەنا دا، بەڵام لەوێش لەوە زیاتر ئیدی نەدەکرا. بەو جۆرە و بەو ڕەزالەتە هەر شەوەی لە شوێنێک بووم، زۆریان لێمان گرت و شەویش نەبوو چەندی دیکەمان لێ نەگرن. زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەش لە دەوروپشت و لە گەڕەکی ئێمە بوون، من زۆربەیانم وەکوو شەخس دەناسی.

لەدوای ١٠-١٥ ڕۆژێک، پەروەندەی زیندانییەکان ئامادە دەکرێن و هی هەر کەسە ئەدرێتە دەستی خۆی، تاوەکوو بیخوێنێتەوە و بزانێت ئیفادەکەی چۆن

نووســـراوەتەوە، ئەگەر هـــیچ تـــانەیەکی لەســـەری نەبـــوو، ئیمـــزای دەکـــات، ئەو کەسانەیش کە خوێندەوارییان نەبووە، ئیفادەکانیان بۆ دەخوێننەوە.

دوای ئەوە زینـــدانییەکان بە خۆیـــان و پەروەنـــدەکانیانەوە، بـــۆ هەیـــئە تـــازەکە دەگوێزنەوە. دیسانەوە لەوێش دەکەونەوە ئەشکەنجەدانیان، وەلێ نەک بەو ڕادەیەی کە لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووکدا هەبوو.[126] گیراوەکـان لێرەدا بـۆ مـاوەی ٤٠-٤٥ ڕۆژێـک دەهێڵـنەوە، پاشـان بـۆ هەیـئە کـۆنەکە کە دەکەوتە نێـو بینایەکـانی فەیلەقی یەکەوە، دەگوێزنەوە. ئیدی گیراوەکان لێرە دەهێڵنەوە، هەتاوەکوو بە ڕۆژی دادگاییکردن دەگات.

لە ڕێکەوتـــــی ١٩٨٢/١/١٣دا زینــــدانییەکان بە چاوبەســــتراوی دەخەنە نێــــو ئۆتـۆمبیلەوە و بـۆ دادگـای تـایبەتیی کەرکـووک کە دەکەوتە نێـو بینـایەی هەیـئە تازەکەوە، دەگوێزنەوە.[127]

دادگـــا هـــۆڵێکی گەورەیە، ســـەکۆیەکی تێـدایە کە بە چەنـــد پلیکـــانەیەک بـــۆی ســـەرئەکەوی، مێزێـــک لەســـەر ســـەکۆکەیە، لە پشـــتی مێـزەکەوە دادوەر (موســـلیم ئەلجبووری) و چەنـد ئەفسـەرێکی پلە بەرز و لەولاشـەوە جێگری داواکـاری گشـتی ڕۆنیشتوون. زیندانییەکانیش لە خوارەوە لە قەفەسێکی گەورەیان ترنجاندوون.[128]

ئەوەی شـایانی باسـە، دەستگا ئەمنییەکـان لیژنەکـانی ئیغتییالاتیـان بەلاوە گرنگتـر بـــووە، بـــۆیە لە ســـەرەتادا نـــاوی ئەوان و 'ئەســـعەد و فـــارووق و فەهمی'یـــان خوێندووەتەوە. ادگاییکردنەکە سێ ڕۆژ دەخایەنێت و زیندانییەکان سـێ جـار دەچنە بەردەم دادگا. لە ڕۆژی یەکەمدا تەنها ناوەکانیـان دەخـوێننەوە و لە دوو ڕۆژەکەی دیکە دادگاییکردنیان بە ئاکام دەگات.

وردە وردە لێشـاوەکە خـاو بـووەوە و نیشـتەوە، ئەو پـایزە بەڕاسـتی پـایز بـوو، جادەوبانەکان و نێو گەڕەک و کووچە و کۆڵانەکان گشت ڕەنگی پایزیان گرتبوو،

---

١٢٦. فایەق عومەر ڕەسوول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦٧.

١٢٧. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز نەوزاد بەهائەدین محەمەد.

١٢٨. فایەق عومەر ڕەسوول، هەستنامەی زیندان، ئەمیرە محەمەد، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠١٧، ل ٣٦٨.

ترس و خۆف گشت سووچێکی تەنی بوو. دوو مانگ بەر لەوە خەڵکی شانازی بە خۆیەوە دەکرد، پیاوخراپ و بەکرێگیراوانیش وەک جرجی زراو تۆقیو، لە سێبەری خۆیان دەسڵەمینەوە ... بەڵام ئەو دەور و دوکانە گۆڕا، ئێستا ئەوان بە نەشئەن و تریفەیان دێت، ئەمنی کەرکووکیش لە ڕاست خانەوادە و کەسوکاری ئەوانەی بەر زەبری شانە چەکدارەکان کەوتن، ڕووسوور و سەربەرزن، شانازی بەوەوە دەکەن کە نەیانهێشت خوێنی ئەوانە بە هەدەر بڕوات و لەولاشەوە ئارامی و ئاسوودەییان بۆ باقی بەدکاران بەدەست هێنایەوە.

# دادگا حوکمی خۆی بەیان دەکات

ڕۆژی (١٩٨٢/١/١٦)ە، سـێیەمین ڕۆژی دادگـاییکردنەکەیە. لەو ڕۆژەدا دادگـا بڕیـاری خـۆی ئەدا و ڕای دەگەیەنێـت. زینـدانییەکان ژمارەیـان ٣٧ کەسـە و لە قەفەسـێکدا تونـد کـراون و هێشـتا مانـدووی پـاش ئەشـکەنجەن و برینەکانیـان قەتمـاغەی نەگرتـووە. بە دڵێکـی نائـارام و بە چـاوێکی پـڕ لە چـاوەڕوانییەوە بـۆ سەکۆکە دەڕوانن. هێندێکیان لێیـان مەعلوومە، چارەنووسیان بەرەو سێدارەچوونە، هێندێکیشیان لێیان مەعلوومە، دەبێت بۆ مـاڵێکی نوێ، ڕێگای بەندیخانەی بەدنـاوی ئەبووغرێـب بگـرنە بەر. وەلـێ بەشێکیشـیان لەو نێـوانەدان و بە حـوکمی زینـدانیی هەتاهەتـایی ئەبووغرێـب مەمنوونن.ئەمـانە چاوێکیـان لە دادوەر و چاوێکیـان لەلای موحسین عومەر سدیق (ڕەنجە) بوو. موحسین یەکێک بوو لە زیندانییەکان، باڵای بەرز بـوو، بەباشـی کـاغەزی سـەر مێزەکەی دەخوێنـدەوە و جـۆری حوکمەکـانی بە هاوڕێکانی دەگەیاند.

سەرەنجام ناوەکان یەک یەک خوێندرانەوە:

- ١٠ کەس حوکمی ئیعدامیان بەسەردا دران:

ئەسـعەد عەزیـز سـۆفی، جەنگـی نەجمەدیـن نـووری، حەسـەن مـحەمەد عەلـی، ڕەشاد محەمەد ئەمین، عەبدولجەبار فەرەج ساڵح، عەبدولقادر بەکر قادر، فارووق عـومەر وەلـی، فەرهـاد مـحەمەد سـەعید، فەهمـی ئەمـین ڕەشـید، محێدین حوسـێن حەسەن.

- ٢٣ کەس حوکمی زیندانیی جۆراوجۆریان بەسەردا دران:

ئەحـمەد قەمـبەر، ئەنـوەر مـحەمەد ئەمـین ڕەحمـان، جەلیل حەمە مراد شـەریف، حەبیب محەمەد حەبیب، حەسـەن ئەحمەد مـحەمەد، حەسـەن مـحەمەد قـادر، حەمید محەمەد کاکەمەند، ڕەشید مەجید حەسەن، سابیر عەبدوڵا حەسەن، سابیر مەحموود عەلـی، سـەردار سـەعید ئەمـین، سـەعدوڵا ئەحـمەد عەزیـز، سـیروان ئەحـمەد قـادر، عەبدولسـەلام قـادر مسـتەفا، عەبـدولڕەحمان حەمیـد مـحەمەد، عەسـرییە ئەحـمەد مـحەمەد، عەلائەدیـن مـحەمەد قـادر، عـومەر قـادر عەلـی، فـایەق عـومەر ڕەسـوول،

موحسین عومەر سدیق، نامیق شەریف مەحموود، نەوزاد بەهائەدین محەمەد، هیوا عەبدولعەزیز محەمەد.

- ٤ کەس ئازاد کران:

تەیب ڕەشید عەبدولڕەحمان، چەتۆ مەجید سەعید، جەمال عەبدولا قادر (مفەوەز)، نەجمە ئەحمەد سالح.

بەڵی! ئیدی بەو شێوەیە ئەو ڕۆژە بڕیاری دادگا خوێندرایەوە و هەر یەکە چارەنووسی خۆی لێ مەعلووم بوو. ئەو شەوە زیندانییەکان پێکەوە دەبن و بۆ ڕۆژی دوای ئەوە، هەر یەکە بەرەو مەنزڵی خۆی ڕەوانە دەکرێ.

سەبارەت بەو کۆمەڵە هاوڕێیەی کە حوکمی ئیعدامیان بەسەردا درا، ڕەوانەی بەشی سێدارەی زیندانی مووسڵ کران.سەبارەت بەو کۆمەڵە هاوڕێیەی کە حوکمی زیندانیی جۆراوجۆریان بەسەردا درا، ڕەوانەی زیندانی ئەبووغرێب کران.

هەروەها بەشێکی دیکە لە زیندانییەکان کە ژمارەیان ١٦ کەس بوون، سەرنگوون کران و لەدواییدا چارەنووسی بەشێکیان زانران کە ئیعدام یان ڕەمی کرابوون، ئەوانیش بریتی بوون لە:

- ٧ کەس سەرنگوون کران و پاشان بەپێی دۆکیۆمێنتەکانی دائیرەی ئەمن لە هاوینی ساڵی ١٩٨٣دا ئیعدام کراون:

سیروان محەمەد ئەمین، عەبدولوەهاب حازم محەمەد، عەبدولمەقسوود محەمەد عەلی، عەدنان محەمەد ئەمین، قەهرەمان کاکە حەسەن، لەتیف محەمەد ئەمین، هادی قادر عەلی.

- ٣ کەس سەرنگوون کران و پاشان بەپێی دۆکیۆمێنتەکانی دائیرەی ئەمن لە هاوینی ساڵی ١٩٨٣دا گولەباران کران:

ئازاد سەیدە محەمەد خدر، محەمەد عەبدولا کەریم، نەعمان ئەنوەر ئەحمەد.

- ئەم هاوڕێیانەی خوارەوە، کە ژمارەیان ٦ کەس بوون، هیچ سەروسۆراخێکیان نەزانرا و بە یەکجاری سەرنگوون کران:

جەواد بەهائەدین عەلی، حەسەن ئەحمەد محەمەد، محەمەد زەکی سدیق، غەفوور فەرەج، فەهمی سدیق، کەریم حەسەن عەلی.

# ئاكامی گرتنەكان

بەو شێوەیە شاڵاوی گرتنەكان بۆ سەر كۆمیتەی ئاگر لە نێوەڕاستی مانگی ١٠ی ساڵی (١٩٨١)ەوە دەستی پێ كرد و لە نێوەڕاستی مانگی ١ی ساڵی (١٩٨٢)دا چارەنووسیان یەكلایی كرایەوە.

ئەو شاڵاوی گرتنانە كە ٥٣ كەس لە هاوڕێیانمان تیایدا دەستگیر و زیندانی كران، ڕەنگبێ بە گەورەترینی ئەو زەبرانە بێتە هەژمار (گرتنی خاڵە شەهاب و هاوڕێكانی لێ بترازێ) كە لە درێژەی تەمەنی خۆیدا، بەر پەیكەرەی كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستان كەوتبێت.

ئەم زەبرە لە خراپترین جۆرەكانی ئەو زەبرانەیە كە بەر ڕێكخراوێک بكەوێت، چونكە نووكی هەرەمەكەی بە نیشان گرت و كۆمیتەی شار و بەو پێیەش زۆربەی هەرە زۆری هێڵەكانی ڕێكخستنی تێک شكاند و باقییەكەی گۆج كرد.

كۆمیتەی ئاگر كە بۆخۆی لە ٣ ئەندام پێک هاتبوو، دوانیان (ئەسعەد و عومەر) دەگیرێن و ئەوەی تر (كاكەڕەش) بە ڕێكەوت ڕزگاری دەبێت.

ژمارەیەكیش نەگیران و چوونە دەرەوە و ئەوەندەی من بزانم ژمارەیان زۆر نەبوون و لەنێویاندا بێجگە لە كاكەڕەش و ئەو خەتەی كە پێوەی بوو، ئەم هاوڕێیانەش بوون: عومەر نەجار (عومەر حوسێن قاسم)، ئیبراهیم ئەحمەد خدر (سەركەوت)، عەبدولخالق ساڵح (چیا)، فاریق حوسێن، زاهیر ...

هەر وەكوو پێشتریش باسم كردووە، هاوڕێیانێک هەبوون، ئاشكرا نەبوون و دەستگیر نەكران، بەڵام دوای ئەوە بەهۆی ئەو فەزای ترس و تۆقاندنەی لە كاتی گرتنەكان و پاشی ئەوە بەسەر ڕێكخستنەكانماندا هاتن، وازیان هێنا، یان پچڕانەوە و نكۆڵییان لە پەیوەندی خۆیان بە ڕێكخستنەوە كرد و ئامادە نەبوون درێژە بە كاری خۆیان بدەن.

ئەوەی شایانی باسە، بێجگە لەو هاوڕێیانەی ڕێكخستن كە دەستگیر نەكران و ڕایان كرد، ژمارەیەكی دیكەش كە ئەو دەمە ئەندامی ڕێكخستنەكانی ئێمە نەبوون، وەلێ بەهۆی ترس لە پەیوەندی كۆنی ڕێكخراوەییانەوە شار بەجێ دەهێڵن، لەوانە:

خالید مەجید فەرەج (خالیدی پەرستیار)، سەباح مەحموود کەریم، ، نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا (نەجمەدین ڕەشید عەبدوڵا)، هۆشیار عەبدولخالق عەبدولکەریم. هەروەها عوبێد خالید ڕەئووف (تۆماری)یش هەر لەگەڵ ئەمان دەچێتە دەرەوە، بەڵام دوای ئەوەی هەست بە مەترسییەک ناکات، دەگەڕێتەوە.[١٢٩]

بەو شێوەیە، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک لەوپەڕی بەهێزی و توانستی خۆیەوە، لە ئەوجی کار و هەڵسووڕان و چالاکیی سەربازیی خۆیەوە، کەوتە بەر گەورەترین شاڵاوی گرتن و ڕاوەدوونان.

ئەوەی دوای ئەو تۆفانە لە ڕێکخستنەکان مایەوە، کۆمەڵێک ئەندام و کادر و شانە و خەتی لێک ترازاو و پەرتەوازە بوون، کە هەر یەکەی کەوتبووە قوڵ و قوژبنێکەوە و کۆکردنەوە و لێک بەستنەوەیان، جگە لە کاری زۆر و ئارام و پڕ حەوسەڵە، تین و تاو و ورەیەکی باشیشی گەرەک بوو.

---

١٢٩. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز عوبێد خالید ڕەئووف (تۆماری)

# ئەم شاڵاوە بۆچی؟

ڕەنگبێ لەدوای خوێندنەوەی ئەم کورتە باسەی ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر و شێوازی پەیوەندی و کار و چالاکی و هەڵسوکەوت و بەرخوردەکان، هەر یەکە لە شوێن خۆیەوە بتوانێت چەندین خاڵی لاواز و هەڵەت و پەڵەت دەستنیشان بکات و هۆکاری گرتنەکان شی بکاتەوە.

سەرەتا ئەبێ ئەوەمان لەلا ڕۆشن بێت، شاڵاوی گرتنەکان بۆ سەر ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر بەرەنجامی کار و چالاکیی سەربازی و پێشمەرگانەی نێوشار بوو، نەک کار و هەڵسووڕانی ڕێکخراوەیی و سیاسیمان. واتە: بەهۆی ئەو چالاکییە سەربازییانەوە کە شانە چەکدارەکان پێی هەستان، تەواوی ڕێکخستنەکانمان بەرکەوتن و تەفروتوونا بوون.

کەواتە: یەکەمین و گەورەترین هەڵەی ئێمە، تێکەڵاوکردنی شانەکانی ڕێکخستن و شانە چەکدارەکان بوون لەگەڵ یەکتری.

ئەمە بە جیا لەوەی، ئایا بۆ ڕێکخراوێکی مارکسیستی کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی پشت بە هێزی جەماوەریی کرێکاران و زەحمەتکێشان دەبەستێت و ڕێکخستنی ناڕەزایەتیی کرێکاری و جەماوەری بە ئەرکی خۆی دەزانێت، کاری سەربازی و هەبوونی باسکی چەکدار بە گشتی و کاری ئیغتیالات و کوشتن و تیرۆری فەردی بە تایبەتی دروستە یان نا؟ ئەوە بۆخۆی مەسەلەیەکە و لەژێر پرسیار دایە. بەڵام ئێمە لێرەدا ناچینە نێو ئەو باسەوە و ئەوە بە فەرز وەردەگرین کە ئەو کارە ئوسووڵی و دروست و ڕێگەپێدراوە.

لەڕاستیدا ئەم تێکەڵکردنە لەنێو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا داب و نەریتێکی قەدیمی و بڵاو بوو. کۆمەڵە لەنێو ڕێکخستنەکانی نێوشاریدا، لە هەر جێگایەک بۆی لوابێت، لیژنەی ئیغتیالاتی پێک هێناوە، تاوەکوو لەوێوە پیاوان و جاسووسان و دەستوپێوەندەکانی دەستگا ئەمنییەکانی دەوڵەت کە چاودێریی ڕێکخستنەکانی نێوشار و جموجووڵی پێشمەرگە دەکەن و بەو هۆیەوە زەبریان لێ دەوەشێنن، ئیغتیبال بکەن.

لەڕاستیدا هەندێک جار ئەو لیژنانە هەر بە تیرۆری پیاوانی دەوڵەت نەگیرساونەتەوە، بەڵکە تیرۆری ئەندامان و کادرانی نێو ئەو حیزب و لایەنانەی دژی دەوڵەتیشی گرتووەتەوە کە ناکۆکییەکانی نێوانیان لەسەر ڕابەرایەتی و پاوانخوازی تێژبوونەوەی بەخۆوە بینیوە.

هەندێک جاریش ئەو لیژنانە بۆ تیرۆری ئەندامان و کادرانی ئەو سازمان و گرووپانەش بەکار هێنراون کە ناکۆکیی فکرییان لەگەڵ کۆمەڵەدا هەبووە و ڕەخنەیان گرتووە و تەبلیغاتیان لەدژی کۆمەڵە کردووە. نەک هەر ئەوەندە، هێندێک جار بە هۆی جیاوازیی فکری، یان بەهۆی هەر کێشەیەکەوە بووبێت، هاوڕێیانی خۆشیان پێ تیرۆر کردوون.

کەواتە، یەکەمین خاڵی نادروست لەنێو ڕێکخستنەکانی ئێمە لە شاری کەرکووک (هەر وەکوو باقیی شوێنەکانی دیکە)، تێکەڵاوکردنی لیژنەکانی ئیغتیالات و شانەکانی ڕێکخستن بووە. چونکە لیژنەکانی ئیغتیالات بە هۆی تەبیعەتی کارەکەیانەوە، هەمیشە لە مەترسی ئاشکرابووندان و دەستگا جاسووسییەکانیش زۆرتر چاویان لەسەر ئەو لیژنانەیە، تاوەکوو بە ڕێکخستنەکان دەگات. ئەو دەمە بەهۆی لیژنەکانی ئیغتیالاتەوە، شانەکانی ڕێکخستنیش ئاشکرا دەبن و دەکەونە بەر شاڵاوی گرتن.

سەبارەت بە مێژووی لیژنەی ئیغتیالات لەنێو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک، لە پاش شکستی بزووتنەوەی چەکداری بە ڕێبەرایەتیی پارتی و بارزانی، یەکەمین لیژنە لە ساڵی ١٩٧٨ لە سوارە کەمال و خالید مەجید فەرەج (دکتۆر خالید) بە سەرپەرشتی محەمەد حەسەن خورشید پێک دێت.

هەر لە هەمان ساڵدا سێ شانەی دیکەی تاکەکەسی پێک دەهێنرێن کە بریتی بوون لە: شەهید نوعمان کلاوقوتی کە ئەمیش هەر پەیوەندی بە "محەمەد حەسەن خورشید"ەوە هەبوو، شەهید شوان تەپەیی کە پەیوەندی بە "فایەق عومەر ڕەسووڵ"ەوە هەبوو. هەروەها شانەیەکی تاکەکەسی دیکە، لە نائیب زابتێک پێک هاتبوو کە پەیوەندی بە مامۆستا کاکە ڕەش (بەکر سدیق)ەوە هەبوو.[١٣٠]

---

١٣٠. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز محەمەد حەسەن خورشید (حەمەی سانییە).

دەوروبەری دوو ساڵێک لەدوای ئەوە و لە بەهاری ساڵی ١٩٨٠دا هێڵێکی سەربازی کە مەلا محێدین (محێدین حوسێن حەسەن) فەرماندەیان دەبێت، بۆ کۆمیتەی ئاگر دەگوێزرێنەوە و دەدرێنە لای عەلی مغاویر. مێژووی ئەم هێڵە لەو دەمەدا بۆخۆی تازەیە و سەرەتا پەیوەندییان بە هەرێمی دووی کەرکووکەوە دەبێت و لەلایەن ئەوانەوە ڕێنوێنی و کۆمەک دەکرێت.[١٣١]

مەلا محێدین لە کاری چریکی نێو شاردا، کەسێکی زۆر بەتوانا و بە ئەزموون بوو، لەڕادە بەدەر بێباک و بوێر بوو، لەژێر ئەشکەنجەشدا قارەمانی زیندان بوو. دیارە زۆربەی ئەفرادی ئەو شانە چەکدارانە، لە ئازایەتی و نەبەردییان بێ کەمایەسی بوون، ئەگەر بهاتبایە ئەوانە وەک گەنجینەیەکی ڕێکخستن چاویان لێ بکرایە، مەشق و ڕاهێنانی کاری چریکیی نێو شاریان پێ بکرایە و بەگوێرەی پرەنسیپ و دیسیپلین و ئوسوولی نهێنیکاری پەروەردە و بار بهێنرایەن، دەیانتوانی کاری ئێجگار گەورە و مەزن ئەنجام بدەن و دەستگا ئەمنییەکان لەو شارەدا بەچۆکدا بدەن و هەر وا بە سانایی و ئاوها بە کۆمەڵ نەکەونە نێو داو و تەپکەی دەستگا سیخوڕییەکانەوە.

خاڵێکی دیکە لە هۆکارەکانی ئەو کارەساتەی بەسەر کۆمیتەی ئاگردا هات ئەوە بوو، لیژنەکانی ئیغتیالات نەک هەر تێکەڵی شانەکانی ڕێکخستن کرابوون، بەڵکوو لێکیش هەڵپێکرابوون، نەک هەر ئەوەندە، بگرە زۆرێکیش لە شانە و کۆمیتەکان، بە خودی 'کۆمیتەی ئاگر'یشەوە، ببوونە لیژنەی ئیغتیالات و ڕاستەوخۆ بەشدارییان لە پلاندانان و تەنانەت هەندێک جار و هەندێکیان بەشدارییان لە جێبەجێکردنیشیدا دەکرد. لە کاتێکدا دەبوو، لیژنەکانی ئیغتیالات هیچ پەیوەندییەکیان بە ڕێکخستنەکانەوە نەبێت و سەربەخۆ بن.

ئەوەش بە هەر حاڵ، ئەگەر لیژنەکانی ئیغتیالات تێکەڵ بە ڕێکخستنیش هەر دەکرێن، بەڵام بۆچی هەر ئەندام کۆمیتەیەک، بە خودی ئەندامانی کۆمیتەی ئاگریشەوە، هەر بابە و لیژنەیەکی ئیغتیالاتی بۆخۆی هەبێت و خەریکی کاری ئیغتیالات و نەخشەدارشتن و جێبەجێکردنی بێت. دەکرا لیژنەکانی ئیغتیالات

١٣١. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

هێڵێکی سەربەخۆ بن و تەنها یەک کەس لە کۆمیتەی ئاگر دابنرێت، سەرپەرشتی ئەو هێڵە بکات و ئەویش تەنها بەرپرسی ئەو هێڵە بناسێ. لەوەش تۆکمە و مەحکەمتر ئەوە بوو، لیژنەکانی ئیغتییالات هەر بۆ خۆیان هێڵێکی لێک هەڵپێکراویان لێ پێک نەهێنرێت، بەڵکە کۆمەڵێک لیژنەی دابڕاو و مونفەسیل بن و هەر یەکە کاری خۆی بە جیا لەوانی دیکە بکات و هەر کاتێکیش چالاکییەک پێویستی بە کاری چەند لیژنەیەک کرد، ئەوا دەیانتوانی لە ڕێگەی فەرماندەیەکی گشتییەوە هاوئاهەنگی بکەن. بۆ ڕەچاوکردنی ئەمنییەتی زیاتر، دەکرا فەرماندە گشتییەکە جێگەوڕێگەی فەرماندەی لیژنەکانی ئیغتییالات بزانێت، بەڵام ئەوان هی ئەم نەزانن.

بەو جۆرە لە کاتی ئاشکرابوونی هەر لیژنەیەک، لیژنەکانی دیکە ناکەونە بەر مەترسی و لە شوێنێکدا ئاگربڕ دەبێت و کۆمیتەی بالای ڕێکخستن و باقی ڕێکخستنەکانی دیکەش لە مەترسی بە دوور دەبن و هیچ زیانێکیان پێ ناکەوێت.

کەواتە، کۆمیتەی ئاگر و ڕێکخستن و لیژنەکانی ئیغتییالاتی، لە خراپترین و سەقەتترین جۆری پەیوەندی و هەیکەلی ڕێکخراوەییدا بوون و بە دەرکردنی تەنها خشتێکی ئەو ساختارە، تەواوی بیناکە هارە دەکات، هەر وەکوو کردی.

ئەمانەی کە باسمان کرد، کۆمەڵە پرەنسیپ و دیسیپلینێکی ڕێکخراوەیی و کاری چەکدارانەی شاری بوون کە بۆ ئەو دەمەی ئێمە سازمانی چریکەهای فیدائی خەڵقی ئێران زۆر تیایدا شارەزا بوون، لەوانیش زیاتر ڕێکخراوێکی مارکسیستی گەریلایی نێوشار لە سالانی ١٩٦٠-١٩٧٠ لە ئۆرۆگوای بە نێوی "توپامارۆس"وە هەبوو، زۆر چالاک و زۆر تۆکمە و توندوتۆڵ و بەدیسیپلین بوون.

بەڵێ! ژێربینای ڕێکخستنەکانی ئێمە نەک هەر بەو جۆرە نەبوون، بەڵکە لەولای ئەوەشەوە، کۆمەڵێک خاڵ و هەڵەی دیکە هەبوون کە پەیوەندییان بە پەروەردەی ئەندامان و سەرەتاکانی دیسیپلین و کاری نهێنیکارییەوە هەبوو، لە ڕێکخستنەکانی ئێمەدا غائیب بوون و زەبری گەورەیان وەشاند کە لێرەدا ئاماژیان پێ دەکەین:

یەکەم: ئەو هێڵە سەربازییە و لیژنەکانی ئیغتییالات بە شێوەیەکی گشتی و پێشووتر پەیوەندییان بەو هێڵەی لای عەلی مغاویرەوە هەبوو، لە کاتێکدا ئەو کەسە ماوەیەکی کەم پێش ئەوە دەگیرێت و پاشان ئازاد دەکرێت، وە بەو هۆیەوە ئەحمەد

کرێکار بەرپرسی ئەو دەمەی کۆمیتەی ئاگر دەچێتە دەرەوە و شار بەجێ دەهێڵێت. واتە، ئەو کەسە جێگای گومانە. کەچی ئەندامانی ئەو لیژنانە، نەک هەر لە شوێنی خۆیاندا مانەوە و جێگۆڕکێیەکیان بە خۆیان نەکرد، بەڵکە بەچڕوپڕی کەوتنە چالاکی و ئیغتیيالات و ویزەی پیاوانی دەوڵەت.

دووەم: چڕکردنەوەی چالاکییەکان بە زۆری لە یەک شوێن (گەڕەکی ئیمام قاسم) و ئەنجامدانیان یەک لەسەر یەک و بێ فاسیلە. ئەو شێوازە لە کارکردن، دەبێتە هۆی ئەوەی دەستگا ئەمنییەکان تەرکیزی زیاتر بخەنە سەر ئەو شوێنە و دۆزینەوەیان ساناتر بکات.

سێیەم: پەیڕەوی نەکردن لە پرەنسیپی "زانیاری بەگوێرەی پێویست". واتە، هەر ئەندام و هەڵسووڕاوێک تەنها ئەوەندە زانیارییەی لەلا هەبێت کە بۆ ڕاپیکردنی کار و هەڵسووڕانی خۆی پێویستی پێی هەیە. بەڵام لەنێو ڕێکخستنەکانی ئێمە و لیژنەکانی ئیغتیيالاتدا گەلێک زانیاری لەپێش و لەدوای هەر چالاکییەک دزەیان دەکرد کە بەهیچ کلۆجێک ئەو کەسانە پێویستییان بەو زانیارییانە نەبوو. تەنانەت جاری وا هەبووە، بەر لەوەی چالاکییەک ئەنجام بدرێ، ئەندامانێک کە بەهیچ تەرزێک پەیوەندییان بەو چالاکییەوە نەبووە، ئاگادار بوونە و زانیارییان لە بارەیەوە هەبووە! زۆر جاریش لەدوای چالاکییەکان زانیاری ئەوە دەکەوتە لای هەندێک کە کێ بە فڵانە چالاکی هەستاوە!

ئەو زانیارییە زیادانە لە کاتی شێنەییدا هەست بە زیانیان ناکرێن، وەلێ لە زینداندا هەر یەکە دەبنە بارێکی قورس و زیانی گەورەیان لێ دەکەوێتەوە.

چوارەم: ئەنجامدانی چالاکییەک لە جێگایەک کە تۆ تیایدا ناسراویت و پەنجەت بۆ درێژ ئەکەن، بەڵام تۆ نادیدەی بگریت و شار بەجێ نەهێڵی!

پێنجەم: لە کاتێکدا کە هاوڕێی شانەکەت گیرا، دەبێت خۆت پەنا بدەیت، یان شار بەجێ بهێڵی، بەڵام هەندێک لە هاوڕێیانی ئێمە ئەو کارەیان نەکرد، بۆئەوەی خوشک و دایکیان نەگیرێت، یان گوێیان پێ نەدا، وە یان درەنگ کەوتنەخۆ و بەدەم ڕێگەی خۆدەربازکردنەوە گیران، وە یان شوێنێکیان کردە پەناگە کە بۆخۆی بە ئامانج گیراوە.

شەشەم: کاتێک کە شالاوی گرتن دەست پێ دەکات، یەکەمین ڕێکار تۆ بیگریتە بەر، دەبێت تەوای ئەو شتانەی دەبنە بەڵگەی وابەستەگی تۆ بە ڕێکخستن و لیژنەی ئیغتیالاتەوە لە ماڵ نەیهێڵی و دووری بخەیتەوە.

حەوتەم: خاڵێکی گرنگی دیکە، مەشق و ڕاهێنان و کردنەوەی خولی فێرکردنی کاری پارتیزانی نێو شار بۆ ئەو پارتیزانانە کە دەبنە مایەی زیاتری ڕادەی سەرکەوتن و زەمانەتی زیاتری گیانی پارتیزانەکان. بە داخەوە ئەو هاوڕێیانەی ئێمە بەو خولانە نامۆ بوون[١٣٢] و هەر وا هەڕەمەکی و هەر یەکە بەگوێرەی زانین و شارەزایی و ئەزموونی خۆی ڕەفتاری کردووە.

بەو شێوەیە و لە ئەنجامی ئەو هەڵانەدا، ژمارەیەکی بێشومار لە هاوڕێیانمان دەستگیر کران، ئەشکەنجەی وەحشییانە دران، حوکمی زیندانی دران یان ئیعدام و گولەباران کران، خۆیان شاردەوە و ڕایان کرد، لە کار و کاسبی و خوێندن بوون، خانە و لانەیان لێ تێک چوو، ئاوارە و پەرتەوازە و سەرگەردان بوون، تووشی نەبوونی و داماوی و دەستەنگی، ترس و خۆف و دڵەڕاوکێ هاتن ... هتد.

بەڵێ! خەبات و تێکۆشان بەبێ قوربانی نابێت، وەلێ دەکرێ ڕێژەی قوربانییەکانمان کەم بکەینەوە و قوربانی خۆڕایی نەدەین. هەر تێکۆشەرێک بگرێت، بۆ بزووتنەوەکەی گەنجینەیەکە و دەبێت بەرپرسانی حیزب، بەرپرسانە مامەڵەی لە تەکدا بکەن.

لەپاش هەموو ئەمانە گشت، خاڵێکی زۆر گرنگ و حەیاتی ئەوەیە، لە کاتی ڕووداوێکی وادا، ڕابەرایەتیی حیزبێکی جددی و بەهۆل، دێت لێکۆڵینەوەیەکی باش لەسەر ڕووداوە دەکات، هۆکارەکانی دەستنیشان دەکات، دەرس و ئەزموونی لێوە هەڵدەهێنجێنێ و کادرەکانی لێ ئاگادار دەکاتەوە و ڕێکاری پێویست بۆ دووبارە نەبوونەوەی دەگرێتە بەر.

بەڵام بەداخەوە، ڕابەرایەتیی ئەو دەمی کۆمەڵە، لەو بارەیەوە نەک هەر کۆبوونەوەیەکیان بە ئێمە، ئەندامانی کۆمیتەی ڕێکخراوی نوێ نەکرد، بەڵکە تەنانەت یەک دانە تێبینی و کەمترین ڕوونکردنەوەشیان بە ئێمە نەدا!

---

١٣٢. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێزان: محەمەد حەسەن خورشید (حەمەی سانییە) و سەلمان کەریم شەریف.

# هەڵسووڕانمان لە دەورانی هەولێر

من لە باسەکانی پێشوومدا باسی ئەوەم کرد، زانکۆ لە سلێمانییەوە بۆ هەولێر گوێزرایەوە و ئەسعەد و من تاقیکردنەوەی دەوری دووەممان پێکەوە لە هەولێر دا و پاش گەڕانەوەمان بۆ کەرکووک بە ماوەیەکی کەم، شالاوی گرتنەکان دەستی پێ کرد و ماوەیەک ئاگاداریی خۆم کرد و خۆم شاردەوە.

خوێندنی ساڵی نوێ دەستی پێ کرد و بەو هۆیەوە من ماوەیەک تاخیر چووم، کاتێکیش کە چووم، هەندێک لە هاوپۆلەکانم کاتێک لە دوورەوە منیان بینی ئەبڵەق بوون و زۆر بە سەرسووڕمانەوە چاویان تێم بڕی، چونکە هەواڵی ئەو شالاوە گەورەیەیان بیستبوو، وایان زانیبوو کە منیش گیراوم، بە تایبەتی هەواڵی گیرانی "ئەسعەد"یان بیستبوو، نزیکایەتیی ئەسعەد و منیش لای ئەوان بەرچاو بوو.

بە هەر حاڵ، دەستم بە دەوامی زانکۆ کردەوە. بەپێی ئەو سیستەمەی ئەوێ ڕۆژێ تەنها دەوامی ئەو ماددانەم دەکرد کە لێی دەرنەچووبووم. بۆیە دەوامم کەم و وەختم زۆر بوو، زۆربەی وەختی خۆمم بۆ پەرەپێدانی ڕێکخستنەکان تەرخان کردبوو. ژیانی ئێمە هیچ شتێکی لە جێی خۆیدا نەمابوو، لە شاری خۆمان ڕاگوێزراین، لە دێهات ڕاگوێزراین، سەرەنجام لە زانکۆش هەر ڕاگوێزراین! ئێمە خوێندکاران ئەمەمان گەلێک لەلا ناخۆش بوو، بە غەدر و سووکایەتییەکی گەورەمان دەزانی، بەئاسانی ناوە سەپێنراوەکەی زانکۆمان بەدەمدا نەدەهات، زانکۆ ئەوەندەی بە سیاسەت و بەرگرییەوە بارگاوی کرابوو، نیو هێندە شوێنی عیلم و مەعریفە نەبوو.

جەنگی نێوان عێراق و ئێران هەر گرمەی ئەهات و گەرووی شەڕ بۆ لووشدانی ئینسانەکان ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ فراوانتر دەبووەوە.

بەسەر بەشە ناوخۆییەکاندا دابەش کراین و من بەر بەشە ناوخۆیی قادر بلە کەوتم.بەشی ناوخۆیی قادر بلە لەسەر جادەی بازنەیی، ڕێک دەیرڕوانییە پشتی قەرات و ئەملا و ئەولای دوکان بوو. بە دەستی چەپی ئێمەوە، بیرۆی کۆمپانیایەکی کاری دیکۆراتی پلاستیکی بوو، من ئەو ساڵە کە دەرسم کەم بوو، بە هۆی هاوڕێیەکمەوە لەو کۆمپانیایە کاری دیکۆراتم ئەکرد.

ئەو هاوڕێیەم ناوی فەهد بوو، خەڵکی هەولێر بوو، لە کۆلێجی ئەندازیاری بوو، بە خانەوادە سەر بە حیزبی شیووعیی عێراقی بوون و پاشانیش چووە دەرەوە و بووە پێشمەرگەی ئەوان. یەکێک لەو کارانەی پێکەوە کردمان، دیکۆری پلاستیکیی دیوار و بنمیچی نەخۆشخانەی کۆماریی هەولێر بوو.

خاوەنی ئەو کۆمپانیایە کابرایەکی قەڵادزێیی بوو، مامۆستا عوسمان زاوای جەعفەر عەبدولواحید و باوکی نەرمین عوسمان کاری تێدا دەکرد و ئیشوکارەکانی بەڕێوە دەبرد. بەو هۆیەوە لەگەڵ مامۆستا عوسمان بووینە هاوڕێ و زۆر جار دەچوومە لای و گفتوگۆمان دەکرد و کتێبمان دەگۆڕییەوە.

مامۆستا عوسمان پیاوێکی بەتەمەن بوو، قاچێکی تەواو نەبوو، بە گۆچان دەڕۆییشت، کابرایەکی بەڕێز و سادە و سەنگین، ئاتەئیست و مۆدێرن بوو. ئەوان هەر بە بنەماڵە کۆمەڵە بوون و ئەو بیرۆ و دوکانەش بووبووە مەکۆ و ناوەندێکی گەورەی ئەندامان و هەوادارانی کۆمەڵە و هەر ئێوارەی لێ دەهات، پۆل پۆل روویان لەوێ دەکرد و پاشان بە کۆمەڵ لەوێوە بە پیاسە دەردەچوون و بەدەم قسەوباس و موناقەشەوە تەوافی قەڵایان دەکرد. منیش جاروبار لەگەڵ دەکەوتم و تێکەڵی کۆڕ و کۆمەڵەکانیان دەبووم، وەلێ لە باری ئەمنییەوە بەباشم نەدەزانی و زۆر کەیفم پێ نەدەهات، چونکە زۆر زەق و زل و ئاشکرا بوون.

یەکێک لەو کەسانەی لەو کۆڕ و کۆمەڵی تەوافەدا ناسیم، دکتۆر موحسین (موحسین ئیبراهیم حەسەن) بوو.

موحسین لە رووی رۆشنبیری و زانستی مارکسیستییەوە لەوانی دی لەپێشتر بوو، هەر زوو بووینە هاوڕێی نزیکی یەکتری، وەلێ دواتر بەهۆی ناکۆکیی فکرییەوە لێک توند بووین و دابڕاین. من لە باسێکی دیکەدا قسەی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە ئەکەم.

چەند دوکانێک لەولای دوکانی دیکۆری پلاستیکییەکەوە، دوکانەکەی عەبدولخالق مەعرووف[١٣٢] بوو کە ناوی "تەکنیکار" بوو، دیارە کتێبێکیشی هەر بەو ناوەوە

---

١٣٢. عەبدولخالق مەعرووف لە ڕێکەوتی ١٩٣٥/١/١ لە شاری هەولێر لە دایک بووە، لەپاش تەواوکردنی قۆناغی خوێندنی ئامادەیی لە ساڵی ١٩٥٨ چووە بۆ قاهیرە بۆ خوێندن لە زانکۆی ئەزهەر. خاوەنی چەندین کتێبە، لەوانە: تەکنیکار، ترانزستۆر، ئەنتینا، دیوانی نالی و کێ ڕاستە؟ لە ڕێکەوتی ١٩٨٥/١٠/٤ لە شاری هەولێر تیرۆر کرا.

هەبوو. ئەم پیاوە جگە لەوەی شارەزایەکی بواری زانستیی فیزیا بوو، شارەزایەکی بواری ئیسلام و شەریعەتیش بوو، هەر وەکوو بەو کتێبەیدا (ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا)[١٣٤] دەردەکەوێت.

ئەو کتێبە لە سەرەتادا ناوی "ژن لە کۆمەڵی کوردەواریدا" بوو، بەڵام بۆ ئەوەی لە سانسۆری چاپ بەڕێ بکرێت، ناوەکەیان گۆڕی و کردیانە: "ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا".

نووسەر، هەر وەکوو بە لێکۆڵینەوەکەیدا دەرئەکەوێت، کەسێکی ئاتەئیستە و بڕوای بە ئایین و ئیسلام نییە و کەسێکی یەکسانیخوازە، وەلێ هاتووە لەژێر پەردەی دینەوە ڕەخنەکانی خۆی ئاراستە کردووە و دەستەواژەی "دروودی خوای لێ بێت"ی لەو جێگایانە بەکار بردووە کە ناوی محەمەد پەیامبەری ئیسلامی هێناوە. دیارە هەر وا سانا نەبوو، لەژێر زەبروزەنگی حکوومەتێکی دڕندەی وەکوو بەعس و لە هەمبەر چاوداچەقانی ڕەوێک لە مەلای کۆنەپەرستی کلک گرێدراوی بەعس و لەشکرێک لە باوەڕداری قورمیشکراو، ڕاشکاوانە بیروباوەڕ و تێڕوانینی خۆت بەیان بکەیت و ڕەخنە لەو شەریعەتە بگریت کە ژنان وەکوو نیوە و چارەکە مرۆڤ و کۆیلەی ژێردەستی پیاوان چاو لێ دەکات. بەڵام بەداخەوە، ئەوانە دادی "عەبدولخالق"یان نەدا و لە مینبەری مزگەوتەکانەوە مەلاکان سووکایەتییان پێ کرد و بە کافر و مولحید ناویان برد و فتوای کوشتنیان بۆ دەرکرد.

عەبدولخالق لە لێکۆڵینەوەکەیدا باسی ئەوە دەکات، ئەوەی لەسەر ئیسلام و ژن و کۆنەپەرستی و نەبوونی ئازادی ... باس دەکرێن، لە خودی قورئان و شەریعەتی ئیسلامدا هەن و کەس تەحریف یان زیادەی نەخستوونەتە سەر. پاشان داوای لەو مەلایانە کرد کە لە مینبەری مزگەوتەکانەوە دائەبارێنە سەری، بابێن پێکەوە دابنیشن و مونازەرە و دیبەیت بکەن، بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون و سەرەنجام بە فیتی ئەوان، چەقۆکێشەکانی بەعس تیرۆریان کرد و پاشان کتێبەکەیان یاساغ کرد و لە کتێبخانەکان کۆیان کردەوە.

ئەو کتێبە، لێکۆڵینەوە و نامیلکەیەکی بچکۆلە بوو، بەڵام بۆ ئەو دەورانە کۆمەڵگای کوردەواری هەژاند و کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دانا.

---

١٣٤. ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا، دار الجاحظ، ساڵی ١٩٨٥.

# ئیبراهیم و دیوارنووسین

دوای ئەوەی زانکۆی سلێمانی بۆ هەولێر گوێزرایەوە و چەند مانگێک بوو دەوام دەستی پێ کردبوو، خوێندکاران هەموو لە حکوومەتی بەعس پڕ و پەست بوون، ئیبراهیم ئەحمەد خدر (سەرکەوت) کە ئەو دەمە پەیوەندی بە منەوە هەبوو، وەکوو تەحەدایەک لە بەرامبەر ئەو کارەدا و وەک پەرچەکردارێک بیر لەوە دەکاتەوە، سەردیوارەکانی شاری هەولێر بە درووشم بنووسێتەوە.

ڕۆژێکیان دەمەو عەسر بۆ لای فەرهاد هەمزە محەمەد دەچێت و پێی دەڵێت، ئەو بە نیازی شتێکی وایە، بەڵکوو یارمەتی بدات. فەرهاد لە ڕێکخستن نابێت، وەلێ لەگەڵ ئیبراهیم هاوگەڕەک دەبن و هەر لە منداڵییەوە ئیبراهیم دەیناسێت. فەرهادیش دیارە کارەکەی لەلا ڕۆشن نابێت و بە قەلەقی و دوودڵییەوە چەندوچوونی لەگەڵدا دەکات، ئەویش ئەڵێ: فەرهاد! تۆ حەقت نەبێت، من هەموو شتێک ئامادە دەکەم و هەر خۆشم دیوارەکان دەنووسم، تۆ هیچ مەکە! تەنها وەرە قوتووی بۆیەکەم بۆ هەڵبگرە و هیچی دیکە. فەرهادیش هەست دەکات ئیشەکەی ئەم ئەوەندە سووکە، ڕازی دەبێت!

ئەو دەمە فەرهاد لە بەشی ناوخۆیی قادر بلە دەبێت، ئیبراهیم هەموو شتێک ئامادە دەکات و لە نیوەی شەودا پێکەوە لە قادر بلەوە بۆ دیوارنووسین دەرئەچن. هەر وا سەد مەترێک لەولای خۆیانەوە و لەسەر دیواری قەڵا دەست بە دیوارنووسین دەکەن. دوای ئەوەی یەک دوو درووشم دەنووسنەوە، ئۆتۆمبیلێکی شورتەی نەجدەیان لێ پەیدا دەبێت، ئەمانیش بەپەلە خۆیان هەڵئەدەنە نێو بینایەکی تەواونەکراوی ئەو دەوروبەرەوە. ئۆتۆمبیلەکە دەگاتە ڕاست ئەو بینایە و ڕێک لەوێ دەوەستێت و هەتا مەلابانگدان جووڵە ناکات. ئیبراهیم و فەرهادیش بەناچاری لەنێو بیناکەدا گیر دەمێنن و هەتا دەمەوبەیان لەسەرماندا هەڵدەلەرزن. دوای ئەوەی ئۆتۆمبیلی شورتەی نەجدەکە دەڕوات، ئەمانیش لە بیناکە دەرئەچن و بەرەو بەشی ناوخۆیی دەگەڕێنەوە.[١٣٥]

ئەوەی شایانی گوتنە، من ئەو دەمە ئاگاداری ئەو کارە نەبوومە.

---

١٣٥. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز فەرهاد هەمزە محەمەد. فەرهاد، کۆلێجی زانستەکان بەشی جیۆلۆجی تەواو کرد، ئێستا سەرۆکی ئەندازیاران و نوێنەری مەڵبەندی (ی.ن.ک.)ە لە کۆمپانیای نەوتی باکوور لە کەرکووک.

# چی بکەین؟

هەر وەکوو باسم کرد، من لە شالاوی گرتنەکان بۆ سەر ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر بەرنەکەوتم و ڕزگارم بوو. ماوەیەک خۆم شاردەوە و خۆم پەنا دا، ڕۆژگارێکی گەلێک ناخۆش، تاڵ و سەخت بوو، ئەزانم گەلێک لە هاوڕێکانم گیراون، ئەزانم کۆمیتەی ئاگریش بەرکەوتووە، وەلێ نازانم، ئەوەی کە ماوینەتەوە زۆرین یان کەمین، هەواڵی ئەوەم بیست کە هاوڕێکانمان لێکۆڵینەوەیان تەواو بووە و حوکم دراون، پاشان ئەوانەی حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ دەرکرا، بۆ بەشی سێدارەی زیندانی مووسڵ و ئەوانەی حوکمی زیندانی جۆراوجۆر بوون، بۆ زیندانی ئەبووغرێب ڕەوانە کران. لەدوای ئەوە ئیدی من هەستم بە دڵنیایی کرد و بەو باوەڕە گەییشتم کە ناوی من نەدراوە و دەتوانم لەمەودوا نەک هەر هاموشۆ، خەوتن و ژیانم، بەڵکە تەنانەت کاری نهێنی و ڕێکخراوەییشم ئاسایی بکەمەوە.

لەگەڵ هاوڕێکانم، ئەوانەی پەیوەندییان بە منەوە هەبوو، سەرلەنوێ کۆبوونەوەکانمان بە وێنەی پێش گرتنەکان دەست پێ کردەوە، ئەگەر تا ئەو دەمە کەموکورت و ناوبەناو کۆبوونەوەمان کردبێت، ئەوا لەمەودوا کۆبوونەوەی دەوری و مونەزەممان دەست پێ کردەوە، ئابوونەکان کە پێشتریش هەر خڕمان دەکردنەوە، لای خۆم کۆم کردنەوە و هەڵم گرتن، بەڵام هیچ بەیان و بڵاوکراوەیەکی نوێمان لەلا نییە و ئاگاداری هیچ شتێک نین. بەپێی ئەو سەرچاوە مارکسییانەی کە هەمبوون، هەر جارەی بابەتێکم دەکردە بەرنامەی دانیشتنەکان و لێکۆڵینەوە و جەدەلمان لەسەر دەکرد. بەو جۆرە و لەدوای نزیکەی دوو مانگ و نیو بەسەر ئەو کارەساتەدا، خوێن بە دەمارەکانی جەستەی ڕێکخستندا بەگەڕ کەوتەوە.

بەڵام من هەر بەوەندەوە نەوەستام، ئەوە باشە ئەو شانە و هێڵانەی کە لامن کەوتنەوە سەر کاری خۆیان، وەلێ بیرم لەوە دەکردەوە، چۆن بتوانم ئەندام و شانە و هێڵە پچڕاوەکان لێک ببەستمەوە و کۆمیتەی کەرکووک دابمەزرێنینەوە. بیرم لەوە کردەوە، لەم دوورگە دابڕاوەوە چۆن دەستمان بە سەرکردایەتی و

ناوەندیی کۆمەڵە بگات و ڕێکخستن بخەینەوە سەرپێ و سەر ڕێگا و ڕێچکەی خۆی. ئەو دۆخە نالەبار و ئەو کەشوهەوا پڕ ترسە نەک هەر دەستی شل نەکردم، بەڵکە وەک پەرچەکردارێک لە هەمبەر ئەو شاڵاوە و ئەو زەبرە گەورەیە هەموو هێز و توانای خۆم بۆ بە سەرپێ خستنەوەی ڕێکخستنەکان بەگەڕ خست و ئەوەم کردە ئامانج.

هاوڕێیانی زیندانی بەشی سێدارەی مووسڵ دیداریان نەبوو، بۆیە نەمدەتوانی بۆ دیدەنییان بچم و لە نزیکەوە گوێ لە قسە و ڕاز و نیازیان بگرم. بەڵام دەمتوانی بۆ لای هاوڕێیانی زیندانی لە ئەبووغرێب بچم و ئەوەم خستە بەرنامەی کاری خۆمەوە.

هەروەها بیرم لەوە کردەوە، بە هەر ڕێگایەک بێت، دەنگی خۆمان بە سەرکردایەتی و ناوەندیی کۆمەڵە بگەیەنم.

# سەردانی زیندانی ئەبووغرێب

لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد خدر قەول و قەرارمان کرد، پێکەوە بۆ زیندانی ئەبووغرێب بۆ سەردانی هاوڕێیانی زیندانیمان بچین و لە نزیکەوە گوێ لە بەسەرهات و سەرگوزەشتەیان بگرین و بڕێک زیاتریش لەوەی ڕووی دا تێ بگەین و ئەگەر ئەندام و شانە و هێڵێکیش، ئەوان پێی دەزانن و دەبێ ئێمە پەیوەندییان بۆ دروست بکەینەوە، ئەوا ناونیشانیان وەردەگرین و ڕێکیان دەخەینەوە.

ئیبراهیم ناوی نهێنی سەرکەوت بوو، وەلێ لە دەرەوەی ڕێکخستن و لەنێو هاوڕێکانی دەوروپشتیدا بە بلە ماو دەناسرا، چونکە لە کاتی قسە و جەدەلدا، بۆ پاڵپشتی بۆچوونەکانی، زۆر ئاماژەی بە وتەکانی ماو تسیتۆنگ دەکرد.

ئیبراهیم خەڵکی تەپپە بوو، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٨ بوو، وەک من لە زانکۆی سەلاحەدین کۆلێجی زانستەکاندا بوو، وەلێ ئەو لە بەشی کیمیا بوو.

ئەو دەمەی کۆمیتەی ئاگر بەر ئەو شاڵاوە کەوت، ئیبراهیم بەرپرسی هێڵێکی فراوانی ڕێکخستنی کۆمەڵە بوو، پەیوەندی بە منەوە هەبوو، وەک بێتەوە یادم، هەر وا چەند مانگێک بوو، پەیوەندییەکەی بۆ لای من گوێزرابووەوە.

ئیبراهیم لە کاتی خۆیدا لە ڕێگەی 'سەباح مەحموود کەریم'ەوە پەیوەندی بە ڕێکخستنەوە کردبوو. 'سەباح'یش هەر خەڵکی تەپپە بوو، لە ساڵی ١٩٧٩ وازی لە کۆمەڵە هێنابوو، لە کاتی شاڵاوی گرتنەکان بۆ سەر کۆمیتەی ئاگر، بە هۆی پەیوەندییە کۆنەکانییەوە، شار بەجێ دەهێڵێت و دەڕوات دەبێتە پێشمەرگە.

ئیبراهیم و من بەرەو بەغدا و پاشان بۆ زیندانی ئەبووغرێب بەڕێ کەوتین. من ئەو هاوڕێیانەی 'ئیبراهیم'م نەدەناسین کە ئەو بە نیاز بوو بۆ لایان بچێت، ئەویش ئەوانەی منی نەدەناسین، بۆیە کە گەیشتینە ئەوێ، لێک جوودا بووینەوە و هەر یەکە بۆ لای هاوڕێکانی خۆی ڕۆییشت. دوای ئەوەی کاتی دیدار بەرەو تەواوبوون ئەچوو، ئیبراهیم گەڕایەوە بۆ لام و بە دەنگ و دەموچاوێکی کەمێک گۆڕاوەوە و بە چرپە وتی، ئەو هاوڕێیانەی کە چوومە لایان، وتیان: ئەوە تۆ چی ئەکەی لێرە، ناوی تۆ دراوە، لە کاتی ئەشکەنجە و لێکۆڵینەوەدا گوێمان لە ناوی سەرکەوت و

نەسرەوت بووە؟! واتە ناوی نهێنیی هەردووکمان. منیش وتم: هاوڕێ ئیبراهیم، ئەوە چەند مانگە ئەو هاوڕێیانەی ئێمە گیراون و ئەوەی ناوی دراوە و ئاشکرا بووە گرتوویانە، ئێستا قۆناغی ئەشکەنجە و لێکۆڵینەوە نەک هەر تەواو بووە، بەڵکوو حوکم دران و پەروەندەکان گشت داخراون و ئەوا دەبینیت، وا خۆشمان بۆ سەردانییان هاتووین، بۆیە بەهیچ جۆرێک من ئەوەم پێ ڕاست نییە. بەڵێ! بەپێی ئەو قسانە بێت، ناوی ئێمەش هاتۆتە گۆڕ و ناوی ئێمەش لەنێو ئەو کڵێشەیەدا بووە کە ڕادەستی دائیرەی ئەمنی کەرکووک کراوە، وەلێ ناوی نهێنی، نەک ناوی ڕاستی و تەواوەتی خۆمان. ئەو هاوڕێیانەش ڕاست دەکەن، گوێیان لە ناوی نهێنیی ئێمە بووە و ئەشکەنجەی ئەو هاوڕێیانەی ئێمەیان کردووە کە پەیوەندیمان پێیانەوە هەبووە، تاوەکوو ناوی ڕاستەقینەی ئێمەیان پێ بدەن، بەڵام ئەوان دانیان بەوەدا نەناوە و ناوی ڕاستی و تەواوی ئێمەیان نەدرکاندووە، ئەگەر نا، ئێستا ئێمەش لەگەڵ ئەوان دەبووین و خەڵکی دیکە بۆ دیدەنیمان دەهاتن.

ماوەی دیدار تەواو بوو، لەگەڵ هاوڕێیان باوەشمان بەیەکدا کرد و زیندانمان بەجێ هێشت و بەرەو کەرکووک بەڕێ کەوتین. بەڵام ئەو بابەتە مات و مەلوول و بێتاقەتی کردین و هەتا گەیشتینەوە جێ، چەند جارێکی تر قسە و مشتومڕمان لەسەری کرد.

ئیبراهیم بڕوای تەواوی بەوە هەبوو کە ناومان دراوە و ئەگیرێین، منیش بەهیچ جۆرێک بڕوام بەوە نەبوو، پێم وابوو بەهیچ جۆرێک ناوی ئێمە نەدراوە. بەڵێ! دەزانم، جاری وا هەیە فرتوفێڵ و کەینوبەینی دەستگا ئەمنییەکان بەو جۆرەیە و ناوی کەسانێکیان لەلایە، کەچی نایگرن، تاوەکوو بیخەنە ژێر چاودێرییەوە و لەو ڕێگەیەوە تۆڕی پەیوەندییەکانی ئاشکرا بکەن و هەرچی بکرێت، ژمارەیەکی زۆرتر بخەنە نێو داو و تەپکەی خۆیانەوە و زەبرێکی گەورەتر بوەشێنن، بەڵام ئەم حاڵەتەی ئێمە گەلێک لەوە جوودایە و ئەوان ئێستا بەپێی ئەو ڕاپۆرتەی لەلایانە، تۆڕی پەیوەندییەکان دەزانن و ئیشیان لەسەر ئەوە یەکی نەکەوتووە.

سەرەنجام ئیبراهیم وتی، من وای بەباش دەزانم هەردووکمان پێکەوە بچینە دەرەوە و شار بەجێ بهێڵین. منیش وتم: هاوڕێ گیان! ئەگەر مەترسیمان لەسەر

بێت، ئەوا باشە دەچین، بەڵام من پێم وا نییە هیچ مەترسییەکمان لەسەر بێت، بۆچی بەخۆڕایی ئێرە بەجێ بهێڵین، ئەزانی ئێستا کۆمەڵە لەم شارەدا چەندە پێویستیی بە ئێمە هەیە؟! ئەوە خۆت ئاگاداری، ڕێکخستنەکانمان داریان بەسەر بەردیانەوە نەماون، کۆمیتە تەفروتوونا بووە و نەماوە، هێڵەکان گشت لێک بەربوونە و وەک ئاردی نێو دڕکیان لێ هاتوون، بۆیە هاوڕێ گیان، ئەبێ ئێمە لەمەودوا لە فکری لێکهەڵپێچان و بەستنەوەی شانە و هێڵە لێکترازاوەکان و دامەزراندنەوەی کۆمیتەی کەرکووکدا بین، بۆیە من شار بەجێ ناهێڵم و هەر لە ئێستاوە بەو نیازە ئەکەومە گەڕ، بەڵام ئەگەر تۆ لەسەر بۆچوونەکەی خۆت هەر سووریت، ئەوا من ڕێگریت لێ ناکەم و تۆ ئەتوانیت بڕیاری خۆت بدەیت.

ئیبراهیم بڕیاری خۆی دا و وتی، من ئەڕۆم! وتم دەی چاکە، ناونیشانی ئەو هاوڕێیانەم بۆ ئامادە بکە کە پەیوەندییان بە تۆوە هەیە و ئاگاداریان بکەوە لەمەودوا هاوڕێیەکی دیکە دەیان بینێ! ئەوانەمان گشت سەروبەر کرد و باوەشمان بە یەکدا کرد و هیوای سەلامەتی و سەرکەوتنمان بۆ یەکدی خواست.

ئیبراهیم لە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٢/٢٠دا بووە پێشمەرگە.

لە ناوەڕاستی ساڵی ٢٠١٧ 'فایەق عومەر ڕەسووڵ'م ناسی، کە یەکێکە لە زیندانییەکانی ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر و هونەرمەند و شێوەکارێکی ناودار و بەتوانایە و ئێستا لە 'ڤییەننا'ی پایتەختی نەمسادا دەژێت. کاتێک ئەو ڕووداوەم بۆی گێڕایەوە، یەکسەر گوتی: کاکە ئەو کەسە من بووم، من بە 'ئیبراهیم'م گوت، ئەوە چی ئەکەیت لێرە، ناوی ئێوەش دراوە؟!

ئیدی بەگوێرەی ئەزموونی خۆم و بەو جۆرەی کە خۆم بە گونجاوم زانی، سەرلەنوێ ئەو هێڵەی 'ئیبراهیم'م ڕێک خستەوە.

ئێمە هێڵێکی ڕێکخستنمان هەبوو، زۆربەی ئەندامەکانی خەڵکی گوندی چیمەن بوون، ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم، ئەم هێڵە لە جوملەی ئەو ڕێکخستنانە بوو کە ئیبراهیم سەرپەرشتی دەکرد و لەدوای دەرچوونی ئەو، من ئەو هێڵەم لە خۆ گرت و بوومە بەرپرسی.

هەروەها کەسێکم بە ناوی فاریق حوسێن ناسی، وەک بێتەوە بیرم ئەویش لەو ڕێکخستنانەی لای ئیبراهیم بوو، دوای ئەوەی خۆی چووە دەرەوە، پەیوەندییەکەی بۆ لای من گوێزرایەوە.

فاریق خوێندکاری کۆلێجی علووم بەشی کیمیا بوو، ماڵیان لە ڕەحیماوا بوو، هەر وەکوو عومەر قادر باسی دەکات، پێشووتر پەیوەندی بەمەوە هەبووە، وادیارە لەدوای گرتنی عومەر پەیوەندی بە ئیبراهیمەوە کردووە. وەلێ پەیوەندیی فاریق و من هەر زۆر کورت بوو، جارێک وە یان دوو جار یەکتریمان بینی، دوای ئەوە هەر لە خۆی دڵنیا نەبوو، بۆیە شاری بەجێ هێشت و چووە دەرەوە.

بە ڕۆیشتنی ئیبراهیم کاری من و باری من ئەوەندەی دیکە قورس و گرانتر بوو.

ئیبراهیم لە سەرەتادا چووە هەرێمی دووی کەرکووک و پاشان وەکوو پێشمەرگە چووە ڕادیۆ و ڕاگەیاندن لە تووژەڵە. دواتر بووە نوێنەری یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان کە ئەو دەمە بارەگاکەی لە بالیسان بوو.

دوادیدار و دوا ماڵئاوایی من لەگەڵ ئیبراهیم لە ساڵی ١٩٨٤ لە گوندی ئاوەژێ لە سەردەمی مفاوەزاتی نێوان حکوومەتی بەعس و یەکێتیدا بوو. ئەو دەمە ئێمە وەکوو ئەندامانی کۆمیتەی ڕێکخراوی شارەکانی هەولێر، کەرکووک و سلێمانی، بۆ ئامادەسازی بۆ کۆنفرانس و کۆبوونەوە لەگەڵ "نەوشیروان مستەفا ئەمین"دا، بۆ ئەوێ چووین.

ئیبراهیم هەتا دەورانی سەختی کیمیاباران و ئەنفالەکان هەر مایەوە و وەک پارتیزانێک لە ناوچەی شوان و شێخبزێنی و خاڵخاڵان لەنێو مەفرەزەی بچووک بچووکی ئەو ڕۆژگارە دژوارەدا بەنهێنی و لەم بنکە بۆ ئەو بنکە درێژە بە کاری خۆی ئەدات، سەرەنجام لە شەڕێکی دەستەویەخەدا گیانی دەبەخشێت، کە من دواتر سەرگورشتەکەیتان بۆ دەگێڕمەوە.

# ئەو هێڵەی چیمەن

گونـدی چـیمەن هەر وا دەوری ١٥ کیلۆمەترێـک لە کەرکـووکەوە دوورە و بە درێژایی مێژوو خەڵکی ئەم گوندە ڕۆڵی گەورە و گرنگیان لە بزووتنەوە سیاسی و چەکدارییەکانی کوردستاندا گێڕاوە و لەو پێناوەدا قوربانی زۆریان بەخشیوە و هەر لەو سۆنگەیەوەیە، پێی دەوترێت: چیمەنی شەهیدان.

ئێمە وەکـوو کـۆمەڵەی ڕەنجـدەرانی کوردسـتان، لەو گونـدەدا هێڵێکـی فراوانـی ڕێکخسـتنمان هەبـوو، کە لەدوای تێکشـکانی کـۆمیتەی ئاگرەوە هەتـا هـاوینی سـاڵی ١٩٨٤ لە ڕێگەی کەرەم ئیبراهیم مەحموود (بەختیار)ەوە پەیوەندی بە منەوە هەبوو. من لەنێو ئەو هێڵەدا بە وێنەی پەیوەندیی ڕێکخراوەیی تەنها 'کەرەم'م دەناسی. من و کەرەم لە پـۆلی یەکەمـی ناوەنـدی لە قوتابخـانەی کـاوە هـاوپۆلی یەک بـووین و پێشتر یەکتریمان دەناسی.

بەپێـی بەدواداچوونێک کە مـن لەم دواییـیەدا لەگەڵ فـایز ئیبـراهیم سـەمین (مەلا فایز)دا کردوومە، ئەم هـێڵە لە شـانەیەکی سـەرەکی و لە چـوار ئەندام پێـک هـاتووە: کەرەم ئیبراهیم مەحموود، فایز ئیبراهیم سـەمین، لوقمـان عەزیـز شـەریف، کاکەخـان عەبدوڵا. هەر یەکە لەم چوار ئەندامەش تۆڕی پەیوەندیی خۆیان هەبووە.

مەلا فـایز تـۆڕی پەیوەنـدییەکانی خـۆی بەم جـۆرە کێشـا و ئەو هاوڕێیـانەی لە شانەکەی ئەو بوونە و ئەو بەرپرسیان بووە و ئێستا لەژیاندا ماون، ئەمانە بوون:

وەهاب حەمە ساڵح، بارام حەسـەن، عەبدوڵا ئەحمەد، حەوێز ناسیح، مەحموود خدر، خدر عەبدوڵا، زاهیر حەیدەر، وریا محەمەد ڕەمەزان، محەمەد عومەر.

ئەو هاوڕێیانەی دیکە کە لە ژیاندا نەماون و شەهید بوون:

ئازاد سـابیر حوسـێن، مەجیـد عـارف ئیسـماعیل، شـەریف لەتیـف عەلـی، سـەعید ئەحـمەد عەلـی، کـاوێز ناسـیح مـحەمەد، نـازم مـحەمەد ڕەمەزان، کـازم مـحەمەد ڕەمەزان، غێدان مستەفا کەریم، زێدان مستەفا کەریم.

ئەوەی شایانی باسە، ئەم هاوڕێیانە لە شانەکاندا کۆبوونەوەی خۆیان کردووە و ئابوونەی مانگانەی خۆیان داوە، بەڵام وەک لایەنگر و هەوادار.

سەبارەت بە تۆڕی پەیوەندییەکانی ئەو سێ هـاوڕێیەی دیکە زانیـارییەکم دەست نەکەوت.

بەپێی یاداشتێکی عومەر قادر عەلی، ئەم خەتەی چیمەن پێشووتر مەلا ڕەشید چیمەنی بەرپرسی بووە و ئەویش پەیوەندی بە عومەر خۆیەوە هەبووە. فەتحییە ئەحمەد کە هاوسەری مەلا ڕەشید بووە، ئەندامێکی نێو ئەو خەتە بووە و چوار مامۆستا بە ناوەکانی: پرشنگ، پەخشان، ڕووناک و ئەڵماس، پەیوەندییان پێوە هەبووە. پرشنگ عەبدوڵا شەریف کە خەڵکی کەرکووک، گەڕەکی ئیمام قاسم بوو، هەر وەکوو خۆی باسی دەکات، لەساڵی ١٩٧٩ مامۆستای قوتابخانەی نەهێشتنی نەخوێندەواری لە گوندی چیمەنی گەورە بووە، لەلایەن 'فەتحییە ئەحمەد'ەوە کە خوێندکاری خۆی بووە، بۆ ڕیزەکانی کۆمەڵە ڕێک خراوە. پاشان ئەمیش خوشکێکی لە خۆی بچووکتری بە نێوی 'پەخشان'ەوە لە ڕیزەکانی کۆمەڵەدا ڕێک خستووە.[١٣٦]

ئەوەی شایانی باسە، پرشنگ لە خۆپیشاندانەکەی ساڵی ١٩٨٢ی شاری کەرکووک بەشداری دەکات و دەگیرێ و قارەمانانە لە بەرامبەر ئازار و ئەشکەنجە و هەڕەشەی ئەمنی کەرکووک دەوەستێتەوە و دان بەهیچ زانیارییەکدا نانێت.

ئەوەی شایانی گوتنە، هەندێک جار پۆستی ڕێکخراوی کەرکووک لەلایەن مستەفا چالاوییەوە دەگەییشتە چیمەن و لەوێشەوە کەرەم بۆ ئێمەی دەهێنا و پاشان بۆ ڕیزەکانی ڕێکخستنمان دەنارد.

لەدوای شالاوی گرتنەکانی کۆمیتەی ئاگر بە ماوەیەک، نامەیەکم لە ئەحمەد کرێکارەوە پێ گەییشت و ناو و ناونیشانی 'مەلا ڕەشید'ی تێدا بوو، داوای ئەوە دەکات، بەڵکوو پەیوەندی بۆ دروست بکەینەوە. من ناوی 'مەلا ڕەشید'م بیستبوو، وەلێ نەمدەناسی، کۆنە جەلالی بوو، لەگەڵ مامەکانم ئاشنایەتی هەبوو و لەنێو خەڵکیدا ناسراو بوو. بەپێی ئەو تاریفەی لە نامەکەدا هاتبوو، ئەو دەمە ئۆتۆمبیلێکی ١٨ نەفەری هەبوو، لە خەتی نێوان مەحاکم و ئیسکان کاری دەکرد. ڕۆژێکیان چووم بۆ مەیدانی پاسەکان لە مەحاکم و دۆزیمەوە، چووم بۆ لای و خۆم پێ ناساند، بەڵام ئەو سەری بادا و بەهیچ جۆرێک ئامادە نەبوو کارمان لەگەڵدا بکاتەوە، منیش بەجێم هێشت و جارێکی دی سودفەی یەکتریمان نەکردەوە.

مەلا ڕەشید بۆ ماوەیەک و هەتا ساڵی ٢٠٠٣ بەڕێوەبەری دەستگای شەهیدانی کەرکووک بوو، ئێستا لە ژیاندا نەماوە.

---

١٣٦. هەوال، ژمارە ٢٧٩، ١٧ی ئایاری ٢٠٠٨، ل ٦.

# سەردانی گوندی چالاو

هەر لە درێژەی هەوڵدان بۆ گرێدانەوەی هێڵەکانی ڕێکخستن و دروستکردنەوەی کۆمیتەی ئاگر، بڕیارم دا بۆ گوندی چالاو بۆ بینینی ئەحمەد کرێکار (حەمەکەریم عەلی ڕەزا) بچم.

من ئەحمەد کرێکارم دووربەدوور دەناسی و هاوگەڕەک بووین، ئەو منی نەدەناسی، وەلێ باوک و مامەکانی دەناسیم و هاوتەمەنی ئەوان بوو.

ئەحمەد کرێکار کۆنە جەلالی بوو، مامەم محەمەد (حەمەی ڕەشەبیبەر)یش یەکێک بوو لە جەلالیە زۆر چالاک و دیارەکان، دوای تێکەڵبوونەوەی هەردوو باڵەکە، لە ڕێکخستنەکانی پارتی کاری دەکرد و لە ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ مستەفا چایچی و کۆمەڵێکی تر دەگیرێ و ئەشکەنجەیەکی ئێجگار زۆر دەکرێت، ئیعتیراف لەسەر هیچ شتێک ناکات و سەرەنجام ئازادی دەکەن، وەلێ بەو هۆیەوە پشتی سەقەت دەبێ.

دایکم بۆی گێڕامەوە و گوتی، لە سەردەمی جەلالی و مەلاییدا، جارێکیان ئەحمەد کرێکار سەر ئەنێتە سەر باوکم و پرسیاری لێ دەکات:

کاک عەزیز تۆ چیت (جەلالیت یان مەلایی)؟

باوکیشم ئەڵێت: من هیچیان نیم!

ئەحمەد کرێکار ئەڵێت: تۆ کورتانی!

باوکیشم ئەڵێت: کورتان لە کەر ئەکرێت!

من ئەو دەمە زانیاریم لەسەر ئەوە هەبوو، ئەحمەد کرێکار بەرپرسی پێشووتری کۆمیتەی ئاگر بووە و لەدوای گرتن و بەربوونی عەلی مغاویرەوە شاری بەجێ هێشتووە و ماوەیەک لە گوندی چالاو بووە.

هەر لەو ماوەیەدا بوو، تالیب ئەحمەد غەفوور، هاوزاوای ئەحمەد کرێکارم ناسی. تالیب جووتیارێکی ئەو گوندە و باوکی شەهید مەناف بوو.

جارێکیان سەردانی گوندی سەیدانی سەرخاسەم کرد، ماڵی حاجی ئەحمەد تەها و حاجی خالید (خالیدە ڕەش)ی لێ بوو، ئەمانە خزممان بوون و هاتوچۆی زۆرمان هەبوو، چەند ڕۆژێک لەوێ مامەوە و وا ڕێکەوت، "تالیب"یش بۆ ئەوێ و بۆ ماڵی حاجی خالید هات و لەوێدا یەکتریمان ناسی.

تالیب لەو دەمەدا، تەمەنی خۆی لە ٥٠ ساڵی ئەدا، خوێندەواری هەبوو، گەلێک لە شیعرەکانی قانع و بێکەسی ئەزبەر بوو، ناوبەناو و لەنێو قسە و گفتوگۆکانماندا پارچە شیعرێکی دەخوێندەوە، لە قسەکانی و لەو شیعرانەی کە دەیخوێندنەوە، دیار بوو کابرایەکی چەپە و هەڵگری بیری مارکسییە، دیار بوو ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانە. ئەم پیاوە سرووشتێکی هێمن و لەسەرخۆ و ڕێزداری هەبوو، هەر لێرەوە بووینە هاوڕێ و هاوڕێیەتیمان ساڵانێکی خایاند.

هەر وەکوو گوتم، تالیب باوکی شەهید مەناف چالاوی (شاخەوان) بوو، سەربووردەی شەهیدبوونی مەناف بەم جۆرە بوو:

"تەحسین شاوەیس سەعید و قالە فەرەج بە هێزێکی زۆری جاش و سەربازەوە لە بەرەبەیانی ڕێکەوتی ١٩٨٠/١٠/٦دا هێرش دەکەنە سەر کەرتی سێی هەرێمی دووی پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی لە گوندی مامڕەش، دوای شەڕێکی سەخت پێنج پێشمەرگە بەم ناوانەی خوارەوە شەهید دەکەن: حەمید محەمەد ئەمین مراد کەرکووکی (پشتیوان)، فەرماندەی کەرتی سێی چەمچەماڵ، ئەحمەد عەوداڵ حەمید (مەلا ئەحمەد مامڕەشی)، بیلال جەلال حەمە ڕەشید چالاوی ( دلێر)، قالە فەرەج بە دەستی خۆی شەهیدی کرد، تاهیر دەروێش بابە (تاهیر قەمەری)، مەناف تالیب ئەحمەد چالاوی (شاخەوان)، کە دوای بەدیلگیرانی بە شێوەیەکی دڕندانە لەناو بازاڕی چەمچەماڵ بەدەستی تەحسین شاوەیس و قالە فەرەج شەهید دەکرێت"[١٣٧].

ئەحمەد کرێکار دەڵێت:

---

١٣٧. ئینسیکلۆپیدیای تۆمەتبارانی شالاوی ئەنفال لە باشووری کوردستان، دەرسیم دیبەگەیی، ل ٤٩٠.

له ١٩٨١/٨/٢٠ کەرکووکم بەجێ هێشت و بۆ گوندی چالاو چووم، چونکە خانەوادەکەم لەوێ بوو، بۆ ماوەی ١٥-٢٠ ڕۆژێک لەوێ مامەوە.[١٣٨]

سەفەر چالاوی دەڵێت:

لەو ماوەیەدا کە ئەحمەد کرێکار لە چالاو ئەبێت، دەستگا ئەمنییەکانی شاری کەرکووک بەدوایدا دەگەڕێن و ئیخباری دەکرێت کە لەوێیە. ڕۆژێکیان قاله فەرەج و جاشەکانی ئەچن دەوری ئاوایی ئەگرن و پرسیاری ئەحمەد کرێکار ئەکەن. ئەوانیش ئەڵێن، ئەحمەد کرێکار لە ماڵ نییە. ئەویش تووڕە ئەبێ و هاوار ئەکات و ئەڵێ: کوا کرێکار؟ ئەمڕۆ ڕۆژی جومعەیە، کرێکار چۆن لە ماڵ نییە، کرێکار ئەکەم بە باڵ! ئیتر کە ئەویان بۆ نادۆزرێتەوە، لە ڕقاندا دوو سێ کەس دارکاری ئەکەن و ئەڕۆن.

لەدوای ئەو ڕووداوەوە، ئیتر ئەحمەد کرێکار ئەوێ بەجێ دەهێڵێت و بە هێزی پێشمەرگەوە پەیوەست دەبێت.

گوندی چالاو گوندێکی بچکۆلە و لە ناوچەی شوانی سەرخاسە بوو، نزیکەی ١٦ کیلۆمەترێک لە شارۆچکەی چەمچەماڵەوە دوور بوو، وشک و بێئاو، بێ ڕەز و باخ و بێداروبار بوو، لە ٢٥ ماڵێک پێک هاتبوو، لە سەردەمی ئەنفالەکاندا، وەک هەر گوندێکی دیکەی ئەو دەڤەرە تەخت کرا. ئەم گوندە بەوە ناسرابوو کە هەواداری کۆمەڵەن و بە یەکێک لە پێگەکانی ئەو ڕێکخراوە دەژمێردرا کە ڕەنگبێ هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، ئەحمەد کرێکار خەڵکی ئەم ناوچەیە بووە و سەردەمێکیش مامۆستا حەمید کاکەیی لەو گوندە مامۆستا بووە.

مامۆستا حەمید کاکەیی ئەندام و کادرێکی پێشکەوتوو و چالاکی کۆمەڵە بوو، پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگرەوە هەبوو، دواتر دەگیرێت و بێسەروشوێن دەکرێت.

ئیدی چووم بۆ چەمچەماڵ و لەوێ پرسیاری سەیارەی گوندی چالاوم کرد، بەڵام ئەو گوندە سەیارەی تایبەتیی خۆی نەبوو، وتیان فلانە سەیارە بەو ئاقار و

١٣٨. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ئەحمەد کرێکار (حەمەکەریم عەلی ڕەزا).

ناوچەیەدا گوزەر دەکات و دەتوانی لە ڕێگا و لەڕاست ئەو گوندە دابەزی و ماوەیەک بەپێ بڕۆیت، هەتا دەگەیتە نێو دێ.

بەڵێ! ئیتر بەو جۆرەم کرد و لەو ڕاستەدا دابەزیم و کەوتمە ڕێ. دەستەڕاستی ڕێگاکە کێڵگەی گەنم و جۆ بوون، دەغڵ هەتا پشتێنە بەرزەوە ببوو، من لە خەیاڵی کارەکەی خۆم و بەرنامەی کاری خۆمدا بووم، دوای ئەوەی ماوەیەک ڕێم کرد، لەو دەشتە چۆڵ وهۆڵە گیزەی ماتۆڕێک دەهاتە گوێم و هەتا دەهات دەنگەکە لێم نزیک دەبووەوە، ماتۆڕەکە لە جادەی قیر لای دا و کەوتە سەر ئەو ڕێگە خۆڵەی کە من پیایدا دەڕۆم، منیش لەنێو دەغڵەکەدا خۆم پەنا دا، هەتا لێم تێپەڕی، پاشان هاتمە دەرەوە و کەوتمەوە ڕێ هەتا گەیشتمە نێو گوند و ماڵی تالیب.

ئەحمەد کرێکارم بینی و خۆم پێ ناساند، پاشان باسی بارودۆخی ڕێکخستنی کۆمەڵەمان لە شاری کەرکووک کرد. من باسی ئەوەم کرد، من دوو خەتی ڕێکخستنی کۆمەڵە و یەکێتیی خوێندکارانم لەلایە و بەهۆی ئەو بارودۆخەی کە بەسەر ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووکدا هاتووە، لێک ترازاوین.

ئەحمەد کرێکار پێی خۆش بوو، سەرەتا باسی ئاوێزانی خۆی بە سیاسەتەوە کرد و گوتی: سیاسەت بۆ من وەک جگەرە وایە و ئالوودەی بوومە! پاش ئەوەی دۆخەکەمان باس کرد، ئەو پێشنیاری ئەوەی کرد، بۆ هەر خەتێک کۆمیتەیەک پێک بهێنم، پاشان کۆمیتەیەکی باڵا پێک بهێنم و خۆم سەرپەرشتی بکەم. بەڵام من وتم، ئێمە جارێ لە دۆخێکی ناجێگیر و لە دەورەی گوزەرداین، جارێ ڕۆشن نییە چۆن خۆمان ڕێک دەخەینەوە و ئەندام و شانە و هێڵەکان چۆن لێک گرێ دەدەینەوە، ئەوە بە جیا لەوەی هەر یەکە لەو خەتانە سەر بە ڕێکخراوێکە، بۆیە جارێ هیچ ئاڵوگۆڕێک لە پەیوەندییەکانماندا نەکەین باشە. ڕاستییەکەیشی هەر وا بوو و واشم نەکرد. پاشان نامەیەکم لە پەیوەند بە یەکێتیی خوێندکارانەوە نووسی و دامە دەستی ئەحمەد کرێکار، تاوەکوو بۆم بگەیەنێتە سەرکردایەتی.

دوای ئەوە لە ماڵ دەرچووین، بە پیاسە و بەدەم قسەوباسەوە بەرەو دەوری ئاوایی چووین، لەو دەمەدا مستەفا چالاویی برازای 'تالیب'یش لەگەڵماندا هات و

کەمێک لە دووری ئێمە ڕێی دەکرد، دیار بوو هەر بۆ پارێزگاری و ئاگاداریی ئەحمەد کرێکار هاتبوو.

بەو جۆرە و لە ڕێگەی ئەحمەد کرێکارەوە سەرەتای کارەکەمان بۆ لێکگرێدانەوەی ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک دەستی پێ کرد.

ئیدی لەدوای ئەوە، ئەحمەد کرێکار بە "تالیب"دا نامەیەکی بۆم نارد و داوای کردبوو، لە فلانە ڕێکەوت لە چەمی سوورقاوشان ئامادە بم. بەو جۆرە تالیب ئەڵقەی پەیوەندی من و دەرەوە بوو، هەر کاتێک بیانویستبا من ببینن، یان هەر کارێکی دیکەیان هەبووایە، بە نامەیەک و لە ڕێگەی ئەم پیاوەوە، منیان ئاگادار دەکردەوە. تا وای لێ هات، جارجارە تالیب هەر بۆ سەردانیش بووایە، بۆماڵمان دەهات، تا ئەو دەمەی بڕوام بە کۆمەڵە نەما و بە یەکجاری دەستم لێی کێشایەوە.

دێتەوە بیرم، تازە وازم لە کۆمەڵە هێنا بوو، تالیب سەردانی کردم، منیش باسی وازهێنانی خۆمم بۆی کرد و باسی ئەوەم بۆ کرد کە ئێمە بۆ ئەوە لەم ڕێکخراوەدا کارمان کردووە و ئامادەی گشت فیداکارییەک بووینە، تاوەکوو بە قازانج و بەرژەوەندیی کرێکاران و زەحمەتکێشان کارێک بکەین و بەمەش ژیانی گشت کۆمەڵگا بگۆڕین و میللەتی کوردیش لەژێر ستەم دەربهێنین، وەلێ کۆمەڵە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لەو ئامانجانە دوور دەکەوێتەوە و هەتاوەکوو دێت، زیاتر بەلای ڕاستدا وەردەچەرخێ، بۆیە ئێمە ئەگەر بمانەوێت بەو ئامانجانە بگەین، ئەبێ لە ڕێکخراو و حیزبێکدا کار بکەین و تێ بکۆشین کە ئامرازی ئەو ئامانجەیە، کۆمەڵە ئێمە بۆ ئەو جێگایە نابات ...

تالیب گوێی بۆ قسەکانم شل کردبوو، هیچی نەدەگوت، وەلێ لەگەڵ قسەکانی مندا، ئەو ڕەنگی دەهێنا و ڕەنگی دەبرد، منیش لەناوەوە گەلێک ئازارم ئەبینی و ویژدانم گەلێک ئەزیەتی ئەدام، ئاخر هیچ شتێک وەکوو ئەوە ناخۆش نییە، تۆ چەنای چەند ساڵ بۆ ڕێباز و ڕێکخستنێک ڕەنج و قوربانی بدەیت، کەچی دواتر لەگەڵ هیوا و ئاواتی تۆدا وێک نەیاتەوە! ئاخر هەموو هیوا و ئاواتێکی تالیب کۆمەڵە بوو، ئەوەی لەو پشتشکان و جەرگسووتانەدا ڕای گرتبوو، ئەو ڕێگا و ڕێکخستنە

بوو، کەچی ئەویش وا دەرنەچێت! ئەمە کارەساتە ... بەڵام دووریش نییە، بیری لە پەیوەندیی چەندین ساڵەی خۆی لەگەڵ من و هەڵوێستی لەمەودوای نەکردبێتەوە! ڕەنگە بیری لەوەش کردبێتەوە، من واز لە کۆمەڵە ئەهێنم، ڕەنگبێ ببمە جێگەی مەترسی بۆ ئەو. دووریش نییە هەر وەک حاڵەتی تەسلیمبوونەوەی پێشمەرگەی هەژمار نەکردبێت! ڕەنگبێ ئەوەی نەزانیبێت، ئەوەی من ئەیڵێم و گەرەکمە، سووربوونی زیاترە لەسەر خەبات و تێکۆشان و جەختکردنەوەیە لەسەر ئامانجی بەرزی زەحمەتکێشان و خۆگرێدانەوەی زیاترە بە قازانج و بەرژەوەندیی ئەوانەوە.

بە هەر حاڵ! لەدوای ئەوەوە ئیدی تالیب پای لە ماڵمان بڕی و جارێکی دی نەهاتەوە و هاوڕێیەتیمان لەوێ کۆتایی پێ هات. ئێستا ئەو زەمانێکە لە ژیاندا نەماوە.

# کۆبوونەوەی یەکەمی سوورقاوشان

کۆبوونەوەی گوندی چالاو هەنگاوی یەکەم و سەرەتایی بوو بۆ گرێدانەوەی ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک بە ناوەندیی کۆمەڵە و دامەزراندنەوەی کۆمیتەی ئاگر.

ئەحمەد کرێکار قسەوباسەکانی نێوانمان و چیرۆکی ئێمەی بە ناوەندیی کۆمەڵە گەیاندبوو، ئەوانیش "عەلی بچکۆل"یان ڕاسپاردبوو لەگەڵ من دابنیشێ و تەگبیر و ڕاوێژ سەبارەت بە چۆنیەتی سازدانەوەی ڕێکخستنەکان بکەین.

عەلی بچکۆل ئەو دەمە ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و ئەندامی دەستگای ڕێکخستن بوو، خەڵکی عەسکەر بوو، هەر وا ساڵێک و چەند مانگێک بوو هاوسەرگیری کردبوو، ماڵی لە سوورقاوشان بوو.

سەرەتا لە هەولێرەوە بۆ کۆیە چووم و لەنێو بازاڕی گەورە پرسیاری ئۆتۆمبیلی گوندەکانی دەشتی کۆیەم کرد، ئۆتۆمبیلم دۆزییەوە و لەگەڵ شۆفێرەکەی قسەم کرد و ماوەیەکی پێ چوو، هەتا نەفەرەکانی ئامادە بوون، سوار بووین و کەوتینە ڕێ. ئۆتۆمبیلەکە هەتاوەکوو گوندی بۆگد چوو، ئەوە دواوێستگەی بوو، ئیتر لەوێ دابەزیم. ئەم گوندە کاتی خۆی میر محەمەدی میری سۆران قەلایەکی لێ دروست کردبوو، تا ئەوساش کەلاوەکانی هەر مابوون.[١٣٩]

من ئەبوو ئیدی بەپێ بڕۆم، ڕێگایان بۆم تاریف کرد و بەڕێ کەوتم، هەتا گەییشتمە کڵێسە. پاشان لەوێوە بەردەوام بووم، هەتا گەییشتمە ئاوی زێی بچووک، لەوێ کەڵەکێک لەسەر ئاوەکە بوو، کەسیشی بەدیارەوە نەبوو تا بم پەڕێنێتەوە، منیش چاوەڕێم نەکرد و ویستم خۆم کەڵەکەکە بئاژۆم، بەڵام دوای کەمێک جووڵان، هەستم کرد نازانم سەوڵ لێ بدەم و کەڵەکەکە ئاراستە بکەم، ترسام و زوو گەڕامەوە و چاوەڕێم کرد، تا خاوەن کەڵەک بێت، خۆ ئەگەر ئاوەکە خۆم و کەڵەک بڕفێنێت و بەختم بیهێنێت، ئەوا لە ئالتوون کۆپری و دبس ئەم گرنەوە، ئەگەر نا

---

١٣٩. خولانەوە لەناو بازنەدا، دیوی ناوەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٨٤-١٩٨٨، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپ و بلاوکردنەوەی: مەڵبەندی ئاوەدانیی کوردستان، ساڵی ١٩٩٩، ل ٨٩

منێک کە مەلەوانیم نەدەزانی، دوور نەبوو شەپۆلەکان لێم یاخی ببن و بە دیواری هەڕۆڵی شاخمدا نەدەن.

زۆری پێ نەچوو خاوەن کەڵەک هات و پەڕاندمییەوە. دیسانەوە کەوتمەوە ڕێ، پاش قەدەرێک پۆلێک پێشمەرگە لە دوورەوە دەرکەوتن، وا بەرەو ڕووی من دێن، پاشان پێشمەرگەیەکی دیکە بە تەنها. من جەمەدانییەکم پێ بوو، لە دەمووچاوی خۆمم ئالاند، نەوەکوو کەسێکی ناسیاوی تێدا بێت و بمناسێتەوە، پێشمەرگە تەنهاکەم هەر لە دوورەوە ناسییەوە، عەلی حوسێن حەسەن (شوانەی تەنسیق) بوو. عەلی خەڵکی گەڕەکی ئێمە بوو، یەکتریمان دەناسی و مەرحەباییمان لە نێواندا هەبوو، بەڵام ئەو لە من بەتەمەنتر بوو، من هەموو ڕۆژێک بۆ خوێندنی بەکالۆریی پۆلی سێیەمی ناوەندی دەچوومە ئەو دوو باخچەیەی خوار ماڵی خۆمانەوە و بەزۆریش بۆ باخچەی دەستە ڕاست کە پاڵی بە ماڵەکانی گەڕەکی زێویەوە دابوو، "عەلی"یش هەموو ڕۆژێک بۆ ئەو باخچەیە بۆ خوێندنی بەکالۆریی پۆلی شەشەمی ئامادەیی دەهات. ئەو خوێندکارانەی بۆ ئەوێ دەهاتن، بەزۆری جێگە و ڕێگەی سابتی خۆیان هەبوون کە بەو ڕێگایەدا دەهاتن و دەچوون، لەمسەری بۆ ئەوسەری، لەوسەری بۆ ئەمسەری. شوێن و ڕێگەی عەلی ڕێک بندیواری ماڵەکان بوو، واتە هەر لە دەرگای باخچەکەوە کە دەچوویتە ژوورەوە، بەرەو ناوەوە دەڕۆیت، هەتا دەگەیتە ئەوسەری باخچەکە کە دیواری ماڵەکانی ئەو گەڕەکە بوو.

عەلی بەرەو ڕووم دەهات، لێم نزیک بووەوە و گەییشتینە ڕاستی یەک، بەبێ ئەوەی ڕۆیشتنی خۆم خاو بکەمەوە، بەبێ دەنگی بە تەنیشتیدا تێپەڕیم و تەنها دەستی سڵاوم بۆ هەڵبڕی. پاش قەدەرێک گەییشتمە نێو ئاوایی و بە پرسیار "عەلی بچکۆل"م دۆزییەوە، دوای چاکوچۆنی و ئەحواڵپرسی و دەنگوباسی گشتی و باسی شار و شاخ و دۆخی ڕێکخستنەکانمان، وردە وردە بە پیاسە و بەدەم ڕێکردنەوە، لە سەربانی کۆمەڵێک هۆدە و خانوو کە پێکەوە لکابوون، عەلی بچکۆل کەوتە باسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، هەر بەو جۆرەی لە نامیلکەی "یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆچی؟"دا هاتووە، یەکێتی لە سێ باڵ پێک هاتووە و لە ئێستادا نیمچە بەرەیەکە و سەرەنجام دەبێتە بەرە و "کۆمەڵە"ش دەبێتە پارتی پێشڕەوی ئەو بەرەیە ...هتد.

من ئەو قسەوباسەی "عەلی بچکۆل"م بەلاوە سەیر بوو! من چەندین ساڵە ئەندامی کۆمەڵە و یەکێتیی خوێندکارانی کوردستانم، لە هەر یەکێک لەوانەدا کادر و بەرپرسی هێڵێکی ڕێکخستنم، چەندین هاوڕێم بۆ هەر یەکێک لەوانە ڕێک خستووە و ئێستاش هاتووم تا بە کۆمەکی ئەوان و بە ڕێنوێنی ناوەند و دەستگای ڕێکخستن کۆمیتەی ئاگر دابمەزرێنینەوە، کەچی کاک عەلی تازەبەتازە خەریکە لە ئەلفوبێی یەکێتیی نیشتمانییەوە قسەم لەگەڵدا دەکات و ئەوەی ئێمە لە ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکاندا بۆ هاوڕێیانی خۆمانی باس دەکەین، ئەو لەگەڵ مندا باسی دەکاتەوە!

بێجگە لەو قسەوباسانە، عەلی بچکۆل باسێکی دیکەی کردەوە و وتی، خەتێکی سەربازیی نێوشار هەیە، بەرپرسەکەیان ناوی عومەر نەجارە، بەڵکوو پەیوەندییان بۆ دروست بکەیتەوە و بۆ ئیغتییالات و کاروباری سەربازیی نێوشار بەکاری بهێنن.

ئەوەی شایانی باسە، عومەر نەجار و ئەو خەتەی کە پێوەی بوو، لە شانە چەکدارەکانی سەربە کۆمیتەی ئاگر بوون، لەدوای شالاوی گرتنەکان، عومەر نەجار هەڵهات و لە دەرەوە ئەندامانی خەتەکەی دەبینی و بەڕێوەی دەبردن. لەگەڵ عومەر نەجار هاوگەڕەک بووین، ئەو دوکانی دارتاشی لە عاشوور هەبوو، من ناویم بیستبوو، وەلێ نەمدەناسی.

من ئەو تەرحەم پێ باش نەبوو، بۆیە بە "عەلی بچکۆل"م گوت، لە ئەزموونی کۆمیتەی ئاگرەوە، وا چاکترە شانە چەکدارەکان جارێکی تر لەگەڵ شانەکانی ڕێکخستن تێکەڵ نەکەینەوە. لەدوای ئەوە عەلی بچکۆل هیچی نەگوت و لەوێدا ئەو باسە کۆتایی پێ هات.

بە پێویستی دەزانم لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، من لە باسەکانی دواتر و لە بابەتی "ئەشرەف چایچی و ئێمە"دا باسی چارەنووسی ئەو شانە چەکدارانەتان بۆ دەگێڕمەوە.

هەر لەو سەفەرەدا لەگەڵ عەلی بچکۆل تەرحی ئەوەم کرد، ئەگەر بکرێ خولێکی سەربازی بۆ هەندێک ئەندام و کادری ڕێکخستن بکەینەوە، ڕەنگە بۆ کاتی چالاکیی پەخشی بەیان و بڵاوکراوە، یان بۆ هەندێک حاڵەت و بۆ بەرگریکردن لە خۆ، نەک بۆ چالاکیی سەربازیی نێوشار، پێویستمان پێی هەبێت. عەلی بچکۆل ئامادەیی خۆی دەربڕی و وتی، باشە ئێمە ئەتوانین چۆنیەتی بەکارهێنانی چەک و داژەنین و

بەستنەوەیتان فێر بکەین. دیارە ئەوەی من مەبەستم بوو، لەوە فراوانتر بوو، مەبەستی من ئەوە بوو، نەک هەر فێربوونی بەکارهێنانی چەک، بەڵکە ڕاهێنان و مەشقی سەربازی و فێربوونی تاکتیکی بەرگری لەخۆکردن بوو، بۆیە ئەو هەنگاوەمان نەنا و وازمان لێی هێنا.

دیارە ئەوەی من مەبەستم بوو، لە دەسەلاتی ئەودا نەبوو، لەڕاستیدا یەکێتی بۆ ئەو کەسانەی دەچنە پێشمەرگایەتیش، فێرکاریی سیاسی-سەربازییان نەبوو، چ جا بە ئێمە بگات!

دوای ئەوە عەلی بچکۆل داوای کتێبێکی کرد بە ناوی: "الموسوعة العسكرية" (ئینسیکلۆپیدیای سەربازی)، کە کتێبێکی زۆر قەبە و ئەستوور و نایاب و ناوازە بوو لە دوو بەرگدا. دوای ئەوەی بۆ کەرکووک گەڕامەوە، بە کتێبخانەکاندا گەڕام و پرسیاریم کرد، سەرەنجام لە کتێبخانەی دارولوەتەنییە پەیدام کرد و بە ٥٠ دینار کڕیم و پارەکەیمان لە دارایی ڕێکخراو دا، پاشان بۆیم ڕەوانە کرد. ئەو پارەیە بۆ ئەو زەمانە و بۆ ئەو دوو کتێبە ئێجگار زۆر بوو، ڕاتبی مانگێکی فەرمانبەرێک بوو.

دوای ئەوەی ئیشوکارەکانم تەواو کرد، وام بەباش زانی بۆ گوندی کڵێسە بگەڕێمەوە، بۆ ئەوەی بۆ ڕۆژی دوایی فریای ئۆتۆمبیلی بۆگد-کۆیە بکەوم و درەنگ نەکەوم.ماڵئاواییم لە عەلی بچکۆل کرد و بەرەو گوندی کڵێسە بەڕێ کەوتم، هەتا گەییشتمە ئاوایی. ئەو دەمە زانیاری ئەوەم هەبوو، ماڵی "خالید مەحموود محەمەد" برا گەورەی شەهید بێستوون عەسکەری لەو گوندەیە، ماڵیانم دۆزییەوە و ئەو شەوە لەوێ مامەوە. دەمەو بەیان لەگەڵ شەبەقی و زەردەی دەم کەل لە خەو هەستام، نانوچای بەیانیم خوارد و ماڵئاواییم لە خانەخوێ کرد.

بەپێ بەرەو بۆگد بەڕێ کەوتم، گورج گورج لەش سووکەڵە، دڵ پڕ لە خۆزگە و ئاوات، بەدەم ڕێوە و بە هاوشانی زێی بچووک کەوتمە نێو خۆشی خەیاڵی ساڕێژکردنی برینی شار، نزیکبوونەوەی سەرلەنوێ ڕۆنانەوەی کۆمیتەی شار و لێکبەستنەوەی هێڵە لێک ترازاوەکان و دەستبەکاربوونەوەمان بۆ کاری جددی و خەباتکارانە. تاوناتاوێکیش سەرنجم ئەچووە سەر دیمەنی دڵفرێنی ئەو دۆڵ و کێو و زۆزانە و تەنیا شتێک کە مەنگی ئەو ڕێگا و دۆڵ و کەنارەی منی تاقە ڕێبواری دەشڵەقاند، هاژەی ئەو ڕووبار و چەمە و جریوە و جووکەجووکی باڵندەکان بوون.

بەڵێ! بەو بەیانییە زووە، بەو سبای ساڵحانە، خوێندکاران بەرەو خوێندنگا و بە خەیاڵی دەرسودەور و خوێندنەوە، کرێکاران بەرەو کارگە و کارخانە و شوێنی کار و بە خەیاڵی کارەوە، خاوەنکاران بۆ بیرۆی کار و بە خەیاڵی قازانجی زۆر و بەرهەمی کارەوە ... دایکیشم بۆ مانگادۆشین و منیش لە خەیاڵی لێکبەستنەوەی دوو شانەی پساو و گورجکردنەوەی هەنگاوەکانی تێکۆشانەوە ... لەپڕێکدا، لەپاڵ هاژەی ڕووبار و جریوەی باڵندەکان، دەنگ و ڤڕەی کۆپتەریش خۆی هاویشتە نێو ئەو تابلۆیەوە و هەتا دەهات نزیک دەبووەوە، لەگەڵ نزیکبوونەوەی دەنگەکە، ئەو تابلۆ نەخشینەی بەرچاومی دەشێواند و ئەو سەمفۆنیایەی تێک ئەدا.

من زۆرم نەمابوو بگەمە گوندی بۆگد، هێشتا لە ڕاست بۆڵقامیش بووم، دەنگی کۆپتەرەکان تەواو نزیک بوونەوە. بۆڵقامیش گوندێک بوو لە نێوان کڵێسە و بۆگد، وەلێ ئەمان لەمبەری ئاوەکە و لە نشێوەکەدا، ئەویش بەوبەری ئاوەکە و بەو بەرزییەوە. کۆپتەرەکان، کۆپتەری جەنگی بوون، کۆپتەری بیمارستان و خاچی سوور نەبوون، هەناویان ڕەش بوو وەک قەقنەس، شەڕەنگێز بوون وەک ئەهریمەن، ڕاوچیی بەعس و چاو و گوێی دنیای شەڕ بوون. کۆپتەرەکان چەند جارێک بە بازنەیی، شانی دیوی گوندەکەی کەمێک خوار کردەوە، تا بەچاوی وێرانکاری بڕوانێتە ئاوایی و بزانێت کوێی گوند زامار بکات، دوای چەند دەورەیەک، وردە وردە دابەزی، بە پەروانەکانی ژێر خۆی پاک کردەوە و زگی خستە سەر زەوی، هەناوی ڕەشی خۆی هەڵڕشت و ئەو ڕۆژە تا ئێوارە، بوخچەیەک دڵیان لە لێدان خست، چەندین ژن و مێردیان لەیەک کرد و چەندین دڵداریان بێ دڵ کرد، دەیان منداڵیان بێ باوک کرد و سەدان چاویشیان کردە گۆمی خوێن.

من هەنگاوەکانم گورج کردەوە، تاوەکوو بگەمە بۆگد و بگەمە پەنایەک. شەڕ دەستی پێ کرد، سواری سەیارەی ئاوایی بووم و بەرەو کۆیە بەڕێ کەوتم، بەڵام بێجگە لە خەم و خەیاڵی بۆڵقامیش، هیچ شتێکی دیکە لە کەلەمدا نەما. گەیشتمەوە کەرکووک و هەواڵم زانی: لە گوندی بۆڵقامیش لە شەڕێکی سەخت و قارەمانانەدا، بەکر تەلانی و کۆمەڵێک لە هاوڕێکانی گیانیان بەخشی.

وەلێ سەرگوزەشتەی ئەم مەفرەزەیە چۆن بوو؟

ڕێکەوتــی ١٩٣٤/٣/٣١ ڕۆژی دامەزرانـدنی حیزبـی شـیووعیی عێـراقییە. بەکـر تەلانی و مام جوامێر بۆلقامیشی و هاوڕێکانیـان بە بۆنەی ٤٨ ساڵەی دامەزراندنی حیزبەکەیـانەوە لە دەوروبەری گونـدی ڕێدار چالاکییەکیـان ئەنجـام دابـوو، لەدوای ئەوە گوند بە گوند هاتبوون هەتا بە گوندی کڵێسـە دەگەن. لە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٤/١دا و هەر لەو گوندە و بۆ هەمان مەبەست ئاهەنگێک ساز دەکەن. پاشـان ئەوێ بەجێ دەهێڵن و کەڵەکە شرێک درووست دەکەن و وردە وردە لە زێیەکە پێی دەپەڕنەوە. دوای ئەوە بەو ڕێگا ڕکەدا سـەردەکەون هەتـا دەگەنە نـاو گونـدی بۆلقـامیش و بـۆ شەوەکەیشی هەر لەوێ دەمێننەوە.

هەر ئەو ئێـوارەیە هێنـدێک هەواڵ و دەنگوباسـیان لەمەڕ جموجـووڵی هێزەکـانی ڕژێم پێ دەگات، بـۆ شـەوەکەی کۆبـوونەوەیەک دەکەن و دەربـارەی ئەو دەنگۆیـانە گفتوگــۆ و تەگبیــر دەکەن. هێنــدێکیان پێشــنیاری ئەوە دەکەن، بەیــانی زوو پــێش قاوەڵتی ئاوایی بەجێ بهێڵن و لە گونـد دەرکەون، وەلـێ سـەرەنجام بڕیـاری مـانەوە دەدەن.

ڕۆژی دوایـــی ڕێکەوتـــی ١٩٨٢/٤/٢ لە دەوروبەری دەمژمێـــری ٧ی بەیـــانی، ئێشــکگرەکان، مەلا هۆشـیار و عەبـدوڵا (شـوانە) هــاوار دەکەن و دەڵـێن: چەنـد کۆپتەرێک لە کەرکووکەوە هەستاون و ئێستا لە دەوروبەری خاڵخالانن! لەدوای ئەم هەواڵە، بەکـر تەلانـی کە سـەرلقی ئەو هێـزە بـوو، هـاوار لە پێشـمەرگەکان دەکـات، کۆیان دەکاتەوە و ڕاوێژیـان پێ دەکـات. مـام جوامێر کە ئەویش هەر سـەرلق بـوو، دەڵێـت: مـن پـێم باشــە، هەر لەنێـو گونـدەکەدا بمێنینـەوە و دەرنەچـین! بەڵام بەکـر تەلانـی ئەو پێشـنیارەی پـێ دروسـت نابێـت و ئەڵێـت: نەخێـر! ئـێمە لەپێنـاوی ئەم میلەتەدا هەستاوین و دەستمان داوەتە چەک، شەڕ لەنـاو دێدا ناکەین! ئیدی ئـاوایی بەجـێ دەهـێڵن و لە دەرەوەیـدا خۆیـان دادەبەسـتن و سـەنگەر دەگـرن. هێزێکـی گەورەی جەیـش و جـاش بەو شـێوەیەی کە باسـم کـرد، بە کـۆپتەر دادەبەزن و چواردەوریان دەگرن و پاشان شەڕ دەست پێ دەکات. سـەرەنجام لەدوای شـەڕێکی سـەخت و قارەمانـانە، بەکـر تەلانـی و پۆلێـک لە هــاوڕێ و هاوسـەنگەرانی گیـانی خۆیان دەبەخشن و بۆ هەمیشە چاو لێک دەنێن.

بەو پێـیە بێـت، کۆبـوونەوەی ئەو جـارەی مـن لەگەڵ عەلـی بچکـۆل ڕێکەوتـی ١٩٨٢/٤/١ بووە.

# خۆپیشاندانی زانکۆی سەلاحەدین

لە هەشتەمین ساڵڕۆژی بۆردوومانی شاری قەڵادزێدا، خۆپیشاندان لەو شارەوە دەستی پێ کرد و دوای ئەوە زۆرێک لە شار و شارۆچکەکانی دیکەی کوردستانی گرتەوە.

ئەم خۆپیشاندانانە بە دەستپێشخەریی کۆمەڵێک هەڵسووڕاوی چەپ دەستی پێ کرد کە سەربە ڕێکخراوی برووسک و یەکێتیی تێکۆشانی کارگەران بوون و لەو دەمەدا پێشمەرگە و بەرپرس و فەرمانده‌ی تیپی ٦٣ی جووتیارانی سەربە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون. واتە، ئەمانە تەنها وەکوو پێشمەرگە لەگەڵ یەکێتیدا بوون، وەلێ لە ڕووی ڕێکخستنەوە سەربە ڕێکخراوی برووسک و یەکێتیی تێکۆشانی کارگەران بوون.

لە گفتوگۆیەکدا نادر عەبدولحەمید، وەک یەکێک لە کادرانی ئەو ڕێکخراوە و یەکێک لە فەرماندەکانی ئەو دەمەی تیپی ٦٣ی جووتیاران سەبارەت بەو ڕووداوە دەڵێت:

(... کارگەران لەناو شارەکانیشدا بە لایەنگران و ئەندامانی خۆی وتبوو، هەر کەسێک لە سەربازی فیراری کرد، با بۆ تیپی ٦٣ی جووتیاران بچێت. بەم شێوەیە ژمارەیەک لە لایەنگران و ئەندامانی کارگەران لەو تیپە بوون بە پێشمەرگە و تیپەکە بە کردەوە بوو بە مەڵبەندێک بۆ کۆکردنەوەی ئەندامان و لایەنگرانی کارگەران و ببوو بە ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان ئێمە و کارگەران. ئەو دەنگوباسە بە سەرکردایەتیی یەکێتی گەیشتبوو کە چۆن لەناو شارەکاندا "عێراقچییەکان" ڕێنوێنی سەربازە هەڵهاتووەکان دەکەن، بۆ تیپی جووتیاران بچن و ببن بە پێشمەرگە. هەر وەکوو ئاماژەشم پێی دا، وێڕای ئەوەی چەند هاوڕێیەکی کارگەران لە تیپەکەدا بوون، من و هاوڕێ عەبدولاش هەر بە "عێراقچی" دەناسراین. ئەمانە گشت ترس و گومانی خستبووە دڵی سەرکردایەتیی یەکێتی و "کۆڕەک"ەوە و ئەگەری ئەوەیان دانابوو کە لەوانەیە ئەم هێزە لە یەکێتی جیا ببێتەوە و ببێتە هێزێکی سەربەخۆ. بۆیە لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٨٢دا مام جەلال ئێمەی بۆ لێپرسینەوە بۆ

سەرکردایەتی بانگ کرد. بەر لەوەی ئێمە بۆ سەرکردایەتی بچین، بۆ یادی هەشتەمین ساڵڕۆژی بۆردومانی شاری قەڵادزێ بەیاننامەیەکمان نووسیبووەوە و بە دەنگی ئاسۆی کەریم زەند لەسەر کاسێت تۆمارمان کردبوو. هەروەها مەفرەزەیەک پێشمەرگەشمان ئامادە کردبوو، بەیاننامەکە و کاسێتەکە بۆ قەڵادزێ ببەن و کاسێتەکە لە شەوی ٢٣ لەسەر ٢٤ لەدوای بانگی شێوان بخەنە سەر مایکرۆفۆنی "مزگەوتی کارەبا" کە لەو سەردەمەدا لە ناوەڕاستی شاردا بوو.

ئێمە لە بەرواری ١٩٨٢/٤/٢٤ بۆ لێپرسینەوە لە ناوچەی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ چاوەڕێی دانیشتنمان لەگەڵ مام جەلالدا دەکرد. لە ڕێگەی کاروانچییەکانەوە دەنگوباس هات کە دوێنێ شەو پێشمەرگەکانی تیپی ٦٣ی جووتیاران قەڵادزێیان گرتووە و لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە وتاریان خوێندووەتەوە و بۆ بەیانیش خۆپیشاندان بووە و دوو کەس بە ناوەکانی دایکە ئامینە و مامۆستا سنەوبەر شەهید بوون. کاتێک لەگەڵ مام جەلال دانیشتین، وتی: ئێستا وەختی لێپرسینەوە و باسکردنی هیچ شتێک نییە، تەنها ئەوە نەبێت، چۆن ئەو خەباتە پەرە پێ بدەین؟!

دوای دانیشتن لەگەڵ مام جەلال بۆ بارەگای ڕادیۆ چووین، تاوەکوو وتار لەسەر خۆپیشاندانی جەماوەریی شاری قەڵادزێ و شارەکانی تریش بنووسین. بیرمە ئەو کات ئەرسەلان بایز بەرپرسی ڕادیۆ بوو، نووسینەکانی ئێمەی سانسۆر دەکرد و خەتی سووری بەو شوێنانەدا دەهێنا کە بەلای ئەوەوە لەگەڵ کورد و کوردستاندا نەدەهاتنەوە و بۆنی "عێراقچێتی"یان لێ دەهات و لەگەڵ خوێندنەوەیدا لای دەبردن، ئێمەش بە مام جەلالمان وت، ئەویش تەلەفۆنی بۆ ئەرسەلان کرد و وتی: هەر شتێک دەنووسن، دەبێ بەبێ سانسۆر بۆیان بڵاو بکەنەوە. ئیتر لەدوای ئەوەوە هەر شتێکمان دەنووسی، وەک خۆی بڵاو دەکرایەوە. دوای ئەوە مامۆستا عەبدولا بۆ تیپی جووتیاران گەڕایەوە و منیش بە هاوئاهەنگی لەگەڵ مولازم عومەر، بووم بە فەرماندەی هێزێکی پێکهاتوو لە پێشمەرگەکانی گەرمیان و بەشەو خۆمان بەناو شاری قەڵادزێدا کرد)[١٤٠]

---

١٤٠. مێژوویەک لە یادەوەریدا، سالار ڕەشید، ل ٩٦-٩٨.

سەرەنجام خۆپیشاندان تەنییەوە و شارەکانی دیکەی کوردستانی گرتەوە.

تارماییەک بەنێو زانکۆدا دێت و دەچێت، ئەویش تارمایی خۆپیشاندانە. پیاوانی ڕژێم لە ئامادەباشیدا بوون، چەند ڕۆژێک پێشتر دەمانچەیان بەسەر ئێتیحادییەکان دابەش کردبوو. ئەو ڕۆژانە ئێمە خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین خەریکی دەوامی ئاسایی خۆمان بووین، دەنگوباسی خۆپیشاندانەکان لەنێو خوێندکاراندا ئەمدەست و ئەودەستی دەکرد، ڕۆژی یەکشەممە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٥/٢ لە کۆلێجی ئەندازیارییەوە چەخماخەی یەکەمی خۆی لێ دا.

ئەو ڕۆژە ئیتر فەزای خۆپیشاندان بەتەواوەتی خۆی بەسەر زانکۆدا زاڵ کردبوو، تەقینەوە لە ئانوساتدا بوو، خوێندکاران دوو دوو و سێ سێ و دەستە دەستە لە چپەچپ و فسکەفسکدا بوون، سەرەنجام کۆمەڵێک لە خوێندکارانی کۆلێجی ئەندازیاری لە ماوەیەکی کورتدا بڕیاری خۆیان ئەدەن و داوا لە خوێندکاران دەکەن لەبەردەم نادی کۆلێج کۆ ببنەوە و لەوێوە دەست پێ بکەن، کۆمەڵێک لە خوێندکاران لەوێ کۆ دەبنەوە، هێشتا بەشێک لە خوێندکارانیش هەواڵەکەیان پێ نەگەیشتبوو، وەلێ ئەم کۆمەڵە خوێندکارە کە نزیکەی ٤٠-٥٠ کەسێک (لەتیف، ڕاغیب، بەیان، حامید عەبدوڵا ڕەزا، مەحموود ئەسعەد پەری، ڕێبوار، پەری، سەلاح، ئاکۆ وەهبی، تێکۆشەر، بەختیار ...) دەبوون لە کچان و لە کوڕان، چی دی چاوەڕێ ناکەن، یەکەم کەس "لەتیف" چەخماخەکەی لێ ئەدا و بە سروودی "ئەی ڕەقیب" دەنگی لێ هەڵدەبڕێ. ئیدی خۆپیشاندان بە سروود و بە چەپڵە دەست پێ دەکات، نێو کۆلێج دەشێوێت و دەبێتە تەقە و بەردهاویشتن. یەکەمین فیشەک لەلایەن سەرۆکی ئێتیحادەوە کە ناوی "وحید" ئەبێ دەتەقێندرێت. ئەبوبەکر کە لە نزیکی مەحموود ئەسعەد پەری دەبێت و بریندار دەبێت، چاکەتەکەی مەحموودیش دەبێتە خوێنی "ئەبووبەکر"ەوە، بەڵام خۆی ئاگای لێ نییە!

حامید: مەحموود! ئەوە بریندار بوویتە؟

مەحموود: نازانم، هەست بەهیچ ناکەم!

حامید: با! قۆڵی ڕاستی قەمسەڵەکەت هەمووی خوێنە!

ئینجا مەحموود دەزانێت، قەمسەڵەکەی بووە بە خوێنی "ئەبووبەکر"ەوە، خێرا لەبەری خۆی دائەکەنێ و فڕێی ئەداتە نێو ئۆتۆمبیلەکەی "حامید"ەوە.

ئەفسەری ئاسایشی کۆلێج کە ناوی شەوقی بوو، بەڕوویەکی خۆش و بە جۆرێک لە پاڕانەوە ڕوو لە خوێندکاران دەکات و دەڵێت:

"علی کیفکم شباب!"، واتە: لاوان لەسەرخۆ!

خۆپیشاندەرانیش ئەفسەری ئاسایش ئەدەنە بەر بەرد و بەرەو پرسگە و دەرگای دەرەوە مل ئەنێن و لەوێوە دەچنە دەرەوە و بە درووشم و بەدەم سروودوتنەوە بەرەو کۆلێجی علووم دەچن.[١٤١]

کاتێک کە خۆپیشاندەران نزیک دەبنەوە، حیکمەت مەلا حەکیم، خوێندکاری بەشی کیمیا، کاردانەوەیەک لەخۆ پیشان ئەدات، بەڵام پیاوانی ڕژێم کە لە ئامادەباشیدا بوون، فریا دەکەون و بە چەندین کەسەوە دائەبارنە سەری و ئازارێکی زۆری ئەدەن. نیشتمانی هاوسەری و هەندێک لە خوێندکاران هەوڵ ئەدەن بەریان پێ بگرن، یەکێک لە ئەمنەکان پەلاماری نیشتمان ئەدات، هەژار تەها پاڵێک بە ئەمنەکەوە دەنێت و فڕێی ئەداتە نێو ئەو گۆلاوەی بەهۆی ئاوی بارانەوە لە نێوان هۆڵی محازەرەکاندا کۆ ببۆوە. پاشان ڕادەکات و خۆی دەکاتە نێو هۆڵی محازەرەی کۆلێجی پەروەردەوە کە ئەو ڕۆژە لە کۆلێجی علووم محازەرەیان دەبێت. ئەمنەکان دوای ئەکەون و بەدوایدا ئەگەڕێن، مامۆستاکە دەنگ ناکات، بەڵام خوێندکارێکی ئیتیحادی خەبەری لێ دەدات و سەرەنجام ئەگیرێ و زۆری لێ ئەدەن. هەژار لە دەستیان ڕا دەکات و دەکەوێتە نێو گۆلاوەکان و دووبارە دەی گرنەوە و دیسانەوە لێی ئەدەن هەتا لەهۆش خۆی دەچێت. پاشان فڕێی ئەدەنە پشتی پیکابەکەیان و بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی دەبەن.[١٤٢]

خۆپیشاندەرانی کۆلێجی ئەندازیاری گەیشتنە بەردەمی کۆلێجی علووم، پیاوانی ڕژێم دەرگای سەرەکیی کۆلێجیان داخست و کەوتنە سەرکوتی خۆپیشاندەران.

---

١٤١. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێزان حامید عەبدوڵا ڕەزا و مەحموود ئەسعەد پەری، خوێندکارانی کۆلێجی ئەندازیاری، بەشی کارەبا.

١٤٢. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێزان سەباح عەبدوڵا حەمەدین و هەژار تەها ئەحمەد خوێندکارانی کۆلێجی علووم، بەشی کیمیا و فیزیا.

ڕاگری کۆلێجەکەمان دکتۆر عەبدولڕەزاق لە دەرگای سەرەکی چووە دەرەوە و بە کلاشینکۆفێکەوە کەوتە دەستڕێژ لە خۆپیشاندەران. لەو دەمە دا ئێمە بەشێک لە خوێندکاران هەوڵمان دا لە دەرگای سەرەکی و پرسگەوە بچینە دەرەوە و بە خۆپیشاندەرانەوە پەیوەست بین، بەلام دەرگایان کلۆم کرد و ڕێگەیان لێمان گرت و نەیانهێشت کەس بچێتە دەرەوە. سەرەنجام ئێمە سێ کەس (عوسمان غەریب محەمەد، یاسین حوسێن هەمزە، سالار ڕەشید) بە هەر جۆرێک بوو چووینە دەرەوە، بەلام ئەو دەمە خۆپیشاندەران دوور کەوتبوونەوە. ئیدی ئێمە خۆمان کەوتینە نێو ئەو گەڕەکانە و بەدەم هوتافکێشانەوە کۆلان بەکۆلان ڕۆییشتین. ئەو خەڵکە کە زۆر نەبوون و زیاتریش ژنان بوون، لەنێو کۆلان و بەردەرگاکان سەیری ئێمەیان دەکرد و واقیان وڕ مابوو. دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر بەو جۆرە ڕێمان کرد و تاقە کەسێک پێمانەوە پەیوەست نەبوو، وازمان هێنا و ڕۆییشتینەوە بۆ بەشە ناوخۆییەکەی خۆمان.

خۆپیشاندەران پێش ئەوەی بگەنە کۆلێجی پەروەردە تەقەیان لێ دەکرێت و سەرەنجام بە کۆلانەکاندا بلاوەی لێ دەکەن. کاتێک دەچنە کۆلانەکانەوە تووشی جەیش شەعبییەکی کورد دەبن، بەختیار (بەختیار ڕاپ) پەلاماری ئەدات و کلاشینکۆفەکەی لێ ئەسەنێت، دوای قەدەرێک نازانن چی لێ بکەن و ئەزانن ئەبێتە بارێک بەسەریانەوە، بۆیە هەر لەوێ بۆی بەجێ دەهێڵن و دەڕۆن.

خۆپیشاندانی ئەو ڕۆژەی زانکۆ، شاری هەولێری لەرزاند. حکوومەتی بەعس ئەم زانکۆیەی بۆیە لە سلێمانییەوە بۆ هەولێر گواستەوە و کەرت و پەرتی کرد، تاوەکوو کوانووی بەرگری و خەباتکارانەی خامۆش بکات و دەستەمۆ و دەستبەسەری بکات، کەچی ئەوا هێشتا ساڵێک بەسەر گواستنەوەکەیدا تێ نەپەڕیوە، بووە مەیدان و شانۆی خۆپیشاندان!

خۆپیشاندانەکانی کوردستان هەر وا درێژەی هەیە و بەردەوامە، تازە ئەوا زانکۆش پریشکی بەرکەوت و گڕی گرت، گڕگرتنی زانکۆش هەر وا سانا نییە. زانکۆ خانەی توێژێکی خوێندەواری خورت و جحێڵ و هۆشیارە، گەلێک جاران لە

دیرۆکــی نارەزایەتییەکانــدا زانکــۆ و دانیشــگاکان پێشــەنگ بــوونە و ســەرەنجام ئاڵوگۆڕی گەورە و بنەڕەتییان لە وڵاتدا بەدی هێناوە.

ئێــوارەی ئەو ڕۆژە خوێنــدکاران چــوونەوە بــۆ بەشــە ناوخۆییەکانیــان. بــۆ شــەوەکەی دەستە دەستە و گرووپ گرووپ لەدەوری یەکتری کۆ بووینەوە. ئەو دەمە مـن لە بەشـی نـاوخۆیی قـادر بـلە بـووم، ژوورەکەی ئـێمە پێـک هـاتبوو لە: حـیکمەت حەکـیم، ســالار ڕەشـید، ســەباح عەبـدوڵا حەمەدیـن (ســەباحە ســوور)، عەزەدیـن مەجیـد مـحەمەد، عەلـی مەحمـوود مـحەمەد (عەلـی سیاسـی). ژوورەکەی تەنیشـتمانیش پێک هـاتبوو لە: عوسـمان غەریـب مـحەمەد، لوقمـان سـدیق ڕەسـوول، یاسـین حوسـێن هەمـزە. ئەوەی شـایانی باسـە "سـەردار عوسـمان محەمەد"یـش کە مانگ و نیوێک پێش ئەو ڕووداوانە شەهید کرا، هەر لەو ژوورە بوو.

شـەهید سـەردار خوێنـدکاری کـۆلێجی زانسـتەکان بەشـی جیۆلـۆجی و خەڵکـی ماوەت بوو. ڕۆژێک پێش ئەوەی شەهید بکرێت، ڕێکخستنەکانی پارتی سۆشیالستی کـورد (پاسـۆک) لە هەولێـر بە بـۆنەی نەورۆزەوە کۆمەڵێـک دروشـمیان لەســەر دیوارەکـان نووسـیبووەوە. شـەوێک دوای ئەوانـیش سـەردار و جەبـار مەحمـوود ڕەسـوول کە هەر هـاوڕێی یەکتـری بـووین، دەرئەچـنە دەرەوە بـۆ دیوارنووسـین. بەڵام بەهۆی ئەوەی شەوی پێشوو پاسۆک ئەو کارەیان کردبوو، پۆلیس و دەسـتگا ئەمنییەکـانی شـاری هەولێـر لە ئامادەباشـیدا بـوون. بـۆیە لە کـاتی دیوارنووسـیندا دەبینـرێن و تەقەیـان لـێ دەکرێـت و سـەردار گیـانی دەبەخشـێت. دوای ئەوە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکاران، بە چەندین پاس تەرمەکەیمان بۆ ماوەت بردەوە.

لەگەڵ سەردار هاوڕێی نزیکی یەکتری بووین، جارێکیش بۆ کەرکووک هـات و شەو لە ماڵمان مایەوە.

ســەردار پــێش ئەوەی بێـتە زانکــۆ، بــۆ مــاوەیەک دەچێـتە دەرەوە و دەبێـتە پێشمەرگە. چەند جارێک چیرۆکی ئەو ڕۆژانەی خۆی بۆم گێڕاوەتەوە، وەلێ ئەوەی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، ئەم حیکایەتە بوو:

مـاوەیەک لە بارەگاکـانی سـەرکردایەتی بـووم، ڕۆژێکیـان سـالار عەزیـز بەوێـدا تێپەڕی، هەمـوو پێشـمەرگەکان لەبەری هەسـتان، تەنهـا یەک پێشـمەرگەیەک نەبێت،

ئەویش سەرقاڵی ڕادیۆچاکردن بوو. سالار چووە لایەوە و پێی وت، کە بۆچی لەبەری هەڵناسێت! ئەویش وتی: کاک سالار! خۆت ئەزانی من سەرقاڵ بووم، پاشان خۆ سەردەمی ئاغایەتی نییە! سالار گرتی و زۆری لێ دا، هەتا قۆڵی شکاند!

وتم (سالا ڕەشید): کاک سەردار ئەوە بەڕاستە؟!

وتی: کاک سالح! ئەوەی ئەو دەمە لە سەرکردایەتیی یەکێتی بووبێت، ئەزانێت ئەو پێشمەرگەیە بۆچی دەستی بە ملییەوە هەڵواسرابوو!

سەردار مرۆڤێکی زۆر بەڕێز، هێمن و زرنگ و شۆڕشگێڕ بوو، یەکێک لە جیاکەرەوەکانی ئەو مرۆڤە ئەوە بوو: ئەو دەمە هەڵسووڕاوانی سیاسی کۆمەڵە بەزۆری ناوچەیی بیریان دەکردەوە، یانی تەنها هاوکێشە سیاسییەکانی نێو کوردستان و عێراق یان ئەوپەڕی ناوچەکەیان دەبینی، وەلێ سەردار باسی هاوکێشە سیاسییەکانی جیهان و بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا و وڵاتانی زلهێزی لە ناوچەکەدا دەکرد!

ئێمە ئەم دوو ژوورە زۆر تێکەڵ بووین. ئەو شەوە هەموو لە دەوری یەکتری و لە ژوورەکەی ئێمە کۆبووینەوە، 'حیکمەت'مان لەگەڵدا نەبوو، ئەو هەر ئەو ڕۆژە گیرابوو، ڕەنگبێ کەسی دیکەشمان لەگەڵدا بووبێت، وەلێ من نایەتەوە بیرم. ئیتر قسە لەسەر ئەوە کرا، بۆ سبەی لە شێخەڵا لەو بازاڕەی نێوان مەیدانی ڕیمەکان و کۆلێجی ئیدارە و ئیقتیساد خۆپیشاندان بکەینەوە.

بێگومان لە بەشە ناوخۆییەکانی دیکەش خوێندکاران هەر بە وێنەی ئێمە لە دەوری یەکتری کۆ دەبوونەوە و تەگبیری ئەوەیان دەکرد، ڕۆژی دوایی لە کوێ و کەی بەردەوامی بە خۆپیشاندانەکان بدەن، ئیتر سەرەنجام لەسەر کات و شوێنێک دەبڕایەوە، بڕیارەکانیش دەستەجەمعی بوون و لە کۆبوونەوە و کۆڕ و کۆمەڵەکاندا دەدران، هەموو کەسێک ڕای خۆی دەدا و پاشان پەسەند دەکرا و دەماودەم بڵاو دەکرایەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی خوێندکاران پۆل پۆل بەرەو شێخەڵا بەڕێ کەوتن، خەڵکێکی زۆری لێ کۆبووەوە، چەخماخەی خۆپیشاندان لێ درا و سەدای سروود و هوتافکێشان ئەو ناوەی پڕ کرد، زۆری نەبرد هێزە ئەمنییەکان گەیشتنە سەرمان و

دەستیان بە دەستڕێژ کرد، سەرەنجام لەژێر قرمژنی گولەدا بڵاوەمان لێ کرد و هەر یەکە بەلایەکدا ڕای کرد. ئەو ڕۆژە سەفا سدیق ڕەشید کە خەڵکی کەرکووک و خوێندکاری قۆناغی سێیەمی کۆلێجی زانستەکان بەشی کیمیا بوو، گیانی بەخشی، کۆمەڵێکیش بریندار بوون.

بۆ شەوەکەی دیسانەوە لە بەشی ناوخۆیی لە دەوری یەکتری کۆ بووینەوە. تەگبیری شوێن و کاتی خۆپیشاندانی ڕۆژی دواتر کرا و بڕیار درا بۆ عەسرەکەی لە جادەی باتە درێژە بە خۆپیشاندان بدرێت.

من ئەو ڕۆژە لە کۆلێج بووم، کاتێک ویستم بچمە دەرەوە، ڕێگایان لێم گرت و چەند هەوڵم دا و بیانووم هێنایەوە، بەڵام بێسوود بوو، هەوڵم دا لە جێگەیەکی دیکەوە بچمە دەرەوە، چونکە وەختی خۆپیشاندانی جادەی باتە وا خەریکە نزیک دەبێتەوە. کۆلێج دیواری نەبوو، دەوروبەرەکەی تەلبەندێک بوو، چاوم گێڕا، بینیم تەلبەندەکە لەو سووچەی دەکەوتە لای کۆلانەکەوە دڕێندرابوو، کونێکی بایی چوونە دەرەوەی تێدا کرابوو، لەوبەریشەوە و هەر بەرامبەر بەو کونە کۆمەڵێک لە ئەمن و بەعسییەکان بەچەکەوە چاودێریی ئەو دەوروبەرەیان دەکرد، من ئەمزانی کاتێک لەوێوە دەرئەچم هەر دەمبینن، بەڵام کردمە چاوقایمی و گوێم نەدایە. لە کونەکە دەرچوومە دەرەوە، ئەوانیش هەر هەموو بەپرتاو گەییشتنە سەرم و گرتمیان، پاشان بۆ پرسگەیان بردم، لەوێش دووبارە ئەوانەم بینییەوە کە پێشتر بووبووە قرەمان، سەرەنجام گومانی ئەوەیان کرد، ئەو هەموو هەوڵەی من بۆ ئەوەیە، بگەمە خۆپیشاندانی جادەی باتە کە دیار بوو ئاگایان لە شوێن و کاتەکەی هەبوو. فڕێمیان دایە نێو ئۆتۆمبیلەکەیانەوە و بۆ دائیرەی ئەمن بردمیان.

ئەو جێگایەی منیان بۆ برد، لەسەر ئەو جادەیە بوو کە بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی لێ بوو. خانوویەک بوو دەکەوتە خواری خوارەوە و بە دەستی ڕاست. هەر لەبەر دەرگاوە کەلەپچەیان کردم. لەو کاتەدا کە ئەمنەکە کەلەپچەکەی دەکردە دەستم، پرسی:

تۆ لە کام کۆلێج و بەشی؟

وتم: کۆلێجی زانستەکان بەشی فیزیا.

وتی: ئێ، کە تەواوت کرد، ئەبی بە چی؟ دیاربوو نەیدەزانی دەرچووی کۆلێجی زانستەکان بەشی فیزیا دەبێت بەچی!

وتم: مامۆستای فیزیا.

وتی: احنا مانرید مدرس فاسد!

واتە: ئێمە مامۆستای بەدخوومان ناوێت!

دوای ئەوە بە پەڕۆیەک چاومیان بەستەوە و لە ڕاڕەوێکدا کە بۆ یەکێک لە ژوورەکان دەچوو فڕێیان دام. پاش چەند ڕۆژێک خستمیانە ژوورەکەوە. ئەو ژوورە نزیکەی بیست زیندانییەکی تێدا دەبوو، وا دیار بوو کە پێشتر زیندانی زۆرتریشی تێدا بووە، بۆیە منیان لە ڕاڕەوەکە فڕێ دا. زیندانییەکان هەر هەموو لە خۆپیشاندەران بوون و پێ دەچوو جێگەکانی دیکەشیان پڕ کردبێت، بەڵام هی وا هەبوو، هەر ئەو ڕۆژە بەر ئەدرا. من ٨-٩ ڕۆژ لە زیندان مامەوە و چەند جارێک بۆ لێکۆڵینەوە بردمیان. یەکێک لەو جارانە ئەفسەری لێکۆڵەر داوای لێم کرد، سروودی ئەی ڕەقیبی بۆ بڵێم، منیش بە ئیسراحەتی خۆم دەستم کرد بە وتنی ئەی ڕەقیب. وا دیار بوو، لەنێو خۆپیشاندانەکانەوە زۆر گوێی لەو سروودە بووە و ئەیزانی ئەوە مارشی خۆپیشاندەران بووە و لەگەڵ بڵندبوونەوەی سەدای ئەو سروودە زارەترەک بووە. پاشان وتم، ئێمە خوێندکاران هەر هەموو ئەو سروودە دەزانین و لە قوتابخانەوە فێری بووینە.

یەکێکی دیکە لەو پرسیارانەی لێمی کرد و پێداگری لەسەر کرد، وتی: کێ ئێوەی هان داوە؟ ئینجا هەر خۆی دەستی کردە جوێندان و گوتی: ئەمە دەستی سووریای لە پشتە!

ئازار و ئەشکەنجە لە نیوەشەوەوە دەستی پێ دەکرد، بەڵام تەنها بۆ چەند کەسێک بوون کە بەڵگەیان لەسەریان هەبوو، باقی زیندانییەکان لێدان و سووکایەتیی ئاساییان هەبوو.

سەرەنجام لە دوا لێکۆڵینەوەدا کەلەپچەکەیان لە دەستم کردەوە و پارە و پێناسە و شمەکەکانیان پێم دایەوە و ئازادیان کردم. بەڵام دوای من هێشتا خەڵکی دیکەی تێدا مابوو.

که له زیندان دەرچوومه دەرەوه، هەر بەپێ بەرەو بەشی ناوخۆیی قادر بله کەوتمه ڕێ، هەتا گەیشتمەوه جێ. لەو نێوانەدا تووشی دوکانێک بووم، ئەو ماوەیه چونکه خواردنمان ڕۆژانه هەر دوو لەفەی بچووک بوو، بەبێ چایی و هیچ خواردنەوەیەکی دیکه، هەناوم گڕەی ئەهات، بۆیه لام دا و ساردییەکم کڕی و خواردمەوه. کاتێک که گەیشتمەوه قادر بله و چوومەوه ژوورەکەم، هەندێک له هاوڕێکانم لەوێ بوون، باوەشمان به یەکدا کرد و کەوتینه نێو پرسیار و خەبەر و باسەوه.

لەو ڕۆژانەدا که من له زیندان بووم، ئاگام لەوه نەبوو له کەرکووکیش خۆپیشاندان بووه و خەڵکێکی زۆر گیراون و شەهید بوونه و لوقمانی براشم گیراوه و سەروسۆراخی نییه.

دایک و باوکم که بیستبوویان له زانکۆش خۆپیشاندان کراوه، وتبوویان، بەخوا تازه ئەمیشمان چوو، ئەویشمان چوو! بۆیه بۆ هەولێر بۆ هەواڵی من هاتبوون و به هەر دردەسەرییەک بووه، بەشی ناوخۆیی قادر بلەیان دۆزیبووەوه، که ناوەکەشیان بەتەواوەتی نەدەزانی. چووبوونه ژوورەوه و پرسیاریان لەوانه کردبوو که لەوێ بوون. ئەوانیش وتبوویان: سالار لێرەیه و سەلامەته، ئەوەش قاپوقاچاخەکانییەتی، نانی خواردووه و چووەته دەرەوه. ئیتر ئەوانیش دوای چاوەڕوانییەکی زۆر من نابینن و بەناچاری بۆ کەرکووک دەگەڕێنەوه.

به هەر حاڵ، من له ڕۆژی سێشەممه و ڕێکەوتی ٤ی مانگ گیرام و نەمتوانی بەشداریی خۆپیشاندانی ئەو ڕۆژەی جادەی باته بکەم.

ئەو ڕۆژه هەر وەکوو قەرار بوو، دەمەو عەسرەکەی خۆپیشاندان دەستی پێ کردبوو، دەستگا ئەمنییەکانیش پێشتر ئاگادار ببوونەوه و زانیارییان له بارەیەوه هەبوو، هەر بۆیه ئەو ڕۆژه هێزێکی گەورەیان به جلوبەرگی مەدەنی و بەنهێنی بۆ سەرکوتی خۆپیشاندەران ساز و ئامادە کردبوو.

ئەو شوێنه جادەیەکی تەسک و باریک بوو، نەدەبوو ئۆتۆمبیلی لێ ڕابگیرێ، بەڵام ئەو ڕۆژه ئۆتۆمبیلێکی زۆری خسووسی و تاکسی لێ ڕائەگیرێ، تووەمز

ئەوانە گشت هـی هێزە ئەمنییەکـانن و سـەندووقەکانی پڕە لە دۆنکی و کێبڵ و لە ئامادەباشیدان.

ئەو ڕۆژە جـادەی بـاتە جمەی دێت، خوێنـدکارانی کـۆلێجی کشـتوکاڵ لە ئاسـکی کەڵەکەوە هـاتبوون و خوێنـدکارانی بەشـێک لە دواناوەنـدییەکانی هەولێـر وەکـوو: هەڵمەت، ڕزگاری، کوردستان ...هتد. لەوێ ببوون و بەڕێژەیەکی زۆریش، بەجۆرێک تەنها دواناوەندیی هەڵمەت زیاتر لە ٣٠ خوێندکار بەشدارییان تێدا کردبوو.[١٤٣]

لە جـادەی بـاتەش دیسـانەوە "لەتیـف"ی هەندەسـە بە سـروودی ئەی ڕەقیـب چەخماخە لێ ئەدات. جادەی باتە پڕ دەبێت لە سەدای سروود و هوتافکێشـان. هێزە ئەمنییەکـان کە لە ئامادەباشـیدا بـوون، سـەندووقی ئۆتۆمبیلەکانیـان دەکەنەوە و دۆنکی و کێبڵەکانیان دەردەهێنن و دەکەونە وێزەی خەڵکی خۆپیشـاندەر و دەکەونە لێدان و گرتنیـان. خۆپیشـاندەرانیش بە کـووچە و کۆڵانەکانـدا فـرتەی لـێ دەکەن و هەر یەکە بەلایەکدا ڕا دەکات و بڵاوەی لێ دەکەن.

ئەو ڕۆژە هەنـدێک لە خوێنـدکارانی کـۆلێجی کشـتوکاڵی پێیـان بـاش بـوو، بـۆ کەرکووک بچنەوە نەوەک بۆ کەڵەک، بەڵام لە بـازگەی ئەو ڕێگایە نـاهێڵن بڕۆن و دەیـانگرن. ئەوەی شـایانی باسـە، بـۆ ڕۆژی دوایـی، ئەو خوێنـدکارانەی کە ویستبوویان لە کەڵەکەوە بۆ هەولێر بێن، لە بـازگەی ئەو ڕێگـایە بەریـان پێ دەگرن و دەیانگەڕێننەوە.[١٤٤]

بۆ ڕۆژی دوای ئەوە، گردبوونەوەیەکی بچکۆلە لە نەقلیـات ڕێک خرابوو، هێزە ئەمنییەکان نزیکەی ١٧ کەسێکیان لێ دەگرن و بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئەمن ڕاپێچیـان دەکەن. لەو کـاتەدا یەکێـک لە بەرپرسـە ئەمنییەکـانی بەڕێـوەبەرایەتی پێویسـتی بە قەڵەمێک دەبێـت و داوا لە خوێنـدکارەکان دەکـات، وەلـێ بەڕێکەوت هـیچ کامێکیـان قەڵەمیان پێ نابێت! ئەویش پێی سـەیر دەبێت و پێیـان دەڵێت: ئەرێ بەڕاسـتی ئێوە تەلەبەن؟! دیارە ئێوە بۆ خوێندن نەهاتوون![١٤٥]

---

١٤٣. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز هونەر تەها ئەحمەد، خوێندکاری پۆلی چوارەم، دواناوەندیی هەڵمەت.

١٤٤. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ڕزگار سەلام ڕەحمان، خوێندکاری کۆلێجی کشتوکاڵی.

١٤٥. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز عوسمان غەریب محەمەد خوێندکاری کۆلێجی علووم، بەشی کیمیا و یەکێک لەو ١٧ زیندانییە.

ئەوەی شایانی باسە، زۆربەی ئەم گیراوانە هەر ئەو ڕۆژە ئازاد دەکرێن.

سەبارەت بە ڕێکخستنی خۆپیشاندانەکانی زانکۆی سەلاحەدین و دواناوەندییەکانی هەولێر و خەڵکی هەولێر، ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان بە هۆی گیرانی یەکێکیانەوە لەو دەمەدا هەڵوەشابووەوە و ڕێکخستنەکانیش پەرش و بڵاو ببوونەوە. ئێمە خەریکی سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی بووین و هێشتا بە ئەنجام نەگەیشتبوو. بۆیە ئێمە وەکوو یەکێتیی خوێندکاران هیچ ڕۆڵێکی ڕێکخراومان نەبوو، بەڵام ئەندامان و لایەنگرانمان بۆخۆیان وەکوو تاک دەستپێشکەر بوون و بەشداریی جددیان تێدا کردبوو.

لە ڕاستیشدا بڕیاری خۆپیشاندان کە لە کۆلێجی هەندەسەوە درا، ئەوەندە خێرا و کتوپڕ بوو، هیچ هێڵێکی ڕێکخستن لەناو زانکۆ و شاری هەولێریش پێشتر خۆیان بۆی ئامادە نەکردبوو، وە هیچ پلان و نەخشەیەکیان بۆی نەبوو.

کەواتە، ئەو خۆپیشاندانانەی زانکۆ ئەگەرچی ئەندامان و هەوادارانی گشت حیزب و لایەنێکی تێدا بوو، بەڵام بە شێوەیەکی کتوپڕ و لەلایەن خودی خوێندکاران و لەنێو زانکۆدا بڕیاری لەسەر درابوو، نەک بە پلان و نەخشەی هیچ حیزب و لایەنێک، بەڵام بە هۆی بەهێزیی نفووزی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەو ناوچانەی کە خۆپیشاندانی تێدا کران و بە هۆی زیندوویی ڕادیۆکەیان و بەهێزی ئەداکەیەوە، خۆپیشاندانەکان کەوتە ژێر کاریگەریی ئەوانەوە و هەر بەهیی ئەوانیش ناسرانەوە.

پێش خۆپیشاندانەکان و پێش ئەوەی بکەومە زیندانەوە، مەوعیدێکم لە چەمی سوورقاوشان لەگەڵ 'عەلی بچکۆل'دا هەبوو، بە مەزەندەی خۆم کە دەبێت ڕۆژانی هەینیم بۆ ئەو مەوعیدانە دانابێت، ئەشێ بکاتە ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ١٩٨٢/٥/١٤. کەواتە، دوای ئەوەی لە زیندان ئازاد بووم بە ڕۆژێک یان دووان، بۆ چەمی سوورقاوشان چوومە.

# خۆپیشاندانی کەرکووك

خۆپیشـاندانەکان زۆربەی شـار و شـارۆچکەکانی کوردسـتانی گرتـووەتەوە و بەردەوامە و لرفەی دێت. شـەقامەکان سـوور بـوونە و بە سـەدان کەس گیانیـان لە دەسـت داوە، یـان برینـداری فیشـەک و کێبـڵ و گۆپـاڵ و کلکەبـێڵن. دەسـتگا سـەرکوتگەرەکانی حکـوومەتی بەعـس ماخۆلانیـان تـێ کەوتـوون، هەر چاوێکیـان کردووە بە چوار و گوێکانیان هەڵخستوون و پەیتا پەیتا دێن و دەچن و زیندانەکان پڕ پڕ بـوونە و لەش لەسـەر لەشـە و جمەی دێ. ئەوەی دەگـوزەرێ، لە مێـژووی دەسەڵاتدارێتی بەعسدا بێوێنەیە، نە لە حیساباتی ئەمان و نە لە حیساباتی هێزەکانی بزووتنەوەی چەکداریی ئۆپۆزیسیۆنە لە کوردستاندا. ڕادیۆکەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردسـتان (دەنگـی شۆڕشـی عێـراق) لەسـەر خۆپیشـاندانەکان چەقـی بەسـتووە و هەرچـی هێـز و توانسـتی خـۆی هەیە، لەوێـدا خـەرج دەکـات و کـاریگەریی گەورەی لەسـەر ڕووداوەکان داناوە.

کەرکووک ئیدی ئۆقرەی لێ براوە و لەسەر ئاگرە، شوێن بەخۆی ناگرێ و ژانی گرتـووە و گەرەکێتـی ئەویـش بێـتە سـەر شـانۆ. پێـی وایە هەمـوو لە چـاوەڕوانیی ڕۆسـتەمی نەوتفرۆشـدان و عـانی نمایشـکردنی پەردەیەکـی دیـکەی ڕاپەڕینـی گاورباخییە. لاوانی کەرکووک دوو دوو و سێ سێ، دەستە دەستە لەنێو خوێندنگا و لە کـووچە و کـۆڵان و شـەقامەکاندا باسـی ئەوە دەکەن، دەبێ کەرکـووکیش بێـتە مەیدان و هەر یەکەیان لە شـوێنی خۆیەوە بڕیـار ئەدا، خۆپیشـاندان دەبێ بکرێت و هەر کۆڕ و کۆمەڵێکیش کات و شوێنێک پێشنیار دەکات.

ئـێمە ئەو دەمە وەکـوو ڕێکخسـتنەکانی کـۆمەڵەی ڕەنجـدەرانی کوردسـتان لە شـاری کەرکـووک هێشـتا بەتەواوی لەژێـر زەبـری ئەو شـاڵاوەی کە شـەش مانگێک بەر لەوە پێمـان کەوتبـوو ڕاسـت نەبووبـووینەوە. هاوڕێیـانی ڕێکخسـتن هەر بە دەستپێشکەریی خۆیان و بەبێ هـیچ ئاگـاداری و ڕێنمـاییەکی ئاسـتەکانی سـەرەوەی خۆیان بەشدارییەکی کاریگەریان کردبوو.

سەبارەت بە کات و شوێنی خۆپیشاندان، هەتا ئەو دەمەی کە ئەنجام درا، چەند جارێک گۆڕانی بەسەردا هات. لە سەرەتادا ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٥/٥ گەڕەکی بەرتەکێ دەستنیشان کرا.[١٤٦] پاشان کرایە پێشنیوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەممە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٥/٦ لە گۆڕستانی شێخ محێدینەوە.[١٤٧] دوایی ئەم مەوعیدەش گۆڕا و سەرەنجام کرایە دوانیوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەممەی ڕێکەوتی ١٩٨٢/٥/٦ لە گۆڕستانی شێخ محێدینەوە.

ئەو شوێنە لەو ڕۆژ و دەمەدا هەڵبژاردنێکی باش و گونجاو بوو، گەڕەکی ئیمام قاسم ناوەندی گەڕەکە کوردنشینەکان بوو، گۆڕستانی شێخ محێدینیش ناوەندی گەڕەکی ئیمام قاسم بوو، گۆڕستانیش شوێنێکی گونجاوە بۆ گردبوونەوە و دەمەوعەسریش دەمێکی گونجاوە بۆ زۆربە، بازاڕی حەسیرەکە و ئەو مەسیرە تا بە جووتقاوە دەگات، لە جێگا هەرە قەرەباڵغەکانی شارە، بە تایبەتی لە دەمەو عەسرانەکەیدا.

دوانیوەڕۆیە و ئیدی گۆڕستانی شێخ محێدین چاوەڕوانی زەماوەندی لاوانی چاونەترس و پڕ لە هیوای شارە، ئەو لاوانەی بڕیاریان داوە بەدەستی خاڵی نەونەمامی بەدەنیان بخەنە بەردەم لوولەی چەکی یەکێک لە هارترین دەسەڵات و بەهێزترین سوپای پۆشتەوپەرداخی سەر زەمین.

گەلۆ! ئەوە لەڕاستیدا بەربەرەکانێی نەونەمامی بەدەن و چەکی پێشکەوتوو و مۆدێرن نییە، ئەوە بەربەرەکانێی بیروباوەڕ و هیوای ئازادییە لە هەمبەر سەرکوت و ملهوڕی! ئاخر ئیدی کەس نازانێ، ئاخۆ چەند دانە لەو لاوانە لە پاش یەک سەعاتی دیکە، نەونەمامی جەستەیان دەبنە میوانی یەکجاریی هەر ئەو گۆڕستانە!

ئیدی وردە وردە وا بەدەرکەوتن، دوو دوو و سێ سێ لە تەپە و ڕەحیماوا، لە ئازادی و ئیسکان و یادگار و زێویە و عاشوور و حەسیرەکە، لە شۆڕیجە و ڕەشیداوا و حورییە و گشت لایەکەوە بۆ گۆڕستانی شێخ محێدین هاتوون و بە

١٤٦. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ڕزگار ڕەحمان، خوێندکاری کۆلێجی کشتوکاڵی لە زانکۆی سەلاحەدین و یەکێک لە خۆپیشاندەران.

١٤٧. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز سەباح عەبدولا حەمەدین (سەباحە سوور)، خوێندکاری کۆلێجی زانستەکان بەشی کیمیا لە زانکۆی سەلاحەدین و یەکێک لە خۆپیشاندەران و برینداران و زیندانییانی خۆپیشاندانەکە.

تووله‌ڕێی پێچاوپێچی نێوان گۆڕه‌كان بۆ سه‌ره‌وه‌ هه‌ڵده‌كشێن و سڵاو له‌ عه‌لی مه‌ردان و ئه‌سیری و ئه‌نوه‌ر زۆراب ده‌كه‌ن و به‌ گرده‌كه‌دا سه‌ر ده‌كه‌ون و دیسانه‌وه‌ بۆ خواره‌وه‌ شۆڕ ده‌بنه‌وه‌ و به‌رده‌وامیش هه‌ست ڕاده‌گرن و چاوده‌گێڕن و به‌ بڕوایه‌كی به‌تین و به‌ ڕقێكی پیرۆزه‌وه‌ ته‌واوی ئه‌و ناوه‌ ده‌خه‌نه‌ ژێر بینایی خۆیانه‌وه‌ و ته‌واوی هه‌ست و بیریان له‌ دوو خاڵدا گرمۆڵه‌ ده‌كه‌نه‌وه‌: تۆ بڵێی ژماره‌مان زۆر بێت و خۆپیشاندانێكی گه‌وره‌ و دیار و به‌رچاو به‌ڕێ بخه‌ین؟ تۆ بڵێی جه‌لاده‌كانی شار بۆنی شتێكیان نه‌كردبێ، یان به‌دكاران هه‌واڵی ئێمه‌یان نه‌گه‌یاندبێ؟ ئه‌ی ئه‌ڵێن دار و دیواریش گوێی هه‌یه‌! نه‌خێر وا نییه‌، ئه‌گه‌ر وا بوایه‌ له‌و شاره‌ گه‌وره‌یه‌دا ماقووڵ نییه‌، ئه‌و هه‌موو ده‌ستگا زه‌به‌لاحه‌ تۆقێنه‌ره‌ بێخه‌به‌ره‌! به‌ڵێ، ورته‌یه‌كیشیان نه‌ژنه‌وتووه‌، ئه‌گه‌ر نا، ئێستا ته‌واوی ئه‌م ده‌وروبه‌ره‌یان ته‌نی بوو!

به‌ڵێ! دواتر سه‌دام حوسێن به‌ ئه‌بووسه‌باح، یه‌كێك له‌ ئه‌فسه‌ره‌ پله‌ بالاكانی ئه‌منی ئه‌و ده‌مه‌ ده‌ڵێت: "له‌و بڕوایه‌دا بووم له‌ تكریت خۆپیشاندان بكرێت، وه‌لێ نه‌ك له‌ كه‌ركووك"[١٤٨]

سه‌ره‌تا هه‌ر ده‌ دوانزه‌ كه‌سێك ئه‌بوون،[١٤٩] به‌ڵام ئیدی وا ژماره‌ی خۆپیشانده‌ران له‌ زیادبووندان، دێن و ده‌چن، یان دوو دوو و سێ سێ له‌پاڵ كێل و له‌ سێبه‌ری قه‌بران دانیشتوون و هه‌ندێكیشیان ئه‌مسه‌ر و ئه‌وسه‌ر ده‌كه‌ن و چاوه‌ڕێی ئه‌وه‌ن ژماره‌یان هه‌ڵكشێ و ده‌نگی لێ هه‌ڵبڕن.

قه‌رار وا بوو ئه‌و ڕۆژه‌ ته‌رمی شه‌هید سه‌فا[١٥٠] بۆ گۆڕستان بهێنرێت و له‌گه‌ڵ هاتنیدا چه‌خماخه‌ی خۆپیشاندان لێ بدرێت، وه‌لێ ئه‌و نه‌هات و ته‌رمی سه‌ربازێكی جه‌نگ گه‌یشته‌ ئه‌وێ. حوسێن ستار ئه‌مین[١٥١] وای زانی ته‌رمی سه‌فایه‌، چووه‌ سه‌ر ته‌رمه‌كه‌ و ده‌ستی به‌ سروودی "ئه‌ی شه‌هیدان ... ئه‌ی شه‌هیدان" كرد.

---

١٤٨. ڕۆژنامه‌ی "هه‌واڵ"، ژماره‌ ٢٧٨، ١٠ی ئایاری ساڵی ٢٠٠٨، ل ٦.

١٤٩. گفتوگۆ له‌گه‌ڵ به‌ڕێز لوقمان عه‌زیز ڕه‌شید، خوێندكاری دواناوه‌ندیی سه‌وره‌ و یه‌كێك له‌ خۆپیشانده‌ران و برینداران و زیندانییانی خۆپیشاندانه‌كه‌.

١٥٠. "شه‌هید سه‌فا"، خوێندكاری كۆلێجی زانسته‌كان به‌شی كیمیا له‌ زانكۆی سه‌لاحه‌دین بوو، له‌ خۆپیشاندانه‌كانی زانكۆ له‌ شاری هه‌ولێر گیانی به‌خشی.

١٥١. "حوسێن ستار ئه‌مین" خوێندكاری كۆلێجی كشتوكاڵی له‌ زانكۆی سه‌لاحه‌دین و خه‌ڵكی گوندی ته‌په‌لوو.

لە گۆشەیەکی گۆڕستانەکەوە ئافرەتێک دەنگ هەڵدەبڕێت و دەست بە وتنەوەی دروشمەکان دەکات،[152] لە گۆشەیەکی دیکەوە "ئاشنا محەمەد سەعید" فیکەیەک لێ ئەدا و ڕەحیم قادر دانساز (کرێکار) بە دروشم دەست پێ دەکات.[153] پاشان ئاشنا کە دەنگی گەورە بوو، دەنگ هەڵدەبڕێ و دروشمەکان دەڵێتەوە.[154]

بەو شێوەیە لەگەڵ هاتنی تەرمی ئەو سەربازە و گردبوونەوەی ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵکی، لە دەوروبەری سەعاتی دوو دوو و نیو خۆپیشاندان دەست پێ دەکات و کەرکووک لاپەڕەیەکی دیکە لە مێژووی تێکۆشانی سیاسیی خۆی تۆمار دەکات.

ئەوەی شایانی گوتنە، هێزە ئەمنییەکانی شار دەمەو ئێوارە دەچنە سەر ماڵی ئەو سەربازە لە گەڕەکی ئازادی و تەوقی دەکەن، چونکە پێیان وایە ئەو خۆپیشاندانە بە بۆنەی ئەوەوە بووە.[155]

ئیدی خۆپیشاندەران بە حەماسەتێکی زۆر و بە ورەیەکی بەرزەوە بە گردەکەدا دێنە خوارەوە و هەر هەموو پێکەوە درووشمەکان دەڵێنەوە: "ئاسن و پەت و سێدارە، دەرمان ناکات لەم شارە"، "یەکێتیی نیشتمانی، ئاگرە بۆ دوژمنانی"، "ئێمە نەوەی مارکسین، لە سێدارە ناترسین"، "بژی هێزی پێشمەرگە، سەدام نزیکی مەرگە"، "بەهێزی مامە ڕیشە، دوژمن ئەکەین بە شیشا" ... هتد.

بەشێک لە خۆپیشاندەران لە سەرەتاوە و لە سەرقەبرانەوە فریای خۆپیشاندانەکە ناکەون و دواتر لە حەسیرەکە تێکەڵی دەبن.[156] سەرەنجام ژمارەی خۆپیشاندەران خۆی لە ١٥٠ کەسێک ئەدات.

---

١٥٢. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ڕزگار سەلام ڕەحمان.

١٥٣. ڕۆژنامەی "هەواڵ"، ژمارە ٢٨٠، ٢٤ی ئایاری ساڵی ٢٠٠٨، ل ٦، گفتوگۆ لەگەڵ "ئاشنا محەمەد سەعید".

١٥٤. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز لوقمان عەزیز ڕەشید.

١٥٥. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ڕزگار سەلام ڕەحمان.

١٥٦. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێزان ئازاد مەجید عەبدولا و سەمەد ئەحمەد محەمەد، خوێندکارانی دواناوەندیی سەورە و دووان لە خۆپیشاندەران و فازڵ عوسمان فەقێ، خوێندکاری کۆلێجی ئەندازیاریی مەدەنی، زانکۆی تەکنەلۆجیی بەغدا و یەکێک لە خۆپیشاندەران و زیندانیانی خۆپیشاندانەکە و محەمەد تاهیر ساڵح خوێندکاری کۆلێجی زانستەکان، بەشی فیزیا، زانکۆی سەلاحەدین و یەکێک لە خۆپیشاندەران.

خۆپیشـاندان ڕێچـکەی خـۆی دەگرێـت و بە ڕێـگـا خـۆڵەکەی نێـو گۆڕسـتـانەکە و گەڕەکی جمهووری دەڕوات و بەرەو دواناوەندیی سەورە و بازاڕی حەسیرەکە ملی ڕێ دەگرێـت، هەتـا دەگـاتە سـەر جـادەی حەسـیرەکە، ئەو جـادەیەی کە بە دەسـتی ڕاسـتدا بـۆ سـینەما خەیـام و پـردی یەکەمـی سـەر خاسـە و بە دەسـتی چەپـدا بـۆ سلێمانی دەچێت. خۆپیشاندەران دەستی ڕاستی ئەو جادەیە دەگرن، تـا دەگەنە سـەر ئەو جـادەیەی کە بە دەسـتی چەپـدا بـۆ بـازاڕی حەلواچییەکـان، قازانپاکەرەکـان، ئاسنگەران و جووتقاوە دەچێت.

خۆپیشـاندەران لە نزیـک کەبابخـانەکەی سـەعید دەگەنە دوکانێـک فـافۆن و شووشـەوات دەفرۆشـێت، شـاڵاوی بـۆ دەبەن، هەمـووی بەسـەر یەکدا دەدەن و بەو کارە دوکاندارەکانی ئەو دەوروبەرە ترسیان لێ دەنیشێت.[157]

لەو دەمەدا لەلای دەرگـای حەلواچییەکـانەوە لـۆرییەکی مـارکەی سـەلاحەدینی کارگەی کۆکاکۆلای کەرکووک خەریکی داگرتنی کۆکاکۆلا، بیبسی، سینالکۆ، مشن و تراوبی دەبێت، خۆپیشاندەران دەیدەنە بەر بەرد و شووشە کۆلاکـان هـاڕە دەکەن و دێنە خوارەوە.[158]

سـەدای دروشـمی خۆپیشـاندەرانی تـوورە و نـاڕازی تەواوی ئەو بـازاڕەی هێناوەتە لەرزە. خۆپیشاندەران بەدەم ڕێگاوە هەر وێنەیەکی سەدام دەبینن، بە بەرد و بە پارچەی بوتڵی شـکاوی کۆلاکـان دەکەونە سـەری. پێشـەنگی خۆپیشـاندانەکە وا گەییشـتە بـازاڕی جووتقـاوە، سـەدای خۆپیشـاندەران و دروشـمەکانیان بەو شـەقامە نامۆیە، ئەو بازاڕە چاوی ئەبڵەق بووە و نازانێ خەونە یان ڕاستییە! خۆپیشـاندەران لە نێوەنـدی بـازاڕی جووتقـاوە، وێنەیەکـی گەورەی سـەدام حوسـێن بە دیـوارێکەوە دەبینن و هەر هەموو بەردبارانی دەکەن.

هێزە سـەرکوتکەرەکانی بەعـس بەئاگـا دێنەوە و زانیارییـان بـۆ دەچێت کە شـار هەسـتاوە، لافاوی خۆپیشـاندەران ئەو جادەیەی گرتـووە و پێشـەنگەکەی وا خەریکە دەگاتە بازاڕی ئاسنگەران.

---

١٥٧. گفتوگـۆ لەگەڵ بەڕێـز نەسـرەدین کەریـم عەبـدوڵا خوێنـدکاری دواناوەنـدیی سـەورە و یەکێـک لە خۆپیشاندەران.

١٥٨. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێزان نەسرەدین کەریم عەبدوڵا، محەمەد تاهیر سالح و ڕزگار سەلام ڕەحمان.

ژمارەیەکی زۆری ئەو هێزانە بە ئەمن و پۆلیس و هێزی تایبەتەوە، بە ئۆتۆمبیلی شۆفرلێت و نەجدەوە، بە چەکوچۆڵ و بە دار و کێبڵ و دۆنکی و کلکەبێڵەوە، لە دوو لاوە، لە بازاڕی حەسیرەکە و سەرەتای ئەو جادەیەی کە بۆ جووتقاوە دەچێت و لە بازاڕی حەویجە و قالیبازاڕەوە بەرەو جووتقاوە دائەبارنە سەر خۆپیشاندەران.

هەر وەکوو دەیگێڕنەوە، لەلای ئەمنی کەرامەوە دوو پیکابی شۆفرلێتی سوور و ئۆتۆمبیلێکی شورتەی نەجدەی جۆری 'جی ئێل'ی ڕەش کە نزیکەی ١٥ چەکدارێکیان تێدا دەبێت، جلی سەربازی، جلی هەواڵگری و ئەمنی ئەوسایان پۆشیوە، خۆیان بەنێو ئاپۆرەی جەماوەرەکەدا دەکەن.[١٥٩] لەولاشەوە، یانی لەلای گەراجی حەویجەوە ئۆتۆمبیلێکی شۆفرلێتی گەورە چەند چەکدارێکی لەسەر دەبێت و شەش حەوت چەکداری دیکە بەمەلا و بەولایدا بە گۆپاڵ و کێبڵ و دارەوە، پاشەوپاش دەکشێتەوە و خۆی دەکاتە نێو ئاپۆرەی جەماوەرەکە و کۆمەڵێک لە خۆپیشاندەران دەشێلێ و بەو هۆیەوە چەندین کەس بریندار دەبن، یان گیانیان لە دەست ئەدەن. لەنێو ئەوانەدا ستار عوسمان (ستاری عوسمان بێکراس) بەو هۆیەوە گیانی دەبەخشێت.[١٦٠]

بەو شێوەیە هێزە سەرکوتگەرەکانی بەعس پاش و پێشی خۆپیشاندەران دەگرن و بێڕەحمانە و هەر بە ئۆتۆمبیلەکانیانەوە خۆیان بە نێو خۆپیشاندەراندا دەکەن و لە هەمان کاتدا دەکەونە دەستڕێژی گولە و ژمارەیەکی زۆر پێوە دەبن. پاشان بە کێبڵ و دۆنکی و دار و کلکەبێڵ دەکەونە وێزەی خۆپیشاندەران و گرتن و ڕاپێچکردنیان بۆ نێو ئۆتۆمبیلەکانیان.

خۆپیشاندەران پەرت دەبن و بە کۆڵانە باریک و پێچاوپێچەکانی بڵاخ و پریادی و موسەڵادا فرتەی لێ دەکەن و لە هەوڵی ڕزگارکردنی خۆیاندا دەبن. وەلێ بەشێک لە خۆپیشاندەران فریای خۆدەربازکردن ناکەون و لە نێو دوکان و ماڵەکانی ئەو دەوروبەرەدا خۆیان حەشار ئەدەن. هێندێک لەو ماڵانە کە بەزۆری تورکمان و

١٥٩. ڕۆژنامەی 'هەواڵ'، ژمارە ٢٧٨، ١٠ی ئایاری ساڵی ٢٠٠٨، ل ٦، گفتوگۆ لەگەڵ نەجمەدین سالح، یەکێک لە خۆپیشاندەران و برینداران و زیندانییانی خۆپیشاندانەکە.

١٦٠. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز فازل عوسمان فەقێ.

کـــورد و بەشـــێکی کەمیشـــیان عەرەب دەبـــن، خۆپیشـــاندەران داڵـــدە دەدەن و دەیانپـاریزن، بەڵام هێنـدێکی دیکەیـان لەترسـاندا نایـانگرنە خـۆ و ئیزنیـان ئەدەن، بەشێکی کەمیشیان خەبەریان لـێ دەدەن و بە گرتیـان دەدەن. بەشـێکیش لەوانەی لەنێو دوکانەکانـدا خۆیـان حەشـار داوە، دەگیـرێن[161] و ئەوانەش کە لەنێـو بـازاڕ و جادەکەدا برینداری فیشەک و کوتەک بوون و کەوتنە بەردەستیان، گیران و ڕاپێچی بەڕێـوەبەرایەتیی ئەمنـی کەرامە کـران. لێـرە لە ئەمنـی کەرامە ئەکەونە گیـانی گیراوەکـــان و ئـــازار و ئەشـــکەنجەیان ئەدەن و دەســـت ئەکەن بە جنێـــودان و سووکایەتی پێ کردنیان.

ئەوەی شایانی گوتنە "ئەشرەف چایچی"ش، یەکێک لە پیاوان و موعتەمەدەکانی ئەو سـەردەمەی دەستگا ئەمنییەکانی شـاری کەرکووک، لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرامە دەبێت و دەکەوێتە لێدان و سووکایەتیکردن بە گیراوەکان.[162]

پاشـان ئێوارەی هەر ئەو ڕۆژە، گیراوەکـان دەسـتە دەسـتە بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنـی کەرکـووک (ئەمنـی مەنسـوور) دەگـوێزنەوە و لەوێ زۆر درنـدانە دەکەونە ئازار و ئەشکەنجەدانیان.

ئەوەی شـــایانی گـــوتنە، قـــالە شـــەفیق (قـــادر شـــەفیق)، یەکێـــک لە پیـــاوان و موعتەمەدەکـــانی ئەو ســـەردەمەی دەســـتگا ئەمنییەکـــانی شـــاری کەرکـــووک لە بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی کەرکووک دەبێت و لە کاتی ئیفادە و لێکۆڵینەوەدا تەرجەمە بۆ بەڕێوەبەرایەتی دەکات و لە هەمـان کاتدا سـووکایەتی بە زیندانییەکان دەکات و هەڕەشەیان لێ دەکات.[163]

لە گەرمەی ئەم ڕووداوەدا خەڵکێکـی زۆری دیـکەش کە بەڕێـکەوت لەوێ دەبـن، یان تێ دەپەڕن، یان دوکانداری ئەو بازاڕە دەبن، دەکوژرێن، یان بریـندار دەکرێن و دەگیرێن.

---

١٦١. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ئەحمەد خورشید ڕەزا، خوێندکاری کۆلێجی کشتوکاڵی لە زانکۆی سەلاحەدین و یەکێک لە خۆپیشاندەران و زیندانییانی خۆپیشاندانەکە.

١٦٢. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز لوقمان عەزیز ڕەشید.

١٦٣. ڕۆژنامەی "هەواڵ"، ژمارە ٢٨٠، ٢٤ی ئایاری ساڵی ٢٠٠٨، ل ٦، گفتوگۆ لەگەڵ "ئاشنا محەمەد سەعید".

"کەریم حەلاق یەکێک بوو لەو کەسانەی کە دەیویست دوکانەکەی دابخات، بەڵام دەگەنە سەری و بە دار دەکەونە گیانی، پاش ئەوەی ماوەیەک لە ماڵی خۆیان دەمێنێتەوە، هەر ئەو ڕۆژە گیانی دەبەخشێ".[164]

سەرەنجام نزیکەی ١٣ کەس گیان لە دەست ئەدەن، ژمارەیەک بریندار دەبن، ژمارەیەکی زۆریش دەستگیر دەکرێن و لەنێویاندا ٧٦ کەس بۆ ماوەی دوو مانگ و حەڤدە ڕۆژ لە زیندان دەهێڵنەوە و پاشان بە لێبووردنی گشتی ئازاد دەکرێن.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە تەواوی ئەوانەی گیانیان بەخشی، یان بریندار بوون و زیندانی کران، لە خۆپیشاندەران نەبوون، بەڵکوو ژمارەیەکیان لە دوکاندارەکانی ئەو گوزەرە یان ڕێبوارانی بێئاگای ئەو جادە و بانە بوون و خەڵکانێکیش بۆ بازارکردن هاتوون.[165]

ئەوەی شایانی گوتنە، چەند ئافرەتێک لەم خۆپیشاندانەدا بەشداری دەکەن و یەکێکیانیش بە نێوی "پرشنگ عەبدوڵا شەریف" دەگیرێت و لە زینداندا ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر دەکرێت.

پرشنگ عەبدوڵا شەریف ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو و پەیوەندی بەو خەتەی لای منەوە هەبوو.

بەو شێوەیە، خۆپیشاندانی کەرکووک کە جووتقاوەی کردە سەکۆ و نمایشگای خۆی، کەمتر لە یەک سەعاتی خایاند، بەڵام مێژوویەکی پرشنگداری لە تێکۆشان و بەرخۆدان لە دژی سەرکوت و بێمافی و هەڵاواردن و ستەمی میللی، لە پێناوی ئازادی و مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤدا تۆمار کرد.

---

١٦٤. ڕۆژنامەی "هەواڵ"، ژمارە ٢٨٠، ٢٤ی ئایاری ساڵی ٢٠٠٨، ل ٦، گفتوگۆ لەگەڵ شایەدحاڵ "فیکرەت ئاسنگەر".

١٦٥. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز سەباح عەبدوڵا حەمەدین.

# کۆبوونەوەی دووەمی سوورقاوشان

هەر وەکوو باسم کرد، لە یادی هەشتەمین ساڵەی بۆردوومانکردنی شاری قەڵادزێ، لە ١٩٨٢/٤/٢٤دا لە زۆربەی زۆری شارەکانی کوردستان و زانکۆی سەڵاحەدین خۆپیشاندان کرا و من گیرام، لەدوای هەفتەیەک دە ڕۆژ ئازاد کرام. وەک بێتەوە یادم، هەر ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ دوای ئەوە بوو، مەوعیدێکی دیکەی کۆبوونەوەی "سوورقاوشان"م هەبوو کە ئەکاتە ناوەڕاستی مانگی ئایار.

کۆبوونەوەی ئەم جارە بێجگە لە عەلی بچکۆل، ئەحمەد کرێکار"یش هاتبوو. دیسانەوە قسەوباسەکانمان لەسەر چۆنیەتی لێکگرێدانەوەی ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک بوو. لەو کۆبوونەوەیەدا پێشنیاری ئەوەم کرد، "کەرتی شەهید سیروان"یش لە دامەزراندنەوەی "ڕێکخراوی کەرکووک"دا بەشداری بکەن.

من زانیارییەکی ئەوتۆم لەسەر ئەو کەرتە نەبوو، وەلێ هێندەم دەزانی، کەرتێکی ڕێکخستن بەنێوی "کەرتی شەهید سیروان"ەوە هەیە، پەیوەندییان بە نێوشار و کۆمیتەی ئاگرەوە نەبووە، پەیوەندییان بە دەرەوە و بە کەرتی ڕێکخستنی لادێکانەوە هەیە، هەر بەو هۆیەوە لە کاتی شاڵاوی گرتنەکان بۆ سەر کۆمیتەی ئاگر ئەمان بەر نەکەوتوون و هیچ زیانێکیان پێ نەکەوتووە. ئەو زانیارییانەشم لە ڕێگەی "لوقمان"ی برامەوە دەزانی، چونکە ئەو لە ڕێگەی منەوە پەیوەندی بە "یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان"ەوە هەبوو، لە هەمان کاتدا وەکوو ئەندامی کۆمەڵە پەیوەندی بە محەمەد ئەحمەد حوسێن (محەمەد باجی عاسم)ەوە هەبوو، ئەمیش پەیوەندی محەمەد کەلارەوە هەبوو کە بەرپرسی کەرتی شەهید سیروان بوو.

بە هەر حاڵ! ئەحمەد کرێکار و عەلی بچکۆل ئەو پێشنیارەی منیان لەگەڵ "ئازاد هەورامی"دا باس کردبوو، ئەویش بەلایەوە پەسەند دەبێت و خەبەر بۆ تەهای جەباری (تەهای مەلا وەهاب) دەنێرێت بەرپرسی ئەو کەرتە ئاگادار بکاتەوە، لە فڵانە ڕۆژ بۆ سوورقاوشان بێت، تاوەکوو لەگەڵ ئەو ڕێکخستنانەی کۆمیتەی ئاگر

که لەو شاڵاوەدا بەرنەکەوتوون، بەشداریی دامەزراندنەوەی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک بکەن.

ماوەیەک بەر لە ئێستا گفتوگۆیەکم لەگەڵ "تەهای جەباری"دا کرد و پرسیاری ئەوەم لێی کرد، ئەو لە وەڵامدا گوتی:

(سەبارەت بە کەرتی شەهید سیروان: دوو خەتی ڕێکخستن پەیوەندییان بە منەوە کرد، نازانم پێشتر و لەناو شاری کەرکووک کێ لێپرسراویان بووە، لەبیریشم نییە، ئایا هیچ کام لەو دوو خەتە پێشتر بە ناوی کەرتی شەهید سیروانەوە کاریان کردووە یان نا، خەتێکیان لە ڕێگای هاوڕێیان "محەمەد ئەحمەد و ئاوات کەرکووکی" کە من تەنها ئەو دوو هاوڕێیەم لێ دەناسین و نزیکەی چل کەسێک دەبوون، پاش ساڵێک و لەسەر داوای شەهید ئازاد هەورامی تەسلیمم کردەوە و لە پێکهێنانەوەی "کۆمیتەی کەرکووک"دا بەشدارییان کرد. خەتی دووەم: لە ڕێگای "مامۆستا مارف"ەوە پەیوەندییان بە منەوە کرد کە مامۆستای گوندی چۆڵەک بوو لە ناوچەی هەمەوەند. ئەم خەتەش بە ژمارە زیاتر لە شەست کەس دەبوون، من تەنها "مامۆستا مارف"م ناسی و تا ئەو کاتەی کە مامۆستا مارف خۆی بۆ پێشمەرگایەتی هاتە دەرەوە، پەیوندییان بە منەوە هەبوو، دوای ئەوە پەیوەندییان بە منەوە نەما)[١٦٦]

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا بوو، عەلی بچکۆل و ئەحمەد کرێکار باسی خەتێکی دیکەیان بۆم کرد کە ئەویش لە ئەنجامی ئەو شاڵاوە پچڕاونەتەوە و بەرپرسەکەیان ناوی "مامۆستا قادر"ە و ماڵیان لە فڵانە شوێنە ... بەڵکوو بچم بیدۆزمەوە و لەسەر دامەزراندنەوەی کۆمیتەکە قسەی لەگەڵدا بکەم و کات و شوێنی کۆبوونەوەکەشی پێ ڕابگەیەنم. بۆ ئەو مەبەستە نامەیەکیشیان پێم دا کە بۆی ببەم.

لەگەڵ مامۆستا قادر هاوگەڕەک بوین، ئەگەرچی نەمدەناسی، بەڵام ناوەکەیم بەلاوە نامۆ نەبوو، ڕەنگبێت زانیبێتم ئەکاتە مامی نەوزاد محەمەد ساڵح. نەوزاد لە

---

١٦٦. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز تەهای جەباری (تەها وەهاب محەمەد).

قوتابخانەی سەرەتایی نالی هاوپۆلی یەک بووین و لە "سانەویی ئیمام قاسم"یش جارێکی تر یەکمان گرتەوە و هاورێ و جێگە متمانەی یەکتری بووین.

بە هەر حاڵ! گەییشتمەوە کەرکووک و لە دوانیوەڕۆیەکی ڕۆژێکی گەرمدا، بە پرسیار ماڵی مامۆستام دۆزییەوە. ماڵی مامۆستا هەر وا کیلۆمەترێک لە خوار ماڵی ئێمەوە بوو، کەوتبووە نێو گەڕەکی زێویە و ئەولای مزگەوتەکەی مەلا عەبدوڵاوە. ماڵەکەیان شانی بە چەمی خاسەوە دابوو، هیچ ماڵێکی دیکە لەولایانەوە نەبوو.

چووم لە دەرگام دا، دەرگایەکی گەورەی سێدەری، مامۆستا خۆی دەرگای کردەوە، خۆم پێی ناساند و بە کورتی و هەر لە بەردەرگاوە هەندێک شتم بۆی باس کرد و نامەکەم دەرهێنا و دامە دەستی، پێم گوت، ئەو نامەیە بۆ تۆ هاتووە، بیخوێنەوە و پاشان یەکتری دەبینینەوە.

تەنها ئەو جارە من مامۆستام لەو خانووە بینی، ئیدی دوای ئەوە ماڵیان هاتبووە نێو کۆڵانەکە و لە ڕیزی مزگەوتەکەی خۆیان، چونکە مامۆستا کوڕی مەلا عومەر ئۆمەر گومبەتی بوو.

لەو سەفەرەدا بوو، لە بنکەیەکدا چەند کادرێکی "کەرتی ڕێکخستنی چەمچەماڵ"م بینی، لەوانە: مامۆستا شێرکۆ عەسکەری، جەلال جەوهەر، هێمن برای بێستوون عەسکەری، پێم وابێت، ئارامی کادریشیان لەگەڵدا بوو ... ئەمانە هێندێک نامیلکە و کتێبی "لینین"یان کردبوو بە کوردی و هەر خۆشیان بە تایپ و ڕۆنیۆ چاپیان کردبوون.

# عەزەدین مەجید محەمەد (جەمال ئەیووب)

ژوورەکانی ئەو بەشە ناوخۆییە چوارکەسی بوو، ئەو ژوورەی ئێمە پێک هاتبوو لە: حیکمەت حەکیم، سالار ڕەشید، سەباح عەبدوڵا حەمەدین (سەباحە سوور)، عەلی مەحموود محەمەد (عەلی سیاسی).

عەزەدین مەجید تازە لە کۆلێجی پەروەردە، بەشی فیزیا وەرگیرابوو، بەهۆی ئەوەی ناوی لە لیستی دووەمی وەرگیراوەکانی زانکۆ بوو، درەنگ دەستی بە خوێندن کرد و بەشە ناوخۆییەکان دابەش کرابوون و جێگا نەمابوو. ئەو دەمە من هێشتا "عەزەدین"م نەدەناسی و بەهۆی "سەباح"ەوە هاتە لای ئێمە. ژوورەکەی ئێمە دوو قەرەوێڵەی دوو قاتی تێدا بوو، واتە بۆ چوار کەس و هەر چواریشی گیرابوون، ئێمە ڕازی بووین بەوەی لای ئێمە بمێنێتەوە. ئەویش لە ناوەڕاستی ژوورەکە و لە کۆلانی نێوان دوو قەرەوێڵە دووقاتەکان و هەر لەسەر زەوییەکە دۆشەکێکی بۆخۆی ڕاخست و بووە ماڵ و حاڵی.

عەزەدین خوێنەر و هەواداری بابەتی ئەدەبی بوو، کەسێکی ڕۆشنبیر و لە جوملەی "هاوڕێیانی شەقامی جمهووری"[١٦٧] کەرکووک بوو، هەر زۆر زوو من سەرنجم لەسەر دانا و هاوڕێیەتی و تێکەڵاویمان چووە سەر و بووینە جێگە متمانەی یەکدی و لەلای خۆمەوە خستمە نێو ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی کۆمەڵەوە. پاش بەسەربردنی ماوەی پاڵاوتن موفاتەحەم کرد و بووە ئەندامی کۆمەڵە و یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان.

پێویستە لێرەدا ئەوە وەبیر بهێنمەوە، خۆم و ئەو تۆڕە ڕێکخستنەی بە منەوە بەسترا بوون، هێشتا هەر لە حاڵی دابڕاندا بووین و من هەر لە هەڵپەی ڕێکخستنەوەی پارچەکانی کۆمیتەی ئاگردا بووم و هێشتا کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووکمان دانەمەزراندبووەوە، بەڵام من سەربەخۆ کاری خۆم هەر دەکرد، کۆبوونەوەی دەوریم بە شانەکان دەکرد، ئابوونەم لێیان وەردەگرت، ئینجاش

١٦٧. هاوڕێیانی شەقامی جمهوری، ئازاد ئەحمەد ئەسوەد، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٥.

بەردەوام هـاوڕێی نـوێم دەهێنـایە ڕیزەکـانی ڕێکخسـتنەوە و هەر خۆشـم بڕیـارم لەسەر دەدا و هەر خۆشم پلەی ئەندامەتیم پێ دەبەخشی.

هـاوڕێ عەزەدیـن کەسـێکی جـددی، بە دیسـیپلین بـوو، بەردەوام لە هەوڵـی بەدەسـتهێنانی زیـاتری ڕۆشـنبیریی مارکسیسـتی بـوو، بـۆ پێـدانی ئەرک و لێپرسـراوێتی زیـاتر هەمیشـە گونجـاو و ئامـادە بـوو، بـۆیە منـیش لە هەر ئاراییشدانەوەیەکی ڕێکخراوەییدا ئەوم وەک یەکێک لەو کەسانە لەبەرچاو گرتبوو، لە جێگەی خۆیدا بەرپرسیارێتی پێ بدەم.

ئیدی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرپرسیارێتی ئەو لەنێو کۆمەڵە و یەکێتیی خوێندکاراندا زیاتر دەبوو، سەرەنجام ئەو هێڵەی لای ئەو فراوان بووەوە و خۆیشی لە کۆمەڵەدا بـووە ئەنـدامی پـۆل و لە یەکێتیـی خوێنـدکارانیش بـووە بەرپرسـی کـۆمیتەی لقـی کەرکووک و بەو پێیەش ئەندامی ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان.

عەزەدیـن مەجیـد نـاوی نهێنـی کرێکـار بـوو، بـێجگە لەوەی لە سـازدانەوەی ڕێکخستنەکاندا ڕۆڵی هەبووە، بۆ خۆشی چەندین کەسـی هێناوەتە نێو ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە.

هاوڕێیەکمـان بەنێـوی "بەهـرۆز خالیـد"ەوە لە کـۆلێجی کـارگێڕی و ئـابووریی زانکۆی سەلاحەدین هەبوو، لە ئەنجامی گرتنەکانی کۆمیتەی ئاگردا پچڕابـووەوە، دوای ئەوەی ناونیشانەکەیمان پێ گەییشت، عەزەدینمان ڕاسپارد پەیوەندییەکەی بۆ دروست بکاتەوە، بەهرۆزیش دوو هاوڕێی دیکەی لەگەڵدا بووە.

هاوڕێیەکی دیکە بە نـاوی "مستەفا"وە کە لە سووپای عێراقیدا نائیب زابت بـوو، خەڵکی گەڕەکی حوڕییە بوو، بە هـۆی گرتنەکانی کۆمیتەی ئاگرەوە پچڕابووەوە، دوای ئەوەی ناونیشـانەکەیمان پـێ گەییشـت، دیسـانەوە "عەزەدین"مـان ڕاسـپارد، بچێت پەیوەندی پێوە بکات.

هاوڕێیەکی دیکەمان بە ناوی ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد (سـمکۆ)وە، کە ئەمـیش بۆخۆی چەند شانەیەکی لەلا بوو، لە کاتی گرتنەکانی کۆمیتەی ئاگردا پچڕابوونەوە، دوای ئەوەی ناونیشانەکەیم پێ گەییشت، خالید مـحەمەد فـاتیح (سـەمیر نووری)مـان

ڕاسپارد، پەیوەندییەکەی بۆ دروست بکاتەوە. دوای ئەوە پەیوەندییەکەی بۆ لای نەوزاد فەتحولا عەبدولڕەزاق (شەهید هیوا) گوازرایەوە و پاشان بۆ لای عەزەدین.

بێجگە لەم ئەندام و شانانە، کە پەیوەندییان بە 'عەزەدین'ەوە هەبوو، ئەو لە میانەی کاری سیاسیی خۆیشیدا چەندین کەسی دیکەی ڕێک خستووە، لەوانە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، خۆشناو جەمال جەلال، وەحدەدین مەجید محەمەد ...

'نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد'یش غازی عاسی ڕێک خستووە و بەرپرسی شانەی دیکەش بووە.

بەو شێوەیە عەزەدین تا ئەو دەمەی لە ساڵی ١٩٨٤ دەستمان لە کار کێشایەوە، بەرپرسی هێڵێکی فراوانی کۆمەڵە و یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان بوو.

عەزدەین لەدوای ئەوە لەنێو گرووپە کۆمۆنیستییەکاندا کاری کردووە و یەکێک بووە لەو کەسانەی بۆ دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق ئیمزای کردووە و لەو نێوەدا بەرپرسیارێتی جۆراوجۆری هەبووە و بۆ دەورانێکیش ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی ئەو حیزبە بووە.

عەزەدین لەنێو حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق بەنێوی 'جەمال ئەیووب'ەوە دەناسرێت.

# یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان
## (ی.خ.ك.)

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا خستەمە ڕوو، هەر لە یەکەم کۆبوونەوە لەگەڵ ئەحمەد کرێکار، نامەیەکم پێی دا، تاوەکوو بۆمان بگەیەنێتە سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پەیوەندییەکەمان وەکوو یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان گرێ بدەینەوە. من لەو نامەیەدا ناونیشانی خۆمم نووسی بوو.

دیارە ئەو دەمە من ئاگام لەوە نەبوو کە چی بەسەر ئەم ڕێکخراوە و ڕابەرایەتییەکەیدا هاتووە، وام دەزانی بە هۆی گرتنی "ئەسعەد عەزیز سۆفی"یەوە، تەنها لقی کەرکووک پچڕاوەتەوە.

ماوەیەکی پێ چوو، ڕۆژێکیان یەکێک لە دەرگای دا، کاتێک چوومە دەرەوە کەسێک خۆی پێم ناساند و وتی: "من لەلای خاڵۆتەوە هاتووم"، کە ئەوە وشەی نهێنیی نێوانمان بوو، ئەویش سیروان کەریم محەمەد (سیروان پاڵانی) بوو.

ئەوەی شایانی باسە، سیروان پەیوەندی بە زۆربەی بەرپرسانی هێڵەکان لە شارە جیاجیاکانەوە کرد و لەگەڵ هەڵکەوت ڕۆڵی گەورەیان لە دامەزراندنەوەی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیدا گێڕا.

سیروان خەڵکی کەلار و خوێندکاری کۆلێجی ئاداب بەشی کوردی لە زانکۆی سەلاحەدین بوو، ئێستا لە سوێد دەژی.ئیدی چووینە ژوورەوە و لە ژوورە بچکۆلەکە دانیشتین. سیروان هەواڵ و دەنگوباسی "یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان"ی پێم گەیاند و باسی ئەوەی کرد، سەرکردایەتیی ئەم ڕێکخراوە تووشی چ کێشە و گرفتێک هاتووە و چۆن دەبێت سەرلەنوێ ئەنجوومەنی سەرکردایەتی دابمەزرێنینەوە. سیروان ئەو دەمە خۆی خەریکی ڕێکخستنەوەی لقی سلێمانی بوو، هەڵکەوت عەبدوڵا (جەمال عەبدوڵا ڕۆستەم) سکرتێری ڕێکخراوەکە بوو، خوێندکاری کۆلێجی پزیشکی بوو لە شاری بەغدا، بەڵام بەهۆی ئەو دۆخەوە شاری بەجێ هێشتبوو و لەگەڵ سیروان خەریکی دامەزراندنەوەی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی بوو.هەر وەکوو پێشووتریش باسم کرد، من ئەو دەمە خەتێکی "یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان"م پێوە بوو، لە سازدانەوەی ڕێکخراوەکەدا بوومە بەرپرسی لقی کەرکووک و بەو پێیەش بوومە ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی بە شێوەیەکی کاتی، هەتا ئەو دەمەی کۆنفرانس دەبەسترێت.

پاش ماوەیەک لە یەکێک لە کابینەکانی سەرپەش کۆبوونەوەیەکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیمان کرد، هەڵکەوت ئەو دەمە لە شاخ بوو، بەنهێنی هاتبووە نێوشار و ئامادەسازی بۆ ئەو کۆبوونەوەیە کردبوو. لەو کۆبوونەوەیەدا باسی گرتن و ڕاکردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی کرا و باسی ئەوە کرا کە چۆن دووبارە ڕێکخستنەکانمان بخەینەوە سەرپێ و بڵاوکراوەی "دەنگی خوێندکاران" دەست بە بڵاوکردنەوە بکاتەوە و پاشان ئامادەکاری بۆ کۆنفرانس بکەین.

دوای ئەوە لە ڕێکەوتی ٢٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٢دا لە گوندی بارەپان، لە ماڵی کوێخا ڕەسوول، کۆنفرانسی دووەممان بەست، کە دوو ڕۆژی خایاند.

لەو کۆنفرانسەدا ئاوات ئەحمەد عەلی و سیروان کەریم لە لقی سلێمانی، خالید محەمەد فاتیح (سەمیر نووری) و سالار ڕەشید لە لقی کەرکووک، ڕزگار لە لقی هەولێر، عیسام نامیق عەبدولا (دکتۆر عیسام) لە لقی مووسڵ، هەڵکەوت وەکوو سکرتێری پێشووی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی بەشدارییان کرد.

لە کۆتایی کۆنفرانسەکەدا بەرپرسی لقەکان هەڵبژێردران بەم شێوەیە:

ئاوات ئەحمەد عەلی/ بەرپرسی لقی سلێمانی.

سالار ڕەشید/ بەرپرسی لقی کەرکووک.

سیروان کەریم محەمەد/ بەرپرسی لقی هەولێر.

عیسام نامیق عەبدولا/ بەرپرسی لقی مووسڵ.

هەڵکەوت عەبدولا ڕۆستەم/ سکرتێر.

ئەوەی شایانی باسە، شوێن و بەرنامە و باسەکانی کۆنفرانس هەر هەموو لەلایەن "هەڵکەوت"ەوە ئامادەکاری بۆ کرابوو.

لەڕاستیدا من نایەتەوە یادم، پەیڕەوی ناوخۆی یەکێتیی خوێندکاران لەمەڕ هەڵبژاردنی سکرتێر چۆن بووە و ئەوەی ئێمە کردوومانە دروست بووە یان نا، بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی مەنتیقی بیر لەو پرسە بکەینەوە، دەبێ سکرتێر ئەندامی ئەنجوومەن بێت، ئەندامی ئەنجوومەنیش دەبێت، بەرپرسی یەکێک لە لقەکان بێت و بەو پێیەش سکرتێر ئەبێت لەنێو شاردا بێت نەک لە شاخ. ئەمە بە جیا لەوەی ئەو هەموو هاموشۆیە بەنهێنی لە شاخەوە بۆ شار، مایەی مەترسییەکی گەورەیە.

دوای ئەوە هەڵکەوت هەواڵەکەی بە ڕادیۆی یەکێتی گەیاند. کاتێک هەواڵەکە بڵاو کرایەوە، من لە گوندی "پیریجان"ی ناوچەی شوان لە ماڵی کوێخا تالیب میوان بووم و زۆر پێی دڵخۆش بووم.

## دامەزراندنەوەی کۆمیتەی ئاگر
## (ڕێکخراوی کەرکووك)

لەدوای هەوڵ و ماندووبونێکی زۆری هەموومان و دوای نۆ مانگ لەو زەبرەی پێمان کەوت، توانیمان ڕۆژێک لە تەمووزی ساڵی ١٩٨٢ لە چەمی سوورقاوشان بۆ کۆبوونەوە دیاری بکەین، تاوەکوو کۆمیتە دابمەزرێنینەوە و ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک بخەینەوە سەر ڕێگا و ڕێچکەی خۆی.

لەو ڕۆژەدا مامۆستا و من پێکەوە لە نەقڵخانە یەکمان گرت و سواری سەیارەی سلێمانی بووین هەتاوەکوو گەیشتینە چوارڕێیانەکەی تاسلوجە. لەوێ دابەزیین و سواری سەیارەی دوکان بووین، هەتا گەیشتینە ڕاستی ئەو ڕێگەیەی بۆ سوورقاوشان دەچێت. لەوێ دابەزیین و بەپێ کوتامان هەتا گەیشتینە نێوگوند. ئینجا وردە وردە لەو کەپرە نزیک بووینەوە کە قەرارە کۆبوونەوەکەی تێدا بگرین.

من یەکەم جارم بوو بەو ڕێگایەدا بڕۆم، وەلێ مامۆستا بەڵەد بوو.

کاتێک کە گەیشتینە بەردەم کەپرەکە، ئەوان هەموو لەوێ بوون و چاوەڕوانی ئێمە بوون. ئازاد هەورامی، ئەحمەد کرێکار و "عەلی بچکۆل"م ناسییەوە، وەلێ ئەوەی بۆ من غەریب بوو، گەنجێکی ئەسمەری ئارامی بزە شیرین بوو، چاوەکانی ترووسکەیان دەهات، ئەویش محەمەد ئەحمەد ڕەحمان، بەرپرسی کەرتی شەهید سیروان بوو.

کۆبوونەوەکەمان دەست پێ کرد، دوای قسەوباسێکی کورت لەلایەن "ئازاد"ەوە، کۆمیتەکەمان لەو سێ کەسە ڕۆنایەوە:

محەمەد ئەحمەد ڕەحمان (دەرسیم): بەرپرسی کەرتی شەهید سیروان.

مامۆستا قادر مەلا عومەر ساڵح (توانا): بەرپرسی کەرتی شەهید سەلاحی موهەندیس.

سالار ڕەشید (نەسرەوت، جووتیار): بەرپرسی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن.

محەمەد کە بە محەمەد ئاڵتوونچی یان محەمەد کەلارە ناسرابوو، لە ساڵی ١٩٥٨ لە دایک بووە، دانیشتووی گەڕەکی شۆڕیجە بوو، خوێندکاری بەشی ئەندازیاری لە زانکۆی تەکنەلۆجیی بەغدا بوو.

کەرتی شەهید سیروان، بەناوی سیروان تاڵەبانی (فەیسەڵ ڕەشید حەمید)ەوە ناو نرابوو، فەرماندەی هەرێمی پێنجی قەرەداغ بوو، لە شەوی ٢٩ لەسەر ١٩٧٩/٤/٣٠ لە گوندی 'زێڕینجۆ'ی ناوچەی شارەزوور دەکەوێتە کەمینەوە و شەهید دەکرێت.

ئەم کەرتە لە سەرەتای ساڵی ١٩٨١ لەلایەن 'مامۆستا مارف، محەمەد ئەحمەد ڕەحمان، ئاوات ناسیح حەبیب'ەوە دادەمەزرێت و مامۆستا مارف دەبێتە بەرپرسی کەرتەکە و پەیوەندییان بە 'نووری حەمە عەلی'یەوە دەبێت. لەدوای شەهیدبوونی نووری، پەیوەندییەکەیان لە ڕێگەی 'دڵشاد تۆفیق'ەوە کە کادری ناوچەی جەباری دەبێت بەردەوام دەبێت. لە پاش شەهیدبوونی دڵشاد و لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٢دا پەیوەندییەکەیان لە ڕێگەی تەهای جەبارییەوە بەردەوام دەبێت. پاشان مامۆستا مارف دەچێتە دەرەوە و محەمەد دەبێتە بەرپرسی کەرتەکە.[١٦٨]

ئەوەی شایانی باسە، قادر سەی مستەفا جەخت لەوە دەکاتەوە کە کەرتی شەهید سیروان لەدوای شاڵاوی گرتنەکانی کۆمیتەی ئاگر و لە لایەن محەمەد ئەحمەد ڕەحمان و ئاوات ناسیح حەبیب و خۆیەوە دروست کراوە.[١٦٩]

مامۆستا قادر کە ناوی تەواوەتی، عەبدولقادر عومەر ساڵح بوو، لە ساڵی ١٩٣٩ لە شاری کەرکووک لە دایک بووە، ئەو ساڵانە (١٩٨٢-١٩٨٤)ی ئێمە تێیدا یەکتریمان ناسی و پێکەوە کارمان کرد، ئەو لە قوتابخانەی 'دیجلە'ی سەرەتایی لە شاری هەولێر مامۆستا بوو.

مامۆستا لەنێو خانەوادەیەکی ئایینی گەورە ببوو، باوکی مەلا بوو، لەلای باوکی دەرسی دینی خوێندبوو، هەر لە ڕیزی ماڵی خۆیانەوە مزگەوت و خانەقایەکیان هەبوو کە لەلایەن باپیرە گەورەیەوە ڕۆ نرابوو،[١٧٠] لە سەرەتادا کە ئێمە یەکتریمان

---

١٦٨. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ئاوات ناسیح حەبیب.

١٦٩. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز قادر سەی مستەفا.

١٧٠. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز نەوزاد محەمەد سالح (برازای مامۆستا قادر)

ناسی، من وەکوو کەسێکی مارکسی چاوم لێ کرد، وەلێ لە نێوان ئەو دوو ساڵەدا بۆم دەرکەوت، مامۆستا تەنها خەباتکارێکی ڕێگای کوردایەتییە و کاریگەری ئایینیش بەسەریەوە زۆرە.

ئەبووشەهاب (ئیحسان نەجم محێدین) گێڕایەوە:

لە ساڵی ١٩٧٢-١٩٧٣ مامۆستا قادر لەلایەن منەوە بۆ کۆمەڵە ڕێک خرا، هەر ئەو دەمە لە بەرامبەر مارکسیبوونی کۆمەڵەدا دڕدۆنگ بوو، من بەزۆر قەناعەتم پێی کرد.[171]

ئێمە کۆبوونەوەکانمان لە هاویناندا بەزۆری دەخستە نێو قرچەی گەرماکەوە، جارێکیان تەحسین نامیق و من پێکەوە بۆ ماڵی مامۆستا چووین، ئەو دەمە مانگی ڕەمەزان بوو، هەستمان کرد مامۆستا بەڕۆژووە، هەندێک شۆخیم لەگەڵدا کرد، ئەو هیچی نەوت، بزەیەکی بۆ کرد و کەمێک ئیحراج بوو.

مامۆستا مرۆڤێکی زۆر بەڕێز و هێمن و لەسەرخۆ بوو، ئەگەرچی فەرقی تەمەنمان زۆر بوو، وەلێ هاوڕێی یەکتری بووین و هیچ کاتێک من هەستم بەو فەرقە نەدەکرد.

هەر وەکوو باسم کرد، ئەو کەرتەی کە مامۆستا قادر بەرپرسی بوو، بە ناوی "شەهید سەلاحی موهەندیس"ەوە بوو.

شەهید سەلاح سەرتیپی ٤٧ی پیرەمەگروون بوو،[172] لە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٧/٢٥ شەهید کرا.

شەهید سەلاح کوڕی حاجی ڕەفیق ئامۆزای حەمە تۆفیق ڕەحیم بوو، لە زانکۆ لەگەڵ "جیهان تۆفیق" هاوپۆلی یەک بووین. بەهۆی "عیسام نامیق"ەوە لەگەڵ "سامان تۆفیق" کە خوێندکاری بەشی پزیشکی بوو لە زانکۆی مووسڵ و ئەندامی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان بوو، بووینە هاوڕێ.

هەرچی بەو کەرتەی من دەگەڕێتەوە، هەر لەو خەتەی کە پێش شاڵاوی گرتنەکان بەرپرسی بووم، دوای ئەوەی هەندێک ئەندام و شانە و هێڵی دیکەمان

---

١٧١. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ئەبووشەهاب (ئیحسان نەجم محێدین).

١٧٢. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپی سێیەم، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ٢٦٣.

گرتەوە و هاوڕێیانی دیکەشمان هێنایە ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە، کەرتی "شەهید ئەنوەر حەسەن"مان لێ پێک هێنا.

"ئەنوەر حەسەن، گەنجێکی هەڵکەوتووی شاری کەرکووک بوو، لەدوای ئاشبەتاڵ گیرا، خوێندکاری کۆلێجی هەندەسە بوو لە بەغدا، ئەویش وەکوو هاوڕێکانی حوکم درا و لە زیندانی ئەبووغرێب مایەوە تا لە عەفووی ساڵی ١٩٧٨دا بەر بوو. هەر ئەو کاتە هاتە ڕیزی پێشمەرگەوە، لەگەڵ ٩ کادری تر بۆ لوبنان بۆ مەشقی جەنگی نێردران، دوای گەڕانەوەی کرا بە فەرماندەی هەرێمی ٢ی کەرکووک.

لە ڕۆژی ٥ی مارتی ساڵی ١٩٨٢دا هێزێکی تێکەڵاوی جەیش و جاش بە پشتیوانیی هالیکۆپتەر لە گوندی قازان هەڵئەکوتنە سەر ئەنوەر و هاوڕێکانی کە ژمارەیان ٢٢ کەس بوون. لەم شەڕە نابەرامبەرەدا ١١ کەس کوژران: ئەنوەر حەسەن، ڕزگار جەلال (هێمن)، مامۆستا عەبدولخالق ساڵح ئەحمەد (ئاسۆ)، مامۆستا عەبدولخالق عەبدوڵا ساڵح (چیا)، سوارە شێخ سدیق، کامەران مام عومەر، کەریم چەمچەماڵی (گۆران)، نوعمان عەبدی، حەمە شوکر بلوکێنی، نەجمەدین فاتیح شوکر (شێروان)، موەفەق تەقی".[١٧٣]

بەو شێوەیە لەدوای ئەو زەبرە گەورەیە کە بەر کۆمیتەی ئاگر کەوت، جارێکی دیکە کۆمیتەکەمان ڕۆنایەوە، وەلێ بە نێوی: "کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک"ەوە.

ئەو شەوە ئێمە لەلای ئەو هاوڕێیانە ماینەوە، بۆ بەیانییەکەی لە وەختی خۆی لە خەو ڕابووین و ماڵئاواییمان لێیان کرد و بۆ دەورەیەکی نوێ لە کار و هەڵسووڕان، بۆ دەورەیەکی دیکە لە چالاکی، بە دڵێکی خۆش و پڕ لە ئومێدەوە، بەتینوتاوێکی گەرمی ئاگرینەوە، بۆ شاری کەرکووک گەڕاینەوە.

مامۆستا قادر و محەمەد پێکەوە بەرەو سەر جادەی دوکان-تاسلووجە، ڕۆییشتن. دواتر هەر پێکەوە بۆ سلێمانی چوون و لەوێ سەر و دەستی جلی کوردییان لە یەک تەرز و ڕەنگ دابووە دووریین و ئینجا بۆ کەرکووک گەڕابوونەوە. بەڵام من پێم خۆش بوو بۆ شارەزابوون، بە ڕێگای عەسکەر-

---

١٧٣. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپی سێیەم، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ٢٥١.

گۆپتەپە-ئاغجەلەر بگەڕێمەوە، ئەوە سەرباری ئەوەی پێم باش نەبوو، هەرسێکمان پێکەوە بین و لە ڕێگای گەڕانەوەماندا تووشی کێشە و گرفتێک ببین، بە تایبەتی کە ئێمە سەرکردایەتیی تەواوی ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووکین و تازە بەتازە و لەدوای زەبرێکی قورس و گران کۆمیتەمان پێک هێناوەتەوە ڕۆژێک بەر لەوەش مامۆستا و من بەوێدا هاتووین.

هەفتەیەک دووان بەسەر دامەزراندنەوەی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووکدا تێ نەپەڕیبوو، لوقمانی برام وردەکاری کۆبوونەوەی سوورقاوشانی بۆم باس کرد.

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا قسەم لەسەر کردووە، لوقمان لە یەکێتیی خوێندکارانی کوردستاندا پەیوەندی بە منەوە هەبوو، لە لایەکی تریشەوە وەکوو کۆمەڵە پەیوەندی بە محەمەد ئەحمەد حوسێن (محەمەد باجی عاسم)ەوە هەبوو، ئەمیش پەیوەندی بە محەمەد ئەحمەد ڕەحمانەوە هەبوو.

کاتێک لوقمان ئەو زانیارییانەی لەسەر ئەو کۆبوونەوەیە بەو وردییە بۆ من باس کرد، گەلێک تووڕە و پەست بووم، هەردوو چاوم چوونە پشت سەرم! من لوقمان برامە و لە ڕێکخستن پەیوندی بە منەوە هەیە، جێگای ئەوپەڕی متمانەی منە، بەڵام نەچووم وردەکاریی ئەو کۆبوونەوەیەی بۆ باس بکەم! بەڵام ئەمزانی سەرچاوەی ئەو زانیارییانە بێجگە لە محەمەد ئەحمەد ڕەحمان کەسێکی تر نییە. ئاخر ئێمە چەند مانگێک بەر لە ئێستا گەورەترین زەربەمان بەرکەوت و دە دانە هاوڕێمان هەر ئێستا چاوەڕێی پەتی قەنارە ئەکەن! دیارە گەیاندنی هەواڵی دامەزراندنەوەی کۆمیتەی شار بە ئەندامان، کارێکی نەک هەر چاکە، پێویستیشە، وەلێ باسی ئەوەی لە چەند کەس و لە چەند کەرت و کەی و لە کوێ و چۆن دامەزراوە، نەک پێویست ناکات، بەڵکوو مەترسیداریشە. بۆیە لە کۆبوونەوەی کۆمیتەدا کە مامۆستا قادریش ئامادە بوو، ڕەخنەم لەو کارە گرت.

دوای ئەوە زۆری پێ نەچوو، ڕۆژێکیان لوقمان باسی ئەوەی بۆم کرد کە بە نیازن لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکەن و سزای بدەن، چونکە نهێنیی شانەکەی بردووەتە دەرەوە! منیش بە "لوقمان"م گوت، پێیان بڵێ: بەڵام سەرەتا دەبێ لێپێچینەوە و سزا

لەگەڵ ئەو کەسەدا بکرێت کە نهێنیی کۆمیتەی ڕێکخراوەکەی بردووەتە دەرەوە!

دوای ئەوە وازیان لە لوقمان هێنا و جارێکی تر ئەو بابەتەیان باس نەکردەوە.

محەمەد کەسێکی زرنگ و وریا بوو، بەڵام بەداخەوە کەسێکی نهێنی پارێز نەبوو، سەرەنجام هەر بەو هۆیەوە گەورەترین زەربەی لە خۆی دا و خەریک بوو ئێمەش تووشی کارەساتێکی تر بکاتەوە.

ئەو کاتەی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووکمان دامەزراندەوە، ژمارەی کەرتی شەهید سیروان ٦٠ ئەندام و کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن ٤٥ ئەندام و کەرتی شەهید سەلاحی موهەندیس ١٥ ئەندام بوون.

لە پاش ماوەیەک هێڵێکی ڕێکخستن کە سەربە شارۆچکەی چەمچەماڵ بوو، بە ئێمەوە پەیوەست کرا و مامۆستا قادر سەرپەرشتییانی دەکرد، بەڵام ژمارەی ئەندامەکانیم لەبیر نەماوە.

هەروەها لەماوەی ساڵێکدا، توانیمان ژمارەیەکی زۆری دیکە لەو ئەندام و شانە و هێڵانە ڕێک بخەینەوە کە بە هۆی شاڵاوی گرتنەکانەوە پەرش و بڵاو بووبوونەوە و پەیوندییان بەهیچ شوێنێکەوە نەمابوو. ئەمانە خۆیان پەیوەندییان بە کەرتی ڕێکخستنی چەمچەماڵ و سەرکردایەتییەوە دەکرد و ناونیشانیان بۆ ئێمە دەهات.

ئەو ناوانەی کە بە ئێمە دەگەییشتن، بەگوێرەی شارەزایی و ئەزموونی خۆم، کەسانی گونجاوم بۆ دەدۆزینەوە و ڕێکم دەخستنەوە.

ئەوەی شایانی باسە، بێجگە لەو هێڵەی چەمچەماڵ، باقی ئەوانی دیکە هەر هەموویم لەنێو 'کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن'دا ڕێک خستنەوە، چونکە هەم شارەزایی زیاترم بە ئەندام و کادرەکانی هەبوو، هەم کەرتێکی یەکدەست و بەدیسیپلین و بێ کێشە و تۆکمە بوو.

بەو جۆرە ئەو کەرتە لەدوای ساڵێک ژمارەی ئەندامانی بووە دوو هێندە.

# هەڵبژاردنی بەرپرسی کۆمیتە

## (ڕێکخراوی کەرکووک)

پاش ئەوەی "کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک"مان پێک هێنایەوە و بۆ کەرکووک گەڕاینەوە، پاش ماوەیەکی کورت، یەکەمین کۆبوونەوەی کۆمیتەمان لە ماڵی مامۆستا قادر ئەنجام دا.

یەکێک لەو مەسەلانەی بۆ یەکەمین کۆبوونەوە بەبیرمدا هات، هەڵبژادنی بەرپرسی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک بوو. من خۆم لەلای خۆمەوە بڕیاری ئەوەم دابوو کە ئەو بەرپرسیارێتییە لە ئەستۆ نەگرم، ئەگەرچی کارێکی فۆرماڵییە و تەنها کۆبوونەوەکانی کۆمیتە ڕێک دەخات و ڕاپۆرتی مانگانە دەنووسێت و جاروباریش لەگەڵ دەستگای ڕێکخستنی کۆمەڵە کۆ دەبێتەوە، وەلێ بۆ من کە چەندین مانگە هیلاک و ماندووم و لەمە بەدواش دەزانم ئەرکی زۆرم لەسەرە، وا باشە هەر کارێک هاوڕێیەکی دیکە پێی دەکرێت، من لە خۆمی بار نەکەم.

بۆیە لە یەکەمین کۆبوونەوەدا من ئەو باسەم تەرح کرد و پێشنیاری مامۆستام کرد کە ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرێت، ئەگەرچی لەو سەرەتایەدا هێشتا شارەزاییمان بە یەک نییە و هەرسێکمان تازە بە یەکتری ئاشنا دەبین. مامۆستا پێشنیارەکەی منی قبووڵ کرد و "محەمەد"یش ڕەزامەندی لەسەر دەربڕی. بەو جۆرە مامۆستا قادر بووە بەرپرسی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک، بەڵام ئیدارەی ڕێکخستنەکانی ڕێکخراوی کەرکووک بە فیعلی هەر من دەمکرد و لە ئەستۆی مندا بوو، بە تایبەتی پاش ماوەیەک محەمەد تووشی کێشەیەک هات و شاری بەجێ هێشت و پاشان وازی هێنا. یانی ئیدارەکردنی ڕێکخستن، ڕێکخستنەوەی ئەندامان و شانە و هێڵی لێکترازاو، کێشەی ئەندامان و چارەسەرکردنی، وەڵامدانەوە بە نامە و پرسیاری فکری، ئامادەکاری بۆ کۆنفرانس و چۆنیەتی دەستنیشانکردنی ئەندامان بۆ کۆنفرانس، کێشەی کەرتەکەی لای محەمەد و ڕێکخستنەوەی، ئەندامانی نوێ و ناردنی نامەی ئەندامەتی ...هتد. بەزۆری من پێی هەڵدەستام.

ئیتر وەکوو کۆمیتەی ڕێکخراو، کۆبوونەوەی دەوریمان دەست پێ کرد و کۆبوونەوەکانمان هەر لە ماڵی مامۆستادا بوو. لە سەرەتادا من ویستم کۆبوونەوەکانمان لە ماڵی ئێمەشدا بێت و ناوبەناو شوێنەکەی بگۆڕین، بەڵام سەرەنجام پێم وا بوو هەر ماڵی ئەوان گونجاوترە.

مامۆستا بەزۆری جلوبەرگی کوردی لەبەر دەکرد و بۆخۆشی بەژن و بالآیەکی بەرز و بڵندی هەبوو، جارێکیان شوێنی کۆبوونەوەکەمان لە ماڵی ئێمە دانا، مامۆستا لە دەرگای دا، دەرگایان لێ کردەوە و پاشان منیان لێ ئاگادار کردەوە، منیش چوومە دەرەوە و لەگەڵ مامۆستا چووینە ژوورەوە، باوکم ئێمەی پێکەوە بینی و ئەمەی بۆ حەل نە ئەکرا! دوای ئەوە لەلای دایکم وتبووی: فەرید! تۆ سەیری ئەم زەلامە زلە کە، بۆ لای ئەم منداڵە دێت!

# ئەشرەف چایچی و ئێمە

یەکێـک لەو پیـاوانەی بەعـس و لەو کەسـە هـار و درانەی ئەوێ ڕۆژێ، کە کونبەکـون بەدوای ئـێمەدا دەگەڕا و لە کـاتی شـاڵاوی گرتنەکـان بۆسـەر ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر ڕۆڵی گەورە و بەرچاوی گێڕا، ئەشرەف چایچی بوو.

ئەشـرەف، چـایچی و خـاوەنی چایخـانە بـوو، چایخـانەکەی هەر وا دوو سـەد مەترێـک لەخـوار مزگەوتـی ئیمـام قاسـم، بە ئاراسـتەی بـازاڕی حەسـیرەکە و بە دەستی چەپدا بوو. ئەم کابرایە ئیشی تەکسیشی دەکرد، بەڵام ئەم ئیشەی نەک بۆ مەعیشەت، بەڵکوو هەر بۆ خراپەکاری بوو. کاری چایچێتی و تەکسی لەو پیشانە بوون بە باش یان بە خراپ سەرچاوەی بەدەستهێنانی زانیاری و کاری هەواڵگری بـوون. ئەشـرەف جـگە لەوەی پیـاوی ئەمـن و چاوسـاغ و موعتەمەدیـان بـوو، چایخانەکەیشی ناوەند و مۆڵگەی ئەمن و بەدکاران بوو. هەر وەکوو باسم کرد، لە سـەردەمی شـاڵاوی گرتنەکـان بـۆ سـەر کـۆمیتەی ئـاگر، تـوخمی چـالاک و هەڵسـووڕاوی نێـو مەفرەزەکـانی ئەمـن بـوو و بەدیـاریکراویش ئەو لەگەڵ ئەو مەفرەزەیە بووە کە ئەسعەد عەزیز سۆفی دەستگیر کردووە و ئەو ناسیبوویەوە.

ماڵی ئەسعەد کەوتبووە ژوورووی چایخانەکەی ئەشرەف و هەر وا دەوری پێنج سـەد مەترێـک لێـوەی دوور بـوو. ئەو ئەسـعەدی چـاک دەناسـی، چـونکە لەگەڵ "ئەسـعەد"دا هـاوگەڕەک بـوون، ئەوە سـەرباری ئەوەی ئەسـعەد هەمیشـە ڕیشـێکی گەورە و دیـاری بەردابـووەوە و جارجـارەش کە بە بەردەم چایخانەکەیـدا تـێ دەپەڕی، مۆڕەی لێ ئەکرد!

هەر وەکـوو لە باسـەکانی ڕابـردوودا ڕوونـم کـردەوە، ئەو شـاڵاوەی لە مـانگی ١٠ی سـاڵی ١٩٨١ کـرایە سـەرمان، ڕێکخسـتنەکانی کۆمەڵەی لە شـاری کەرکـووک نەک هەر گۆج کرد، بەڵکە تۆزیشی بە حەوادا برد.

ئەو شاڵاوە بووە هۆی ئەوەی ڕێکخستنەکانمان گشت لەبەریەک هەڵبوەشێنەوە و هێڵە سەربازییەکەیشی کە هەر تێکەڵی شانەکانی ڕێکخستن بوو، شتێکی ئەوتۆی لێ نەمێنێتەوە.

لەو هێڵە سەربازییە، ئەوەی مایەوە و من ئاگادار بم، ئەوانە بوون کە مام عومەر (عومەر نەجاڕ، مام عومەری قەمچووغە) بەرپرسیان بوو، ئەوانەیش بریتی بوون لەم کەسانە:

ئەحمەدی مام قادر، محەمەدی مام قادر (حەسەن)، بێستوون (محەمەد، ڕەجەب)، وەستا سابیر (سابیر حەمە ساڵح ڕەسوول)، سەلمانی مام کەریم (سەلمان کەریم شەریف) (هیوا)، عوسمان قادر ڕەسوول، سەردار شێخ عەبدولقادر بریفکانی ...

لە کاتی شاڵاوی گرتنەکان بۆ سەر کۆمیتەی ئاگر، مام عومەر ئاشکرا دەبێت و دەستگیر ناکرێ، دەچێتە دەرەوە و دەڕواتە گوندی قەمچووغە، بەڵام باقیی هاوڕێکانی ئاشکرا نابن و دەمێننەوە.

ئەمانە دوای ماوەیەک لە سستی و سڕبوون، خۆیان ڕێک دەخەنەوە و

لە یەکێک لە کۆبوونەوەکانیاندا باسی کاراکردنەوەی شانە چەکدارەکان و پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە دەکەن کە لەدوای شاڵاوی گرتنەکان بۆسەر کۆمیتەی ئاگر دروست ببوو. هاوشانی ئەوەش پەیامێک بۆ دەستگا ئەمنییەکانی شاری کەرکووکیش بنێرن و بڵێن: سەرباری گرتن و زیندان و ڕاوەدوونان، ئێمە لەنێو ناچین و ناهێڵین بە ئارامی سەر بخەنە سەر سەرین.[١٧٤]

ئەم هێڵە ئەگەرچی چەند شانەیەک بوونە و پلەبەندییەکی ڕێکخراوەیی هەبووە، وەلێ تێکەڵوپێکەڵی و بێ دیسیپلینی و فەوزایەکیشی تێدا بووە و لەلایەن محەمەدی مام قادرەوە سەرپەرشتی کراوە. لە هەمان کاتدا پەیوەنییان بە مام عومەریشەوە هەر دەمێنێ و بۆ کار و چالاکییەکانیان لەگەڵ ئەودا تەگبیر و ڕاوێژ دەکەن و هەر ئەویش پێویستییەکانی چەک و تەقەمەنییان بۆ دابین دەکات.

١٧٤. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز سەلمان کەریم شەریف.

سەرەنجام چەند کەسێک لەم هێڵە سەربازییە لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٨٢ بۆ لای مام عومەر دەچن و نەخشەی چالاکییەکی گەورە لەنێو شاری کەرکووکدا دەخەنە بەرنامەی کاری خۆیانەوە.[١٧٥]

نەخشەکەیان بەو جۆرە دەبێت، لەلای ئەمنی کەرامە و شوێنی ئاهەنگی یادی حەڤدەی تەمووز لە بەردەم مەرکەز شەبابی ئیسکان (گوایە بەرپرسێکی گەورەی بەعس سەردانیی ئەوێ دەکات) و دوو جێگای دیکەش چەند بۆمبێکی تەوقیتکراو دابنێن و لە هەمان کاتدا هێرش بکەنە سەر ئەشرەف و چایخانەکەی.

سەرەنجام لە ڕێکەوتی عەسری ڕۆژی ١٧ی تەمووز، بێستوون لەلای ئەمنی کەرامە بۆمبێک دادەنێت، وەستا سابیر و 'سەلمانی مام کەریم'یش بۆمبێک لە نزیکی مەرکەز شەبابەکە دادەنێن. قەرار وا بووە چەند هاوڕێیەکی تریان لە دوو شوێنی دیکە بۆمبی تر بچێنن، بەڵام ئەوانە سەرکەوتوو نابن.

بۆ ئێوارەی هەر ئەو ڕۆژە، ئەو چەند کەسەی کە قەرارە چالاکی سەر چایخانەکە بە ئەنجام بگەیەنن، لە سەرخاسە و لای باخەکەی حەسەن گوڵە کۆبوونەوەیەک ئەنجام ئەدەن، نەخشەی کارەکەیان دادەڕێژن و لەنێو خۆیاندا کارەکان دابەش دەکەن.

بەپێی نەخشە و پلانێک کە دایان ڕشتبوو، سێ کەس دادەنێن هێرش بکەنە سەر چایخانە، ئەوانیش بریتی بوون لە: بێستوون، ئیبراهیم (بلە قەرە) و سەلاح. ئەوەی شایانی باسە، هەر یەکە لە ئیبراهیم و سەلاح خەڵکی سلێمانی بوون. بەگوێرەی پلانەکە، لە کاتی نزیکبوونەوەی سەعاتی سفردا، محەمەدی مام قادر بە تاکسییەکەی خۆی ئەم سێ کەسە دەگەیەنێتە نزیک دوکانەکەی چەتۆ بازرگان و لەوێ دایان دەگرێت و خۆی دەڕوات. دوکانەکەی چەتۆ بازرگانیش کەوتبووە نێوان مزگەوتی ئیمام قاسم و چایخانەکە، هەر وا بەدووریی پەنجا مەترێک، بە بەری ئەوبەرەوەی چایخانەکە. لەخوار چایخانەکەشەوە سێ گۆشەیەک هەیە و جادەکە

١٧٥. ئازاد هەورامی کەرکووکییەکی کوردستانی، ئەمیرە محەمەد، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠١٨، ل٣٥٠.

دەبێتە دوو لقەوە، لقێکیان بۆ دوکانەکەی نووری ناڵبەندی باوکی مامۆستا فەوزی و مزگەوتی نائیب ئۆغلی و چایخانەکەی حاجی عوسمان و حەسیرەکە دەچێت، لقەکەی دیکەشیان بۆ لای ماڵی شەوکەت ڕەشید و حەمامەکان و مزگەوتی بەرتەکێ دەچێت. ماوەیەکی کەم پێش سەعاتی سفر، وەستا سابیر و سەلمانی مام کەریم لەو سێگۆشەیە و لە سەرەتای ئەو جادەیەی کە بەرەو بەرتەکێ دەچێت ئامادە دەبن. وەستا سابیر بۆ پارێزگاریکردن و بەرگریکردن لە سێ هێرشبەرەکە و سەلمانیش وەکوو شۆفێر، بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆیەوە کە پیکابێکی بچکۆلەی بیجۆ بوو، بۆ دەربازکردن و ڕزگارکردنی مەفرەزەکە.

لە سەعاتی سفردا هێرش دەکرێتە سەر چایخانەکە و بۆمبەکانیش دەتەقنەوە. دوای ئەوە سێ هێرشبەرەکە بەدەم تەقەوە خۆیان دەگەیەننە لای وەستا سابیر و سەلمان. ئەمن و بەعسییەکانی نێو چایخانەکەش لەبەرامبەردا ڕوو لەمان دەست بە تەقە دەکەن، وەستا سابیریش لای خۆیەوە دەکەوێتە دەستڕێژی تەقە لە ئەمن و بەعسییەکانی لای چایخانەکە. سەرەنجام تایەیەکی ئۆتۆمبیلەکە پەنچەر دەبێت و ئاوێنەیەکی دەشکێ و چەند فیشەکێکیش بەر بۆدییەکەی دەکەوێت و کوشتنی ئەشرەفیش کە ئامانجی چالاکییەکە بووە، نەک هەر سەرناگرێت، بەڵکە وای پێ دەچێت کە هەر لە وێش نەبووبێت. وەلێ بەداخەوە منداڵێک لەو نێوەدا بە نێوی هەڵکەوت محەمەد ساڵح، دایکی بە ناوی هەدییە محەمەد دەکوژرێت.[١٧٦]

سەرەنجام ئەم پێنج کەسە بە ئۆتۆمبیلێکی پەنچەرەوە، شوێنی چالاکییەکە بەجێ دەهێڵن و بەرەو بەرتەکێ و پاشان لەوێوە بۆ گەڕەکی شۆڕیجە هەڵدێن.

دەستگا ئەمنی و سەربازییەکانی شاری کەرکووکیش دەکەونە گەڕان و پشکنین بۆ دۆزینەوە و دەستگیرکردنی ئەو کەسانە. وەلێ ئەو هاوڕێیانە بەناچاری لە کۆڵانێکدا ئۆتۆمبیلەکەیان بەجێ دەهێڵن و خۆیان دەگەیەننە ماڵی هاوڕێیەکی بێستوون لە هەمان گەڕەک.

١٧٦. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز نەبەز محەمەد قادر.

ئەم هاوڕێیەی بێستوون ئاگا و خەبەری لەو کار و چالاکییە نەبووە، تەنانەت هیچ پەیوندییەکی بە کاری ڕێکخستنیشەوە نەبووە. بەڵام زۆر جوامێرانە کۆمەکیان دەکات و ئەو شەوە لە ماڵەکەی خۆی داڵدەیان دەدات.

ئیتر کات ئێوارەیە و دنیا بەتەواوی تاریک و کشوماتە. ئەو شەوە ئەو پێنج کەسە لەو ماڵەدا دەمێننەوە و بۆ ڕۆژی دوایی، دوای ئەوەی دنیا ڕووناک دەبێتەوە، محەمەدی مام قادر بە تاکسییەکەی خۆی لە ڕێگای لەیلان، باشبلاخ، مەقانەوە بۆ چەمچەماڵ دەربازیان دەکات و پاشان بۆ گوندی قەمچووغەیان دەبات.

لەم نێوانەدا سەلمانی مام کەریم ئاشکرا دەبێت و بەناچاری ماڵ و حاڵ، دوکان و خانوو، کار و خوێندن و شار بەجێ دەهێڵن و بە خاووخێزانەوە دەچنە دەرەوە و دواتریش دووان لە براکانی لە پێشمەرگایەتی گیانیان دەبەخشن و بەو جۆرە ئەو خانەوادەیە ڕووبەڕووی دەربەدەری و ماڵوێرانییەکی گەورە دەبنەوە.

دەوروبەری چەند هەفتەیەک دوای ئەوە، یەکێک لەو سێ کەسەی کە هێرشیان کردە سەر چایخانەکە، نەخشەی کوشتنی ئەشرەف دادەڕێژێت و بە تاقی تەنها و هەر خۆی، لە گەڕەکی عاشوور لەلای کەبابخانەکەی عوبێد کارەکە جێبەجێ دەکات و ئەم جارەیان ئامانجی خۆی دەپێکێ و ئەشرەف لەناو دەبات.

ئەمەوێ لێرەدا وەبیری بهێنمەوە، من لە باسی کۆبوونەوەی یەکەمی سوورقاوشاندا باسی ئەم خەتەم کردووە و باسی ئەوەم کرد کە چۆن لەلایەن "عەلی بچکۆل"ەوە پێشنیاری ئەوە کرا، ئەو خەتە پچڕاوەتەوە، بەڵکوو پەیوەندی بۆ دروست بکەینەوە، وەلێ ئێمە پێمان باش نەبوو ئەو شانە چەکدارانە تێکەڵ بە شانەکانی ڕێکخستن بکەین و نەمانکرد، ئەگەر نا، ئێستا دووبارە دەکەوتینەوە بەر شالاوی گرتن و ڕێکخستنەکانمان کە تازە خەریک بوون پێیان دەگرت، لەپێ دەکەوتنەوە.

# کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵە

دوای ئەوەی ئێمە سەرلەنوێ خۆمان ڕێکخستەوە و ڕێکخراوی کەرکووکمان دامەزراندەوە و زۆرێک لە ئەندامان و هێڵە لێک پساوەکانمان گرێ دایەوە، نزیکەی مانگێک لەدوای ئەوانە کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵە بەسترا.

کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵە لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٨٢ بە بەشداری ٢٢٢ ئەندام لە هۆڵی شەهید شەهاب لە ناوزەنگ بەسترا.[١٧٧]

لە کەرکووکەوە شەش کەس وەکوو نوێنەرانی ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک بەشدارییان تێدا کرد. لە کەرتی شەهید سیروان ئەندامان: ئاوات ناسیح حەبیب، سەردار عومەر کەریم، کەریم حەمید ڕەسوول، کەریم محەمەد ئەحمەد قەڵادزێیی، محەمەد ئەحمەد ڕەحمان و لە کەرتی شەهید سەلاحی موهەندیس: مامۆستا قادر (عەبدولقادر عومەر ساڵح) بەشدارییان کرد.

من بۆ کۆنفرانس نەچووم، ئەو ساڵە ئەوەندە ئەمسەر و ئەوسەرم کردبوو، بەتەواوی ماڵەوەم خستبووە نارەحەتی و دڵەڕاوکێوە، ناویان لێ نابووم: مام غەریب. مام غەریب مامەی باوکم بوو، لە گوندی کانیسپیلکەی سەر بە شارۆچکەی ئاغجەلەر دادەنیشت. مام غەریب هەر کاتێک سەفەری شاری کەرکووکی بکردایە، بە ماڵەوەی دەگوت، دوو سێ ڕۆژێکم پێ دەچێت، وەلێ دوای ئەوەی دەهاتە کەرکووک ئەوەندە ئەم ماڵ و ئەو ماڵی دەکرد، بە هەفتە و دوو هەفتە سووڕ و دەورەی خۆی تەواو نەدەکرد. بۆیە تەحەمولی دایک و باوکم بەشی سەفەر و دیارنەمانێکی تری منی پێوە نەمابوو، بڕیارم دا بۆ کۆنفرانس نەچم.

---

١٧٧. پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپی سێیەم، سلێمانی، ساڵی ١٩٩٨، ل ٢٦٣.

# عەزەدین و نائیب زابتێکی قتعەتێن لەبەر

لەدوای شـاڵاوی گرتنەکـانەوە ئـێمە بەردەوام خەریکـی کـۆکردنەوە و لێـک گرێـدانەوەی ئەنـدامان و هـێڵە لێـک پسـاوەکان بـووین. هەر مـاوە نـا مـاوەیەک نامەیەکمان لە دەرەوە بۆ دەهات، کە فلانە ئەندام و خەت بەو ناونیشانە بگرینەوە.

جارێکیان نامەیەکمان بۆ هـات، داوای ئەوەی دەکرد، ئەندامێک بە نـاوی مستەفا عـومەر، پیشـە نائیـب زابـت، دانیشـتووی گەڕەکـی حـوڕییە پچـڕاوەتەوە، بەڵکـوو پەیوەندییەکەی بۆ دروست بکەینەوە.

منیش بیرم کردەوە، بۆ کەسێکی لەو جۆرە، بۆ ئەو تەمەنە و بۆ ئەو پیشەیە کە ئاسـان نییە کەسـێکی گونجـاوی بـۆ بدۆزمەوە، کێ بنێرم. سـەرەنجام قەرارم کرد، عەزەدیـن مەجیـد مـحەمەد (جەمـال ئەیـووب) بـۆ ئەو پەیوەنـدییە ڕابسـپێرم، کە سەرباری ئەوەی کەسێکی گونجاوە، هاوگەڕەکیشـن. دواتر نـامەیەکم ئامـادە کرد و هەموو شتێکم تێیدا ڕوون کردەوە و پێم دا.

عەزەدیـن دەچێـتەوە بـۆ مـاڵ، نـامەکە دەکـاتەوە و بەو ناونیشـانە و بە پرسـیار مسـتەفا دەدۆزێـتەوە، بەڵام پـێش ئەوەی بچێـت خـۆی پـێ بناسـێنێت، ئەبینێـت ئەم کەسە جلوبەرگی زەیتوونی قتعەتێن و زۆر جاریش جلوبەرگی خـاکی لەبەر ئەکات، شێوەشی هەر بە عەرەب دەکات! ئەو جلە لەو دەمەدا هـی ڕەفیق حیزبییەکـان بـوو، خەڵکیش زۆر سڵیان لێ دەکردەوە.

عەزەدیـن مـاوەیەک خـۆی دوا ئەخـات، بـۆ ئەوەی پرسـیاری بکـات و بزانێت ئەم نائیـب زابـتە جـل زەیتـوونیی قتعەتێـنە چـۆن کەسـێکە! پرسـیار لە سـەدرەدین (عەبـاس)ی بـرای دەکـات، تـوومەزە مسـتەفا و سـەدرەدین پـێکەوە سـەربازن، هەردووکیان لە بەشـی زرێپۆشـین و سـەدرەدین بەباشـی دەی ناسـێت. بە عەزەدین ئەڵێت: مستەفا کەسێکی چاکە. دوای ئەوە ئینجا عەزەدین ئەچێت بۆ لای و خۆی پێ دەناسێنێت و پەیوەندییەکەی بۆ دروست دەکاتەوە.[١٧٨]

---

١٧٨. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز عەزەدین مەجید محەمەد (جەمال ئەیووب).

# نەوزاد فەتحوڵا عەبدولڕەزاق (شەهید هیوا)

نەوزاد و من هاوڕێی منداڵی یەکتری بووین، هەردووکمان لە گەڕەکی یادگار گەورە بووین و ماڵی ئەوان لە کۆڵانی مەکینەی بەفرەکە و بەرامبەر ماڵی فەرمان ئەمین گۆگجەیی و ماڵی ئێمە لە کۆڵانی ماڵی شێخ عەبدولکەریم بوو. کۆڵانی نێوەندیش، کۆڵانی مزگەوتەکەی مەلا جەبار بوو، کە کۆڵانێکی گەورە و ڕاستەجادەیەک بوو، لە چایخانەکانی هەردوو ئەحمەدەوە دەستی پێ دەکرد و بەرەو حەمەشنە و گردەکەی ئازادی و باڕووتخانە و پاشان بۆ ناو خاسە و گوندەکانی یارەلی و سۆنەگۆلی دەڕۆییشت.

هەموو ڕۆژێک چێشتەنگاوان ئۆتۆمبیلەکانی ئەو گوندانە بەرەو کەرکووک شۆڕ دەبوونەوە و بەم کۆڵان و بانەدا تێ دەپەڕین و ڕوویان لە بازاڕی حەسیرەکە دەکرد. ئێمە منداڵانی گەڕەک پشتی ئەو ئۆتۆمبیلانەمان دەگرتن و بۆ ماوەیەک پێی دڵخۆش دەبووین. بەڵام پشتگرتنی ئەو ئۆتۆمبیلانەش لێزانینی دەوێ و دەبێت بزانی چۆن لە پێچەکان، ئەو دەمەی ئۆتۆمبیلەکە بەناچاری خێراییەکەی خاو دەکاتەوە، دەستی لێ بەر بدەیت و لە کاتی دەستبەردانیش ئەبێ یەکسەر پێیەکانت لە زەوی جووت دانەنێیت، بەڵکوو دەبێ بەخێرایی هەنگاو بنێیت و بەڕاکردنەوە دەستی لێ بەر بدەیت، ئەگەر خێراییەکەت لە هیی ئۆتۆمبیلەکە کەمتر بێت، ئەوا بەڕوودا دەکەویت و بریندار دەبیت.

جارێکیان پشتی ئۆتۆمبیلێکم گرت و پێچی لای دوو چایخانەکە و پێچی دوای ئەوەشی بڕی و هەر دەستم لێی بەرنەدا، ئیدی ئۆتۆمبیلەکە کەوتە سەر ئەو ڕاستەڕێیەی کە بە تەنیشت گۆڕستانی شێخ محێدین و بە بەردەم ماڵی سامە سەرپان و ئازاد هەورامیدا تێ دەپەڕی و خێرایی خۆی وەرگرت. ئیتر ئەبێ دەستی لێ بەردەم، ئەگەر نا، زۆر دوورم دەخاتەوە ... لە ترسی ئەوە دەستم لە ئۆتۆمبیلەکە بەردا و نەزانانەش هەردوو پێم بە جووتکراوی لە زەوی دانا، ئاخر دوایی زانیم ئەمە یاسایەکی فیزیاوییە و پێی دەڵێن، یاسای بەردەوامی ... لەگەڵ دەستبەرداندا هەر وا چەند مەترێک بەپێوە بووم و دوای ئەوە بەسەر دەمدا و بە

خێرایی ئۆتۆمبیلەکە بەسەر ئەو جادەیەدا خشام و قاچوقول و سەرئەژنۆ و ئانیشکەکانم لە تۆک داماڵان، ئیدی ببڕای ببڕای لەو کاتەوە هەتا هەنووکە پشتی سەیارەم نەگرتەوە و تۆبەی نەسووح و یەکجاری پێم کرد.

ئێمە هاورێیانی گەڕەک، ڕزگار سەلام ڕەحمان (ڕزگار شوانی)، نەوزاد فەتحوڵا و من، زۆر جاریش محەمەدی برای ڕزگار و لوقمانی برام و محەمەد ساڵەیی (محەمەدی مەلا جەبار) و جەبار حەسەن ... گشت ڕۆژێک هەر ئەوەندەی کە پێمان لە ماڵ دەبڕا، لە سەرسووچی مزگەوتەکەی مەلا جەبار یەکمان دەگرتەوە. لەوێ پێکەوە بە چەند سەعات ڕادەوەستاین، دەمێک گاڵتە و شۆخی و دەمێکی دی قسەی جددی و باسی کتێب و بابەتی ئەدەبی و دەنگوباسی چاپکراوی نوێی کتێب و گۆوار و ڕۆژنامە و هێندیک جاریش قسەوباس و موناقەشەی سیاسی دەبووە میوانی کۆڕەکانمان و لەو نێوەشدا ئاڵوگۆڕی کتێب و چاپەمەنی دیکەمان دەکرد.

ئێمە منداڵانی گەڕەک گەورە ببووین و مەیلی سیاسی لە هزرماندا چەکەرەی کردبوو، ئیدی ئەوا نەوەیەکی نوێی دیکەش بۆ خەبات و ململانێی سیاسی و خەباتی ژێرزەمینی و خەباتی پێشمەرگانە و قوربانیدان و جەرگسووتان پێگەییشت.

من ئەو دەمە چەند ساڵێک بوو لەگەڵ کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان کارم دەکرد و بە دەوروبەری خۆشمدا چاوم دەگێڕا و لێی ورد دەبوومەوە، بزانم کێ لە هاوڕێ و دۆست و ناسیاوەکانم بۆ هاودەمی ڕێگای پڕ لە هاتونەهاتی ئەم تێکۆشانە گونجاوە، تاوەکوو هەرچی زووترە، دەستەگەلی بتوانین ئەو هەموو زوڵم زۆر و کوێرەوەرییەی کە بەسەر ئەو خەڵکەوەیە لابەرین و بتوانین لە دنیایەکی باشتردا بژین.

بۆ ئەم مەبەستە بیرم لەم هاورێیەم کردەوە و یەک لەدوای یەک ئەو کتێبانەم دایە لای کە بۆ ئەو کارە کۆمەکم دەکات، لەوانە: کتێبی کوردستان و کوردی عەبدولڕەحمانی قاسملۆ، ڕۆمانی ژانی گەلی ئیبراهیم ئەحمەد، چەپکێک لە قسەکانی ماو ... لەپاش خوێندنەوەی ئەمانە و گەڕانەوەی، باسی کتێبەکەمان دەکرد و بەو هۆیەوە دەچووینە نێو قسەوباسی سیاسییەوە، بەبێ ئەوەی ئەو بزانێت من دەنێو ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی 'کۆمەڵە'م جێ خستووە.

قسەوباسەکانمان هەتا دەهات تایبەت دەبووە و ناڕاستەوخۆ خۆی لە قەرەی کاری ڕێکخراوەیی و ژێرزەمینی دەدا، وەلی من هێشتا بەڕاشکاوی ئەو باسانەم لەگەڵدا نەکردبوو، بەڵام ئەو بۆ خۆی لەناوەوە جۆشی سەندبوو و قوڵتی ئەدا.

لەو دەمەدا بوو باسی ئەوەی بۆم کرد کە چۆن نزیکایەتی لەگەڵ حیزبی سۆشیالیستی کوردستان (حسک)دا پەیدا کردووە و لەلایەن ئەوانەوە پێشنیاری ئەوەی بۆ کراوە، نارنجۆکێکی پێ بدەن و کارێکی سەربازی پێ ئەنجام بدەن. لەدوای ئەوە ئیتر ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوانە قسەم لەگەڵدا کرد و ڕەخنەم لەو کارە و لەو ڕێکخراوە گرت و بۆ کۆمەڵە موفاتەحەم کرد[179] و لە "حسک" و لەو کارەی کە قەرار بوو پێی بکەن، دوورم خستەوە.

لەو ڕۆژگارەدا زۆربەی پارت و ڕێکخراوەکانی کوردستان بۆ ئەوەی متمانەی تەواو بە کەسێک بکەن، تا بە ئەندام یان بە پێشمەرگە قبووڵی بکەن، نارنجۆکێکیان پێ ئەدا و ئەیانگوت بڕۆ فلانە کاری پێ بکە. بێگومان ئەمەش شێوازێکی چەوت و چەوێڵ و بێدەربەستانە بەرامبەر بە گیانی ئەو لاوە خوێنگەرم و ئامادەبەکارانە بوو. دیارە ڕێگا و شێوازی دروست: ناسین و تێکەڵی و پەیوەندیی کۆمەڵایەتییە. پاشان مەرج نییە کەسانێک کە دەیانەوێت لە ڕێکخستندا کار بکەن، بۆ کار و کردەی سەربازییش هەر گونجاو بن، لە هەموو ئەمانەش خراپتر ئەوەیە، کاتێک کارێکی وا بە کەسێک دەسپێرن، هیچ خول و ڕاهێنانێک لەسەر چۆنیەتیی بەکارهێنانی چەک و هونەری کاری چریکی نێوشار بۆ ئەو کەسە ناکرێتەوە و ناکرێت. ئاکامی ئەمەش گەلێک جار ئەوەیە، ئەو کەسە بەهۆی بەکارهێنانی هەڵەی ئەو چەک و تەقەمەنییانەوە خۆی کوشتووە، یان بە هۆی نەشارەزایی و بێئەزموونییەوە کارەکەی سەرکەوتوو نەبووە.

نەوزاد، لاوێکی ئەسمەر، باڵا مامناوەندی، تۆکمە و پتەو و دامەزراو، گورجوگۆڵ و وەرزشکار بوو، لە خوێندنگای سەرەتایی و ناوەندی ئەندامی تیپی وەرزشی قوتابخانەکەیان بوو، لە گەلێک لە جۆرەکانی وەرزش بەتوانا و لێهاتوو بوو،

---

١٧٩. نامیلکەیەک (خۆرێک لە تاریکی، چەپکێ لە ژیاننامە و خەبات و شیعرەکانی شەهید نەوزاد فەتحوڵا، سلێمانی، سالی ٢٠٠٢) بلاو کراوەتەوە، بەداخەوە گەلێک زانیاریی ناڕاستی لەمەڕ چۆنیەتی پەیوەندیکردنی نەوزاد بە ڕیزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و پەیوەندییەکانی و تەنانەت شیعرەکانیشی تێدا هاتووە!

بەشداری کێبەرکێی قوتابخانەکانی دەکرد و پاشان لە یاری تۆپی پێ گۆڵچییەکی لێزان و شارەزا و پرۆفێشێناڵ بوو، وەلێ لە دەرس و خوێندندا خوێندکارێکی باش نەبوو.

مام فەتحوڵای باوکی نەوزاد پۆلیسی خانەنشینکراو بوو، بەڵام بۆ باشترکردنی بژێویی خانەوادەکەی، خەریکی کاری کرێکاری بوو. "نەوزاد"یش لە کاتی پشووی قوتابخانەکاندا لەگەڵ باوکی بۆ کرێکاری دەچوو.

دێتەوە یادم، گشت جارێک پێکەوە بەپێ بەرەو حەمەشنە و پاشان بۆ نێو خاسە و بۆ لای هێڵی شەمەندەفەرەکە و بۆ ئەو شوێنەی ئێستا پێی دەڵێن، سەرچنار دەڕۆیشتین، ئەوێ شوێنی کارەکەیان بوو. کارەکەیان، کاری دروستکردنی قاڵبی ستێگەر و بۆڕی کۆنکرێتی بوو، کارێکی سەخت و قورس و تاقەتپڕووکێن بوو، ئەگەرچی نەوزاد ئەو دەمە هەر وا مێردمنداڵێک بوو، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا تاقەتی بەسەر ئەو کارە قورسەدا دەشکا.

هەر وەکوو لە سەرەتادا ئاماژەم پێی دا، ئێمە مەڕوماڵاتدار بووین، لە دەورانی مێردمنداڵیمدا جاروبار ئەبوو ماڵاتەکان بۆ ئەو چۆڵاییەی ژوور ماڵمان بۆ ناوخاسە و هێندێک جار تا نزیکی هێڵی شەمەندەفەرەکە دەر بکەم، تاوەکوو تۆزێک بلەوەڕێن و جێیەکانیشیان خاڵی بێت و بتوانرێت بەسانایی پاک بکرێنەوە، وەلێ مەبەستی سەرەکی ئەوە بوو کە دەرچنە دەرەوە و سرِی پێیان دەربچێت و تووشی نەخۆشی باوڵی نەبن. باوڵی نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی ئاوسان و پەنەمانی چۆکی ئاژەڵەکان.

دەرکردنی ڕەشەوڵاخەکان گەلێک ناخۆش و ماندووکەر و مەترسیدار بوون، چونکە هەر ئەوەندە لە ماڵەوە دەرئەچوون، ئیدی بەناو ئەو کۆڵانەدا دەستیان دەکردە ڕمبازێ. هەرچی مەڕ و بزن و بەرخ و کارگەل بوون، وا نەبوون، بەڵام ئەمانە لەگەڵ مێگەلی دیکەدا زوو تێکەڵ دەبوون و دەبوو ئەوانەی خۆت بناسیتەوە و جیایان بکەیتەوە.

زۆر جار پەزەکانم هەتا لای هێڵی شەمەندەفەرەکە دەبرد و ئەوەشم بیستبوو کە ئەگەر پێنج فلسی بخەیتە سەر ئەو هێڵە و شەمەندەفەرەکە بەسەریدا بڕوات، ئەوا پانی دەکاتەوە و گەورە دەبێتەوە و دەبێتە دە فلسی. ئێ زۆر چاکە بۆ نا، با تاقی بکەمەوە! من خۆم ڕۆژانەکەم دە فلسە، ئەو کاتە ئەبێتە بیست فلس. لوقمانی براشم

هەر ڕۆژانەکەی دە فلس بوو، زۆر حەزمان لە کۆکاکۆلا بوو، بەڵام کۆکاکۆلایەک بە پانزە فلس بوو، واتە هیچمان بە تەنها نەمان دەتوانی ڕۆژانە کۆلا بخۆین! ناچار ئەبووینە شەریک و کۆکایەکمان لە دوکانەکەی حاجی ئەحمەد یارەوەلی بۆ هەردووکمان دەکڕی، بۆ دابەشکردنەکەشی پەنجەکانم جووت ئەکرد و سنووری خۆم و ئەوم دیاری دەکرد. لە پێشدا من نیوەکەی خۆمم ئەخوارد و نیوەکەی تریشی بۆ ئەو، بەڵام جاری وا هەبوو، بینم پێوە ئەنا و کەمێک ئەچوومە خوارەوە و ئەکەوتمە ناو سنووری ئەوەوە، ئیتر لێرەوە کێشە دروست ئەبوو.

ڕۆژێکیان وتم با تاقی بکەمەوە، ئەگەر سەری گرت، ئەوا بە تەنها خۆم ئەتوانم کۆکایەک بکڕم و پێنج فلسیشم ئەمێنێتەوە و لە کێشەی سنووریش نەجاتم ئەبێت. ئەو ڕۆژە چاوەڕێی شەمەندەفەرەکەم کرد، هەر ئەوەندە گوێم لە فیشکەی بوو، بەگورجی پێنج فلسییەکم لەسەر هێڵە ئاسنینەکە دانا و خۆشم چەند شەقاوێک کشامە دواوە و چاوەڕێی ئەوە بووم شەمەندەفەرەکە بەسەریدا بڕوات و پێنج فلسیم بۆ بکاتە دە فلسی! شەمەندەفەر بەسەریدا ڕۆییشت و منیش بەپەلە خۆم پێ گەیاند، کاتێک ئەبینم، پێنج فلسییەکەی لە یەک لاوە پان کردووەتەوە، نەک هەر نەیکردووە بە دە فلسی، بەڵکوو لە پێنج فلسیشی خستووە و ئەو ڕۆژە نەمتوانی نیوە کۆلاکەش بخۆمەوە!

نازانم نەوزاد هەتا چەندێک هەر پەیوەندی بە خۆمەوە هەبوو، بەڵام ئیتر هێڵەکانمان فراوان ببووەوە، پەیوەندییەکانی من زۆر و ئەرکەکانم قورس ببوون، ڕێکخستنەکانمان پێویستی بە ئارایشتێکی نوێ هەبوو، بۆیە لە ئاڵوگۆڕێکدا پەیوەندییەکەیم بۆ لای ئەحمەد خورشید گواستەوە. لەپاش ئەوە پەیوەندی لەگەڵ ئەودا مایەوە، هەتا ئەو دەمەی بڕیاری دا بڕواتە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی.

ئەو دەمەی نەوزاد چووە دەرەوە، بەرپرسی هێڵێک بوو بەم شێوەیە:

ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد (سمکۆ): ئەم هاوڕێیەش خەتێکی ڕێکخستنی پێوە بوو.

سەردار شێخ عەبدولقادر بریفکانی (باوەڕ): ئەم هاوڕێیەش خەڵکی دیکەی پێوە بوو، کە بۆ ئێمە نەزانراوە. ئەم هاوڕێیە لەدوای ئەوەی نەوزاد فەتحوڵا چووە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی، پەیوەندییەکەی بۆ لای ئەحمەد خورشید گوێزرایەوە.

موهەندیس ئازاد (برِوا): ئەم هاورِێیەش خەڵکی دیکەی پێوە بوو، کە بۆ ئێمە نەزانـــراوە. ئەم هـــاورِێیە لەدوای ئەوەی نەوزاد فەتحـــولاّ چـــووە دەرەوە بـــۆ پێشمەرگایەتی، پەیوەندییەکەی بۆ لای ئەحمەد خورشید گوێزرایەوە.

ستار عارف (ستارە رِەش): ئەم هاورِێیەش هەر پەیوەندی بە نەوزاد فەتحولاّ و بەم هێڵەوە هەبووە.

دیدار: ئەمە ناوی نهێنی کەسێکە، پەیوەندی هەر بە "نەوزاد فەتحولاّ"وە هەبووە و ناوی تەواوی خۆی نازانرێ.

نەوزاد لە پۆلی شەشەمی وێژەیی بە هۆی نزمی پلەکانی و وەرنەگیرانی لە هیچ جێگـایەک، دەبـوو بـۆ سـەربازی بچێـت، بەڵام ئەو برِیـاری دا بچێـتە دەرەوە بـۆ پێشمەرگایەتی، ئێمەش تەزکییەمـان بۆ کرد و لە پایزی سـاڵی ١٩٨٣دا بـوو، شـاری بەجێ هێشت و لە تیپی ٢١ی کەرکووک لە کەرتی ٤ی خاڵخـالآن بووە پێشمەرگە. لەدوای ماوەیەکی کورت دەبێتە کادری کەرت و پاش چەند مانگێک لەدوای ئەوەی تیپی ٢٥ی خاڵخالآن دادەمەزرێ، وەکوو کادرێک بۆ کەرتی یەکی قەڵاسێوکەی ئەو تیپە دەگوێزرێتەوە.

### ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد (سمکۆ):[180]

رِۆژێکیـان نـامەیەکی چـوکلێتی لە کەرتـی رِێکخسـتنی چەمچەمـاڵەوە گەیشـتە دەسـتم، کاتێـک کە کـردمەوە و خوێنـدمەوە، داوای ئەوە دەکـات، پەیوەنـدی بـۆ هاورِێیەک بە ناوی "ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد"ەوە بە فڵانە ناونیشـان و وشـەی نهێنییەوە دروست بکەینەوە. ئەو ناونیشـانە کەوتبووە نێو کۆڵانە تەنگ و کۆم و باریکەکانی گەرِەکی "حەمام عەلی بەگ"ەوە. منیش هەستام نامەیەکم نووسی و ناو و ناونیشـــانەکەیم تێـدا روون کـردەوە و بــۆ ئاســانکاریش نەخشـــەی گەرِەک و کۆڵانەکەم بەگوێرەی ئەو تـاریفەی لە نـامەکەدا هـاتبوو کێشـا و دامە خالید مـحەمەد فاتیح (سەمیر نووری) کە بچێت پەیوەندیی پێوە بکات.

ئیسماعیل (سمکۆ) سەرەتا لە رِێگەی فەخرەدین عەلی رِەزا ناسراو بە هەردی و جومعە ئەنوەر ئۆمەر ناسراو بە شێروان رِێک دەخرێت و شانەیەکی سێ کەسی کە

---

١٨٠. ئێستا ئەفسەری ئاساییشە بە پلەی عەمید لە ئاساییشی کەرکووک.

شێروان بەرپرسی دەبێت پێک دەهێنن. "شێروان"یش پەیوەندی بە جەواد بەهادین عەلی (شێخ جەواد)ەوە دەبێت. دوای ئەوەی جەواد لە شالاوی گرتنەکان بۆسەر کۆمیتەی ئاگر دەگیرێت، ئەمانیش لە ڕێکخستن دەپچڕێنەوە.

سمکۆ لەو دەمەدا بەرپرسی خەتێکی ڕێکخستن دەبێت بەم ناوانە: کاوە تەیفوور ئیبراهیم (کاوە گەنیاکی)،[181] موئەیەد عەلی سادق (کاروان)، ئەحمەد سابیر کەریم، جەبار نەجم ڕەزا، زرار ئەحمەد محەمەد،[182] کامەران ئەحمەد محەمەد (دکتۆر کامەران)، فازڵ مەحموود ئەمین (سەید فازڵ، نەمر)، ئەمیش بەرپرسی دوو شانە دەبێت، بەم ناوانەوە: نەجمەدین سالح ڕەمەزان (پێشڕەو)،[183] سەیفەدین غائیب (پێشەوا).[184]

هەروەها خۆشمان شانەیەکی دیکەمان دایە لای سمکۆ، بەم ناوانەوە: سیروان عەزیز فلامەرز،[185] فەرهاد مەحموود عەزیز سێکانیان، مەمەند کەڵوڕی.[186]

چەند شانەیەکی دیکەیشی پێوە دەبێت، کە خۆی ڕێکی خستوون بەم ناوانەوە: فازڵ عوسمان فەقێ عەزیز، کامەران عوسمان فەقێ عەزیز، سەردار عوسمان فەقێ عەزیز، ئەمەل عوسمان فەقێ عەزیز و سوعاد.

لەدوای ماوەیەک پەیوەندییەکەی سمکۆ بۆ لای نەوزاد فەتحوڵا عەبدولڕەزاق (هیوا) دەگوێزرێتەوە. دوای ئەوەی لە پایزی ساڵی ١٩٨٣ نەوزاد دەچێتە دەرەوە و دەبێتە پێشمەرگە، پەیوەندیی سمکۆ بۆ لای عەزەدین مەجید محەمەد (جەمال ئەیووب) دەگوێزرێتەوە.

لەدوای کۆنفرانسی سێیەمی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان، کاتێک ئێمە وەکوو ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی وازمان هێنا، سمکۆ دەمێنێتەوە و دەبێتە بەرپرسی لقی کەرکووک و سکرتێری ئەو ڕێکخراوە.

---

١٨١. ساڵانی دواتر دەبێتە پێشمەرگە و لە ساڵی ١٩٨٥ لە شەڕی گوندی حاجیتان شەهید دەبێت.

١٨٢. ئێستا ئەفسەری ئاسایشە بە پلەی عەمید.

١٨٣. ئێستا ئەفسەری ئاسایشە بە پلەی عەمید.

١٨٤. ئێستا مفەوەزی ئاسایشە.

١٨٥. ئێستا ئەفسەری هەواڵگریی عێراقییە بە پلەی عەمید.

١٨٦. ئێستا بەڕێوەبەری ناحییەی سەنگاوە.

# سەفەرێك بۆ نێوزەنگ

لە پـایزی سـاڵی ١٩٨٢دا بـوو، ئـێمە، ئەنجـوومەنی سـەرکردایەتیی یەکێتیـی خوێنـدکارانی کوردسـتان بڕیارمـان دا سـەفەرێک بـۆ خـڕی ناوزەنـگ بکەیـن و لە نزیکەوە بارودۆخی یەکێتی و سەرکردایەتییەکەی ببینین.

ژمارەمان پێنج هاوڕێ بوو: ئاوات ئەحمەد عەلی، سالار ڕەشید، سیروان کەریـم محەمەد، شوان قادر (دکتۆر شوان)، عیسام نامیق عەبدوڵا (دکتۆر عیسام).

وڵاخێکمـان بەکـرێ گـرت و دەمەو عەسـرەکەی لە ئۆردووگـای "بەستەسـتێن"ی نزیـک شـارۆچکەی قەڵادزێـوە بەڕێ کەوتـین. ڕێگامـان زۆر کـرد و هەر جـارەی یەکێکمـان بە نـۆرە سـوار دەبـووین و ڕێگـا هەر نەدەبڕایەوە. وردە وردە ڕوونـاکی خـۆی کـۆ ئەکردەوە و ئـێمەی بە تـاریکی شـەو دەسـپارد. دوای مـاوەیەکی زۆر لە شـەوڕەوی مانـدوو بووبـووین، لە دۆڵێکدا بە هێنـدێک وڵاخـدار و کـاروانچی دیـکە گەییشتین، ڕاوەستاین و پشوویەکمان دا. دنیا بەشـەو ساردی کردبوو، بە تـایبەتی لەو کوێستانە. وڵاخدارەکان ئاگرێکیان کردەوە و چایەکیان لـێ نـا. ئەوان یەکترییـان دەناسی و بۆ خۆیان کەوتنە حیکایەت. ئێمەی خوێندەوارانی شارییش کەوتینە گاڵتە و نوکتە و پێکەنین. بۆ ئێمە فەزایەکی خۆش بوو. ئاخر کەم جار وا ڕێـک دەکەوێت، ساتێک خوێندن وەلا بنێیت و لە ژاوەژاوی زانکۆ و چاوی بەدکاران و جاسووسـان بەدوور بیت. شەوێکی ساردی پایزەی خـۆش بـوو، مرۆڤ هەر حەزی دەکرد چاو لە ئاسمان نەبڕێت، ئاخر مەگەر لە فرسەتێکی وادا و بەس، بزانیت چەندێک ئەستێرە خۆی بەو ئاسمانەوە هەڵواسیوە! پێ دەچێت ئاسمانی ئەو زوزانە ئەستێرەی گەلێک زیاتری پێوە بێت وەک لە ئاسمانی شـار. ئەسـتێرەکانی ئەم دەڤەرە بەشۆڕوشـەوقتر و بزێوتریشـــن، ڕەنگبێـــت بـــۆ ڕەجمـــی شـــەیاتین گـــورجتر و نیشانشـــکێنتر و سەرکەوتووتریش بن، دەنا ئەو هەموو تریفە و تریقەیە لە کوێوە دێن!

پشـــوویەکی باشـــمان دا، چەنـــد ئیســـتیکانێک چـــاییش وەنەوزی لەچـــاو بـــڕین. هەستاین و بەڕێ کەوتین. ڕێگامـان دوورە و دەبێت بگەینە مەنزڵ. هەر ئەڕۆین و پێ ناگەین. ئەوەندەمان زانی شوان لەترێکی دا، لە جێگایەک پێی خراپ دانابوو، پێی

وەرگەڕا و لەجێ چوو، ئەگەر پێشووتر بەنۆبە سواری ولاخەکە دەبووین، ئەوا ئیدی ئەو نۆرەیەش نەما و هەتاوەکوو گەییشتینە جێ، شوان ولاخی داگیر کرد. ڕەنگ بێت هەر ئەوە وای لێ کردبێت، دواجار خۆی کردە دکتۆری ئێسک و فەقەرات.

شوان زۆر جار لەنێو کۆبوونەوەکان لە نێوزەنگ خەو دەیبردەوە، بۆیە من ناوم لێ نا، ڕەشۆی فەقێ برایم. ڕەشۆی فەقێ برایم ئەکتەرێکی نێو یەکێک لە دراما کوردییەکان بوو، ئەچن خوازبێنی ژنی بۆ بکەن، کەچی ئەو لەنێو مەجلیسەکەدا خەوی لێ دەکەوێت.

ئێمە گشت نەشارەزا و نابەڵەد بووین، ئەوە یەکەمجارمان بوو ئەو ڕێگایە تەی بکەین، هەر تاوناتاوێکیش بە کاکی ولاخدارمان دەگوت: ئەرێ کاکە! زۆرمان ماوە بگەینە جێ؟ ئەویش لە وەڵامدا دەیگوت: نانا ... هەر پێچی مێزەرێکمان ماوە! پێچی مێزەر بۆ ئەو بچووک و بۆ ئێمە گەورە بوو. سەرەنجام پێچی مێزەر لە ڕاست "زیندان" کۆتایی پێ هات.

شەو درەنگە، نازانم چەند سەعاتە بەڕێوەین، دنیا تاریک و نیتک چاو چاو نابینێ، بەسەر یاڵێکەوەین بڵند، کاکی ولاخدار وتی: کاکە ئەوە گەییشتینە جێ، ئیدی من لێرە لێتان جیا دەبمەوە. لەگەڵ ئەوەی ولاخدار ئەو قسانەی ئەکرد، ئێمە دڵخۆش بووین، ئاخر گەییشتن بە خاڵی ئامانج شادیهێنە، وەلێ سەیرێکی دەوروبەری خۆمان کرد، بێجگە لە ورتەورتی هێندێک ڕێبوار و ولاخدار و کاروانچی دیکە و تروسکە ترووسکی چەند پەڵە ڕووناکییەک، هیچی دیکەمان لێوە دیار نەبوو! خەمێک و هەستێکی نامۆ دایگرتین، پرسیارمان کرد: کاکە ئێرە کوێیە؟ کاکی ولاخدار دەستی بۆ دۆڵەکە درێژ کرد کە چەند ترووسکاییەکی تێدا بەدی دەکرا، وتی: کاکە ئەوە زیندانی یەکێتییە، هەر لەم بەرزاییەوە بەکاوەخۆ و بەوریایی بچنە خوارە هەتا دەگەنە ئەو ڕووناکییە، ئەتوانن شەو لەوێ بمێننەوە و بۆ بەیانییەکەی بۆ ناوزەنگ بکەونە ڕێ.

زۆر چاکە، خوداحافیزیمان لە ولاخدارەکە کرد و وردە وردە بەرەو خوارەوە بۆ ناو دۆڵەکە ملمان نا. هیچ ڕێگایەکمان لێوە دیار نەبوو، هەر ئەلاوتەوەکەلی

هەنگاومان ئەنا. کاتێک لەنێو دۆڵەکە نزیک بووینەوە، هاواریان لێمان کرد و میلی تفەنگیان لێمان هێنایەوە:

زەلام کێن؟!

وتمان: کاکە، ئێمە هاوڕێیانی شارین!

وتیان: هاوڕێیانی شار؟! هاوڕێیانی شار چی ئەکەن لێرە؟!

وتمان: کاکە، ئێستا گەییشتووین و ئەمانەوێت ئەم شەو لێرە بمێنینەوە و سبەی بۆ ناوزەنگ بچین.

دەباشە وەرنە خوارەوە! وریا بن! لەوێوە نا ... لەوێوە! دەی دەی! ئاخر چۆن وا ئەبێت، ئەمە ئیشە ئێوە ئەی کەن؟! لەگەڵ ئەو قسانەدا و هەر لەو دوورەوە بە لایتەکەی دەستی ڕێگاکەی بۆ ڕووناک ئەکردینەوە.

بە هەر حاڵێک بوو، چووینە خوارەوە و گەییشتینە زیندان و ئەو کەسەی کە دەنگی ئەدایین.

کابرایەکی چوارشانەی تێکسمڕاوی پتەو لەبەردەم زیندانەکە بوو، هەتا گەییشتینە بەردەمی هەر دیقەتی ئەدایین، دەتگوت قەت میوانی ناوەختی نەدیوە، ئەویش بەرپرسی زیندان، عەلی شامار بوو.

عەلی شامار بە ئەسڵ خانەقینی بوو، کاتی خۆی پێش ئەوەی بێتە دەرەوە، لە سەرەتادا عەرەبانەیەکی دەستی هەبوو، سێو، پرتەقاڵ و سەوزەی لەسەری دەفرۆشت ... ژێر عەرەبانەکەی هەمووی کتێبی ماو تسیتۆنگ و شۆڕشی چین و ماچین بوو. هەر کەسێک سڵاوی لێ بکردایە، یان دوو کیلۆ تەماتەی لێ کڕیبایە، یەکسەر باسی پرۆلیتاریا و شۆڕشی جووتیاران و شەڕی پارتیزانی بۆ دەکرد ... چەند نامیلکەیەکی دەخستە باخەڵییەوە ... پاشان دوکانێکی دانا ... نوقڵ و چکلێت و مەساسە و فڕفاڕە و میزڵدانی تێدا دەفرۆشت. لایەکی ڕەفەکان وردەواڵە بوو، لایەکی تری نامیلکە و کتێب ... دەیگوت: دەبێ مێشکی گەنجان ڕوون بکەینەوە، با چاو بکەنەوە، لە ژیان تێ بگەن، کە بەرچاویان ڕوون بووەوە، دەبنە هێزێک، گەورەترین قەڵای زۆرداران دەڕووخێنن.[١٨٧]

١٨٧. بە خەونی گەورەوە کەوتینە ڕێ، مامۆستا جەعفەر، بەرگی یەکەم، چاپخانەی تاران، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٩، ل ٣٧.

عەلـی شـامار هەر لە سـەرەتاوە کەوتە سـەرکۆنەکردنمان و بە شـێوەزاری خانەقینی وتی: ئێوە موسەقەفن و بایەد کارەکاندان مونەزەم بوود. ئینجا وتی: ئێوە زەبت و ڕەبتتان نییە! دیسانەوە ئەیگوتەوە: ئێوە زەبت و ڕەبتتان نییە!

بە هەر حاڵ شـەو درەنـگ بـوو، ئێمەش هـیلاک و مانـدوو بـووین، گەرەکیشمان بوو سبەی لە وەختدا لە خەو هەستین و بکەوینە ڕێ. بۆیە بە 'عەلی شامار'مان گوت، بەڵکوو بکرێ شوێنی خەومان بۆ دیاری بکەیت.

وتی: وەڵا هیچ جێگەیەکمان نییە، جگە لە ژووری زیندانەکە نەبێت! سـەرەنجام دەرگای زیندانەکەی بۆ کردینەوە، تاقە زیندانییەکی تێدا بوو، ئەویش نائیب زابتێکی عەرەب بوو. زینـدانی هەستایە سـەرپێ و چاوی بڕییە ئێمە، ڕەنگە زۆر دڵی بەوە خۆش بووبێت، ئێمە زیندانی بۆ ئاوەدان بکەینەوە و لەو تەنهاییە ڕزگاری بکەین و ئەو شـەوە دەمەتەقێیەکمـان لەگەڵـدا بکـات و هێنـدێک دەنگوباسـی دەرەوە و دنیـا بژنەوێت. وەلێ عەلی شامار ئەو خەیاڵانەی لێ شێواند و پێی گوت: سـەرت داپۆشـە و ڕوو بکەرە ئەودیو و سەیری ئەمان نەکەیت!

بە ئێمەشی گوت: ئاگاتان لە خۆتان بێت!

ئینجا خڕ دەرگاکەی لێ داخستین و گوتی: ئێوە زەبت و ڕەبتتان نییە!

زینـدان ژوورێکـی مامناوەنـدی لە قـوڕ دروسـتکراوی ئاسـایی وەکـوو هەر ژوورێکی دیکە بوو، دەلاقەیەکی گچکەی تێدا بوو، دەیڕوانییە سەر دۆڵەکە.

ئەو شـەوەمان لە زینـدانی یەکێتـی بەسـەر بـرد. دەمەو بەیـان عەلی شـامار هـات دەرگای زیندانەکەی لێ کردینەوە، هەر ڕێک لەدوای بەیانی باش، گوتی: ئێوە زەبت و ڕەبتتان نییە!

نان و چای بەیانیمان خـوارد و ماڵئاواییمـان لەوێ کرد. بەرەو ناوزەنـگ کەوتینە ڕێ و پاش ماوەیەک ڕێکردن گەیشتین. ناوزەنـگ ئـاوەدان بـوو، وتیـان ئەو خانگـانە هەر یەکەی مـقەڕی دەسـتگایەک و مـاڵی یەکێـک لە سـەرکردەکانە. دەسـتیان بـۆ خـانوویەک درێـژ کـرد، وتیـان ئەوە هـۆڵی شـەهید شـەهابە، کۆنفرانسـی دووەمـی کۆمەڵە لەوێ بەستراوە. کەمێک بەرەو خـوارەوە، وتیـان ئەوە مقەڕی مـام جەلالە و زۆر کەمتر لەوە و بەلای سەرەوە، وتیان ئەوەش ناوەندیی کۆمەڵەیە.

ئێمە چووینە ناوەندیی کۆمەڵە، مامۆستا جەمال تاهیر و فەرەیدوون عەبدولقادر و قادری حاجی عەلی لەوێ بوون. لەو دەورانەدا مامۆستا جەمال بەرپرسی دەستگای ڕێکخستنی کۆمەڵە بوو، لەوێ لەگەڵ ئەواندا دانیشتین و دەست کرا بە قسەکردن، زۆرتر مامۆستا جەمال قسەی کرد. دوای ئەوە بۆ بارەگای مام جەلال چووین. دیارە پێشتر ئاگادار کرابووەوە کە هاوڕێیانی شار، ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکاران هاتوون. لەو کاتەدا کە ئێمە لەلای مام جەلال بووین، هۆکی تۆکی مام جەلال زەنگی لێ دا، حەمە سوور (حوسێن مورادبەگی)، یەکێک لە دامەزرێنەران و ڕابەرانی سیاسی و سەربازیی کۆمەڵەی ئێران بوو، باسی سەرکەوتنەکانی خۆیان و یەکێتی لە هەمبەر کۆماری ئیسلامی ئێران و باسی دەسکەوتەکانی بۆ مام جەلال کرد. دیار بوو، هاتبوو تا دوای ئێمە مام جەلال ببینێ.[188] دوای ئەوەی مام جەلال لە قسەکردن بووەوە، ڕووی کردە ئێمە و گوتی:

ئەمانە لە باری تیۆرییەوە زۆر توندڕەون، بەڵام چونکە دەستیان لە هەویرەکەدایە، دەزانن چۆن کار بکەن.

ئیتر مام جەلال باسی بارودۆخی یەکێتی و کوردستان و ناوچەکەی کرد، پاشان هاتینە سەر باسی یەکێتیی خوێندکاران و بەستنی کۆنفرانس و ڕۆنانەوەی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی و هەڵبژاردنی هەڵکەوت عەبدوڵا وەکوو سکرتێری ڕێکخراوەکە. پاشان مام جەلال چووە سەر باسی هەڵکەوت و زۆر لێی تووڕە و پڕ بوو، گوتی:

ئەو برادەرەتان زۆر ساختەچییە، لێرە نەماوە و چووە بۆ خاریج! ئێمە هەموو ئەبڵەق بووین. وتی چووەتە ئێران و پاشان سووریا ... بەناوی ئێوەوە باسی ئەوەی کردووە کە یەکێتیی خوێندکاران لە دەرەوەی وڵات پێویستیی بە نوێنەرێک هەیە و داوای کردووە برووسکەی پشتگیری بۆ لێ بدەین ...

---

١٨٨. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە کۆبوونەوەیەکی سێقۆڵی نێوان 'مام جەلال و نەوشیروان و قاسملۆ'دا لە ١٥ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٢دا، لە نێوزەنگ بەڕێوە چوو، بەبێ گەڕانەوە بۆ مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی، بڕیاری ناردنی هێزی دا.

سەرچاوە: ئەو ڕۆژانەی نیشتمان هی هەموان بوو، هەڤاڵ کوێستانی، چاپخانەی کارۆ، چاپی دووەم، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٨، ل ٢٣٥.

ئێمەش وتمان: ئێمە نەک هەر بڕیاری وامان نەداوە، تەنانەت ئەو ئێمەی هەر ئاگاداریش نەکردووەتەوە!

پاشان مام جەلال گوتی: ئاخر سەرۆکی ڕێکخراو چۆن ئەبێت لە خاریج بێت، ئەبێت لە نزیکی ڕێکخراوەکە و لەنێو وڵاتدا بێت! ئینجا وتی: ئەوە فەنانە.. فەنان (مەبەستی ئەوە بوو، فێڵی لە ئێمە و لەویش کردووە)!

هەڵکەوت کەسێکی بەتوانا، وریا، چالاک و بزێو بوو، وەلێ پێ دەچێت، هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بووبێت، یەکێتیی خوێندکاران بەپەلە و لەپشتی هاوڕێ کۆنەکانییەوە (لە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی) بخاتەوە سەرپێ و بیکەینە سکرتێر و هەمەکارە و لەو ڕێگەیەوە خۆی بە خاریج بگەیەنێت.

دوای ئەوە باسی ئەوەمان کرد، چۆن یەکێتیی خوێندکاران گەورە و بەهێز بکەین و بەرەو پێشی بەرین. من لەوێدا داوای ئەوەم لە مام جەلال کرد، بەڵکوو تایپێکمان لە ئێران بۆ پەیدا بکەن، بۆ ئەوەی بتوانین بڵاوکراوەکانمان بەتایپکراوی بڵاو بکەینەوە. ئەو دەمە جۆرە تایپێکی بچکۆلەی ئێرانی جۆری برازەر هەبوو، پیتەکانی فارسی بوون، بۆ نووسینی کوردی زۆر گونجاو بوو، بۆ هەڵگرتن و شاردنەوەش زۆر عەمەلی بوو. مام جەلال قەولی پێمان دا و پاشان لەلای خۆی وەکوو تێبینییەکیش تۆماری کرد، وەلێ هەتا هەنووکەش هەر چاوەڕوانین!

ویستمان سالار عەزیز و ئازاد هەورامی ببینین، بەڵام ڕێک نەکەوت. ویستمان نەوشیروان مستەفا ببینین بەڵام لەوێ نەبوو، سەرقاڵی ئەو هێزە بوو کە یەکێتی بۆ پشتیوانی دیموکرات و کۆمەڵەی ئێرانی ناردبوو. بەڵام توانیمان لەگەڵ مەلا بەختیار دابنیشین.

مەلا بەختیار کەسێکی سادە و خاکی و قسەخۆش بوو. دێتەوە بیرم ئەو دەمە باسی دانووستانی نێوان یەکێتی و حکوومەتی کرد و بەپێکەنینەوە گوتی: مفاوەزاتمان پێ باشە، بەڵام وەهاش نییە کە کرەی بۆ بکەین.

لەو دەمەدا بەنێوەندگیریی قاسملۆ نزیکبوونەوەیەک لەگەڵ حکوومەتی عێراقیدا هاتبووە کایەوە و جارێکیش وەفدی هەردوو لا چاویان بە یەکدی کەوتبوو.[189]

دوای ئەوە من بە تەنها و جارێکی دیکە بۆ ناوەندیی دەستگای ڕێکخستنی کۆمەڵە بۆ لای مامۆستا جەمال تاهیر چووەوە و سەبارەت بە بارودۆخی ڕێکخراوی کەرکووک و ڕێکخستنەکانی گفتوگۆمان کرد. پاشان مۆرێکی ڕێکخراوی کەرکووکی پێم دا، تا لەگەڵ خۆمدا بیبەمەوە. مۆرەکە لە ئێران دروست کرابوو، بچکۆلە و بازنەیی بوو، ئارم و ناوی کۆمەڵە و ڕێکخراوی کەرکووکی بەسەرەوە بوو. مۆرەکەم لە مامۆستا وەرگرت و خستمە گیرفانی شەرواڵەکەم و بۆ کەرکووکم هێنایەوە.

ئەو شەوە پێم وابێت لە ناوزەنگ لەلای هەڤاڵ کوێستانی ماینەوە، کە لە دەستگای ڕۆشنبیریی کۆمەڵە یان لە ڕادیۆ کاری دەکرد. پرسیاری خوێندنەوە و دەسکەوتنی کتێبی کرد، ئێمەش وتمان، بەڵێ کتێب دەست دەکەوێت، ئاڵوگۆڕی کتێب دەکرێت و لەلایەن خوێندەوارانەوە بایەخ بە خوێندنەوە زۆر دەدرێت.

بۆ بەیانییەکەی لە خەو هەستاین و بەرەو شار گەڕاینەوە. لە گەڕانەوەماندا سێ هێسترمان بەکرێ گرت و بە سکی بەتاڵەوە غارغارێنی باشمان پێیان کرد. کاکی کاروانچی ناوزگی بڕا هێندە بەدواماندا ڕا بکات. لە دواییدا گوتی: بمزانیبا ئاوها ئەکەن، سوارم نەدەکردن.

بۆ دەوری نیوەڕۆکەی گەیشتینە سەر جادەی نێوان قەڵادزێ و ژاراوە، بە جیا سواری ئۆتۆمبیل بووین و هەر یەکە بۆ زێدی خۆی گەڕایەوە.[190]

دوای ئەوە بە ماوەیەک لە کۆبوونەوەیەکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکاراندا "عیسام"مان بە سکرتێر هەڵبژارد.

---

١٨٩. ئەو ڕۆژانەی نیشتمان هی هەمووان بوو، هەڤاڵ کوێستانی، چاپخانەی کارۆ، چاپی دووەم، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٨، ل ٢٣٥.

١٩٠. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێزان: ئاوات ئەحمەد عەلی، ئەبووزێد سەمەد شەریف، سیروان کەریم محەمەد.

# چاپ و چاپخانەکەمان

زۆر جار ئێمە لە بۆنەکانی وەکوو دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان، وە یان بە هۆی ڕووداوێکەوە بەیاننامەمان دەرئەکرد.

ئەوەندەی پەیوەندی بە شاری کەرکووکەوە هەبووایە، ئەوا من خۆم ئەمنووسییەوە و هەر لە ماڵی خۆمان لە ژووره بچکۆلەکە و لەگەڵ لوقمانی برام بە ڕۆنیۆی سەرەتایی چاپمان دەکرد. دوای ئەوەی بەیاننامەکەم ئامادە ئەکرد، خۆم یان لوقمان کە هەردووکمان دەستوخەتمان خۆش بوو، بە پێنووسی ستێنسڵ و لەسەر وەرەقەی ستێنسڵ بەجوانی و بەئاگادارییەوە ئەمانئووسییەوە.

وەرەقەی ستێنسڵ لە دوو پارچە پێک هاتبوو، هەردوو پارچەکە لەلای سەرەوە پێکەوە بەند بوون، وەرەقەی سەرەوە تەنک و بە مادەی مۆم ڕووکەش کرابوو، کاتێک بە پێنووسی ستێنسڵەکە لەسەریمان دەنووسی، لەگەڵ جووڵەی نووکی پێنووسەکە مۆمەکەی لائەدا و کاغەزەکەی چاڵ ئەکرد. ئەوەی شایانی باسە، ئەو پێنووسە تایبەتی بوو، تەنها نووکێکی ئاسنی هەبوو و هیچی تر، واتە مەرەکەبی تێ نەدەکرا و ئەو نووکە ئاسنەش هەر بۆ ئەوە بوو، لەگەڵ نووسین لەسەر کاغەزەکە، بەگوێرەی ڕێڕەوی نووکە ئاسنەکە، کاغەزەکە بڕووشێنێت و مۆمەکە لابەرێت. هەرچی پارچەی دووەم و ژێرەوە بوو، وەرەقەیەکی ئاسایی بوو، کاتێک لەسەر لاپەڕەی یەکەم بتنووسیبا، لەوەی خوارەوە دەرئەچوو، وە دەتوانی بزانیت، ئایا بەجوانی و بەدروستی نووسیوتە وە یاخوود نا. پاشی ئەمە پارچە جام (شووشە)یکمان ئەهێنا و پارچە خامێکمان بەسەریدا دەدا بە جۆرێک کە ساف بێت و گرێوگۆڵی تێ نەکەوێت، پارچە خامەکەمان لەژێرەوەی جامەکە توند دەدوورییەوە، پاشان مەرەکەبی ڕۆنیۆمان ڕۆ دەکردە سەر خامەکە و بەجوانی و بەیەکسانی بەگوێرەی گەورەیی لاپەڕەکە بڵاومان دەکردەوە، پاشان لاپەڕەی سەرەوە، واتە لاپەڕە مۆمدارەکەمان بە هەڵگەراوەیی دەدایە سەر مەرەکەبەکە، ئەو دەمە تەنها لەو شوێنانەوە مەرەکەب ئەهاتە ئەمدیو کە نووکی پێنووسەکە مۆمەکەی ڕووشاندووە. ئیتر لەدوای ئەوە لاپەڕەی ئەی چوارمان ئەدا بەسەریدا و تیرۆکێکمان بەسەریدا دەهێنا و هەڵمان دەگرتەوە، ئەو کاتە نووسراوەکە لەسەر

لاپەڕە ئەی چوارەکە چاپ دەبوو، ئیدی جاری وا هەبوو، زیاتر لە ۲۰۰ بەیاننامەمان چاپ دەکرد.ئەوەی شایانی باسە، بەهۆی ناڕێکی دابەشبوونی مەرەکەبەکەوە، چەند لاپەڕەیەکی سەرەتا جوان دەرنەدەچوون، هەندێک شوێنی تۆخ و هەندێک شوێنی کاڵ بوو، بەڵام پاش ئەوە هاوسەنگی خۆی وەردەگرت و بەجوانی دەردەچوو. وەلێ بەهۆی ئەوەی، مەرەکەبەکە کاتی دەویست تا وشکەوە بێت، دەبوو لاپەڕەکان لەسەر یەک دانەنێین و بەنێو ژوورەکەدا بڵاویان بکەینەوە هەتا وشک دەبنەوە. بەو شێوەیە لەبەر بەیاننامە شوێن نەبوو پێی لێ دابنێی.

هەر ماوە جارێکیش، دوای ئەوەی هەستمان بە کاڵبوونەوەی چاپەکە دەکرد، دەبوو کاغەزی ستێنسڵەکە هەڵگرین و جارێکی تر و بەگوێرەی پێویست مەرەکەب بەسەر خامەکەدا ڕۆ بکەینەوە.دوای ئەوەی لە چاپکردن دەبووینەوە، خامە مەرەکەباوییەکەمان لە جامەکە دەکردەوە و دەمانسووتاند، جامەکەشمان پاک دەکردەوە و بۆ جارێکی دیکە و بەیاننامەیەکی دیکە هەڵمان دەگرت. بەو شێوەیە دەبوو پاشماوەی هیچ شتێک لە ژوورەکە و لە ماڵەکەماندا نەهێڵین.

کاتێک ئێمە خەریکی ئەم کارە و ئەم هێنان و بردن و شت سووتاندن و مەشغوولییە ئەبووین، بێگومان کەسمان لە ماڵەوە ئاگادار نەئەکردەوە، بەڵام گومانی تێدا نییە، هەموو ئاگادار دەبوونەوە و دەیانزانی لوقمان و من خەریکی چین و دەیانزانی مەترسی ئەو کارە چییە و چۆن تەنها هەر بۆ ئێمە نییە، بەڵکە بۆ گەورە و بچووکی ئەو ماڵەیە و بەو هۆیەوە ئەشێ گشت لە زیندان توند بکرێن و ڕۆژی ڕووناک بەچاو نەبیننەوە، ئەشێ خانووەکەیان، بەری ڕەنجی دەیان ساڵەیان تەخت بکرێت و بێ خانە و لانە بمێننەوە، هەروەها ئەشێتیش لە کەرکووک ڕاگوێزرێن و ڕەوانەی ڕومادی بکرێن و لە زێدی غەریبی بەبرسێتی و کوێرەوەری ژیان بەدووی خۆیاندا بەکێش بکەن!

بەڵام وێڕای ئەم هەموو ترس و بیمانە، هیچ کەسێکیان نەک هەر هیچی نەدەگوت و چارەی گرژ نەدەکرد، بەڵکە بەبێ دەرکردنی هیچ ئەمر و فەرمانێک، گوێقوڵاغ و بەئاگا، بە ئەرکی خۆیان هەڵدەستان و ئاگاداری دەرگا و دەر دەبوون و خۆمان و کارەکەمانیان پەنا دەدا، تا ئەو دەمەی ئێمە لە کارەکەمان دەبووینەوە و خامەکە و پاشماوەکانیمان دەسووتاند. هێندێک جاریش دایکم خۆی ئەهات، لە سووتاندنی ئەو شتانە کۆمەکی دەکردین.

# بڵاوکراوەکان لە چاوەڕوانیدان

ئێستا بڵاوکراوەکان وشکەوە بوونە، هەموویانمان لەسەر یەک سەفتە کردووە، پەلەیانە تا لەنێو ئەو ژوورە بچکۆلەیە، لەو چاپخانە هەژارانەیەوە بەنێو کوچە و کۆڵانەکانی شاردا شۆڕ ببنەوە و خۆیان بەژێر دەرگای ماڵاندا بکەن.

ناوبەناو من سەیرێکی بەیاننامەکان دەکەم و چەند دانەیەکیان هەڵئەدەمەوە و دیقەتیان ئەدەم، لوقمانی براشم لە بەرامبەرم دانیشتووە و بە هەمان شێوە لێیان دەڕوانێ و دەڵێت، ئەگەرچی هەندێکی مەرەکەبەکەی کەمێک زۆرە، بەڵام کێشەیەک نییە، گرنگ بەباشی دەخوێنرێنەوە! منیش ئەڵێم، نا خراپ نییە، بەگشتی جوانە، گرنگ ئەوەیە بخوێنرێنەوە، خەڵکی بزانێ چییان تێدایە و پەیامی "شۆڕش" چییە!

دەی! ئێستا با دەستوبرد بکەین، زەرفەکان بهێنین و بیانخەینە نێو زەرفەوە ... هەر بڵاوکراوەیەک چوارقەمچ ئەکەین و ئەیخەینە زەرفێکەوە. ئەوە بەشی من و ئەوە بەشی تۆ، من لە ئازادی بڵاوی ئەکەمەوە، تۆ لە زێویە، لە مزگەوتەکەی مەلا ئەحمەد بەولاوە، هەتا ئەگاتە لای ماڵی عێزەت ئاغا و خوارتریش، ئەوانەی دیکەش هاوڕێیانی تر لە شوێنی تر بڵاویان دەکەنەوە.ئەبێ ئەم شەو لەدوای نوێژی عیشا بە نیو سەعات، دەست بە بڵاوکردنەوەیان بکەین، نە زووتر نە درەنگتر، دەبێت بخرێنە ژێر دەرگای ماڵانەوە ...لوقمان ڕوو دەکاتە من و ئەڵێت: ئەوانەی خۆتیش بۆ من دابنێ، من بڵاویان ئەکەمەوە! منیش ڕووی لێ کەم و ئەڵێم: نانا! تۆ هەر ئەوەی بۆتم داناوە بڵاوی بکەوە، منیش هیی خۆم بڵاو ئەکەمەوە ...

لە فکری خۆمدا دامناوە، بەیاننامەکان بۆ کێ ببەم و کێ بەشداری لە بڵاوکردنەوەیاندا بکات. ئەو ڕۆژە ئیتر دەبوو بگەمە ماڵی ئەو هاوڕێیانە و هەر یەکەی ١٠-١٥ دانەی بۆ ببەم و شوێن و کاتی بڵاوکردنەوەشیان پێ ڕابگەیەنم.

بۆ بڵاوکردنەوەی بەیاننامە من ئەو وەختەم پێ باش بوو، چونکە جموجووڵی خەڵکی هەتا نوێژی عیشاش هەر هەبوو، بەڵام لەدوای ئەوە ئیدی جووڵە کەم ئەبوو، ڕاوەستانی نێو کۆڵان و سەرسووچی ماڵان کەم ئەبووەوە، ئەوەی بۆ مزگەوتیش ئەچوو، لەدوای نیو سەعاتێک مزگەوتیان چۆڵ ئەکرد و بۆ ماڵەوە ئەگەڕانەوە. لەوە درەنگتریش هەر باش نەبوو، چونکە ئیتر جێگەی گومانی مەفرەزەی ئەمن و پۆلیس بوو. بۆ بەیانی ئەبوو هەواڵی گشت ئەو هاوڕێیانە بزانم کە بەشداری بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەکانیان کردووە و لە سەلامەتییان ئاگادار بم.

## بەشی خۆم

هەر کاتێک بەیاننامەمان بۆ بڵاوکردنەوە هەبووایە، منیش وەک باقی هاوڕێیان بەشێکم بۆخۆم دائەنا، ئەگەرچی ئەوە هەڵە و کارێکی نادروست بوو، وەلێ لە گیانم ناخۆش بوو بە شێک لەو ئەرک و مەترسییە لە ئەستۆ نەگرم.

لەڕاستیدا نەک هەر ئەوانەی کە بەرپرسیارێتی ڕێکخراوەییان هەیە، نابێت بە کاری بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوە هەڵسن، بگرە دەبێ تەنانەت گشت ئەو ئەندامانەی کە بەرپرسیارێتیشیان کەمە یان نییە، هەر بەو کارە هەڵنەسن، بەڵکوو دەبێ تیمی تایبەتی بۆ ئەو کارە دابنرێت. ئەو دەمە کارەکان سەرکەوتووتر و ڕێکخستن کەمزیانتر ئەبێت.

ئەوەندەی بە خودی خۆمەوە پەیوەستە، چەندین جار بەیاننامەم لە چەندین شوێنی جیا جیا بڵاو کردووەتەوە. ئەوەندەی بێتەوە بیرم، یەکێک لەو جارانە لە گەڕەکی ئازادی و بە دووقۆڵی لەگەڵ نەوزاد فەتحولا و دوو جاریش لە باخچەکەی خوار ماڵ خۆمانەوە بوو.

یەکێک لەو دوو جارە لە باخچەی دەستە ڕاست، کاتێک لە ماڵی خۆمانەوە بە ئاراستەی عاشوور بچوویتایە، جارەکەی تریشی لە باخچەی دەستی چەپ. ئەوەی یەکەمیان بەیانییەکی زۆر زوو بوو شەبەقی، کتێبی مەکتەبم بەدەستەوە گرت و بەیاننامەکانیشم لە باخەڵم نا، لە دەرگای باخچەکە چوومە ژوورەوە، هیچ کەسێک لەو دەوروپشتە نەبوو، وام دانابوو ئەگەر کەسێک لەو نێوە بێت نەچمە ژوورەوە. کاتێک کە چوومە ناو باخچەکە، چاوێکم بە تەوای بە باخچەکەدا گێڕا و هیچ کەسێکم تێدا بەدی نەکرد. دوای ئەوە کەوتمە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەکان و لە هەر ڕاڕەوێک زەرفێکم دانا، بە جۆرێک کە بەرچاوی بێت و بە ئاسانی ببینرێت.

ئەو ڕاڕەوانە، ئەو شوێنانە بوون کە خوێندکاران تیایاندا دەیانخوێند و کەوتبوونە نێو دارودەوەن و نێو گوڵ و گوڵزاری ڕەنگاوڕەنگی گوڵەباخ و هەمیشەبەهار و گوڵەقەدیفە و دەمەشێری قەشەنگ و بۆنخۆشەوە. هەر

خوێندکارێکیش بە ڕاڕەوێکەوە عادەتی گرتبوو. هەتا هەنووکەش لە هەر شوێنێکی ئەم سەر زەمینە بۆنی هەر گوڵێک لەوانە بەگژما بێت، زۆر نا.. بە یەک چرکە هەڵم ئەداتە نێو باخچەکەی عاشوورەوە!

دوای ئەوەی بەیاننامەکانم بەوریاییی بڵاو کردەوە، لە دیواری پشتەوەی باخچەکە خۆم هەڵدایە ئەودیو و بەنێو کۆڵانە باریک و مارمارۆکەییەکانی نێو خانگە کۆم و لارەکانی گەڕەکی هەژارنشینی زێویە بەرەو ماڵ گەڕامەوە.

بۆیە لە دەرگای باخچەکەشەوە دەرنەچووم، ئەگەری ئەوەم دانابوو، نەوەکوو کەسێک لە کاتی چوونە ژوورەوە، منی بینیبێت و پاشان ئەوەی لەلا ببێتە پرسیار، بۆچی هەر وا زوو و بەپەلە دەرچوومە دەرەوە و باخچەکەم بەجێ هێشت!

ئەوەی جاری دووەم لە باخچەی دەستی چەپ بوو، بە هەمان دەستووری ئەوەی دیکە، بەڵام ئەم جارەیان بێجگە لە فڕێدانی بەیاننامە لە ڕاڕەوەکان، بەیاننامەیەکیشم لەسەر یەکێک لە دارەکان قایم کرد. ئەو دارە، دارێکی ئەستوور و قەوی و قەبە و بەرز بوو، هەر لە دەرگای باخچەکە دەچوویتە ژوورەوە دوای دە مەترێک پێی دەگەییشتی و زۆربەی ئەوانەی بۆ ئەو باخچەیە دەچوون، بەوێدا ڕەت دەبوون و پاشان بە دەستی چەپ و ڕاستدا دابەش دەبوون. واتە، شوێنی داکوتینی بەیاننامەکە زۆر چاک و بەرچاوی بوو.

جارێکی دیکە لە زانکۆ و لەنێو کۆلێجی علووم بەیاننامەکانم بڵاو کردەوە. ئەو دەمە کەشوهەوای نێو زانکۆ و کۆلێجەکان گەلێک ناخۆش بوو، خوێندکاران لەژێر چاودێرییەکی چڕوپڕدا بوون، ئەفسەرێکی ئاساییش کە ناوی ئەبووئەحمەد بوو، زەلامێکی کەڵەگەتی سپیکەلەی بەخۆ و قۆز بوو، لەناو مەیدانی کۆلێج و نزیک دەروازەی چێشتخانەکە ڕادەوەستا بۆ ماوەیەکی زۆر دەچەقی و ترس و سامێکی زۆری خستبووەوە.

بەیانی زوو لەگەڵ کردنەوەی دەوام چوومە نێو کۆلێج و لە ڕاڕەوەکان و لە دەستشۆرگەکە و لە هەر شوێنێکی دیکە کە پێم باش بوایە، بەیاننامەیەکم دائەنا.

دەستشۆرگەکە شوێنێکی زۆر باش بوو، چونکە بەو بەیانییە زووە، ژمارەیەکی زۆری خوێندکاران بۆ ئەوێ دەچوون.

لە کۆلێج، لە ڕاڕەوێکدا سەندووقێکی گەورەی ئیعلاناتمان هەبوو، ئەم سەندووقە دەرگایەکی گەورەی شووشەی هەبوو هەڵئەدرایەوە، هەر شتێکی نوێ هەبووایە، لەوێدا هەڵدەواسرا و خوێندکاران گشت ڕۆژێک چاوێکیان پێدا دەخشاند. ئەو ڕۆژە ویستم دانەیەک لە بەیاننامەکان لەنێو ئەو سەندووقە دابنێم، بەڵام کێشەی گەورە ئەوە بوو، یەکەم: دەبوو دەرگا گەورە جامەکەی هەڵدەیتەوە، دووەم: کە لەوەی یەکەم سەختتر بوو، سەندووقەکە کەوتبووە نێو ڕاڕەوێکی زۆر درێژ و لە هەردوو لاوە دەرگای هەبوو، واتە: لە دوو لاوە خەڵک ئەهاتن و ئەچوون!

چەند خۆم غافڵ کرد و چاودێری دۆخەکەم کرد و هاتم و چووم، بەڵام خەڵکی لێ نە دەبڕا، ناچار وازم لێی هێنا و بۆم جێبەجێ نەکرا.

خزمێکی دایکم کە ناوی ڕەزا و خەڵکی گوندی دارەمان بوو، بە هۆی شەریکی سەیارەوە زۆر جار بۆ ماڵمان ئەهات. ڕۆژێکیان ڕەزا میوانمان بوو، سەیارەکەی لەبەردەم ماڵمان ڕاگرتبوو، بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژە بەیاننامەمان بۆ بڵاوکردنەوە هەبوو، منیش چوومە دەرەوە، سەیرێکی ناو کۆڵانم کرد، کەس بەدەرەوە نەبوو، بەیاننامەیەکم دووقەمچ کرد و فلچەی جامی سەیارەکەم هەڵبڕی و لەسەر جامی سەیارەکە و ڕێک بەرامبەر بە شۆفێر دام نا و فلچەکەم هێنایەوە سەری و بەجێم هێشت. دوای ئەوەی ڕەزا ئەیەوێت بڕوات، وەرەقەیەک لەژێر فلچەی سەیارەکە دەبینێ، دەری ئەهێنێ و سەیری ئەکات، تێ ئەگات کە ئەوە بەیاننامەیە.

دوای ئەوە جارێکی تر بۆ ماڵمان هاتبووەوە، بە دایکمی وتبوو، جاری پێشوو کە لە ماڵتان بووم، بەیاننامەیەکیان خستبووە ژێر فلچەی جامی سەیارەکەمەوە، ئەوە ئیشی سالار بووە!

# شەهید هیوا و من، بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوە

جارێکیان، لە یادم نەماوە بە چ بۆنەیەکەوە بوو، بەیاننامەیەکم نووسییەوە و بە ڕۆنیۆی سەرەتایی چاپمان کرد و بەسەر کۆمەڵێک هاوڕێ لە گەڕەک و شوێنی جیاواز دابەشم کرد، تاوەکوو ئەوانیش لە دەوروبەری خۆیان بڵاوی بکەنەوە. بەشی خۆم و بەشی "نەوزاد فەتحوڵا"شم دانا. لەبەر ئەوەی نەوزاد یەکەم جاری بوو بەیاننامە بڵاو بکاتەوە، پێم باش بوو ئەمجارەیان پێکەوە ئەو کارە ئەنجام بدەین. چووم بۆ لای نەوزاد و پێم گوت، بەنیازی بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەین و پێم باشە هەردووکمان پێکەوە پێی هەستین، وتی باشە و پێی خۆش بوو.

ئیتر باسی ئەوەم بۆی کرد، ئەو جێگایەی ئێمە بەیاننامەکانی تێدا بڵاو دەکەینەوە، گەڕەکی ئازادی، دەستی چەپی ئەو شەقامەی کە بۆ بارووتخانە دەچێت و وەخت و سەعاتی دیاریکراو و شوێنی بە یەک گەیشتنم دانا. دیارە وام بە باش زانی، لە شوێنێکی دەرەوەی گەڕەکی خۆمان یەک بگرین و لەوێوە بەرەو ئازادی بکەوینە ڕێ، ئەمەش چونکە لە گەڕەک ناسراوین و ئەگەر شتێک ڕووی دا، نەڵێن، ئەم دوو کەسەمان پێکەوە بینیوە.

لە کات و شوێنی دیاریکراودا ڕێک هەردووک ئامادە بووین و پێکەوە بەرەو گەڕەکی ئازادی بەڕێ کەوتین. هەر لە سەرەتاوە نەخشەکەمان وەها بوو کە لە هەر کۆڵانێکدا من لە ڕیزێکەوە دەست بە بڵاوکردنەوەی بکەم، ئەویش لە ڕیزێکی دیکەوە و بە پێچەوانەی ئاراستەی یەکتریش، ئەو کاتە ئەو دەگەییشتە ئەم سەری کۆڵانەکە و من دەگەییشتمە ئەو سەرەکەی و پاشان ئەچووینە کۆڵانی ئەو دیو. بەو جۆرە هەموویمان خستەژێر دەرگای ماڵان و پاشان هەر یەکەمان بەجیا و بە ڕێگای جیاواز بەرەو ماڵ گەڕاینەوە.

# خالید و ڕووداوێکی سەیر!

جارێکیان بە بۆنەیەکەوە بەیاننامەیەکم نووسیبووەوە و چاپ و ئامادەمان کرد و بۆ هەر یەکە لەوانەی لەبەرچاوم گرتبوون کە بەیاننامە بڵاو بکاتەوە، بەشی خۆیم بۆ برد و کات و شوێنی بڵاوکردنەوەیشم پێی ڕاگەیاند. خالید محەمەد فاتیح (سەمیر نووری) یەکێک بوو لەو هاوڕێیانەی بۆ ئەو کارە لەبەرچاوم گرتبوو. ١٠ بەیاننامەم بۆ جیا کردەوە و ویستم بیان خەمە نێو زەرفەوە و بۆی ببەم، بەڵام کاتێک ئەڕوانم، تەنها ٩ زەرفم ماوە! بۆیە ٩ دانەم لە بەیاننامەکان خستە نێو زەرفەوە و ئەو دانەیەی دیکەم بەبێ زەرف دانا و بەرەو شۆڕیجە و کۆڵان قیرەکە کەماڵی خالیدی لێ بوو، بەڕێ کەوتم. ئەوە کاتی خۆی لەو گەڕەکەدا تەنها ئەو کۆڵانە قیر بووە، بۆیە وایان پێ گوتووە.

دوای ئەوەی گەیشتمە ماڵی خالید و بەیاننامەکانم دایە دەستی پێم وت: ئەوە ١٠ دانە لەو بەیاننامانەم بۆت هێناوە، بەڵام زەرفێکم کەم بوو، بەڵکوو خۆت ئەوەی تریشیان بخەیتە نێو زەرفێکەوە و لە فڵانە وەختدا بڵاویان بکەیتەوە، وتی: زۆر باشە، وا ئەکەم.

لەدوای ڕۆیشتنی من، خالید چاو ئەگێڕێ لەنێو دەلاقە بچکۆلانەکەی ژوورەکەدا کە کتێبخانەیەکی گچکۆکەی تێدا بوو، زەرفێک ئەدۆزێتەوە و بەیاننامەکەی تێ دەهاوێت و لەپاڵ نۆ دانەکەی دیکە دایدەنێت. بۆ شەویش لە کات و ساتی دیاریکراودا هەموویان بڵاو دەکاتەوە و دانەیەکیش دەخاتە ژێر فڵچەی جامی پێشەوەی ئۆتۆمبیلی ماڵی "فەرەیدوون عەلی ئەحمەد"ی خزمییەوە.

دوای ئەوەی ڕۆژ ئەبێتەوە، باوکی فەرەیدوون ئەچێتە دەرەوە بۆ لای ئۆتۆمبیلەکەی، زەرفەکەی بەرچاو دەکەوێت، لەژێر فڵچەکە دەری دەهێنێ و دەیباتە ژوورەوە، بانگی فەرەیدوون ئەکات و ئەڵێ، ئا کوڕم وەرە، بزانە ئەم زەرفە چییە! ئەویش یەکسەر زەرفەکە ئەکاتەوە، سەیر ئەکەن بەیاننامەیەکە و وێنەیەکی خالیدیشی تێدایە! توومەزە ئەو زەرفەی کە خالید بەیاننامەکەی تێ دەهاوێت، زەرفی ستۆدیۆیە و کاتێک لە ستۆدیۆ وێنەی گرتووە، وێنەکانیان بۆ خستووەتە نێو ئەو

زەرفەوە، ئەویش کاتێک کە بەیاننامەکەی تێ ئەکات، سەیری نێو زەرفەکە ناکات و بیری بۆ ئەوە ناچێت ئەوە زەرفی ستۆدیۆیە و وێنەی تێدایە! بەڕێکەوتیش ئەو دانەیە بەر ماڵی فەرەیدوون دەکەوێت! ئیتر باوکی فەرەیدوون زۆر تووڕە و دەهری دەبێت و بە ئاسماندا دەچێت و جوێن بە خالید ئەدا و ئەڵێ، ئەوە ئەیەوێت سەرمان بە قوڕدا بکات!

دوای ئەوە فەرەیدوون بۆ ماڵی خالید دەچێت و پێی دەڵێت: ئەوە دوێنێ شەو بەیاننامەت لە کوێ بڵاو کردووەتەوە؟

خالید ئەڵێ: بەیاننامەی چی؟! من بەیاننامەم بڵاو نەکردووەتەوە!

فەرەیدوون ئەڵێت: نا، خالید! دوێنێ شەو تۆ بەیاننامەیەکت لە فلان شوێن بۆ ئێمە داناوە، لەگەڵ ئەم قسانەدا دەست بەگیرفانی خۆیدا دەکات و وێنەکەی دەرئەهێنێ و دەیداتە دەستی و دەڵێت: فەرموو ئەوەش وێنەکەت لەنێو زەرفەکەدا بووە! خالید ئەشڵەژێت و ڕەنگ ئەهێنێ و ڕەنگ ئەبات و دەزانێت ئیتر کارەکەی ئاشکرا بووە.

پاش ماوەیەک خالید بە فەرەیدوون ئەڵێ: تۆ پاڵێوراوی ڕێکخستنی.[١٩١]

---

١٩١. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز فەرەیدوون عەلی ئەحمەد.

# نووسراوەکانم لەو دەورانەدا

سالانی پێشووتر هەندێک جار کە کتێبێکمان دەخوێندەوە، ئەگەر پەیوەندیی بە بیر و تێڕوانینی خۆمانەوە هەبووایە و بە گرنگ و پایەییمان بزانیبایە، ئەوا کرۆکی باسەکەمان بە کورت و پوختی دەنووسییەوە و لە کۆبوونەوەکانی خۆماندا جەدەل و پلمیکمان لەبارەوە دەکرد. بەڵام سەبارەت بە نووسینی نامیلکە و کتێب و لێکۆڵینەوە و وەرگێڕان، ئەوا نەک هەر کادرانی خوارەوە و وەسەت، بەڵکە کادرانی سەرەوە و ئەندامانی سەرکردایەتیش لەو ڕووەوە دەستکورت و قەڵەمیان کۆڵ بوو. من پێشووتر باسی ئەمەم کردووە و ناچمەوە سەری.

لە دەورانی ئەو چەند ساڵەی دوای شاڵاوی گرتنەکان بۆ سەر کۆمیتەی ئاگر و هەتا دامەزراندنەوەی کۆمیتەکە و وازهێنانمان لە کۆمەڵە، کۆمەڵێک کارم لە بواری نووسین و لێکۆڵینەوە و وەرگێڕاندا ئەنجام دا، بۆ ئەو دۆخ و دەورانەی ئەوسای ئێمە خراپ نەبوون.

یەکێک لەو نووسراوانە، نامیلکە یان کتێبێک بوو بە نێوی "ڕابەر"ەوە.

ڕابەر، کۆمەڵێک باس و بابەتی نێوخۆیی جۆراوجۆر بوو، هەر بە دەست و لەسەر کاغەزی قەوارە ئەی ٥ نووسیبوومەوە و ٩٠ لاپەڕە دەبوو.

لەو نووسینەدا باسی کۆمەڵێک کاری ڕێکخراوەییم سەبارەت بە شێوازی کار و هەڵسووڕانمان لەنێو جەماوەر و چۆنیەتی فراوانکردنەوەی دامەنەی ڕێکخستنمان و بنەما و پرەنسیپەکانی نهێنیکاری و خۆپاراستن و چۆنیەتی مامەڵەمان لە کاتی ئاشکرابوون و دەستگیرکردن و شێوازەکانی ئەشکەنجە و فریودان لە کاتی لێکۆڵینەوەدا ...هتد. کردبوو.

ئەم نووسینە وەک بیتەوە بیرم لە ساڵی ١٩٨٢دا بوو، پاشان بە کاربۆن چەندین کۆپیمان لەبەر گرتەوە و لەناو ڕێکخستنەکاندا بڵاومان کردەوە.

بابەتەکانی نێو ئەم نووسینە باسگەلێکی زیندوو و گرنگ بوون، ورد و ڕێنیشاندەر بوون، بۆ کاری هەمەڕۆژەی هاوڕێیانمان پێویست بوون.

دیتەوە بیرم، خالید محەمەد فاتیح دوای ئەوەی خوێندییەوە، زۆر پەسەندی کرد.

هەر لە ساڵی ١٩٨٢دا بوو، نامیلکەیەکی "ڤلادیمیر ئیلیچ لینین"م بە نێوی "دەوڵەت"ەوە لە زمانی عەرەبییەوە بۆ کوردی وەرگێڕا.

ئەم نامیلکەیە وتارێک بوو، هەر بەدەست نووسیبوومەوە، نزیکەی ٤٠ لاپەڕەی ئەی ٥ دەبوو، لە چاپکراوەکانی "خانەی پێشکەوتن"ی مۆسکۆ بوو. لەم وتارەدا لینین بە پشتبەستن بە کتێبی "بنەچەی خێزان"ی فردریک ئەنگلس، شیکاریی مەسەلەی "دەوڵەت"مان بۆ دەکات و باسی ئەوە دەکات دەوڵەت کەی و چۆن و بۆچی پەیدا بووە و لە هەر قۆناغێکی پەرەسەندنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا چ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا هاتووە و سەرەنجام چۆن دەپووکێتەوە.

ئەو دەمەی کە من خەریکی وەرگێڕانی ئەم نامیلکەیە بووم، ئەو ساڵە بوو کە زانکۆ تازە بۆ هەولێر گوێزرابووەوە و من لە بەشی ناوخۆیی قادر بلە لە پشتی قەراتێ بووم. ئەو جێگایەش لە کتێبخانەی گشتی هەولێرەوە هەر وا چەند سەد مەترێک دوور بوو، هەر کاتێک فرسەتم هەبووایە، نامیلکەکەی "لینین"م بەدزییەوە دەخستە نێو لیڤاکسی موحازەرەکانی زانکۆوە و بۆ ئەو کتێبخانەیە دەچووم و خەریکی وەرگێڕانی دەبووم. ئەو کتێبخانەیە تازە دروست کرابوو، زۆر خۆش و دڵگیر و تۆکمە و جوان بوو.

بەو جۆرە وەرگێڕانی ئەو نامیلکەیەم تەواو کرد و بۆ کەرکووکم بردەوە و دام بە کەرەم چیمەنی (بەختیار) بە خەتە خۆشەکەی و بە کاربۆن چەندین ژمارەی لەبەر گرتەوە و لەنێو ڕێکخستن بڵاومان کردەوە و لە کۆبوونەوەکاندا گفتوگۆ و جەدەلمان لەسەر دەکرد.

لە ساڵی ١٩٨٣دا بوو، لێکۆڵینەوەیەکم لەسەر مێژووی پارتی دیموکراتی کوردستان، دامەزراندن و زەمینەی هاتنەکایەوەی، قۆناغەکانی پەرەسەندنی، لەتبوون و شەڕی خوێناوی ...هتد. نووسییەوە. ئەم باسە بە دەست نووسیبوومەوە، نامیلکەیەکی ٤٠ لاپەڕەیی بە قەوارەی ئەی ٥ دەبوو، دانەیەکیشم بۆ ناوەندیی کۆمەڵە لێی نارد. لە پایزی ساڵی ١٩٨٣دا بوو، کۆبوونەوەیەکم لەگەڵ فەرەیدوون

عەبدولقادر لە گوندی "خەتێ"دا هەبوو، فەرەیدوون بە سەرسوورمانەوە پرسیاری ئەو نامیلکەیەی لێم کرد و وتی: ئەرێ ئەوە چییە؟!

"باوەگوڕگوڕ"، گۆڤاری لقی کەرکووکی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستانمان لە ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٤ لە شاری کەرکووک دەرئەکرد.

بیرۆکەی دەرکردنی ئەم گۆڤارە لەلایەن منەوە بوو، هەر خۆشم بابەتەکانم هەڵدەبژارد و بەڕێوەم دەبرد.

ئەم گۆڤارە سێ ژمارەمان لێ دەرکرد، ژمارەکانی یەکەم و دووەمی لەگەڵ "لوقمان"ی برام هەر بە دەست ئەماننووسییەوە و بە ڕۆنیۆی سەرەتایی ڕامان دەکێشا، وەلێ ژمارە سێیەمی لەلایەن دەستگای ڕاگەیاندنی مەڵبەندی چواری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە بالیسان چاپ کرا.

هەر لەو سەروبەندەدا بوو، نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد نامیلکەیەکی لێنینی بە ناوی، ئەرکەکانی ڕێکخراوەکانی لاوان لە عەرەبییەوە کرد بە کوردی و دواتریش لە شاخ چاپ کرا.

"کەموکووڕییەکانمان چین، وە چۆن چارەیان دەکەین"، لێکۆڵینەوەیەک بوو لەژێر ناوی نهێنیی "نەسرەوت"، بە قەوارەی ٢٨ لاپەڕەی ئەی ٦، لەمەڕ مێژووی بزووتنەوەی خوێندکارانی کوردستان و ئاستەنگەکانی بەردەمی و چۆنیەتی چارەسەرکردنی. ئەم نامیلکەیە لە ساڵی ١٩٨٤ لە چاپخانەی ئیبراهیم عەزۆ چاپ و پەخش کرا.[١٩٢]

---

١٩٢. بیبلیۆگرافیای کتێبی نهێنیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ١٩٧٥-١٩٩١، نەوزاد عەلی ئەحمەد، چاپخانەی دلێر، ل ١٣٣.

## چوون بۆ دیداری ئەسعەد

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا گوتوومە، لێبووردنە گشتییەکەی هاوینی ساڵی ١٩٨٢ ئەو هاوڕێیانەی ئێمەشی دەگرتەوە کە حوکمی ئیعدامیان بەسەردا درابوو، وەلێ ئەوە بوو تەنها هەر مواجەهەیان کرایەوە و چارەنووسیشیان هەتا ماوەیەکی زۆر بە هەڵواسراوی مایەوە. لەو ماوەیەدا چەندین جار من بۆ دیداری ئەسعەد چووم و پێکەوە دانیشتین و لە نزیکەوە قسەمان کرد.

یەکەمین جار هەر خۆم بە تەنها ڕۆییشتم، بۆ ئەوەی بوار هەبێت پێکەوە قسەی تایبەتی خۆمان بکەین.

لە کەرکووکەوە بەرەو مووسڵ بەڕێ کەوتم، ئەگەرچی گەلێک پەرۆشی دیداری ئەسعەد بووم، وەلێ گەلێک مات و دڵتەنگ بووم، ئاخر بۆ دیداری هاوڕێیەک دەچم، هەتا دوێنێ بۆ تێکۆشان لە پێناوی ئازادی و سەرفرازی ئارام و سرەوتی نەبوو، کەچی ئەمێستەکێ لەنێو قەفەسێکدا دانراوە و لە ژووری ئەودیوی خۆیەوە پەتی سێدارەی بۆ هەڵخراوە.

گەییشتمە شاری مووسڵ و بەو ناونیشانەی وەرم گرتبوو بەرەو زیندان بەڕێ کەوتم. هەتا نزیکتر دەبوومەوە دڵم زیاتر دەگوشرا و هاوشان لێدانی سەرتر دەچوو، هەناسەم سوار و سییەکانم ئامادەی وەرگرتنی هەوای دەرەوەیان نەبوو.

گەییشتمە بەردەمی زیندان، لە بەردەمی دەروازەکەی کۆمەڵێک لە خەڵکی، کەسوکار و هاوڕێی زیندانییان، بێتاقەت، مات و مەلوول و ڕەنگپەڕیو، ڕێک هەر وەکوو ئەوەی لە پرسەی ئازیزاندا بن، چاوەڕێی چوونە ژوورەوەیان بوو. چاوێکم بەنێویاندا گێڕا، دایکی ئەسعەدم کەوتە بەرچاو، دیار بوو ئەو بەر لە من خۆی گەیاندبووە ئەوێ. چوومە تەنیشتی و چاکوچۆنیم لەگەڵدا کرد، بە بینینی ئەو ئەوەندەی دیکە بێتاقەت بووم، ئاخر ئەو دۆخە بۆ دایک ئێجگار سەختە، جگەرگۆشەکەت هیوای ژیانت لە تەلبەندێکدا بێت و چاوەڕێی پەتی قەنارە بکات، تۆش لە بەرامبەریدا هیچ توانا و دەسەڵاتێکت نەبێت. بە تایبەتی بۆ دایکێک بڕوای بە بیر و ڕێگا و ڕێبازەکەت نەبێت.

لەو دەمەدا بە چرکەیەک و برووسکە ئاسا، تەواوی ڕابردووم وەکوو فیلمێک هاتەوە بەرچاو. لە چاوەکانی ئەو دایکەشدا هەموو ئەو قسانەم دەخوێندنەوە کە لە

کاتی کۆبوونەوەکانماندا هەڵی ئەکوتایە سەرمان و پێمانی دەکرد. لە چاوەکانیدا تەواوی ئەو تابلۆ و دیمەنانەم بەبێ ڕوتووش دەهاتنەوە بەرچاو کە چۆن خۆی ڕادەوەشاند و ڕووی لە ئەسعەد دەکرد، چۆن ئەسعەد لە بەردەم من شەرمەزار دەبوو و ڕەنگی ڕووی دەگۆڕا، چۆن منیش شەرمەزار دەبووم و دەکەوتمە ژێر پەستانێکی زۆرەوە.

بە هەر حاڵ ... لەڕێی تێکۆشاندا ئاستەنگەکان فرەن!

دوای تاوێک وێستان و چاوەڕوانی، دەروازە واڵا کرا. هەموو ئەوانەی لەم سووچ و لەو گوێچکە دوو دوو و سێ سێ، بەپێوە یان بەچیچکان مژوولی قسەوباس بوون، جووڵەیان تێ کەوت و خڕ هاتن. ڕیزمان بەست و ناسنامەکانمان بەدەستەوە گرت، یەک یەک چووینە بەرەوە. نۆرەی من هات و گەیشتمە بەردەمی پاسەوانەکە، سەیرێکی ناسنامەکەی کردم و پرسی:

بۆ لای کێ دەچیت؟

گوتم: ئەسعەد عەزیز سۆفی.

مۆرێکی نا بە دەستمەوە و ئاماژەی دا، بچمە ژوورەوە.

دوای چوونە ژوورەوە داڵانێک بوو، دوای چەند هەنگاوێک بە دەستی چەپ لات ئەدا، حەوشێک بوو، پاشان بە دەستی ڕاستدا حەوشێکی تر بوو کە دەرگای ژوورەکانی زیندانی کەوتبوونە سەر. زیندانییەکان هەر هەموو لەوێدا چاوەڕێی دیدار بوون. بەشی سێدارەی زیندانی مووسڵ لە سێ ژوور پێک دەهات، دوو ژووری ئەمسەر و ئەوسەری شوێنی نووستنی زیندانییەکان بوون، ژوورەکەی نێوەڕاست کرابوو بە چێشتخانە، کۆمەڵێک فلینەی گەورە گەورەی هەردەم پڕ لە سەهۆڵی تێدا بوو، بۆ پاراستنی ئەو خواردنانەی کە زیندانییەکان لەلایەن کەسوکاریانەوە لە ڕۆژانی دیدەنی بۆیان دەهێنان، بۆ ئەوەی تا دیدەنی داهاتوو بەشیان بکات. ئەو ژوورە ئاودەستێکی بچووکیشی تێدا بوو، وەکوو گەرماو بۆ خۆشۆردن بەکار دەهێنرا ...

بێجگە لەمانە، ژووری لەسێدارەدانیشی تێدا بوو، دەکەوتە دەستەچەپی ژوورە بچووکەکەوە، شەش ئەڵقە و پەتی سێدارە بە بنمیچەکەیەوە هەڵواسرابوون. دەرگای ژوورەکانی ئەمسەر و ئەوسەر، واتە ژوورە گەورەکە و بچووکەکە کە زیندانییەکان تیایدا دەخەوتن، شیشی ئەستوور بوون، نێوانی شیشەکان زۆر کەم بوون، نزیکەی

سێ بۆ چوار پەنجە دەبوون. ئەم دەرگایانە دەکەوتنە سەر ئەو حەوشەیەی کە زیندانییەکان چاوەڕێ بوون لەوێدا مواجەهەی کەسوکار و هاوڕێیانیان بکەن. ئەم حەوشەیە بە درێژایی ئەم ژوورانە بوو، پانییەکەی نزیکەی دوو مەتر و درێژییەکەی نزیکەی هەشت بۆ دە مەتر دەبوو، ڕۆژانە دەرگاکانی هەردوو ژوورەکە لە کاتژمێری هەشتی بەیانییەوە تا هەشتی ئێوارە دەکرانەوە، زیندانییەکان خواردنیان بۆ خۆیان ئامادە دەکرد، خۆیان دەشۆری، دەهاتنە دەرەوە، پیاسەیان دەکرد و خۆیان دەدایە بەر هەتاوەکە.[193]

دیقەتی هەموویانم دا، لەنێویاندا ئەسعەدم بەدی کرد و گەییشتمە لای، یەکتریمان لە ئامێز گرت و بەگەرمی ئەملا و ئەولای یەکتریمان ماچ کرد. ئەسعەد و باقی زیندانییانی دیکە بە هۆی ئەشکەنجەی زۆر و هەلومەرجی سەختی زیندان و بێخۆراکی و نەبینینی هەتاوەوە، لەڕ و لاواز و بێهێز و بێڕەنگ بوون.

لە کاتی باوەش بەیەکداکردندا ئەسعەد چرپاندی بەگوێمدا و یەکەمین قسەی ئەوە بوو: ئەزانی سالار لەسەر ناوی تۆ چەندەیان ئەشکەنجە کردووم؟! ناوەکەت بە مێشکمدا دەهات و دەچوو! لە دیدارێکی دیکە کە لەگەڵ حامید عەبدولا ڕەزا پێکەوە چووین، هەمان قسەی بە حامید و من گوتەوە.

بوار نەبوو پڕ بە دڵی خۆمان قسە بکەین، چونکە پاسەوانەکان بەنێوماندا دەهاتن و دەچوون، بەڵام جارجارە فرسەتمان دەبینی و دەنگوباسمان دەگۆڕییەوە.

من باسی ئەوەم بۆی کرد کە چۆن جارێکی تر خۆمان ڕێک خستووەتەوە، کۆمیتەمان دامەزراندووەتەوە، گەلێک لە هێڵە پچڕاوەکانمان لێک گرێداونەتەوە. باسی بارودۆخی کۆمەڵە و گەشەسەندنی هێزی چەکدار و جەماوەرییبوونەوەی خۆمانم بۆ کرد. ئەویش باسی خۆیانی کرد و گوتی، یەکێکمان نەبێت، ئەوانی دی گشت ورەمان بەرزە. پاشان وتی، هاوڕێیەک کە ناوی قادر سەی مستەفایە،ماڵیان لە فڵانە جێگایە، بەڵکوو بتوانیت پەیوەندی بۆ دروست بکەیتەوە. هەروەها وتی: ئەڵێن، کادرێک هاتووەتە ناوچەی جەباری، لەتەک خەڵکیدا بەرخورد و مامەڵەی خراپ و ناخۆشە، چۆنە ئێوە ئەوە قبووڵ دەکەن؟! وتم: کە چوومەوە بەدواداچوون بۆ ئەو بابەتە ئەکەم.

---

١٩٣. پلانی شکاندنی بەشی سێدارەی زیندانی موسڵ ١٩٨١، دەرسیم دیبەگەیی، ل ١٠.

ئەو قسـە و هەڵوێستانەی ئەسـعەد گشت لای مـن، نیشـانەی ئەوە بـوون کە ئەم ئینسـانە سـەرباری ئەوەی نۆرەی بـۆ مـەرگ گرتـووە، کەچی لەوێش هەر لە خەمـی خەڵک و ڕێکخراوەکەیەتی.

دوای ئەوەی وەختـی چـاوپێکەوتن تەواو بـوو، دەسـتمان لەملـی یەکتـری کـرد و بەجێم هێشت.لە کاتی هـاتنە دەرەوەمانـدا، دەبـوو مـۆرەکەی سـەر دەسـتمان پیشـانی پاسـەوانەکان بـدەین. عەلـی بـرای فـارووق عـومەر وەلـی مـۆرەکەی سـڕابووەوە، گێچەڵیان پێ کرد و ماوەیەک گلیان دایەوە، ئەوەش ئێمەی زۆر بێتاقەت کرد.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٣دا بوو، جارێکی دیکە لەگەڵ حەوێز مـحەمەد ئەمین بۆ دیـداری ئەسـعەد چـووم. زسـتانێکی ئێجگـار سـارد بـوو، شـەوەکەی لە مووسـڵ لە ئۆتێل ماینەوە، لە پەنایەکدا پەنجەرەیەک کرابووەوە و پێمـان نەزانیبوو، هەتـا ڕۆژی کردەوە ئێمە هەڵلەرزاین و خەو لە چاوانمـان نەکەوت. بـۆ بەیـانییەکەی بەو حـاڵەوە بـۆ دیـداری ئەسـعەد چـووین. وەختـی دیداریش ئێجگـار کەم بـوو، هەر وا ڕەنگە دە خولەکێک بووبێت، زۆر کەم پێکەوە بووین و بواری هیچ باسێکمان نەبوو.[١٩٤]

حەوێز خەڵکی شـارۆچکەی ڕانیە بـوو، لە زانکـۆ هـاوپۆلی ئەسـعەد و مـن بـوو، ئەویش ئەندامی کۆمەڵە بوو، وەلێ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی نـاوچەی خۆیـانەوە هەبوو، ئێستا لە وڵاتی کەنەدا دەژی.

جـارێکی دیـکە لە تەمـووزی سـاڵی ١٩٨٣دا، لەگەڵ حامیـد بـۆ دیـداری ئەسـعەد چوومەوە، پێم وابێت ئەم جارەیان ئاخر جاری من و دوا مواجەهەی ئەوانیش بوو.

ئەو جـارەی لەگەڵ حامیـد پێکەوە چـووین، ئەسـعەد جـارێکی دیـکە بەسـەرهاتی خۆی گێڕایەوە:

هەر لەدوای گرتنم و لە یەکەمین لێکۆڵینەوەدا، ڕاپۆرتێکیـان خسـتە بەردەسـتم و گوتیـان: ئەوە کلێشـەی نـاوی نهێنیـی ڕێکخسـتن و تـۆڕی پەیوەنـدییەکانتانە، ئێسـتا نـاوی تەواوەتـی ئەو کەسـانەمان پـێ بڵـێ کە پەیوەنـدییان بە تـۆوە هەیە و لەو کلێشەیەدا دەستنیشان کراون!

کلێشەکە بە مەرەکەبێکی سوور و بە دەستوخەتی عەلی مغاویر نووسرابوو، مـن بەباشی خەتەکەیم دەناسییەوە.

---

١٩٤. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز حەوێز محەمەد ئەمین.

من لەسەر ٩ شت ئەشکەنجە ئەکرام: ناوە نهێنییەکەم کە شێخ دارا بوو، ئەندامی کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە، ئامر مەفرەزەی یەکێک لە مەفرەزەکانی نێو شار، گرتنی دەمانچە و نارنجۆک و هێندێک بەیاننامە و کتێب لە ماڵماندا، ئاشکراکردنی ناوی تەواوەتی ئەو ناوە نهێنییانەی لە کلێشەکەدا دەرکەوتوون کە پەیوەندییان بە منەوە هەیە ...هتد.

هەموو جارێک ئەوەندە ئەشکەنجەیان ئەکردم، ئەمگوت: ئەوە ئیتر تەواو بووم، لە ژیاندا نەمام، لە هۆش خۆم دەچووم، بەلام پاش ماوەیەک لەناو هاوڕێکانمدا چاوم هەڵئەهێنایەوە، دەمبینی هەموو بەدەورمەوەن و ئاو بە دەموچاومدا دەکەن، بۆ ئەوەی بەهۆش خۆم بێمەوە.

یەکێک لەو ئەشکەنجانەی زۆر بە لامەوە سەخت و ناخۆش بوو: بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بە دەستەکانم و هەر لە پشتەوە لە ژوورێکی یەک مەتر بە یەک مەتر هەڵیان واسیم، بە جۆرێک پەنجەکانی پێم گەیشتبوونە نێو گیراوەیەکی شل کە کارەبای لەسەر بوو.

ئەم شێوە ئەشکەنجەیە وای لێ کردم، یەکێک لە شانەکانم بۆ ماوەی سێ مانگ بەباشی کار نەکات، هەڵبەتە هەتا ئێستاش هەر وەکوو جاران کار ناکات.[١٩٥]

هەر لەو دیدارەدا ئەسعەد گێڕایەوە: ئیعتیرافم لە سەر دوو کەس لە هاوڕێکانم کردووە، ئەگەر ڕۆژێک هات و لە زیندان ئازاد کرام، کۆمەڵە لەسەر ئەوە ڕەمیم نەکات، ئەوا من بە ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕی نازانم.

بێگومان ئەسعەد یەکێک بووە لەو کەسانەی لەسەر زۆر خاڵی هەستیار لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کردووە، بۆیە بەپێی قسەی هاوڕێکانی زیندانی، ئەشکەنجەیەکی ئێجگار سەخت کراوە.

ئەوەی شایانی گوتنە، ئەسعەد لە سەرەتادا هێندێک شتی درکاندووە، وەلێ دوای ئەوە لێیان پەشیمان بووەتەوە و نکوڵی لێ کردوون. خۆ ئەگەر بهاتبایە و ئیعتیرافی لەسەر ئەو کەسانەی کە دەیانیناسی و ئەو زانیارییانەی کە لەلای هەبوون بکردایە، ئەوا کارەساتێکی گەورەتر ڕووی ئەدا و ڕێکخستنەکانیش گسکیان لێ دەدرا.

ئەوەندەی من ئاگادار بم، ئەسعەد خەڵکێکی ئێجگار زۆری هێنابووە نێو ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە و خەڵکانێکی زۆری دیکەیشی دەناسی کە بۆ مێژوو دەیڵێم،

---

١٩٥. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز حامید عەبدوڵا ڕەزا.

هـیچ ئیعتیرافێکـی لەسـەریان نەکـرد، ئەمـانە هێنـدێکن لەوان: ئـازاد سـلێمان، ئـازاد غەریـب (سـیروان)، ئەبـوبەکر حەسـەن، ئەبـوبەکر سـەی عـومەر، ئەنـوەر عـومەر شەریف (حاجی ئەنوەر)، تەحسین تاهیر جەبار، حامید عەبدوڵا ڕەزا، زەکی ئەمـین، سالار ڕەشید، قادر سەی مستەفا (قادر مستەفا قادر ئەمین)، مەلا خەلیل (خەلیل عادیل سابیر)، یوسف حازم محەمەد ...

لوقمان گێڕایەوە: جارێکیان بۆ دیداری ئەسعەد چووم، لەنێو قسەکانماندا هەواڵی دروستکردنەوەی "کۆمیتەی ئـاگر"م پێـی ڕاگەیانـد، وتـم: بەڵام بەنـاوی "ڕێکخـراوی کەرکووک"ەوە. ئەو ئەوەی پێ ناخۆش بوو، وتی: بۆچی ناوەکەیتان گۆڕیوە؟[196]

ئەسعەد لەو ماوەیەدا، لە ڕێگەی دایکییەوە شـەش حەوت نـامە و پـارچە خـامێکی چنراوی بۆم نـارد، پـارچە خـامەکە لەسـەری نووسرابوو: "ئەی کرێکـاران و گەلانـی زۆرلێکراوی دنیا یەکگرن!"، ئەسعەد بە دەستی خۆی چنیبووی.

ئەو نامانە بە قەڵەمی ڕەساس و لەسەر کاغەزی نێو پاکەتی جگەرە زۆر بەنهێنـی نووسیبوویانی. یەک دانە لەو نامانە هی فاررووق عومەر وەلی (فارووقە قەمبوور)[197] بوو، باقییەکەی هیی خۆی بوو.

نـامەکەی فـارووق بریتـی بـوو لە ڕوونکـردنەوەی کۆمەڵێـک دەسـتەواژەی فەلسـەفی-ئـابووری-سیاسـی. ئەوانەی ئەسـعەدیش بریتـی بـوون لە: شـیکردنەوەی کۆمەڵێک بـاس و بـابەتی فەلسـەفی-ئـابووری-سیاسـی کە لە کـاتی خۆیـدا و لەنێـو کۆبوونەوەکانماندا قسەمان لەسەریان دەکرد.

لوقمـان ئەو نامـانەی گشـت جـارێکی تـر بە دەسـتوخەتە خۆشـەکەی نووسـینەوە، نوسخە ئەسڵییەکانمان بۆ سەرکردایەتی ڕەوانە کرد و ئەوانەی لەبەری گرتمـاننەوە، لەلای خۆمان هەڵمان گرتن، بەڵام بە هۆی شاردنەوە و ڕاکردنەوە، ئەوانیش فەوتان و لەبەین چوون.

---

١٩٦. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز لوقمان عەزیز ڕەشید.

١٩٧. لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ بەڕێـز عەبـدولخالق نـاجی عەبـاس (هیـوا، بیبـی) گێـڕایەوە: "ڕۆژێکیـان نـزیکەی سەعات و نیویک لەگەڵ فارووق پێکەوە بووین و پیاسەمان کرد. ئەو ماوەیەک بوو، بەنیاز بوو من موفاتەحە بکات و منیش بەنیاز بووم ئەو موفاتەحە بکەم، بەڵام کەسمان بە کەسمان نەدەزانی. لەو ڕۆژەدا کە ئەو ئەیویسـت بە مـن بڵـێ، مـن بەوم وت! خێسـەیەکی لـێم کـرد و وتـی: بـڕۆ لـێم دوور کەوە، ئەوە دزاودز کەوتووین!

# قادر سەی مستەفا (قادر مستەفا قادر)

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا گێڕامەوە، لە یەکەمین دیداری نێوانماندا، ئەسعەد ناوی قادری پێم دا کە پەیوەندی بۆ دروست بکەینەوە. ئەو دەمە قادر و من هاوڕێی یەکتری نەبووین، ڕەنگبێ هەر وا دووربەدوور یەکتریمان ناسیبێت.

کاتێک بۆ کەرکووک گەڕامەوە، ماڵی "قادر"م دۆزییەوە، لە گەڕەکی "جمهووری" بوو، کە یەکێک بوو لەو گەڕەکە بچکۆلە زۆرانەی لەنێو کۆشی گەڕەکی گەورە و بەرینی "ئیمام قاسم"دا بوو. ئەو گەڕەکە زۆر لە ئێمەوە دوور نەبوو، کەوتبووە سەر ئەو ڕێگایەی کە لە گەڕەکی یادگارەوە بەنێو گۆڕستانی "شێخ محێدین"دا بەرەو حەسیرەکە دەچێت و هەر وا شانی بە شانی گۆڕستانەکەوە بوو، خانووەکانیشی تێکرا، خانووی کۆم و لاری هەژارانە بوو، تەنانەت هێندێکیان هەر بە قوڕ دروست کرابوون.

لەگەڵ قادر بەدەم قسە و هەنگاوی نەرم و ئارامی دوای نیشتنەوەی تۆفانی شالاوی گرتنەکانی کۆمیتەی ئاگر بەرەو دوو باخچە خنجیلانەکەی گەڕەکی عاشوور بەڕێ کەوتین، لەنێو باخچەکەدا ڕاسپاردەکەی ئەسعەدم بەگوێیدا دا، بەڵام قادر لە وەڵامدا گوتی: من پەیوەندیم کردووەتەوە! ئیدی من هیچی دیکەم لەگەڵدا نەگوت، چونکە بۆ من و بۆ کاری ژێرزەمینی ئەوەندە کافی بوو.

هەنووکە و پاش ئەوەی چەند دەیە بەسەر ئەو ڕووداوەدا گوزەرا، ئەوا ئێستا لەگەڵ قادر دووبارە چووینەوە سەر ئەو باسە و باقی چیرۆکەکە تەواو دەکەین.

قادری سەی مستەفا (توانا) لەلایەن خودی ئەسعەد عەزیز سۆفییەوە بۆ کۆمەڵە موفاتەحە کراوە و لە دەورانی کۆمیتەی ئاگردا، لە شانەیەکی سێ کەسیدا بووە، کە لە خۆی و جەواد بەهائەدین عەلی پێک هاتووە و ئەسعەد بەرپرسی شانەکە بووە. لە هەمان کاتدا قادر کۆمەڵێک پەیوەندیی دیکەی هەبووە، وەکوو خۆی دەیگێڕێتەوە بەم جۆرە بووە:

شانەیەک لە گوندی 'تەپەلوو'ی سەر بە ناحییەی لەیلان کە پێک هاتبوو لە: شەهید محەمەد نازم (چیا)، ڕزگار سەعید و چەند برادەرێکی تر.

ڕەمەزان محەمەد ساڵح (بەخە بچکۆل)،[198] ئەحمەد شێخ حەسەن پەڵکانەیی قەرەحەسەن کە لە ئەنفالەکاندا تێدا چوو.

ئەوەی شایانی باسە، هەر بە هۆی بەختیار و 'محەمەد نازم'ەوە، گوندی تەپەلوو بووبووە قەڵای پێشمەرگەکانی کەرتی چواری جەباری، بە شایەدی خەڵکی ناوچەکە.

خدر خورشید (شوان) کە خەڵکی گوندی 'جەوەجەوە'ی سەر بە ناحییەی شوان بوو، لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە.

دوای ئەوەی ئەسعەد ئەگیرێ، قادر و جەواد بۆ ماوەیەک دەچنە دەرەوەی کەرکووک و خۆیان دەشارنەوە، پاش ئەوەی شالاوی گرتنەکان دەنیشێتەوە، دەگەڕێنەوە و ژیانی ئاسایی خۆیان دەست پێ دەکەنەوە و دەچنەوە بەر خوێندنەکەیان. پاشان جەواد لە پەیمانگای تەکنەلۆجیی کەرکووک دەگیرێت، وا دیارە چاوەڕێی گەڕانەوەی بوونە.

ئەوەی شایانی باسە، قادر ئاشکرا نابێت و ئەسعەد هیچ زانیارییەک سەبارەت بە قادر و تۆڕی پەیوەندییەکانی نادرکێنێت. هەروەها 'جەواد'یش هیچ نهێنییەک لەسەر قادر ئاشکرا ناکات و سەرەنجام خۆی یەکێک دەبێت لە بێسەروشوێنکراوەکان.

برایەکی جەواد دەیگێڕێتەوە: 'سۆراخێکی زۆری جەوادمان کرد، هیچ هەواڵێکیمان چنگ نەکەوت. ڕۆژێکیان ئەمنەکان لە دەرگایان دا و پێیان وتین کە براکەمان گولەباران کراوە و دەبێ پارەی ئەو گولانەی پێوەی نراوە، بۆ حکوومەتی بگێڕینەوە'.[199]

بەو جۆرە ئەم خەتە بۆ ماوەی چەند مانگێک دەپچڕێتەوە و پاشان لە ڕێگەی مامۆستا مارفەوە پەیوەندی بە کەرتی شەهید سیروانەوە دەکات، کە ئەو دەمە

---

١٩٨. ڕەمەزان محەمەد ساڵح (بەخە بچکۆل)، لە ساڵی ١٩٥٧ لە گەڕەکی ئازادیی شاری کەرکووک لە دایک بووە. دەورانێک ڕابەر سیاسیی کەرتی چواری جەباری و دواتریش ئامرمەفرەزە و جێگری مامە ڕیشە بووە. لە ڕێکەوتی ١٩٨٧/٤/١٤ لە داستانی ڕزگاری گیانی بەخشی.

١٩٩. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز فەرمان ئەمین ئەحمەد (ئەمین گۆگجەیی)، هاوڕێی جەواد.

مامۆستا مارف بەرپرسی کەرتەکە دەبێت و پەیوەندیی بە لادێ و بە تەهای مەلا وەهابەوە دەبێت.

هەر لەو دەمەدا مامۆستا مارف ئەچێتە دەرەوە و لە ناوچەی هەمەوەند جێگیر دەبێت و پەیوەندی بەم کەرتەوە نامێنێت. کۆمیتەی "کەرتی شەهید سیروان"یش کە تا ئەو دەمە پێک هاتبوو لە: ئاوات ناسیح حەبیب، مامۆستا مارف، محەمەد ئەحمەد رەحمان، ئارایشتێکی نوێی پێ دەدەنەوە و بەو پێیە قادری سەی مستەفا دەبێتە ئەندامی کەرت و "محەمەد ئەحمەد رەحمان" دەبێتە بەرپرسی کەرتەکە.

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٢دا قادر خوێندنی ئامادەیی پیشەسازی تەواو دەکات و ئیتر دەبێت چەند مانگێک دوای ئەوە بۆ خزمەتی سەربازی و بۆ دەورەی ئەفسەری بچێت، بەڵام ئەو سەربازی ناکات و لە کۆتایی ئەو ساڵەدا شار بەجێ دەهێڵێت و دەچێتە دەرەوە لە گوندی پەڵکانە دادەنیشێت.

قادر پێش ئەوەی بچێتە دەرەوە، پەیوندییەکانی خۆی کە بریتی بوون لە: جەلال حەمید ڕۆستەم، خدر خورشید، عەلی عومەر وەلی، محەمەد نازم ... بۆ لای کەریم حەمید ڕەسوول دەگوێزێتەوە.

ئەوەی شایانی باسە، جەلال حەمید ڕۆستەم (شۆڕش) و عەلی عومەر وەلی لەو ئەندامانە بوون کە پێشتر پەیوەندییان بە "فاڕووق عومەر وەلی"یەوە هەبوو، فاڕووق ئیعتیرافیان لەسەر ناکات و دواتر قادر پەیوەندییان بۆ دروست دەکاتەوە.

دوو ئەندامی دیکە کە دوو فەرمانبەر بوون و هەر پەیوەندییان بە فاڕووقەوە هەبوو، قادر دەچێتە لایان بۆ ئەوەی پەیوەندییان بۆ دروست بکاتەوە، بەڵام ئەوان ئامادەی کارکردن نابن و لە ڕێکخستن دوور دەکەونەوە.

کەریم حەمید ڕەسوول کە لەو دەورانەدا پەیوەندی بە قادرەوە دەبێت، ساڵانی زووتر پەیوەندی بە محەمەد ئەحمەد ڕەحمانەوە هەبووە.

دوای ئەوەی قادر شار بەجێ دەهێڵێت و پەیوەندی بە کەرتی شەهید سیروانەوە نامێنێت، کەریم بۆ کۆمیتەی کەرتەکە (کەرتی شەهید سیروان) ئیزافە دەکرێت.

# محەمەد تاهیر سالح (مامۆستا محەمەد)

هەر لە هەمان ساڵی خوێندن (١٩٨١-١٩٨٢)دا بوو، "محەمەد تاهیر"م ناسی. محەمەد خەڵکی گوندی "تەرجل"ی سەر بە ناحیەی لەیلان بوو، ئەو ساڵە لە زانکۆی سەلاحەدین و لە کۆلێج و بەشەکەی من وەرگیرا.

لەگەڵ محەمەد زۆر زوو بووینە هاوڕێ و جێ متمانەی یەکتری و وەک ئەوە وا بوو لەمێژبێ یەکدی بناسین. محەمەد کەسێکی سادە و خاکی، نەترس و بە حەماس بوو، هەر بۆیە زۆر زوو لەنێو ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی کۆمەڵە و یەکێتیی خوێندکاراندا جێی خۆی کردەوە و لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٢دا بوو بە ئەندام.

دوای ئەوەی محەمەد بووە ئەندامی کۆمەڵە و یەکێتیی خوێندکاران، من داوام لێ کرد کە ناوێکی نهێنی بۆخۆی دابنێ. لە وەڵامدا وتی: من ناوی جووتیار بۆخۆم دائەنێم. منیش وتم: ناوێکی دیکە دابنێ! وتی: بۆچی، من ئەو ناوەم پێ خۆشە؟! وتم: دە ئاخر نابێت، ئەوە ناوی نهێنی منە! پاشان ناوی نهێنیی "شاخەوان"ی بۆ خۆی دانا. لەو ساڵانەدا بوو، نووسراوێکمان هەبوو، شیکردنەوەیەکی چینایەتیی کۆمەڵگای کوردستان، لە شێوەی ئەو شیکردنەوە چینایەتییەی ماو تسیتۆنگ بۆ کۆمەڵگای چینی کردبوو، نووسراوەکە هەر بە دەست نووسرابووەوە و ناوی نووسەرەکەیشی لەسەر نەبوو. ئەم نووسینەم دایە لای محەمەد تاوەکوو بیخوێنێتەوە و پاشان لە دانیشتنی داهاتوودا موناقەشەی بکەین. بۆ جاری دوای ئەوە، نووسینەکەی بۆم هێنایەوە و کاسێتێکیشی پێم دا و وتی، ئەوە تۆماریشم کردووە! دوای ئەوە کە کاسێتەکەم لێدا، بینیم زۆر بەجوانی و بەڕوونی تۆماری کردووە و دەکرا لەبەری بگرینەوە و دەستاودەستی پێ بکەین و بۆ هاوڕێ و هەوادارانێکیش کە خوێندەوارییان نییە، کارێکی گونجاو و دەسپێشکەرییەکی ناوازە بوو.محەمەد کەسێکی هەڵسووڕاو بوو، کاریگەری بەسەر گوندەکەی خۆیانەوە هەبوو، لەو ماوەیەدا چەند کەسێکی هێنایە ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە:

زێدان کەریم ڕەحیم کە دەکاتە ئامۆزای مامەڕیشە بۆ کۆمەڵە و شێرزاد محەمەد محێدین و ئەنیسە محەمەد ئەمین بۆ یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان.

ئێمە لەو دەورانەدا نەخشەی ئەوەمان دارشتبوو، لە گوند و شارەدێ و شارۆچکەکانی دەوروبەری کەرکووکیش پەل بهاوین و بنکەی نهێنی و

ڕێکخستنمان هەبێت، هەر بۆیە دوای ئەوە محەمەد لە کەسێکی جێمتمانەی خۆی بە نێوی ڕەمەزان عەلی خورشید نزیک دەبێتەوە. ڕەمەزان باسی ئەوەی بۆ دەکات کە خۆی و چەند کەسێکی دیکە لە ئاوایی، خەتێکی ڕێکخستنی کۆمەڵەن و ژمارەیان شەش کەسە بەم ناوانەوە: سیروان شەفیق، محەمەد شوکر زەینەڵ، شێرزاد محەمەد محێدین (هەر وەکوو پێشتر ئامـاژەم پێی کرد، ئەم هاوڕێیە لە یەکێتیی خوێندکاران پەیوەندی بە محەمەد خۆیەوە هەبوو)، ڕەئووف غائیب، ئەحمەد ڕەزا.

لەدوای ئەوەوە بڕیارمان دا، لەو خەتە دوور بکەوینەوە و ئاڵوگۆڕ بەسەر پەیوندییەکەیاندا نەهێنێت و پەیوەندیی خۆیشی لەلای ئەوان ئاشکرا نەکات، چونکە ئەوانە پەیوەندییەکانی خۆیان هەر وا بەو سووکییە ئاشکرا بکەن، سەرەنجام ئێمەش لەگەڵ خۆیاندا تووشی چۆرتم و کێشە و قۆرتێک دەکەن.

# شلێر عەزیز ڕەشید (شلێر ڕەشید)

شلێر خوشکمە، وەکوو بێتەوە بیرم لە ساڵی ١٩٨٣ بۆ کۆمەڵە و یەکێتیی خوێندکاران موفاتەحەم کرد. شلێر کەسێکی نهێنیپارێز و بەدیسیپلین بوو، هەوڵی خوێندنەوە و خۆپەروەردەکردنی هەبوو، لە یەکێتیی خوێندکاراندا بەرپرسی هێڵێکی ڕێکخستن بوو کە لە سێ شانەی تاکەسی پێک هاتبوو بەناوەکانی: بەیان جەبار ئەحمەد، بەیان کەریم محەمەد (هاوسەری لوقمانی برامە)، سەنا عەبدولستار کە هەر لەلایەن خودی خۆیەوە ڕێک خرابوون.

شلێر ساڵانێکی زۆرە لە وڵاتی کەنەدا ئەژێت و لەگەڵ نەوزاد مەدحەت (گۆران عەبدوڵا)ی هاوسەری سایتی دەنگەکان بەڕێوە دەبات. شلێر لە بواری وەرگێڕانیشدا کار دەکات و هەتا هەنووکە چەندین کتێبی شیعر و ڕۆمانی لە زمانی ئینگلیزییەوە کردووە بە کوردی.

هەروەها لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا، چەند بەشێکی کتێبی "سەرمایە"ی مارکسیان لە زمانی ئینگلیزییەوە کردە کوردی.

## لوقمان سدیق ڕەسووڵ

لوقمان خەڵکی شاری سلێمانی بوو، هەردووکمان پێکەوە لە کۆلێجی زانستەکان بووین، وەلێ ئەو لە بەشی کیمیا بوو، هاوڕێیەتیمان نزیک و جێگە متمانەی یەکدی بووین.

ڕۆژێکیان کە پێم وابێت لە ساڵی ١٩٨٣دا بوو، بۆ یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان موفاتەحەم کرد، ئامادەیی خۆی دەربڕی و باسی ئەوەی کرد کە چۆن پەیوەندیی لەگەڵ بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستاندا هەیە و بەرپرسی خەتێکی ڕێکخستنیشە و دەتوانێت بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ ئەوانیشدا قسە بکات. ئەوانیش بریتی بوون لە: سیروان مەحموود، عەلی مەحموود محەمەد (عەلی سیاسی)، نیشتمان سەعدوون، یاسین حوسێن هەمزە.

بەو شێوەیە ئەم پێنج ئەندامەی بزووتنەوە بوونە ئەندامی یەکێتیی خوێندکارانیش کە هەر وەکوو پێشتر باسم کردووە، ئەو دەمە من بەرپرسی لقی هەولێر و زانکۆی سەلاحەدین بووم.

ئەوەی شایانی گوتنە، بۆ من ئەوە یەکەمین جار بوو، ببینم ئەندامانی بزووتنەوە، بێنە ڕیزی یەکێتیی خوێندکارانەوە، ئەوەی لەوەوبەر من بینیبووم، تەنها کەسانێک بوون کە هەر لە یەکێتیی خوێندکاراندا بوونە، وە یان بەزۆری کۆمەڵە بوونە و لەنێو خوێندکارانیش کاریان کردووە.

ئەبێ لێرەدا ئەو ڕاستییە بڵێم، ئەوانەی ئەندامی یەکێتیی خوێندکاران بوونە، هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ئەندامانی کۆمەڵەدا نەبووە، لە هیچ ڕوویەکەوە، واتە: باسوخواسەکانی نێو کۆبوونەوەکان و ئەدەبیاتەکان هەمان شت بوون. من بۆخۆم زۆر لەو حاڵەتە بێزار بووم و یەکێتیی خوێندکارانم هەر بە زیادە دەزانی و ئەرکێکی سەربار و لەخۆڕایی بوو. بە تایبەتی زۆرێک لە هاوڕێکان لە یەک کاتدا سەربە خوێندکاران و کۆمەڵە بوون. بۆیە بۆ من زۆر وەڕسکەر و نابەجێ بوو. بەڕای من دەبوو هەر کۆمەڵە هەبووایە و یەکێتیی خوێندکاران نەبووایە.

# ئەو ڕۆژەی ئەوان لە سێدارە دران

پێم وابێت، مواجەهەی هاوڕێیانی زیندانی بەشی سێدارەی مووسڵ لەدوای ئەو چوونەی ئێمە لە تەمووزی ساڵی ١٩٨٣ کۆتایی پێ هات. دوای چەند مانگێک لەدوای ئەوە، بەپەلە و بەبێ ئاگادارکردنەوەی کەسوکارەکانیان، ڕەوانەی زیندانی ئەبووغرێب دەکرێن و لەوێ لە سێدارە دەدرێن ...

وەلێ چیرۆکی لەسێدارەدانەکەیان چۆن بوو؟

خالید محەمەد ئەمین (عەبدولخالق) بۆمان دەگێڕێتەوە:

"دەمەو ئێوارەی ڕێکەوتی ١٩٨٣/١٠/٢٥ بوو، ٩ هاوڕێ لەو ١٠ هاوڕێیەی ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر کە حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ دەرکرابوو، لە زیندانی مووسڵەوە بۆ لای ئێمە، بۆ زیندانی ئەبووغرێب هێنران، تەنها هاوڕێ "ئەسعەد"یان لەگەڵدا نەبوو. ئەم هاوڕێیانەیان بەسەر هۆدەکاندا دابەش کرد، هاوڕێ عەبدولقادر بەکر قادر بەر هۆدەکەی من کەوت، ٣ شەو پێکەوە بووین. گەلێک قسەمان کرد و گەلێک پرسیارم ئاراستەی کرد. یەکێک لەو پرسیارانەی کە لێم کرد: ئەوە چۆنە وا ئێوەیان بۆ ئێرە گواستەوە؟!

عەبدولقادر: پێیان وتووین، بۆ دادگا ئەتانبەین، پاشان ئازادتان ئەکەین.

دوای ئەوەی سێ شەو پێکەوە بووین، لە نیوەی شەودا نیو سەعاتێک بوو چووبووینە نێو ڕێکەوتی ١٩٨٣/١٠/٢٨وە، جەلادەکان هاتن دەستیان کردە خوێندنەوەی ناوی ئەو هاوڕێیانە و بردیانن. ئێمەیش بەوردی چاودێریی دەرگای چوونە دەرەوەمان ئەکرد، وەلێ ئەوان هەر دیار نەبوون! لەپاش دوو سەعاتێک بۆمان دەرکەوت کە ئیعدام کراون. ئیدی خەم و پەژارە و ماتەمینی تەواوی هۆڵەکەی داگرت.

لە هەمان ڕۆژدا و لە سەعات یەکی دوانیوەڕۆ، کۆمەڵێکی دیکەی زیندانییان هەر لە مووسڵەوە بۆ لای ئێمە هێنا و یەکسەر بۆ هۆڵی تەنفیزیان بردن و لە سێدارەیان دان. دواتر بۆمان دەرکەوت، هاوڕێ ئەسعەد لەنێو ئەوانەدا بووە.

لێرەدا دەمەوێت ئاماژە بە دوو خاڵ بکەم:

یەکەم: ئەو هاوڕێیانە حوکمی ئیعدامیان لەسەر نەمابوو، بەڵام دەستگا ئەمنییەکانی شاری کەرکووک پێداگرییان کردبوو کە ئەمانە نابێت ئازاد بکرێن.

دووەم: لە وەفاتنامەی ئەم هاوڕێیانەدا نووسراوە، لە ڕێکەوتی ١٩٨٣/١٠/١٨دا ئیعدام کراون، وەلێ ئەوە ڕاست نییە و تەنها لەبەر ئەوە بووە کە نەڵێن لە کاتی دانوستانی نێوان حکوومەت و یەکێتیی نیشتمانیدا ئیعدام کراون.[٢٠٠]

٢٠٠. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز خالید محەمەد ئەمین (عەبدولخالق)، یەکێک لە زیندانییەکانی بەشی سێدارە لە زیندانی ئەبووغرێب.

# بارێك دەرمان بۆ تیپی ٢١

ساڵی ١٩٨٣ بوو، تیپی ٢١ی کەرکووک بەردەوام لە شەڕدا بوو، شەهید و بریندااریان زۆر بوو، زۆر پێویستییان بە داودەرمان بوو، داوایان لە ئێمە (ڕێکخراوی کەرکووک) کرد، بەڵکوو مشووری هەندێک دەرمانیان بۆ بخۆین. منیش ئەو دەمە پەیوەندی نزیکم لەگەڵ موحسین ئیبراهیم حەسەن (دکتۆر موحسین) و بەبۆنەی ئەویشەوە لەگەڵ 'عارف ڕوشدی'دا[٢٠١] هەبوو. ئەم دووانە لە کلینیکێک لە قوشتەپە یاریدەدەری پزیشک بوون، چووم بۆ لایان و وەزعەکەم بۆ باس کردن. ئامادەییان دەربڕی و وتیان، باشە بەسەر چاو، هەر شتێک بۆ ئەوان پێویست بێت، ئێمە بۆت دادەنێین و هەر کاتێک ئامادەمان کرد، ئەتوانن بێن ببیەن.

ئەوان دیار بوو خۆیان دەیانزانی چ جۆرە دەوا و دەرمانێک بۆ دەرەوە و بۆ پێشمەرگە پێویستە، بۆیە بارێکی گەورەیان لە دەرزیی پرۆکاین پەنسیلین و ئەسپیجیک، کەپسوول، حەبی پاراسیتۆڵ، دیتۆڵ و شاش و لەفاف ... ئامادە کرد و منیان لێ ئاگادار کردەوە، تاوەکوو بیگوێزینەوە.

ئەو دەمە تەیب عەزەدین سادق (تەیب تەلانی) بەرپرسی هێنان و بردنی نامە و بڵاوکراوە و ئیشوکاری بەریدی ڕێکخراوی کەرکووک بوو، پەیوەندی بە 'لوقمان'ی برامەوە هەبوو، بۆیە لەگەڵ لوقمان قسەم کرد و ناونیشان و وشەی نهێنیم پێی دا، تاوەکوو بیداتە تەیب و بچێت ئەو بارە دەرمانە لە قوشتەپە هەڵبگرێ و بۆ ناوچەی تیپی ٢١ی ببات.تەیب کەسێکی زۆر ئازا و بەجەرگ بوو، ترس لە قەلبیدا نەبوو، قەمەرەیەکی بیجۆی تاکسی هەبوو، لە کاتی خۆیدا دەچێتە قوشتەپە، بارە دەرمانەکە لە موحسین و عارف وەردەگرێت و هەر هەمووی لەنێو ئۆتۆمبیلەکەی و لەژێر کوشنەکان دەشارێتەوە و بەو هەموو بازگە زۆر سەختانەدا دەیهێنێتە ناو کەرکووک و پاشان بۆ گوندی چالاوی نێو شوان بۆ ماڵی مستەفا چالاوی دەبات.

دەرکردنی دەرمان لە فەرمانگەی حکوومی و ناردنی بۆ پێشمەرگە لەو زەمانەدا، یەکێک بوو لە گوناهە هەرە گەورەکان و لە کارە زۆر ترسناکەکان.

ئەو دەوا و دەرمانانە لەو دەمەدا بۆ تیپی ٢١ی کەرکووک، پێویستییەکی حەیاتی و گەورەترین سەروەت بوون.

---

٢٠١. عارف ڕوشدی، ماوەیەک ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ئێستا ڕاوێژکاری مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستانە.

# کێشەی محەمەد ئەحمەد ڕەحمان

هەر وەکوو پێشووتر باسم کردووە، لە مانگی ٨ی ساڵی ١٩٨٢دا، کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵە لە خڕی ناوزەنگ بەسترا و من نەچووم.

ئێمە وەکوو ڕێکخراوی کەرکووک بە شەش ئەندام بەشداریمان کرد، محەمەد ئەحمەد ڕەحمان یەکێک بوو لەوان.

محەمەد لە کۆنفرانس هاوڕێیەکی دەورانی تەلەبایەتی خۆی بەناوی "عادیل نامیق"ەوە دەبینێ. عادیل لەو دەمەدا پێشمەرگە دەبێت و لە بەشی خزمەتگوزاری کۆنفرانس کار دەکات. سەرەنجام لەوێ لەیەک ئاشکرا دەبن و پێکەوە قسە ئەکەن.

محەمەد بەم جۆرە چیرۆکەکەی بۆ من گێڕایەوە:

ڕۆژێکیان دوای ئەوەی بەرنامەی ئەو ڕۆژەی کۆنفرانس تەواو دەبێت، محەمەد لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی کە یەکتری دەناسن و پێکەوە بۆ کۆنفرانس هاتوون، بۆ پشوودان و حەوانەوە دەچنە چادرەکەی خۆیانەوە، دنیا تاریک دادێت و ڕووپۆشەکانیان دادەکەن، لە پڕێکدا عادیل نامیق بە چرایەکەوە خۆی دەکاتە نێو چادرەکەیانەوە و محەمەد دەناسێتەوە ...

بەڵام ئاوات ناسیح حەبیب کە لەگەڵ محەمەد پێکەوە بۆ کۆنفرانس چوونە، بە جۆرێکی دیکە ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە:

"ئەو ڕۆژانە عادیل نامیق لە گرووپی خزمەتگوزاریی کۆنفرانس وەکوو چێشتلێنان و دابەشکردنی کاری دەکرد. یەکەم جار کە محەمەد ئەوی بینی، زۆر پێی حەساس بوو و وتی: ئەوە لە زانکۆ لەگەڵماندا بوو، ڕەنگە بمناسێتەوە! بەڵام دواتر هەستم دەکرد، لە ڕووی فزوولییەوە و شانازیکردن بەوەی ئەندامی کۆنفرانسە، پێی خۆشە بە بەهانەیەک لەگەڵ عادیل لەیەک ئاشکرا بن و وەکوو هاوڕێیەکی زانکۆ لەو بۆنە گرنگە (کۆنفرانس)دا. سەرەنجام ئێوارانێک بینیم لەسەر جۆگە ئاوێک کە بەوێدا تێدەپەڕی، دانیشتوون و پێکەوە قسە دەکەن! دوای ئەوە

پرسیارم لە محەمەد کردەوە، وتی: ئەو منی ناسیبووەوە، ئیتر خۆشاردنەوە فایدەی نەبوو.)[٢٠٢]

من پێم وایە ئەم چیرۆکەی ئاوات ڕاستی مەسەلەکە بێت و ئەشێ محەمەد پێی خۆش نەبووبێت ڕاستی ڕووداوەکە بۆ من بگێڕێتەوە و هەستی بەوە کردووە، ئەوە کارێکی هەڵەیە، هەر وەکوو دواتریش دەرکەوت و زەربەی لێ دا.

دوای ٨-٩ مانگێک عادیل دێتەوە و خۆی ڕادەستی حکوومەت دەکاتەوە. محەمەد کە بەوە دەزانێت، تووشی ترس و دڵەڕاوکێ دەبێت. هەر لەو ڕۆژانەدا بوو محەمەد هات بۆ ماڵمان و باسی ئەو کێشەیەی خۆی کرد. منیش پێم گوت، وا چاکە ماوەیەک خۆت پەنا بدەیت و خۆت بشاریتەوە، تا شتێکمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە. هەروەها پێشم گوت، ئەگەر ئەتەوێت من هەوڵ ئەدەم، شوێنێکیشت بۆ پەیدا بکەم، ئەو ماوەیە خۆتی تێدا ئیختیفا بکەیت، ئەویش ئەم پێشنیارەی منی پێ باش بوو.

دوای ئەوە بۆ لای ئامۆزایەکی دایکم چووم، محەمەد عەریف ئەحمەد،[٢٠٣] کە لە باسەکانی پێشوودا ناوم بردووە. لە کێڵگەی پەلەوەری حەویجە کرێکار بوو، ماڵیشی هەر لەو نزیکانە بوو، زۆر لە ئێمە بەتەمەنتر بوو، لە سەردەمی خۆیدا چەکداری جەلالییەکان بوو، ئەندامی 'کۆمەڵە بوو، هەر پەیوەندی بە خۆمەوە هەبوو، مرۆڤێکی زۆر خاوەن باوەڕ و جێگە متمانە بوو. باسی ئەوەم بۆی کرد، هاوڕێیەکمان مەترسی گرتنی لەسەرە و دەبێت بۆ ماوەیەک خۆی ئیختیفا بکات، ئەگەر ماڵی ئێوە بۆ ئەو کارە گونجاوە، بەڵکوو بیهێنمە ئێرە. محەمەد عەریف ئەحمەد بێ چەندوچوون ڕەزامەندیی خۆی دەربڕی و بە هەموو شێوەیەک ئامادەی یارمەتی بوو. دوای ئەوە چووم بۆ لای محەمەد ئەحمەد ڕەحمان بۆ ئەوەی ئەنجامی کارەکەی پێ بڵێم و ئیشەکان بەو جۆرەی لەسەری ڕێکەوتبووین تەرتیب بکەین، بەڵام محەمەد لە ماڵ نەبوو. دوای ئەوە بە ڕۆژێک و بە دووان ... محەمەد هەر نەهات و منیش هەر لە چاوەڕوانیدا بووم! ئیدی کەوتمە قەلەقییەوە و کەوتمە

---

٢٠٢. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ئاوات ناسیح حەبیب.

٢٠٣. محەمەد عەریف ئەحمەد لە ڕێکەوتی ٢٠١٩/٢/٨ بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد.

سۆراخکردنی. دواتر بیستمەوە کە گوایە محەمەد شاری بەجێ هێشتووە و خۆی گەیاندووەتە ناوچەی گەرمیان و گوندی تیلەکۆ! بەڵام لە ڕاستیدا، پێش ئەوەی بچێتە تیلەکۆ، دەوری مانگ و نیوێک لە ماڵ خوشکێکی هاوسەرەکەی کە دەکاتە ئامۆزایشی، هەر لە گەڕەکی شۆڕیجە خۆی دەشارێتەوە.[٢٠٤] و ئینجا دەڕواتە دەرەوە بۆ تیلەکۆ، پاشان لەوێوە بۆ مەڵبەندی یەکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەچێت. بەو شێوەیە محەمەد بەبێ ئەوەی مامۆستا قادر و من ئاگادار بکاتەوە و کەرتەکەی دەوروتەسلیم بکات، شاری بەجێ هێشت و هەتا ماوەیەک ئەو کەرتە لە ئێمە دابڕا.

دوای ئەوە لە شۆڕیجە و لەناو خەڵکی عامیدا بڵاو بووەوە، ئەندامێکی سەرکرایەتیی ناوشاری کۆمەڵە ئاشکرا بووە و ڕای کردووە!

من خۆم ئەم هەواڵەم بیستەوە!

بەو شێوەیە هەتا دەهات قوڕەکەیان خەستر دەکردەوە!

---

٢٠٤. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز سەمیرە سلێمان ڕەحمان.

# ئاوات ناسیح حەبیب (ئارام)

پاش چەند مانگێک لە دابڕان و پچڕانەوەی کەرتی شەهید سیروان و هەوڵی ئێمە بۆ دۆزینەوە و لێکگرێدانەوەی، توانیمان سەرەداوێکمان دەست بکەوێت.

هاوڕێیانی ئەو کەرتەمان ئاگادار کردەوە کە ناونیشانی بەرپرسی کەرتەکەمان بۆ ڕەوان بکەن، تاوەکوو پەیوەندییەکەیان بە "کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک"ەوە بۆ دروست بکەینەوە.

دوای ئەوە، بۆ ئەوەی دەستوخەتی من نەناسرێتەوە، بە "مامۆستا قادر"م وت، نامەیەک بە ناوی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووکەوە بنووسێت و کات و شوێن و وشەی نهێنی تێدا دابنێ، تاوەکوو بۆ بەرپرسی نوێی "کەرتی شەهید سیروان"ی بنێرم و یەکتری بناسین. مامۆستا نامەکەی نووسی و منیش بە ڕێگای خۆی نامەکەم پێیان گەیاند.

بەرپرسی کەرتەکە کە دەبوو من بیناسم، ئاوات ناسیح حەبیب بوو.

ئەو شوێنەی کە دامان نابوو ئاوات و من یەکتری تێدا بناسین، وێستگەیەکی پاسەکانی خەتی ڕەحیماوا بەرامبەر بە نادی سەورە بوو. دەبوو ئاوات نایلۆنێکی سوور بەدەستەوە بگرێت و من بچم بۆ لای و پرسیاری لێ بکەم: کاکە زەحمەت نەبێت، سەعات چەندە؟ ئەویش ئەبێ وەڵام بداتەوە و بڵێت، سەعات ئەوەندەیە، واتە، نەئەبوو وەڵامی دروست بداتەوە، بەڵکە دەبوو ئەو سەعاتە بڵێت کە لەسەری ڕێک کەوتووین، بەو جۆرە من لەو دڵنیا دەبووم، بەڵام بۆ دڵنیابوونی ئەویش، دەبوو منیش شتێک بڵێم، من ئێستا ئەوەم لەبیر نەماوە.

لە کات و ساتی خۆیدا چوومە ئەو شوێنە، ئاوات بە کیسەیەکی نایلۆنی سوورەوە چاوەڕێی منی دەکرد. بەو جۆرەی لەسەری ڕێک کەوتبووین چووم بۆ لای و یەکتریمان ناسی. دوای ئەوە بەدەم پیاسەوە دەستمان کردە قسەوباسی ئەو لێکترازان و لێکدابڕانە و کێشەی ئەو کەرتە ... سەرەتا ئاوات ڕەخنەی لە وشەی نهێنیی نێوانمان گرت و ئەو شێوەیەی پێ باش نەبوو، ئیتر لەسەریشی ڕۆی. منیش بۆ یەکەمجارە ئاوات ئەناسم، بەلامەوە سەیر بوو، بۆ ئەو بابەتە ئەوەندە ئاڵۆز ئەکات و ئەم پەڵپ و بیانووانە چین، ئێ ئەوەتا بەبێ هیچ کێشەیەک یەکتریمان ناسی! بۆیە هەر لە سەرەتاوە سەرودڵمی گرت، وا بزانم کەمێک لەوە پەست و ئاڵۆز بوو، بە زەحمەت نایلۆنی سووری دەست کەوتبوو!

ئیدی بەدەم پیاسەوە، بەرەو لای نەخۆشخانەی منداڵبوون و پردی چوار و لەوێوە بەرەو شۆڕیجە چووین و پاشان ماڵیانم ناسی کە دەکەوتە کۆڵانەکانی پشت "قوتابخانەی سەرەتایی سەلاحەدین"ەوە.

لەبەر ئەوەی کۆمیتەی ئەو کەرتە جێگیر نەبوو، من بەوریایی و پارێزەوە هەڵسوکەوتم لەگەڵدا دەکردن. من بەرپرسیارێتی خۆمم لای ئاوات باس نەکرد و ناوی تەواو و ناونیشانی خۆمم ئاشکرا نەکرد و پێم گوت، من تەنها ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان کەرتی شەهید سیروان و "کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک"م.

دوای چەند مانگێک و لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣دا بوو، لە کۆبوونەوەیەکدا ئاوات وتی، باری تەندروستیم باش نییە، ئەمەوێت واز لە کۆمەڵە بهێنم. وتم چ خێرتە؟ وتی: کاتی خۆی ڕانم شکاوە، ئەبێ عەمەلیاتی بکەم! کاتێک کە وای گوت، من زانیم ئەو کێشەیە هی وازهێنان نییە و تێگەییشتم کێشەکە لەڕاستیدا سیاسییە و نایەوێت باسی بکات، بۆیە هەندێک هەوڵم دا کە جارێ واز نەهێنێ و پێم گوت، کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە نزیک بووەتەوە، پێم باشە بەشداری تێدا بکەیت و دۆخەکە لە نزیکەوە ببینی، ئەو دەمە بڕیاری خۆت بدەیت. بەڵام ئەو قەناعەتی نەکرد و دیار بوو بڕیاری کۆتایی خۆی دابوو. دیارە هەر وەکوو "کەریم حەمید ڕەسووڵ"ی هاوڕێی باسی دەکات، ئەو لە وازهێنان گەلێک ڕاڕابووە، ماوەیەکی زۆر لەو هێنان و بردنەدا بووە، نە ئەوەتا وازبهێنێ و نە ئەوەتا بمێنێتەوە. بە هەر حاڵ، ئەو وازی هێنا و منیش دوای ئەوە بۆ ماڵیان نەچوومەوە و پەیوەندییەکەمان لەوێدا کۆتایی پێ هات.

دوای ئەوە کەریم لە شوێن ئاوات وەکوو بەرپرسی کەرتی شەهید سیروان دیاری کرا. ناونیشانی "کەریم"یان بە من دا و چووم دۆزیمەوە. زۆری پێ نەچوو، ئینجا سەلاح حەسەن پاڵەوان (سەلاح حەسەن عەبدولکەریم)یان دەستنیشان کرد، بۆ ئەوەی بە منی بناسێنن. بەڵام من لەو دەورانەدا ئاڵوگۆڕێکم لە ڕێکخستنەکاندا کرد و کەرتی "شەهید ئەنوەر حەسەن"م تەسلیمی تەحسین نامیق کرد و خۆم بوومە بەرپرسی کەرتی شەهید سیروان.

ئەوەی شایانی باسە، بە هەمان شێوەی ئاوات، ناوی تەوای خۆمم بە کەریم و "سەلاح"یش نەگوت و ناونیشانی ماڵی خۆمانم پێیان نەدا و هەر من بۆ لای ئەوان ئەچووم. دیارە مەسەلەکە تەنها پەیوەست بوو بە ئەمنییەتی ڕێکخستنەوە، بۆ سەلامەتی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک بوو کە ڕابەرایەتیی تەواوی

ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک دەکات. لەڕاستیدا ئەو نەخشەیە و ئەو شێوازە لە مامەڵە هی من بوو، تەنانەت هی کۆمیتەی ڕێکخراو و هی مامۆستا قادریش نەبوو. منیش بەدڵ پێم خۆش بوو، هەرچی زووە کۆمیتەی ئەو کەرتە جێگیر بێت و بەرپرسەکەیان بێتە ناو کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووکەوە و هەرچی زووە کۆمیتەی ڕێکخراو شێوەی ئاسایی خۆی وەر بگرێتەوە.

بۆ مێژووش ئەیڵێم و بە ویژدانەوە، نە من و نە مامۆستا قادر بە غەیری ئەوەی باسم کرد، هیچ جۆرە تێبینییەکمان لەسەر ئەو سێ هاوڕێیە (ئاوات، کەریم، سەلاح) نەبوو.

ئیدی کار بەو شێوەیە مایەوە هەتا گەیشتە کۆنفرانسی سێیەم و وازم هێنا.

دەوروبەری ساڵێک دوای ئەوە، ڕۆژێکیان لە دەرگا درا، کاتێک چوومە دەرەوە، بینیم "ئاوات"ە لەگەڵ "قادری سەی مستەفا" بۆماڵمان هاتووە.

ئیدی جارێکی تر پەیوەندییەکەمان پێک هاتەوە و بووینە هاوڕێی نزیکی یەکتری و پێکەوە کەوتینە ناو کاری سیاسییەوە. وەلێ بەهۆی ئەو ئەزموونەی لە کۆمەڵەدا هەمان بوو، هەموو شتێکی پێشووی خۆمانمان خستبووەوە ژێر پرسیارەوە!

دێتەوە بیرم، جارێکیان من لە ماڵیان بووم، دوای ئەوەی هەستام و بە ئاراستەی نەخۆشخانەی ئازادی (مستەشفای سەدام) پێکەوە بە پیاسە کەوتینە ڕێ، ئەو پرسیاری ئەوەی کرد: ئایا ئێمە کۆمۆنیستین یان نا؟!

دێتەوە یادم دوای چەند مانگێک ئاوات باسی ئەوەی لەگەڵدا کردم کە بەنیازە بۆ خولێکی سیاسیی نیزامی بۆ لای کۆمەڵەی ئێران بچێت. هەروەها لەسەر ئەوەش ڕێک کەوتین، پێش ئەوەی بڕوات هاوڕێیەکی خۆیم بەناوی "فاتمە ئەحمەد محەمەد"ەوە پێ بناسێنێت.

تا ئەو دەمە من دوو جار بۆ ئۆردووگاکانی کۆمەڵە چووبووم و بە هۆی هاوڕێیەکمەوە دۆستایەتییەکم بەتایبەت لەگەڵ مامۆستا برایم بەرقەرار کردبوو. بۆیە کاتێک کە ئاوات بۆ ئەو دەورەیە ڕۆیشت، نامەیەکی تەزکییەم بۆ جێبەجێ کرد و پێم دا.

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٦ ئاوات و فاتمە بۆ ماڵمان هاتن، لەگەڵ فاتمە یەکتریمان ناسی و ئاوات سەفەری کرد.

لەڕاستیدا فاتمە و من بە یەک دوو ساڵێک پێش ئەوە لە ماڵ نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد یەکتریمان ناسی بوو، بۆیە کاتێک ئاوات باسی ئەوی بۆ من کرد و باسی

منی لای ئەو کردبوو، هەردووکمان دەمانزانی و بە یەکدی ئاشنا بووین. وەلێ یەکترناسینی یەکەم جار نەبووە هۆی ئەوەی پەیوەندییەکمان لە نێواندا دروست بێت.

ئیدی لەگەڵ فاتمە هەموو هەفتەیەک یەکتریمان دەبینی و هەر جارە بە چەندین سەعات لە ژوورە بچکۆلەکە دادەنیشتین و موناقەشەی سیاسیمان دەکرد و ئەدەبیاتی مارکسیمان دەخوێندەوە. دێتەوە یادم، تەواوی هەردوو بەشەکەی کتێبی "ئەفسانەی بۆرژوازیی میللی و پێشکەوتنخواز"[٢٠٥]مان خوێندەوە و موناقەشەی چڕوپڕمان کرد.

فاتمە خاوەن پێشینەیەکی سیاسی بوو، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٢دا پەیوەندی بە ڕیزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردبوو. لە تەمووزی ساڵی ١٩٨٣دا بەهۆی ناکۆکیی فکرییەوە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی لە کەرتی شەهید سیروان واز لە کۆمەڵە دەهێنێت.

فاتمە تێکۆشەرێکی سیاسی و ڕۆشن بوو، پەیوەندییەکی فراوانی کۆمەڵایەتیی هەبوو، ئەو بە جۆرێک بوو، پەیوەندییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی تێهەڵکێشی یەکتری دەکرد و پەیوەندی و قسەوباس لەسەر کێشە کۆمەڵایەتییەکانیشی هەر بە سیاسەت دەزانی. فاتمە لەو جۆرە هەڵسووڕاوە دەگمەنانە بوو کە هەر حیزب و ڕێکخراوێک ئەگەر تیمێک لەو تەرزە لە کادری هەبووایە، کۆمەڵایەتی دەبووەوە.

ئاوات پاش چەند مانگێک بە باوەشێک باس و تێڕوانینی نوێوە گەڕایەوە، هەر وەکوو خۆی گوزارشتی لێ دەکرد: بەشی دوو ساڵ لە کار و هەڵسووڕان زەخیرەی فکری هێناوەتەوە.

لەدوای ئەوە، کەوتینە نێو دامەزراندنی ئەڵقە و گرووهی کۆمۆنیستی و دەرهێنانی گۆڤار و کۆبوونەوە و سەفەر و خۆشاردنەوە و ڕاکەڕاک ... کە گێڕانەوەیان کتێبێکی جوودای گەرەکە.

ئاوات لە ژیانی سیاسیی خۆیدا کەسێکی گورجوگۆڵ و بەدەستوبرد و ماندوونەناس بوو، لە لێکدانەوەی هەر دۆخ و دیاردەیەکدا دانەئەما و بەزوویی ئەنجامگیری خۆی دەکرد.

---

٢٠٥. ئەفسانەی بۆرژوازیی میللی و پێشکەوتنخواز، مەنسوور حیکمەت، وەرگێڕانی بەشی یەکەم: ڕێبوار و بەشی دووەم: ناسری حیسامی.

# بۆ چەند ڕۆژێك بووین بە خاوەنی چاپخانە!

یەکێک لە ئاواتە گەورەکانی ئێمە لەو دەورانەدا ئەوە بوو کە تایپێکمان هەبێت، خۆ ئەگەر ڕۆنیۆیەکیشی لەگەڵدا بێت، ئەوە ئیدی مەلیکین. ئەگەر بێت و ئەو خەوەمان بێتە دی، ئیتر لەوە ڕزگارمان دەبێت، بە دەست بەیان و بڵاوکراوە بنووسین و بە ڕۆنیۆی سەرەتایی تەکسیری بکەین. ئەوە بوو لەو سەفەرەماندا بۆ نێوزەنگ، من داوای تایپێکم لە مام جەلال کرد، وەلێ هیچ ئەنجامێکی نەبوو. جارجارەش بیرمان لە فڕاندنی تایپێک لە فەرمانگەیەک، لە قوتابخانەیەک یان لای عەریزەنووسێک دەکردەوە.

ڕۆژێکیان کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٨٣ بوو، نەوزاد فەتحوڵا عەبدولڕەزاق (شەهید هیوا) هات بۆ ماڵمان و لە دەرگای دا، چوومە دەرەوە و بەدەم قسەوە وردە وردە بەرەوە لای مزگەوتەکەی مەلا جەبار ڕۆیشتین، کاتێک کە گەیشتینە نزیک ماڵی مەلا جەبار، نەوزاد باسی ئەوەی کرد، چەند هاوڕێیەک لەو هێڵەی لای ئەو چوونەتە سەر ئامادەیی زێوەر و دەستیان بەسەر تەواوی دەستگای چاپی قوتابخانەکەدا گرتووە و هەر هەموویان هێناوە. کاتێک نەوزاد ئەم هەواڵە زۆر خۆشەی پێم دا، باوەشم پێدا کرد و وام ئەزانی بووینەتە حوکمەت.

ئەو خەتەی کە پەیوەندی بە "نەوزاد"ەوە هەبوو، کۆمەڵێک ئەندام بوون، وەلێ نەوزاد تەنها ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد (سمکۆ شوانی)ی دەبینی.

ئەو هاوڕێیانە هەر بۆخۆیان و بەبێ پرس و ئاگاداریی ئێمە بیر لەو کارە دەکەنەوە!

سیروان عەزیز فلامەرز (ڕێباز) و فەرهاد مەحموود عەزیز (چیا، هەڵکەوت) کە دوو ئەندامی ئەو هێڵە و خوێندکاری ئامادەیی زێوەر دەبن، بیرۆکەکە لەلای ئەرسەلان عەبدوڵا عەزەدین باس دەکەن. ئەرسەلان هاوڕێیەکی ئاسایی ئەوان دەبێت و هیچ پەیوەندییەکی ڕێکخراوەییان لە نێواندا نابێت. ئەویش پێشنیاری "ئەمین حەسیب نەسیب" دەکات کە دیسانەوە ئەمیش هەر هاوڕێیەکی ئاسایی ئەوان دەبێت و هیچ پەیوەندییەکی ڕێکخراوەییان لە نێواندا نابێت.

ئەمین ئۆتۆمبیلێکی پاسی ١٨ نەفەری دەبێت و بۆ گواستنەوەی دەستگاکان پێویستییان پێی دەبێت.

سەرەنجام ئەم هاوڕێیانە لەسەر بەئەنجامگەیاندنی عەمەلییەکە ڕێک دەکەون، پێکەوە دادەنیشن و نەخشە و پلانی بۆ دەکێشن، پێویستییەکانی بۆ ئامادە دەکەن و لەنێویاندا دەمانچەیەک، گۆرەویی ژنانە بۆ ئەوەی لەسەری بکەن و شێوەی دەموچاویان بگۆڕێت، دەستکێش، تالیبەر ... وەلێ ئەرسەلان پەشیمان دەبێتەوە و دەکشێتەوە، بۆیە کارەکەیان بۆ نزیکەی هەفتەیەک دوا دەخەن. سەرباری ترس و دڵەڕاوکێیان لە پەشیمانبوونەوەی ئەو هاوڕێیەیان، کارەکەیان لە شەوی ١٩٨٣/٨/٣١ هەر ئەنجام ئەدەن.

سەرەتا ئۆتۆمبیلەکە دەبەنە پێشەوە و لە تەنیشت دیواری قوتابخانەکە ڕای دەگرن. پاشان هەرسێکیان دەچنە ژوورەوە بۆ نێو قوتابخانەکە و بۆ لای پاسەوانەکە کە ناوی مام ئەنوەر (ئەنوەرە گۆج) دەبێت. داوای کلیلی دەرگاکانی لێ دەکەن، ئەویش پرسیار ئەکات و ئەڵێ ئێوە کێن؟ ئەڵێن: ئێمە پێشمەرگەین. مام ئەنوەری داماویش لە ترسی زەبری بەعس و کێشەیەک کە سبەی بۆی دێتە پێش، ئامادە نابێت کلیلەکانیان پێ بدات، هەرچەندە هەوڵی لەگەڵدا ئەدەن، بێ سوود دەبێت. بۆیە ئەوانیش دەست بە لێدانی دەکەن، هەتا لەهۆش خۆی دەچێت! دوای ئەوە دەست و پێی دەبەستنەوە، کلیلەکان لەژێر سەرینەکەی دەدۆزنەوە و بۆ ژووری تایپ و ڕۆنیۆکان دەچن، دەستگاکان گشت دەپێچنەوە و دەیخەنە نێو ئۆتۆمبیلەکەوە و بۆی دەردەچن.

من ئێستاش زۆر بەچاکی لەبیرمە، دەستگاکان بریتی بوون لە دوو تایپ، یەکێکیان عەرەبی و ئەوەی تریان ئینگلیزی، دوو ڕۆنیۆ، یەکێکیان دەستی و ئەوەی تریان کارەبایی.

بۆ بەیانی کە ڕۆژ دەکاتەوە، حکوومەت ئاگادار دەبێتەوە، هێزێکی گەورەی ئەمن و پۆلیس بۆ قوتابخانەکە دەبەن. دەست بە لێکۆڵینەوە دەکەن و دەست دەکەن بە وردبوونەوە لە چۆنیەتی ئەنجامدانی کارەکە و هەڵگرتنەوەی شوێنپێ و هەر ئەسەرێک کە بەجێ مابێت.

ئەوەی شایانی گوتنە، فەرهاد بۆ بەیانییەکەی دێتە ئەو ناوە، دەبینێت ئەو دەوروبەرە هەر هەمووی بە ئەمن و پۆلیس گیراوە، سەرەتا لە دوورەوە هێندێک لێیان دەڕوانێت، پاشان خۆی پێ ڕاناگیرێت و هەر بەو پێڵاوەی کە شەو کارەکەی پێوە ئەنجام داوە، دەکەوێتە نێو ئەو لیژنەیەی خەریکی شوێنپێ هەڵگرتنەوەن و لە

هێندێک شوێن کە ئەوان بە هەڵەدا دەڕۆن، ئەم خەریکە کۆنترۆڵی خۆی لە دەست بدات و لەوەدایە پێیان بڵێت: نا ... ئەوە هەڵەیە، بەوێدا نەڕۆییشتین، بە ئێرەدا ڕۆییشتین!

ئەوەی شایانی گوتنە، ئەوە حاڵەتێکی دەروونی و واقیعییە، ئەو کەسەی کارێک یان تاوانێک ئەنجام ئەدات، دوای ئەوە پێی خۆشە بچێتەوە ئەو شوێنەی کارەکەی تێدا ئەنجام داوە و زۆر جار لێکۆڵەر دەتوانێت بە خوێندنەوەی دەموچاوی ئامادەبووان، گومان بخاتە سەر کەسی بکەر و تاوانبار.

دوای ئەوە مام ئەنوەر و کۆمەڵێک خەڵکی دیکە کە هیچ پەیوەندییەکیان بەو کارەوە نەبووە دەگرن و بۆ ماوەیەکی زۆر لە زینداندا دەیانهێڵنەوە.

بە حوکمی ئەوەی ئۆتۆمبیلەکە هی ئەمین دەبێت، تایپ و ڕۆنیۆکان لەلای ئەو دەمێننەوە، ئەویش لە پاش چەند ڕۆژێک بەبێ پرسی ئەمان، بۆ کەرتی چواری جەبارییان دەبات و لەوێ تەسلیمی شوانە (تۆفیق)ی کادری دەکات.[٢٠٦]

ئیدی من هەر لە فکری ئەوەدا بووم، چۆن بتوانین وەکر (حەشارگە)یێکی باش و ئەمینی بۆ دروست بکەین و چۆن هاوڕێیەکی گونجاو، نهێنیپارێز و بەسەلیقە بدۆزینەوە کاریان لەسەر بکات. هەر بیرم لەوە دەکردەوە، نەخشەی دروستکردنی حەشارگەکە و شێوازی دروستکردنی قەباغی کونەکەی چۆن بێت و هەر دەمەش بیرم لە یەکێک لە هاوڕێکان دەکردەوە، کاریان لەسەر بکات ...

دوای چەند ڕۆژێک نەوزاد هاتەوە بۆ ماڵمان و لە دەرگای دا، چوومە دەرەوە و چاکوچۆنیمان کرد، بێتاقەت دیار بوو، وتی: هەواڵێکی زۆر ناخۆش! وتم: خێر، چی بووە؟ وتی: ئەزانی ئەو هاوڕێیانە تایپ و ڕۆنیۆکانیان لە شار دەرکردووە و بردوویانە بۆ کەرتی چواری جەباری و تەسلیمی ئەوانیان کردووە!

بەو شێوەیە ئەو هاوڕێیانە بەبێ پرسوڕا و سەربەخۆ ئەو کارەیان ئەنجام دا و بەبێ پرسوڕا و سەربەخۆش لەدەستمانیان کردەوە. هەواڵێکی ئێجگار ناخۆش بوو، گەلێک بێتاقەت بووم، هەرچی خەو و خەیاڵ هەبوون، گشتی بەمل یەکدا هاتن و جارێکی دی هاتینەوە سەر ساجی عەلی و سەر ڕۆنیۆی بیدائی.

---

٢٠٦. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێزان: ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد (سمکۆ شوانی) و فەرهاد مەحموود عەزیز (چیا، هەڵکەوت).

# محەمەد بۆ ناوشار گەڕایەوە

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا گوتم، محەمەد گوندی تیلەکۆی بەجێ هێشت و خۆی گەیاندە مەڵبەندی یەکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە لە حاجی مامەندە بوو.لەو دەمەدا مەلا بەختیار بەرپرسی مەڵبەند بوو، سالار عەزیز لەوێ بوو، کێشەی فکریی نێو کۆمەڵە زۆر زەق بووبووەوە، خەڵکانێکی زۆر کە لە ڕووی فکرییەوە لەگەڵ هێڵی فەرمیی کۆمەڵەدا یەکیان نەدەگرتەوە، یان ڕەخنە و تێبینییان لەسەری هەبوو، یان لەژێر فشاردا بوون، بڕوایان بەوە هەبوو، کۆمەڵە دەبێت ڕێکخراوێکی مارکسی-لینینیی کوردستانی عێراق، یانی داش عێراقی بێت، یان بڕوایان بە ڕێکخراوێکی مارکسی-لینینی بۆ کرێکارانی سەرتاسەری عێراق، یانی، عێراقییەکان ... لەو گوندە و لەو دەوروبەرە گیرسابوونەوە.

ئەو دەمە ناکۆکیی نێوخۆی کۆمەڵە، نێوانی هێڵی شەهید ئارام لەلایەک و هێڵی گرووهی زیندان و نەوشیروان مستەفا لەلایەکی دی هەتا دەهات توندتر دەبووەوە، قسەوباسەکان لەو هەرێم و مەڵبەندە لەمەڕ ئەو بابەتە گەرم بوو.

محەمەد هەتا ئەو دەمەی بۆ کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵەش چووە، کێشەی فکریی کوردستانی و عێراقی، چ لەلای خۆی و چ لەلای هاوڕێکانی نەک هەر نەبووە، بەڵکە کاتێک بۆ کۆنفرانس چوونە، بەدەم ڕێگاوە هەر لە "قەلادزێ"وە هەتاوەکوو ناوزەنگ، بەشێک لە قسە و نوکتە و تەنزەکانیان دژی ئەو کەسانە بوونە کە لەو دەورانەدا پێیان دەگوترا عێراقچییەکان.[207] چەند مانگێک لەدوای کۆنفرانس و لە کۆتایی ئەو ساڵەدا، ئاوات ناسیح حەبیب، یەکێک لە هاوڕێکانی محەمەد، لە پەیمانگای کەرکووک فاتمە دەبینێت و باسی کۆنفرانسەکەی بۆ دەکات و کۆڵێک سەرسامی خۆی بۆ مام جەلال دەربڕیبوو.[208]

وەلێ هەر لەو ماوەیەدا و بەهۆی پەیوەندیی کەرتەکەیان لە ڕێگەی تاها وەهاب و ئەویش بە مامۆستا موحسینەوە کە سەربە باڵی داش عێراقی ناو کۆمەڵە بوون،

---

٢٠٧. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز کەریم حەمید ڕەسوول (بەختیار).

٢٠٨. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز فاتمە ئەحمەد محەمەد (ئاڵا، تانیا).

ئەو بـاس و بابەتـانە لە هزریـدا چەکەرەی کردبـوو و لە هەمـبەر فکـری کـۆمەڵەدا دوودڵ و دڕدۆنگ بوو و سەرەنجام ئەمیش ماوەیەک لەدوای کۆنفرانس دەکەوێتە پاڵ ئەو باڵە.

قادر سەی مستەفا کە بەرپرسی خەتێکی ڕێکخستن و ئەندامی کۆمیتەی کەرتی شەهید سیروان بووە، دەیگێڕێتەوە کە چۆن محەمەد لایەنگریی خۆی بۆ ئەو باڵە لەلای ئەم دەربڕیـوە و هەوڵـی داوە کـاریگەری لەسـەر ئەمـیش دابنـێ، بەڵام ئەم قەناعەتی نەکردووە.[٢٠٩]

ڕەنگبـێ هەر لەبەر ئەوەیش بووبێت، کاتێـک مـحەمەد بەناچـاری شـاری بەجـێ هێشـت، بە شـێوەی عـادەتی ڕووی نەکـردە سـەرکردایەتی و خـۆی لەوێ بەدوور گرت.

پاش چەند مانگێک و هەر لەو ناوچانەوە، مـحەمەد نـامەی وازهێنـان و دەسـت لە کار کێشانەوەی خۆی دەنووسـێ و بـۆ ناوەنـدیی کۆمەڵەی ڕەوان دەکات و پاشـان بیر لەوە دەکاتەوە، بۆ شار بگەڕێتەوە.

ئیدی بەهۆی مەلا جەمیل ڕۆژبەیانییەوە کە خزم و ناسیاویان دەبێت و بە بنەچە هەردووک لایان خەڵکی گوندی "فەرقان"ن و لە ڕێگەی فەتاح جاف و ئەوانەوە کە سـەر بە دەسـتگای هەواڵگریـی عێراقـی بـوون، کێشـەکەی چارەسـەر دەکـات و دەگەڕێتەوە.

لە ماوەی ئەو سووڕ و دەورەی محەمەد کردی، یەکتریمان نەبینی و هیچ نـامە و هەواڵێکـی بـۆ ئـێمە (کـۆمیتەی شـاری کەرکـووک) نەنـارد و ئاگامـان بەتەواوی لە یەکتری بڕا. بەڵام کاتێک کە هەواڵم پێ گەییشت، محەمەد تەسلیم بووەتەوە، هەستم بە ترس و ناڕەحەتی کرد و یەکسەر چووم بۆماڵیان. ماوەیەک پێکەوە دانیشـتین و باسی ئەو کێشە و موشکیلانەمان کرد، بەڵام من مەبەستم لەسەردانەکەم ئەوە بوو، دەمـودووی تاقی بکەمەوە و بزانم قسـەکانی بۆنی چـی لـێ دێت. سـەرەنجام لەلای خۆمەوە بەو ئاکامە گەییشتم، مـحەمەد پێ ناچێت نیازی خراپی هەبێت و نایەوێت زەبرمان لێ بوەشێنێ، مەگەر بخرێتە ژێر فشارەوە.

---

٢٠٩. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز قادر سەی مستەفا.

ئەوە بوو هەر واش دەرچوو، محەمەد بەهیچ شێوەیەک هیچ زانیارییەکی لەسەر ئێمە ئاشکرا نەکرد و تەواوی نهێنییەکانی ئێمەی پاراست و ساڵانێک دواتر لەنێو گرووپە چەپەکاندا بەنهێنی بەردەوامی بە کاری سیاسیی خۆی دا و ماڵەکەیشی بۆ دەورانێک، وەکوو بنکە و جێگەی پەنادانی چەندین هەڵسووڕاوی چەپ و کۆمۆنیست بوو.

هەر لەو دەورانەدا بوو، لە سەردانێکمدا بۆ ناوچەی دۆڵی بالیسان، چوومە گوندی خەتێ و لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر کۆبوونەوەیەکمان کرد، یەکێک لە باسەکانمان، تەسلیمبوونەوەی محەمەد بوو.

# جەدەلی نێوان کوردستانی و عێراقی

پرسی کوردستانی و عێراقی یەکێکە لەو کێشانەی کە لە مێژووی چەپی نوێی کوردستان و بۆ ماوەی نزیکەی یەک دەیە و نیو لەنێو کۆمەڵەی مارکسیی لێنینیی کوردستان و کۆڕ و کۆمەڵە مارکسییەکانی دیکە لە کوردستاندا جەدەل و موناقەشەی لەسەر کراوە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٢ و سەرەتای ساڵی ١٩٨٣وە، قسەوباس نەک هەر لەسەر عێراقی و کوردستانی، بەڵکە لەسەر زۆر مەسەلەی فکریی مارکسیستیی دیکە کەوتە نێو فەزای سیاسیی کوردستانەوە. هۆکاری ئەمەش بۆ هەندێک خاڵ دەگەڕێتەوە:

مارکسیزم و کۆمۆنیزمی فەرمی و ئۆردووگایی سۆڤیەت و چین ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ناشیرینتر دەبوون. دیارە هەر یەکە لەو باڵە جیهانییانە لە هەمبەر یەکتری کاریگەرییان لەسەر تێڕوانینی ڕای گشتی دانا، بۆ نموونە، کۆمۆنیزمی ماوی کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر جێگاوڕێگای سۆڤیەتی دوای ستالین و سەردەمی خروشۆف و برێژنێڤ لە دنیادا بە نێگەتیڤ دانا و پاشان کۆمۆنیزمی ئەلبانی کاریگەرییەکی گەورەی لە جێگاوڕێگای کۆمۆنیزمی چینی و ماوی و تێزی سێ جیهانی بە نێگەتیڤ دانا و هەر وا بەو شێوەیە. بەڵام هەر یەکەیان خۆیان وەک ئاڵتەرناتیڤی ئەوان دەخستە ڕوو، نەک گەڕانەوە بۆ بنج و بناوان و ئەرتەدۆکسی مارکسی.

کەواتە: لەو دەورانەدا هەر یەکە لەو مۆدێلانە و لەو باڵە جیاوازانەی کۆمۆنیزمی ئۆردووگایی و جیهانییانە لە قەیراندا بوون و ڕەوشی زیندەگیی کرێکاران لەو وڵاتانە و ئازادیی مرۆڤ و سیاسەت و دیپلۆماسییەتی هەر یەکە لەوانە کەوتبوونە ژێر پرسیارەوە و تێکۆشەرانی ڕێگای ڕزگاریی کرێکاران و بەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی ئازاد و یەکسان لە سۆراخی گەڕانەوە بۆ مارکس و بۆ مانیفێستی مارکسدا بوون.

لە هەلـــومەرجێکی وادا، ئیـــدی ئەو بـــزووتنەوە ناسیۆنالیســـتی و دژە ئیمپریالیســتییانەی خۆیــان لە بەرگــی کۆمۆنیســتیی ئەو بــاڵ و ئۆردووگایــانەدا پێچابوو، وەختی ئەوەیان هـاتبوو خۆیان لەو بەرگە دامـاڵن کە ئیدی خێرێکی بۆ ئەوان تێدا نەماوە. بۆیە وردە وردە و هەر جارەی کاژێکیان فڕێ ئەدا و جارێک بە گـۆڕینی ناوەکانیـان و جارێـک بە فڕێدانی لۆگۆکانیـان، جـارێکی تـریش بە گـۆڕینی هەندێک بەند و بڕگەی بەرنامەکەیان و پاشانیش بە سەرکوت و گرتن و ئەشکەنجە و تیرۆری موخالفین و ئەوانەی لە ڕێگای ئەو گۆڕانکارییانە دەبنە لەمپەر و کۆسپی سەر ڕێگەیان.

کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بـۆ دەورانێـک و لەچـاو سـەردەمەکەی خۆیـدا ڕادیکـــاڵ بـــوو، شـــوێنی کۆبـــوونەوەی زۆربەی هەرە زۆری کۆمۆنیســـت و سۆشیالیست و چەپەکانی کوردستان بـوو، خۆشنـاو و خۆشەویست و جەمـاوەری بـوو، وەک ڕێکخراوێکـی چەپـی ناسیۆنالیسـتی لەنێـو چوارچێـوەی ئەو ئـاڵوگۆڕ و فەزایەدا بوو، وە دەبوو ئەویش ئیدی خۆی لەگەڵ زەمانە و ئەسڵ و بنج و بنەوانی خۆیدا یەکلا و ساغ بکاتەوە. بۆیە ساڵ لەدوای ساڵ و کۆنفرانس لەدوای کۆنفرانس بەو ئاقارەدا دەڕۆیی و ئەو پرۆسەیەی تەی ئەکرد.

ماوەی نێوان کۆنفرانسی دووەم لە هاوینی ساڵی ١٩٨٢ بۆ کۆنفرانسی سـێیەم لە هاوینی ساڵی ١٩٨٤ هەستیارترین و گەرمترین ئەو ماوانە بوون بۆ ئەو ئاڵوگۆڕانە.

لێکۆڵینەوەیەک بەنێوی "پـارتی پێشـڕەوەی چینـی کرێکـاری کوردسـتان" لەلایەن فەرەیدوون عەبدولقادر لە ساڵی ١٩٨١و پاشان لێکۆڵینەوەیەکی دیکە بە نێوی "چەند سـەرنجێکی ڕەخنەگرانە دەربـارەی پـارتی پێشـڕەوی چینـی کرێکـاری کوردسـتان" لەلایەن سالار عەزیز لە ساڵی ١٩٨٢دا بڵاو بوونەوە.

فەرەیــدوون دەیویســـت بیســـەڵمێنێت، کرێکـــارانی کوردســـتان بە هەر چـــوار پـارچەکەیەوە، پێویسـتی بە حیزبێکـی سەرتاسـەری کوردسـتانی هەیە، "سـالار"یش ڕەخنە لەو تەرحە دەگرێت.

ئەم دوو باسە ڕەنگدانەوەی توندبوونەوەی ناکۆکییەکانی نێو کۆمەڵە بوون لەو ڕۆژگارەدا. ئەو دوو نامیلکەیە، دوای بڵاوبوونەوەیان، بوونە مایەی قووڵکردنەوەی زیاتری ئەو ناکۆکییانە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣دا بوو، ئەو دوو نامیلکەیەمان پێگەییشت. ئێستاش بەباشی دێتەوە بیرم، ئەو دوو نامیلکەیەمان کردە بەرنامەی کۆبوونەوەی کۆمیتەی کەرتەکەمان و تەحسین نامیق و ئەحمەد خورشید و من (سالار ڕەشید) دوای ٢٥ دانە سەعات و چەندین کۆبوونەوەی یەک لەدوای یەک لە ژوورە بچکۆلەکەدا لە بەرگەوە بۆ بەرگ خوێندمانەوە و جەدەلمان لەسەری کرد.

ئەو دەمە من خۆم لێکۆڵینەوەکەی "فەرەیدوون"م بە ناڕاست و ناواقیعی دەزانی و ئەوەی سالار ئەگەر بەتەواوی لەگەڵیشیدا نەبوویم، بە واقیعیترم دەزانی. هەر بۆیە بە مەبەستەوە ئەو دوو نامیلکەیەم خستە نێو بەرنامەی کۆبوونەوەی کەرتەکەمانەوە، بەڵام پێم خۆش نەبوو، پێش وەخت و ڕاشکاوانە نەزەری خۆمیان لەسەر بدەم و کاریگەری لەسەر ئەو دوو هاوڕێیە دابنێم، بەڵکە هەوڵم ئەدا لەمیانەی خوێندنەوە و شیکاری باسەکاندا، بەرەو ئەوێیان ببەم و لەنێو ئەو پرۆسەیەدا ئەوانیش بەو ئەنجامەی من بگەن، ئەوسا منیش قسەی خۆم بکەم. سەرەنجامیش هەر وای لێهات و ئەوانیش بە هەمان ئەنجامگیری من گەیشتن.

لەلایەکی دیکەوە، ماوەی چەند ساڵێک بوو شۆڕشی ئێران بەرپا ببوو، لەنێو کێشمەکێشی ئەو شۆڕشەدا چەپێکی ڕادیکاڵ کە تەواوی ئۆردووگا و ڕەوت و ڕێبازەکانی خستە ژێر نەشتەری ڕەخنەی خۆیەوە و باسی لە دوورکەوتنەوە لە مارکسیزم و کۆمۆنیزمی دەستاودەستکراو و دەستی دوو دەکرد و داوای گەڕانەوە بۆ خودی مارکس و ئەرتەدۆکسی مارکسی دەکرد، ئەویش مارکسیزمی شۆڕشگێڕ و پاشانیش کۆمۆنیزمی کرێکاری بوو.

ئەو شۆڕشە و ئەو ڕەوتە تەنها کاریگەری لەسەر چەپ و ڕەوت و ڕێبازەکانی ئێران بە کوردستانەکەیشییەوە دانەنا، بەڵکە کاریگەری لەسەر کوردستانی عێراق و تا ڕادەیەکیش عێراق دانا.

ئەو هەلومەرجە وای کرد، لەلایەکەوە ڕەوتی ئارامی لەنێو کۆمەڵەدا هەرچی زیاتر ڕێگای بەردەمی لێ بەرتەسک و باریک ببێتەوە و لە فکری ئەوەدا بن ئاراییشێک بە خۆیاندا بدەن و لەولاشەوە پۆل پۆل لە ئەندامان لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە واز بهێنن و لەو ڕێکخراوە دوور بکەونەوە.

هەر هەمان ئەو هەلومەرجە وای لە مەحفەلە چەپەکانی ئەو دەمە، "کارگەران" (بۆ نموونە) کرد کە بکەونە گێژاو و ناکۆکییەوە و بکەونە ڕەخنە لە دەستگای فکریی ماوی و سێ جیهانی و ئەلبانییان و قبووڵکردنی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ و سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی خۆیان و دەستگای فکرییان.

ئەوەندەی من بە خۆم و بە هاوڕێیانی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن دەگەڕێتەوە بە شێوەیەکی گشتی، هەتا ئەو دەمەی ئەو باسانە نەبووبوونە جێگای پرسیار و تێڕامان و وردبوونەوە لەلای ئێمە، ئێمە وەکوو هێڵی زاڵ و فەرمی کۆمەڵە "بیر"مان دەکردەوە. هێڵی زاڵ و فەرمی کۆمەڵە دیارە، باڵی کوردستانی و باڵی نەوشیروان مستەفا و گرووهی زیندان بوو. بەڵام لە ڕاستیدا ئێمە سەر بە هیچ هێڵ و باڵێک نەبووین، چونکە یەکەم: ئەو مەسەلەیە هەر بۆخۆی نەبووبووە جێگای پرسیار و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی ئێمە، تا لەنێو باڵەکاندا یەکێکیان هەڵبژێرین. دووەم: هەر لەسەر ئەو بنەمایە، ئێمە لە بەرەی باڵێکەوە سەنگەرمان لە باڵەکەی دیکە نەدەگرت، وە یان با بڵێین: لە بەرەی باڵی کوردستانییەوە، سەنگەرمان لە باڵی داش عێراقی نەدەگرت و دژایەتی و بەربەرەکانێی ڕابەران و تێڕوانینی ئەوانمان نەدەکرد.

کاتێکیش ئەو بابەتانە لەلای خۆم و هاوڕێیانی کەرتەکە بوونە جێگای پرسیار و مشتومڕ، ئیتر مەسەلەکە لەوە دەرچوو کە قسە تەنها لەسەر سنووری کاری کۆمەڵە بێت، بەڵکوو قسە چووە سەر مەسەلەیەکی جەوهەریتر و ڕیشەییتر، ئەویش ڕەتکردنەوەی تەواوی ئەو دەستگا فکرییەی کە کۆمەڵە بە هەردوو باڵی کوردستانی و داش عێراقییەوە و ڕێکخراوی کارگەران و باقی عێراقییەکانی دیکە گرفتاری ببوون، ئەویش پۆپۆلیزم و کۆمۆنیزمی ماوی و ئەلبانی و ...هتد.

# کۆبوونەوەی خەتێ لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر

پایزی ساڵی ١٩٨٣ بوو، دەوامی زانکۆ تازە کرابووەوە، سەفەرێکی دۆڵی بالیسانم کرد. ئەو دەمە بارەگای مەڵبەندی چواری یەکێتی لە گوندی بالیسان و دکتۆر کەمال خۆشناو لێپرسراوی بوو. بارەگای سەرکردایەتی و مام جەلال لە گوندی خەتێ بوون. ئازاد ئەحمەد ئەسوەد پێشمەرگە بوو، لە ڕاگەیاندنی مەڵبەندی چوار کاری دەکرد، نەوزادی برای و هەندێک لە کەسووکارەکەی بۆ سەردانی ئازاد هاتبوون، منیش چوومە لای ئەوان و کۆمەڵێک لە ئەندامانی دەستگای ڕاگەیاندنم بینی، لەوانە کاکە عەبە و ئەبووبەکر خۆشناو ... ئەو دەمە ئێمە گۆڤاری "باوەگوڕگوڕ"مان دەرئەکرد کە بڵاوکراوەی لقی کەرکووکی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان بوو. هەتا ئەو دەمە دوو ژمارەمان بە دەستنووس لێ دەرکردبوو. ئەو برادەرانەی ڕاگەیاندنی مەڵبەندی چوار بڕیاریان دا کە چاپی ژمارە سێ لە ئەستۆ بگرن و کردیان. دێتەوە بیرم، لەگەڵ ئەبووبەکر خۆشناو موناقەشەیەکی دوورودرێژمان بوو. تێڕوانینەکانی ئەو لەو دەمەدا لە ڕوانگەی شیکارییەکانی "لیۆن ترۆتسکی"یەوە بوون. منیش لە ڕوانگەی "لینین"ەوە دژی بووم و ڕەخنەم لەسەریان هەبوو. دوای ئەوە کۆبوونەوەیەکم لەگەڵ ناوەندیی کۆمەڵەدا ڕێک خست و بۆ خەتێ چووم. کاتێک کە من گەیشتمە خەتێ، ڕێک ئەو دەمە مام جەلال و نەوشیروان مستەفا و فەرەیدوون عەبدولقادر لەژێر چادرێک هاتنە دەرەوە و لە کۆبوونەوەی سێقۆڵی خۆیان تەواو بوون.

گوندی خەتێ زۆر خۆش و دڵگیر بوو، کانی و جۆگەئاوی زۆر و سازگار بوو، سەوز و ڕەنگین و پڕ لە دار بوو. لە جێگایەک هەر لە نزیکی چادرەکە، لە کەپرێکدا کە هەر لە دارودەوەنی ئەو ناوە و لەدەم جۆگەئاوێک دروستیان کردبوو، دانیشتین. لە سەرەتادا لەگەڵ فەرەیدوون دانیشتم و باسی بارودۆخی ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک و کاریگەریی چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگە لە ناوچەکانی شوان و شێخبزێنی و ساڵەیی و گەرمیانم کرد. باسی ئەوەم کرد کە چۆن ئەو چالاکییانە

زەمینە خۆشـکەرن بـۆ کـاری ڕێکخسـتن و فەزایەکـی چـاتر لەنێـو جەمـاوەردا دەخولقێنن.

فەرەیدوون زۆر دڵی بەمە خۆش بوو، یەکسەر بانگی نەوشیروانی کرد و وتی، وەرە بزانە لەسەر کار و چالاکی هێزەکانی پێشمەرگە چی دەوترێت! نەوشیروان هـات و قەدەرێـک دانیشـت و گـوێی گـرت. دوای ئەوە ئەو بەلای ئیشـی خـۆیەوە ڕۆییشت و ئێمە درێژەمان بە کۆبوونەوەی خۆمان دا.

پاشان باسی گەڕانەوەی محەمەد ئەحمەد ڕەحمان بۆ نێو شار کرا، کە دواتر من لە باسێکی دیکەدا قسەی لەسەر دەکەم.

یەکێکی دیکە لە بابەتەکان ئەوە بوو، فەرەیدوون پرسیاری کرد، وتی: ئەو ئارام نـاوە کێـیە؟! منـیش کە نەمزانـی مەبەسـتی چیـیە لەو پرسـیارە، وتـم: یەکـێکە لە کادرەکانی ڕێکخستن! ئیتر هیچی دیکەی نەگوت و مەبەستەکەی ڕوون نەکردەوە.

ئارام، ناوی نهێنی ئاوات ناسیح حەبیب بوو.

ئەو دەمە ئاوات و من تازە یەکتریمان دەناسی، ئەو بەرپرسی کەرتی ڕێکخستنی شـەهید سـیروان بـوو، لە ڕێـگەی مـنەوە پەیوەنـدییان بە کـۆمیتەی ڕێکخـراوی کەرکووکەوە هەبوو، من ئاگام لەوە نەبوو کە لەگەڵ یەکێک لە هاوڕێکانی خۆی لە ڕێکخسـتن ناکۆکییـان هەیە و ئەو هـاوڕێیەی (بەپێـی قسـەی ئـاوات) نـامەیەک بـۆ ناوەندیی کۆمەڵە دەنێرێت و تیایدا لەسەر ئەم دەنووسێت: "ئارام کەسێکی عێراقییە و کردوویانە بە مەسئوولی ئێمە".[٢١٠]

پـاش مـاوەیەک ئـاوات نـامەیەکی لە ڕیزەکـانی لای خـۆیەوە پـێ دەگـات کە بـۆ کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک بەرزی بکاتەوە، نامەکە دەکاتەوە و دەی خوێنێتەوە، تەماشـا دەکـات نـامەکە دەربـارەی خـۆی نووسـراوە، پاشـان نـامەکە وەکـوو خـۆی دەپێچێتەوە و دەیداتە من کە بیگەیەنمە کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک.

نامەکە لە ناوەندیی کۆمەڵە و شەخسـی فەرەیدوونەوە هـاتبوو. ڕاسـتییەکەی من ئێسـتا نـاوەڕۆکی ئەو نـامەیەم لەبیـر نەمـاوە، بەڵام هەر وەکـوو ئـاوات خـۆی

---

٢١٠. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ئاوات ناسیح حەبیب.

دەیگێڕێتەوە لە نامەکەدا نووسراوە: "ماوەیەک پشووی پێ بدەن!".[٢١١] ئەوەش یانی، تەجمیدی بکەن. بێگومان مامۆستا قادر و من ئەو نامەیەمان خوێندووەتەوە، چونکە ئەو دەمە کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک تەنها هەر هەردووکمان بووین و هەر شتێک بۆ کۆمیتە هاتبێت، پێکەوە قسەمان لەسەری کردووە، بەڵام بەڕاستی وردەکاری ئەو مەسەلەیەم لەبیر نەماوە، تەنها ئەوەندە دەزانم، کە ئێمە نەک هەر هیچ ئیجرائاتێکمان لە بەرامبەر "ئاوات"دا نەکرد، بەڵکوو هەر نەبووە بابەتی کۆبوونەی نێوان مامۆستا و من و تەنانەت بە یەک وشەش قسەمان لەسەری نەکرد. هەروەها ئەو نامەیە نەک هەر هیچ کاری لە مامەڵە و هەڵسوکەوتی ئێمە نەکرد، بەڵکوو کاتێک کە ئاوات لەگەڵ مندا باسی وازهێنانی لە کۆمەڵە کرد، من هەوڵیشم لەگەڵی دا، کە جاریٚ پەلە نەکات و چاوەڕێی کۆنفرانسیش بکات.

فەرەیدوون پرسیاری دەنگوباسی نێو خەڵک و ڕێکخستنی کرد، وتی چی لەسەر ئێمە دەوترێت.

منیش دوور لە دیپلۆماسییەت و بێ پێچوپەنا وتم: لەسەر ئێوە، باسی ئەوە دەکرێت، فەرەیدوون عەبدولقادر ئەندامی سەرکردایەتیی ڕێکخراوێکی چەپ و مارکسییە، کەچی بە جۆرێک دەژێت، لەگەڵ باقی پێشمەرگە و کادرەکاندا جوودایە. دەوترێت: فەرەیدوون عەبدولقادر بەسواریی ئەسپ هاتوچۆ دەکات!

فەرەیدوون زۆر تووڕە بوو، ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و لە فیکەی خۆی تێگەییشت و وتی: ئەوانەی ئەو قسانە ئەکەن، مانگانە لە شارەوە ٨٠ دیناریان بۆ دێت! من تێگەییشتم کە مەبەستی "سالار عەزیز"ە.

دوای ئەوە گوتم: ئەڵێن کۆمەڵە سەربەخۆیی خۆی لە دەست داوە و مام جەلال بە ئارەزووی خۆی هەڵی دەسووڕێنێت.

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: مام جەلال ڕیشسپیی ئێمەیە.

پاشان باسی ئەوەم کرد، وتم: ئێستا قسەوباس زۆر لەسەر بوون و نەبوونی بۆرژوازیی نیشتمانی دەکرێت و دەوترێت، بۆرژوازی لەم سەردەمەدا نیشتمانی

---

٢١١. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ئاوات ناسیح حەبیب.

نیــیە و لەگەڵ ئەو دەورانەدا جیــاوازە کە هێشــتا بــازاڕی نــاوخۆیی وڵات پێــک نەهاتبوو!

ئەویش لەبەرامبەردا گوتی: نەخێر ئەوە وا نییە، بۆرژوازیی نیشتمانیمان هەیە و چەندین دەوڵەمەند و سەرمایەداری کورد لە بەغدا هەن، نیشتمانپەروەرن و دۆستی شۆڕشن.

ئینجا پرسیاری ئەوەم کرد، وتم: هاوڕێیەکمان[212] لە شارۆچکەی حەویجە چەند کەسـێکی چەپ و مارکسـیی عەرەب دەناسـێت و قسەوباسـیان پـێکەوە هەیە، بـۆ ڕێکخسـتنی ئەوانە چـی بکرێـت، لە کاتێکـدا کـۆمەڵە کوردسـتانییە و بـۆ کـوردێکی عێراقی لە هەر کوێیەک بێت، بەغدا، بەسرە، ڕومـادی ... کێشـەیەک نییە، وەلێ بۆ عەرەبێکی عێراقی نابێت!

ئەو لە وەڵامـدا گـوتی: ئەوانـیش بـا بۆخۆیـان ڕێکخـراوی مارکسـیی خۆیـان دابمەزرێنن!

ئەو دەمە ئێمە تازە لە گەڕەکی بەلاشاوای شاری هەولێر لە نزیک کۆلێجی ئاداب ژوورێکمـان لە خانوویەکـدا بەکـرێ گرتبـوو، بـۆئەوەی کۆبـوونەوەی ئەنجـوومەنی سـەرکردایەتیی یەکێتیـی خوێنـدکارانی کوردسـتانی تێـدا ئەنجـام بـدەین و بـاقیی ئیشوکارەکانی خۆمانی تێدا بکەین.

ئەو ژوورەمـان لە ڕێگەی سیروان کەریـم مـحەمەد (سـیروان پاڵانی)ەوە دەست کەوت. سـیروان ئەو سـاڵە خوێنـدنی زانکـۆی تەواو کـرد، واتە کـاری ئەو لەنێـو یەکێتیی خوێندکاران کە بەرپرسـی لقی هەولێر و زانکۆی سـەلاحەدین بوو کۆتـایی پێ هات. من تا ئەو دەمە بەرپرسی لقی کەرکووک بووم، پاشان لە جێگەی سـیروان بـوومە بەرپرسـی لقـی هەولێـر و زانکـۆی سـەلاحەدین و "خالیـد مـحەمەد فـاتیح" (سەمیر نووری)م پێشنیار کرد لەجێی خۆم ببێتە بەرپرسی لقی کەرکووک. ئاوات ئەحمەد (سەرچڵ) بەرپرسـی لقی سلێمانی و عیسـام نـامیق بەرپرسـی لقی مووسـڵ بوون.

---

٢١٢. مەبەستم لە خالید محەمەد فاتیح (سەمیر نووری) بوو.

هەر لە سەرەتادا جارێکیان خالید و عەزەدین مەجید محەمەد (جەمال ئەیووب) و من (زۆر دڵنیا نیم، دوو جار و دوودوو چووین، یان یەک جار و هەرسێکمان پێکەوە) بۆ ژوورەکە چووین، بۆ ئەوەی هێندێک پێویستی بۆ ببەین. لە دەرگامان دا، دەرگایان لێمان کردەوە و چووینە ژوورەوە. کاتێک ئێمە بەرەو ژوورەکەی خۆمان چووین، کەسێک لە ژوورەکەمان بوو، سڵاومان لێی کرد، وەڵامی سڵاوەکەمانی دایەوە و دەستبەجێ لە ژوورەکە هاتە دەرەوە و ئەوێی چۆڵ کرد. من ئەو کەسەم ناسییەوە، عەدنان کەریم شەریف بوو.

هەر وەکوو بێتەوە بیرم، عەدنان کتێبێک لە کتێبەکانی هەڵبژاردەیەک لە نووسراوەکانی "لێنین"ی بە دەستەوە بوو، بووە جێگە سەرنجی ئێمە. عەدنان، چ بەهۆی ئەوەی هاوگەڕەک بووین و سەلمانی برای هاوڕێی لوقمانی برام بوو، چ بە هۆی ئەوەی کاتی خۆی ئەندامی "ڕێکخراوی ڕەنجدەرانی کوردستان" بوو، لە ئەنجامی شاڵاوێک بۆسەر ئەو ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٧٧ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێکانی دەگیرێت و کۆتایی بە ڕێکخراوەکەیان دێت،[٢١٣] من ئەوم دەناسی.

کاتێک ئێمە ئەوێمان بەجێ هێشت، قسەمان چووە سەر عەدنان و ڕووبەڕووبوونەوەمان لە ژوورەکە و کتێبەکەی دەستی ... منیش بە خالیدم گوت: من ئەو شەخسە ئەناسم و لەگەڵ یەکدی هاوگەڕەکین، وەلێ ڕەنگە ئەو من نەناسێتەوە. ئەو کەسە لە جەماعەتی ڕێکخراوی ڕەنجدەران بوو، گیران و کۆتایی بە ڕێکخراوەکەیان هات. بەڵام ئەمانە لە زیندان گۆڕانیان بەسەردا هات و بوونە یەکێتیی تێکۆشانی کارگەران.

بە هەر حاڵ! کاتێک من ئەوەم بینی، ئەو شوێنەم نەک هەر بە گونجاو نەزانی، بەڵکوو بە خراپ و خەتەریشم زانی.

ئەم ڕووداوە لەو دەمەدا بوو کە من کۆبوونەوەم لەگەڵ ناوەندیی کۆمەڵە و فەریدوون عەبدولقادردا هەبوو. لەو کۆبوونەوەیەدا لەنێو باسی ئیشوکارەکانی

---

٢١٣. مێژوویەک لە یادەوەریدا، سالار ڕەشید، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٥، ل ٩-٢٣.

خۆمان و نەخشە و پلانی ڕێکخستنمان، باسی ئەو بنکەیەم بۆی کرد و وتم، بەڵام بەڕێکەوت کەسێک لە هەمان خانووە کە ڕەنگە بیناسی و لە زیندانی ئەبووغرێب لەگەڵتان بووە، ئەویش عەدنان مام کەریمە، ئەوان بە خانەوادە یەکێتین و سێ برای پێشمەرگەن، وەلێ عەدنان خۆی نا.

فەرەیدوون هیچی نەوت، بەڵام دیار بوو عەدنانی ئەناسی و دواتر لەگەڵ عەلی بچکۆل کە هاوڕێی دێرین و زیندان و نزیکی خۆی بوو، وە ئەمیش دیسانەوە لە زیندان لەگەڵ عەدنان بووە، باسی کردبوو.

جارێکیان عەلی بچکۆل ڕێی دەکەوێتە ماڵی دایک و باوکی عەدنان لە گوندی قەمچووغە و باسی عەدنان دێتە پێشەوە، وە یان ئەوەتا ئەم پرسیاریان لێ دەکات. دایکی عەدنانیش ئەڵێ: عەدنان بۆ خاریج چووە (عەدنان لەلای دایک و باوکی وتبووی من بۆ خاریج ئەچم). عەلی بچکۆلیش ئەڵێ، خاریجی چی، عەدنان وا لە هەولێرە! بەمە دایکی عەدنان زۆر نارەحەت دەبێت و باری دەروونی تێک دەچێت.

لەم ساڵانەی دوایی کە عەدنان ئەو چیرۆکەی بۆم گێڕایەوە، زورم پێ ناخۆش بوو و زۆر بەداخ بووم، خۆی و خانەوادەکەی تووشی نارەحەتی هاتوون و قسەکانی من ئەو ئەنجامەی لێ کەوتووەتەوە.

سەرەنجام ئێمە وازمان لەو جێگایە هێنا و جارێکی تر بۆی نەچووینەوە.

ماوەیەک دوای ئەوە خالید کەوتە ژێر کاریگەریی 'کارگەران'ەوە و وازی لە کۆمەڵە هێنا. لەو ماوەیەدا خالید ئەگەرچی عەدنانی نەدەناسی، ئەچێتەوە بۆ ئەو خانووە و لە دەرگا ئەدات و عەدنان ئەبینێ و پێی ئەڵێت، ئەمەوێ هەندێک قسەت لەگەڵدا بکەم! دوای ئەوە عەدنان دێتە دەرەوە و ئەچێت پیاسەیەکی لەگەڵدا دەکات. خالید بە عەدنان دەڵێت: کاکە جەماعەتی یەکێتی بەم جێگایەی ئێوەیان زانیوە، بۆ ئاگاداریت! ئەویش دوای ئەوە، ئەوێ چۆڵ ئەکات و ئەگوازێتەوە.

عەزەدین مەجید محەمەد (جەمال ئەیووب)گێڕایەوە: ڕۆژێکیان لە ماڵ جەمیل ئەمین عەبدولڕەحمان بووم،[٢١٤] جەمیل بە پێکەنینەوە وتی: چەند کەسێکی دەستگای

---

٢١٤. جەمیل ئەمین لە ڕێکەوتی ٢٠١١/٨/١٧ بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد.

زانیاریی یەکێتی لە هەولێر چوونەتە سەر چەند هاوڕێیەکمان! منیش (عەزەدین) وتم: وەڵا بەڕێکەوت ئەوە ڕووی دا، ئەوە ئێمە بووین! جەمیل دەستی بە پێکەنین کرد و وتی: تۆ بزانە ئەو شتانە چۆن گەورە دەکرێنەوە![٢١٥]

ئەوەی شایانی گوتنە، فەترەیەک دوای ئەوە عەدنان بۆ لای خانەوادەکەی کە لە گوندی قەمچووغەی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دەبن، دەگەڕێتەوە و دووبارە لەوێ نیشتەجێ دەبێتەوە. بەڵام هەر وەکوو خۆی باسی دەکات، هێشتا تازە مانگێک و چەند ڕۆژێک بەسەر شەهیدبوونی عادیلی برایدا تێ ئەپەڕێت، ئیحسانی برایشی شەهید دەبێت. هێشتا چلەی ئەمیان تەواو نەبووە، ڕۆژێکیان عومەر فەتاح و شەوکەتی حاجی موشیر و چەند کەسێکی تر بۆ پرسە و سەرەخۆشی دێن بۆماڵیان. لە کاتی هەڵسانیان بە باوکی دەڵێن، عەدنان ئیتر شووڵی لێ هەڵکێشاوە، باشتر وایە واز بهێنێت، نەوەکوو کەسێک لە پەناوە زەفەری پێ ببات. ئیتر ئەویش بەناچاری لە بەهاری ساڵی ١٩٨٦ ئەوێ بەجێ دەهێڵێ و بۆ سلێمانی دەچێت و هەتا سەروەختی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ بەنهێنی لەوێ ژیان بەسەر دەبات.

کاتێک کۆبوونەوەکەمان بەرەو کۆتایی دەچوو، فەرەیدوون داوای ئەوەی لێم کرد، دوای گەڕانەوەم بۆ نێوشار، بەڵکوو بە نامەیەکدا نرخی کۆمەڵێک شتومەکی وەکوو، شەکر و چا، ڕۆن و برنج، ئارد و تایت و سابوون ...ی بۆ بە لیستێک بکەم و بۆی ڕەوان بکەم. لەڕاستیدا من کەم بایەخ بە نرخی شتومەک دەدەم و ئەگەر نرخی شتێکیشم زانی، ئەوا زوو لەبیرم دەچێتەوە، بۆیە کاتێک کە گەڕامەوە، بەناچاری چوومە دوکانی بایەعییەکەمان کە هەر لەپشتی ماڵی خۆمان و نزیک چایخانەکەی ئەحمەد چایچی بوو، برادەرێکی خۆمی لەسەر بوو بەنێوی کەریم، لەناو قسەوباسدا پرسیاری نرخی هەموو ئەو شتانەم لێ کرد و دوایی هەموویانم نووسی و بە نامەیەکدا بۆ 'فەرەیدوون'م نارد.

٢١٥. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز عەزەدین مەجید محەمەد (جەماڵ ئەیووب).

# بڕیاری کوشتنی محەمەد

هەر وەکوو باسم کرد، یەکێک لە باسەکانی کۆبوونەوەی گوندی خەتێ لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر، باسکردنی کێشەی محەمەد ئەحمەد ڕەحمان و ڕاکردن و گەڕانەوەی بۆ نێوشار بوو.

لەنێو قسەکانمدا وتم، دوای ئەوەی محەمەد گەڕایەوە، چووم بۆ ماڵیان و باسی ئەو کێشەیەمان کرد و وای پێ دەچێت، زیانی بۆ ئێمە نەبێت، بەڵام هەر ئەبێت ئاگاداریی خۆمان بکەین و بەحەزەر بین!

فەرەیدوون یەکسەر هاتە گۆ و گوتی: ناونیشانەکەیمان پێ بدە، ئێمە ئەیکوژین! ئیتر پێش ئەوەی من هیچ بڵێم، درێژەی بە قسەکانی دا و وتی: ئێمە بۆیە هەتا ئێستا ماوینەتەوە و ئاوها بەهێزین و وا و واین، چونکە بەو شێوەیە کارمان کردووە ...

کاتێک گوێم لەو قسەیە بوو، زۆر نارەحەت بووم و ئازار بە ویژدانم گەییشت. پاشان وتم: نەخێر کاک فەرەیدوون! من ناڵێم محەمەد کەسێکی ناپاکە و دەستی لەگەڵ دەستگا ئەمنییەکانی بەعس تێکەڵ کردووە و بووەتە پیاویان و بەگرتمان ئەدات، بەڵام وەک ئەوەی پێکەوە کارمان کردووە و ئەو چووە دەرەوە و ئێستا گەڕاوەتەوە و گشت نهێنییەکی ئێمە دەزانێت، خۆ دەبێ حەزەرێکمان لێی هەبێت. دوای ئەو قسانەی من هیچی تری نەگوت و چووینە سەر باسێکی دیکە.

من وای بۆ دەچم ناوەندیی کۆمەڵە وە یان دروستتر بڵێم، نەوشیروان و فەرەیدوون پێشتر لەنێو خۆیاندا باسی ئەم بابەتەیان کردووە و لەلای خۆیانەوە، هەردووکیان بەو بڕیارە گەییشتوون، بۆیە فەرەیدوون قسەکەی منی زوو بۆخۆی قۆستەوە و ڕەنگە ویستبێتی بشزانێ من پشتیوانی لێ دەکەم یان نا.

ئەوەی وا دەکات ئەو بۆچوونەی من پشتڕاست بکاتەوە ئەوەیە، لە گفتوگۆیەکم لەگەڵ "کەریم حەمید ڕەسوول"دا باسێکی هاوشێوەی ئەوەی بۆ گێڕامەوە و وتی:

"جارێکیان، چەند مانگێک لەدوای گەڕانەوەی محەمەد بۆ نێوشار، سەردانێکی گوندی "خەتێ"م کرد، هەر وا سەرپێیی و لە بەردەرگای چادرێکەوە لەگەڵ نەوشیروان مستەفا هەندێک قسەمان کرد. نەوشیروان پرسیاری "محەمەد"ی لێم کرد و وتی: وەزعی چۆنە؟

وتم: وەزعی باش نییە، سەری لێ شێواوە، لەڕ و لاواز بووە و ڕەنگوڕووی ڕەش داگیرساوە.

وتی: لە کۆڵی بکەنەوە!

سەرەتا واقم وڕما ... پاشان وتم: وابزانم بە هەڵە لێم تێگەییشتی، من وتم، تەنها هەر ئەوەندەیە، لاواز بووە و سەری لێ شێواوە، ئەگەرنا هەقی بەسەر هیچەوە نییە!

دوای ئەوە زۆر بەحەددی قسەی کرد و وتی: بە مامۆستا قادر بڵێ، محەمەد ئەبێ تەسفییە بکرێ!

من ویستم موناقەشەی لەگەڵدا بکەم، بەڵام ئەو وتی: تۆ واز بێنە، من لەگەڵ تۆ قسە ناکەم!

وتم: مەعقوول نییە کەسێک گومانی ئەوەی لێ بکرێ کە ڕووخابێت، بێت ناو بدات!

وتی: معامەلەی ئەوە ناکەین، ناو ئەدات یان نایدات، ئەوە ڕووخاوە.

پاشان وتی: من وەختم نییە، کۆبوونەوەم هەیە، بە مامۆستا قادر بڵێ: بێت بۆ لام!

دوای ئەوەی چوومەوە بۆ کەرکووک، ئەو مەسەلەیەم لەگەڵ مامۆستا قادر باس کرد، مامۆستا قادر زۆری پێ ناخۆش بوو، وتی: شتی وا نابێت، مەگەر بەسەر لاشەی مندا بڕوا، تۆ نایزانیت، من خۆم تێی ئەگەیەنم، خەمت نەبێت و لەبیر خۆتی بیەرەوە!

لەم دوو ڕووداوەوە، بەو ئەنجامگیرییە دەگەین کە چۆن نەوشیروان مستەفا و فەرەیدوون عەبدولقادر پێکەوە بە جووتە و بۆخۆیان، بەبێ ئەوەی ڕای ئێمە وەک کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک وەربگرن، بڕیاری کوشتنی "محەمەد"یان دەرکردووە!

لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە: محەمەد ماوەیەکە گەڕاوەتەوە بۆ نێوشار و ئەو دوو مادەیەی کە مابووی ئیمتیحانی لێ داوە و خەریکی ژیانی ئاسایی خۆیەتی. دوای ئەوەی قسەمان لەگەڵیدا کردووە، پێ ناچێت کەسێک بێت دەستی لەگەڵ دەستگا ئەمنییەکاندا تێکەڵ کردبێت. ئەگەر ئەو نیازی ئەوەی هەبووایە، زەبر لە ئێمە بوەشێنێت، ئەگەری زۆرتر ئەوە بوو، هەر لە سەرەتاوە ئەو کارەی بکردایە، بەڵام کاتێک نەوشیروان و فەرەیدوون باسی تەسفییەی ئەو دەکەن، ماوەیەک بەسەر

هاتنەوەکەیدا تێپەڕیوە! کەواتە، ئەگەر هۆکاری بڕیارەکەی ئەوان، ترسی زەربەدان لە ئێمە نەبێت، ئەبێ چی بێت؟

من وای بۆ دەچم، مەسەلەکە پەیوەندی بە جیاوازی بیرکردنەوەوە هەبێت. چونکە هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا قسەم لەسەر کردووە، محەمەد لەجیاتی ئەوەی بۆ سەرکردایەتی بچێت، بۆ مەڵبەندی یەک دەچێت! پاشان هەر لەوێشەوە نامەی دەست لە کار کێشانەوەی خۆی لە کۆمەڵە بۆ ناوەندی دەنێرێت. بەڵام دیارە محەمەد لەبەرامبەر خەتی داش عێراقیشدا سارد بووەتەوە و ئەو هیوایەی کە زووتر پێی هەبوو، کەم بووەتەوە، ئەگەر نا مەڵبەندی یەکی بەجێ نەدەهێشت و تەسلیم نەدەبووەوە.

بەڵام سەرباری ئەوەش محەمەد لەنێو شارەوە هەر چاودێری ئەو باڵەی نێو کۆمەڵەی کردووە و هەندێک جار ڕابەرانی ئەو باڵەی بینیوە، هەر وەکوو ئاوات ناسیح حەبیب باسی دەکات، جارێکیان لە سەردەمی مفاوەزاتی یەکێتی و حکوومەت و ماوەیەکی کەم بەر لە کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە، لەگەڵ محەمەد ئەچن بۆ لای سالار عەزیز لە سلێمانی و دەربارەی ئامادەکاری خۆیان بۆ کۆنفرانس لە بەرامبەر باڵی نەوشیروان و گرووپی زیندان پرسیاری لێ دەکەن.

دووریش نییە لە نامەی وازهێنانەکەیدا کۆمەڵێک ڕا و ڕەخنەی خۆی نەنووسیبێت کە بێگومان ئەو نامەیەش دەگاتە دەستی نەوشیروان و فەرەیدوون، بۆیە ئەم دووانە بەجووتە بڕیاری کوشتنی محەمەد ئەدەن.

محەمەد مرۆیەکی زرنگ، بەتوانا و مەحبووب بوو، بەڵام بە داخەوە لەو ساڵانەی دواییدا بەهۆی کێشەی شەخسی و خێزانی و هێنانی ژنی دووەمییەوە، شوێن و جێگەی خۆی ون کرد و هاوڕێ نزیکەکانیشی لێی تەکینەوە.

هەروەها محەمەد لە کاری سیاسیشدا کەوتە نێو ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی و ڕێکخراوی "کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی"یەوە و سەرەنجام لە ٣١ی ئابی ساڵی ١٩٩٦ کاتێک کە پارتی بە هاوکاری حکوومەتی عێراقی هەولێری گرت، محەمەد کەوتە بەر شالاوی دەستگای هەواڵگریی عێراقی و گیرا، سەرەنجام حوکمی زیندانیی بۆ دەرکرا و ڕەوانەی زیندانی ئەبووغرێب کرا، پاشان جۆری حوکمەکەیان بە ئیعدام بۆ گۆڕی و لە ڕێکەوتی ١٩٩٧/٧/٢٤ هەر لەوێ لە سێدارە درا.

# ئەیووب کوێخا (ئەیووب محەمەد ڕەزا)

ئەیـووب کە لەنێـو خەڵکیـدا بە مامۆسـتا ئەیـووب دەناسـرا، لە نیـوەی یەکەمـی سـاڵانی هەشـتاکاندا یەکێـک بـوو لە ئەنـدام و کادرەکـانی کـۆمەڵەی ڕەنجـدەرانی کوردستان و پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە فەتاح کوێخا (فەتاح ڕەزا محەمەد ساڵح)وە هەبوو. ئەمـانیش لە پۆلێکدا بوون کە تەحسـین نـامیق عەبدوڵا بەرپرسـی بـوو، ئەو پۆلەش سەربە کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن بوو کە من بەرپرسی بووم.

فەتـاح کە دەکـاتە مـامی ئەیـووب، نـاکۆکی و کێشـەیەکیان لە نێوانـدا هەبـوو، مـن ئێستا نایەتەوە یادم چی بوون، وەلێ دەزانم کێشەکە درێژەی کێشا و هەر چەندمان دەکرد بۆمـان چارەسـەر نەدەکرا و نەمانـدەزانی خەتـا لە کێیە، چونکە بەپێی ئەو نامانەی دەگەییشـتنە مـن، هەر یەکە بە جۆرێک باسـی کێشـەکەی دەکرد و قسـەکان وێک نەدەهـاتنەوە. بـۆیە مـن پێشـنیاری ئەوەم کـرد، هەردووکیـان پێکەوە دابنیشـن، ڕێکۆردەرێـک دابنـێن، موناقەشـەی کێشـەکە بـکەن، قسـەکان تۆمـار بـکەن و پاشـان کاسێتەکە بۆ من بنێرن. سـەرەنجام وایان کرد و منیش گوێم لە قسـەکانیان گرت. دوای ئەوە گەییشـتمە ئەو بـڕوایەی، وا چـاکە پەیوەنـدیی ڕێکخراوەیـی ئەو دوو هـاوڕێیە لێـک دابـبـڕین و ئەو شـانانەی کە لەلای ئەیـووبن، لێـی وەربگـرینەوە و خۆیشی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە خۆمەوە هەبێت.

لە ئـاخر و ئـۆخری سـاڵی ١٩٨٣دا بـوو، لە نـامەیەکی چوکلێتیـدا نـاو و ناونیشانەکەیم پێ گەییشت و چووم پەیوەندیم پێوە کرد.

کـاتی خـۆی ڕوونـاک عوبێـد سـەعاتچی پەیوەنـدیی ڕێکخراوەیـی بـۆ لای مـن گـوێزرایەوە، ئەگەر بە هەڵەدا نەچـووبم، ئەمە یەکێـک بـوو لەو شـانانەی کە پێشـتر پەیوەندی بە "ئەیووب"ەوە هەبوو.

مـاڵی ڕوونـاک لە زێویە بوو، کەوتبووە سـەر ئەو ڕێگا خـۆڵەی کە بۆ گەڕەکی ڕەحیماوا دەچوو، لەوسەری کۆڵانەکە بە دەستی ڕاست، ئەو لە خـانەوادەیەک بـوو بە شیووعی دەناسران.

ڕووناک بۆ ماوەیەکی زۆر کورت پەیوەندی بە منەوە هەبوو، دوای ئەوەی وازم لە کۆمەڵە هێنا، پەیوەندییەکەمان کۆتایی پێ هات.

ئەیووب کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەندی گەڕەکی حەمام عەلی بوو، براکانی هەموو خاوەنی کار و کارگە بوون، تەنها ئەم نەبێت.

زۆربەی هەفتەکان بۆ لای ئەیووب دەچووم و کۆبوونەوەی دەوریی خۆمان دەکرد. خانووەکەیان غەربی بوو، هەر لە دەرگای دەرەوە دەچوویتە ژوورەوە ڕاڕەوێکی کورتی هەبوو، دوای ئەوە بە دوو هەنگاو دەچوویتە نێو هۆڵی میوانەوە. هەموو جارێک لەو هۆڵە دادەنیشتین. بەڵام چۆن دانیشتنێک؟! ئێمە لە گەرمەی خوێندنەوەی بڵاوکراوە و قسەوباس و موناقەشەدا بووین، ئەوەندەم دەزانی کەسێک خۆی بە ژووردا ئەکرد، دوای ماوەیەک کەسێکی تر ئەهات! بەو جۆرە نەماندەتوانی کۆبوونەوەکانمان لە کەشێکی نهێنی و ئارامدا ببەستین. بۆیە من لەو شێوازە لە کۆبوونەوە زۆر ناڕەحەت و لە ئەیووبیش پڕ و پەست بووم.

من لەگەڵ ئەیووبدا تەنها پەیوەندییەکی ڕێکخراوەیی ڕووتم هەبوو. واتە تەنها لەو هۆڵە یەکتریمان دەبینی و هیچ پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی و برادەریمان لە دەرەوەی ئەو چوار دیوارەدا نەبوو. تەنانەت بە هۆی ئەو کێشانەی کە پێشتر لەگەڵ فەتاح و بە هۆی ئەو فەوزا و بێ دیسیپلینییەوە کە هەیبوو، ٩ مانگ پەیوەندیمان بەیەکەوە هەبوو، بەبێ ئەوەی جێگا و ڕێگای من بزانێت.

جارێکیان ئەیووب تەرحی ئەوەی لەگەڵ مندا کرد، ئەیەوێت پلانێک بۆ کوشتنی قالە فەرەج دابنێت، وەلێ من ئەوەم پێ پەسەند نەبوو کە خۆی لە قەرەی کارێکی وا بدات.

ئەوەی شایانی باسە، لەو دەورانەدا بەهۆی ئەوەی قالە فەرەج پێشمەرگە و خەڵکی گوندنشینی هەراسان کردبوو، هەمیشە بەدوایانەوە بوو، زەبری زۆر و زیانی گەورەی لێیان ئەدا، گەلێک کەس بیریان لەو کارە دەکردەوە کە ئەیووب بیری لێ دەکردەوە.

جارێکیان ئەیووب باسی ئەوەی بۆم کرد، هاوڕێیەکی هەیە سەر بە ڕێکخراوی "کار"ە، دەیەوێت زیاتر لێی نزیک بێتەوە، بڵاوکراوەکانی لێ وەربگرێت و زانیاری زیاتری لەبارەوە بزانێت و بۆ منیشی بهێنێت.

من له بەرامبەردا هیچم نەوت، نە بەوەی پێم باش بێت، یان پێم خۆش بێت و هانی بدەم، نە بەوەیش کە دژی بم. لەڕاستیدا من هەستم بە پێویستی ئەو کارە نەدەکرد و من خۆم ئۆرگانەکەی ئەوانم دەست ئەکەوت و ئەم خوێندەوە و پێشم وابوو، ئەوانە تەرەفداری ڕێبازی ترۆتسکین و بە لادەرمان دەزانین. ئەبێ ئەوەش بڵێم، ئەیووب کەسێکی پاک و بێوەی بوو، ئەوەی ئەو مەبەستی بوو، لە کارێکی فزوولی بەولاوە شتێکی دیکە نەبوو.

من ئەو دەمە بە هۆی جۆری پەیوەندییەکەمانەوە، بوار نەڕەخسا لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە شارەزای ئەیووب بم، وەلێ لەو هاوڕێیانەوە[٢١٦] کە تێکەڵییان لەگەڵیدا هەبوو، دەگێڕنەوە، ئەیووب کەسێکی کراوەی دوور لە دەمارگیریی فکری و حیزبی بووە، کەسێکی کۆمەلایەتی بووە و هاوڕێی وای هەبووە لەگەڵ کەسوکاری خۆیدا بەینی خۆش نەبووە، کەچی ئەم چووە تێکەڵیان بووە، چای لەگەڵ خواردوونەتەوە، حیکایەتی لەگەڵدا کردوون و پەیوەندیی خێزانی لەگەڵ پێک هێناون.

لەگەڵ پیر و بەتەمەنەکانیشدا هاوڕێیەتی خۆش بووە، بە زمانی خۆیان لەگەڵیان دواوە و تەنانەت خوازبێنی ژنی بۆ دوو هاوڕێی خۆی کردووە.

ئەیووب کەسێک بووە لە ڕووی مادیشەوە بەتەنگ دەورووپشتەکەیەوە بووە و لەڕاست هاوڕێکانیدا خاوەنی گیرفانی خۆی نەبووە. هەموو جارێک ئەوەی لەبەرکیدا بووە، لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەشی کردووە و کۆمەکی بۆ کەسانێک کۆ کردووەتەوە کە بۆ نەخۆشی، یان بۆ شتومەکی نێومال پێویستییان بە دەستگیرۆیی هەبووە.

من لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٨٤دا وازم لە کۆمەڵە هێنا و پەیوەندیم لەگەڵ "ئەیووب"یش کۆتایی پێ هات.

ئەیووب لە ڕێکەوتی ١٩٩٢/٤/٢٧ بەهۆی نەخۆشی گورچیلەوە کۆچی دوایی کرد.

---

٢١٦. گفتوگو لەگەڵ بەڕێز کەمال عەبدولا (نەسرەدین کەریم عەبدولا).

# مفاوەزاتی یەکێتی

حکوومەتی عێراق جارێکی دیکە و لە ڕێگەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و شەخسی عەبدولڕەحمان قاسملۆوە داوای گفتوگۆی لە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کرد. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٣ بڕیاری دا، ئاگربەست بکات و لەگەڵ حکوومەتی عێراقیدا بکەوێتە گفتوگۆوە.[٢١٧]

ئەم گفتوگۆیە لە کاتێکدا بوو کە دەوڵەتی عێراق لەگەڵ دەوڵەتی ئێران لە گەرمەی شەڕێکی خوێناویدا بوو. یەکێتیی نیشتمانیش لە کوردستاندا ببووە هێزێکی گەورە و کاریگەر و بەشێک لە هێزە چەکدارەکانی عێراقی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو.

سەرەتای کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣ بە برووسکە هەموو مەڵبەندەکان، تیپەکانی پێشمەرگە، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە و لقەکانی شۆڕشگێڕان، لە ڕاگرتنی شەڕ ئاگادار کرانەوە. لەدوای ئەم بڕیارەی یەکێتی، سەدامیش فەرمانی بە هێزە چەکدارەکانی عێراق دا، ئۆپەراسیۆنی سەربازی دژی چەکدارەکانی یەکێتی ڕابگرن.[٢١٨]

ئەو دەمە مامۆستا قادر و من لە ڕێکخراوی کەرکووکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووین. محەمەد ئەحمەد ڕەحمان دوای ئەوەی ڕای کرد و چووە دەرەوە و پاشان هاتەوە نێوشار، وازی لە کۆمەڵە هێنابوو. هێشتا "تەحسین نامیق"مان بۆ کۆمیتەی ڕێکخراو ئیزافە نەکردبوو. واتە، ئەو دەمە مامۆستا و من سەرکردایەتیی تەواوی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەمان لە شاری کەرکووک ئەکرد، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ئاگاداری گفتوگۆی نێوان یەکێتی و حکوومەت نەبووین و نەک هەر هیچ پرسوڕایەک بە ئێمە نەکرا و نەزەرمان وەرنەگیرا، بەڵکە ئێمە خۆمان لە خەڵکەوە بیستمان.

---

٢١٧. خولانەوە لەناو بازنەدا، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپ و بڵاوکردنەوەی مەڵبەندی ئاوەدانیی کوردستان، ساڵی ١٩٩٩، ل ٧.

٢١٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٩.

له کتێبی "گفتوگۆی شۆڕش لەگەڵ میری"دا هاتووە و ئەڵێت: ئەوە بوو لە پاییزی ساڵی ۱۹۸۳دا میری جارێکی تر پەیوەندی بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کرد. سەرکردایەتیش کەوتە پرسکردن بە هەموو سەرکردایەتییەکانی کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان، بە هەموو کادرە سیاسی و سەربازییەکانی خۆی، هەر وەکوو پرسیشی بە دەیان ڕۆشنبیر و پیاوماقووڵ کرد. ڕای هەموو ئەنجوومەنەکانی دێهاتی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستانیشی وەرگرت. لە ئەنجامدا هەموو لایەک بەگشتیی دەنگ، گفتوگۆکردنیان پەسەند کرد. ئینجا سەرکردایەتیی یەکێتی بڕیاری گفتوگۆکردنی بەگشتیی دەنگ دا ...[۲۱۹]

نەوشیروان مستەفاش لە کتێبەکەیدا، هەمان شت دووبارە دەکاتەوە.[۲۲۰]

دێتەوە یادم، ئەو دەمە من هێشتا لە زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر بووم. لەگەڵ دکتۆر موحسین هاوڕێی یەکتری بووین و گەلێک جار یەکتریمان دەبینی و قسەوباسی سیاسیمان دەکرد. دیارە پەیوەندیی ڕێکخراوەییمان لای یەکتری باس نەکردبوو، هەر وەکوو دەبوو باس نەکرێت، بەڵام ئەو دەمە ئەو لە ڕێکخراوی هەولێر بوو. باسی ئەوەمان کرد کە دەنگۆی گفتوگۆی نێوان یەکێتی و حکوومەت لە ئارادایە، ئەو نەک هەر نەیبیستبوو، باوەڕیشی نەدەکرد.

مامۆستا عادیل ڕەفیق کە لەو دەمەدا ئەندامی ڕێکخراوی سلێمانی بووە، دەڵێت: ناوەندیی کۆمەڵە، تا ئەو دەمەی فەرەیدوون عەبدولقادر چوو بۆ بەغدا، هیچ هەواڵێکی لە ڕێکخراوی سلێمانی نەگێڕابووەوە کە ئەوان بڕیاری مفاوەزاتیان داوە و نوێنەریان بۆ بەغدا ناردووە.[۲۲۱]

من دێتەوە یادم، لە کاتی ئەو گفتوگۆیەدا، لە کۆبوونەوەیەکی جەماوەری لە گوندی تۆماری سەر بە ناوچەی شوان، یەکێک پرسیار لە نەوشیروان مستەفا دەکات و دەڵێت: لە کاتێکدا ئێوە لەگەڵ حکوومەتی بەعس خەریکی گفتوگۆن، ئایا

---

۲۱۹. گفتوگۆی شۆڕش لەگەڵ میری، نووسینی: مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، چاپخانەی شەهید جەعفەر، کانوونی دووەمی ۱۹۸۵، ل ۱، ۵۳، ۹۵.

۲۲۰. خولانەوە لەناو بازنەدا، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپ و بلاوکردنەوەی مەڵبەندی ئاوەدانیی کوردستان، ساڵی ۱۹۹۹، ل ٦٢.

۲۲۱. هەندێک لە دیکۆمێنتەکانی ئاڵای شۆڕش، عادیل ڕەفیق، چاپی یەکەم، ساڵی ۲۰۱۷، ل ۱٤۹.

هیچ پرسیێکتان بە پێشمەرگە کردووە؟ نەوشیروان مستەفا بە تووڕەییەوە وەڵام ئەداتەوە و ئەڵێت: ئێمە خۆمان شۆڕشمان کردووە و هەر خۆشمان مفاوەزات ئەکەین، پێشمەرگە سبەی ئەچێت تەسلیم ئەبێتەوە، ئەوە ئێمەین دەبێت بمێنینەوە!

لەو دەمەدا چەند هاوڕێیەکمان بە نوێنەرایەتیی یەکێتیی خوێندکاران بۆ دیداری نەوشیروان مستەفا دەچن، ئەو دەمە من بۆم نەکرا و لەگەڵیان نەبووم، عیسام نامیق کە ئەو دەمە سکرتێری ڕێکخراوەکە بوو، لەگەڵیان بوو. هاوڕێکانمان ڕەخنە لە سەرکردایەتیی یەکێتی دەگرن و گلەیی ئەوەیان لێ دەکەن، لە پەیوەند بە مفاوەزاتەوە هیچ پرس و ڕایەکیان پێ نەکراوە! نەوشیروان تووڕە و دەهری دەبێت و دەڵێت: ئێوە چین تا پرستان پێ بکەین! ... هەڵدەستێت و بەجێیان دەهێڵێت!

کەواتە، نەک هەر ئەندامانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شارە گرنگەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکووک کە لەژێر ترسناکترین بارودۆخی سەرکوت و خەفەقان بێباکانە خەباتی نهێنیی خۆیان دەبەنە ڕێوە، نەک هەر ئەو پێشمەرگانەی سینگی خۆیان ناوەتە بەر گولەی دوژمن و پارێزگاری لە نەوشیروان مستەفا و باقیی سەرکردایەتی دەکەن، لە بڕیاری گفتوگۆ بێئاگا بوونە، بەڵکە سەرکردایەتیی کۆمەڵە لە شارەکان و ڕابەرایەتیی ڕێکخراوە جەماوەرییەکانیش نەک هەر پرسوڕایان پێ نەکراوە، تەنانەت وەکوو هەواڵێکیش لێی ئاگادار نەکراونەتەوە!

بەڵام بەپێچەوانەوە، بزانین کێن ئەوانەی ئاگادار کراونەتەوە.

مامۆستا عادیل ڕەفیق دەڵێت: ڕۆژێک لە کۆبوونەوەی ڕێکخراوی سلێمانیدا، سەلیم نامەیەکی لە جەلال تاڵەبانییەوە هێنا کە ئاراستەی هەندێک کەسایەتیی نێوشار کرابوو کە تیایاندا هەبوو، خۆی و کەسوکاریشی نەک هەر بەعسی بوو، بەڵکوو لە ڕێکخراوەکانی بەعسدا بەرپرسیارێتیشیان هەبوو. ئەمانە ئاگادار کرابوونەوە کە یەکێتی نیشتمانی لەگەڵ حکوومەت خەریکی گفتوگۆیە و داوایان لێ کردبوون کە ڕا و بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە داخوازییەکانی گەلی کورد بنووسن بۆیان! ئەو نووسراوە بۆ ئێمە وەکوو بۆمبێک وا بوو. لەلایەکەوە ڕێکخستنیان لە مفاوەزات ئاگادار نەکردووەتە و پرسیان پێ نەکردووە، لەلایەکی دیکەوە نامەیان بۆ کەسانێکی دەرەوەی ڕێکخستن ناردووە و داوای ڕا و بۆچوون

و ئامۆژگارییان لێ کردوون! هەموو ئەندامانی ڕێکخراو حەپەسابوون، بە تایبەتی زۆراب کە دەیگوت، ئەوە درۆیە و هەرگیز ڕاست نییە ... هەر زووبەزوو لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا، سەرانی یەکێتی هاتنە گوندی زیخان لەسەر جادەی گشتیی بالیسان و لە سەرەتای کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣ بە بروووسکە مەڵبەندەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە لە ڕاگرتنی شەڕ ئاگادار کرانەوە.[٢٢٢]

ئەم جۆرە لە ڕەفتار و مامەڵە هەر وا کارێکی سەتحی، وە یان هەڵەیەک نەبوو، بەڵکە ئەمە خەسڵەتی ئەو پارت و هێزانەیە و ئەوە جەوهەر و کرۆک و ناوەخنیانە.

هەر لەو زەمانەدا بوو، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکدا سەردانییەکی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی شۆڕشگێڕی کوردستانی ئێرانمان کرد و پرسیاری نەزەری ئەوانمان لەسەر پرسی مفاوەزات کرد، ئەوان وتیان:

ئەگەر بۆ ئێمە وا پێویستی کرد و وا بە قازانج بوو موزاکەرە (مفاوەزات) لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێراندا بکەین، ئەوا لەسەر مێزی موزاکەرە مایکرۆفۆنێک دائەنێین، تاوەکوو خەڵکی هەرچییەک کە ئێمە باسی دەکەین و لەسەری ڕێک دەکەوین، ئەوان لە بڵندگۆکانەوە ببیستن. چونکە ئێمە موزاکەرە لەسەر مافەکانی ئەوان دەکەین و دەبێت ئەوان خۆیان ئاگادار بن و بزانن نمایندەکانی ئەوان لەسەر مێزی موزاکەرە چی ئەڵێن و چۆن موزاکەرە ئەکەن.

ئەم وەڵامە بۆ من زۆر سەرنجڕاکێش بوو، وەک تەزووی کارەبا بەخێرایی خۆی گەیاندە نێو قووڵایی هزر و دەستگای فکریمەوە. ئەم وەڵامە خۆی دوو دێڕ بوو، زۆر سادەش بوو، وەلێ قووڵ و مانادار بوو! ئاخر ئەوە پێچەوانەی سونەتی باو بوو، تا ئەو دەمە لە کارێکی وادا ئەوپەڕەکەی پرسوڕا بە ئەندامان و لایەنگران و هێزی پێشمەرگە دەکرا، لەلای هێزە کلاسیکییەکان لەوەش خراپتر بوو، نەریتی باو ئەوە بوو، سەرکردایەتی نەک هەر لەجیاتی خەڵک، بەڵکە لەجیاتی ئەندامانی حیزبیش بڕیار ئەدەن و خۆیان زانا و حەکیمن و خۆیان ئەزانن چی ئەڵێن و چی ئەکەن و چی لە بەرژەوەندیدایە!

---

٢٢٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٩-١٥٠.

وەلێ ئەم نەریتەی تر، یانی ئەوەی لە وەلامی کۆمەڵەی ئێران بە ئێمە درایەوە، یانی: نەک هەر ئەندامانی حیزب، بەڵکە تەواوی کۆمەڵگاش دەبێت بزانێت، چی ئەوترێت و چی ئەکرێت، چونکە قسە لەسەر زیندەگی و چارەنووسی ئەوانە و ئەوان دەبێت بزانن، نوێنەر و نمایندەکانی ئەمان، چۆن ڕەفتار ئەکەن و چۆن داکۆکی لە مافی ئەمان ئەکەن. دیارە لەوەش دروستتر ئەوەیە: خەڵکی بتوانێت و مافی خۆیەتی، نەک هەر نەزەری خۆی بدات، بەڵکە دەبێت خۆی نوێنەری خۆی هەڵبژێرێت و هەر کاتێکیش ئەو نوێنەرەی بەباش نەزانی، نوێنەرایەتی و متمانەی لێ وەربگرێتەوە.

## کێشەی نێوان ئێمە و بەرپرسێکی گەرمیان

دوای ئەوەی مواجەهەی هاوڕێیانی زیندانی سێدارەی مووسڵ کرایەوە، من چووم بۆ سەردانیان و "ئەسعەد"م بینی، هەر وەکوو لە باسەکانی پێشووشدا قسەم لەسەری کردووە، یەکێک لەو شتانەی باسی کرد، وتی: "ئەرێ ئەوە چییە ئەڵێن، بەرپرسێکی تازە بۆ گەرمیان هاتووە، ناوی فلانە، مامەڵە و بەرخوردی لەگەڵ خەڵکیدا خۆش نییە و ئەزیێتی خەڵکی ئەدات، ئەوە چۆن لێی قبووڵ ئەکەن؟!". منیش وتم: من شتێکی وام نەبیستووە، کە چوومەوە بەدواداچوونی بۆ ئەکەم.

زۆری پێ نەچوو، خۆشم لەسەر هەمان بەرپرس هەندێک شتی دیکەم بیستەوە کە چۆن پەیوەندیی خۆشەویستی لەگەڵ ئافرەتێکدا هەیە و لەناو ئاوایی و بە بەرچاوی خەڵکەوە چۆن ڕەفتاری لەگەڵدا ئەکات.

ئەو دەمە ئێمە وەک ئەندامی کۆمەڵە، باسی ڕەفتاری هاوڕێی کۆمەڵەمان بە جۆرێک دەکرد، کە دەبێت: هاوڕێی کۆمەڵە دەست و دەم و داوێنپاک بێت ... لەنێو خەڵکیدا چۆن ڕەفتار بکات و چۆن خاوەن نموونەی بەرزی "ڕەوشت" بێت و حیساب بۆ بیرکردنەوە و نەریت و سوننەتی خەڵکی بکات و کۆمەڵێ شتی لەم جۆرە. بۆیە لەسەر ئەو دوو بابەتە، من هەستام نامەیەکم بەناوی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووکەوە بۆ ناوەندیی کۆمەڵە نارد و ڕەخنەیەکی توندم لەو بەرپرسە گرتبوو، وە داوام لە ناوەندیش کردبوو کە لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکەن، چونکە ئەو ڕەفتارانە زیان بە کۆمەڵە دەگەیەنێ و کەسایەتیمان لەکەدار ئەکات.

هەروەها خۆشم بیرم لەوە کردەوە، سەفەرێکی ناوچەی جەباری بکەم و چاوم بە مامە ڕیشە بکەوێت و لەگەڵ ئەویشدا باسی ئەو مەسەلانە بکەم.

بیرم لەوە کردەوە، ئەو سەفەرە لەگەڵ محەمەد تاهیر ڕێک بخەم کە بۆخۆی خەڵکی ئەو ناوچەیە و شارەزا بوو، هەروەها لەگەڵ مامە ڕیشەشدا خزم بوون. سەرەنجام ڕێکەوتین و من چووم بۆ ماڵی محەمەد لە تەرجل، لەوێوە سواری ئۆتۆمبیل بووین و بە گوندەکانی قازانبلاخ، جافان، کەوەڵەدا ڕۆییشتین هەتا گەیشتینە خاڵەبازیانی. لەوێشەوە ئیدی بەپێ کەوتینە ڕێ هەتا گەیشتینە گوندی

شێخجیری و بنکەی کەرتی چواری جەباری. ئەو شەوە لەوێ ماینەوە و من بە تەنها لەگەڵ مامە ڕیشە لەسەر ئەو بابەتە قسەم کرد و بۆ بەیانییەکەی کەوتینە ڕێ بە ئاراستەی قەرەهەنجیر و لەوێ سواری ئۆتۆمبیل بووین و بۆ کەرکووک گەڕاینەوە.

دیارە من نامەیەکیشم پێ بوو، بە ناوی "ڕێکخراوی کەرکووک"ەوە نووسیبووم، بەڵام لەبەر نهێنیکاری، محەمەد نە ئاگای لەو نامەیە بوو، نە پێیشیم گوت، سەفەرەکەم بۆ چییە و بۆ چ مەسەلەیەکە.

نامەکەی من دەگاتە ناوەندیی کۆمەڵە و پاشان بەو بەرپرسەش، بەڵام ئەو زۆر پێی تووڕە و پەست دەبێت، لە وەڵامدا نامەیەکی توندی بۆ ئێمە نووسیبوو، منیش وەڵامێکی وردی نامەکەیم دایەوە کە هەر لە ڕێگەی ناوەندیی کۆمەڵەوە پێی گەیشتبوو.

ئیتر بەو جۆرە چەند نامەیەکی توند لە نێوانماندا هات و چوو.

زۆری پێ نەچوو، "ئازاد هەورامی"یم بینی کە ئەو دەمە ئەو بەرپرسی دەستگای ڕێکخستنی کۆمەڵە بوو، ئەو نامانە گشت دەگەیشتنە دەستی ئەو و ئەو ئاگاداری تەواوی کێشەکە بوو. ئازاد ئەوەی پێ ناخۆش بوو، کێشەکە بەو جۆرەی لێ هاتووە و پێی وابوو، پێویست نەبوو بەو ئاستە بگات و پلارێکیشی لە ئێمە، لە کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک گرت و وتی: ئەو نامانە ئەڵێی نەقدی بەرنامجی غۆتایە،[٢٢٣] با ڕاپۆرتەکانی کۆمیتەتان ئاوها ورد و درێژ بووایە!

جا ئێستا ئەگەر لێکدانەوەیەک بۆ ئەو کێشانە بکەم، ئەوا ئەوەندەی بە مامەڵەی خراپ و نەشیاوی ئەو بەرپرسەوە لەگەڵ جەماوەر و خەڵکی گوندنشینەوە هەبێت، هەر وەکوو ئەسعەد لە زیندانی سێدارەی مووسڵ پێی گەیشتبوو، ئەوا من لە هیچ

---

٢٢٣. "ڕەخنە لە بەرنامەی گۆتا"، نامیلکەیەکە لە ساڵی ١٨٧٥ لەلایەن "کارل مارکس"ەوە نووسراوەتەوە و پێک هاتووە لە کۆمەڵێک سەرنجی ڕەخنەگرانە لەمەڕ بەرنامەی حیزبی کرێکارانی ئەڵمانیی یەکگرتوو.
بەرنامەی گۆتا لە کۆنگرەی گۆتا دانرا، کە تیایدا دوو ئاراستە لە بزووتنەوەی کرێکارانی ئەڵمانی (حیزبی کرێکارانی سۆشیال-دیموکرات بە سەرۆکایەتیی بیبل لیبکنیخت و یەکێتیی گشتیی کرێکارانی ئەڵمانیی لاسالی) یەکیان گرت. ئەم پرۆژەیە، هەڵەی ترسناک و لادانی زۆری مەبدەئی لە بەرامبەر لاسالییەکان تێدا بوو.مارکس و ئەنگلس دامەزراندنی حیزبێکی سۆشیالیستیی یەکگرتووی ئەڵمانییان بە باش دەزانی، وەلێ دژی ئەوە بوون، لەتەک لاسالییەکاندا سازشی فکریی بکرێت.

شوێنێکی دیکەوە، شتێکی لەو جۆرەم نەبیستەوە و لە ڕاستی و ناڕاستی ئەو هەواڵە بە ئەنجامی تەواو نەگەیيشتم. سەبارەت بە شێوازی مامەڵەی ئەو لەنێو گوند و لە بەرچاوی گوندنشینان لەگەڵ خۆشەویستەکەی، ئەوا ئەبێ بڵێم، من ئێستا مامەڵەیەکی دیاریکراوم لەیاد نەماوە تا داوەری بکەم، بەڵام ئەزانم، ئەو دەمە ئێمە وەکوو کۆمەڵەی ڕەنجدەران سۆفییانە بیرمان دەکردەوە و ئەگەرچی بڕوامان بە ئایین نەبوو، وەلێ بەرخوردمان لە هەمبەر پەیوەندیی نێوان نێر و مێ، ژن و پیاو و خۆشەویستی و بەرابەریی ژنان و پیاوان ناڕۆشن و هەندێک جار کۆنەپەرستانەش بوو. من قسەم لەسەر هەڵوێستی فەردی ئەندامان نییە و دەزانم لەو ڕاستایەدا دژی نابەرابەری و لەگەڵ یەکسانیی ژن و پیاو و دژی کۆنەپەرستیی ئایین و نەریتی کۆن و خێڵەکی بووین و کاریگەری و جێپەنجەمان لەنێو خێزان و لە کۆمەڵگادا ڕۆشن و دیار بوو. وەلێ کۆمەڵە وەک ڕێکخراو پۆپۆلیستی بوو، لەبری ئەوەی لەو پرسانەدا پێشڕەو بێت و شەڕی کۆنەپەرستی و نەریتی داڕزیوی خێڵەکی و دینی و نابەرابەریی ژنان و پیاوان بکات، ملی خۆی لێ دەخەواند و دەیویست دڵی خەڵکەکە ڕابگرێ و خۆی لەگەڵیاندا جووت بکات و دەست بۆ ئەو کێشانە نەبات و لە جێی خۆیان لەقیان نەکات.

ئەگەرچی ئەندامانی کۆمەڵە بەگشتی بێبڕوا بە دین و بە ئایین بوون، وەلێ بەشێکیان هەر باوەڕدار بوون و فەرزی دینییان بەجێ دەگەیاند. دیارە ئەوانەی کە بێبڕوا بوون، بەهۆی ئەوەی سەرچاوەی فکریی ئەوان مارکسیزمە و ئەدەبیاتی مارکسیستیش لەگەڵ ئایین جووت نایاتەوە. ئەوانەیشی کە بڕوادار بوون و فەرزی دینییان بەجێ دەگەیاند، لەبەر ئەوە بوو، چونکە کۆمەڵە وەک ڕێکخراو لە تەواوی مێژووی سیاسیی خۆیدا، تاکە یەک نووسراوەی لە سەر دین و ڕەخنە لە دین بڵاو نەکردەوە و ئەندامان و هەوادارانی خۆیشی بەو جۆرە پەروەردە نەکرد و لەو ڕووەوە هۆشیاری نەکردنەوە.

کۆمەڵە وەکوو ڕێکخراو، تەنانەت تاکە یەک وتاریشی لەسەر ئازادیی ژن و بەرابەریی نێوان ژنان و پیاوان لە دیرۆکی سیاسیی خۆیدا بڵاو نەکردەوە و هیچ کۆششێکی بۆ ئەوەش نەکرد، کە ژنان بێنە بەرەوە و لە ڕیزی پێشمەرگە و هێزی چەکدار بەشداری و دەخاڵەتیان هەبێت.

## ئێوارەیەك لەگەڵ "ئازاد هەورامی"دا

ساڵی ١٩٨٤ بوو، چەند مانگێک بەسەر ئاگربەست و مفاوەزاتی یەکێتی و حکوومەتدا تێپەڕیبوو. یەکێتی و حکوومەت بۆ هەماهەنگی کارەکانیان کۆمەڵێک لیژنەیان لە نوێنەری هەردووک لا پێک هێنابوو. ئەم لیژنانە نێویان لێ نابوون، لیژنەکانی تەنسیق. بنکەی سەرەکیی لیژنەکانی تەنسیق لە کەرکووک بوو. نوێنەر و بەرپرسی لیژنەی تەنسیقی کەرکووک، عەلی حوسێن حەسەن (شوان) بوو.

لەو دەمەدا ژمارەیەکی زۆری پێشمەرگە و ئەندامانی سەرکردایەتیی یەکێتی دەهاتنە نێو شارەکانەوە و ئەم لیژنەی تەنسیقانە پسوولەیەکیان بۆ دەکردن و هاتوچۆیان پێ دەکرد.

لەو دەورانەدا ئازاد هەورامی بۆ کەرکووک هات، من ئاگاداری ئەو هاتنەی ئازاد بوومەوە و ئێمە وەکوو کۆمیتەی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵیدا ڕێک خست. ئەحمەد خورشید ڕەزا و "تەحسین نامیق عەبدوڵا"م ئاگادار کردەوە کە هەردووکیان لە ئەندامانی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن بوون.

کۆبوونەوەکەمان لە ماڵی ئێمە، یانی لە گەڕەکی یادگار، کۆڵانی ماڵی شێخ عەبدولکەریم، لە ژووورە بچکۆلەکەی خۆم دانا.

لەگەڵ ئازاد هاوگەڕەک بووین، ئەوان ماڵیان لە هەمبەر گۆڕستانی شێخ محێدین بوو، وەلێ من لەو دەورانەدا قەت ئەوم نەدیبوو، چونکە ئەو سەرباری ئەوەی پێنج شەش ساڵێک لە من هەراشتر بوو، ئینجاش لە ساڵی ١٩٧٤ چووەتە دەرەوە و لەدوای شکستی ئەو بزووتنەوە چەکدارییەش لە ساڵی ١٩٧٥ زۆر لە کەرکووک نەماوەتەوە و دووبارە چووەتە دەرەوە. بۆ یەکەمجار من ئازادم لە تەمووزی ساڵی ١٩٨٢ لە چەمی سوورقاوشان لە کۆبوونەوەی دامەزراندنەوەی ڕێکخراوی کەرکووک بینی.

بە هەر حاڵ! لەگەڵ مامۆستا قادر ڕێکەوتین، ئازاد بگەیەنێتە ماڵی ئێمە.

ئێوارانێکیان لەدوای ئەوەی دنیا تاریک داهات و کۆڵان کشومات، ئەو دەمەی خانەوادەکان لە کونجی ماڵەوە لەدەوری یەک خڕ دەبنەوە، لە دەرگا درا. ڕێک ئەو

دەمەیە کە دەبێت ئازاد بگاتە ماڵی ئێمە. ئێمە هەرسێکمان (ئەحمەد، تەحسین، سالار) کەمێک پێش ئەوە لەگەڵ یەکدی قسەوباسێکمان کردبوو، دامانبوو لەگەڵ ئازاد چی باس بکەین و چ پرسێک بورووژێنین.

چووم دەرگام کردەوە، بینیم مامۆستا قادر و ئازادن. ئازاد بە بزەیەکی شیرینەوە تێی ڕوانیم و یەکتریمان لە ئامێز گرت. مامۆستا ئێمەی بەجێ هێشت و گەڕایەوە.

ئازاد جلێکی کوردیی شەرواڵ و مرادخانی لەبەردا بوو، قەمسەڵەیەکی عەسکەریشی بەسەردا کردبوو، چونکە دنیا سارد و لە وەرزی زستاندا بووین.

لەگەڵ ئازاد هاتینە ژوورەوە و بەرەو ژوورە بچکۆلەکە ڕۆییشتین، ئەو ژوورەی دەیان تێکۆشەری داڵدە دا و نهێنی هەموویانی وەک گلێنەی چاو پاراست. ئەوا ئەمێستاش دەرگای خۆی بۆ میوانێکی باڵا مام ناوەندی، باریکەلەی ڕەشتاڵەی لەشسووک و دەم بەخەندە، خستە سەر پشت.

ئازاد لەگەڵ هاوڕێیان باوەشیان بەیەکدا کرد و پاشان دانیشتین. دوای هێندێک هەواڵپرسیی ڕۆتینی، قسەوباسەکانمان دەست پێ کرد.

باسەکانمان بریتی بوون لە هەواڵی مفاوەزات و لێکدانەوەی بارودۆخەکە و ئەگەرەکانی، هەتا بە مەسەلە فکری و کێشەکانی نێو کۆمەڵە دەگات.

ئەو دەمە ئێمە ماوەیەک بوو، زۆر مەسەلەی کۆمەڵەمان خستبووە ژێر پرسیارەوە و پێداچوونەوەمان بە زۆر لێکدانەوە و تێڕوانینی خۆمان و کۆمەڵەدا کردبوو. باسی کوردستانی و عێراقی، سەربەخۆیی چینی کرێکار لە حیزبی خۆیدا، باسی دیموکراتیی نوێ و شۆڕشگێڕانە ... لە باسە گەرمەکانی ئەو ڕۆژگارەی ئێمە بوون.

دێتەوە بیرم، پرسیاری دیموکراتیی نوێ و شۆڕشگێڕمان لە ئازاد کرد.

ئەو لە وەڵامدا بە درێژی باسی دیموکراتیی نوێ، هەر بەو جۆرەی ماو تسیتونگ لێی دوابوو کرد. پاشان باسی دیموکراتیی شۆڕشگێڕی کرد و ئیدی قسەی خۆی چییە لەسەریان و ئەو تەرەفداری کامیانە؟ خۆی لە قەرەی نەدا!

کاتی خۆی ماو تسیتۆنگ نامیلکەیەکی بەنێوی "دیموکراتیی نوێ"وە هەبوو، کە ئێمە لە ڕیزەکانی خۆماندا دەمانخوێندەوە و موناقەشەمان دەکرد. ئەوەی شایانی گوتنە، ئەو نامیلکەیە هەر بە زبانی عەرەبی هەبوو و نەکرابوو بە کوردی.

دیموکراتیی نوێ، وە یان دیموکراتیی گەلی، بەو دیموکراتییە دەگوترا کە لە چین و لەسەر بنەمای بیری ماو تسیتۆنگ بەرپا کرا بوو. ئەم دیموکراتییە بۆیە پێی دەگوترا دیموکراتیی نوێ، بەو حیسابەی لەگەڵ ئەو دیموکراتییە کلاسیکییەی لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا هەیە، جوودایە و ئەمە نوێیە. لەم دیموکراتییەدا، دیموکراتی بۆ گەل و دیکتاتۆرییەت بۆ دوژمنانی گەل بوو. زاراوەی "گەل" لەم دەستگا فکرییەدا یانی: چینی کرێکار، جووتیار، بورژوازیی بچووک و نیشتمانی. دوژمنانی گەلیش یانی: چینی بۆرژوازیی کۆمپرادۆر، فیئۆداڵ و بۆرژوازیی کۆسمۆپۆلیتی. هەر لەبەر ئەوە بەم دیموکراتییە نوێیە دەشگوترا: "دیموکراتیی گەلی".

لەم دەستگا فکرییەدا، شۆڕش قۆناغبەندی دەکرێت و پێی وایە، لە وڵاتی چین و هاوشێوەکانی، قۆناغی شۆڕش دیموکراتیی نیشتمانییە و گەل لە دژی دوژمنانی گەل حوکم دەکەن و لەدوای تەواوبوون و پیادەکردنی ئەم قۆناغە، ئەوجا نۆرەی قۆناغی سۆشیالیستی دێت. بەڵام کەی ئەو نۆرەیە دێت؟ کەس نازانێت و هەواڵەی غەیب و ڕۆژگارێکی نادیار دەکرێت! ئەوەی شایانی گوتنە، کۆمەڵەی عێراق باسی لەم جۆرە دیموکراتییە دەکرد، ئەویش زۆر بە کرچ و کاڵی.

هەرچی دیموکراتیی شۆڕشگێڕە، لینین باسی کردووە و دواتریش کۆمەڵە و "حیزبی کۆمۆنیستی ئێران"یش هەر پێداگرییان لەسەر ئەمە دەکرد.

لە دیموکراتیی شۆڕشگێڕدا باسی گەل و دوژمنانی گەل ناکرێت، بەڵکە سەیری هەڵوێستی حیزبەکان لە هەر مەسەلەیەکدا و ڕادەی پشتیوانییان بۆ دەسەڵاتی کرێکاران، یان کرێکاران و جووتیارانی هەژار دەکرێ. هەروەها لەم دیموکراتییەدا شۆڕش قۆناغبەندی ناکرێت، بەڵکوو شۆڕش بەردەوامە و بەگوێرەی ئەو زەمینەیەی لە ئارادایە و بەگوێرەی هاوسەنگیی هێزی چینایەتی بەرەو سۆشیالیزم هەنگاو دەنرێت.

ئێمە ئەو سێ هاوڕێیە، بڕوامان بە دیموکراتیی نوێ و گەلی نەمابوو، بڕوامان بە دیموکراتیی شۆڕشگێڕ هەبوو. هەر بۆیە دواتر هەڵسەنگاندنێکمان بۆ قسەکانی ئازاد کرد و پێمان وا بوو، ئەبوو تێڕوانینی خۆیشی لەسەر ئەو دوو جۆرە لە دیموکراتی بەیان بکردایە و لایەنداری خۆی ئاشکرا بکردایە.

بەو شێوەیە دوای نزیکەی چوار سەعات لە قسەوباس و دوای ئێوارەیەکی پڕ لە پرسیار و موناقەشەی گەرم، شەو درەنگ داهات، ئێمەش کۆتاییمان بە کۆبوونەوەکەمان هێنا و ئازاد ئیزنی خواست و هەستا.

ئەو دەمە ئەگەرچی یەکێتی لەگەڵ حکوومەت لە دانووستاندا بوو، وەلێ ئەندامانی سەرکردایەتی و کادرانی دیار و بەرجەستەی یەکێتی دەبوو ئاگاداریی خۆیان بکردایە، نەوەکوو دەستگا ئەمنییەکان فرسەتیان لێ بهێنن و بیانڕفێنن، وە یان لەلایەن جاش و چەکدارەکانی دیکەی سەربە ڕژێمەوە تیرۆر بکرێن. هەر بۆیە بۆ هاودەمی و بۆ ئاگاداری و سەلامەتی ئازاد، من لەگەڵیدا ڕۆییشتم. ئەو دیار بوو بۆ شەوەکەی دەیویست بۆ ماڵی مامۆستا قادر بگەڕێتەوە کە لە ماڵی ئێمەوە هەر وا نزیکەی کیلۆمەترێک نێوانی بوو. ئازاد بۆخۆشی هەر کوڕی ئەو گەڕەکە بوو، بستەبستی ئەو ڕێگاوبانانە بەڵەد بوو.

لە ماڵ دەرچووین و بەرەو عاشوور بەڕێ کەوتین، دوای ئەوەی گەییشتینە دیواری باخچەکە، بە دەستی ڕاست چووینە نێو کۆڵانێکی تەنگەبەرەوە کە لەو لاوە گەییشتینەوە لای ماڵی شەهید ئەحمەد نەنە گوڵە (شەهید هاوار). پاشان گەییشتینە ئەو بەرزاییەی بۆ مزگەوتەکەی مەلا عەبدوڵای مەلا ڕەفیق دەچوو. ئا لەوێدا کە زۆری نەمابوو بگەینە ماڵی مامۆستا، ئازاد هەڵوێستەیەکی کرد، سەیرێکی کردم و بە بزەیەکی شیرینەوە گوتی: دەی چاکە، ئیتر تۆ بگەڕێوە! ئیدی ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد و من گەڕامەوە.

ئازاد وەکوو سیفاتی شەخسی خۆی مرۆڤێکی سادە، خاکی، هێمن، سەنگین و بەڕێز بوو، گوێی بۆ بەرامبەرەکەی شل دەکرد و پاشان قسەی خۆی دەکرد. ئەگەر ئەو کەسە ڕای پێچەوانەی ئەمیشی هەبووایە، ڕێزی لێ دەگرت، دژی توندوتیژی و تیرۆری موخالفینی فکریی خۆی بوو.

ئـازاد لە ژیـانی سیاسـیی خۆیـدا بە گەلێـک قۆناغـدا گـوزەری کردبـوو. لەدوای ئـاودیوبوونی خـاڵە شـەهاب و هاوڕێکـانی بـۆ ئێـران، ئـازاد دەبێـتە بەرپرسـی ڕێکخسـتنەکانی کـۆمەڵە لە شـاری کەرکـووک، بەو پێـیەش دەبێـتە ئەنـدامی ئەو کۆمیتەیەی کە قەرار بوو، وەکوو کۆمیتەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە کار بکات.

دیارە و گومـانی تێدا نییە، ئەو کۆمیتەیەی بە سەرپەرشتیی خاڵە شـەهاب پێک هێنرا، تا لەدوای خۆی کۆمەڵە ڕابەرایەتی بکات، درێژەپێدەری دید و ڕێبازی خۆی بـووە کە "ئـازاد"یش یەکێـک بـووە لەوان. واتە، "ئـازاد"یش هەر وەکـوو ئەوان بیـری کردووەتەوە.

ئەوەی شـایانی گـوتنە، بـۆ بەشـداریکردن لەم کـۆمیتەیەدا، شـەهید ئـارام ئاگـادار ناکرێتەوە، واتە: ئارام وەکوو ئەوان بیری نەکردووەتەوە.

دوای ئەوەی ئەم کۆمیتەیە لە کارەکانیدا سـەرکەوتوو نابێت، شـەهید ئـارام دێتە مەیـدانەکەوە و کـۆمیتەیەک بـۆ ڕابەرایەتیـی کـۆمەڵە دادەمەزرێنێـت. ئـازاد لەم کۆمیتەیەشدا بەشـداری دەکـات، کە تێڕوانینێکی جیاوازیـان لەگەڵ خـاڵە شـەهاب و قۆنـاغی ئەودا هەبـووە و دەبێـتە ئەنـدامی کـۆمیتەی هەرێمەکـان و یەکێـک لە ڕابەرایەتیی کۆمەڵە.

لە قۆناغی سێیەمی کۆمەڵەدا، یانی لەپاش شـەهیدبوونی ئارام و هـاتنە مەیدانی نەوشـیروان مسـتەفا و دوورکەوتـنەوە لە ڕێبـازی ئـارام، ئـازاد ئەگەرچـی لەگەڵ هاوڕێکانی پێشـووی کە لە کۆمیتەی هەرێمەکانـدا پێکەوە بـوون، پەیوەنـدیی نزیکـی هەر هەبـووە و هاوسـۆزیان بـووە، وەلێ بەکردەوە لەگەڵ هێڵی زاڵی نێو کۆمەڵە، یانی هێڵی "نەوشیروان مستەفا"دا بووە.

کەواتە: ئازاد لە هەر سێ قۆناغەکانی کۆمەڵەدا حزووری هەبووە و سـەرباری جیاوازی نێوانیان، لە هەر قۆناغەدا لەگەڵ هێڵی زاڵی نێو کۆمەڵەدا بووە. وەلێ ئازاد لە هیچ کام لەو قۆناغ و کۆمیتانەدا، کەسی بڕیاربەدەست نەبووە.

ئەمەی ئەیڵێم واقیعەتە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە ئازاد کەسێکی هەلپەرست بووبێت، نەخێر! من پێم وایە، ئەو بابەتە بە فکر و تێڕوانینی ئەوەوە پەیوەستە.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی، یادەوەرییەکی خۆم بگێڕمەوە، کە ڕۆشنایییەک دەخاتە سەر ئەو ئەنجامگیرییە.

لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٨٤ کۆمەڵە سێیەمین کۆنفرانسی خۆی گرێ دا. چەند مانگێک بەر لەوە، ئێمە وەکوو سەرکردایەتیی ڕێکخستنەکانی نێو شارەکان (هەولێر، کەرکووک، سلێمانی) بۆ ئامادەسازی بۆ کۆنفرانسەکە، ئەبوو بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ نەوشیروان مستەفا بۆ ئاوەژێ بچین. کۆمەڵێک قسەوباس کرا کە من لە شوێنی خۆیدا دەچمە سەریان و لێرەدا تەنها یەک مەسەلە باس دەکەم.

لەنێو باسەکاندا قسە چووە سەر مەلا بەختیار و ئاڵای شۆڕش، کۆسرەت ڕەسوول پرسیاری ئازاد هەورامی کرد و بەوە دەچوو لەسەر ئەو هێڵە حیسابی بکات. وەلێ نەوشیروان لە وەڵامدا ئەوەی ڕەت کردەوە و بە جۆرێک قسەی کرد کە بەدڵنیاییەوە ئازاد لەگەڵ ئاڵای شۆڕشدا نییە و جێگەی ترس نییە و لێی بێخەم بن.

لە کاتی هێرش بۆ سەر ئاڵای شۆڕش و دەستگرتن بەسەر دۆکیۆمێنت و کەلوپەلەکانیاندا، دەنگۆیەکی وا هەبوو، نامەی ئازادیان لەنێویاندا گرتووە کە بۆ مەلا بەختیاری ناردووە، لەسەر ئەوە لێپێچینەوەیان لەگەڵدا کردووە و قسەی ناخۆشیان پێ کردووە. دیارە ئازاد لەسەر ئەو پەلامارەی بۆ سەر ئاڵای شۆڕش کرا، لە یەکێتی دەستی کێشایەوە و کوردستانی بەجێ هێشت و چووە ئێران، تاوەکوو لەوێوە سەفەری ئەورووپا بکات، وەلێ سەرەنجام هەر گەڕایەوە.[٢٢٤]

بەکورتییەکەی، ئازاد ئەگەر حیزبەکەی بڕیاری تیرۆری کەسێکی لەسەر بیروڕای جیاواز دابێت و بواری تێدا بووبێت، ئەو کەسەی لێ ئاگادار کردووەتەوە و لە مردن ڕزگاری کردووە.

ئازاد لە شەڕی قەڕناقا و پشتاشان، ئەگەرچی فەرمانی پێ درابوو، پەرێزی پاک بێت، وەلێ ئەو یەک دیلی نەکوشت و پەرێزی پاک نەبوو.

---

٢٢٤. هەندێک لە دیکومێنتەکانی ئاڵای شۆڕش، عادیل ڕەفیق، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧، ل ٢٧٨. ئەزموون و یاد، پشکۆ نەجمەدین، ل ٢٨٤-٢٨٥.

لەمانەوە دەتوانین بەو ئەنجامگیرییە بگەین، ئازاد وەکوو شەخسی خۆی، کەسێک بووە لەگەڵ تیرۆری موخالیفینی فکریی خۆی و کوشتنی دیلدا نەبووە.

بەڵام ئازاد، سەرباری ئەوەی حیزبەکەی لەسەر جیاوازیی بیروڕای فکری دەستی بۆ هەڕەشە و چاوسوورکردنەوە و ڕاونان و گرتن و ئەشکەنجە و تیرۆری ئەندامانی کۆمەڵە و دەرەوەی کۆمەڵە بردووە، ئەو هەر لەگەڵ حیزبەکەیدا ڕێی کردووە! سەرباری ئەوەی حیزبەکەی بڕوای بە پاوەندکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی هەبوو و زۆر جار بەشەڕ کێشەکانی یەکلا دەکردەوە، ئەو هەر لەگەڵ حیزبەکەیدا ڕێی کردووە! سەرباری ئەوەی حیزبەکەی لە شەڕدا دیلی دەکوشت، ئەو هەر لەگەڵ حیزبەکەیدا ڕێی کردووە!

ئەوەندەی بە کۆمەڵە و بیروباوەڕەکەیشی هەڵدەگەڕێتەوە، کاتێک نەوشیروان مستەفا بووە هەمەکارەی کۆمەڵە و لەگەڵ تاڵەبانی خەریکی پێچانەوەی، نەک هەر تێڕوانینەکانی ئارام لەنێو کۆمەڵەدا بوو، بەڵکوو خەریکی سڕینەوەی هەر شتێک بوو کە بۆنی مارکسیزم-لینینیزم و چەپی لێ بهاتبایە و نەک هەر ئەوەندە، تەنانەت خەریکی تیرۆرکردنی کۆمەڵە، یانی حەلکردن و نەهێشتنی هەر ئاسەوارێکی ئەو بوو، ئازاد هەر لەگەڵ حیزبەکەیدا ڕێی کردووە و هەڵوێستی یەکلاکەرەوە و جددی نەبووە!

بێگومان، سیفاتی مرۆڤدۆستی و هەڵوێستە جوانەکانی ژیانی سیاسیی ئازاد لە بەرچاون، وەلێ لە لێکدانەوەی ئەخیردا، هەڵسەنگاندنی هەر کەسێک لە چوارچێوەی ئامانج و بەرنامە و کارنامەی ئەو حیزبەدا جێ دەگرێت کە ئەو کاری بۆ کردووە و کاری تێدا کردووە.

# ئیزافەکردنی تەحسین نامیق بۆ کۆمیتەی ڕێکخراو

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا باسی ئەوەم کرد کە چۆن من کەوتمە نێو کێشەکانی کەرتی شەهید سیروان و دوای ماوەیەکی کەم لە ناسینی ئاوات و لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣دا دەستی لەکار کێشایەوە، دوای ئەوە ئەو کەرتە "کەریم حەمید ڕەسووڵ"یان دیاری کرد، تا من پەیوەندی پێوە بکەم. دوای ئەوە، سەلاح حەسەن پاڵەوانیان دیاری کرد.

بەو جۆرە ئەو کەرتە پڕ بوو لە کێشە و هەردوو مانگ جارێک یەکێکیان دیاری دەکرد، من پەیوەندی پێوە بکەم.

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشووشدا گوتوومە، منیش بەهۆی ئەو بارودۆخە ناجێگیرەی ئەوانەوە، لەلایەکەوە، ناو و ناونیشانی خۆمم پێیان نە ئەدا و هەر من بۆ ماڵی ئەوان دەچووم، لەلایەکی دیکەشەوە، بڕیاری ئەوەم نە ئەدا بەرپرسی ئەو کەرتە کە هەر جارەی یەکێک بوو، بێتە نێو کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووکەوە.

سەرەنجام بیرم لەوە کردەوە، کەرتەکەی خۆم (کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن) بە یەکێک لە هاوڕێکانم بسپێرم و خۆم بۆ ئیدارەی کەرتی شەهید سیروان تەرخان بکەم. وە یان دروستتر بڵێم، لە کاتێکدا من بە عەمەلی بەرپرسیاریتی "کەرتی شەهید سیروان"م لە ئەستۆدایە، هەر واش چاکترە کە بە فەرمیش ببمە لێپرسراوی. ئەو دەمە لەلایەکەوە باری من سووکتر دەبێت و لەجیاتی بەڕێوەبردنی دوو کەرت، تەنها کەرتێک بەڕێوە دەبەم، لەلایەکی ترەوە، ژمارەی ئەندامانی ڕێکخراویش دەبێتەوە بە سێ کەس کە بۆ ئیدارەکردن و ڕابەرایەتیکردنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شارێکی گرنگی وەکوو کەرکووک، ژمارەیەکی چاکتر و گونجاوترە.

سەبارەت بەوەیش کە کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن بە کێ بسپێردرێت؟ من بیرم لەوەش کردبووەوە و "تەحسین نامیق"م لە فکری خۆمدا دیاری کردبوو، وە پێم وا بوو بۆ ئەو بەرپرسیارێتییە، ئەو کەسێکی گونجاو و شیاوە.

تەحسین نامیق چەند ساڵێک بوو ئەندامی کۆمەڵە بوو، هەر خۆم بۆ کۆمەڵە موفاتەحەم کردبوو، پەیوەندی هەر بە خۆشمەوە هەبوو. ئەو دەمە ئەو بەرپرسی

پۆلێک و ئەندامی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن بوو. کەسێکی خاوەن بڕوا و زۆر بە دیسیپلین و زۆر نهێنیپارێز بوو. لە کاروباری ڕێکخستن بە ئەزموون و ئاستی فکری و فەرهەنگی سیاسی باش و بەردەوامیش لە هەوڵی زیاتردا بوو.

لە دانیشتنێکدا کە پێم وابێت لە مانگەکانی سەرەتای ساڵی ١٩٨٤دا بوو، ئەم بیرۆکەیەم لەگەڵ "مامۆستا قادر"دا باس کرد، ئەویش بەلایەوە پەسەند بوو. "تەحسین"یش ئامادەگی خۆی بۆ ئەو کارە دەربڕی. دوای ئەوە، ئەو بڕیارەی خۆمانم لەگەڵ "سەلاح حەسەن پاڵەوان"دا باس کرد، کە ئەو دەمە پەیوەندیی ئەو کەرتە بە منەوە لە ڕێگەی ئەوەوە بوو.

بەو جۆرە تەحسین نامیق بووە بەرپرسی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن و بەو پێیەش بووە ئەندامی ڕێکخراوی کەرکووک. منیش بوومە بەرپرسی کەرتی شەهید سیروان و پۆلەکەی خۆمیشم لەگەڵ خۆمدا برد.

بەو شێوەیە و جارێکی دیکە، ژمارەی ئەندامانی "ڕێکخراوی کەرکووک"مان کردەوە بە سێ ئەندام.

ڕێکخرای کەرکووک بەو شێوەیە مایەوە، هەتاوەکوو لە تەمووزی ساڵی ١٩٨٤ و لەدوای کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە تەحسین و من و زۆربەی هەرە زۆری هاوڕێکانمان پێکەوە وازمان لە کۆمەڵە هێنا و مامۆستا قادر بە تەنها خۆی مایەوە.

# کۆبوونەوەی سووورداش لەگەڵ مام جەلال

چەند مانگێک بوو مفاوەزاتی نێوان یەکێتی و حکوومەتی بەعس دەستی پێ کردبوو، ئەبووزێد سەمەد شەریف کە ئەو دەمە نوێنەری یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان بوو لە شاخ، کۆبوونەوەیەکی بۆ ئێمە (ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان) لەگەڵ مام جەلال لە سووورداش ڕێک خست.

ئەبووزێد ئەیگوت: مام جەلال زۆر سەرقاڵە و بە زەحمەت ئەتوانی کۆبوونەوەیەکی لەگەڵدا ڕێک بخەیت، بەڵام هەر کاتێک من داوای کۆبوونەوەی 'یەکێتیی خوێندکاران'م لێ کردبێت، زۆر بەزوویی وەختی دیاری کردووە.

لەو کۆبوونەوەیەدا عیسام نامیق عەبدوڵا (دکتۆر عیسام) و من بە هاوڕێیەتی دووان لە نوێنەرەکانمان (ئەبووزێد و عیدۆ شەکر قاسم) بەشداریمان کرد. عیسام وەکوو بەرپرسی لقی مووسڵ و سکرتێر، من وەکوو بەرپرسی لقی هەولێر و زانکۆی سەڵاحەدین و ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی بەشداریمان کرد. عەزەدین مەجید محەمەد ئەو دەمە بەرپرسی لقی کەرکووک و ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی بوو، بەڵام نازانم بۆچی ئەومان لەگەڵدا نەبوو. بەرپرسی لقی سلێمانی لەو دەمەدا نازانم کێ بوو، ئەویشمان لەگەڵدا نەبوو.

دنیا دەمەو ئێوارە بوو، گەییشتینە بارەگای مام جەلال، سەر دیواری حەوشەکەی کۆمەڵێک عەلەشیشی سپی بەسەرەوە بوو، پاسەوانێکی سەر ڕووتی سەلکە کودی لەو ناوە دەهات و دەچوو، دیار بوو ئاگاداری سەردانەکەی ئێمە بوو، ئێمەی گەیاندە لای مام جەلال و خۆی گەڕایەوە.

شوێن و ڕێگەی مام جەلال لە سووورداش وەک جاری پێشوو نەبوو کە لە نێوزەنگ چووین بۆ لای. لەوێ لەنێو چیا و لە ژوورێکی بە خشت و قوڕ دروستکراو و لەسەر زەوی، وەلێ لێرە لە شار و لە خانوویەکی خۆشی غەربیدا بوو، بە تاخمی قەنەفە و مێز و کورسییەوە.

مام جەلال لەپشت مێزێکەوە و لەسەر کورسییەکی بزۆکی قۆڵدار دانیشتبوو. لە پشتەوەی خۆی کتێبخانەیەک هەبوو، وێنەیەکی خۆی کە لەگەڵ جەمال عەبدولناسری سەرۆکی وڵاتی میسر گرتبووی، تێدا دانابوو. ڕادیۆیەکی بچکۆلەی سۆنی یابانی تەنک و مۆدێرنی بە دەستەوە بوو، ئەوانەی کە میلەکەیت دەسووڕاند، تیشکێک لە بری چوکڵەی دیاریکەری شەپۆلەکان دەجوولا.

دوای بەخێرهێنان و ئەحواڵپرسی، باسی بارودۆخی یەکێتی و مفاوەزاتی کرد. پاشان پرسیاری بارودۆخی یەکێتیی خوێندکارانی لە ئێمە کرد. دوایی پرسیاری قەوارە و نفووز و ژمارەی ئەندامانی کرد. عیسام وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە. لەو کاتەدا قەڵەم و کاغەزێکی لە بەردەستدا بوو، یەکسەر ئەو ژمارەیەی ئێمە پێمان گوت، ئەو لەگەڵ ژمارەی تەقدیریی خوێندکارانی کوردستان بەراوردی کرد و ڕێژەیەکی سەدی لێ دەرهێنا و گوتی، ڕێژەی سەدیی ئەندامانی ئێوە لەچاو ژمارەی خوێندکارانی کوردستان دەکاتە ئەوەندە، ئەمەش ڕێژەیەکی کەمە. پاشان وتی: ئێمە ئێستا لەگەڵ حکوومەتی بەعس لە مفاوەزاتداین، زۆر گرنگە ژمارەتان ئێجگار زۆر بێت، خۆتان دیالەکتیکتان خوێندووە، دەزانن گۆڕانی چەندایەتی چۆن بۆ چۆنایەتی دەگۆڕێت ...

مام جەلال زۆر خۆی تێک دابوو، باڵی ڕادەوەشاند و قەرەباڵغییەکی زۆری دروست کردبوو. باسی فەلسەفەی مارکسی و دیالەکتیک و گۆڕانی چەندایەتی بۆ چۆنایەتی دەکرد و بە حیسابی خۆی ئێمە خوێندەوارین و یاری لەسەر وەتەری ئێمە دەکات. من ئەو قسانەی ئەوم بە نادروست و نامەنتیقی زانی، ئاخر ئەوەی ئەو باسی دەکرد، تەنها بۆئەوەی لەبەرامبەر حکوومەتی بەعسدا وەکوو ڕێکخراوێکی گەورە و بە نفووز و بە هەیبەت دەر بکەوین، دەبووا بچین بەلێشاو خەڵکی بهێنینە نێو ڕیزەکانمانەوە!

من لە گرنگی ژمارە و نفووزی ڕێکخراو دەگەم و دەزانم چەندێک پڕ بایەخە کە تۆ لەنێو جەماوەری خوێندکاراندا بە ئۆتۆریتە بیت و هێنانەمەیدانی ئەوان لەژێر

ڕەهەن و ئیشارەتی تۆدا بن، وەلی ئەوە زەمینەی خۆی گەرەکە و بارودۆخی گونجاوی خۆی دەوێت.

ئاخر ئەوەی ئەو باسی دەکرد، دەبوو خۆمان ئاشکرا یان نیمچە ئاشکرا بکردایە و ژمارەیەکی زۆر و بۆرمان لە خۆ بئالاندایە! لە کاتێکدا هیچ مەعلووم نەبوو، سبەیرۆژ مفاوەزات بە کوێ دەگات، لە کاتی سەرنەگرتنیدا هەر هەموو دەگیراین، وە یان دەبوو ڕامان بکردایە!

بۆیە دوای ئەوەی مام جەلال لە قسەکانی بووەوە، من قسەم کرد و وتم، بەڵێ وایە، گۆڕانی چەندایەتی دەبێتە مایەی گۆڕانی چۆنایەتی، ئەوە یاسای دیالەکتیکە، بەڵام مەرج نییە هەموو گۆڕانێک بۆ چۆنایەتی، گۆڕان بێت بۆ چۆنایەتییەکی باش، ئەشێ گۆڕان بێت بۆ چۆنایەتییەکی خراپ. لەو دەمەدا لامپەیەک لەسەر مێزەکەی بەردەمی بوو، دەستم بۆ لامپەکە درێژ کرد و گوتم: بۆ نموونە، ئەو لامپەیەی لەبەردەمتدایە، گڵۆپەکەی لە مادەی تەنگستن پێک هاتووە و بە تەوژمێکی دیاریکراوی کارەبا کار دەکات، ئەگەر بێت و ئەو تەوژمەی لەسەر زیاد بکەین و پاشان زیاد بکەین، لە جێگەیەکدا بەرگە ناگرێ و دەپسێ و لەکار دەکەوێت. واتە: چەندایەتیی تەوژمەکەمان زیاد و زیاتر کرد، سەرەنجام ئەو گۆڕانە چەندایەتییە بۆ چۆنایەتییەکی خراپ گۆڕا و تەنگستنەکە سووتا و پچڕا و لەکار کەوت!

مام جەلال ئەو قسەیەی منی زۆر پێ ناخۆش بوو، سوور هەڵگەڕا و چاوەڕێی بەرپەرچدانەوەیەکی وەها نەبوو، وەک ئەوە وابوو لە بانێکی بەرزەوە هەڵی بدەیتە خوارەوە، زۆر بە تووڕەیییەوە ڕووی لێم کرد و وتی: تۆ کابرایەکی زۆر موشاکیسی![٢٢٥]

منیش چاوەڕوانی بەرپەرچدانەوەیەکی وەها نەبووم و بەو قسەیە بریندار بووم. بەو جۆرە فەزای دانیشتنەکە گرژی تێ کەوت و بایی ئەوەی تێدا نەمایەوە هیچی دیکە بوترێت. دوای قەدەرێکی تر لە قسەکردن، کۆبوونەوەکەمان کۆتایی پێ هات و ئەوێمان بەجێ هێشت.کاتێک کە لای مام جەلالمان بەجێ هێشت، ئێوارەیەکی درەنگ

---

٢٢٥. موشاکیس، وشەیەکی عەرەبییە (مشاکس) بە مانای: سەرکێش، یاخی، ناسازگار، شەڕانی.

بوو، دنیا تاریک ببوو. ئەو شەوە لە سووورداش ماینەوە و بۆ خەوتن بۆ بارەگای دەستگای ناوەندیی ڕێکخستنی کۆمەڵە چووین کە ئازاد هەورامی و قادری حاجی عەلی لێ بوو.لەگەڵ ئازاد تاوێک قسەمان کرد و پاشان پرسیارم لێی کرد: کاک ئازاد دەنگۆیەکی وا هەیە کە تۆ و کاک نەوشیروان خەریکی وەرگێڕانی کتێبی 'سەرمایە'ی مارکسن؟ ئازاد هەر بە سادەییەکەی خۆی، دەستی کردە پێکەنین و وتی: وەڵا هەر نەشمان خوێندووەتەوە!

بۆ بەیانییەکەی لە خەو هەستاین و نانی بەیانیمان لەوێ خوارد. عیدۆ هاتە تەنیشتمەوە و دەستی لە گیرفانی شەرواڵەکەم دا و وتی: خشخش هەیە؟ وتم: خشخش چییە؟ جارێکی تر قسەکەی خۆی دووبارە کردەوە: خشخش! لەو کاتەدا جگەرەیەکی بە دەستەوە بوو، پیشانمی دا و بە جووڵەی دەستی دیار بوو ئاگری ئەوێت. منیش دەستم کردە پێکەنین و وتم: ئەها ... شخاتە!

عیدۆ خەڵکی ئۆردووگای 'خانکێ'ی سەربە شارۆچکەی سێمێل بوو، لە زانکۆی مووسڵ کۆلێجی زانستەکان بەشی کیمیای تەواو کردبوو. لە خێزانێکی جووتیاری ئێزیدی قەرەباڵغ و هەژار بوو، لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد خدر (سەرکەوت)، ئەبووزێد و عەبدولڕەحمان حەمید محەمەد (ئاوات، ڕەحمان جۆلا) و سیروان عەزیز فلامەرز (سیروان دیسکۆ) لە ماوەی جیاجیادا نوێنەری ئێمە (یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان) لەلای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون.

عیدۆ زوو زوو تووڕە دەبوو، کە تووڕە بووایە، جوێنی بە مام جەلال ئەدا و ئەیوت: لە قوزی مام جەلال بەم!

جارێکیان تازە مفاوەزاتی ساڵی ١٩٨٤ی نێوان یەکێتی و حکوومەت کۆتایی پێ هاتبوو، عیسام و عیدۆ و ئەبووزێد بەرەو بالیسان ئەچن، لەو ڕێگایەی نزیک حەریر و ئەو ناوە زرێپۆشێک و چەند سەربازێک لە کەنار ئەو جادەیە دەبینن، عیسام ڕوو لە عیدۆ ئەکات و پێی ئەڵێت: عیدۆ ئەوە مفاوەزات تێک چووە، بۆچی ناچیت قازیفەیەک بەو زرێپۆشەوە بنێیت و یەکەمین چالاکی پێشمەرگانە لەدوای

مفاوەزات بۆ خۆت تۆمار بکەیت؟! عیدۆ دەهری ئەبێت و بەجێیان دەهێڵێت، بەڵام ئەبووزێد دوای هەوڵێکی زۆر، ساردی ئەکاتەوە.

لە کاتی مفاوەزاتدا حکوومەت کۆمەڵێک دەمانچەی دایە یەکێتی، لەو دەمانچانە سێ دانە بەر نوێنەرەکانی ئێمەش کەوتن، پاش ماوەیەک عیدۆ ئەیەوێت واز لە یەکێتی بهێنێت، دەمانچەکەی ئەفرۆشێت و ئەچێت بۆ مووسڵ و ماوەیەک لەوێ بە قاچاخ و بە کوڵەمەرگی ژیان بەسەر دەبات و پارەکەی ئەخوات.

بە هەر حاڵ ئەو شەوەمان لە دەستگای ناوەندیی کۆمەڵە بەسەر برد و بۆ بەیانییەکەی لێک جوودا بووینەوە. من پێش ئەوەی بگەڕێمەوە، چووم سەردانێکی ماڵی مەلا بەختیارم کرد و تاوێک لەسەر دۆخی کۆمەڵە و کێشەکانی قسەمان کرد.

مەلا بەختیار لە هۆڵەکە و لەسەر ڕایەخەکان چەند کتێبێکی لە هەڵبژاردەیەک لە نووسراوەکانی 'لینین'ی دانا بوو، دیار بوو خەریکی خوێندنەوەیان بوو، پاش بڕێک قسەوباس، چوو دانەیەک لە نووسراوەی 'هەڵوێست'ی بۆم هێنا.

ئەم نامیلکەیە لە نووسینی مەلا بەختیار خۆی بوو، بەنهێنی لەنێو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا بڵاوی دەکردەوە، دواتر لەنێو کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵەدا گۆبەندێکی گەورەی نایەوە و نەوشیروان مستەفا بەنیاز بوو کۆمەڵێک ئەندام و کادری کۆمەڵە کە ئەو نامیلکەیەیان بڵاو کردبووەوە، یان لەلایان بینرا بوو، ئیعدام بکات.

دوای ئەوە نووسراوەی 'هەڵوێست'م لە باخەڵ نا و بۆ کەرکووک گەڕامەوە.

# سەردانی ئۆردووگای کۆمەڵە

لە ڕێکەوتـی ٢١ی مـارتی سـاڵی ١٩٨٤دا، واتە ڕێـک لە نەورۆزی ئەو سـاڵەدا، لەتەک سـێ هـاوڕێی خـۆم کە بریتـی بـوون لە: ئاسـۆ عـومەر حەمە ئەمـین خەڵکی ماوەت، بارزان کەریـم محەمەد خەڵکی کەلار، هەژار تاها ئەحمەد (کاوانی) خەڵکی هەولێر، بـۆ سـەردانی کـۆمەڵەی شـۆڕشـگێڕی زەحمەتکێشـانی کوردسـتانی ئێران و حیزبی کۆمۆنیستی ئێران چووین.

ئەو ڕۆژە یەکێتـی بە بـۆنەی نەورۆزەوە لە سـووورداش ئـاهەنگێکی گەورەی جەماوەرییان سـاز کردبوو کە دەیـان و بگـرە سـەدان هەزار کەس بەشـدارییان تێدا کـرد و تاڵەبـانی کە تـازە لە بەغـدا گەڕابـووەوە، وتـارێکی دووردرێـژی دا. پاشـان نووسـراوێک بەنێـوی "بـۆرژوا ناسـیۆنال-ڕیفۆرمیسـتی کـورد" لەلایەن گرووپێکـی چەپەوە بـڵاو کـرایەوە، لە میـانەی ڕەخنەگـرتن لەو وتـارە، ڕەخـنە لە یەکێتیـی نیشتمانیی کوردستان و لە بزووتنەوەی ناسیۆنالیستیی کوردستان دەگرێت.

ئەم نووسراوە بە شێوەی نامیلکەیەکی چاپکراو لەژێر نێوی "کۆمۆنیست"دا بڵاو کرایەوە. سـەرەتا نەدەزانرا "کۆمۆنیسـت" چییە، وەلـێ دواتر مەعلووم بوو کە ئەمە لەتێکی "یەکێتیی خەبـاتی تێکۆشـانی کـارگەران"ە و پاشـان نێـوی خـۆی نـا: ڕەوتـی کۆمۆنیست.

"کارگەران" سـاڵانێک یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتانیان بە هێزێکی پێشـکەوتنخواز لەقەڵەم ئەدا و چەندین ئەندام و کـادر و هەوادارییـان لە ڕیـزی هێزی چەکداری ئەو حیـزبەدا بـوون. ئەم گـرووپە لەو دەورانەدا لە تێکەولێکەیەکـی فکـری و قەیرانێکـی قووڵدا بوو، سەرەنجام کەرت و پەرت بوو و ئەم بەشەی لێ پەیدا بوو.

لەڕاستیدا ئەم نـامیلکەیە، یەکەمـین نووسـین و بەیـانی ڕاگەیـاندنی ئەوان بـوو، وە بۆ یەکەمین جاریش بوو، بەڕوونـی و ڕاشـکاوانە و لەژێـر کـاریگەریی تێڕوانینەکـانی مارکسـیزمی شـۆڕشـگێڕی ئێـران، تێـزی بـۆرژوازیی نیشـتمانیی پێشـکەوتنخواز ڕەت بکەنەوە.

ئەم نووسـینە نـاوی نووسـەرەکەی بەسـەرەوە نەبـوو، وەلـێ لەلایەن "مـوئەیەد ئەحمەد"ەوە نووسرابوو.

من هەر کاتی خۆی، ئەو نامیلکەیەم دەست کەوت و خوێندمەوە.

بە هەر حاڵ، ئەو دەمە بنکە و بارەگاکانی کۆمەڵە و زۆربەی حیزب و ڕێکخراوە ئۆپۆزیسیۆنە ئێرانییەکان لە ناوچەی گەلالی نزیک شارۆچکەی ماوەت بوون.

شەهید سەرداری جیۆلۆجی هاوڕێی نزیکی من بوو، خەڵکی ماوەت بوو، ئەو دەمە ئەو لەژیاندا نەمابوو، لە هەولێر شەهید کرا، وەلێ بەهۆی خزمێکی ئەوەوە کە ناوی ئاسۆ عومەر حەمە ئەمین بوو، هەر لە کۆلێجی خۆمان و لە بەشی ماتماتیک بوو، ماڵی لە ماوەت بوو، بۆ بنکە و بارەگاکانی کۆمەڵە چووین.

کاتێک کە گەیشتینە ئەو ناوچەیە، وتیان ئەوانەی بەو بەرەوەن، جەماعەتی فیدائییە چریکەکانە و ئەوەی ئەمبەرەوە دەفتەری مامۆستا شێخ عەزەدینی حوسێنییە و بڕێک زیاتر بڕۆین، ئۆردووگای کۆمەڵە دێت.

هەر کە گەیشتینە ئۆردووگای کۆمەڵە، فڕۆکەیەک کە تەواوی دەنگەکەی کردبووەوە بە هاڕەیەکی ترسناکەوە بە ئاسمانی ئەو ناوچەیەدا تێپەڕی. توومەز ئەوە فڕۆکەی عێراقییە و تەنها بۆ ڕاچڵەکاندن و گاڵتەکردن بەو خەڵکەی لە ئاهەنگی نەورۆزی سووورداشدا بەشدارییان کردووە، ئەو کردارەی نواندووە. ئیدی پێشمەرگەیەکی کۆمەڵە بەپەلە خۆی گەیاندە دۆشکا یان چەکە دژەئاسمانییەکەی و کەوتە ئامادەباشییەوە.

سەرەتا گەیشتینە چادرێک، ڕەشادی مستەفا سوڵتانی برای کاک فوئادی لێ بوو کە ئەوە پرسگەیان بوو. دوای بەخێرهێنان، خۆمان پێی ناساند و گوتمان ئێمە خەڵکانێکی چەپ و کۆمۆنیستی کوردستانی عێراقین، پێمان خۆشە ئەگەر بکرێ چاومان بە کاک عەبدوڵای موهتەدی بکەوێت و کۆمەڵێک قسەوباس بکەین و لە نزیکەوە بە دید و تێڕوانینی ئێوە بۆ هێندێک بابەت و مەسەلە ئاشنا بین. ڕەشاد وتی زۆر چاکە، هەر ئێستا هەوڵ ئەدەم پەیوەندی بە کاک عەبدوڵاوە بگرم. دوای پەیوەندیگرتن وتی، ئەوە کاک عەبدوڵا لە گوندێکی ئەم نزیکانەیە، ماوەیەکی دی دەگەڕێتەوە. پاش قەدەرێک دانیشتن، هەواڵی پێ گەیشت کە بەداخەوە کاک عەبدوڵا کارەکانی تەواو نەبووە و ناتوانێت بێتە خزمەتتان، وەلێ هاوڕێیانی دیکە لێرەن، فەرموون با بچین بۆ حزووری ئەوان. ئیدی لەوێ هەستاین و پێکەوە بۆ ژوورێک چووین. لەو ژوورەدا کۆمەڵێک لە ئەندامانی کۆمیتە ناوەندی و کادری

کۆمەڵە و حیزبی کۆمۆنیستی لێ بوو، پاش تاوێک چەند کەسێکی دیکەش هاتن. سەرەنجام ئەوانەی لەوێ بوون و من بیتەوە یادم ئەمانە بوون: ئیبراهیمی عەلیزادە، مامۆستا ئیبراهیم (ساعیدی وەتەندۆست)، دکتۆر جەعفەری شەفیعی، ئیرەج ناوێک و مامۆستا ساڵح ... هەروەها وا ڕێکەوت، "شەماڵ عەلی"یش هات بۆ ئەوێ و لەگەڵمان دانیشت.

من "شەماڵ"م ئەناسی، هاوڕێی زانکۆم بوو، ئەو لە علووم بەشی ماتماتیک بوو، بەڵام نایەتەوە یادم، تا ئەو دەمە قسەوباسی سیاسیمان لە نێواندا هەبوو، یان نا، وەلێ دوای ئەوە ئەزانم، قسەوباسمان هەبوو.

من تا ئەو دەمە هێشتا هەر ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووم، بەڵام ماوەیەک بوو، کەوتبوومە ژێر کاریگەریی تیروانین و کار و چالاکییەکانی کۆمەڵەی ئێرانەوە.

ماوەیەک بوو، گوێم لە ڕادیۆی کۆمەڵە ئەگرت، بەرنامەکانی زۆر سەرنجڕاکێش بوون، باسی کۆمۆنیزمی ئەکرد، بەرنامەی دەرسەکانی مارکسیزم و خوێندنەوە و ڕۆشنکردنەوەی کتێبی "مانیفێستی حیزبی کۆمۆنیست" زۆر کاریگەر بوون، هەواڵی مانگرتنی کرێکاری لە ئێران و لە دنیادا باس دەکرد، بەرنامە لەسەر بەرابەریی نێوان ژنان و پیاوان و ڕەخنە لە ئایین و بەرنامەی پرسیاری گوێگرانی ڕادیۆ و وەڵامی واقیعی و مەنتیقی و هاوسەنگ بۆیان. هەموو ڕۆژێک بەرنامەکانی ڕادیۆیان لەجیاتی ئەوەی وەکوو ڕادیۆی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان بە "چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز" دەست پێ بکات، بە سروودی ئەنتەرناسیۆنال دەکرایەوە. ئەم ڕادیۆیە سروودی یەکی ئایار و چەندان سروودی دیکەی کرێکاری پەخش و بڵاو دەکردەوە ...

ئەوانەی ئەوان و ئەوانەی خۆمانم گشت لەگەڵ یەکدی بەراورد دەکردن. مارکسیزمی ئەوان و هی ئێمە، کار و هەڵسووڕانی ئەوان و هی ئێمە، سروودەکانی ئەوان و هی ئێمە، دەستپێکی ڕادیۆکەی ئەوان و هی ئێمە، باسی یەکسانی ژنان و پیاوانی ئەوان و نەبوونی هیچ باسێکی ئێمە لەو بارەیەوە، دەستپێکی بەرنامەی ڕادیۆکەی ئەوان و هی ئێمە ...

سەرەنجام هەستم دەکرد، ئەوەی ئەوان و ئەوەی ئێمە لە هیچ شتێکدا لەیەک ناچن! هەستم ئەکرد ئەوەی ئەوان ئەسڵ و ئەوەی ئێمە تەزویرە! هەستم ئەکرد ئەوەی ئەوان بە ناوەڕۆکەوە مارکسیزمە و ئەوەی ئێمە تەنها بۆیەیەکی تەنک و کاڵە. بەکورتییەکەی هەستم دەکرد، من سەر بەوەی ئەوانم و بەمەی خۆمان نامۆم!

ئەوانە گشت وایان کرد، هەنگاو بۆ لای ئەوان هەڵبهێنمەوە و ناچاری سەفەرێکی لای ئەوان بم. کاتێکیش کە چوومە لای ئەوان، ئەو هەموو ژن و پیاوە چەکدارەم بینی، پێکەوە و بەتێکەڵی کار دەکەن، ئۆردووگای ئەوانم بینی، ئەو هەموو لافیتانەم بینی، کە بە خەتگەلێکی زۆر جوان و پێرفێکت، ئەو هەموو درووشمە جوان و کرێکاری و کۆمۆنیستییە نووسراونەتەوە و ئۆردووگاکەی پێ ڕازێنراوەتەوە ... ئیدی هەستم بەوە دەکرد، جیاوازییەکان لەکێشدا نیین، هەستم دەکرد، ئێمە هەر بەناو مارکسیین.

لەو دانیشتنەدا من کۆمەڵێک پرسیار کە پێشووتر لەگەڵ هاورێکانم ڕاوێژمان لەسەریان کردبوو و لە کاغەزێکدا یاداشتم کردبوون، ئاراستەی ئەو هاورێیانەی کۆمەڵەم کرد، ئەوانیش وەڵامیان ئەدایەوە. هەروەها ئەوەشم دێتەوە یاد، ئێمە ڕیکۆردەرێکمان لەگەڵ خۆماندا بردبوو، هەر لە سەرەتای قسەوباسەکانمادا من داوای ئەوەم کرد، ئەگەر ئیجازە هەبێت، بەڵکوو قسەوباسی نێو کۆڕەکە تۆمار بکەم، تاوەکوو کە گەڕاینەوە، هاورێیانی دیکە گوێی لێ بگرن. وەلێ ئەوان، لەلایەکەوە پێیان خۆش نەبوو تۆماری بکەین، لەلایەکی دیکەشەوە پێیان خۆش نەبوو دەست بنێن بە ڕوومانەوە، بۆیە گوتیان: لەبەر ئەوەی ئەمە یەکەمین دیدارمانە لەگەڵ یەک، ئەم جارە هەر وا بۆخۆمان گفتوگۆ ئەکەین و بۆ یەکترناسین دایئەنێین، وەلێ بۆ جارێکی دی کە هاتنەوە، بە چاوان دەتوانن تۆماری بکەن.

دانیشتنەکەمان دوورودرێژ بوو، لە چێشتەنگاوی ئەو ڕۆژەوە هەتا دەمەو عەسری برد، نانی نیوەڕۆشمان هەر لەوێ و لەگەڵ ئەواندا خوارد، کە گۆشتی قوتوو بوو.

پرسیار و بابەتەکان زۆر بوون، وەلێ ئەوەی دێتەوە بیرم، باسی کۆمەڵەی عێراق و یەکێتی و مفاوەزات و بۆرژوازیی نیشتمانی و بەرەی گەل و دیدگای ماو

تسیتۆنگمان کرد. ئەوانە بۆ ئەو دەمە جێگای مشتومڕ بوون و قسەوباس لەسەریان گەرم بوو. هەروەها دێتەوە یادم، دکتۆر جەعفەری شەفیعی زۆر باسی "مانیفێستی حیزبی کۆمۆنیست"ی کرد و زۆر جەختی لەسەر گرنگی و ئەهمییەتی ئەو نووسراوە ئەکردەوە و دەیگوت، دەبێت چەندین جار بخوێنرێتەوە. من ئەو دەمە ئەو نووسراوەم وەکی هەر نووسراوێکی دیکەی مارکس و ئەنگڵس دەهاتە پێش چاوان و ئەو هەموو هەڵوەستەکردنەی ئەوم بە زێدەڕەوی دەبینی.

ئەو ڕۆژەمان لەگەڵ ئەو پۆلە ئینسانە شۆڕشگێڕ و دڵ پڕ لە هیوایە، بە قسەوباسی گەرم و جددی بەسەر برد و کاریگەری پێشووتری ئەوانی چەند قات لەسەر فکر و زیهن و تێروانینم بەجێ هێشت.

لە کۆتاییدا ئەو هاوڕێیانە کۆمەڵێک بڵاوکراوەی خۆیان، کە بریتی بوون لە: پێشڕەو، پێشەنگ، "کمونیست" ... بە زبانی کوردی و فارسی بە ئێمە بەخشی و دوای ئەوەماڵئاواییمان لێیان کرد.

بڵاوکراوەکان زۆر بوون، هەر یەکەمان هەردووک پووزمان پێیانەوە جەڕەبابە دا و بۆ سلێمانی چووین، پاشان لەوێوە دابەش بووین و هەر یەکە بۆ شاری خۆی، هەولێر، کەرکووک و کەلار گەڕاینەوە.

ئەو ڕێگایە زۆر مەترسیدار بوو، ڕێگایەکی دوورودرێژ و بازگەکانی سەخت بوون، بە تایبەتی بازگەی ماوەت و کەرکووک. وەلێ هەر هەموو بێ کێشە گەییشتینەوە زێدی خۆمان.

هەر کە گەییشتمەوە ماڵ، دەستم کردە خوێندنەوەی بڵاوکراوەکان، فارسییەکانیشم دەخوێندەوە، ئەگەرچی بەباشی لێیان تێ نەدەگەییشتم، وەلێ لەدوای ئەوەوە هەوڵی فێربوونی زبانی فارسیم دا و بە ماوەیەکی کەم فێر بووم.

گۆڤاری "پێشڕەو" ژمارە دووەکەی لەنێو بڵاوکراوەکاندا بوو، لە بەرگەوە بۆ بەرگ خوێندمەوە، باسەکانی بۆ من زۆر سەرنجڕاکێش بوون. یەکێک لە باسەکانی نێو ئەو ژمارەیە نووسینێکی عەبدوڵای موهتەدی بوو، باسی حیزبی کوردستانی و سەرانسەری دەکرد. ئەو لەوێدا باسی ئەو ئوسووڵ و هۆکارانەی دەکرد کە بۆچی دەبێت حیزبی کۆمۆنیست، حیزبی کۆمۆنیستی سەرتاسەری ئێران بێت نەک

کوردستان. چ ئەو باسە و چ باسەکانی دیکە لەسەر پۆپۆلیزم بۆ من و بۆ کۆمۆنیستەکانی ئەو ڕۆژگارەی کوردستان بەتەواوی لە کات و ساتی خۆیاندا بوون.

ئیدی لەدوای ئەوەوە، گۆڕانە ورد و لەسەرخۆ و شێنەییەکان لە دید و نیگای مندا بوونە گۆڕانی گەورە و ڕیشەیی.

ئەو ئالوگۆڕانە وایان کردبوو، لەنێو ڕێکخستن و هاوڕێیانی دەرەوەی ڕێکخستنیشدا بەو ئاراستە و ئاقارەدا منیش کاریگەری دابنێم و کاری فکری خۆم بکەم.

دێتەوە بیرم جارێکیان لە هەولێر لەگەڵ دکتۆر موحسین بووە موناقەشەمان، ئەو لە نەزەرەکانی من گەلێک تووڕە و دەهری بوو، سەرەنجام وتی: تۆ کابرایەکی مورتەدی! ئەم قسەیەی ئەو لەسەر وەزنی وتارێکی لینین بوو، بەنێوی: "الثورة البرولیتاریة والمرتد کاوتسکی" (شۆڕشی پرۆلیتاری و کاوتسکی هەڵگەڕاوە). لینین ئەم وتارەی دەربارەی کاوتسکی لە ساڵی ١٩١٨ لە ڕۆژنامەی "پراڤدا" بڵاو کردەوە. منیش لە وەڵامدا پێم گوت: مورتەدم لە چی؟ مورتەدی خۆی لەخۆیدا شتێک نییە، ئەسڵ ئەوەیە، تۆ لە چ شتێک مورتەدی؟ من لە شتێک مورتەدم، بەنێوی کرێکار و کۆمۆنیزمەوە ئەدوێ کە نە کرێکارییە و نە کۆمۆنیستی! ئیدی لەدوای ئەوەوە پەیوەندی لەگەڵدا پچڕاندم و پاشان یەکتریمان نەبینییەوە و چەند ساڵێک دواتر بیستم، لە شاڵاوی گرتنەکان بۆ سەر ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری هەولێر ئەویش گیراوە و پاشان حوکمی زیندانی ئەبووغرێب دراوە.

پێم وابێت لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٦دا بوو، لە زستانێکی ئێجگار سەختدا، لەگەڵ حەوێز محەمەد ئەمین (مامۆستا حەوێز) کە خەڵکی ڕانیە و هاوڕێی یەکتری بووین لە زانکۆ، جارێکی دیکە بۆ سەردانی ئۆردووگای کۆمەڵە چووەمەوە. ئۆردووگای کۆمەڵە ئەو دەمە لە مالوومە بوو.

حەوێز و من بە ئۆتۆمبیل هەتاوەکوو گوندی گاپیلۆن چووین، ئیدی دەبوو لەوێوە بەپێ بڕۆین، چونکە بەفرێکی زۆر باری بوو، دنیاش بەتەواوی بەستبووی، هەواکەی ئێجگار سارد بوو، دەتگوت تیغە.

له گـاپیلۆن سـەرەتا لامـان دایە چایخـانەیەک کە هەر وا بە دار و نـایلۆن و سەفەری دروست کرابوو. چامان خواردەوە و کەمێک لەشمان گەرم داهات. دوای ئەوە وتمان با بکەوینە ڕێ. پارەی چایەکانمان دا و بەرەو دەرەوە هەنگاومان نا. هەر ئەوەندەم خۆش بوو، لە دەرگا نایلۆنەکەی چایخانەکە پێم هەڵدایە ئەو دیو، خلیسکام و کەوتم، بەڵام چۆن کەوتنێک، خزینی پاژنەی پێڵاوەکەم و کەوتنی پشتەسەرم بە زەویدا هیچی وای بەین نەبوو، ئەوەندە خێرا بوو، خۆشم نەمزانی چۆن وا تەخت بووم. ئاخر زەوی بەستبووی و ئەوەندەش خەڵکی بەسەر ئەو دەرگا و بانەوە بوو، بەتەواوی لووس ببوو. ئەو زەوییەش ناحەقی نەبوو، ئاخر لە جیاتی جزمە و پووت، من جووتێک پێڵاوی گڵاسی ژێر چەرمم لە پێ کردبوو، بەو بەفر و سەرمایە دەبووە تەختە و هەر مالّی ئەوە بوو، لەسەر بەفر یاری خلیسکانەی پێ بکەیت. زۆر بەگورجی هەستامەوە سەرپێ و سەیرێکی حەوێزم کرد و دەستمان کردە پێکەنین و کەوتینە ڕێ.

لە ڕێگا تراکتۆرێکمان بینی، ئیشی نەدەکرد و گیری کردبوو، ئاگریان بۆ کردبووە تاوەکوو بیخەنە ئیش. چەند جارێک شەختەی سەر ڕێگاکە لەژێر پێڵاوەکانم ئەشکا و پێم ئەچووە خوارەوە بۆ نێو ئاوی تەزیوی ژێر شەختەکە و گۆرەوییەکانم تەڕ و پێڵاوەکانم پڕ لە بەفراو دەبوون.

دەمەو ئێوارە گەییشتینە گوندی مالوومە. لامان دایە خانوویەک کە بنکەی 'کۆمەڵەی یەکسانی کوردستان' بوو، تەنها ئەو بنکەیەیان هەبوو، وە تەنها یەک کەسیشی لێ بوو، ناوی عەبدوڵا بوو. ئەو شەوە لەوێ ماینەوە و کۆمەڵێک قسەوباسمان کرد. نووسراوێکی کۆنی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی ئێرانی لەلا بوو، ئارمەکەیان بریتی بوو لە هەوجارێک و تفەنگێکی برنەو، نایەتەوە بیرم چەکوشی لەگەڵدا بوو وە یان نا! پرسیارم لە عەبدوڵا کرد و وتم: ئەم ئارمە چییە؟! ئەوە کۆمەڵە پێشووتر بەو جۆرە بوونە؟! وتی: بەڵێ ئەوان ئاوها بوون و ئاوها بیریان دەکردەوە.

لەڕاستیدا پێشووتر کۆمەڵەی ئێران دیدگایەکی ناڕۆشن و تێکەڵوپێکەڵیان لەمەڕ مارکسیزم و کۆمۆنیزم هەبوو، ماویی بوونە و پێیان وابووە ئێران وڵاتێکی نیمچە

کۆلۆنی-نیمچە فیئۆدالی بووە. هەروەها کۆمەڵەی ئێران لەپێش شۆڕشی ئێرانەوە پەیوەندییان لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا هەبووە و بەگوێرەی توانستی خۆیان، کۆمەکیان پێ کردووە و چەند کەسێکیشیان بۆ نێویان ناردووە و لەنێویاندا مامۆستا برایم و دکتۆر جەعفەری شەفیعی کە بۆ چەندین ساڵ و هەتا دەمی ڕاپەڕین و شۆڕشی خەڵکی ئێران هەر لەوێ بوونە. وەلێ دواتر کۆمەڵەی ئێران دەکەوێتە ژێر کاریگەریی گرووپی سەهەند و ئیتیحادی موبارزان و شەخسی مەنسوور حیکمەتەوە و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت. بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین: کۆمەڵە دەنێو کرێکاران و زەحمەتکێشانی شار و لادێ، بنکەیەکی گەورە و فراوانی جەماوەریی هەبووە و بە پراکتیک خۆی بە ئامانج و ئارمان و بەرژەوەندیی ئەوانەوە گرێ دابوو. هەر بۆیە بەتەبیعەت ئامادەیی گشت ئاڵوگۆڕێکیان بەو ئاقارەدا هەبوو.

قسەوباسەکانمان لەگەڵ عەبدوڵا چووە سەر وەرگێڕانی توراسی مارکسی بۆ سەر زبانی کوردی و وتی: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ئەگەر بۆمان چاپ بکەن، ئەوا من ئامادەم هەر مانگەی کتێبێکیان بۆ وەربگێڕم و پێیان بدەم، وەلێ ئەوان بۆمان ناکەن. دیارە من لەلای خۆمەوە ئەوەم بەڕاست نەئەزانی و پێم وابوو، ئەوە فشە و زێدەڕۆیییە.

ئەو شەوەمان لەو بنکەیە کردەوە و بۆ بەیانییەکەی بۆلای کۆمەڵە چووین.

کاتێک کە گەیشتینە ئۆردووگای کۆمەڵە، پرسیاری "مامۆستا برایم"مان کرد. من پێشووتر بە هۆی هاوڕێیەکی زانکۆوە کە ناوی عەبدوڵا بوو، لە کۆلێجی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەدین و خەڵکی سلێمانی بوو، ئەندامێکی کۆمەڵەی ئێرانم ناسی کە لە شاری سلێمانی دادەنیشت و هاوڕێ و ئاشنای مامۆستا برایم بوو. جا بەو هۆیەوە و لەڕێگەی ئەوانەوە من ئەمویست مامۆستا برایم ببینم و لەگەڵ ئەودا دابنیشین.

هەر وەکوو پێشووتریش باسم کرد، من لەدوای ئەوەی لە کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٨٤ گەڕامەوە، وازم

له کۆمه‌ڵه هێنـابوو. هه‌روه‌هـا ئه‌و په‌یوه‌نـدییه‌ش، که له‌گه‌ڵ مه‌لا به‌ختیـاردا هه‌مـان بوو، کۆتاییمان به‌ویش هێنابوو.

به هه‌ر حـاڵ له‌م سـه‌ردانه‌ماندا بـۆ لای کـۆمه‌ڵه، "مامۆسـتا برایم"مـان بینـی و له‌سه‌ر گه‌لێک مه‌سـه‌له‌ی فکری و سیاسـی ئه‌و زه‌مـانه قسـه‌مان کرد. دێته‌وه یـادم، یه‌کێک له‌و مه‌سـه‌لانه‌ی چـووینه سـه‌ری، کۆبـوونه‌وه‌ی کۆمۆنیسـته‌کان له ده‌وری یه‌کتـری، له‌نێـو ده‌سـته و سـازمانی کۆمۆنیسـتی و ته‌بلیـغ، ته‌رویـج و سـازمانده‌هی له‌نێو کرێکاران و زه‌حمه‌تکێشاندا بوو.

ئه‌و ده‌مه چه‌ند سازمان و رێکخراوێک له ئارادا بوون، وه‌لێ بچکۆله، نارۆشـن، بێئۆتـۆریته و که‌مته‌ئسـیر بـوون. له هه‌ر نێوه‌نـد و له‌نێـو هه‌ر چه‌نـد که‌سێکیشـدا، ئه‌ڵقه‌ی بچکۆله‌تریش پێک هـاتبوو، یـان به‌رده‌وام له پرۆسـه‌ی پێکهاتندا بـوو. پێش هه‌ر شتێک ئه‌مانه گشت له ئاستێکی نزمی تیئۆریدا بوون و نه‌یانده‌توانی له‌و نێوه‌دا هه‌ژموونی په‌یدا بکه‌ن و ئه‌و هێزه په‌رش و بڵاوه له ده‌وری یه‌کدی بئاڵێنن. خـاڵێکی دیکه‌ی دیار و زه‌قی ئه‌م بزووتنه‌وه‌یه ئه‌وه بوو، بڕوا و متمـانه‌ی به‌خـۆی نه‌بـوو که بێگومان به‌شێکی بۆ خـاڵی یه‌که‌م ده‌گه‌ڕایه‌وه. له‌گه‌ڵ مامۆسـتا بـرایم ئه‌م باسـانه‌مان کرد. مامۆستا له وه‌ڵامدا گوتی:

بـۆچی بڕوا و متمانه‌تـان به خۆتـان نییه‌؟! ئێمه کـاتی خـۆی که کۆمه‌ڵه‌ی عێراق هه‌بوو، دڵمان پێی خـۆش بـوو، که باسـی شـۆڕشـی زه‌فـار ده‌کرا، دڵمـان پێی خـۆش بوو، تین و تـاو و هێز و وره‌ی پێ ده‌به‌خشـین. ئێسـتا ئێوه کـۆمه‌ڵه‌ی شـۆڕشـگێڕی زه‌حمه‌تکێشـانی کوردسـتانی ئێـران و حیزبـی کۆمۆنیسـتی ئێـران له‌پـاڵ ده‌سـتانه، ڕادیۆیان هه‌یه و ڕۆژانه ده‌توانن گوێبیستی بن.

ئه‌و شـه‌وه له ئۆردووگـا مـاینه‌وه و له چادرێکـدا نووسـتین. به‌ڵام سـه‌رماکه‌ی له‌وه‌دا نه‌بوو، بۆ به‌یانییه‌که‌ی که له خه‌و ڕابووین و چووین ده‌ست به‌ئاو بگه‌یه‌نین، هه‌تا ئه‌گه‌یشتینه سه‌رئاو، مه‌سینه‌که چلووره‌ی ئه‌به‌ست!

جـارێکی دیـکه مامۆسـتامان بینیـیه‌وه و پـێکه‌وه بـۆ فرۆشـگاکه‌یان چـووین که بڵاوکراوه و نه‌شرییاته‌کانیشیان بۆ فرۆشتن تێدا دانابوو. چاومان به بڵاوکراوه‌کاندا

گێڕا و هەر یەکەمان چەند دانەیەکمان هەڵبژارد. مامۆستا نەیهێشت پارە بدەین و خۆی لەبری ئێمە پارەکەی دا، ماڵئاواییمان لێی کرد و گەڕاینەوە.

ئەو دەمە کۆمەڵە و حیزبی کۆمۆنیستی ئێران کاریگەریی گەورەیان لەسەر کۆمۆنیستەکانی کوردستانی عێراق دانابوو. هەر بەو شێوەیەی ئێمە چەندین کەسی دیکە، تاک تاک یان بە دەستە، سەردانی ئەو ئۆردووگایەیان دەکرد. ژمارەیەکیش هەبوون، ئەچوون دەورەی ئامووزشی سیاسی-نیزامییان دەبینی و دەبوونە پێشمەرگەی کۆمەڵە، یان دەگەڕانەوە بۆ دیوی عێراق و کار و چالاکییان دەکرد.

هەر لەو ساڵەدا بوو، نمایندەی کۆمەڵەم لە شاری کەرکووک ناسی.

کۆمەڵە و حیزبی کۆمۆنیست لە شاری کەرکووک بنکە و بیرۆیەکیان هەبوو، تاقە یەک کەس کاری تێدا دەکرد، ئەویش کەسێک بوو بە نێوی ڕەحیم. ئەم بیرۆیە خانوویەک بوو لە ڕێگای بەغدا لە نزیک بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووک. هەر بە هۆی ئەو پەیوەندییانەی خۆمەوە لەگەڵ کۆمەڵە، "ڕەحیم"م ناسی. یەکترناسینەکەمان وا ڕێک خرابوو، لە شەقامی جمهووری لە بەردەم سینەمای سەلاحەدین یەکتری ببینین. بە هەر حاڵ، بەگوێرەی ئەوەی بڕیار بوو، لە کات و شوێنی دیاریکراودا یەکتریمان ناسی و بووینە هاوڕێی یەکتری. لەبەر ئەوەی بیرۆکەی ئەوان لە جێگایەکی هەستیار و مەترسیداردا بوو، من تەنها یەک جارێک بۆ ئەو بیرۆیە چووم، بەڵام هەر ماوە جارێک ئەو بۆ ماڵمان دەهات و سەردانی دەکردم.

ڕۆژێکیان ڕەحیم هات بۆ ماڵمان، بێتاقەت و شپرزە بوو، پرسیارم کرد، شتێک ڕووی داوە؟

وتی: دکتۆر جەعفەری شەفیعی بە ڕووداوی ئۆتۆمبیل گیانی لەدەست داوە!

وتم: کەی؟ لە کوێ؟

گوتی: ئەمڕۆ، لە نزیک شاری تکریت. پاش ئەوەی پشوویەکی دا، گوتی: من ئەبێ بڕۆم تەرمەکەی وەربگرمەوە.

دکتۆر چەعفەری شەفیعی کە ئەو دەمە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە و بەرپرسی ڕادیۆ و سەرنووسەری گۆڤاری پێشڕەو بوو، یەکێک بوو لە کادرە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە و لە ڕابەرە زۆر بەتوانا و کاریگەرەکانی کۆمەڵە و

موبەلیغێکی دیار و دەرکەوتووی ئەو حیزب و سازمانە بوو، کاتێک دەیەوێت بە مەئموورییەتێک بۆ شاری بەغدا و لەوێوە بۆ ئەورووپا بچێت، لە ڕێکەوتی ۱۹۸۷/۱۰/۲۹ لە نزیک شاری تکریت تووشی ڕووداوی ئۆتۆمبیل دەبێت و گیان لە دەست دەدات.

من دکتۆر جەعفەرم تەنها ئەو جارە بینی کە باسم کرد، وەلێ هەر ئەو جارە بووە هۆی ئەوەی خۆشەویستی ئەو لە دڵی مندا بەقووڵی ڕەگ دابکوتێ و کەسایەتیی ئەو بۆ هەمیشە لە زەینی مندا ئەسەرێک بەجێ بهێڵێ.

ماوەیەک بوو کۆمەڵە و حیزبی کۆمۆنیست کەوتبوونە ژێر گوشاری دەوڵەتی عێراقەوە و بۆیان نەبوو بڵاوکراوە و ئەدەبیاتەکانیان بە کۆمۆنیستەکانی کوردستانی عێراق بدەن و کارێکی لەو جۆرە لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە بە دەخاڵەتکردن لە کاروباری عێراق دەهاتە ژماردن و لێپێچینەوەی لەسەر بوو. لەو دەورانەدا بوو، جارێکیان ڕەحیم بۆ ماڵمان هات. دوای چاکوخۆشی و هەواڵپرسین و قسەوباسکردن، لە جانتاکەی دەستی ژمارەیەک لە ئۆرگانی "بسووی سۆسیالیزم"ی دەرهێنا و گوتی: ئەمە ژمارەی نوێی ئەم ئۆرگانەیە و تازە دەرچووە. پێم وابێت، ژمارە پێنج بوو. لێم وەرگرت و سەیری پێرستی بابەتەکانیم کرد، هەر وا بەخێرایی چاوێکم پیایدا خشاند و لە نێوان هەردووکماندا دامنا و وتم، دەکرێ بیدەیتە لام، تا بیخوێنمەوە؟ دەستی کردە پێکەنین و گوتی: داوای لێبووردن ئەکەم، بەهۆی ئەو گوشارانەی خراونەتە سەرمان، ناتوانم!

ڕەحیم کەسێکی سووروسپی، قژزەرد و چاوشین بوو، بەتەواوەتی دیار بوو کە عێراقی نییە و غەریبە، جارێکیان باجی ڕەعدە، یەکێک لە ژنەکانی شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزانی کە ماڵیان لەبەرانبەر ماڵمان بوو، ڕەحیمی لەبەر دەرگای ئێمە بینیبوو، دواتر بە دایکمی گوتبوو: ئەو زەلامە ئێرانییە!

هەر وەکوو جارێکی دیکەش باسم کردووە، ماڵی ئێمە لە کۆڵانی ماڵی شێخ بوو، ئەو کۆڵانەش بۆ کاری نهێنی و ژێرزەمینی لە خراپترین کۆڵانەکانی شار بوو. وەلێ لە ڕێی ئەوانەوە تووشی بچووکترین زیان نەهاتم.

# شەڕی عێراق-ئێران و مانگرتنی خوێندکاران

شەڕی نێوان هەردووک وڵاتی عێراق و ئێران لە ساڵی ١٩٨٠دا هەڵگیرسا. عێراق دەیگوت، لە ٤ی ئەیلوول و لە ئەنجامی دەخاڵەتی ئێران لە کاروباری عێراق[٢٢٦] و ئێرانیش دەیگوت، لە ٢٢ی ئەیلوول و لە ئەنجامی هێرشی سوپای عێراق بۆ سەر خاکی ئێران دەستی پێ کردووە.

واتە، هەر لایەک دەیویست لایەکەی دیکە بە دەستپێشکەر و تاوانکار و خۆی بە بەرگریکار و بێتاوان لەقەڵەم بدات.

عێراق بێجگە لە وڵاتانی لیبیا، جەزائیر و سووریا، باقی وڵاتانی دیکەی عەرەبی و یەکێتیی سۆڤیەت و فەرەنسا و ئیتالیا پشتیوانییان لێ دەکرد.

ئێران تەنها لیبیا، سووریا، چین و کۆریای باکوور پشتیوانییان لێ دەکرد.

هەرچی ئەمەریکا بوو، بە شێوەیەکی گشتی پشتیوانی لە عێراق دەکرد، وەلێ هێندێک جار و بەنهێنی پشتیوانی لە ئێرانیش دەکرد کە دیارە ئەوەش بە سیاسەتی ئەمەریکا و ڕاگرتنی هاوسەنگیی هێزی نێوان ئەو دوو وڵاتە بە قازانجی خۆی پەیوەست بوو. ڕژێمی ئیسلامی ئێران، حکوومەتی دڵخوازی ئەمەریکا نەبوو، وەلێ لە هەمبەر هەڕەشەی ڕاپەڕینی ڕادیکاڵی خەڵکی ئێران و هاتنەمەیدانی کرێکاران و زەحمەتکێشان و بە تایبەتی کرێکارانی شیرکەتی نەفتی ئێران و کاریگەریی دیار و گەورەی بزووتنەوەی چەپ و کۆمۆنیستی، ئەمەریکا و وڵاتانی گەورەی سەرمایەداری لە هەوڵی ڕاگرتن و چەسپاندنی دەسەڵاتی ئیسلامیی ئێراندا بوون.

کەواتە: ئەو شەڕە لە ناوەڕۆکدا بۆ لەباربردنی شۆڕشی ئێران و بۆ لەناوبردنی ئامانجە ڕادیکاڵانەکەی بوو کە سەرەنجام بە هۆی ڕژێمی ئاخوندیی ئیسلامی ئێرانەوە بەو ئاکامە گەییشتن و ئەوەی لەو نێوەدا زەرەری کرد، کۆمەڵانی زەحمەتکێش و ئازادیخواز و پێشکەوتنخوازی ئێران بوو.وەلێ ڕژێمی ئاخوندیی ئیسلامیی ئێران توانی بە سوودوەرگرتن لەو شەڕە، کۆڵەکەکانی فەرمانڕەوایەتیی

---

٢٢٦. پێنج مانگ پێش هێرشی سوپای عێراق بۆ سەر خاکی ئێران، لە ڕێکەوتی ١٩٨٠/٤/١٩دا ڕۆژنامەی "کەیهان"ی ئێرانی بە تایتڵێکی گەورە دەنووسێت: ئیمام، بانگەوازی سوپای عێراقی کرد، بۆ ڕاپەڕین لە دژی سەددام.

خۆی بچەسپێنێت و عێراقیش بەهەڵی زانی لە پەیماننامەی جەزائیر پاشگەز بێتەوە و ئەوەی پێشووتر دۆڕاندبووی وەری بگرێتەوە.

ئەمەریکا و وڵاتانی گەورەی سەرمایەداری، دیسانەوە وڵاتانی سەرمایەداریی ناوچەکە و لەنێویشیاندا خودی ئێران و عێراق لە خەفەکردنی شۆڕشی ئێران و لەگۆڕنانی ئامانجەکانی و بەرگرتن بە تەنینەوەی، قازانجی گەورە و مەزنیان کرد.

ئەم شەڕە عێراق ناوی لێ نابوو: شەڕی قادسییە و ئێرانیش ناوی لێ نابوو: شەڕی بەرگریی پیرۆز.

سەرەنجام ئەم شەڕە ٨ ساڵی برد و لە ڕێکەوتی ١٩٨٨/٨/٨ کۆتایی پێ هات.

ئەم شەڕە بە درێژترین شەڕ لە سەدەی بیستەمدا دێتە ژماردن و بەپێی ڕاپۆرتە نێودەوڵەتییەکان ژمارەی کوژراو، دیل و کەمئەندام بە زیاتر لە یەک ملیۆن و نیو دەخەمڵێندرێت.

ئەوەی شایانی باسە، لە پاش تەواوبوونی جەنگ و ئەو هەموو کوژران وماڵوێرانییە، خومەینی گوتبووی: جەنگ نیعمەت بوو!

ئەو دەمەی ئەو شەڕە هەڵگیرسا، من لە زانکۆی سلێمانی خوێندکار بووم و بۆ تاقیکردنەوەی چەند مادەیەکی دەوری دووەمی قۆناغی یەکەم بۆ سلێمانی گەڕابوومەوە و لە بەشی ناوخۆیی لەپشت تەلاری حەسیب ساڵح بووم.

زۆری نەبرد دەوامی خوێندنی ساڵی (١٩٨٠-١٩٨١)یش دەستی پێ کرد. باسی ئەو شەڕە لەنێو خوێندکارانی زانکۆ و بە تایبەتی لەنێو ئێمە، ڕێکخستنە نهێنییەکانی کۆمەڵە زۆر گەرم بوو. هەر هەموو پێمان وابوو کە زۆر نابات خەڵکی ڕادەپەڕن و ئەو ڕژێمە هارە دەڕووخێنن. خۆمان بۆ ئەوە ئامادە کردبوو کە چۆن لەو کاتەدا پیاوانی بەعس، ئەوانەی ئێمەیان عەزیەت ئەدا و خۆشیی ژیانی ئێمەیان دزیبوو و زیندەگییان لێ کردبووین بە دۆزەخ، پەتیان بکەین و بەنێو گۆڕەپان و مەیدانی زانکۆ و نێوشاردا ڕایان بکێشین.

وەلێ ئەو قسە و لێکدانەوە و پێشبینییانە نەک هەر ڕاست دەرنەچوون، گەلێکیش بەپێچەوانەوە بوون. ئەو شەڕە درێژەی کێشا و بە وێنەی ئەژدیها ڕۆژانە بە سەدەها لاوی هەردووک وڵاتی هەڵدەلووشی. هیچ کۆڵانێک نەبوو دیوارەکانی چەندین لافیتەی ڕەشی کوژراوەکانی ئەو شەڕەی بەسەرەوە نەبن. کەم خانەوادە

هەبوو، سەرباز و سەربازی بەرەکانی جەنگی نەبووبێت. هەر یەکە لە دڵەڕاوکێی ئەوەدا بوو، ئێستا نا ئێستا تەرمی نووستوو و ڕاکشاوی کوڕ یان هاوسەرەکەی لەنێو تابووت و بەسەر ئۆتۆمبیلێکەوە خۆی بەنێو گوزەرەکەیاندا دەکات و پرسیاری ماڵی ئەوان دەکات و لەبەر دەرگاکەیان دەوەستێت.

جاری واش هەبوو بە هەڵە هەواڵ یان تەرمی یەکێکیان دەهێنایەوە، وەلێ پاشتر ئەو کەسە بە ئیجازە دەهاتەوە.

هی واش هەبوو کەس نەیدەزانی چی لێ بەسەر هاتووە و دەڕۆییشت و سەروسۆراخی نەدەزانرا و بەیەکجاری و هەتاهەتایە لە بەرچاوان گوم دەبوو.

ژمارەی فیرار ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر دەبوو، گوندەکانی کوردستان و هۆڕەکانی باشووری عێراق جمەی دەهات. تەنانەت لە نێوجەرگەی شاری بەغدا و لە گەڕەکی سەورە بە هەزاران فیرار خۆیان حەشار دابوو.

بەردەوام سەرجادە و چوارڕێیانەکان دەگیران و بازگەیان بۆ فیرارەکان دادەنا. گەلێک جاریش دەوری گەڕەکێک دەگیرا و هەڵیان ئەکوتایە سەر ماڵان. خەڵکێکی زۆر لەو حەملە و پشکنینی ماڵانەدا دەستگیر دەکران و دەخرانە زیندانەوە، یان هەر لەسەر شەقامەکان گولەباران دەکران و لەشیان دەکرا بە بێژنگ.

ئەو شەڕە وای کرد، بە سەدان هەزار کەس شەلوشێت و سەقەت و گێڕوگەواڵ بین و بە سەدان هەزار ژن بێوەژن و ملیۆنەها منداڵیش هەتیو بکەون.

خۆشی لە دڵی خەڵکی و بزە بەسەر لێویانەوە نەمابوو. ژنان بەزۆری ڕەشپۆش بوون و ڕەنگی ئاڵوواڵا لە زەینی زۆرێک هەر سڕابووەوە. ڕادەی هاوسەرگیری کەم ببووەوە و بە وسکتی و بەبێهەستی بەڕێوە دەبرا. شایی و زەماوەندی چەند ڕۆژەی نێو کووچە و کۆڵان وشکی کردبوو، زوڕناکان بێ دەنگ و دەهۆڵەکان مەگەر بۆ پارشێو زرمەیان لێ هەستایە. چاوشەکان بەهۆی بێکاری و دانیشتنەوە زەلیل و ڕیسوا ببوون و لەدەستی نەبوونی هەر دادوبێدایان بوو. ئاخر کورد دەڵێت: چاوش بە دانیشتن ماڵی وێرانە.

بۆ ئەم شەڕە، دەستگای زەبەلاحی ڕاگەیاندن بەگەڕ کەوتبوو. خەڵکی عێراق، لەنێویشیاندا منداڵانی ورد و ناسک شەوانی بەدیار تەلەفزیۆنەکانەوە بەسەر دەبرد. ئەو دەمە چەند کەناڵێک هەبوون کە هەر دەوڵەتی بوون، ئەو کەناڵانەش بەردەوام

بەرەکانی جەنگ و تەرمی شێواو و قاچ و دەست و کەلەسەری پەڕیوی دەم تۆپ و ورگــی دڕاوی دەم حەربەی پیشـــان دەدا و ســـووکایەتی نەدەمـــا بە لاشـــەی ئەو ســـەربازانەوە نەکرێـت کە بە هەڕەشـــە و گوڕەشـــە خرابـــوونە نێـو کــوورەی ئەو جەنگەوە. لە بەرەکانی جەنگیش، لە پشتەوە لیژنەی ئیعداماتیان بۆ ئەوانە دانابوو کە نەیاندەویست بەرگری بکەن و هەوڵی هەڵاتنیان دەدا.

بەو جۆرە فەزای شەڕ تەواوی کۆمەڵگای داگرتبوو. موالیدی وا هەبوو خزمەتی ســـەربازی هەر تەواو نەدەبـــوو. خزمەتـــی ســـەربازی تەواو دەبـــوو، بـــۆ خزمەتـــی ئیحتییـات گـاز دەکـرا. جـاری وا هەبـوو خزمەتـی ئیحتییـات سـێ هێنـدەی خزمەتـی ئیجباری بوو. جاری وا هەبوو تەسریح دەکرا، وەلـی زۆری نەدەبرد دووبـارە بانـگ دەکـرایەوە. ئەوانەی تەسـریح دەبـوون، یـان بە هەر هـۆیەکەوە بـوو بە سـەرباز نەدەگیـران، بەزۆر دەکـرانە جەیشـی شـەعبی. تەنـانەت خوێنـدکارانی سـەرەتایی دەکرانە تەلایع و هی ناوەندی دەکرانە فتوە و دواناوەندیش دەکرانە شەباب.

ئەو دەمە باسـی ئەوە دەکـرا، لە ٪۹۰ی داهـاتی نەوتـی عێـراق بە قـوڕگی ئەو شەڕەدا دەکرێت. ئەمە بە جیا لە کۆمەکی زۆروزەوەندی وڵاتـان. واتە، تەنهـا ٪۱۰ی داهاتی نەوتی عێراق کە دەمـایەوە، بۆ بەڕێوەبردن و بەڕێکردنی گوزەرانی خەڵک بەکار دەهێنرا. ئینجـا لەگەڵ ئەوەشـدا ئاسـتی بژێوی خەڵکی خـراپ نەبـوو، دەکـرێ بڵێـــین خەڵکـــی لە ڕووی ئـــابووریيەوە لەگەڵ دەورانـــی پێشـــوودا هەســـتی بە جیـاوازییەکی ئەوتـۆ نەدەکرد. لەو نێوانەدا حیزبەکـانی بزووتنەوەی ناسیۆنالیسـتیی کوردسـتانی عێراق لە ڕووی سـەربازییەوە پەرەیـان سـەند و بەهێـز بـوون. چـونکە لەلایەکەوە سوپای عێراق سەرقاڵی شـەڕ بـوو لەگەڵ ئێران و لەلایەکی دیکەوە ئەو هێـزانە ســـوودیان لەو نـاکۆکییەی نێـوان عێـراق و ئێـران وەرگـرت و دەروازەی سنووریان لێ کرایەوە و کۆمەکی جۆراوجۆریان پێ کرا. ئەمە سـەرباری ئەوەی بە هـۆی سـەربازانی هەڵاتـووەوە، هێـزی چەکداری ئەو بزووتنەوەیە گەشـەی کـرد و پەرەی سـەند. وەلـێ ئەمە هەر وا نەچـووە پێش و هەر دوای ئەوەی سـوپای عێـراق هێندێک سەرکەوتنی لە هەمبەر ئێران بەدەست هێنـا و فرسـەتێکی بـۆ هەڵکەوت، بە بیـانووی جەنـگ و بە بیـانووی دەسـتێکەڵکردنی هێـزە کوردییەکـان لەگەڵ ئێـران و چاوسـاغیکردن بۆیـان، ئەو هێـزە زەبەلاحە بە وێـنەی ئەژدیهـایەکی برینـدار خـۆی

سووڕاند و کەوتە داپڵۆسین و بەکارهێنانی پیسترین چەکی قەدەغەکراو و کۆتایی بە بزووتنەوەی چەکدارانە لە کوردستاندا هێنا و کارەساتێکی گەورەی مرۆییشی، لە کۆمەڵکوژی و ئەنفال بەسەر خەڵکی ستەمدیدەی کوردستاندا هێنا.

بەو جۆرە حکوومەتی بەعس لەلایەکەوە پشتی بەرەی بۆ خۆی زامن کرد و توانی ئەو هێزەی کە بە شەڕی کوردستانەوە خەریک بوو، لە شەڕ لە دژی ئێران بەکاری بەرێت و لەلایەکی دیکەوە دەستی ئێران لە کوردستاندا کورت بکاتەوە.

هەرچی بە بزووتنەوەی چەپ و کۆمۆنیستی نێو شارەکانی کوردستانیش دەگەڕێتەوە، ئەوا لە خراپترین بارودۆخ و زەمینەدا خەریکی چەکەرە و سەرهەڵدان و خۆڕێکخستن و خۆ جیاکردنەوە بوو لە بزووتنەوەی چەپی ناسیۆنالیستی کوردستان. چونکە ئەو دەمە بەهۆی جەنگ و فەزای میلیتارییەوە، شیرازەی کۆمەڵگای عێراق لەبەر یەک هەڵوەشابووەوە. ژمارەیەکی زۆری کارگا و کارخانەکان پەکیان کەوتبوو، کرێکاران لە شەڕ و لە بەرەکانی جەنگدا بوون، بەو هۆیەوە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و تەنانەت خێزانییەکانیش سست و لاواز بوون. ژمارەیەکی زۆریش لە سەربازی هەڵاتبوون کە لەلایەکەوە لە کار و کردەی بەرهەمهێنان دوور کەوتبوونەوە، لەلایەکی دیکەش ئاوارە و پەرپوەی شوێنان ببوون و تۆڕی پەیوەندییەکانیان لێک پسابوون.

دۆخی شەڕ، فەزای زەبروزەنگ و سەرکوتی دەیان قات زیاد کردبوو. ناڕەزایەتی و مانگرتن و بزووتنەوەی داخوازییەکان ئەگەر پێشووتر لاواز بووبن، ئەوا دەیان جار لاوازتر بوون. ماڵانگەڕان و بازگەی سەرجادە و نێوخیابان و نێوان شار و ناوچەکان و گرتن و ئیعدامی نێومەیدان و گۆڕەپانەکان پیشەی هەمیشەیی و ڕۆژانەی ئەو ڕژێمە هارە بوو.

بزووتنەوەی چەپ و کۆمۆنیستی ڕێک لەو زەمین و زەمانەدا کەوتبووە خۆی، هەر بۆیە ئەو بزووتنەوەیە لاواز و بچووک بوو، پێکهاتەکەی بریتی بوو، لە کۆمەڵێک گەنجی خوێندکار یان خوێندکارانی فەسڵکراو و سەربازانی هەڵاتوو. ئەم توێژانە هیچ جێگا و ڕێگایەکیان لە بەرهەمهێناندا داگیر نەکردبوو، بەهۆی ماهییەتی

چینایەتییـــان و بەهـــۆی ئەو بـــارودۆخەوە کە خســـتمانە ڕوو، لە کرێکـــاران و زەحمەتکێشان تەریک و دابڕاو بوون.

هەر بـــۆیە لە دەیەی هەشـــتاکاندا، لەنێـــو ئەو هەلـــومەرجە نالەبـــارەدا، ئەو بـــزووتنەوەیە کاتێـــک ســـەری هەڵـــدا، بە لاوازی و دوور لە کرێکـــار و دوور لە نـارەزایەتیی کرێکـاری و جەمـاوەری بە وێنەی چەنـد گرووپێکـی پـێ لەهەوا پەیـدا بـوون و هەر ڕۆژە خۆیـان هەڵدەوەشـاندەوە و بە هەمـان کەرەسـتە گرووپێکـی دیکەیـان دروست دەکردەوە. هەر ئەم پاشـخانە بـوو وای کـرد، ئەگەرچـی لە کـاتی ڕاپەڕینـی خەڵکـی کوردسـتان دەستپێشـکەر بـوون و دواتـریش بەهـۆی ئەو نارەزایەتییانەی ئەوان کە ڕێکیان خست، حکوومەتی بەعس دامودەستگاکانی خۆی لە کوردسـتان کشـاندەوە، وەلـێ بەرهەمـی کارەکەیـان بچێتە گیرفـانی حیزبگەلـی ڕیشـەداری کـوردایەتی و نەتـوانن چنـگ لە دەسـەڵات، یـان چمکێکـی گیـر بـکەن و کۆمەڵگا بە قازانجی چینە مەحروومەکان وەرچەرخێنن.

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا لێی دوام، سەرەنجام زانکۆی سلێمانی بەهۆی بارودۆخێکەوە کە زانکۆ و شاری سلێمانی تێدا بوو، بۆ شـاری هەولێر گوێزرایەوە. ماڵئاواییمـان لە شـاری سـلێمانی و زانکـۆکەی کـرد و سـاڵی خوێنـدنی (١٩٨١-١٩٨٢) یەکەمین ساڵی خوێندنمان بوو لە زانکۆی سەلاحەدین لە شاری هەولێر.

ئێمە خوێنـدکارانی زانکـۆ ئەو ڕاگوێزانەمـان زۆر لەبەر گـران بـوو، پێمـان وابـوو حکوومەتی بەعس بەوە سزامان دەدات، بۆیە هەموو تووڕە و پەست بووین.

حکـوومەتی بەعـس پێـی وا بـوو بەو ڕاگـوێزانە لە زانکـۆ بـێخەم دەبێـت و بەو هەنگـاوە زانکـۆ دەسـتەمۆ دەکـات. وەلـێ دوای شـەش حەوت مانگێـک و لە یـادی بۆردوومـانی شـاری قەڵادزێـدا و هەر لەو شـارەوە چەخمـاخەی خۆپیشـاندانی جەمـاوەری لـێ درا و پاشـان سـلێمانی و ناوچەکـانی تریشـی گـرتەوە. هەر زوو پریشکی ئەو خۆپیشاندانە گەییشتە زانکۆی سەلاحەدین و دەسەڵاتدارانی تووشـی شـۆک کـرد. مـن لە باسـەکانی پێشـوودا بەدرێژی باسـی ئەو ڕووداوەم کـردووە و لێـرەدا نـاچمەوە سـەری. ئەو سـاڵانە ئـێمە وەکـوو ڕێکخسـتنەکانی کـۆمەڵەی ڕەنجدەران و یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان لە چالاکی و هەڵسووڕانێکی گەرم و

گــوڕ و پــڕ لە شۆڕشــەوقدا بــووین. نیــوەی یەکەمــی ســاڵی ١٩٨٢ دەورانــی هەستانەوەی ڕێکخستنەکانمان بوو. ڕێکخراوی کەرکووکی کۆمەڵە و ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی یەکێتیـی خوێنـدکارانی کوردسـتانمان ڕۆنـایەوە. لەدوای ئەوە و بـۆ مـاوەی دووسـاڵ ڕێکخسـتنێکی گەورەمـان پێکەوە نـا و هەڵسـووڕانێکی فراوانمـان دەست پێ کرد. سەرباری ئەوانەش تووشی هیچ قەڵبە و چورتمێک نەهاتین.

شەڕی نێوان عێراق و ئێران هەر وا گرمەی دێت، هیچ ئاسۆیەک بۆ کۆتاییهاتنی بەدی ناکرێــت. ســـاڵی خوێنـــدنی (١٩٨٣-١٩٨٤)ە و چەنـــد مانگێکمـــان بـــۆ تاقیکردنەوەکانی کۆتـایی ئەو ساڵە مـاوە. "یەکێتیی نیشتمانیی کوردسـتان"یش چەند مـــانگێکە شـــەڕی ڕاگرتـــووە و دانووســـتانی لەتەک حکـــوومەتی بەعســـدا هەیە. حکوومەتی بەعس بڕیارێکی دەرکرد کە دەبێت خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین لە پشووی هاوینەیاندا ببنە جەیشی شەعبی و مەشقی سەربازییان پێ بکرێت.

بەعسـی و ئەمنەکـانی زانکـۆ دەسـتیان دایە کۆبـوونەوە بە خوێنـدکاران و باسـی ئەو بڕیارەیـان کـرد، وەلـێ خوێنـدکاران ملیـان نەدا و قبووڵیـان نەبـوو. بەعسییەکان دەسـتیان کـردە هەڕەشـە و چاوسـوورکردنەوە و پڕکـردنەوەی فـۆرم و هۆکـاری نەکردنـی جەیشـی شـەعبی و پاشـان واژۆکردنـی. لـێ ئەو ڕێکـارانە خـڕ، ناکـام کەوتنەوە و خوێندکاران لەسەر قەول و قەراری خۆیان هەر سوور بوون.

فەزای خوێندن بەتەواوی تێک چوو، پەستی و تووڕەیی خوێندکاران شـەپۆلی ئەدا، خوێنـدکاران بەکەمـی دەچـوونە کلاسـەکانی دەرسـەوە. خوێنـدکارانی کـۆلیجە جیاوازەکـان هـاتوچۆی یەکترییـان دەکـرد، پـۆل پـۆل لە دەوری یەکتـری کۆمەڵەیـان دەکـرد، ڕا و نەزەری خۆیـان دەگـۆڕییەوە و موناقەشـەی ئەو بابەتەیـان دەکـرد. ئەنـدامانی یەکێتیـی قوتابییـانی بەعـس و مامۆسـتایانی بەعسـی و ئەمنـی زانکـۆ ماخۆلانیان تێ کەوتبوو، هەر چاوێکیان کردبوو بە چوار و ڕق و قینیان لێ دەباری و نەیانـدەزانی دۆخەکە بە کوێ دەگـات و هیچـی لـێ حـاڵی نەدەبـوون. خوێندکاران ئامادە نەبوون مل بەو بڕیارە بدەن، وەلێ نەشیان دەزانی چی بکەن و هـیچ ڕێگـا و ڕێبازێکیان لەبەردەمدا ڕۆشن نەبوو و نەیاندەزانی چۆن هەنگاو هەڵبهێننەوە.

ئەو دەمە من لە قۆناغی سێیەمی زانکۆدا بووم، هەر وەکوو پێشووتریش باسـم کـرد، لە یەکێتیـی خوێنـدکارانی کوردسـتان بەرپرسـی لقـی هەولێـر و زانکـۆی

سەلاحەدین و ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی بووم. وەلیٚ ئەم ڕێکخراوە سەر بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە و "یەکێتی"یش چەند مانگێکە سەرگەرمی مفاوەزاتە. ئێمە وەکوو ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکاران لەلایەکەوە ڕامان لەسەر ئەو مفاوەزاتە نەبوو و لەلایەکی دیکەوە وەکوو سیاسەتی ئەو دەمەی یەکێتیی نیشتمانی نەک هەر نەدەبوو خوێندکاران بۆ مانگرتن هان بدەین، بەڵکە دەبوو هانی خوێندکارانمان بدایە مل بەو داوایەی ڕژێم بدەن و لە دژی نەوەستنەوە. ئەمەش لەگەڵ بڕوا و تێڕوانینی ئێمەدا بەهیچ کلۆجێک نەدەهاتەوە.

بۆیە وەکوو یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان نەمانتوانی هیچ هەڵوێستێک بنوێنین، نە بە پشتگیری، نە بە وەستانەوە لە دژی. وەلیٚ وەکوو خۆمان، دانە بەدانەی ئەندامانمان نەک هەر دژی ئەو بڕیارەی بەعس و هەڵوێستی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بووین، بەڵکوو هەڵسووڕاوی زۆر چالاک و پێشەنگی ئەو مانگرتنەش بووین.

کەواتە ئێمە وەکوو "یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان" دەستوپێمان بەسترابووەوە و هیچمان پیٚ نەدەکرا. هەر بۆیە ئێمە کۆمەڵە هاوڕێیەک لە دەرەوەی پەیوەندیی ڕێکخراوەیی، هەر زۆر زوو و بەپەلە لە دەوری یەکتری خڕ بووینەوە و بڕیارمان دا، بۆ ڕابەرایەتیکردن و ئاراستەکردنی ئەو نارەزایەتییە لیژنەیەک دابمەزرێنین.

ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارەکەی، ئەو کۆمەڵە هاوڕێیە یەکەمین کۆبوونەوەی خۆمان لە بەشی ناوخۆیی لە ژووری خۆشناو و عەزەدین ئەنجام دا. ئەو هاوڕێیانەی لە کۆبوونەوەی دامەزراندندا بەشدارییان کرد، بریتی بوون لە: جەزا ڕەزا لە کۆلێجی ئەندازیاری، خۆشناو جەمال جەلال لە کۆلێجی پەروەردە، سالار ڕەشید لە کۆلێجی زانستەکان، عەزەدین مەجید محەمەد لە کۆلێجی پەروەردە.

لەم کۆبوونەوەیەدا باسی ئەوەمان کرد، دەبێت هەوڵی ئەوە بدەین خوێندکاران لەسەر ڕەتکردنەوەی ئەو داوایەی حکوومەت پێداگر، بەردەوام، یەکهەڵوێست و یەکگرتوو بن. ئەو دەمە عەزەدین مەجید بەرپرسی لقی کەرکووک و ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان بوو. خۆشناو جەمال ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و پەیوەندی بە "عەزەدین"ەوە هەبوو.

هەروەهـا ئـێمە لە دەرەوەی کـاری ڕێکخسـتنیش کـۆڕ و کـۆمەڵێکی سیاسیشـمان هەبوو. ئەو چەند هاوڕێیە (خۆشناو، عەزەدین، سالار) و چەند هـاوڕێیەکی دیکەش (جەزا ڕەزا، زانا جەلال، سەردار عەبدوڵا، هیوا ئیسماعیل) بە شێوەیەکی دەوری لە ژوورەکەی خۆشناو و عەزەدین کۆ دەبووینەوە و دیراسـەی ئەدەبیاتی مارکسیمان دەکـرد و موناقەشـەی پرسـەکانی ڕۆژ و لەنێویانـدا کێشـەکانی نێـو کـۆمەڵەی ڕەنجـدەرانمان دەکـرد و گەلێـک مەسـەلەی ئەو ڕێکخراوەمـان خسـتبووە ژێـر پرسـیارەوە. لە ڕۆژی یەکەمـی مـانگرتنەکەدا خوێنـدکارانی کـۆلێجی ئـاداب لە چێشـتخانەی کـۆلێج نانیـان نەخـوارد و مانیـان گـرت. ئەو ڕۆژە خـواردن سـەرف نەبـوو، مـایەوە و خەسـار بـوو. لە ڕۆژی دووەمـدا ئـێمە خوێنـدکارانی کـۆلێجی زانستەکان بە هەمـان دەسـتوور لە چێشـتخانەی کۆلێج نانمـان نەخـوارد و مانمـان گرت. لێرەش خـواردن سـەرف نەبـوو، مـایەوە و خەسـار بـوو. بەو شـێوەیە چەنـد ڕۆژێـک فەزای نێـو کۆلێجەکـان بەتەواوی تێـک چووبـوو. گشـت ڕۆژێـک بـۆ کـۆلێج دەچووین، وەلێ ناچووینە کلاسـەکانی دەرسەوە، یان زۆر بەکەمی.

زانکـۆ لەوە دەرچووبـوو، ماڵێـک بێـت بـۆ زانسـت و زانیـاری، زانکـۆ کرابـووە سەربازگە و دائیرەی ئەمن و مامۆستایانی بەعسی ببوونە جەلادی خوێندکاران.

زانکـۆ بـۆ ئـێمەی خوێنـدکارانیش ببـووە مەیـدانی ململانێی سیاسـی و گۆڕەپـانی خەبـات و خـۆڕاگری. ئـاخر مەسـەلەکە لەوە دەرچووبـوو کە سـێ مـانگی هـاوین مەشقی سـەربازی بکەین! ئەوەی بیری لێ نەدەکرایەوە، ئەو گۆشـەیەی مەسـەلەکە بـوو. کێشـەی بنەڕەتیی ئـێمەی خوێنـدکاران لەگەڵ حکـوومەتی بەعسـدا، ململانـێ و زۆرانبـازیی نێـوان دوو هێـز بـوو: هێزێـک گەرەکـی بـوو ئیـرادە لە هێـزەکەی تـر وەربگرێتەوە و دەستەمۆی بکات، هێزەکەی دیکەش پێی لە عەرز چەقاندبوو، ڕازی نەبوو بێئیرادە و دەستەمۆ بکرێت.

ئێمە وەکوو ئەو لیژنەیەی پێکمـان هێنـابوو، کەوتینە هەڵسـووڕانێکی بێسـرەوت. سـەرمان بە هەمـوو کـۆڕ و کۆمەڵێکدا دەکـرد و تەواوی پەیوەنـدییە کـۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕێکخراوەییەکانی خۆمانمان لە خزمەتی ئەو مانگرتنەدا بەگەڕ خستبوو.

دوای نـــزیکەی هەفـــتەیەک لە ململانـــێ و کێشـــمەکێش، لە کۆبـــوونەوەیەکی لیژنەکەمانـدا هـاتینە سـەر ئەو ڕایەی کە دەبێـت مـانگرتنی نێـو زانکـۆ ئـاڵوگۆڕی

بەسەردا بهێنین و ڕێوشوێن و شێوازێکی دیکە بۆ درێژەدان بە مانگرتن و نارەزایەتی بگرینە بەر ئەویش:

چۆڵکردنی زانکۆ و گەڕانەوەیە بۆ شارەکانی خۆمان.

دوای ئەوە کەوتینە پڕۆپاگەندەکردن بۆ ئەو تەرح و بڕیارە و بە زانکۆدا بڵاومان کردنەوە. تەرحەکە لەلایەن خوێندکارانەوە پەسەند کرا و شوێنی خۆی گرت. بۆ ڕۆژی دوایی و سەرلە بەیانییەکەی خوێندکاران بەلێشاو جانتاکانیان بەکۆڵیاندا دا و بەرەو نەقلخانە ڕۆییشتن و بۆ شارەکانی خۆیان گەڕانەوە.

دوای ئەوەی زانکۆ چۆڵ کرا و خوێندکاران بۆ شارەکانی خۆیان گەڕانەوە، قۆناغێکی دیکە لە مانگرتن و ململانێ دەستی پێ کرد.

ئەو دەمە ئێمەش وەکوو لیژنەی مانگرتنەکە، کۆبوونەوەیەکمان لە شاری سلێمانی لە ماڵی شێخ ئەورەحمان (مێردی پووری جەزا) بەست و لەوێدا بڕیارمان دا ئاراییشێکی نوێ بە لیژنەکەمان بدەینەوە و لیژنەی فەرعیی شارەکان دابمەزرێنین. لەو کۆبوونەوەیەدا "ئەکرەمی میهرداد"یش بۆ لیژنەی ناوخۆی خوێندکاران ئیزافە کرا و بەشداری کۆبوونەوەکەی کرد، وەلێ هەر ئەو جارە بوو، ئیدی نەهاتەوە.

دوای ئەوە لیژنەی سلێمانی و هەولێر و کەرکووکمان دامەزراند و کۆمەڵێک هاوڕێمان بۆ کۆمیتەکە ئیزافە کرد، کە بە بیرەوەریی من ئەم هاوڕێیانە بوون، لە شاری کەرکووک: تەحسین نامیق عەبدوڵا، خالید محەمەد فاتیح (سەمیر نووری)، غازی عەبدول نەریمان، نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد. لە شاری هەولێر: مەحموود ئەسعەد پەری، نەوزاد عەلی ئەحمەد، هەژار تاها کاوانی ...

ئەوەی شایانی گوتنە، لیژنەکەمان تۆڕێکی فراوان و گەورەی لە هەڵسووڕاوان پێک هێنابوو کە هێندێکیان زۆر چالاکانە خەریکی کار و فەعالییەت بوون. حامید عەبدوڵا ڕەزا یەکێک بوو لەو هەڵسووڕاوانەی کە چەندین ساڵ بوو ئێمە پێکەوە لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک کارمان دەکرد و پەیوەندییەکی فراوانی کۆمەڵایەتیی هەبوو، لەنێو دەوروبەرەکەیدا خۆشەویست و بەئۆتۆریتە بوو.

دوای ئەوە بە شێوەیەکی دەوری کۆ دەبووینەوە و زۆربەی کۆبوونەوەکانمان لە ماڵی عەزەدین مەجید، لە شاری کەرکووک لە گەڕەکی حورییە بوو. لە یەکێک لەو کۆبوونەوانەدا قسەمان لەسەر پێویستی دەرکردنی بەیاننامە کرد. هەر بۆیە بە

پێویستمان زانی ناوێک لە لیژنەکەمان بنێین. ئیدی لەسەر پێشنیاری من ناومان لێ نا: لیژنەی ناوخۆی خوێندکاران (ل.ن.خ.). ئەم ناوەش بەو مەبەستە بوو کە بڵێین: ئەم لیژنەیە، لیژنەی ناوخۆی خوێندکارانە، سەربەخۆیە و سەر بە هیچ حیزب و ڕێکخراوێک نییە کە بەڕاستیش هەر وا بوو.

لە ماوەی ئەو چەند مانگەی مانگرتنەکەدا شەش بەیاننامەمان دەرکرد، پێنج لەوانەمان بڵاو کردەوە و شەشەمیان پێویستی نەکرد، چونکە ئیتر بە کرانەوەی دەوامی خوێندنی ساڵی نوێی خوێندن، مانگرتنەکەش بە تەبیعەتی خۆی کۆتایی پێ هات. شێوازی دەرکردنی بەیاننامەکان بەو جۆرە بوون، هەر کەسە ئەیتوانی کلێشەیەک ئامادە بکات و لە کۆبوونەوەی لیژنەکەدا بیخوێنێتەوە، موناقەشەی لەسەر دەکرا و بڕیاری لەسەر ئەدرا. کلێشەی ئەو شەش بەیانەی کە دەرمان کردن، چوار دانەیان لە نووسینی من و دوو دانەیان لە نووسینی خالید محەمەد فاتح بوون. بەیاننامەکانمان هەر بە دەست و لەسەر کاغەزی ستێنسڵ دەنووسینەوە و پاشان بە ڕۆنیۆی سەرەتایی ڕامان دەکێشان و تەکسیرمان دەکردن.

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا قسەم لەسەری کردووە، ڕۆنیۆی سەرەتایی من شارەزای بووم، هەر کاتێک بەیانێکمان هەبووایە، بەشی خۆمانم لە کەرکووک لێی ڕادەکێشا و هاوڕێیانی شارەکانی هەولێر و سلێمانیش سەروو دانەیان لەگەڵ خۆیان دەبرد و یارمەتیمان دەدان کە چۆن بۆخۆیان بینووسنەوە و تەکسیری بکەن. چونکە تەکسیرکردنی بەیاننامەکان لە کەرکووک و گواستنەوەی بۆ شارەکانی تر، لەباری ئەمنییەوە پڕ مەترسی بوو.

دوای ئەوەی بەیاننامەکانمان تەکسیر دەکرد، هەر ١٠ دانەمان دەدایە یەکێک لە هەڵسووڕاوان و ئەوانیش هەر ئەو ڕۆژە و هەر بەدەستی دەیاندانە خوێندکاران و بڵاویان دەکردنەوە.ناوەخنی بەیاننامەکان بریتی بوو لە باسکردنی بارودۆخەکە و ئەو خواستانەی کە خوێندکاران دەبێت پێیان لەسەر دابگرن.

ئیدی هەر کاتێک خوێندکاران بەهۆی تەبلیغاتی تەسلیمخوازانەی یەکێتیی نیشتمانییەوە تووشی ساردی و ڕاڕایی بهاتبانایە، ئەوا ئەو بەیاننامانە و تەبلیغی زارەکیی خۆمان دووبارە لە پەرتبوون و شکان دەیپاراستن.

بەیاننامەکان بە جۆرێک کاریگەر بوون کە یەکێتیی نیشتمانی لە ڕادیۆکەیەوە هێرش بکاتە سەریان و بڵێت، هەر یەکێک هەڵدەستێت پنە و تیرۆکێک بەدەستەوە دەگرێت و بەیاننامەیەک دەردەکات.

مانگرتنی خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین کاریگەری گەورەی لەسەر خوێندکارانی کوردی زانکۆی مووسڵ و بەغدا و پەیمانگای کەرکووک و بەشێک لە ئامادەییەکانی شارەکانی کوردستان و تەواوی کۆمەڵگای کوردستان دانا. چونکە ئەم زانکۆیە، زانکۆ تاقانەکەی کوردستان بوو، سەکۆی بەرگری و مەکۆی بزووتنەوەی چەپ بوو، ژمارەی خوێندکارانی مانگرتوو تیایدا ئێجگار زۆر بوو کە بە ٤٠٠٠ خوێندکار دەخەمڵێندرا.

خوێندکارانی کوردی زانکۆی مووسڵ بۆ پشتیوانی لە مانگرتنەکەی ئێمە، دەستیان دایە مانگرتن و بۆ ئەم کارەیان لیژنەی خۆیان پێک هێنا و دەستیان دایە پرۆپاگەندە لەنێو خوێندکاراندا. پاشان نوێنەری خۆیان بۆ گفتوگۆ لەگەڵ پارێزگاری مووسڵ و بەرپرسی ئەمنی ئەو شارە و سەرۆکایەتیی زانکۆ دەستنیشان کرد و کەوتنە کێشمەکێش و بەربەرەکانییەکی زۆر جەسوورانە.

مانگرتنی خوێندکارانی زانکۆی مووسڵ کاتێک دەستی پێ کرد، دەوری ١٠ ڕۆژێکی بۆ تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ مابوو. خوێندکاران بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ لەنێو زانکۆدا مانیان گرت، پاشان ئەوانیش بڕیاریان دا زانکۆ چۆڵ بکەن و بۆ شارەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. دوای ئەوە بۆ پشتیوانی لە نارەزایەتیی خوێندکاران، بۆ ماوەی ٤-٥ ڕۆژێک لە شاری سلێمانی خۆپیشاندانی جەماوەری بەڕێوە چوو. لەو ماوەیەدا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کۆمەڵێک خوێندکاری ڕازی کردبوو، بۆ دەوام بگەڕێنەوە و لە ڕادیۆکەیشییەوە بڵاوی کردەوە: با خوێندکاران بۆ دەوامی خوێندن بگەڕێنەوە و کێشەکەیان چارەسەر بووا هەر لە ڕادیۆوە هاواریان دەکرد: بگەڕێنەوە بۆ نێوزانکۆ، بەرد لە شوێن خۆی سەنگینە.

ئیتر لە ماوەی دوو ڕۆژدا خوێندکارانی زانکۆی مووسڵ گەڕانەوە. بەو شێوەیە مانگرتنەکەی ئەوان نزیکەی ١٠ ڕۆژێکی خایاند.

ئەوانەی کە مـانەوە، کۆمەڵێک خوێنـدکاری چەپ و کۆمۆنیسـت بـوون، ئەوانـیش دوای ئەوەی نەیـانتوانی بەر بە چـوونەوەی خوێنـدکاران بگـرن، دوای ئەوەی چەنـد تاقیکردنەوەیەکیشیان لەکیس چوو، گەڕانەوە.[227]

بۆ پشتیوانی لە مـانگرتنەکەی ئێمە، بەشێک لە خوێندکارانی پەیمانگای تەکنیکیی کەرکووک لە ڕێکەوتی ١٩٨٤/٥/١٢دەستیان دایە مانگرتن و بەکۆمەڵ لەنێو بـاخچەی پەیمانگـاکە کۆبـوونەوە و داوایـان کردبـوو کە واز لە خوێنـدکارانی زانکـۆی سـەلاحەدین بهێنـرێ و بەزۆر مەشـقی جەیشـی شـەعبییان پـێ نەکـرێ. ڕاگـری پەیمانگـاکەش دەسـتگا ئەمنییەکـان ئاگـادار دەکـاتەوە و سـەرەنجام پارێزگـاری کەرکـووک دێت و هێزێکی زۆری ئەمـن و ئیسـتیخبارات و قوات خاسـەش ئەرژێنە نێو پەیمانگاکەوە. بۆ ڕۆژی دوای ئەوە ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکاران دەیانەوێت بەردەوامـی بە مـانگرتنەکە بـدەن، بەڵام بە هـۆی ئەوەی دەسـتگا ئەمنییەکـان بە هێزێکـی زۆرەوە تەواوی پەیمانگـاکە کـۆنترۆڵ دەکەن، مـانگرتنەکە ناکرێـت و خوێندکاران بڵاوەی لێ دەکەن.[228]

بۆ هەمـان مەبەسـت و بـۆ پشـتیوانی لە مـانگرتنەکەی ئێمە، ئامادەیی سـەورە لە شـاری کەرکـووک لە ڕێکەوتـی ١٩٨٤/٥/١٣ دەسـتیان دایە مـانگرتن. سـەرەنجام لەوێش دەستگا ئەمنییەکـان ئاگادار دەکرێنەوە. دەسـتگا ئەمنییەکـان دێن و تەوقـی خوێنـدکارانی مـانگرتوو دەکەن و پاشـان ژمارەیەکیـان لـێ دەگـرن و ڕاپێچـی ئەمنـی کەرامەیـان دەکەن. دوای ئـازار و ئەشـکەنجەیەکی زۆری چەنـد ڕۆژێ، گیراوەکـان ئـازاد دەکرێن، وەلـێ لەو نێوەدا و بەهـۆی ئەشـکەنجەوە، نەجـات سـلێمان ڕەحمـان گیانی دەبەخشێت.

نەجـات، کۆمۆنیسـتێکی هۆشـیار و کەسـایەتییەکی خۆشەویسـت و بە ئۆتـۆریتەی نێو خەڵکی بوو، چەنـد سـاڵێک ئەنـدامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردسـتان بـووە و پاشـان بەهـۆی جیـاوازی فکـرییەوە لەگەڵ کۆمەڵێـک لە هاوڕێکـانی واز دەهێنـێ و پاشـان لەنێـو کـۆڕ و کـۆمەڵی کۆمۆنیسـتیدا درێـژە بە کـار و هەڵسـووڕانی خـۆی دەدات.

---

٢٢٧. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ڕەحمان داود سلێمان، یەکێک لە ڕابەرانی مانگرتنی خوێندکارانی زانکۆی مووسڵ.
٢٢٨. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز فاتمە ئەحمەد محەمەد، یەکێک لە خوێندکارە مانگرتووەکان.

هەر لە درێــژەی مــانگرتنی خوێنــدکارانی زانکــۆی ســەلاحەدین، چەنــدین خۆپیشاندان لە شاری سلێمانی بەڕێ خران. ڕۆژی ١٩٨٤/٥/١٢ لەبەردەمی پارێزگا دەبێــتە خۆپیشــاندان، تەقە لە خۆپیشــاندەران دەکرێــت و ٣ خوێنــدکار دەکــوژرێن.[٢٢٩] ڕۆژی دوای ئەوە خۆپیشــاندانێکی زۆر گەورە و بەهێزتــر لەبەردەم بارەگای شەهید عوسمان فایەق دەست پێ دەکاتەوە. سەرەنجام خۆپیشاندەران دەست بەسەر بارەگاکەدا دەگرن و چەندین پیاوی بەعس لە سەرەوەی بیناکە فڕێدەدەنە خوارەوە. ئەوەی شایانی گوتنە، کاریگەریی مانگرتنی خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین بە چەشنێک بوو، خوێندکارانی کوردی زانکۆکانی بەغداشی گرتەوە و ئەوانیش پشتیوانییان لەو مانگرتنە کرد.

بەو شێوەیە مانگرتنی زانکۆی سەلاحەدین لەو دەورانەدا، بووە دەستپێکی مانگرتن و خۆپیشاندانی گەورەی جەماوەری لە کوردستاندا و فەزای کۆمەڵگای خستە ژێر سایەی خۆیەوە.

سەرەنجام لەو ململانێیەدا حکوومەت شکستی خوارد و نەیتوانی سیاسەتی خۆی بەسەر خوێندکاراندا بسەپێنێ.

مانگرتنی خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین و پشتیوانیی باقیی زانکۆ و پەیمانگا و ئامادەییەکانی کوردستان، بە گەورەترین مانگرتنی خوێندکاران لە مێژووی بزووتنەوەی خوێندکاری لە کوردستان دێتە ژماردن.

"لیژنەی ناوخۆی خوێندکاران" کە دەستەیەک خەباتگێڕی چەپ و کۆمۆنیست بوون، هەر لە سەرەتاوە ڕابەرایەتیی ئەو مانگرتنەی کرد و لە تەواوی قۆناغەکاندا ئاراستەی کرد و دەستی لێ بەر نەدا، هەتا بە سەرکەوتنی گەیاند.

لەدوای ئەوە ئیدارەی زانکۆ لە بەرامبەر مانگرتن و دەوامنەکردنی ئێمە، ڕێکاری یاسایی گرتە بەر و ئەو ساڵەی بە ڕاسب بۆ حیساب کردین. لەو نێوەدا ئەو خوێندکارانەی کە ساڵی دووەمیان بوو لەو قۆناغەدا فەسڵ کران و لە زانکۆ وەدەر نران. ئەو ساڵە من لە قۆناغی سێیەمی خوێندنی زانکۆ دووەم ساڵم بوو، بۆیە بەو بڕیارە لە زانکۆ فەسڵ کرام.

---

٢٢٩. خولانەوە لەناو بازنەدا، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپ و بلاوکردنەوەی مەلبەندی ئاوەدانیی کوردستان، ساڵی ١٩٩٩، ل ٢٣.

## کۆبوونەوەی ئاوەژێ لەگەڵ نەوشیروان مستەفا

کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە لە تەمووزی ساڵی ١٩٨٤دا بەسترا. یەک دوو مانگێک بەر لەوە، قەرار وا بوو ئەندامانی ڕێکخراوی شارەکان لەگەڵ نەوشیروان مستەفا کۆ ببینەوە کە بارەگاکەی لە گوندی ئاوەژێ لە بەری مەرگە بوو.

ئەو کاتە من هیچ بڕوایەکم بە کۆمەڵە نەمابوو، لەلای خۆمەوە بڕیاری وازهێنانم دابوو، وەلی پێم باش بوو بەشداریی کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە بکەم و لە نزیکەوە ئاگام لە ڕووداو، کێشمەکێش، هەڵوێست و بەرخوردەکانی نێویدا هەبێت.

ئەو دەمە من بە هۆی مانگرتنی زانکۆوە بۆ کەرکووک گەڕابوومەوە و دەوامی زانکۆم نەدەکرد. ئەو ڕۆژانە ئەنوەر مەلا حەمەمین ئیشێکی کاشی گرتبوو، منیش لەگەڵ ئەودا ئیشم دەکرد. هەر وەکوو پێشتریش باسم کردووە، ئەنوەر خوێندکاری کۆلێجی کشتوکاڵ بوو، ئەویش لە خوێندکارە مانگرتووەکان بوو، خەڵکی شۆڕیجەی کەرکووک بوو، لە شاڵاوی گرتنەکان بۆسەر کۆمیتەی ئاگر ئەویش دەستگیر کرا، حوکم درا و پاشان بە لێبووردنی گشتی ئازاد کرا. چەند ساڵێک بەر لە ئێستا بۆ بەئەنجامگەیاندنی نەشتەرگەرییەک بۆ بڕبڕەی پشتی بۆ هیندستان دەچێت، لەژێر نەشتەرگەری دەرناچێت و گیانی سپارد.

ئەو ڕۆژەی بۆ ئێوارەکەی قەرارە بۆ سلێمانی و پاشان بۆ ئاوەژێ بچین، من لەگەڵ ئەنوەر لە کار بووم. دوای ئەوەی ئەو ڕۆژە لە کار تەواو بووم، بۆ ماڵەوە گەڕامەوە و خۆم شۆری و نانم خوارد و جلە کوردییەکەم لەبەر کرد و یەکسەر بۆ ماڵی مامۆستا قادر ڕۆییشتم.

دوای تاوێک دانیشتن لە ماڵی مامۆستا، لە دەرگا درا، مامۆستا ڕۆییشتە دەرەوە و گەڕایەوە بۆ لای من و وتی: ئەوە هاوڕێیانی هەولێر گەییشتن، با بڕۆین!

لەگەڵ مامۆستا چووینە دەرەوە، هاوڕێیانی ڕێکخراوی هەولێر لە بەردەرگا بوون، ژمارەیان سێ کەس بوو، کەسیانم پێشتر نەدیبوو، دوو ئۆتۆمبیلی جۆری بەرازیلیی سوور و سپیی نوێیان پێ بوو.

ئەوانیش بریتی بوون لە: بەهرۆز محەمەد ساڵح قەشقەیی (شوان)،[٢٣٠] عەبدولڕەزاق (عەبدولا محەمەد مەلا عومەر)،[٢٣١] کۆسرەت (عەبدولا ڕەسوول عەلی).[٢٣٢]

---

٢٣٠. لە تەقینەوەیەکدا لە ڕێکەوتی ٢٠٠٤/٢/١ لە بەردەم مەڵبەندی سێی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە شاری هەولێر گیانی لە دەست دا.

ئەو دەمە ئێمە لە ڕێکخراوی کەرکووک سێ کەس بووین: مامۆستا قادر، تەحسین نامیق عەبدوڵا و من، وەلێ لەبیرم نییە بۆچی تەحسین لەو سەفەرە لەگەڵماندا نەبوو.

مامۆستا قادر و من لەگەڵ ئەو سێ ئەندامەی ڕێکخراوی هەولێر بەرەو شاری سلێمانی بەڕێ کەوتین. گەییشتینە سلێمانی و بەدوای یانەی ئەندازیاراندا گەڕاین کە قەرار بوو لەوێ لەگەڵ ئەندامانی ڕێکخراوی سلێمانی بە یەکتری بگەین. کاتێک گەییشتینە ئەوێ، عومەر فەتاح[٢٣٣] چاوەڕێمان بوو.

ئەو شەش کەسە، ئەندامانی ڕێکخراوی شارەکانی سلێمانی، کەرکووک و هەولێر لەو یانەیەدا پێکەوە دانیشتین و دەست بە قسە کرا و داوای خواردنەوە کرا. مامۆستا بە هۆکاری بڕوای ئاینی و منیش لەبەر ئەوەی لەگەڵ چێژی مندا وێک نەدەهاتەوە، نەمانخواردەوە.

دوای ئەوە چووین بەدوای دلێر ئەحمەد شوکری (سەلیم سەرسپی)، کەماڵیان نزیکی سجن بوو. پاشان هەموومان پێکەوە بۆ ماڵی عومەر فەتاح ڕۆییشتین و ئەو شەوە لەوێ ماینەوە. بۆ بەیانییەکەی هەر هەموو بۆ ئاوەژێ بەڕێ کەوتین.

گەییشتینە ئاوەژێ و بارەگای نەوشیروان مستەفا. نەوشیروان هەر خۆی بە تەنها لەوێ بوو، حەمە توفیق ڕەحیمیش لەوێ بوو، وەلێ ئەو خەریکی پاکردنەوەی کارێزێک بوو کە هەر بە تەنیشت ژوورەکەی نەوشیروانەوە بوو. هەر لەو کاتەدا ئەویش بە لەشی قوڕاوییەوە هاتە دەرەوە، هەموو کردیانە گاڵتە و پێکەنین و وتیان: بە لەشی قوڕاوییەوە بینیتمان، بۆ هەڵبژاردنی کۆنفرانس باشە!

---

٢٣١. عەبدولڕەزاق، ناوی ڕاستیی باوکی، ئەحمەد بوو، وەلێ بەهۆی ئەوەی لەلای مامی (مەلا محەمەد) گەورە بووە، بە ناوی ئەوەوە ناسنامەی بۆ دەرهێنراوە.
عەبدولڕەزاق، یەکێک بوو لە کادرە سەرەتاییەکان و لە ڕابەرانی نێوشاری کۆمەڵە، لە کاتی ڕاپەڕینیساڵی ١٩٩١دا بەرپرسی شانە چەکدارەکانی برووسک بوو، لە ١٩٩١/٣/٢٨ لە کاتی هێرشی ڕژێم بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕین و گرتنەوەی شارەکان، بە هۆی تۆپبارانەوە لە باجوان (کەرکووک) گیانی لە دەست دا.

٢٣٢. ئەو دەمە کۆسرەت ڕەسوول عەلی بەرپرسی ڕێکخراوی هەولێر بوو، لە کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵەدا خۆی هەڵبژارد و بووە ئەندامی سەرکردایەتی و لە ڕێکەوتی ١٩٨٤/٩/١٥ چووە دەرەوە و بووە بەرپرسی مەڵبەندی چواری بالیسان.

٢٣٣. عومەر فەتاح حوسێن و دلێر ئەحمەد شوکری هەردووکیان لە کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە خۆیان هەڵبژارد و بە ئەندامی یەدەکی سەرکردایەتی هەڵبژێردران.

لەگەڵ نەوشیروان دانیشتین و دەست بە قسە کرا. بابەتی قسەکان هیچ پەیوەندی بە کۆنفرانس و چۆنیەتی خۆئامادەکردن بۆ کۆنفرانس، وە یان بابەتێکی فکری، سیاسی و ڕێکخراوەیی نەبوو. زیاتر بە سەردانی و میوانی و چاوپێکەوتن دەچوو، وەک لەوەی ئێمە، سەرکردایەتیی ڕێکخستنەکانی ناوشاری کۆمەڵە لەگەڵ سکرتێری ئەو ڕێکخراوە بۆ خۆئامادەکردن بۆ کۆنفرانس کۆ دەبینەوە.

یەکێک لەو بابەتانە، باسی نەخشەی بڕینی بانقێکیان کرد کە چۆن سەرکەوتوو نەبووە. بابەتەکە لە ناوقەدەوە باس دەکرا نەک لە نووکەوە، بۆیە من نەمدەزانی بەتەواوی باسی چی دەکەن! بەڵام دیار بوو هێندێک لەوان، پێشووتر زانیارییان لەسەری هەبوو و ئاگادار بوون. ئیدی نازانم ئەو باسە چی بوو، هی کەی بوو؟! چونکە ئەو دەمە هێشتا یەکێتیی نیشتمانی لەنێو گەرمەی مفاوەزاتدا بوو.

باسێکی دیکە کە کۆسرەت ورووژاندی، باسی ئاڵای شۆڕش و بەدیاریکراویش باسی ئازاد هەورامی کرد. هەر وەکوو لە بابەتەکانی پێشوودا باسم کردووە، کۆسرەت ڕووی لە نەوشیروان کرد و بە جۆرێک باسی ئازادی کرد، وەکوو ئەوەی ئەویش یەکێک بێت لە لایەنگرانی ئاڵای شۆڕش. وەلێ نەوشیروان لە وەڵامدا بە شێوازێک قسەی لەسەر کرد کە ئازاد لەگەڵ ئەواندا نییە و جێگای گومان و مەترسی نییە.

کۆبوونەوەکەمان تەواو کرد، بەڵام هیچ باسێکی تێدا نەبوو سەبارەت بە کۆنفرانس! ئەو کۆبوونەوەیە بۆچی ڕێک خرابوو؟ نازانم!

دوای ئەوە ماڵئاواییمان لە نەوشیروان کرد و پاشان هەر لەوێ منیش ماڵئاواییم لە مامۆستا قادر و کۆسرەت و ئەوانی دیکە کرد و پێیانم گوت: من تاخیر ئەبم، هاوڕێیەکم لەم ناوەیە ئەمەوێ بیبینم، بۆیە ئێوە بڕۆن، دواتر من خۆم ئەگەڕێمەوە.

دوای ئەوە ڕۆییشتم، هاوڕێکەی خۆمم دۆزییەوە، ئەویش ئیبراهیم ئەحمەد خدر (بلە ماو، سەرکەوت) بوو.

دوای ئەوەی تاوێکی باش لەگەڵ ئیبراهیم پێکەوە گفتوگۆمان کرد و پێکەوە چووین بە تفەنگەکەی ئەو هەندێک نیشانمان شکاند، ماڵئاواییم لێ کرد و گەڕامەوە. ئەوە دوادیداری ئیبراهیم و من بوو.

# کۆنفرانسی سێیەمی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان

یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان لە ڕێکەوتی ٢٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٤ کۆنفرانسی سێیەمی خۆی لە قوتابخانەی سەرەتایی گوندی خەتێ بەست. ئەم کۆنفرانسە سێ ڕۆژی خایاند و بەشداربووان بریتی بوون لەم ئەندامانە:

مووسڵ: عیسام نامیق عەبدوڵا (دکتۆر عیسام).

هەولێر: سالار ڕەشید، هەژار تاها ئەحمەد (کاوانی).

کەرکووک: ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد (سمکۆ شوانی)، عەزەدین مەجید محەمەد (کرێکار، جەمال ئەیووب)، فازڵ عوسمان فەقێ عەزیز (فازڵ چاوشین، باپیر)، وەحدەدین مەجید محەمەد.

سلێمانی: ئەحمەد مەحموود محەمەد (ڕەئووف، مامۆستا ئەحمەد)، جەزای ئەحمەد کوردە، ئاسۆی برای شەهید عوسمان شەیدا، دوو ئەندامی دیکە، ناوەکانیان نەزانراوە.لەگەڵ نوێنەرانی یەکێتیی خوێندکاران لە شاخ کە ئەم ئەندامانە بوون: ئەبووزێد سەمەد شەریف (سامان)، ڕەحمان حەمید محەمەد (ڕەحمان جۆلا)، عیدۆ شەکر قاسم (شوان).نوورەدین عومەر شەریف (سەردار) کە ئامۆزای ئەبووزێد بوو، پێشمەرگەی پارێزگاریی کۆنفرانس بوو. کاتێک کە ئێمە وەکوو ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکاران بڕیاری ئەوەمان دا کۆنفرانسی سێیەم ببەستین، نزیکەی دوو ساڵێک بەسەر کۆنفرانسی دووەمدا تێپەڕیبوو. ئەو کاتەی کۆنفرانسی دووەممان بەست، یەکێتیی خوێندکاران بە هۆی ئاشکرابوونی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی پێشوویەوە، تووشی هەڵوەشاندنەوە و پەرتەوازەیی هاتبوو، بۆیە ئەو کۆنفرانسە، کۆنفرانسی بنیاتنانەوەی ئەو ڕێکخراوە بوو.

هەرچی کۆنفرانسی سێیەمە، لە هەلومەرجێکی تەواو جیاوازدا بوو، چونکە ئەمجارەیان، دوای ئەوەی ئێمە ئەو ڕێکخراوەمان هێنایەوە سەرپێ و پاشان گەشەمان پێ دا، گەرەکمان بوو وازی لێ بهێنین.

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا دەرئەکەوێت، نە ئێمە و نە یەکێتی هیچمان وەکوو خۆمان نەمابووینەوە. ئێمە لە ڕووی دنیابینی و تێڕوانینمانەوە هەمان مرۆڤگەلی پێشوو نەبووین و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بە دیاریکراویش کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانیش هەمان ئەو ڕێکخراوەی پێشین نەبوو.

کەواتە، ئـێمە وەکـوو سـەرکردایەتیی ئەو ڕێکخـراوە، لەلایەکەوە بڕوامـان بە ڕێکخراوەکەی خۆمان نەماوە و بە نیازی وازهێنانی بەکۆمەڵین، لەو لاشـەوە ئەبێ کۆنفرانسێکیش ببەستین و هەر خۆشمان ئامادەکاری بۆ بکەین. ئاخر بەڕاستی ئەو دۆخەی ئێمەی تێدا بـووین دەگمەنە! کەسـانێک بێن ئامادەکـاری بـۆ کۆنفرانسـێک بکەن، ڕاپۆرتی کاری دووساڵەی بۆ بنووسنەوە، لایەنی باش و خراپ و لاواز و بەهێزی دەربخەن، دەستکاری بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی بکەن ... وەلێ خۆشیان بڕوایان پێی نەبێت و گەرەکیان بێت دەست لە کار بکێشنەوە!

وەلێ هـیچ چـارێکی دیکە نییە، تەنهـا هەر ئەوە ڕێگـای ئوسـووڵییە، کـۆنفرانس ببەستین و لەوێدا خۆمان هەڵنەبژێرینەوە، کۆمەڵێک کەسی دیکە خۆیان هەڵبژێرن و ئەنجوومەنیان ڕادەست بکەین. پێش کۆنفرانسەکە عەزەدین و عیسام و مـن چووینە ناو چەمەکەی گوندی خەتێ و خەریکی موناقەشـەکردن و دەسـتکاریکردنی بەرنـامە و پەیڕەوی ناوخۆی یەکێتیی خوێندکاران بووین. عەزەدیـن و مـن هاودیـدی یەکتـری بـووین، هەرچـی عیسـام بـوو، ئەگەرچـی ئەویـش بـڕوای بە یەکێتی نەمـابوو، وە بە نیـازی وازهێنـان بـوو، سـەرەنجام وازیشـی هێنـا، بەڵام ئەو وا دەرئەکەوت، بـڕوای بەهـیچ شـتێک نەمابێت.لەنێو چەمەکەدا عەزەدیـن و مـن بە دانیشـتنەوە، عیسـام هەر بەپێوە و بە دیارمانەوە، خاڵ بەخاڵ و بڕگە بەبڕگە بە بەرنامە و پەیڕەوی نـاوخۆدا چووینەوە، عەزەدین و مـن دەمانویسـت ئەو خـاڵانەی تێدا جێگیر بکەیـن کە خۆمـان بڕوامان پێیان هەبوون و لەژێر کاریگەریی مارکسـیزمی شـۆڕشـگێڕدا بـوون. لەگەڵ عەزەدین لە زۆربەی تەرحەکاندا هاوڕا بووین، وەلێ عیسـام کە جگەرەی بە جگەرە دادەگیرساند، یەک دوو هەنگاو بۆ پێشـەوە و یەک دوو هەنگـاو بـۆ دواوە دەجـوولا، دەخاڵەتێکی کەمی دەکرد، یان هێچی نەئەوت، هێندێک جاریش لەو هەموو موناقەشـە و شیکارییەی ئێمە بێزار ئەبوو و تەنها بۆ ئەوەی لە کۆڵی خـۆی بکاتەوە دەیگوت، خۆتـان چـی دەنووسـن بنووسـن! مـن مـوافیقم، وازم لـێ بهێنن بـا جگەرەکەی خـۆم دابگیرسێنم، هێندێک جاریش پێئەکەنی و فشەی پێ ئەهات.

عیسـام لە لێکدانەوەی هەر شـتێکدا ئیسـانێکی مەنتیقی بـوو، ئەو بە عـاتیفە کـاری نەدەکـرد و دوای هەڵا نەدەکەوت، شـتی بێبنەمـای قبـووڵ نەدەکـرد، ئەگەر شـتێکی نامەنتیقیـان لەگەڵ بـاس بکـردایە، بزەیەکـی بـۆ دەکـرد و جەدەلـی لەگەڵـدا دەکـرد. هەروەها عیسام ڕێکەوتی ڕووداوەکانی لەبیر نەدەچوو، هەر کاتێک باسـی شتێکمان

بکردایه و له ڕێکەوتەکەی دڵنیا نەبووینایە، ئەو یەکسەر دەیگوت: لە فڵانە ڕۆژ و مانگ و ساڵ بوو! نوێنەرانی یەکێتیی خوێندکاران شوێنی کۆنفرانس و تەختی دانیشتن و ڕووپۆش و خواردن و پاسەوانی ... هەموو پێویستییەکی دیکەی کۆنفرانسیان ساز و ئامادە کردبوو. کۆنفرانس دەستی پێ کرد، سەرەتا عیسام وەکوو سکرتێر ڕاپۆرتی خۆی خوێندەوە، پاشان ڕاپۆرتی لقەکان لەلایەن بەرپرسەکانیان خوێندرایەوە و موناقەشە کران. باسی مفاوەزات بەدرێژی کرا و ئێمە ڕامان لەسەری نەبوو، بۆیە ڕەخنەی توندمان لێی گرت و لە دژی وەستاینەوە.

کۆنفرانس بەو شێوەیە سێ ڕۆژی خایاند و لە ڕۆژی سێیەم و لە دوا بڕگەی خۆیدا ئەنجوومەنی سەرکردایەتی هەڵبژێردرا، ئێمە ئەندامانی ئەنجوومەنی کۆن هیچمان خۆمان هەڵنەبژاردەوە.

هەر وەکوو باسم کرد، نوورەدین پاسەوانی و پارێزگاری کۆنفرانسەکەی دەکرد، وەلێ خۆشمان لەدوای ئەوەی دانیشتنی هەر ڕۆژێک تەواو دەبوو، بە تایبەتی لە شەواندا، بە نۆرە پاسەوانیمان دەکرد. لەو نێوانەدا شەوێک بەر من کەوت.

دوای ئەوەی کۆنفرانس کۆتایی هات، ئیسراحەتمان کرد و هەستمان بە ئارامی کرد، چونکە کۆمەڵە کەسێک هاتنە پێشەوە و سەرکردایەتیمان ڕادەستیان کرد.

پاشان ئەنجوومەنی تازە هەڵبژێردرا و لە یەکەمین کۆبوونەوەی خۆیان لە شاری سلێمانی، "ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد" وەکوو سکرتێر هەڵدەبژێرن.

دوای ئەوە لە ڕادیۆی یەکێتییەوە هەواڵی کۆنفرانسەکە بڵاو کرایەوە: یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان سێیەمین کۆنفرانسی خۆی سەرکەوتووانە کۆتایی پێ هێنا!

لەپاش ئەمانە و دوای ئەوەی گەڕاینەوە، ئەبوو نامەی فەرمی خۆمان بنووسین و بۆ سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی بنێرین. ئەو هاوڕێیانە نووسینەوەی ئەو نامەیەیان خستە ئەستۆی من، منیش نامەیەکم لە ١٧ لاپەڕەی خورشیدیدا نووسییەوە کە ڕەخنەیەکی هەمە لایەنەی فراوان بوو، لە دید و بۆچوون و سیاسەتی یەکێتی، پاش ئەوەی ئەوانیش پەسەندیان کرد، بۆ سەرکردایەتیمان ڕەوان کرد. پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوەش بکەم، ئێمە وەکوو سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان لە ماوەی دوو ساڵی کارکردنمان بە یەکەوە، پەیوەندییەکی زۆر خۆش و هاوڕێیانەمان لە نێواندا هەبوو، کارەکانیشمان زۆر بە باشی دەچوونە ڕێوە و تووشی هیچ زیان و زەبرێک نەهاتین.

# کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە و دوابزمار

لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٨٤دا سێیەمین کۆنفرانسی کۆمەڵە لە هەواری کانیی سێو لە بناری چیای پیرەمەگروون بەسترا. ٢٣ مانگ بەسەر کۆنفرانسی دووەمدا تێپەڕیبوو. لەم کۆنفرانسەدا ٢٨٧ نوێنەر و ١١ ئەندامی چاودێر بەشدار بوون.[٢٣٤]

کۆنفرانسی سێ ئەخیر کۆنفرانسی کۆمەڵە بوو، سێ ڕۆژی خایاند.

ئەو دەمەی ئەم کۆنفرانسە بەسترا، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هێشتا لە بێنەوبەردەی وەفد و وەفدکاری مفاوەزاتدا بوو. بارەگاکانی یەکێتی بە بارەگای "مام جەلال"یشەوە، ماوەیەک بوو لە سووررداش بوون.

لە سەرەتادا و هەتا چەندین کۆبوونەوەش یەکێتی دڵی بە مفاوەزات زۆر خۆش بوو. سەدام حوسێن بە مام جەلالی گوتبوو: شتێکت ئەدەمێ، لەنێو میللەتەکەدا سەربەرز بیت. مام جەلالیش خەوی بەوەوە دەبینی، وەکوو مەلا مستەفا ئۆتۆنۆمییەکی وەکوو ئەوەی ساڵی ١٩٧٠ لەسەر دەستی ئەمیش بەدەست بێت.

جارێکیان دکتۆر موحسین (موحسین ئیبراهیم حەسەن)م بینی کە ئەندامی ڕێکخراوی هەلێر بوو، وتی: ئەمڕۆ کاک فەرەیدوون عەبدولقادرم لە نەخۆشخانەی کۆماریی هەولێر بینی، تازە لە بەغدا گەڕابووەوە و بۆ ماوەیەکی کورت لەوێ لای دا، پرسیاری دۆخی مفاوەزاتم لێی کرد، لە وەڵامدا گوتی: هەموو شتێک بە دڵی خۆمانە.

وەلێ ئەو دەمەی کۆنفرانسی تێدا گیرا، ماوەی چەند مانگێک بوو ساردی و دڕدۆنگی کەوتبووە نێوانەوە. حکوومەت بۆ ئەوەی یەکێتی سووک بکات و لەبەرچاوی جەماوەرەکەی بخات، دەستی دابووە زەخت و زۆر و گوشار خستنە سەر خەڵکی. تەنانەت نەوشیروان مستەفا بۆ خۆی دان بەو ڕاستییەدا دەنێت و دەڵێت: "دۆخی ئاڵۆزی کوردستان و ساردیی نێوان یەکێتی و بەعس بە درێژایی مانگەکانی مایس، حوزەیران، تەمووز بەردەوام بوو. ڕۆژی ٢٠ی تەمووز سەعدی

---

٢٣٤. خولانەوە لەناو بازنەدا، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپ و بلاوکردنەوەی مەڵبەندی ئاوەدانیی کوردستان، ساڵی ١٩٩٩، ل ٦٩.

مەهدی سالّح هاتە سووررداش و داوای کرد، گفتوگۆ دەست پێ بکەنەوە و ئەوان ئامادەن بۆ پێشوازی وەفدی یەکێتی.[٢٣٥]

حکوومەتی بەعس لە شاری سلێمانی، شارێک کە بە ناوەند و مەڵبەندی نفووزی یەکێتـی دەناسـرێتەوە، ١٦ سـەربازی هەلاّتـووی گولەبـاران کـرد و لەولاشـەوە بەکرێگیراوانی کوردی بۆ کوشتنی کادر و فەرماندە سەربازییەکانی یەکێتی لەنێو شار و ڕێگەوبانەکاندا دەستئاوەلاّ کردبوو. هەروەها حکوومەت گوشاری بۆ خەڵک و بۆ خوێندکاران دەهێنا، تا بەزۆر بیان کاتە جەیشی شەعبی.

ئەم بارودۆخە یەکێتی خستبووە نێو گێژاوێک و تووشی شەرمەزاری کردبوو. گولەبـارانکردنی سـەربازانی هەلاّتـوو، یەکێتـی گەلێـک سـووک کـرد. مـانگرتنی خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین و پشتیوانیی خوێندکارانی دیکە، ئەوەندەی تر. ئاخر یەکێتی بە خوێندکارانی دەگوت: مفاوەزاتمـان لێ تێک مەدەن، بڕۆن جەیشی شـەعبی بکەن! فەرەیـدوون عەبـدولقادر بە خوێنـدکارانی گوتبـوو، کێشـەی ئێوە بە چارەسەرکردنی کێشەی کوردەوە پەیوەستە. نەوشیروان مستەفاش لە وتارێکدا کە ئەو دەمە لە ڕادیۆی یەکێتی بلاّو کرایەوە، دەیگوت: تـاقە ڕێگەی چارەسـەرکردنی کێشـەی خوێنـدکارانی کوردسـتان بەوە ئەبـێ کە کێشـەی کـورد لە عێراقـدا بە شێوەیەکی هەمە لایەنە چارەسەر بکرێت.[٢٣٦] واتە، ئێستا ئێوە مان مەگرن و جەیشی شەعبی بکەن، هەتا کێشەی کورد چارەسەر دەبێت! "فوئاد مەعسووم"یش، وتبووی، قەیدی چییە، ئێمەش کاتی خۆی بووینەتە کەشافە، لەجیاتی ئەوەی بڵێن، عاشەل بەعس، بڵێن: عاشەل شەعب!

فەرەیـدوون عەبـدولقادر و ئـازاد هەورامـی لە کـاتی خۆپیشـاندانی خەڵـک و خوێندکاران لە شـاری سلێمانی، بە بڵندگۆ داوایان لە خەڵکی کردبوو، خۆپیشـاندان نەکەن! نەوشیروان مستەفا لە وەلاّمی پرسیاری خەڵک: ئەگەر مفاوەزات سـەربگرێ، کێشـەی فیـرار چـی بەسـەر دێـت؟ وتبـووی: فیـرار سـەری بە قـوزی دایکی، ئەبێ بچێتەوە عەسـکەری بکـات! مـام جەلال لە گفتوگـۆیەکی لەگەڵ پەیـامنێری ڕادیـۆی

---

٢٣٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٧١.

٢٣٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٩.

مۆنتیکارلۆ و هەفتەنامەی ئەلتەلیعەل عەرەبییە (الطليعة العربية)دا گوتبووی: "صدام هو الحكم وليس الخصم"، ئەمەش یانی: سەدام نەیار و تەرەف نییە، بەڵکوو حەکەمە!

لە کەرکووک لە دواناوەندیی سەورە، خوێندکار نەجات سلێمان ڕەحمان بەهۆی مانگرتنەوە دەگیرێت و پاشان شەهید دەکرێت. کاتێک، کەسوکارەکەی بۆ سۆراخی ئەو، پەنا بۆ لیژنەی تەنسیقی کەرکووک دەبەن، عەلی حوسێن حەسەن (شوان) لێیان تووڕە دەبێت و پێیان دەڵێت: ئەوانە ئاژاوەگێڕن، ئێستا کەی کاتی مانگرتنە![٢٣٧]

ئەو هەنگاوانەی حکوومەت نای، هەمووی بۆ ئەوە بوو، یەکێتی سووک بکات و ماناکەشی ئەوە بوو، حکوومەت هیچ منەتێکی بە یەکێتی و مفاوەزاتەکەی نییە.

هەرچی یەکێتی بوو، کەوتبووە بەرامبەر خەڵک و بەو پێشمەرگانەشیان دەگوت گێرەشێوێن کە تێکەڵ بە خۆپیشاندانەکان دەبوون و سۆزیان بۆ خەڵک و داوا ڕەواکانی هەبوو.

خاڵێکی دیکەی زۆر گرنگ ڕێک لەو دەورانەدا، بڵاوبوونەوە و کاریگەریی دید و بۆچوونەکانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بەسەر کۆمەڵەی عێراق، ئالای شۆڕش، گرووپ و هەڵسووڕاوانی چەپی کوردستانی عێراق بوو، کە بووە مایەی ئەوەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە ڕووی فکرەوە هەڵبتەکێنێ. دیارە من لە باسەکانی پێشوودا بەوردی قامکم لەسەر ئەو خاڵە داناوە.

ئەمانە گشت وایان کرد، نەک هەر خەڵک و هەوادارانی یەکێتی ئومێدیکیان بە یەکێتی نەمێنێ، بەڵکە ژمارەیەکی ئێجگار زۆریش لە ئەندامان و کادران، بەو هۆیانە و بەهۆی دەرکەوتنی زیاتری ماهییەتی دژی خەڵکیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لەو ساڵەدا واز لە یەکێتی و کۆمەڵە دەهێنن.

سەرباری ئەو بارودۆخەی لە کوردستان و لە دەورانی مفاوەزاتی نێوان یەکێتی و حکوومەتدا هەبوون، کۆمەڵە لەنێو خۆیشیدا، ناکۆکیی نێوان باڵەکانی گەییشتبووە ئاستی تەقینەوە و لێکترازان و پێکدادان.

---

٢٣٧. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز فاتمە ئەحمەد محەمەد.

باڵی گرووهی زیندان، باڵی لایەنگرانی خەتی ئارام کە دواتر بە ئاڵای شۆڕش ناویان دەرکرد، باڵی نەوشیروان مستەفا ئەمین.

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا ڕوونمان کردووەتەوە، باڵی زیندان کە فەرەیدوون عەبدولقادر نوێنەرایەتی دەکرد، خۆیان بە خاوەنی ئەسڵی کۆمەڵە دەزانی و داکۆکییان لە ماویزم دەکرد.

باڵی لایەنگرانی ئارام، ڕەخنەیان لە باڵی زیندان دەگرت کە کاتی خۆی کوردستانیان بەجێ هێشتووە و هەڵاتوون. لە ڕووی فکریشەوە، داوای گەڕانەوە بۆ مارکسیزم-لینینیزمیان دەکرد و ماویزمیان تەنها وەکوو ئەزموونێک چاو لێ دەکرد.

باڵی نەوشیروان مستەفا ئەمین، نەوشیروان نوێنەرایەتی دەکرد و مام جەلال پشتیوان و نەخشەدارێژەری بوو. ئەم باڵە پێیان وابوو، مارکسیزم-لینینیزم بە کەڵکی ئەوە نەماوە، بۆ ڕزگارکردنی نەتەوە و نیشتمان بەکار بهێنرێ و لەگەڵ تواندنەوەی کۆمەڵە و دامەزراندنی حیزبێکی پانوپۆڕی جەماوەریدا بوو.

دیارە نەوشیروان مستەفا لەدوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٧ بۆ کوردستان دەگەڕێتەوە و دەیکەنە نوێنەری کۆمەڵە لەنێو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا، هەر ئەو دەمە ڕاشکاوانە بە ڕابەرایەتیی ئەو کاتەی کۆمەڵەی گوتبوو، ئەو بڕوای بە کۆمۆنیزم نییە،[٢٣٨] بەڵام ئەو ڕاستییە لەلای ئێمە، ئەندامان و کادرانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە شاراوە و پەنهان بوو و ڕۆژێک لە ڕۆژان نەوشیروان ئەو بڕوایەی خۆی بۆ ڕێکخستن بەیان نەکرد، بەنهێنی هێشتییەوە و تەمسیلی کرد و بە موزەوەری ئیشی کرد.

مەلا بەختیار و هاوەڵانی کە ئەو دەمە لە ڕابەرایەتیی کۆمەڵەدا بوون، لە کاتی توندبوونەوەی ناکۆکییان لەگەڵ هەردووک باڵەکەی تر، هەر شتێکی ئەوان کە بەلای خۆیانەوە مایەی ڕەخنە و تانە بوون، هەر لە مەسەلەی فکرییەوە هەتا بە هەڵسوکەوتی شەخسیی ئەوان دەگات، بڵاویان دەکردەوە و تەرویجیان پێ دەدا، وەلێ چاویان لە ڕاست ئەو خاڵە گرنگ و جەوهەرییە نووقاندووە کە نەوشیروان مستەفا بڕوای بە کۆمۆنیزم نییە! لە کاتێکدا بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵە بێت،

---

٢٣٨. لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، نەوشیروان مستەفا ئەمین، ساڵی ١٩٩٧، ل ١٧٢.

نەوشیروان بۆی نەبووە تەنانەت ئەندامێکی ئاسایی کۆمەڵەش بێت، تا بگات بەوەی لە نووکی هەرەمەکەدا بێت.

بەڵام نەوشیروان سەرەنجام خۆی لە کۆنفرانسی سێیەم و لە بەردەم تەواوی ئەندامانی کۆنفرانسدا حەی عەلە سەلا وتی: کۆمۆنیزم گەڕ و گول، سووک و سەلیم بووە!

ناکۆکیی توند لە نێوان باڵی ئارام لەلایەک و دوو باڵەکەی تر لەلایەکی تردا بوو. هەرچی دوو باڵەکەی دیکە بوو، ناکۆکییەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نەبوو کە شایانی گوتن بێت، وە لەڕاستیدا هێندێک جار ئەندامان و کادرانیان لێک جوودا نەدەکرانەوە و وەکوو باڵێک دەردەکەوتن. مام جەلال کە کاراکتەری پشتی پەردەی باڵی نەوشیروان مستەفا بوو، دەمسپیی باڵی گرووهی زیندانیش بوو.

باڵی گرووهی زیندان بە هۆی ئەوەی لە داکۆکیکردن لە فکری ماوی و لە سەربەخۆیی کۆمەڵە لەنێو یەکێتیی نیشتمانیدا نەک هەر شێلگیر نەبوون، بەڵکوو تەنانەت ڕێگری بەردەم پرۆژەی تواندنەوەی کۆمەڵە لەنێو یەکێتیشدا نەبوون، لە باڵی نەوشیروانەوە تەواو نزیک بوون و نەبووبوونە مایەی هیچ ئاستەنگییەک لە هەمبەر نەخشە و نیازەکانیدا.

بەو جۆرە باڵی نەوشیروان لە کۆمەڵەدا باڵا دەست بوو، وە کۆمەڵە بەپێی نەخشە و پلانی ئەو بەڕێوە دەچوو، باڵی گرووهی زیندانیش هاوکار و یاریدەدەری بوو. واتە، ئەو دووباڵە لە بەرانبەر باڵی ئارامدا یەکیان گرتبوو و هێزی باڵادەست بوون.

باڵی ئارام کە سالار عەزیز و مەلا بەختیار لە سەرەتادا و دوایی مەلا بەختیار نوێنەرایەتییان دەکرد، لەچاو دووباڵەکەی تر هێز و دەسەلاتیان کەمتر بوو. وەلێ ئەم باڵە (باڵی ئارام)ش لەڕاستیدا بۆخۆی هێز بوو، کاریگەر بوو، ئەگەر بەدروستی یار و نەیاری خۆی دەستنیشان بکردایە، ئامادەسازی بۆ هەموو ئەگەر و پێشهاتەکانی بەردەمی خۆی بکردایە، بەدروستی ئیدارەی ئەو ململانێیەی بکردایە، وە یان لانی کەم: مەلا بەختیار بە مام جەلال خۆشخەیاڵ نەبووایە، دەبووە هێزێکی

گەورە و کاریگەر لە کوردستاندا و یەکێتیی نیشتمانییش هەر وا سووک و ئاسان نەیدەتوانی توخنی بکەوێت و پشتی لە زەوی بدات.

لەم کۆنفرانسەدا باڵی باڵادەستی نێو کۆمەڵە نەخشەی بۆ ئەوە کێشابوو، باڵی ئارام وەکوو کێشەیەک ئیتر کۆتایی پێ بهێنێ. یانی وای لێ بکات لە جومگە گرنگ و هەستیارەکانی نێو ڕێکخستن و هێزی پێشمەرگەی یەکێتی هەڵی بکەنێ و بەتەواوەتی بیخاتە کەنارەوە.

ماوەیەک پێش کۆنفرانس من خەریکی ئامادەکاری بووم، بۆ دیاریکردنی نوێنەرانی ڕێکخراوی کەرکووک. کۆمەڵێک پرسیاری فکری–سیاسیم ئامادە کرد و بۆ ئەندامانم نارد، تاوەکوو وەڵامی بدەنەوە. ئەوسا ئێمەش وەڵامەکانمان دەکردە یەکێک لە پێوەرەکانی دیاریکردنی نوێنەران.

من ئەوەم لە یاد نەماوە، لە ڕێکخراوی کەرکووک بۆمان هەبوو بە چەند ئەندام بەشداری بکەین، بەڵام سەرەنجام بەشداری ئێمە بەم شێوەیە بوو:

کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن، پێنج نوێنەر، کە بریتی بوون لە: ئازاد عەبدولڕەحمان ئیبراهیم (بریار)، ئیبراهیم نوورەدین نەسرەت، تەحسین نامیق عەبدوڵا، فەتاح ڕەزا محەمەد (فەتاح کوێخا ڕەزا)، محەمەد خەیروڵا ئەمین.

کەرتی شەهید سەڵاحی موهەندیس، سێ نوێنەر، کە بریتی بوون لە: ڕەئووف عەبدولڕەزاق ساڵح (مامۆستا ڕەئووف)، شێرزاد حوسێن محەمەد (مامۆستا شێرزاد جەباری)، قادر عومەر ساڵح (مامۆستا قادر مەلا عومەر).

لە کەرتی شەهید سیروان، پێنج نوێنەر، کە بریتی بوون لە: سالار ڕەشید، سەردار سابیر سۆفی، سەڵاح حەسەن عەبدولکەریم (سەڵاح حەسەن پاڵەوان)، عەزەدین مەجید محەمەد (کرێکار)، کەریم حەمید ڕەسوول (بەختیار).

عەزەدین و من پێکەوە بە ئۆتۆمبیلی خەت بۆ سووورداش چووین. لەوێ لە جێگایەک کە بۆ بەڕێوەبردنی کۆنفرانس دانرابوو خۆمان ناساند. ئەوانیش زانیاریی پێویستیان لێمان وەرگرت و ڕووپۆشیان پێمان دا و لەسەرمان هەڵکێشا. پاش ئەوەی بووینە چەند کەسێک، ئۆتۆمبیلیان بۆمان ئامادە کرد و هەر بەنێو هێز و

بازگەی حکوومەتدا تێپەڕیین، هەتا گەیشتینە شوێنی کۆنفرانسەکە لە مێرگەپان. لەوێ چادرێکیان بۆ حەوانەوە و خەو پێمان دا.

لە کردنەوەی کۆنفرانسەکەدا مام جەلال، نوێنەری یەکێتیی شۆڕشگێڕان، عەبدولڕەحمانی قاسملۆ نوێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ئیبراهیمی عەلیزادە نوێنەری سازمانی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران ئامادە بوون و هەر یەکە وتاری خۆی خوێندەوە.[٢٣٩] بێجگە لە تاڵەبانی باقیی نوێنەرەکان بەگوێرەی نەریتی باوی کۆنفرانس لەدوای خوێندنەوەی وتارەکانیان کۆنفرانسیان بەجێ هێشت.

دێتەوە بیرم، مەلا بەختیار وتی: خۆزگە عومەری ئێلخانیزادە بە نوێنەرایەتیی سازمانی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران دەهات.

من ئەو ڕۆژانەی کۆنفرانس گەلێک بێتاقەت و ناڕەحەت بووم. لەلایەکەوە بڕیاری وازهێنانم لە کۆمەڵە دابوو، کۆمەڵەیەک جوانترین مۆمی ڕۆژەکانی تەمەنم بۆی سووتاند، هێز و توانستێکی لە ئەندازە بەدەرم بۆی خەرج کرد، گەورەترین ڕیسکم لەپێناویدا کرد، زیندەگی و چارەنووسم بە هۆی ئەوەوە کەوتە بارێکی ئێجگار خراپەوە. لەلایەکی دیکەوە، پەیوەندی و نزیکایەتییەکم لەگەڵ باڵی ئارامدا هەیە، وەلێ خۆم بەوان نازانم و هیوایەکی ئەوتۆم پێیان نییە.

کەشوهەوای نێو ساباتی کۆنفرانسیش گەلێک ناهاوڕێیانە و دوژمنکارانە بوو، زیاتر بە ژووری تەحقیق و دادگای تەفتیش و سەربازی دەکرد.

سەرباری ئەمانە و بۆ نەگبەتی من، چێشتی کۆنفرانسیشم پێ نەدەکەوت، بە هۆی خواردنی گۆشتی چەوری بزنەوە، تووشی سکچوونێکی خراپ هاتبووم. حەمە جەزا (گۆرانیبێژ) لەوێ بوو، سەرپەرشتیاری تیمی چێشتلێنەرەکان بوو. هەروەها هاوڕێیەکی گەڕەکیشم بینی، ناوی عومەر عەلی (عومەرە ڕەش) بوو، هەر لەنێو ئەو تیمەدا بوو، وەلێ من بە ڕووپۆشەوە بووم، ئەو منی نەناسییەوە.

---

٢٣٩. خولانەوە لەناو بازنەدا، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپ و بلاوکردنەوەی مەڵبەندی ئاوەدانیی کوردستان، سالی ١٩٩٩، ل ٧٠.

ئـێ! هەرچەنـدم کـرد و کۆشـام، یەک دانە حەبـم دەسـت نەکەوت! ئەو هەمـوو خەڵکە لەوێ کۆ بکەیتەوە، تیمێکی بچکۆلەی پزیشکی بۆ دانەنێیت و یەک دانە حەبی سـکچوونت دەسـت نەکەوێت! بە تەمـای ئەوەش بـووین، کۆمەڵگا بەڕێـوە بەریـن! پرسیاری ماستیشم کرد،

بۆ ئەوەی لەگەڵ گەلاچا تێکەڵی بکەم و بیخۆم کە بۆ سکچوون گەلێک باشـە و یەکاویەکە، هەر دەستم نەکەوت! بۆیە زۆر جار لە گەرمەی قسەوباسـەکاندا، دەبوو بەپەلە بچمە دەرەوە و ساباتەکە بەجێ بهێڵم.

قسەوباسـەکانی کـۆنفرانس لە ڕێـڕەوی خـۆی لای دا و لە باسـی بەرنـامە و نەخشەکارەوە بۆ کۆمەڵێک باسی دیکە و هێرش بۆسـەر یەکتری وەرچەرخا، تا بە هەڕەشە و لێدان و چوونە دەرەوە گەییشت.

فەرەیدوون عەبدولقادر باسی نووسراوەی "هەڵوێست"ی هێنایە گۆڕ.

"هەڵوێسـت"، لێکـۆڵینەوەیەکی فکـری-سیاسـی بـوو، هەر بە ڕۆنیـۆ و لە شـێوەی مەلـزەمەیەک ڕاکێشـرابوو، ئەم نووسـراوە نـاوی نووسـەرەکەی بەسـەرەوە نەبـوو، وەلێ لە نووسینی مەلا بەختیار بوو، هەمووش هەر گومانیان لەو بوو.

هەر وەکوو لە باسـەکانی پێشـوودا باسـم کـردووە، سـەفەرێکیان بـۆ کۆبـوونەوە لەگەڵ مام جەلال بۆ سووورداش چووم، "مەلا بەختیار"یشم لە ماڵەکەی خۆی بینی و دانەیەک لەو نووسراوەی پێ دام.

پوختەی باسـەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیە ئەوە بوو، کوردستان دوای ئەوەی دابەش کرا و بە وڵاتەکـانی دەوروپشـتییەوە لکێنـدرا، هەر پـارچەیەک بـارودۆخێکی تـایبەت بەخۆی بۆ هاتووەتە پێش و وەلامدانەوەی کێشـەکانی بەند و گرێدراوی کێشـەکانی ئەو وڵاتەیە کە ئەم ئێستا لەنێو چوارچێوەی ئەودایە. چارەسـەرکردنی ئەو کێشـەیە لە دیـدی ڕێکخراوێکـی مارکسیسـتی وەکـوو کـۆمەڵە بەوە دەبێـت، لەگەڵ ڕێکخـراوە مارکسـییەکانی دیـکەی عێـراق خەبـات بـۆ ڕووخانـدنی ڕژێمـی بەعـس بکـات و دەسـەڵاتێکی دیمـوکراتیی شۆڕشـگێڕ بهێنێـتە سـەر کـار کە مـافی دیـاریکردنی چارەنووس بۆ میللەتی کورد دەستەبەر بکات.

ئەم لێکدانەوەیە ڕەخنەیەک بوو لە هەردووک باڵەکەی دیکەی نێو کۆمەڵە، وە یان دروستر لەو باڵەی دیکەی کۆمەڵە کە خۆی بە کوردستانی و ئەمانی بە عێراقچی ناو دەبرد.

ئەگەر مرۆڤ تێبینی بکات هەست دەکات کە خاڵی دەستپێک و لێوە هەستانی ئەو تێڕوانینەی لە نووسراوەی هەڵوێستدا گەلاڵە بووە، کێشەی ستەمی میللی کوردە لە کوردستاندا، نەک کێشەی چینی کرێکار و کۆمەڵانی خەڵکی بەشمەینەت.

بە هەر حاڵ، باسی ئەم نووسراوە، بووە باسی گەرمی نێو کۆنفرانس و قسە لەسەر ئەوە کرا، ئەم نووسراوە بەنهێنی و لە دژی سەرکردایەتیی یەکێتی نووسراوەتەوە و لەنێو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا بڵاو کراوەتەوە ... ئەمەش خیانەتە.

دوای ئەوە ناوی چەند کەسێکیان خوێندەوە کە ئەم نووسینەیان لەلا بووە و بڵاویان کردووەتەوە، ئەوانیش بریتی بوون لە: حاجی مەمۆ، خەلیل دهۆکی، سدیق ڕەنجبەر، عادیل ڕەفیق، مەهدی کاوانی، هێدی.[٢٤٠]

نەوشیروان مستەفا بە وێنەی جەنەراڵێکی سوپا کە لەنێو گەرمەی جەنگێکی خوێناویدا بێت و نەپەرژێتە سەر پێکهێنانی دادگا، تەنانەت بەبێ ئەوەی پرس و ڕاوێژ بە هاوەڵێکیشی بکات، ئەمر ئەکات و دەڵێت: ئەوانە ببەنە دەرەوە ڕەمییان بکەن! "ڕۆستەم"یش بەبێ ئەوەی بزانێت مەوزووع چییە، دەڵێت: بیاندەنە دەست من، من ڕەمییان ئەکەم![٢٤١]

لەبەرامبەر ئەمەدا، چەند کەسێک لە باڵی ئاڵای شۆڕش ڕووداوی کوشتنی وریا (عەبدولڕەزاق وەستا وەهاب)یان ورووژاند کە بە فەرمانی نەوشیروان مستەفا، لەلایەن جەبار فەرمان عەلی و چەند کەسێکی دیکەوە لە تەویلەیەکدا بەنهێنی ئەشکەنجە دەکرێت و بە تەور دەکەونە وێزەی و پاشان دەیکوژن. ئەمان بە شەهید ناویان برد و ڕەخنەیان لەوە گرت، چۆن دەبێت کادرێکی کۆمەڵە بەبێ هیچ دادگاییەک و بەو شێوازە تیرۆر بکرێت!

---

٢٤٠. هەندێک لە دیکۆمێنتەکانی ئاڵای شۆڕش، عادیل ڕەفیق، چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠١٧، ل ١٦٣.

٢٤١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٣.

نەوشیروان مستەفا چووە سەر سەکۆی ساباتەکە و گوتی: وریا شەهید نییە، خائینە! بەڵێ ئێمە تۆپاندوومانە، چونکە نهێنییەکانی ڕێکخستنی بە نەیارەکانمان داوە! ئەگەر ئێستا زیندوو بێتەوە، بە پێڵەقە ئەچمە سەری و جارێکی تر دەی تۆپێنینەوە.

سەرەنجام لە فەزایەکی گرژ و ئاڵۆز و دوژمنانەدا، کە هەموو ئاگریان لێ دەباری، نەوشیروان زلەیەکی لە ئەندامێکی کۆنفرانس دا و لە ساباتەکە دەری کردە دەرەوە. مەلا بەختیار لەسەر ئەو کادرە هەڵی دایە و دژی نەوشیروان قسەی کرد، حەمە تۆفیق ڕەحیم خۆی بۆ مەلا بەختیار ڕاپسکاند، کەسانێک کەوتنە نێوانەوە و حەمە تۆفیقیان دوور خستەوە.

دوای ئەوە مەلا بەختیار بابەتی گیرانی خاڵە شەهابی وروژاند و وتی: ئەوە بۆچی کۆنفرانس لە چۆنیەتی بە ئیعدام گەییشتنی خاڵە شەهاب ناکۆڵێتەوە، لە کاتێکدا هەموو نهێنییەکان لەلای ئەم (لەو کاتەدا دەستی بۆ فەرەیدوون درێژ کرد) کاک "فەرەیدوون"ەن!

سەرەنجام ئەندامان و هەوادارانی ئاڵای شۆڕش وەکوو نارەزایەتی، ساباتی کۆنفرانسەکەیان بەجێ هێشت و چوونە دەرەوە.

من نەچوومە دەرەوە، چونکە لێکدانەوەی ئەو دەمەم وەها بوو، من ئاڵای شۆڕش نیم، وەلێ بەجیا لە هەر شتێک، بۆ وەستانەوە لە دژی مامەڵەی باڵی باڵادەستی نێو کۆمەڵە، دەبوو منیش بچوومایەتە دەرەوە.

کۆنفرانس کارەکانی پەکی کەوت، مام جەلال کە لە سووررداشەوە چاودێریی ڕەوشی کۆنفرانسەکەی دەکرد، خۆی گەیاندە مێرگەپان و لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی دیکە ئاگرەکەیان خامۆش کردەوە و جارێکی دی کۆنفرانس دەستی بە کارەکانی کردەوە.

بەو شێوەیە، ڕێکخراوێک کە خۆی بە مارکسی دەزانێ و قەرارە ڕابەرایەتیی شۆڕشێک بۆ ئازادی و بەرابەریی کۆمەڵگایەک بکات، لەسەر بڵاوکردنەوەی نووسراوێک، بڕیاری ئیعدامکردنی کادرەکانی لەلایەن تاقە کەسێکەوە دەدات!

هەموو ڕۆژێک کە بەرنامەی ئەو ڕۆژەی کۆنفرانس تەواو دەبوو، بۆ چادرەکەی خۆمان دەگەڕاینەوە و پشوومان ئەدا. هەندێکیش بۆ لای ئەندامانی سەرکردایەتی دەچوون و لە چادرەکەی ئەوان، گفتوگۆی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەی نێو کۆنفرانسیان دەکرد. من یەک جارێک بۆ چادرەکەی مەلا بەختیار چووم، حەسەن عەبدولقادر محەمەد سالح (شاهۆ) کە ئەو دەمە پێشمەرگە بوو، ئەویش لەوێ بوو، وەلێ من ڕووپۆشم لەسەر بوو، بۆ ئەوەی نەمناسێتەوە، لەوێ لەو کۆڕە هیچ قسەیەکم نەکرد، نەبادا بە دەنگ بمناسێتەوە.

دوابەشی کۆنفرانس هەڵبژاردن بوو. لە هەڵبژاردنەکەدا بێگومان ئەو ژمارەیەی کە بۆ سەرکردایەتی بە پێویست دەزانرێ، بەوانە پڕ دەکرێتەوە کە دەنگی زۆرینەیان بەدەست هێناوە، وەلێ مەرجی ئەوەش دانرابوو، ئەو کەسە دەبێت دەنگی نیوە زائید یەکی ژمارەی ئەندامانی کۆنفرانسیش بە دەست بهێنێت. بە هۆی ئەو مەرجەوە کاندیدەکانی ئاڵای شۆڕش بە مەلا بەختیاریشەوە دەنگی پێویستیان نەهێنا. ئەمەش دیسانەوە نارەزایەتی و ئاڵۆزی لێ کەوتەوە و دیسانەوە فەزای کۆنفرانس تێک چووەوە. سەرەنجام دەنگدانیان بەبێ مەرجی "نیوە زائید یەک" دووبارە کردەوە. بەو شێوەیە مەلا بەختیار بووە ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە.

لە کاتێکدا ئەو "لە بەردەم کۆنفرانس و لە حاڵەتێکی هەڵچوونی دەروونیدا، سوێندی بە گۆڕی کاک ئارام خوارد کە چیدی ناچێتەوە نێو کۆمیتەی سەرکردایەتیی کۆمەڵەوە".[٢٤٢]

من دەنگی خۆم بە لیستی ئاڵای شۆڕش دا، چونکە پێم وا بوو لە نێوان ئەو دوو باڵەدا، ڕێبەرایەتی لە باڵی ئاڵای شۆڕش بێت قازانجترە.

یەکێک لە ئەندامانی کۆنفرانس کارتی هەڵبژاردنی بە بەتاڵی گەڕاندەوە، یانی هیچ کەسێکی بۆ سەرکردایەتی هەڵنەبژاردبوو. فەرەیدوون عەبدولقادر چووە سەر سەکۆی ساباتەکە و ڕووی لە ئێمە، ئەندامانی کۆنفرانس کرد و بە توورەیی و بە غەزەبێکی زۆرەوە، دەستی کردە هەڕەشە و گوڕەشە و گوتی: ئێمە ئەو کەسە ئەناسین!

---

٢٤٢. هەندێک لە دیکۆمێنتەکانی ئاڵای شۆڕش، عادیل ڕەفیق، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧، ل ١٦٩.

# وازهێنان لە کۆمەڵە

هەر وەکوو پێشتریش باسم کرد، من چەند مانگێک بەرلەوەی بۆ کۆنفرانس بچم، بڕیاری وازهێنانم لە کۆمەڵە دابوو. بۆیە دوای تەواوبوونی کۆنفرانس و گەڕانەوەم بۆ کەرکووک، یەکسەر نامەی وازهێنانەکەم نووسی. هاوڕێیانی دیکەش لە کەرتی شەهید ئەنوەر کە پێم وابێت کەسێکی تێدا نەمایەوە و هەر هەموو دەستیان لە کار کێشایەوە. هاوڕێیانی کەرتی شەهید سیروانیش بەشێکیان دەستیان لە کار کێشایەوە. وەلێ بە بۆچوونی خۆم، کەرتەکەی مامۆستا قادر، بەو هێڵەی چەمچاڵیشەوە، وەکوو خۆیان مایەوە و بەردەوامییان بە کاری خۆیان دا. کەواتە: ڕێکخراوی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک، باشترین و چالاکترین کادرەکانی خۆی لەدەست دا و ئەوەی مایەوە تەنها دەوروبەری ٤٠-٥٠ کەسێک دەبوون.

چووم بۆ ماڵ مامۆستا قادر و پێکەوە دانیشتنێکمان کرد. لەو دانیشتنەدا باسی کۆنفرانس و بارودۆخی کۆمەڵەم کرد، ڕەخنە و لێکدانەوەکانی خۆمم باس کرد، سەرەنجام باسی وازهێنانی خۆمم کرد و نامەی دەست لە کار کێشانەوەکەیشم پێ دا. هەروەها پێم گوت، هاوڕێیانی خوارەوەش زۆربەیان بڕیاری وازهێنانیان داوە، دواتر نامەکانی ئەوانیشم پێ گەیاند.

مامۆستا زۆری پێ ناخۆش بوو، ڕەنگی هێنا و ڕەنگی برد، هیچ وەڵامێکی نەبوو، هیچ موناقەشەیەکی نەکرد و داکۆکی لە هیچ شتێکی کۆمەڵە نەکرد. تەنها یەک داوایەکی لە من هەبوو، وتی: بەڵکوو ناوی تەواوی ئەوانەم بۆ بهێنی کە وازیان لە ڕێکخستن هێناوە!

وتم: ناوی ئەوانەت بۆچییە؟

وتی: بۆ ئەوەی نەوەک ماوەیەکی دیکە پەیوەندی بە کۆمەڵە بکەنەوە!

وتم: مامۆستا گیان! کەی ئێمە هەتا ئێستا بەو شێوەیە کارمان کردووە؟! هیچ کاتێک ئێمە ناوی ئەو کەسانەمان نەپرسیوە کە پەیوەندییان بە کۆمەڵەوە کردووە، وە یان وازیان هێناوە، هەروەها هیچ زانیارییەکیشمان لە سەریان کۆ نەکردوونەتەوە! پاشان ئەمە چ زەرووڕەتێکی هەیە؟! تۆ ئەڵێیت: نەوەکوو ئەو

کەسانە جارێکی تر پەیوەندی بە ڕێکخستنەوە بکەنەوە! ئاخر ئەمە کەی مەنتیقییە؟! ئاخر ئەگەر کەسێک وازی لە ڕێکخستن هێنا و پاش ماوەیەک ویستی دووبارە پەیوەندی بکاتەوە، ئایا کێشەیەکی تێدایە؟ بێگومان ئەوە نەبووە بە کێشە و بەگوێرەی پەیڕەوی ناوخۆ، مەرجەکانی ئەندامەتی تێدا بووبێت، دووبارە بووتەوە بە ئەندام. بۆیە من هیچ زەروورەتێک لەوەدا نابینمەوە، ناوی ئەوانەت بۆ بهێنم.

ئیدی مامۆستا بێدەنگ بوو، هیچی دیکە لەسەری نەڕۆییشت.

دوای ئەوەماڵئاواییم لە مامۆستا کرد و ئەوە دوادیداری نێوانمان بوو.

ئەو هۆکارەی کە مامۆستا باسی کرد، بێگومان هیچ ئەسڵ و ئەساسێکی نەبوو، بەڵام ئەوەندەی من ئەو پیاوە بناسم، ئەو داواکارییە نەک هەر هیی ئەو نەبووە، بەڵکوو ئەو ئەگەر بیزانیبا بۆ چییە، ڕەنگە هەر داوای نەکردایە. ئەوە داواکاریی ناوەندیی کۆمەڵە بوو، وە یان دەقیقتر بڵێم، ئەوە بە داواکاری نەوشیروان مستەفا دەچوو، بۆ ئەوەی هەر کاتێک مەبەستی بێت، بە شێوازێک لە شێوازەکان بەگرتمان بدات، هەر وەکوو چۆن لەگەڵ پۆلی شەهید "دلاوەر"دا[٢٤٣] ڕەفتارێکی لەو جۆرەی نواندبوو.

پۆلی شەهید دلاوەر ڕەخنەی زۆریان لە کۆمەڵە و سیاسەتەکانی هەبووە، بۆیە نەوشیروان مستەفا لە کۆبوونەوەیەکی ناوەندیی کۆمەڵەدا بڕیار ئەدات، ناوی سیانی و نهێنی ئەندامانی ئەو پۆلە بە لیستێک بۆ تەواوی ڕێکخستنەکان بنێرێت. کاتێک ئەندامانی دیکەی ناوەندیی کۆمەڵە پێی دەڵێن: ئاخر ئەگەر ئەو لیستە بکەوێتە دەستی حکوومەت، مەترسی بۆ سەر ژیانی ئەوان و باقی ئەندامانی دیکەش پێک دێت! نەوشیروان لە وەڵامدا دەڵێت: چاویان دەردەهات، ئەوەی لە دژی ئێمە بێت، چی بەسەر دێت، با بەسەری بێت!

---

٢٤٣. لە سەرەتای سالانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا، تێکۆشەرێکی نێو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بەنێوی "دلاوەر"ەوە دەچێتە دەرەوە و لە ناوچەی دۆڵی جافایەتی دەبێت بە پێشمەرگە. ئەو تێکۆشەرە سەبارەت بە گەندەڵییەکانی نێو ڕیزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەو ڕۆژگارەدا، دەست دەکات بە نامەناردن بۆ هێندێک لە ئەندامانی ڕێکخستنەکانی نێو شار. سەرەنجام دلاوەر شەهید دەبێت و ناوی ئەو پۆلە بەنێوی ئەوەوە دەکرێت.

عادیل ڕەفیق لە کتێبەکەیدا[244] باسی ئەوە ئەکات، کاتێک یەکێتیی نیشتمانی بە پیلان دەچێتە سەر مەلا بەختیار و دەیگرێت، ئەمان بەیاننامەیەک لە دژی ئەو کارە دەرئەکەن و ئیدانەی ئەکەن. سەرانی یەکێتی بەو کارە زۆر تووڕە دەبن و پیاوکوژەکانی خۆیان ئاگادار دەکەنەوە کە عادیل ڕەفیق بکوژن. لەولاشەوە جەلال تاڵەبانی زۆر دەهری دەبێت و لەنێو خەڵکی و لە چەندین شوێن دائەبەزێتە سەر عادیل ڕەفیق و ناوی سیانی و ناونیشانی ئەدرکێنێ، بۆ ئەوەی ئەگەر نەیانتوانی بیکوژن، ئەوا ناو و ئەدرێسەکەی بەگوێی سیخوڕ و بەکرێگیراوانی حکوومەتدا بدات و بەگرتی بدەن.

بە هەر حاڵ! داواکاریی نووسینەوەی ناوی ئەو ئەندامانەی وازیان لە کۆمەڵە هێنا لەلایەن منەوە ڕەت کرایەوە. کەواتە لە من بترازێت، ناوی هیچ کەسێک بۆ ناوەندیی کۆمەڵە مەعلووم نەبوو، تەنانەت تەحسین نامیق کە ئەندامی ڕێکخراوی کەرکووک بوو، نە ناو و نە ناونیشانی بۆ مامۆستا مەعلووم نەبوو.

ئەو ڕۆژەی وازم لە کۆمەڵە هێنا، ڕۆژێک بوو لە ڕۆژە گەرمەکانی مانگی تەمووز، ئەو ڕۆژانەی هەتاو سەری کەچەڵ دەسووتێنێ. ئەو زەمانە خەڵکی لەسەربان دەخەوتن، بەهۆی ئەوەی خانووەکان بەپاڵ یەکەوە بوون، وە یان هەر حەوشێک چەند ماڵێکی تێ ترنجا بوو، هەر خێزانێک کولە، یان پەردەیەکی بە پارچەپەڕۆ بۆ خۆی چێ کردبوو.

ئەو شەوە، لە شەوە فێنکە خۆشەکانی هاوینی کەرکووک بوو، نەمدەتوانی خەریکی ئەستێرە ژماردن بم، چونکە چاوی خەیاڵم لە شوێنێکی دیکە بوو، نوقمی خەیالات بووم، داڵغە بردبوومییەوە، چاوەکانم ڕەق ببوون، خەو لە چاوانم تۆرا بوو، هەتا شەبەق من بێدار بووم.

بۆچی؟ هەتا هەنووکەش من بەدوای ئەو وەڵامەدا وێڵم!

---

٢٤٤. هەندێک لە دیکۆمێنتەکانی ئاڵای شۆڕش، عادیل ڕەفیق، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧، ل ٣٢٣.

# نەوزاد فەتحولڵا و دوادیدار

لەدوای ئەوەی نەوزاد فەتحولڵا (شەهید هیوا) شاری بەجێ هێشت و لە پاییزی ساڵی ١٩٨٣ بووە پێشمەرگە، ئێمە یەکتریمان نەبینییەوە، هەتا ساڵی ١٩٨٤، کە ئەو دەمە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەگەڵ حکوومەتی بەعس دانووستانی هەبوو. لەگەڵ ئەحمەد خورشید ڕەزا (ئاشتی) ڕێکەوتین، پێکەوە بۆ سەردانی و بینینی نەوزاد بۆ گوندی جولحان بچین. ئیدی سەفەرەکەمان ڕێک خست و چووین.

نەوزاد و من پێکەوە دەرچووینە دەرەوەی ئاوایی و پیاسەیەکمان کرد، پاشان لەسەر جۆگە ئاوێک دانیشتین. باسی یەکێتی و کۆمەڵە و چینی کرێکار و مارکسیزم و کۆمۆنیزم و گەلێک بابەتی سیاسیی ترمان کرد، زیاتر لە سەعات و نیوێک ئێمە پێکەوە دانیشتین و خولاسەی کەلام باسی ئەوەم بۆ کرد کە ئێمە بە هیوای ڕزگاریی کرێکاران و زەحمەتکێشان و ڕزگاری میللەتی کورد لە ستەم، لەگەڵ کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان دەستمان دایە کار و خەبات و لەو پێناوەشدا ئامادەی هەموو فیداکاری و قوربانییەک بووین، بەڵام بە داخەوە کۆمەڵە ئەو ئامرازە نییە و ئێمە بەو ئامانجانە ناگەیەنێ. کۆمەڵە باڵی چەپی ناسیۆنالیستی کوردە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش ئەو چەپییەی کاڵ دەبێتەوە و هیچ نزیکایەتییەکی لەگەڵ چینی کرێکار و مارکسیزم و کۆمۆنیزمدا نەماوە. ئێمە دەبێ واز لەم ڕێکخراوە بهێنین و بەدوای دامەزراندنی ڕێکخراوێکەوە بین کە بەو مەرامەمان دەگەیەنێت.

بەو شێوەیە من گەلێک قسەم کرد و لەو سەعات و نیوەدا ئەو هەر گوێی لە من گرت و بەهیچ شێوەیەک نەزەری خۆی بە باش یان بە خراپ لەسەر قسەکانی من دەرنەبڕی و ورتەی لێوە نەهات.

ئەو دەمە من خۆم تازە وازم لە کۆمەڵە هێنابوو، بەڵام پێم خۆش بوو ئەو خەڵکانەش هۆشیار بکەمەوە کە دەیانەوێ بۆ ڕزگاریی کرێکاران و بەشمەینەتان تێ بکۆشن و نەبنە خۆراکی حیزبگەلی تر و ئەوەم بە ئەرک و واجبی خۆم دەزانی، بە تایبەتی کەسانێکی وەک نەوزاد کە بەهۆی من و لە ڕێگەی منەوە هاتووەتە نێو

ڕێزەکانی کۆمەڵەوە. بەڵام وا دیار بوو قسەکانم ئەنجامێکی نەبوو، بۆیە ئەو هەر مایەوە و درێژەی بەکاری خۆی لەنێو کۆمەڵە دا و پاشانیش مەرگ مەودای نەدا، مەرگی تەواوەتی کۆمەڵە و ڕاستی قسەکانی من بە چاوی خۆی ببینی.

نەوزاد لەو دانیشتنەدا باسی ئەوەی بۆم کرد و وتی: ماوەیەک بەر لە ئێستا و لە کۆبوونەوەی پۆلی ڕێکخستنی خاڵخالاندا، لەلایەن کەسێکەوە بە نێوی هیوا (لوقمان عەزیز شەریف)ەوە، خەڵکی گوندی چیمەنی شەهیدانە، ڕاپۆرتێکت لەسەر دراوە، باسی ئەوە دەکات کە تۆ لەنێو خەڵکیدا ڕەخنە لە کۆمەڵە دەگری، بۆیە مەلا ئاراس و ئەوانی تر بە نیازن لە هەر شوێنێک پێت بگەن، بتگرن و ئازارت بدەن.

بەڵێ! شەهید هیوا بە هۆی ئەوەی هاوڕێی منداڵی یەکتری بووین و لە ڕێکخستنە نهێنییەکانی کۆمەڵەش ڕێکخەر و بەرپرسی بووم، گوێی بە دیسیپلینی ڕێکخراوەیی خۆی نەدا و پێی خۆش نەبوو من تووشی ئەزیەت و ئازار بێم، بۆیە تەواوی زانیارییەکانی نێو کۆبوونەوەی پۆلەکەی خۆیانی پێم گەیاند.

ئەو لوقمان ناوەم دەناسی و یەک جارێک لە گوندی چیمەن یەکتریمان بینی بوو. لە کۆڕێکدا قسەوباسمان چووە سەر سیاسەت و کۆمەڵە و شتی لەو بابەتە، من نەزەری خۆم دا و ڕەخنەم لە کۆمەڵە گرت. ئەویش هاتە جواب و گوتی: تۆ نابێت ئەم ڕەخنانە بەئاشکرا و لەنێو خەڵکیدا بگریت، ئەگەر ڕەخنەت هەیە، ئەبێ لەلای کۆمەڵە بیگریت! منیش وتم: من وەکوو هاولاتییەک لە هەر شوێنێک ڕەخنە دەگرم ئازادم، ئەوە ئەندامانی کۆمەڵەن دیسیپلینی حیزبی ئیلزامیان دەکات، تەنها لە کۆبوونەوەکاندا ڕەخنە بگرن و بۆچوونی خۆیان دەرببڕن.

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا قسەم لەسەر کردووە، ئێمە لەو گوندە خەتێکی ڕێکخستنی فراوانمان هەبوو، کەرەم بەرپرسی بوو، "کەرەم"یش پەیوەندی بە منەوە هەبوو، ئەم لوقمانەش یەکێک بوو لە ئەندامانی ئەو خەتە و پەیوەندی بە کەرەمەوە هەبوو.

دوای ئەوە ئەحمەد خورشید و من، شەهید هیوامان بەجێ هێشت و بەرەو شار گەڕاینەوە، ئیدی ئەوە دواجار و دوادیداری نێوانمان بوو.

# پۆلیس پرسیاری خۆم لە خۆم ئەکات!

ئاخروئۆخری ساڵی (١٩٨٤)ە، ڕۆژێکیان لە دەرگا درا، کە چوومە دەرەوە بینیم پۆلیسێک لەبەر دەرگایە، دوای سڵاوکردن پرسیاری منی کرد، وتی:

ساڵح لەماڵە؟ لەو کاتەدا دایکم لەنێو حەوشەکەدا دانیشتبوو، مژووڵی ئیشوکار بوو، کۆڵانی لێوە دیار بوو، زانی ئەوە پۆلیسێک لە بەردەرگایە. ڕووم لە دایکم کرد و وتم:

دایە! ئەوە پرسیاری ساڵح ئەکات، ساڵح لە ماڵ نییە، چووە بۆ بازاڕ، وا نییە؟ دایکیشم یەکسەر تێ گەییشت و وتی:

نا، نەخێر لەماڵ نییە!

من ئەمزانی پۆلیسەکە عەرەبە و لەو گفتوگۆیەی نێوان من و دایکم تێناگات، وەلێ دەمویست گومانی پۆلیسەکە لەسەر خۆم لا ببەم.

ڕووم لە پۆلیسەکە کرد و وتم: ساڵح لە ماڵ نییە، چووە بۆ بازاڕ.

پۆلیسەکەش وتی: هەر کاتێک هاتەوە پێی بڵێ: با بۆ بنکەی پۆلیسی پریادی بێت.

منیش وتم: باشە.

دوای ئەوە هەستام هەرچی کتێبی قاچاخم هەبوو، هەر هەمووویم پێچایەوە و چووم بۆ لای ئەحمەد سەی عومەر کە ئۆتۆمبیلێکی تەکسی پێ بوو، بۆ ئەوەی بۆم بگوازێتەوە بۆ ماڵی فەیمی خوشکم لە ساحە تەیەران.

ئەحمەد هاوڕێی گەڕەک و زانکۆم بوو، ئەو لە کۆلێجی زانستەکان بەشی ماتماتیک بوو، ئەویش وەکوو من لە زانکۆ فەسڵ کرابوو، کەسێک بوو زۆر جێگای متمانە بوو، خێزانێکی گەورە بوون، هەر هەموویان زۆر پاک و بەڕێز و نەجیب بوون.

کتێبەکان زۆر بوون، ئەحمەد هەر هەمووی بۆم گواستەوە.

دوای ئەوە شارم بەجێ هێشت و بۆ ماڵی باپیرم بۆ گوندی گوڵمکەوە چووم.[٢٤٥]

---

٢٤٥. گوندی گوڵمکەوە، یەکێک بوو لە گوندەکانی شوانی سەرخاسە و کەوتبووە باکووری ناحیەی قەرەنجیر بە دووری ٢٠ کیلۆمەتر و باکووری ڕۆژهەڵاتی قەزای چەمچەماڵ بە دووری ١٧ کیلۆمەتر.

باپیرم مەلا مەحموود نەماوە و نەنکم سەی فاتم لەوێیە. کامیل خاڵۆم هەر لەوێیە، ڕای کردووە و نەچووە بۆ سەربازی، خێزاندارە و چوار منداڵی هەیە. جەماڵ (جەماڵ کرێکار) خاڵۆم لە کەرکووک لە ماڵ ئێمەیە و خەریکی کرێکارییە. لوقمان ی برامیش فیرارە و لەپێش منەوە لەوێیە. منیش چوومە لای لوقمان و هەردووکمان پێکەوە لە باڵەخانەکەی ماڵی باپیرم دەژیاین.

دوای دەرچوونی من، باوکمیان گرت و بەهۆی کوڕێکی پوورزامەوە وازیان لێ هێنا.

لە گوڵمکەوە دانیشتم، بەڵام لەو نێوانەدا جاروبار سەفەرم دەکرد، چونکە من هێشتا ناسنامەی زانکۆم پێ بوو، ئەو ناسنامەیە تەنها مێژووی دەرکردنی پێوە بوو، مێژووی کۆتاییهاتنی تێدا نەبوو. بۆیە هەتا ماوەیەک هەر بەکارم دەهێنا.

ئەو دەمەی من لە گوڵمکەوە بووم، جارێکیان خالید محەمەد فاتیح (سەمیر نووری) و عەزەدین مەجید محەمەد (جەمال ئەیووب) پێکەوە هاتن بۆ لام. ئەو دەمە ئەوانیش لە زانکۆ فەسڵ کرابوون و لە گوندی گورگەیی سەرخاسە دەژیان.

هەر لەو ماوەیەدا بوو سەردانی مەلا بەختیارم کرد و لە ماڵی شێخ جەنابی خەزووری لە سەرچنار یەکتریمان بینی.

لەو دانیشتنەدا بێجگە لە بابەتی سیاسی، باسی ئەوەشم لەگەڵدا کرد کە بەنیازم بۆ ڕووسیا بۆ خوێندن لە پەیمانگای دیراساتی مارکسی بچم. مەلا بەختیار وتی: جارێ سەبر بگرە، ئێمەش هەندێک هاوڕێمان هەن، نیازی ئەوێیان هەیە، ئەو دەمە هەموو پێکەوە بڕۆن! بەڵام من لەلای خۆمەوە بڕیاری خۆم دابوو، نەمدەویست خۆم تاخیر بکەم، ئەوە بە جیا لەوەی وام هەست دەکرد، مەلا بەختیار پێی خۆش نییە لەو دۆخەدا من ئەوان بەجێ بهێڵم، ئەگەرچی من ئالای شۆڕشیش نەبووم.

# لە گوندی "گوڵمکەوە"وە بۆ ڕووسیای سپی

لەگەڵ هاوڕێیان عوسمان غەریب محەمەد و عەبدوڵای کۆلێجی تەربییە پێکەوە تەگبیرمان کرد بۆ ڕووسیا بچین. قەرار بوو عوسمان لەلای حیزبی شیووعی هەوڵی بەدەستهێنانی کۆمەک و پشتیوانی بدات، تاوەکوو لە ڕووسیا لە پەیمانگای دیراساتی مارکسی وەربگیرێین.

دایک و باوکم لەگەڵ مام ڕەئووفی شەریکە سەیارەمان بۆ گوڵمکەوە هاتن. باوکم ٧٠٠ دیناری پێم دا کە بۆ ئەو دەمە زۆر بوو. بۆ ئەو سەفەرە ئەبوو لە سەرەتادا هەندێک دۆلارمان پێ بێت، کڕین و فرۆشتنی دۆلار قەدەغە بوو، ئەبوو بەدزییەوە بیکڕین، دواتر عوسمان ئەو کارانەی گشت جێبەجێ کرد. دوای ئەوە هەموو پێکەوە منیان گەیاندە چەمچەماڵ.

هەتا گەییشتینە چەمچەماڵ باوکم هەر دیقەتی ئەدام و چاوی لێم نابڕی، ئەمزانی بیر لە ڕێگای هاتونەهات و پڕ مەترسی من دەکاتەوە، ئەمزانی ئەو وەکوو باوکێک بیر لە چارەنووسی نادیاری من و لێکدابڕانی ڕۆڵەکەی دەکاتەوە! ئاخۆ دەبێت لە ژیاندا چەندێک دڵی بە من و بە داهاتووی من خۆش بووبێت و چەندێک خەیاڵی بە ژیان و دوارۆژی منەوە کردبێت! ئاخر ئەگەر بۆ من هەندێک شت ڕۆشن بووبێت، ئەوا بۆ ئەوی ئازیز، گشت شتێک هەر تاریک بوو! تەنانەت نەیدەزانی هاوسەفەرەکانم کێن! ئاخر مەعلووم نییە، ئاخۆ جارێکی دی باوک و فەرزەند یەکتری دەبیننەوە، یاخود ئەوە دوادیدار و ماڵئاواییە!

منیش لەناوەوە ئازارم زۆر دەکێشا، ئاور هەناومی تەنیبوو، هەستم بە هەستی باوکم ئەکرد، بەڵام وام دەکرد، ئەو هەستم پێ نەکات. ئاخر منیش هیچ چارێکم نەمابوو، دەستم لە هەموو شتێک بەربووبوو، هیچ بوارێکی ژیانم بۆ نەمابووەوە! چەرخی چەپگەرد بێڕەحمانە هاڕیبوومی. من هەوڵم ئەدا سەیری باوکم نەکەم، وەلێ بۆ یەک جار چاوم لە چاوی گیر بوو، فرمێسکەکانی هۆنهۆن بەبێ دەنگی دەهاتنە خوارەوە، ئازاری ئەو دیمەنە ئەوەندە بەسوێ بوو، هەتا هەنووکەش لە لای من هەر وەکوو ئەو دەمەیە!

عەبدوڵا پێش ئێمە لە شار دەرچوو، من و عوسمانیش چووین بۆ شارەزوور و شەوێک لە گوندی گردەنازێ لە ماڵی خزمێکی عوسمان ماینەوە و بۆ ڕۆژی دوایی

دەمەو ئێوارە بۆ گوندی شیرەمەڕ چووین. ئەو دەمە ئەو گوندە وێران کرابوو، ناوچەی موحەڕەمە و زۆر خەتەرناک بوو. ئێمە زانیاریمان هەبوو کە ئەبێت لە شیرەمەڕ هەتا دەمەوئێوارە و تا ئەو کاتەی دنیا تاریک دادێت خۆمان پەنا بدەین. ئەوجا لەوێوە بەڕاکردن، بەپەلە و بەپرتاو خۆمان بگەیەنینە کەندێکی پاش ئەو تەختییە.

ئێمە هەر وامان کرد، وەلێ هێشتا دنیا هێندە تاریک دانەهاتبوو کە بەدی نەکرێین، دیاربوو سەربازگە و ڕەبییەکانی ئەو دەوروبەرە فەرقیان پێمان کردبوو، بۆیە بە هاوەن دامانیان گرت. باش بوو بەرنەکەوتین و بە سەلامەتی گەییشتینە شیوەکە .

دوای ئەوە ملی ڕێگامان گرتە بەر هەتا گەییشتینە خۆرنەوازان کە بنکە و بارەگاکانی حیزبی شیووعیی عێراقی لێ بوو. پاشان ئەوێمان بەجێ هێشت و سواری کۆڵی شاخی سوورێن بوین. ڕێگای ئەو شاخە بەو بەرزییە و بەو ئاسمانەوە بوو. لە خوارەوە و بەرامبەری سەربازگەیەکی لێ بوو، ئەیانگوت جاروبار پێشمەرگە و ڕێبوارانی ئەو ڕێگایە ئەداتە بەر دۆشکە. ئێمە ڕۆییشتین و بە سەلامەتی ئاودیو بووین، هەتا گەییشتینە کەڕەجاڵ. لەوێ ئەبووتارا (ئیبراهیم سۆفی) و مەلا عەلی (عەبدوڵا قەرەداغی)مان بینین، یەکەمیان لە ڕابەرایەتی ئەو حیزبە و دووەمیان بەرپرسی سەربازیی مەڵبەندی سلێمانی و کەرکووکیان بوون و قسەمان لەگەڵدا کردن. بەڵام پێش ئەوە بەڕۆژێک سودفەی هاوڕێیەکی سەردەمی زانکۆم کرد کە پێشمەرگەی حیزبی شیووعی بوو، ناوی موعتەسەم و خەڵکی تەوێڵە بوو، لە ساڵی یەکەمی خوێندن لە شاری سلێمانی لە بەشی ناوخۆیی ساڵێک پێکەوە بووین و گەلێک جار دەبووە مشتومڕمان و من لە ڕوانگەی کۆمەڵەوە ڕەخنەی توندم لە حیزبی شیووعیی عێراقی دەگرت. جا کاتێک 'ئەبووتارا'مان بینی، لەناو قسەکانیدا پلاری تێ گرتم و ناڕاستەوخۆ ئەوانەی دایەوە بەچاومدا. منیش لە فیکەی خۆم تێگەییشتم و زانیم موعتە (هاوڕێ هەورامییەکان بەو شێوەیە ناویان دەبرد) هەموو شتێکی لەچنگ خستوون. بۆیە منیش بە پەستییەوە گوتم: بیروڕای سیاسیم هەرچییەک بووبێت و هەرچییەک بێت، ئەوە شتێکە پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە. ئێمە بە سیفەتی خوێندکارانی مانگرتووی زانکۆی سەلاحەدین بۆ لای ئێوە

هاتووین. لەسەر ئەو هەڵویستە ئێمە لە زانکۆ فەسڵ کراوین، ئێوە ئەڵێن، ئێمە پشتیوانی لەو مانگرتنە ئەکەین. لەو گۆشەیەوە ئەگەر ئەتوانن و ئەتانەوێت کۆمەکمان بکەن باشە و مەمنوونین، ئەگەر نا، ئەوا ئەگەڕێینەوە.

ئەبووتارا گوتی: بەداخەوە ئێمە ناتوانین هیچتان بۆ بکەین، وەلی پێمان خۆشە ماوەیەک لەلای ئێمە بمێننەوە. ئێمە ڕازی نەبووین و بەجێمان هێشتن.

بارەگای حسک و محەمەدی حاجی مەحموودیش هەر لەو ناوچەیە و لە بناری سوورێن بوون. لەوێ محەمەدی حاجی مەحموودمان لەنێو چادرێکدا بینی. ئەیانگوت، دوو ژنی هەیە. من هەر زوو لە ڕێگەی هاوڕێ تەوێڵەییەکانمەوە ناوبانگی ئەم پیاوەم بیستبوو، باسی ئازایەتیی ئەویان دەکرد و پێیان دەگوت، دەبابەکەی شارەزوور. کاتێک کە محەمەدی حاجیم بینی، هەموو ئەو وەسپ و تاریفانەم هاتەوە بیر، لە بەرچاوم هەر بە هەرقڵ ئەچوو، ئەیانگوت، پێی زۆر گەورەیە! هەندێک دیقەتی پاوپلیشیم دا. بە هۆکی تۆکی قسەی لەگەڵ شێخ محەمەد شاکەلی کرد کە لە بنکەیەکی نزیکی خۆی بوو، داوای لێ کرد، پسوولەی هاتوچۆ (برگ تردد)مان بۆ بکات کە ئێمە داوامان لێی کردبوو، بۆ ئەوەی پێی بچینە نێو خاکی ئێرانەوە.

پسوولەیەکیان بۆ عوسمان و یەکێکیان بۆ من کرد، بۆ ماوەی مانگێک دەیخوارد، بەڵام ئێمە بڕیارمان دا، بۆ ئێران نەچین و گەڕاینەوە. لە گەڕانەوەماندا بەڕێگای ئەحمەدئاوادا هاتین و لەو نێوانەدا بەسەر سەرچاوەی ئاوی "زەڵم"دا ڕۆییشتین، کە زۆر جوان و دڵگیر بوو، ئەو ئاوە لە نێوقەدی ئەو شاخەوە لوورەی ئەهات و دەیفیشکاند.

من پسوولەکەی خۆمم دایە عەبدوڵا و پێی چوو بۆ ئێران. مانگێک پێی سووڕایەوە و پاشان کە وەختەکەی تەواو بوو، بۆ سلێمانی گەڕایەوە.

ئەو دەمەی ئێمە لە بارەگاکانی حسک بووین، هەواڵی کوژرانی مامە ڕیشەمان بیست کە ڕێکەوتی ٢٤ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٥ بوو.

دوای ئەوە چووم سەردانییەکی گوندی شەدەڵەم کرد، بۆ لای حامید شێخ عەبدوڵا. ئەو دەمە ئەو لە ماڵی هۆشیار شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەی پوورزای بوو. حامید بە نیازی خاریج بوو، دوایی چووە ئێران و دوای ماوەیەک ئەو

سەفەرەی بۆ ڕێک ناکەوێت و ئەگەڕێتەوە بۆ عێراق و پاش چەند ساڵێک جارێکی تر ئەچێتەوە بۆ ئێران پاشان بۆ سووریا. لە سووریا چاوەڕێی ئەوە بوو، یەکێتیی نیشتمانی زەماڵەی خوێندنی بۆ بکات و بچێتە دەرەوە. ئێوارانێکی بە ڕێکەوت لەناو بازاڕ عومەری سەی عەلی ئەبینێ و ئەو پرسیار لەم دەکات و دەڵێت: ئەرێ حامید بەنیازی چیت؟ حامید ئەڵێت: قەرارە بە زەماڵە بچمە دەرەوە. عومەر پێی دەڵێت: کوورە بڕوا بەوانە مەکە! ئەگەر ئەوەندە پارەیەت هەیە، ئەم ئێوارەیە لەگەڵ پاسپۆرتەکەت بۆم بهێنە، ئەوا من سەفەرێکت بۆ ڕێک دەخەم.

لەو دەمەدا دەزگای هەواڵگریی سووری فڕۆکەیەک بۆ کۆمەڵێک لە خەڵکانی یەکێتی بە شێوەیەکی نایاسایی ڕێک دەخات، کە شێخ جەنگی و هەندێ لە کوڕەکانی و کۆمەڵێک پێشمەرگەی بریندارى یەکێتی ...هتد. تێدا دەبێت.

حامید ئەو پێویستییانە بۆ عومەر ئەبات و ئەویش لەگەڵ ئەو فڕۆکەیەدا سەفەرەکەی بۆ ڕێک دەخات. بەڵام سەفەرەکەیان کە قەرارە ڕۆژی دوای ئەوە بکەن، ڕێک ناکەوێت و بۆ جاری دووەم دەرئەچن و ئەگەنە بەریتانیا. بەڵام چونکە ئەو فڕۆکەیە بە نایاسایی چووە و فڕۆکەخانەی بەریتانی زانیارییەکیان لە بارەیەوە نەبووە، بە زەحمەت ڕێگەی نیشتنەوەی پێ دەدەن و پاشانیش بە پۆلیس دەوریان دەگرن و تووشی لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوەی زۆر دەبن و سەرەنجام ناوی عومەری سەی عەلییش دەخەنە لیستی قاچاخچییانی نێودەوڵەتییەوە.

من ئەو دەمە تازە لە سەفەری خۆرنەوازانی لای حیزبی شیووعی گەڕابوومەوە، هێز و تاقەتی سەفەرم نەمابوو، بۆیە هیچ بیرم لەوە نەکردەوە لەگەڵ حامید سەفەر بکەم.

ئەو دەمە هۆشیاریش هەر بە نیازی سەفەر بوو، بۆیە کتێبەکانی خۆی هێنا و گوتی هەر کامێکیانت دەوێت، دەتوانی بۆ خۆت هەڵی بگریت. منیش یەک دانە لە کتێبەکانیم هەڵبژارد.

دوای ئەوە جارێکی تر بۆ گوڵمکەوە گەڕامەوە .

# ئێمە و مەلا بەختیار و ئاڵای شۆڕش

سەرەتا ئەبێ ئەوە ڕۆشن بێت، مەبەست لە ئێمە کێن؟

مەبەستم لە ئێمە، ئەو کۆمەڵە ئەندام و کادرەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە ڕێکخراوی کەرکووک، لەنێو کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن و کەرتی شەهید سیروان و بەشێک لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری مووسڵ و ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان و زۆربەی زۆری ڕێکخستنەکانییەتی.

ئێمە ئەم کۆمەڵە خەڵکە کە ژمارەمان ئێجگار زۆر بوو، کۆڵەگە و بڕبڕەپشت و هەڵسووڕێنەر و ڕابەرایەتیی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک و لەنێو یەکێتیی خوێندکاراندا بووین، ڕەخنەی زۆر و ڕیشەییمان لە سیاسەت و بەرنامە و ڕابەرایەتیی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی هەبوو، لەپاش کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە و یەکێتیی خوێندکاران، پێکەوە و بەکۆمەڵ دەستمان لە کار کێشابووەوە.

وازهێنانی ئێمە، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی لە شاری کەرکووک و یەکێتیی خوێندکارانی لە گشت کوردستاندا بەتەواوەتی چۆڵ و گۆج کرد و شتێکی ئەوتۆی لەشوێن خۆی بەجێ نەهێشت، کە بتوانیت ناوی لێ بنێیت ڕێکخستن.

لەبەر ئەوەی ئەو هێڵەی کە مەلا بەختیار ڕێبەراتی دەکرد و دواتر نێوی بە ئاڵای شۆڕش دەرکرد، لە کۆمەڵە ناڕازی بوون و ڕەخنەیان لێی هەبوو، ئێمە جۆرێک لە پەیوەندیمان لەگەڵیان دامەزراندبوو.

پەیوەندیی ئێمە لەگەڵ ئەوان مێژوویەکی کۆنی نەبوو. چونکە ئەوان لەمێژ بوو ڕەخنەیان لە بەرنامە، سیاسەت، ستراتیجی کۆمەڵە و لەو بەشە لە ڕابەرایەتی دەگرت کە کۆمەڵە بەگوێرەی نەخشە و پلانی ئەوان ڕێگای دەکرد. ئەوان پێیان وابوو مەیدانی کاری کۆمەڵە کوردستانی عێراقە، نەک کوردستانەکانی دیکە، کۆمەڵە بایەخ بە ناکۆکیی چینایەتی نادات، کۆمەڵە سەربەخۆیی فکری-سیاسیی خۆی لە دەست داوە و بووەتە پاشکۆی یەکێتی و مام جەلال بە ئارەزووی خۆی هەڵی دەسووڕێنێت، کۆمەڵە لە بەردەم پیلانی هەڵوەشاندنەوە و تواندنەوەدایە لەنێو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا ...هتد.

هەرچی ئێمە بووین، دواتر و لە ساڵی (١٩٨٣)ەوە کەوتینە نێو ئەو کێشە فکرییانەوە و کەوتینە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بۆیان. هەر وەکوو لە باسەکانی پێشووشدا ئاماژەم پێی کردووە، ئێمە کەوتبووینە ژێر کاریگەریی تێڕوانینەکانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانەوە. کاریگەری ئەم دوو ڕێکخراوە ئێرانییە بەئاشکرا بەسەر خەتی ئاڵای شۆڕشیشەوە دیار بوو.

ئەمانە گشت وایان کرد، ئێمە و ئاڵای شۆڕش پەیوەندییەک لە نێوانماندا دروست ببێت و وەهاش ڕێک کەوت، پەیوەندی و هاموشۆمان کەوتە نێو سەردەمی مفاوەزاتی یەکێتی و حکوومەتەوە.

هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا قسەم لەسەر کردووە، جارێکیان مەلا بەختیارم لە سووررداش لە ماڵی خۆی بینی و نووسراوەی هەڵوێستی پێم دا. دوو جاری دیکە لە سەرچنار لە ماڵی شێخ جەنابی خەزووری بینیم، یەکێک لەو دوو جارە لەگەڵ تەحسین نامیق عەبدوڵا پێکەوە چووین و دوای قسەوباس لەسەر چەندین مەسەلە، ئەدرێسی ماڵی "تەحسین"مان پێی دا کە لە گەڕەکی ڕەحیماوای شاری کەرکووک بوو، تاوەکوو ڕووناکی هاوسەری بڵاوکراوەکانی خۆیانمان بۆ ئەوێ بۆ بهێنێت و دواتریش ئەوە بوو هێنای.

جاری دووەم هەر خۆم بە تەنها چووم و دیتەوە بیرم، باسی ئەوەم لەگەڵدا کرد کە بە نیازی ئەوەم کوردستان بەجێ بهێڵم و بۆ خوێندن لە پەیمانگای دیراساتی مارکسی بۆ ڕووسیا بچم.

جاری چوارەم و ئەخیری من، لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٥دا بوو، لەگەڵ عیسام نامیق عەبدوڵا و دکتۆر مارف[٢٤٦] بۆ گوندی "تەکیێ"ی ناوچەی قەرەداغ چووین کە ئەو دەمە مەلا بەختیار لەوێ دەژیا.

سەرەتا بۆ سلێمانی چووین و پاشان بۆ قەرەداغ، لە قەرەداغ بەولاوە ئۆتۆمبیل نەبوو، هەر بەپێ بەرەو گوندی تەکیێ ڕۆییشتین. کاتێک گەییشتینە جێ، دنیا دەمەوعەسر بوو. پێش ئەوەی نانی ئێوارە بخۆین، لە سەندووقێکی داری چکۆڵەی عادەتی، گەزۆی سلێمانییان بۆمان هێنا. جاوەرە زستان بێت، برسیت بێت،

---

٢٤٦. دکتۆر مارف خوێندکاری کۆلێجی پزیشکی لە زانکۆی مووسڵ بوو، خەڵکی گوندی "کاولان"ی لای شارۆچکەی ڕەواندز بوو.

ئەوەندەش ڕێگات بەپێ بڕیبێ و عاشقی گەزۆ و گوێزیش بیت! ئاخر من کە منداڵ بووم، شێتی گەزۆی کەرکووک بووم، کە بەسەر سینییەکەوە بە کۆڵانەکاندا دەیانگێڕا و تەنها تۆپەڵێکی بچکەڵەی گەزۆ، نیوە کاکڵەگوێزێکی بەسەرەوە بوو، ئینجا ئێستا لەشوێن ئەوە، گەزۆی سلێمانیش بێت! چی بڵێم؟ دەستم لێی گیر بوو، بە زەحمەت لێی بووەوە.

ئەو دەمە "بەهادین نووری"ش هەر لەو گوندە دەژیا، بۆیە سەرەتا کردمانە گاڵتە و وتمان: کاک بەختیار لەنێو خەڵکیدا دەنگۆی ئەوە هەیە، تۆ و بەهادین نووری لە تەکێ خەریکی دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستی عێراقن! مەلا بەختیار دەستی کردە پێکەنین و وتی: وەڵا پەیوەندیی من و کاک بەهادین هەر ئەوەندەیە، پێکەوە یاری شەترەنج ئەکەین.

ئەو شەوە لە ماڵی مەلا بەختیارماینەوە و گەلێک مەسەلەمان لەمەڕ بارودۆخی کوردستان، دۆخی کۆمەڵە، مارکسیزمی شۆڕشگێڕ و تێڕوانین بۆ یەکێتیی سۆڤیەت باس کرد. ئەویش خۆی بە لایەنگری مارکسیزمی شۆڕشگێڕ دەزانی، وەلێ لە مەسەلەی تێڕوانین بۆ یەکێتیی سۆڤیەت، ئەو وای دەرخست، جارێ خەریکی دیراسە و لێکۆڵینەوەن و هێشتا خۆیان یەکلا نەکردووەتەوە. لە کاتێکدا ئەوە پێچەوانەی تێڕوانینەکانی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ بوو کە پێی وابوو یەکێتیی سۆڤیەت وڵاتێکی سەرمایەداریی دەوڵەتییە.

بە بڕوای خۆم، مەسەلەکە پەیوەندی بە دیراسە و شتی وەهاوە نەبوو، بەڵکە نەیاندەویست خۆیان لە قەرەی ئەو بابەتە بدەن، چونکە باڵی سالار عەزیز پێیان وابوو کە یەکێتیی سۆڤیەت وڵاتێکی سۆشیالیستییە و نزیکایەتییشیان لەگەڵ حیزبی شیووعیی عێراقیدا هەبوو.

لەدوای ئەوانە مەلا بەختیار کۆمەڵێک بڵاوکراوەی خۆیانی پیشانمان دا.

ئیدی لەو مەسەلانەی کە جیاوازیمان لە نێواندا هەبوون، قسەمان کرد و پاشان بە ڕاشکاوانە من بە مەلا بەختیارم گوت: ئێمە لە هەندێک پرس و مەسەلەدا جیاوازیمان هەیە و هەندێک مەسەلەی دیکەش ئێوە هێشتا تیایدا خۆتان یەکلا نەکردووەتەوە. بۆیە ئێمە لێرەدا پەیوەندییەکەمان ڕا دەگرین و لە دوورەوە موتابەعەی ئێوە دەکەین، هەر کاتێک ئێوە مەسەلەکانی خۆتان یەکلایی کردەوە و زانیمان تێڕوانینەکانمان نزیکایەتییان لە نێواندا هەن، ئەوا جارێکی دیکە پەیوەندی دەبەستینەوە و شێوازی پەیوەندی و هاوخەباتیشمان دیاری دەکەین.

دیاره ئەو ئەنجامەی من بە مەلا بەختیارم گوت، بۆ ئەو ناخۆش و مایەی نیگەرانی بوو، هەر وەکوو بۆ منیش ناخۆش و ئازاربەخش بوو، وەلێ من پێم وابوو ئەو ڕێکخراوەی ئەوان شوێنی کار و هەڵسووڕانی ئێمە نییە، ئەوان تێکەڵوپێکەڵن، ڕۆشن و ڕادیکاڵ نین، مارکسیزمی شۆڕشگێڕیان هەر بە ڕووکەشی وەرگرتووە، ئاستی فکرییان زۆر کاڵە و نووسراوەکانیان زۆر سەتحییە.

ئینجا مەلا بەختیار وتی: ڕاستییەکەی منیش لەگەڵ هاوڕێیانی خۆماندا کە باسی ئێوەم بۆ کردوون، وتوومە: ئەو هاوڕێیانە وەکوو ئێمە بیر ناکەنەوە و لەگەڵ ئێمەدا جیاوازن. بەڵام ئەگەر بکرێت، من دوو پرسیارم لە ئێوە هەیە: یەکەم، ئایا ئێوە ڕێکخراوێکتان هەیە؟ ئەگەر وایە، ناوی چییە؟

لە وەڵامدا منیش گوتم: نەخێر ئێمە هەتا هەنووکە ڕێکخراوێکمان نییە، کۆمەڵێک ئەندام و کادری کۆمەڵەین، وازمان لە کۆمەڵە هێناوە، هەتا ئێستا پێکەوەین و لەنێو خۆماندا خەریکی لێکۆڵینەوە و قسەوباسین.

ئەو شەوە لەوێ خەوتین. کاتێک کە ڕۆژی کردەوە، دوای ئەوەی نانوچای بەیانیمان خوارد، ماڵئاواییمان لە مەلا بەختیار کرد. ماڵئاوایی بەو جۆرەش ناخۆشە، من دەزانم چەندێک من دڵم تەنگ بوو و گوشرا، مەلا دوو هێندە. لەژێر پرووشەی بەفردا بەڕێ کەوتین، هێدی هێدی لە تەکیێ دوور کەوتینەوە و بەرەو قەراخ هەنگاومان نا.پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بکەم کە ئێمەش، ئەو کۆمەڵە هاوڕێیە، هەموو وەک یەک نەبووین و وەک یەک بیرمان نەدەکردەوە، هەر بۆیە، ئەگەرچی من بەناوی هەمووانەوە لەتەک مەلا بەختیاردا قسەم کرد و سەبارەت بەو پەیوەندییەی لە نێوانماندا هەبوو، خاڵێکم دانا، کەچی دواتر بەشێک لەو هاوڕێیانە سەرلەنوێ پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ مەلا گرێ ئەدەنەوە و لەنێو ئاڵای شۆڕشدا دەست بەکار دەکەن.ئەوەی شایانی گوتنە، پاش نزیکەی ۹ مانگێک لەو سەردانەی ئێمە، بە فەرمانی ئەڵقەیەکی چکۆلەی نێو یەکێتیی نیشتمانی، کە پێک هاتبوو لە جەلال تاڵەبانی، نەوشیروان مستەفا ئەمین، فەرەیدوون عەبدولقادر فەرەج، هێزێکی گەورە هەڵئەکوتنە سەر ئەو گوند و خانوو و ماڵەی کە ئێمە دواماڵئاواییمان لە مەلا لێی کرد، ئەڵقەیەکی گەورە بە چواردەوری ماڵەکەیدا پێک دەهێنن و لوولەی چەکەکانیان گشت ئاراستەی پنتێک دەکەن، ئەویش سەرکردەیەکی ماندووی خۆیانە، تەنها لەبەر ئەوەی وەک کوێخای دێ بیر ناکاتەوە، دەستبەسەری دەکەن و بۆ دیوەخانی پەلکێش دەکەن.

# دەوامی زانکۆ بە قاچاخ

سەفەری ڕووسیای سپی سەری نەگرت و جارێکی تر بۆ گوندی گوڵمکەوە گەڕامەوە.

ئەو دەمە ئیتر کۆتایی مفاوەزاتی نێوان حکوومەتی بەعس و یەکێتیی نیشتمانی بوو. ترسی ئەوە پەیدا بووەوە کە جەیش و جاش لە ناکاو هێرش بۆ سەر گوندەکان بکەن و تەوقی بکەن. فیرارەکان جاروبار ئەگەر دەنگۆیەک بڵاو ببوایەتەوە، دەمەو بەیان پێش ئەوەی دنیا ڕووناک بێتەوە، بۆ ئەو هەڵەتە ئەچوون .

جارێکیان لوقمانی برام و محەمەدی مام سەلام و کۆمەڵێک خەڵکی دیکەی ئاوایی لە ترسی هاتنی جەیش و جاش بۆ هەڵەتەکە چوون. بە منیشیان گوت، بەڵام من نەچووم و پێیانم وت، ئەگەر شتێک بوو، ئەوا ئەڵێم من تەلەبەم و بە میوانی هاتووم، چونکە من جاروبار ئەوێم بەجێ ئەهێشت و زۆر دیار نەبوو کە منیش هەڵاتووم.

ئیتر لوقمانی برام نۆکی خستە سەر ئاگر و وتی، ئاگاداریی بکە، کە گەڕاینەوە پێکەوە ئەیخۆین. لە ڕێگاش باسی ئەو نۆکەی بۆ محەمەد کردبوو. ئیتر دوای ئەوەی دنیا ڕوون بووەوە و مەترسی هاتنی جەیش و جاش نەما، لوقمان و محەمەد هاتنەوە.

ئەو ڕۆژانە زۆر سارد بوو، ئەوانیش بەو بەیانییە زووە بۆ ئەو دەشتودەرە چوونە و ڕێگایان کردووە، بۆیە زۆر برسییان بوو. وەلێ ئەوەی هێزی پێ بەخشیبوون و لەو حاڵەتی سەرما و برسێتییە ڕۆشناییەکی خستبووە دڵیانەوە ئەو نۆکە بوو. لە ڕێگاش لە سەرما و لە خۆشی ئەو نۆکە، هەر دەستیان لەیەک خشاندبوو.

من خەوم لێ کەوتبوو، ئاگام لە نۆک نەمابوو، لە ورتەورت و دەنگی پێی ئەوان بەخەبەر هاتم. لەگەڵ هاتنەژوورەوەی ئەوان و بەخەبەرهاتنی من، ئەوجا زانیمان نۆکەکە ئاوی لێ بڕاوە و سووتاوە. لەبەر بۆنی نۆکی سووتاو خۆت لەو

باڵەخانەیەدا نە دەگرت و ئەو بۆنە هەموو هیواکانی ئەوانی بە حەوادا برد و بێتاقەت بوون.

هەر لەو ماوەیەدا بوو، حکوومەتی عێراقی لێبووردنی گشتی دەرکرد. ژمارەیەکی زۆر لەوانەی لە خزمەتی سەربازی دواکەوتبوون یان هەڵهاتبوون گەڕانەوە و خۆیان تەسلیم کردەوە. منیش گەڕامەوە و چووم بۆ سەربازی و چەند مانگێک لە مەرکەز تەدریبی کەرکووک مەشقی سەربازیم کرد. مەبەستی من ئەوە بوو، بۆ سەربازی بچم و ناونیشانێکی هەڵە بدەم و لەو کاتەی کە سەرباز مەشقی سەربازی تەواو دەکات و بۆ یەکەکانی سەربازی نەقڵ دەکرێت، من نەچم و خۆم بشارمەوە. هەموو مەبەستەکەی منیش ئەوە بوو، بە بۆنەی منەوە یەخەی باوکم نەگرن و نەبمە مایەی کێشە و ناخۆشی بۆ ئەوان. چونکە کاتی خۆی کە پۆلیس هات پرسیاری منی کرد و من بەدەم تەبلیغی ئەوانەوە نەچووم و هەڵهاتم، باوکمیان زیندانی کرد. بە هەر حاڵ، خەڵکی پێی خۆش بوو هەر لە مەرکەزی تەدریب بمێنێتەوە و نەقڵ نەکرێت، چونکە ئەو دەمە هێشتا ئاگری شەڕ بڵێسەی ئەدا و ڕۆژانە بە دەیان و بە سەدان ئینسانی تێدا دەبرژان و دەسووتان. وەلێ من خۆم دەچووم داوای نەقڵم لێیان دەکرد، بۆ ئەوەی هەر وەکوو وتم، لەدوای نەقڵ ناوم گوم بێت و منیش خۆم دابڕێنم.

لەو کاتانەدا بوو، دەنگۆی گەڕانەوەی خوێندکارە فەسڵکراوەکانی وەکوو من بڵاو بووەوە، قەراری نەقڵیشم بۆ باشووری عێراق و بۆ بەسرە بۆ دەرچوو. زۆرم پێ خۆش بوو، وازم لە سەربازی هێنا و ئەو لاپەڕەیەی نێو دەفتەری خزمەتی سەربازییەکەم کە مۆر کراوە و تێیدا پەیوەندی من بە خزمەتی سەربازییەوە دەرئەخات، لێ کردەوە و لاپەڕەیەکی دیکەم لەشوێن دانا. دانانی لاپەڕەیەکیش بۆ ئەو جۆرە دەفتەرانە هەر وا سانا نەبوو. چونکە دەفتەری خزمەتی سەربازی هەتا پێش موالیدی من زۆر سادە بوو، بە ئاسانی کۆپی و تەزویر دەکرا، وەلێ لە موالیدی منەوە، گەلێک زەحمەت بوو، چونکە لاپەڕەکانی ڕەنگاوڕەنگ و پڕ لە نەخش و زەخرەفەی دیار و نادیاربوون و لە سەرەوەی هەر لاپەڕەیەکیشدا

ژمارەی دەفتەرەکەی بەسەرەوە بوو کە ژمارەیەکی دوورودرێژ و بە شێوازی کونکونکراو دروست کرابوو.دەوامی خوێندنی ساڵی ١٩٨٥-١٩٨٦ دەستی پێ کرد. ناوی منیش لەنێو ئەو ناوانەدایە کە بڕیاری گەڕانەوەیان بۆ خوێندن بۆ دەرچووە .

منیش زۆر بەسووک و سانایی چوومەوە بۆ زانکۆ و دەستم بە دەوام کردەوە و جارێکی دی بوومەوە بە تەلەبە و بە نیاز بووم لە کوێ پچڕا بوو، لەوێ گرێی بدەمەوە.

هێشتا هەر لە سەرەتای دەوامدا بووین، ڕۆژێکیان لە موختەبەر بووم، خەریکی تاقیکردنەوەیەکی فیزیایی بووم، لە فەرمانگەی کاروباری خوێندکاران (شؤون الطلبة)ی کۆلێجەوە داوامیان کرد و ڕۆییشتم. ئەو فەرمانبەرەی ئیشەکەی منی لەلا بوو، ناوی ئەحمەد بوو، بە ڕەگەز میسری بوو. ئەحمەد داوای دەفتەری خزمەتی سەربازییەکەی لێم کرد. منیش لە گیرفانم دەرم هێنا و دامە دەستی. ئەحمەد لاپەڕە بەلاپەڕەی دەفتەرەکەی هەڵدایەوە، زۆر دیقەتی دا و لێی ورد بووەوە. پاشان ڕووی تێم کرد و گوتی: تۆ چەند دەفتەری خزمەتی سەربازیت هەیە؟ منیش لە وەڵامدا گوتم: هەر یەک دانە! وتی: باشە، بڕۆ! ئێستا ڕاگری کۆلێج، دکتۆر عەبدولڕەزاق لێرە نییە، هەر کاتێک هاتەوە ئەنێرین بەدواتدا و وەرە لەگەڵ ئەودا قسە بکە! منیش گوتم: زۆر باشە!

دوای ئەوە چوومەوە بۆ موختەبەر، کەلوپەلەکانم کۆ کردەوە و بەپەلە کۆلێجم بەجێ هێشت. زانیم هەموو شتێک ئاشکرا بووە و گشت زانیارییەکیان لەلا هەیە. ئەو دکتۆر عەبدولڕەزاقەش بەعسییەکی زۆر پیس بوو، بێگومان بەگرتی ئەدام. ئەو کابرایە لە خۆپیشاندانەکانی ساڵی ١٩٨٢ی زانکۆ، من خۆم چاوم تێوە بوو، بە کلاشینکۆفێکەوە دەستڕێژی لە خۆپیشاندەران دەکرد .

ئەو دەمە لەگەڵ چەند برادەرێک (خالید ئەحمەد، خالید محەمەد فاتیح، خۆشناو جەمال جەلال، سادق کەریم (ڕاستگۆ)، عەزەدین مەجید محەمەد)دا شوقەیەکمان بەکرێ گرتبوو. سادقی لێ دەرچێت، ئەوانی دیکە هەموو دەوامی زانکۆیان دەکرد. دوای ئەوەی بەپەلە کۆلێجم بەجێ هێشت، یەکسەر گەڕامەوە بۆ ئەو شوقەیە و ئیتر جارێکی تر وازم لە خوێندن هێنا و بە یەکجاری فەسڵ بووم. ئەو ساڵەم لەو

شوقەیە لەگەڵ ئەو برادەرانەدا بەسەر برد.ئەو شوقەیە نزیکی کۆلێجی ئیدارە بوو، خاوەنەکەی حاجییەکی بەتەمەن بوو، پێیان دەگوت: حاجی زڕە. جارێکیان کارەباکەمان شۆرتی کرد، چووم لە دەرگای ماڵی حاجیم دا کە ماڵەکەی هەر بە تەنیشت خۆمانەوە بوو، وتم، مام حاجی کارەباکەمان شۆرتی کردووە، بەڵکوو بتوانی چەند تەڵیک تێلی فیووزم بۆ بهێنی. دوای ئەوە من چوومە سەرەوە بۆ شوقەکە و پاش قەدەرێک حاجی هات و چەند تەڵێک تێلی لەگەڵ خۆیدا هێنا. کە سەیری تێلەکەم کرد، زۆر ئەستوور بوو، وتم: مام حاجی ئەو تێلە بۆ فیووز نابێت، زۆر ئەستوورە! حاجی ڕووی لێم کرد و گوتی: نا کوڕم ئەستووری باشە!

مام حاجی هەر کاتێک پێی بگەییشتینایە، ئەحواڵمان دەپرسی و دەمانگوت: مام حاجی کووی؟ ئەویش لە وەڵامدا هەر ئەوەندەی دەگوت: وەڵا باشم! ئیتر نە سوپاسێکی ئەکردین و نە ئەوەتا ئەویش لە بەرامبەردا بڵێت، ئەی کوڕم ئێوە چۆنن!

بێگومان، بۆیە فیووز بۆ کارەبا دادەنرێ، بۆ ئەوەی ئەگەر سارد و گەرمی کارەبا لە یەکی دا، یان لۆدێکی زیاتر لە توانای خۆی کەوتە سەر، تێلی فیووزەکە بپچڕێ کە لاوازترین خاڵی سووڕی کارەباکەیە، ئەگەر نا، ئەوا لە شوێنێکەوە وایەرەکە ئەپسێ و تووشی زیان و سەریەشەت ئەکات. واتە، ئەگەر لە بری تێلێکی باریک، تێلێکی ئەستوور بۆ فیووزەکە دابنێی، ئەوا ئەو هێڵی کارەبایە، وەک ئەوە وایە، فیووزی هەر نەبێت.

ئیتر لەدوای ئەو ڕووداوەوە هەر بە قاچاخی و بە ناسنامەی تەزویر ڕۆژگارم بەسەرم برد و لە سەرەتادا و هەتا ماوەیەک هەر بە ناسنامەی زانکۆ کارم چووە ڕێوە، پاشان دەفتەری خزمەتی سەربازییەکەم دەستکاری کرد.

هەر لەو ساڵەدا بوو، لە دڵی خۆمدا گوتم، باشە من وەختم زۆرە، بۆ نەچم مۆڵەتی شۆفێری دەربکەم. هەر بەو قاچاخییە بۆ بەڕێوەبەرایەتیی هاتوچۆی هەولێر ڕۆییشتم، فۆرمم پڕ کردەوە و هەرچییەکی پێویست بوو هەنگاو لەدوای هەنگاو تەواوم کرد. یەکێک لە پێویستییەکان، پشکنینی پزیشکی بوو، ئەو دەمە تازە پشکنینی ڕەنگەکانی چاو پەیدا ببوو، منیش لە ڕەنگەکاندا کێشەم هەبوو، بۆیە کاتێک بۆ ئەو پشکنینە چووم، زۆر قەلەق بووم.

کاتی خۆی من هەستم بەو کێشەیە نەدەکرد، هەتا ئەو دەمەی بەکەلۆری شەشی ئامادەییم تەواو کرد. ئەو کاتە پشکنینیان بۆم کرد و پاشان نامەیەکیان پێم دا کە بۆ بەغدا بچم. چوومە بەغدا و لەوێ پشکنینیان بۆم کرد و نامەیەکیان پێم دا و هێنامەوە. نامەکەم کردەوە و خوێندمەوە، لێی نووسرابوو کە کێشەی ڕەنگەکانم هەیە. نامەکەم بۆ ئیدارە برد، مامۆستا چالاکی لێ بوو. مامۆستا چالاک نامەکەی خوێندەوە و لە کێشەکە حاڵی بوو. خاولییەکی میل میلی ڕەنگاوڕەنگ لە ژووری ئیدارە بوو، چوو هێنای و کەوتە پرسیارکردن لێم: ئەوە چ ڕەنگێکە؟ ئەی ئەوە ... ئەی ئەوە؟ سەرەنجام وتی: ڕۆڵە تۆ نەک هەر کێشەت لە ڕەنگەکاندا هەیە، بەڵکوو جێگیریش نیت! یانی هەر جارەی بەجۆرێک ئەیانبینی.

ئەو پشکنینە لەو کاتەدا بۆ ئەوە بوو، ئەگەر کەسێک ئەو کێشەیەی هەبووایە، ئەوا لە هەندێک کۆلێجی وەکوو کیمیا و پزیشکی ... قبووڵ نەدەکرا.

بە هەر حاڵ! بۆ پشکنینی پزیشکی بۆ مۆڵەتی شۆفێری چووم. ئەو کاتە ئەو پشکنینە لە کلینیکێک لە نزیک پارێزگای هەولێر و بەرامبەر بە سینەمای سەلاحەدین دەکرا. چووم لە بەردەم ئەو ژوورەی پشکنینەکەی لێ دەکرا، ڕاوەستام و خەڵکی تریشی لێ بوو، بەڵام زۆر قەلەق بووم. ئەوەندەم زانی یەکێک کە پشکنینەکەی تەواو کردبوو، هاتە دەرەوە. منیش بەپەلە چووم بۆ لای و پرسیارم لێی کرد: ئەرێ کاکە، ئەو پشکنینە چۆنە؟ کابرا کە بۆخۆی ئەو کێشەیەی نەبوو و هەر نەیدەزانی ئەوە چییە و بۆ چییە، وتی: کوڕە بابم چ نییە، مارمارۆکەیەکە و دەستی بەسەردا دەهێنی، ئەوە لۆ ئەوەیە، بزانن لە ڕێگا کوو دەئاژۆی! منیش کە زەندەقم چووبوو، لە دڵی خۆمدا گوتم: ئاخر من لەو مارمارۆکەیەی دەترسم!

نۆرەم هات و چوومە ژوورەوە، دکتۆر دەفتەری ڕەنگەکانی بۆم هێنا و دەستی کردە پرسیارکردن. لاپەڕە بەلاپەڕەی هەڵدایەوە و پرسیاری ئەو ژمارانەی دەکرد کە بە تێکەڵێک لە ڕەنگ نووسراونەتەوە، هەندێکیانم زانی و هەندێکیانم نەزانی. ئینجا لاپەڕەی مارمارۆکەکەی هەڵدایەوە و وتی بە پەنجە بەسەریدا بڕۆ! هەندێ

بەسەریدا ڕۆییشتم و لە نیوەدا لێم گوم بوو ... سەرەنجام وتی: تۆ موستەحەق نیت لە بۆ ئیجازەی، بەران قەیدی نییە، برۆ ناجیح!

دوای ئەوەی جەنگی عێراق و ئێران تەواو بوو، لێبووردنی گشتی دەرچوو، کە لەگەڵیدا تەسریحیش دەکرایت، منیش ئەو دەمە چووم خۆم تەسریح کرد. بەڵام زۆری نەبرد، موالیدەکان بە هیی منیشەوە هەمدیسان داوا کرانەوە. جارێکی دیکە من نەچوومە پێشەوە و ئینجا دەفتەری خزمەتی سەربازییەکەم بە هۆکاری تەندروستی (ئەسباب سحی) و بە لیژنەی شەرحەبیل پڕ کردەوە.

لیژنەی شەرحەبیل، لیژنەیەکی سەربازیی پزیشکی بوو، کەوتبووە نێو سەربازگەی ڕەشید لە شاری بەغدا. ئەم لیژنەیە بەهێزترین لیژنە بوو بۆ پشکنینی ئەو کەسانەی کێشەی تەندروستییان هەبوو، تاوەکوو بڕیار بدەن ئاخۆ بە کەڵکی خزمەتی سەربازی دێن، وە یان نا. ئەم لیژنەیە زۆر سەختگیر بوو، هەر وا بەسانایی وازیان لێت نەدەهێنا و هەر وا بەسووکی بڕیاریان نەدەدا .

هەر بۆ خۆشی و بۆ شۆخی ناوی هاوڕێیەک (ڕەحمان داود)م خستبووە نێو ئەندامانی ئەو لیژنەیەوە و نووسیبووم: "المقدم عبدالرحمن داود سلیمان" و واژۆیەکیشم لەسەر ناوەکەی کرد بوو. جاروباریش پیشانی خۆیم ئەدا و پێم ئەگوت: جەنابی ئەفسەر! مەمنوونم کە ڕەزامەندیت لەسەر بەخشینم لە خزمەتی سەربازی دەربڕیوە. ئەویش پێ ئەکەنی ...

سەردەمانێک دیسانەوە کەوتنەوە ناو خەڵک و دەستیان کردەوە بە گرتنی خەڵکی بۆ جەیشی شەعبی. ئەو دەمە ماڵمان لە ڕەشیداوا بوو، لە ترسی ئەوە، ئەگەر لە دەرگا بدرایە هەر "فاتمە"ی هاوسەرم دەچوو، دەرگای دەکردەوە، قەت خۆم نەئەچووم. جارێکیان لە دەرگا درا، وا ڕێکەوت و بەناچاری خۆم چووم دەرگام کردەوە، کە دەرگام کردەوە، چیم بینی؟ مەسئوول مەنتیقەی شۆڕیجە، موختاری گەڕەک و چەند زرتەبۆزێکی دیکە، بە بەرگی قتعەتێنی زەیتوونیی ڕەفیق حیزبییەکانەوە، لە بەردەرگامان کۆمەڵەیان کردووە، سڵاویان لێم کرد، منیش وەڵامم دانەوە.

وتم: فەرمووون؟

وتیان: هاتووین ناوت بۆ جەیشی شەعبی بنووسین .

وتم: جەیشی شەعبی من ناگریتەوە، من بە هۆکاری تەندروستی لە خزمەتی سەربازی عەفوو کراوم و هیچ کاریکی سەربازی بۆ من نییە.

وتیان: باشە، بچۆ دەفتەری خزمەتی سەربازییەکەتمان بۆ بهێنە!

چوومە ژوورەوە، دەفتەرەکەم هێنا و ئەو لاپەڕەیەم پیشان دان کە بە لیژنەی شەرحەبیل لە خزمەتی سەربازی تەسریح کراوم.

دەفتەرەکەیان لێم وەرگرت و ئەو لاپەڕەیەیان خوێندەوە کە بڕیاری ئەو لیژنەیە و هۆکاری تەسریحەکەمی تێدایە. دوای ئەوە لاپەڕەکانی دیکەیان ئەمدیو و ئەودیو کرد، سەیرێکی یەکترییان کرد و هیچ قسەیەکیان بۆ نەمایەوە، دەفتەرەکەیان دایەوە دەستم. من لەناوەوە تووشی دڵەڕاوکێ هاتبووم، وەلی کۆنترۆڵی خۆمم بەباشی کردبوو، لە دڵی خۆمدا ئەمگوت: من ئامادە نیم سەربازی بکەم، کەچی داوای جەیشی شەعبیم لێ دەکەن. من فەرزەکە بەجێ ناگەیەنم، کەچی داوای سونەتم لێ دەکەن!

دوای ئەوەی دەفتەرەکەیان دایەوە دەستم، خوداحافیزیم لێیان کرد و من ئەوانم بەجێ هێشت.

لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەو هەموو کەڵە بەعسییە، ئەوەندە لەو دەفتەرەی من وردبوونەوە، کەچی هەستیان بەو تەزویرە نەکرد، کەواتە: تەزویرەکە پێرفێکتە و کوتومت وەکوو ئەسڵییەکە دروست کراوە.

ئەو ڕۆژگارە زۆر بەسووکی لاوانیان لە نێوگەڕەک و کووچە و شەقامەکاندا گولەباران دەکرد. خۆ ئەگەر ئەو تەزویرەم لەسەر ئاشکرا ببووایە، ئەوا دوای ئەوەی هەلاهەلایان دەکردم، حەوت جاریش لەداریان ئەدام.

# نەوزاد فەتحوڵا و ژیانی پارتیزانی

پاش ئەوەی لەگەڵ ئەحمەد خورشید چووین بۆلای نەوزاد بە چەند مانگێک، دانووستانی نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و حکوومەتی بەعس کۆتایی پێ هات و شەڕ دەستی پێ کردەوە. نەوزاد فەتحوڵا عەبدولڕەزاق (شەهید هیوا) هەر وەکوو چۆن لە شار و لە بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی ڕێکخستن ئازا و بوێر بوو، لە شاخ و ژیانی پێشمەرگایەتیشدا هەر وا بوو. هەر وەکوو هاوڕێکانی دەیگێڕنەوە، نەوزاد لەژیانی پێشمەرگایەتیدا، جگە لەوەی کادرێکی سیاسی بوو، لەهەمان کاتدا کادرێکی سەربازیش بووە و یەکێک بووە لەو فەرماندانەی کە نەخشەی شەڕەکانی دەکێشا. ئەگەرچی کادری ڕێکخستن نەدەبوو لە دەستەی هجووم بێت، وەلی ئەو هەمیشە خۆی لەو دەستەیە دادەنا و پارتیزانێکی زۆر بوێر و بەهەڵمەت بووە.

خالید محەمەد ئەمین (عەبدولخالق) کە یەکێکە لە هاوڕێکانی سەردەمی پێشمەرگایەتیی نەوزاد، لە یەکێک لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێت:

"لە ڕێکەوتی مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٨٥ لە داستانی دۆڵی ئاکۆیان، تیپی ٢٥ی خاڵخالان پێنج ڕەبیەی بۆ دانرا کە هێرش بکاتە سەری و بیگرێت، ئەو ڕەبیەی کە بۆ هاوڕێ هیوا و هاوڕێ دلێرە سوور و چەند برادەرێکی دیکە دانرابوو، گرتنی سەخت بوو، تەنانەت دەلیلەکەشیان گوتبووی، ئەو ڕەبیە ناگیرێ با وازی لێ بهێنین! وەلی هیوا دەڵێت: ئەگەر هەمووشمان شەهید بووینە، دەبێ هەر بیگرین! بەڵام دەلیلەکە و ئەوانی تر هەر سوور بوون لەسەر ئەوەی کە ناگیرێ ... بۆیە هیوا و دلێر هەرچی نارنجۆک هەیە، لەوانی تری وەردەگرن و بە هەردووکیانەوە بۆ گرتنی دەچن. دوای ئەوە ئەڕۆن بە نارنجۆک هێرش دەکەنە سەر ڕەبیەکە و دەیگرن و ٨ جاشی تێدا دەبێت، بە دیلیان دەگرن و چەکەکانیان دەهێنن!"

هەروەها خالید چیرۆکی گیان لەدەستدانی نەوزاد دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

"دوای ئەوەی تیپەکەمان ئەرکی پارێزگاریی سەرکردایەتی تەواو کرد و بۆ سنوورەکەی خۆی گەڕایەوە، بە شێک لە پێشمەرگەکان، بە تایبەتی پێشمەرگە خێزاندارەکان، مۆڵەتیان پێ درا و کاکە "هیوا"ش یە کێک بوو لەوان. ئینجا تیپەکەمان پێی باش بوو، لەدوای ئەوەی چەند مانگێک بوو لە ناوچەکە دوور کەوتبووینەوە، چالاکییەک ئەنجام بدەین، ئەویش گرتنی چەند ڕەبیەیەک لە دەوروبەری ئاغجەلەر و تەوەکەڵ بوو.

کاتێک کەرتەکانمان لە ئێوارەی ١٩٨٦/٥/٢٧ لە گوندی کانی هەنجیری گوڵان کۆبوونەوە، تاوەکوو بۆ نانی ئێوارە دابەش بن، بینیمان کاکە "هیوا"ش لەوێیە! لەدوای سڵاو و چاکوچۆنی وتمان: کاکە هیوا! ئەوە تۆ بۆ هاتوویتەوە، خۆ جاری مۆڵەتەکەت تەواو نەبووە؟! وتی: بیستم بەنیازی چالاکین، بۆیە هاتمەوە، چۆن ئەبێت ئێوە بڕۆن چالاکی بکەن، منیش لەماڵەوە بم!

ئیتر چووین نانمان خوارد و دوای ئەوە بۆ گوندی شێخ پاڵەوان کەوتینە ڕێ. لەوێ تەشکیلەمان ئەکرد، پشتیوان حەسەن فەقیانە هات و بە مامۆستا "عادیل شەریف"ی وت: پێشمەرگەیەکم ئەوێ بۆ دەستەی هجووم، مامۆستا "عادیل"یش وتی: باشە با کاک هیوا بێتە لای ئێوە و عەول واتە، بەندە لە جێی کاک هیوا دادەنێم. ئیتر منی لە جێگای کاک هیوا دانا و ڕەتڵی یەک بە سەرپەرشتیی پشتیوان بۆ ڕەبییەکانی تەوەکەڵ و پشت گوندی شێخ پاڵەوان بەڕێ کەوتن و کاک هیوا لەپێش ڕەتڵەکەوە بوو. ڕەتڵی دوو، کەرتی یەک کە بۆ ڕەبیەکانی قەیماسە بەڕێ کەوتین، کاک مەهدی و مامۆستا عادیل سەرپەرشتییان ئەکرد. ڕەتڵی یەک دەبوو زووتر بڕوات، ڕێگایان دوورتر بوو. ئێمە لە گوندەکە دەرچووین، گەییشتینە سەر جادە قیرەکە، ڕەتڵی یەک کەوتنە نێو بۆسەی جاشەکانەوە و تەقە دەستی پێ کرد. کاک هیوا بریندار بوو، یەکسەر کاک محەمەد ناڕووجەیی کاک هیوای بە کۆڵ هەڵگرت و لەگەڵ هاوڕێیان کاک هیوایان هێنابووە نێو گوندی شێخ پاڵەوان. من و کاک عەلی و شەهید عوسمان بچکۆل پێکەوە بۆ گوندەکە گەڕاینەوە، شەهید عەلی باوەفەتی هات وتی: ئەوە نازانن کاک هیوا بریندارە؟ وتمان: نەخێر ئاگامان لێ نییە! ئەی برینەکەی چۆنە؟ لە کوێیە؟ وتی: ئەوەتا لەپشت ماڵەکان دایان ناوە. چووین بۆ لای و بینیمان کە هیلاکە. من بە مامۆستا "عادیل"م وت: ئەرێ کاکە! بۆ کاک هیوا چیتان کردووە؟ وتی: هەر ئێستا ئەیخەینە سەر گوێدرێژێک و بۆ کانیی هەنجیری ئەبەین. بەڵێ! خستمانە سەر گوێدرێژێک و بەرەو کانی هەنجیر بەڕێ کەوتین، کە گە یشتینە ئەوێ، شەهید دکتۆر هادی لەوێ برینەکەی پێچا و وتی: خێرا بیگەیەننە سوورقاوشان! نەیانهێشت من لەگەڵیدا بچم، کاک عەلی و شەهید عوسمان بچکۆل لەگەڵیدا ڕۆیشتن، بەڵام بەداخەوە لەسەر پردەکەی سوورقاوشان، بۆ دواجار چاوی لێک نا و بەجێی هێشتین."

## مامۆستا قادر و ڕێکخراوی کەرکووك
## لەدوای ئێمە

کاتی خۆی، بەرلەوەی ئێمە واز لە کۆمەڵە بهێنین، لە کۆبوونەوەیەک لە کۆبوونەوەکانی ڕێکخراوی کەرکووک، مامۆستا قادر تەرحی ئەوەی کرد، بەرپرسی ئەو خەتەی ڕێکخستنەکانمان لە شارۆچکەی چەمچەماڵ (سامان ئەحمەد) بۆ ڕێکخراو ئیزافە بکەین. بەڵام من ئەوەم پێ باش نەبوو، بۆیە بە مامۆستام گوت: بەرپرسی ئەو خەتە هەتا ئێستا پەیوەندی بە خۆتەوە هەبووە، وا چاکترە هەر بەو شێوەیە بمێنێتەوە، چونکە ئیزافەکردنی ئەندامێکی دیکە بۆ ڕێکخراو هیچ زەرورەتێکی نییە، ئەمە سەرباری ئەوەی ئێمە شارەزاییمان بەو کەسە نییە.[٢٤٧]

کاتی خۆی، لەو دەمەی ئێمە "کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک"مان دروست کردەوە، عەلی بچکۆل (عەلی محەمەد قادر) پێشنیاری ئەم "سامان ئەحمەد"ەی کردووە کە ئەویش یەکێک بێت لە ئەندامانی کۆمیتەکە،[٢٤٨] بەڵام ئەو دەمە بە هەر هۆیەکەوە بێت، ئەوە نەکراوە.[٢٤٩] لەدوای وازهێنانی ئێمە، مامۆستا قادر لە ڕێکخراوی کەرکووک بە تەنها دەمێنێتەوە. وەلێ پێ دەچێت، دواتر ئارایشێکی نوێی بە ڕێکخراو دابێتەوە و چەند کەسێکی تری بۆ ئیزافە کردبێت، ئەو کەسانەش ڕەنگبێ مامۆستا شێرزاد حوسێن محەمەد و مامۆستا ڕەئووف عەبدولڕەزاق ساڵح و ئەو "سامان"ە بووبێت. لەدوای زیاتر لە دوو ساڵ و لە ڕێکەوتی ١٩٨٦/٩/١٠دا مامۆستا قادر لە ماڵەکەی خۆی دەگیرێ. لە هەمان کاتدا مامۆستا شێرزاد و مامۆستا ڕەئووف کە لە سەربازگەی دبس جەیشی شەعبی دەبن دەگیرێن.

---

٢٤٧. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز تەحسین نامیق عەبدوڵا.

٢٤٨. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز ئەحمەد کرێکار (حەمە کەریم عەلی ڕەزا).

٢٤٩. ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت، چونکە کاتێک من پێشنیاری کەرتی شەهید سیروانم کرد کە لە پێکهێنانەوەی ڕێکخراوی کەرکووکدا بەشداری بکات و بەو پێیەش بەرپرسی ئەو کەرتە هاتە ناو کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووکەوە، ئیتر زەرورەتی ئەوە نەما کە "سامان"یش بهێنین.

سامان ئەحمەد کە لە لووتکەی هەرەمی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک بووە، زوانگیڕ و خەوەردزی دەستگا ئەمنییەکانی شاری کەرکووک بووە و هەر زانیارییەکی چنگ کەوتبێت، بۆ دەستگا ئەمنییەکانی گواستووەتەوە.

تۆ بڕوانە، چ کارەساتێکە! دەستگا ئەمنییەکانی شار بتوانن لەنێو بەرزترین ئاستی ڕێکخستنەکانی تۆ کنە بکەن و جاسووسێک بچێنن!

ئەوەی شایانی گوتنە، لە یەکێک لە پشووەکانی نێو کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵەدا، بەڕێکەوت چاوم لە مامۆستا قادر گیر بوو، لەبەردەم سەکۆی ساباتەکە لەگەڵ مامۆستا شێرزاد و مامۆستا ڕئووف ڕاوەستان و پێکەوە وێنەیان گرت! دیارە مامۆستا قادر و هاوڕێکانی بە ڕووپۆشەوە وێنەیان گرت، وەلێ من لە نێویاندا مامۆستا قادرم بە جلوبەرگ و قەد و قامەتیدا ناسییەوە. هەر ئەو دەمە دڵم خورپەیەکی کرد و لە دڵی خۆمەوە بە کارێکی هەڵە و خراپم زانی.

جا کاتێک مامۆستا قادر و هاوڕێکانی ئاشکرا دەبن و دەگیرێن، ئەو وێنانە لە بەردەستی دەستگا ئەمنییەکانی شاری کەرکووکدا دەبن و دەبنە بەڵگەی حاشاهەڵنەگر لەسەریان کە ئەوان بەشداریی کۆنفرانسیان کردووە و دەبنە یەکێک لەو بەڵگانەی، ئەوانی بە پەتی سێدارە گەیاند. سامان ئەحمەد بە هۆی ئەو کارانەیەوە کە بۆ دەستگا ئەمنییەکانی شاری کەرکووک ئەنجامی دابوو، لەدوای ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستان لە ساڵی ١٩٩١ دەکوژرێت.[٢٥٠]

ڕۆژێکیان و لەم دواییانەدا، لەگەڵ تەحسین نامیق کەوتینە سەر باسی ئەو مێژووە و باسی ئەو ڕۆژگارەمان کرد. تەحسین وتی: هەموو جارێک ئەڵێم، ئەگەر کاک ساڵح (سالار ڕەشید) نەبووایە، ئێستا ئێمەش وەکوو مامۆستا قادر و ئەوان لە سێدارە درابووین و نەمابووین، چونکە تۆ نەتهێشت مامۆستا قادر ئەو سامانە بهێنێتە ناو کۆمیتەی ڕێکخراوەوە.

ئەو دەمەی مامۆستا قادر و هاوڕێکانی گیران، من لە شارۆچکەی حەویجە لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێی دیکە خەریکی ئیشی کرێکاری بووم و هەفتەی جارێک بۆ

---

٢٥٠. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز فەرهاد ئەحمەد کرێکار.

کەرکووک دەگەڕامەوە. بەڵام کاتێک ئەو هەواڵەم بیست، ئیدی هەتا بەینێک بۆ ماڵ نەگەڕامەوە. دوای ئەوەی ئیشەکەمان لە حەویجە تەواو بوو، چووومە شاری مووسڵ و ماوەیەک لەلای عیسام نامیق (دکتۆر) و هاوڕێکانی خۆم پەنا دا. ئەو دەمە ئەوان هێشتا خوێندکار بوون و لە شوقەیەکدا دەژیان.

مامۆستا قادر و هاوڕێکانی زۆر قارەمانانە لە هەمبەر ئەشکەنجەی نامرۆڤانەی بەعسییەکان خۆیان گرت و نهێنییەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردە ژێر گڵەوە.

سەرەنجام مامۆستا قادر و هاوڕێکانی لە ڕێکەوتی ١٩٨٧/١/١٥ حوکمی ئیعدامیان بەسەردا ئەدرێ و لە ڕیکەوتی ١٩٨٧/٦/١٧ لە زیندانی ئەبووغرێب حوکمەکەیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت.

# ئیبراهیم شەهید دەبێت

کۆتـایی سـاڵی ١٩٨٨ و لەپـاش شـاڵاوی ئەنفالەکـان سـەختترین هەلـومەرج بـۆ نەیـارانی حکوومەتی عێراقی و کـاری پێشـمەرگانە لە کوردسـتاندا هـاتبووە ئاراوە. گوندەکان کە سەرچاوەی پێویستییەکانی کاری پارتیزانی بوون، هەر هەموو لەگەڵ زەوی تەخت کرابوون و هیچیان بەپێوە نەمابوون. دانیشتووانەکەی ئەنفال کرابـوون و هـیچ ئـاوەدانییەک نەمـابوو. لە نـاوچەی سـاڵەیی، شـوان، شـێخبزێنی، خاڵخـاڵان، قەڵاسـێوکە و سـوورداش تەنهـا یەک هێزی پێشـمەرگە مـابووەوە کە تـاکە هـۆیەکی پەیوەندییان بێتەلێک بـوو، هەواڵ و دەنگوباسـیان لەگەڵ سـەرکردایەتی و بە تـایبەتی لەگەڵ نەوشـیروان مسـتەفا پـێ دەگـۆڕییەوە و ڕێنوێنییـان لێـوە وەردەگـرت، ئیتـر پەیوەندییان بەهیچ شوێنێکی دیکەوە نەمابوو.

خـواردنی ئەو هێـزە، ئەو زەخیرانە بـوو کە گوندنشینەکان لەپاش خۆیـان لێیـان بەجێ مـابوو. بەو هـۆیەوە ئەو پێشـمەرگانە کێشـەی خواردنیـان چارەسـەر کردبـوو. خواردنەکانیان دەخستە نێو بەرمیل و لەژێر زەوی دەیانشـاردەوە. جگە لە ئاردەکە کە ئەسپێ لێی ئەدا، بۆ بـاقی شـتەکانی دی تەگبیرێکی بـاش بـوو. ڕۆژانە خـواردنی هەر یەکە سـێ نانسـاجی بـوو، هەر دانەیەک بـۆ ژەمێکـی خـواردن، جارجـارەش برنجێکی سوور، یان ساوەرێکی سوور بوو.

لە مـانگی ئەیلـوولی ئەو سـاڵەدا، پێشـمەرگەیەکی زۆر کە نـزیکەی ٧٠ کەسـێک دەبن، بەهۆی سەختیی کاری پێشـمەرگایەتییەوە و بە ڕاوێژ لەگەڵ سـەرکردایەتی و بەڕەزامەندیی ئەوان، فرسەت لە عافواتێکی ئەو دەمە وەردەگرن و خۆیـان ڕادەسـتی حکوومەت دەکەنەوە. سەرئەنجام ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها ٣٤ پێشمەرگەیەک دەبن.

جارێکیان یەکێک لەو پێشمەرگانەی کە تەسلیم بووەتەوە، ئەیەوێت هەندێک نـامە و هەواڵ لە ڕێکخسـتنەکانی شـارەوە بگەیەنێتە ئەم هێـزە. بـۆ ئەو مەبەسـتە قەرار ئەکەن لە گوندی "جگیلە" لە ناوچەی شێخبزێنی چاویان بە یەکتری بکەوێت.

فەرماندەی ئەم هێزە کە نێوی "یەکە"یان لێ نابوو، سیروانی کوێخا نەجم بوو. ئەم هێزە لە گوندی فەقێ میرزاوە بەرەو کاریزەی بناری خاڵخالان جووڵە دەکات و دەیەوێت لەوێشەوە بەرەو گوندی جگیلە بۆ ئەو مەوعیدە بڕوات. وەلێ بەهۆی ئەوەی دوو هاوڕێیان: فاتیح عەبدوڵا عەلی (کاروان دووبزی) و خەیروڵا سەعید محەمەد (جووتیار کەرکووکی) نەخۆش دەبن و مەلاریا هێز و بڕستی لێ بڕیبوون، ئەو ڕێگایەش کە لەبەردەمیاندا بوو، دوور و سەخت بوو، بڕیار ئەدەن ئەو دوو نەخۆشە لە پەناگەیەکی خوار گوندی کاریزە لە دۆڵی گورگان دابنێن و چوار هاوڕێی دیکەشیان بۆ کۆمەک و پاریزگاری لەگەڵدا بهێڵنەوە کە بریتیبوون لە: ئیبراهیم ئەحمەد خدر (سەرکەوت)، ڕەمەزان محەمەد ساڵح (پۆڵا هەیبەیی)، محەمەد مستەفا حوسێن (حەمە سەقەڕ)، نیزام محەمەد ئیبراهیم.

ئەم شەش کەسە بەرەو ئەو پەناگەیە دەکەونە ڕێ و دەمەو ئێوارە دەگەنە جێ. بۆ ڕۆژی دوای ئەوە کە دەکاتە ڕێکەوتی ١٩٨٨/١١/١٤ و دوای ئەوەی ڕۆژ دەکاتەوە، لە چێشتەنگاوێکی ڕۆژێکی زستانەی زۆر سارددا، زەوی سەرتاپا زقووم گرتوویەتی، نیزام کە نیگاهبان دەبێت، لە ناکاوێکدا ئەدرێتە بەر دەستڕێژی گولە، وەلێ ناپێکرێ و بەپەلە خۆی دەگەیەنێتە هاوڕێکانی و ئاگاداریان دەکاتەوە. ئەوانیش هەر ئەوەندە فریا دەکەون، تەنها تاخم و تفەنگەکانیان دەست پێ بدەن و دەرکەون، تەنانەت ڕادیۆ و کیسەخەوەکانیشیان بەجێ دەهێڵن. چوار کەسیان بە دۆڵەکەدا دەچنە خوارەوە و دواتر دوو نەخۆشەکەش بەدوویان دەکەون. دۆڵەکە لە پڕێکدا دەبێتە دوو پەلەوە، جووتیار پەلی لای ڕاست دەگرێت کە بە هەورازێک دەست پێ دەکات، بە "کاروان"یش دەڵێت، من شارەزام و دووی من بکەوە، وەلێ کاروان بەهۆی ئەوەی نەخۆشی پرزەی لێ بڕیوە، ناتوانێت خۆی لەو هەورازە بدات. پاشان بە هۆی ئەوەی گەلە سەگێک دەکەونە دوای چوار هاوڕێکەی دیکەی، لێی مەعلووم دەبێت کە ئەوان بەوێدا ڕۆییشتوون، بۆیە ئەمیش هەر بەوێدا و بە دووی ئەواندا دەڕوات. ئیدی جووتیار لەوان دادەبڕێ و شوێنبزر دەبێت و کەس نازانێت چیرۆکی شەهیدبوونەکەی چۆنە.

کاروان له پەناگەیەکدا بە هاوڕێکانی دەگاتەوە. ئەو پەناگەیە بنشاخێک دەبێت، بەردەمەکەی بە بەرد هەڵچنراوە، هەر پێنجیان لەوێدا خۆیان پەنا ئەدەن، بۆئەوەی تووشی شەڕ نەبن، چونکە نازانن ژمارەی ئەو هێزەی هاتووەتە سەریان چەندە و پاشان ئەوان لەو دەورانەدا بەپێی پرەنسیپی خۆلادان لە شەڕ کاری خۆیان دەکەن و تەنها بۆ ئەوە ماونەتەوە کە بڵێن، ناوچەکە پێشمەرگەی تێدایە و چۆڵ نەکراوە. دواتر بۆیان دەرکەوتبوو، هێزەکە تەنها هەر ئەو حەوت هەشت جاشە بووە کە ئەمان بینیبوویان.

دوو لە جاشەکان بە دۆڵەکەدا دەکەونە دووی ئەمان و ئەوانەی دیکەش بە بەرزاییەکەوە دەمێننەوە. لەو کاتەدا کە ئەمان لەنێو پەناگەکەدان، لەپڕێکدا ئەو دوو جاشە دەگەنە سەریان و یەکێکیان لوولەی تفەنگەکەی دەباتە ژوورەوە و پێیان دەڵێت: من مەسئوولم، وەرن تەسلیم بن! یەکەم کەس لەنێو پەناگەکە ئیبراهیم دەبێت، دوایی حەمە سەقەڕ و پۆلا و کاروان و ئینجا نیزام دەبن. حەمە سەقەڕ بە ئیبراهیم ئەڵێت: تەقەی لێ بکە! ئیبراهیم تەقە لەو جاشە دەکات و دەیکوژێ، بەڵام جاشی دووەم دەست دەکاتەوە و ئیبراهیم دەکوژێ. دوای ئەوە جاشەکە دەگەڕێتەوە و دەچێتە پشت گاشە بەردێک، ئەم چوار پێشمەرگەیەش لە پەناگەکە دێنە دەرەوە و دەکەونە تەقە لە جاشەکە. نیزام دەیەوێت بچێتە سەر بەردەکە و بچێت جاشەکە بکوژێت، بەڵام جاشەکە دێتە دەست و ئەم دەکوژێت و فیشەکێکیش بەر داری کلاشینکۆفەکەی پۆلا ئەکەوێت. پاشان ئەمانیش ئەو جاشە دەکوژن و جاشێکی تریش دەپێکن و لە بەرزاییەکەوە بەرەو خوارەوە خلۆر دەبێتەوە. جاشەکانی دیکە بۆ بارەگاکەیان کە هەر لەو ناوچەیە دەبێت دەگەڕێنەوە، بۆ ئەوەی هەواڵەکە بگەیەنن و جەیش و جاشیان بۆ بهێنن.

دوای ئەوە ئەو سێ پێشمەرگەیە ئەوێ بەجێ دەهێڵن و دەوری سەعاتی ١١ی پێشنیوەڕۆ دەگەنەوە لای هاوڕێکانیان کە هێشتا هەر لەو نزیکانە دەبن. بۆ دەوروبەری سەعاتی ٣ی دوانیوەڕۆ دەوری ئەو هێزە بە جەیش و جاش و بە پشتیوانی هێلیکۆپتەر دەگیرێت، دوای شەڕ و پێکدادانێکی سەخت، هێزەکە دەتوانێت

خـۆی دەربـاز بكـات. هێـزەكەی حكـوومەت تەرمـی پێشـمەرگەكان بە كـۆپتەر بـۆ چەمچەماڵ دەگوازێتە و هەر لەوێ بە جلەكانیانەوە دەیان نێژن.

دوای ئەو ڕووداوە، ئەو هێـزەش بەرەو ئێـران دەڕوات و نـاوچەكە بەیەكجـاری چۆڵ دەبێت.[٢٥١]

ئیبراهیم مرۆڤێكی سادە و خاكی، بێگەرد وەك پەڕەی گوڵ بوو، ئەو بزەیەی كە ئەو هەمیشە لەسەر لێوی بوو، هەتا هەنووكەش لە بەرچاوانم كاڵ نەبووەتەوە.

٢٥١. گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز فاتیح عەبدوڵا عەلی (كاروان دووبزی).

## گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز:
## عەلی بچکۆل (عەلی محەمەد قادر)
## دەربارەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە شاری کەرکووك

**سالار ڕەشید:** بەڕێز عەلی بچکۆل! هەر وەکوو ئاشکرایە، هەتا هەنووکە چەندین کتێب و دیدار و گفتوگۆ دەربارەی مێژووی کۆمەڵە بڵاو کراونەتەوە، بێگومان هێشتا گەلێک لایەنی نادیار و شاراوەی ماوە کە گفتوگۆی لەبارەوە بکرێت. بەڵام ئەم گفتوگۆیەی ئێمە سەبارەت بەو مێژووە بە شێوە گشتییەکەی نییە، ئێمە ئەمانەوێ لەم گفتوگۆیەدا لەسەر چەند پرسێکی دیاریکراوی ئەو ڕێکخراوە لە شاری کەرکووک قسە بکەین کە هەتا هەنووکە نادیارن و قسەی یەکلاکەرەوەیان لە بارەوە نەکراوە، وە یان نەنووسراونەتەوە.

ئەوەندەی من ئاگادار بم، بەڕێزتان هەر لە ساڵانی سەرەتای پێکهێنانی کۆمەڵەوە ئەندام و کادری ئەم ڕێکخراوە بوونە، بۆیە وا باشترە، سەرەتا بەو پرسیارە دەست پێ بکەین: کەی پەیوەندیت بە کۆمەڵەوە کرد و لەلایەن کێوە بۆ کۆمەڵە موفاتەحە کرای؟ لە میانەی کارکردنت لەنێو کۆمەڵەدا گەلێک ئەرک و بەرپرسیاریتیت لە ئەستۆدا بووە، دەکرێت لەو بارەیەوە قسەمان بۆ بکەیت؟

**عەلی بچکۆل:** ڕۆڵی من لە شۆڕشی ئەیلوول هەتاوەکوو هەرەسی ساڵی ١٩٧٥ دەبێتە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم: لە ١٩٦٢/٣/٣ لە چەمی ڕەزان بووم بە پێشمەرگە و هەرچی ئەرک و فەرمانێکم پێ درابێت بەزیادەوە جێبەجێم کردووە. لە ساڵی ١٩٦٣ بووم بە لێپرسراوی کۆکردنەوەی دەغڵودان بە ناوی زەکاتەوە بۆ شۆڕش. دواتر بووم بە لێپرسراوی دەستەی پێشمەرگایەتی و پاشان بە پلەکانی ئەرک و فەرمانی پێشمەرگایەتی هەڵساوم.

لە ساڵی ١٩٦٤، ئەو ڕۆژانەی نەهامەتی و دووبەرەکی پەیدا بوون، من ئەندامی پارتی بووم و کەوتمە نێو باڵی مەکتەبی سیاسییەوە و بۆ هەمەدان هەڵبڕدراین و ماوەی ساڵێک لە ئێران بووین.

دوای تێکچوونی نێوان حکوومەتی تاهیر یەحیا و شۆڕشی کورد و پاش هەوڵێکی زۆر، ڕێگە دراین، بۆ کوردستان بگەڕێینەوە. بەڵام جارێکی تر گوشارمان بۆ هێنرا و بووە هۆی ئەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی هێز دروست بکاتەوە و جارێکی تر خوێن لە جەستەی گەلەکەمان جۆگەلە ببەستێ. لەو سەردەمەشدا جۆرەها بەرپرسیارێتیم، هەر لە لێپرسراوی کۆمیتەی ڕێکخستنی پێشمەرگەوە هەتا جێگری بەتالیۆن و لێپرسراوی ئیداری بینیوە.

بەشی دووەم: لە ساڵی ١٩٧٠ بەدواوەیە و هەرچی ئیشوکارێکی ڕێکخستنی کۆمەڵە بە من کرابێت، هەر لە جۆشدانی ڕێکخستن و ڕاپەڕاندن و سازدانی کردوومە. ئەو کاتە لە ڕێکخستن ئەندامی یەکەمین کۆمیتەی ڕێکخستنی کۆمەڵە بووم. بەڵام لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٣بەدواوە چووم بۆ چەمچەماڵ و لەوێ ڕێکخستنی کۆمەڵەم دامەزراند.

دواتریش لە ساڵی ١٩٧٩ لێپرسراوێتی هەرێمی دووی کەرکووک و لە ساڵی ١٩٨٣ لێپرسراوێتی مەڵبەندی کەرکووکم لە ئەستۆ بوو، پاشان ئەندامی دەستگای پێشمەرگایەتی و ئەندامی دەستگای ڕێکخستنی کۆمەڵە لە زەلێ و ناوزەنگ بووم.

لە کاتی هەرەسی شۆڕشی کورد من وەکوو ئەندامێکی پێشکەوتووی کۆمەڵە لە ناوچەی قەڵاسێوکە لەگەڵ شەهید ئازاد هەورامی و مامۆستا شێرکۆ عەسکەری و سادق فەیلی، سەرپەرشتیی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەم دەکرد و بە مونەزەمی هاوڕێکانمان هێنایەوە ناو شارەکان و ڕێکمان خستنەوە. چەند مانگێ لەوێ

سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەم کرد و پاشان کۆمیتەیەکم دامەزراند کە پێک هاتبوو لە هاوڕێیان: شەهید سیروان تاڵەبانی، ئەحمەد کرێکار، شەهید ئازاد هەورامی، حەمید محەمەد وەک ئەندامی یەدەگ.

لەوە بەدوا من و دارا ویستمان بۆ دەرەوەی وڵات بڕۆین، بەڵام گیراین و بۆ شاری سەقز براین و بە تاوانی بەزاندنی سنوور چوار مانگ زیندانی کراین و پاشان ڕادەستی عێراق کراینەوە. ئەوسا من ئەندامی کۆمیتەی ئەستێرەی سوور بووم، واتە، ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی کوردستان.

من هەر لە سەرەتای پەیوەندیکردنم بە کۆمەڵەوە لە ساڵی ١٩٧٠، هەوڵێکی سۆفیانەم دا بۆ گەشەپێدان و کۆکردنەوەی زۆرترین ئەندام و دۆست و لایەنگر لە ئەڵقەی ڕۆشنبیریدا. لەپێشەوە لە بنەماڵەی خۆمان و دۆست و هاوڕێیانی خۆم و کۆنە هەڤاڵەکانی سەردەمی باڵی جەلالی و پێشمەرگەکانی هاوڕێم لە شۆڕشی ئەیلوول. خۆم بە خاوەنی جەماوەرێکی بەرفراوانی ئەندام و دۆست و لایەنگری ڕێکخستنی کۆمەڵە لە کەرکووک ئەزانم و لەدوای فەرەیدوون عەبدولقادرەوە من یەکەمین کەسم کە هەوڵێکی زۆرم بۆ دامەزراندنی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک داوە و سەرەنجام پلەی ئەندامی لیژنەی کەرکووکم لە ڕێکخستنەکانی ناو شاری کەرکووکدا وەرگرت.

هەر لەو پێناوەدا لەلایەن ئاسایشی ڕژێمی نەگریسەوە ڕاوەدوو نرام و بەناچاری چووم بۆ چەمچەماڵ و لەژێر باڵی پارتی لە چەمچەماڵ مامەوە و لە شارەوانی چەمچەماڵ لە دائیرەی کارەبا دەستم دایە کارکردن.

هەر بۆ خاتری گەشەی کۆمەڵە چوومە ناو یەکێتیی لاوانی دیموکراتی کوردستان و نوێنەری لاوانی چەمچەماڵ بووم بۆ کۆنگرەی ٣ لە شاری هەولێر و بوومە ئەندام لە نیقابەی کرێکاران و بووم بە ئەندام لە کۆمەڵەی هونەر و ئەدەبی کوردی. هەموو ئەمانە هەر بۆ خاتری گەشەی کۆمەڵەی مارکسیی لینینیی بیروباوەڕی ماو تسیتۆنگ بوو. پاشان بوومە لێپرسراوی کۆمیتەی چەمچەماڵ و سەرپەرشتی دروستکردنی کۆمەڵە لە سەنگاو و بازیان و قەڵاسێوکەم لە ئەستۆ گرت.

کاتێک لە ساڵی ١٩٧٤ چوومە دەرەوە، ئەڵقەی پەیوەندیی ڕێکخستنی هاوڕێیانی کەرکووکی کۆمەڵە بووم.

لەگەڵ هاوڕێیان خاڵە شەهاب شێخ نووری، فەرەیدوون عەبدولقادر، عومەری سەید عەلی، ئاوات عەبدولغەفوور و ئەرسەلان بایز چووین بۆ ئێران و لەوێ زیندانی کراین و دوای چوار مانگ بە باڵبەستکراوی درایەنەوە عێراق و بە شەش ساڵ زیندانی حوکم درام. بەڵام لەپاش سێ ساڵ و نیو بە لێبووردنی گشتی ئازاد کرام و دوای ئەوە چوومە شاخ.

**سالار ڕەشید:** هەر وەکوو ئاشکرایە کۆمەڵە لە ڕێکەوتی ١٩٧٠/٦/١٠ دامەزراوە. برایم جەلال لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا دەڵێت: "لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵەدا فەرەیدوون عەبدولقادر کراوە بە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک". لێرەدا ئێمە دەپرسین:

یەکەم: ئەوەندەی زانیاریت هەبێ و بێتەوە بیرت، ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک لە سەرەتای دامەزراندنیدا بە تەقریبی خۆی لە چەند کەس ئەدا؟ ئایا تەنها کەسێک بەرپرسی بوو، وە یان نەخێر کۆمیتەیەکی بۆ پێک هێنرا؟ ئەگەر هەر لە سەرەتاوە کۆمیتەیەک بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی ڕێکخستنی کەرکووک پێک هێنرابێت، زانیاریت دەربارەی ئەوە هەیە، ئەو کۆمیتەیە لە چەند ئەندام پێک هاتبوو و کێ بوون؟

دووەم: ئایا ئەو زانیارییە پشتڕاست دەکەیتەوە، یەکەم بەرپرسی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک فەرەیدوون عەبدولقادر بووە؟

**عەلی بچکۆل:** ئەو کاتەی فەرەیدوون بۆ شاری کەرکووک بۆ دامەزراندنی کۆمەڵە نێردرا، بەماڵەوە هاتبوو، ماڵەکەیشی لە ڕێگای بەغدای نوێ بوو.

ئەو هەڤاڵ و هاوڕێ تێکۆشەرانەی لە سەرەتادا و لەپێش دامەزراندنی کۆمەڵە لە دەوری یەکتری بووین، بریتی بوون لە:

مەلا ناسیح مەجید تۆماری، مەلا محەمەد مام ڕەشی، حەمید محەمەد کاکەمەد، شەهید عەلی مەجیدە جاف، ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب)، مەلا عەبدولڕەحمان

ئاوبارەیی، مامۆستا ڕەئووف یابە، شەهید یاسین ئەنوەر، دکتۆر ئەنیس شاکر، مامۆستا عەزیز سلێمانی لە بەغداوە دەهات، شەهید ملازم کامیل ئیمام قاسمی، مامۆستا شێرکۆ عەسکەری، هونەرمەند جیهاد دڵپاک، مامۆستاعەلی کەریم هونەرمەند، ئەحمەد کرێکار، محەمەد عەبدوڵای شارەوانی کەرکووک، سالار بۆگدی، مامۆستا قادر مەلا عومەر و بە دەیان پیاوی تێکۆشەر و قارەمانی تر کە لە بۆشاییدا دەسووڕاینەوە، بەداوای لێبووردنەوە ناوەکانیانم لەیاد کردوون. کۆمەڵێکی دیکەش لە کادر و تێکۆشەری سەردەمی شۆڕشی ئەیلوول کە لە سەرەتاکانی شۆڕشەوە زۆر ماندوو ببوون، لە ئەنجامی پشتگوێخستن و داربەزگانانی کادر و ئەندامانی لەخۆباییی پارتی، ڕووخان و چوونە پاڵ ڕژێمی بەعس.

ئێمە زۆر جار لە ماڵی ئیحسان نەجم کۆ دەبووینەوە، ئیحسان باری دارایی و جێگا و ماڵی باش بوو، خۆیشی پیاوێکی نەترس بوو. هەروەها شێخ عەبدوڵا عەسکەریش هاوکارمان بوو.

بەڵام کاتێک کۆمەڵە دروست بوو، زۆربەی ئەم ناوانە بوون بە ئەندام و کادر و سەرکردە، نموونەی فستقفرۆش واتە، شەهید عەبدولڕەزاق، ئازاد هەورامی نەمر، شەهید بێستوون عەسکەری، شەهید فەیسەڵ ڕەشید تاڵەبانی، شەهید شوانی تەنسیق، شەهید شێروان ...هتد.

سەبارەت بە پێکهێنانی کۆمیتەکانیش، من تەنها ئاگاداری کۆمیتەی ساڵی ١٩٧٥ی دوای هەرەسم و ئاگادارم کە پێک هاتبوو لە: شەهید ئازاد هەورامی، شەهید سیروان تاڵەبانی، ئەحمەد کرێکار و حەمید محەمەدیش یەدەگ بوو، وە کاک ئازادم کرد بە بەرپرسی کۆمیتەکە. ئەوسا من بووم بە ئەندامی کۆمیتەی ئەستێرەی سوور، واتە، سەرکردایەتی ئەوسای ناوشارەکانی کۆمەڵە و لەگەڵ کۆمیتەکانی هەولێر، بەغدا، سلێمانی و کەرکووک، مانگانە لە یەکێ لەم شارانەدا، تەنها لێپرسراوەکان کۆ دەبووینەوە و شەهیدی هەرگیز نەمر جەعفەر عەبدولواحید یان خاڵە شەهاب یان فەرەیدوون سەرپەرشتی کۆبوونەوەکانی دەکرد.

**سالار ڕەشید:** لەدوای شاڵاوی گرتنەکان بۆسەر کۆمیتەی ئاگر، بەڕێزتان لە دامەزراندنەوەی "کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک"دا بەشدار بوون، لەو بارەیەوە ئەگەر بکرێ زانیاری خۆت بخەیتە ڕوو.

**عەلی بچکۆل:** دوای ئەوەی شاڵاوی گرتنەکان دەستی پێ کرد، دێتەوە یادم بەڕێزتان (سالار ڕەشید) و ئەحمەد کرێکار سەرتان لێ دام و داوای دروستکردنەوەی پەیوەندییە پچڕاوەکانتان لێ کردم. لە یادمە، نامەم بۆ شەهید مامۆستا قادری مەلا عومەر نووسی و ڕامسپارد، هەندێک هاوڕێی ترمان کە پەیوەندییان پسابوو بگرێتەوە. پاشان لە سەرکردایەتیی یەکێتی و کۆمەڵەوە و لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە گوندی مام ڕەشی ناوچەی شوانەوە، سێ دەمانچەی بێدەنگم بۆ ناردنە نێوشار.[٢٥٢]

کاکە سالار ماوەیەکی دوورە و هەموو بابەتەکانم ورد لە یاد نییە و ئەم مەسەلەیەش وردبینی و ویژدانی دەوێ، ئەگەر پرسیاری ترت هەبوو، بۆم بنووسەوە، ئەوەندەی بیرم بێت و ویژدانم ڕێگام بدات، بەچاوان. دڵنیام پڕاوپڕی پرسیارەکانت وەڵامەکانم نەپێکاوە، هیوادارم دڵگران نەبیت.

**سالار ڕەشید:** لەو کاتانەدا بەڕێزتان نامەیەکتان پێم دا، تاوەکوو بیبەم بۆ مامۆستا قادر (کە بەرپرسی خەتێک بوو) و لەو هەوڵانە ئاگاداری بکەمەوە کە بۆ دامەزراندنەوەی کۆمیتەی ئاگر ئەیدەین و هەروەها بۆ قسەکردن لەسەر مەوعیدێک لە سوورقاوشان بۆ ئەو مەبەستە ...

پرسیارەکەمان لێرەدا ئەوەیە: ئەو خەتەی کە مامۆستا قادر بەرپرسی بوو لەو دەمەدا، کە دەوری ١٥ ئەندامێک دەبوون، ئایا پێشتر هەر پەیوەندییان بە کۆمیتەی ئاگرەوە هەبوو؟ ئەگەر وایە، پەیوەندییان بە کێوە هەبوو؟ ئەگەر نا، پێشتر پەیوەندییان بە کوێوە هەبوو؟ هەروەها ئەگەر زانیاریت هەبێت، بێجگە لە مامۆستا قادر، ئەندامانی تری ئەو خەتە کێ بوون؟

---

٢٥٢. هەر وەکوو لە باسەکانی پێشوودا ڕوونم کردووەتەوە، ئێمە هیچ شانەیەکی چەکداری پێشوومان لەخۆ نەگرت و خۆمانیش هیچ شانەیەکی چەکدارمان دروست نەکرد. (سالار ڕەشید)

**عەلی بچکۆل:** ...

**سالار ڕەشید:** ئیبراهیم جەلال لە کتێبەکەی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا ئەڵێ، خاڵە شەهاب ماوەیەک بەرپرسی کۆمیتەی شاری کەرکووک بووە، کۆمێنتی تۆ لەو بارەیەوە چییە؟

**عەلی بچکۆل:** کاک شەهاب بەرپرس نەبوو، بەڵکە سکرتێری کۆمەڵە بوو، ئەو هاتبووە کەرکووک بۆ مەسەلەی گەشەپێدانی فکریی کۆمەڵە، ئەو سەرپەرشتیی کۆبوونەوەکان و دەورە بچووکەکانی ئەندامانی کۆمەڵەی دەکرد. لەڕاستیدا فەرەیدوون عەبدولقادر بەرپرسی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بوو لە کەرکووک، هەتاوەکوو ساڵی ١٩٧٤ کە زۆربەمان چووینە دەرەوە. دڵنیابە خاڵە شەهاب وەکوو لێپرسراوی کەرکووک نەبووە!

**سالار ڕەشید:** بەڕێز عەلی بچکۆل! کاتی خۆی بەڕێزتان وتاریکتان نووسی و هەندێک ڕەخنەتان لە یەکێتیی نیشتمانی گرت، کەچی ئەوان بەو هۆیەوە چییان بەسەر تۆدا هێنا، ئەی بۆ ئەم بارودۆخەی ئێستای کوردستان قسەت چییە، ئەوانەی هەتا دوێنێ بەدوامانەوە بوون و ئێمەیان بەگرت ئەدا و هاوڕێکانمانیان بەسێدارە گەیاند، ئێستا دەسەڵاتدار و هەمەکارەن؟!

**عەلی بچکۆل:** من شانازی دەکەم، کاتێک من دژی کەموکوورییەکان بووم و دەرکم پێیان کرد، دادگایان بۆ دانام، ئەگەر خۆم ئازا نەبوومایە، وەکوو شەهید جوامێر لە قاسمەڕەش دەخرامە گۆڕەوە، بەڵام خۆشحاڵم لە یەکەمەکانم کە لە دژی گەندەڵی و خراپەکاری بووم، ئەگەرچی ئەوەی لە پاکستان بەسەر مندا هات، زۆر لە شەق و تێهەڵدانەکانی زیندانی بەعسی فاشیست کەمتر نەبوون!

**نیوزیلاند**

**٢٠١٦/٥/١٩**

# گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز:
# ئەحمەد کرێکار (حەمە کەریم عەلی ڕەزا)
# دەربارەی کۆمیتەی ئاگر

**سالار ڕەشید:** بەڕێز ئەحمەد کرێکار! لە چ ڕێکەوتێکدا کەرکووکت بەجێ هێشت؟

**ئەحمەد کرێکار:** لە ڕێکەوتی ١٩٨١/٨/٢٠ شاری "کەرکووک"م بەجێ هێشت و چوومە گوندی چالاو، چونکە ماڵومنداڵەکەم لەوێ بوو. ماوەی ١٥-٢٠ ڕۆژێک لەوێ مامەوە و پاشان ئەوێم بەجێ هێشت و بووم بە پێشمەرگە.

**سالار ڕەشید:** لەدوای دەرچوونە دەرەوەی تۆ، کۆمیتەی ئاگر چۆن پێک هێنرایەوە؟

**ئەحمەد کرێکار:** لەدوای دەرچوونە دەرەوەی من، کۆمیتەکە لەژێر چاودێری مامۆستا جەمال تاهیر و بە ئامادەبوونی بەڕێز سەلیم ئەحمەد شوکری (سەلیم سەرسپی) لە سێ کەس پێک هێنرایەوە، ئەوانیش: ئەسعەد عەزیز سۆفی (شێخ دارا)، عومەر قادر عەلی و مامۆستا کاکەڕەش (بەکر سدیق) بوون. مامۆستا کاکەڕەش بووە بەرپرسی کۆمیتەکە.

**سالار ڕەشید:** پێش ئەوەی مامۆستا کاکەڕەش ببێتە بەرپرسی کۆمیتەی ئاگر، ئایا ئەندامی کۆمیتەی ئاگر بوو (مەبەستم کۆمیتە باڵاکەیە)؟
**ئەحمەد کرێکار:** نەخێر، مامۆستا کاکەڕەش ئەندامی کۆمیتەکە نەبوو.

**سالار ڕەشید:** بەپێی بەدواداچوونێک کە من کردوومە، بە چەند مانگێک پێش ئەوەی کەرکووک بەجێ بهێڵیت و دەرچیتە دەرەوە، کۆمیتەکەت تەسلیمی ئەو سێ هاوڕێیە کردووە. لێرەدا پرسیارێکم هەیە: بە چەند مانگ پێش ئەوەی دەرچیت، کۆمیتەکەت تەسلیمی کاکەڕەش و ئەسعەد وعومەر کردووە؟
**ئەحمەد کرێکار:** لە مانگی ٨ی ساڵی ١٩٨١بە هەفتەیەک پێش دەرچوونم، کۆمیتەکەم تەسلیمی مامۆستا کاکەڕەش و هاوڕێکانی کرد، نەک چەند مانگێک.

**سالار ڕەشید:** عەلی مغاویر کەی گیرا؟
**ئەحمەد کرێکار:** عەلی مغاویر لە مانگی ٧ی ساڵی ١٩٨١ گیرا و ٢٦ ڕۆژ لە دائیرەی ئەمن بوو.

**سالار ڕەشید:** لەو کاتەی کە تۆ بەرپرسی کۆمیتەکە بووی، ژمارەی ئەندامانی کۆمیتەکە لە ٥ کەس پێک هاتبوو: ئەحمەد کرێکار، حەمید شورتە، عەلی مغاویر، حەمەی ئایشە و مامۆستا محەمەد سانیە. مامۆستا محەمەد ئەگیرێ و حوکمی ئیعدام ئەدرێ و پاشان حوکمەکەی دەکرێتە ئەبەدی، حەمەی ئایشە ئەگیرێ و بێسەروشوێن ئەکرێت، دوایی عەلی مغاویر ئەگیرێ و کلێشەی ڕێکخستن تەسلیم بە ئەمنی کەرکووک ئەکات. پرسیارەکەم ئەوەیە: لە کۆمیتەی تازەدا، چۆنە وا حەمید شورتەی تێدا نییە کە لە کۆنەوە ئەندامی کۆمیتەکە بووە؟
**ئەحمەد کرێکار:** پاش ئازادکردنی عەلی مغاویر و لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا، بۆمان دەرکەوت کە لیستی تەسلیم کردووە و بەڵێنی پێیان داوە کاریان لەگەڵدا بکات. هەر بۆیە مامۆستا جەمال تاهیر ئەمری کرد، کۆمیتەیەکی تر پێک بهێنین کە لە عەلی مغاویرەوە دوور بێت، تاوەکوو نەگیرێن. بۆیە مام حەمید و برادەرە کۆنەکانی تێدا نەبوون. واتە، کۆمیتەیەکی تازە پێک هێنرا، تاوەکوو لەلایەن "عەلی مغاویر"ەوە نەناسرێتەوە.

**سالار ڕەشید:** فایەق عومەر ڕەسووڵ ئەندامێکی قەدیمی و بەرپرسی ئەسعەد بوو، چۆنە وا لەو کۆمیتە نوێیەدا (ئەسعەد، عومەر، کاکەڕەش) نەبوو؟

**ئەحمەد کرێکار:** فایەق عومەر ڕەسووڵ پەیوەندی بە 'مامۆستا محەمەد حەسەن خورشید'ەوە هەبوو، 'مامۆستا محەمەد'یش لەو کاتەدا گیرابوو، بۆیە بەباش نەزانرا، فایەق عومەر ڕەسووڵ بێتە نێو کۆمیتەکەوە.[٢٥٣]

**سالار ڕەشید:** عەلی مغاویر چۆن ئاشکرا بوو؟

**ئەحمەد کرێکار:** ...

**سالار ڕەشید:** ئایا عەلی مغاویر بێجگە لەوەی کلێشەی ڕێکخستنی ڕادەستی بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووک کردبوو، ئەبێ ناوی تەواوەتی کەسانێکیشی ڕادەست کردبێت؟ ئەگەر وایە، کێ بوون؟

**ئەحمەد کرێکار:** ...

**سالار ڕەشید:** ئایا ئەو ڕاپۆرتەی کە عەلی مغاویر بە بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووکی دابوو، ناوی 'ئەحمەد کرێکار'یشی تێدا بوو؟ ئەگەر وایە ... ئەحمەد کرێکار، ماوەیەک لەدوای گرتنی عەلی مغاویر، ئینجا ئەچێتە دەرەوە، چۆنە هەوڵی دەستگیرکردنی نەدرا؟

**ئەحمەد کرێکار:** ...[٢٥٤]

**سلێمانی**

**٢٠١٧/٧/٧**

---

٢٥٣. بەلام مامۆستا محەمەد حەسەن خورشید لە مانگی (٤)ی ساڵی ١٩٨٠ دەگیرێ و لە مانگی (١٠)ی هەمان ساڵ بۆ ڕەدەی ئیعدام دەگوێزرێتەوە و هەتا مانگی (٢)ی ساڵی ١٩٨١ لەوێ دەمێنێتەوە و پاشان حوکمەکەی بۆ سووک ئەکرێ!

واتە، کاتێک کە کۆمیتەی نوێ پێک دەهێننەوە، ماوەیەکی زۆر بەسەر دادگاییکردنی مامۆستا 'محەمەد'دا تێپەڕیوە! پاشان 'عومەر قادر'یش هەر پەیوەندی بە مامۆستا محەمەد حەسەن خورشید'ەوە هەبوو! (سالار ڕەشید)

٢٥٤. ئەم گفتوگۆیە لەگەڵ ئەحمەد کرێکار لە ڕێگەی فەرهادی کوڕییەوە ڕێک خرابوو، لە سەرەتاوە ئامادەی گشت هاوکارییەک بوون، بەلام بە داخەوە ئەوان لێرەدا وەستان.

## گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز:
## محەمەد حەسەن خورشید (حەمەی سانییە)
## دەربارەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە شاری کەرکووك

**سالار ڕەشید:** بەڕێز محەمەد حەسەن! کەی پەیوەندیت بە کۆمەڵەوە کرد، لە ڕێگەی کێوە و بە چ ناوێکی نهێنییەوە کار و تێکۆشانت دەکرد؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** هەر لە سەرەتای ساڵی ۱۹۷۲دا دەمزانی ڕێکخستنێک لە کوردستاندا هەیە، جیاواز لە پارتی و حیزبی شیووعی و حیزبەکانی تری سەر بە بەعس و بۆ خۆپاراستن لە پەلامارە درندانەکانی ڕژێم و چاوی دەستگای پاراستن، بەنهێنی کار دەکات، ئەویش بە هۆی ئەبووشەهابی خاڵمەوە، چونکە بەردەوام و هەفتانە کۆبوونەوە لە ماڵیان دەکرا، منیش زۆربەی کات لەوێ بووم.

هەموو هاوڕێیانی سەرکردایەتی ئەو کاتی کۆمەڵە هاموشۆی ئەوێیان دەکرد، بەڵام لە سەرەتای ساڵی ۱۹۷۳ لەلایەن نەجمەدینی فەقێ عەبدوڵاوە خرامە ئەڵقەی ڕۆشنبیرییەوە و لە سەرەتای ساڵی۱۹۷٤دا موفاتەحە کرام و دەستووری کۆمەڵەم بۆ خوێندرایەوە، کە نامیلکەیەکی بچووکی چەند لاپەڕەیی بوو.

**سـالار ڕەشـيد:** لە مـاوەی کارکردنتـدا پەيوەنـدیی ڕێکخراوەيیـت لەگەڵ کێـدا هەبـووە، يـانی چ ئەوانەی خـۆت پەيوەنـديت پێيـانەوە هەبـووە و چ ئەوانەی پەيوەنـدييان بە تـۆوە هەبـووە، هەروەهـا ئەو کەسـانە کـێن کە لەلايەن تـۆوە بـۆ ڕێکخسـتنەکان موفـاتەحە کـران؟ ئەگەر بێـتەوە بيـرت، ئەو سـاڵانەش دەستنيشـان بکەيت کە ئەو پەيوەندييانەی تێدا بەئەنجام گەيشتوون، وە يان ئەو کەسانەی تێدا ڕێک خراون.

**محەمەد حەسەن خورشيد:** ئەو کات واتە، لە ساڵانی هەفتاکان و هەشتاکانيشدا شـانەی کـۆمەڵە لە ٢-٤ کەس زيـاتر نەبـوو، هەفتـانەش کۆبـوونەوە دەکـرا، يەکەم کۆبـوونەوەم لە شـانەدا لەگەڵ مسـتەفا قـادر بـوو، کە نەجمەدينـی فەقـێ عەبـدوڵا سەرشانەمان بوو، ئيتر لە ماوەی سێ چوار ساڵدا دەيان کەسم ناسـی، چ ئەوانەی نەجمەديـن پـێش چـوونە دەرەوەی پێـی ناسـاندم، واتە بـوونی بە پێشـمەرگە لە مەفرەزە سـەرەتاييەکانی کۆمەڵە، يان ئەوانەی خـۆم بـۆ کـۆمەڵە و خوێنـدکاران و يەکێتـی موفـاتەحەم دەکـردن. هەر لە سـاڵی ١٩٧٦دا بـوو يەکێتيـی خوێنـدکارانی شۆڕشـگێڕی کوردسـتان (کـۆمەڵەی خوێنـدکارانی کوردسـتان)مان لەگەڵ هەڤـاڵان شـەهيد شـوان عەلـی سـەعيد (شـاميل)، شـەهيد ڕەئـووف ئـاکرەيی، بەڕێـزان کـاک کۆسرەت ڕەسوول عەلی و شێخ لەتيف عومەر دامەزراند.

لە سـاڵی ١٩٧٥دا کـاک ئەحمەد کرێکار و مـن شـانەيەکی سـەرەکی بـووين، کـاک عەلی بچکۆل سـەرپەرشتی دەکردين، ئەو کات هێشتا پەلامـاری دڕندانەی بەعس بـۆ سەر ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە دەستی پێ نەکردبوو. هەر لە هەمـان سـاڵدا پەلامـاری بەعـس بۆسـەر ڕێکخسـتنەکانی کـۆمەڵە دەسـتی پـێ کـرد، ئەويـش بەهـۆی دەسـتگيرکردنی کەسـێک لە بـزووتنەوەی سۆشيالیسـتيی عەرەبـی لە فڕۆکەخـانەی بەغدا بە نامەيەکی بەڕێز مام جەلالەوە کە بۆ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ناردبوو.

سـەرەتا شـەهيد ئەنـوەر زۆراب و هەڤـاڵێکی دەسـتگير کـران، پاشـان گرتنەکـان تەشەنەی سەند و هەر بەو هۆيەشەوە سـەرکردايەتيی کۆمەڵە بڕيـاری دا بچێـت بـۆ ئێران. کاک "عەلـی بچکۆل"يش پێش سـەفەرەکەيان، کـاک ئەحمەد کرێکـار و منی بە شەهيد ئازاد هەورامی سپارد، تـاوەکوو دەرچوونە دەرەوەی کـاک ئـازاد پەيوەنـديی ڕێکخسـتنم هەر بەوەوە هەبـوو. لەپاش ڕۆيشـتنی کـاک ئـازاد بـۆ پێشـمەرگايەتی لە

کۆتایی ساڵی ١٩٧٦دا پەیوەندیم بە کاک ئەحمەد کرێکارەوە هەبوو، دیارە پێش ڕۆیشتنی کاک ئازاد بڕیاری ئەوە درابوو، ئەم چەند کەسەی خوارەوە سەرپەرشتیی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتی لە کەرکووک بکەن:

١) ئەحمەد کرێکار، بەرپرسی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتی لە کەرکووک.

٢) شەهید حەمەی ئایشە، ئەندام، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن ئەمنی کەرکووکەوە ڕفێنرا و تاکو ئێستاش ونە، قارەمانانە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی پاراست، بێ ئەوەی لەپاش خۆی کەس دەستگیر بکرێت.

٣) مام حەمید (حەمید شورتە)، ئەندام.

٤) محەمەد حەسەن خورشید، ئەندام.

٥) کۆچکردوو عەلی مغاویر، ئەندام، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨١، لەلایەن ئەمنی کەرکووکەوە دەستگیر کرا، وەک هەڤاڵان دەیگێڕنەوە، تەواوی ئەو خەتەی ڕێکخستن کە پەیوەندی پێوە هەبوو، بۆ ئەمنی کەرکووک ئاشکرا دەکات. هەر بۆیە پاش ماوەیەکی کورت لە ئازادکردنی، هەموو ئەو کەسانەی کە ئەو دەیناسین، لەلایەن ئەمنی کەرکووکەوە دەستگیر کران. لە کاتی لێکۆڵینەوەش لەگەڵیاندا بەردەوام ناوی عەلی مغاویریان لەلا هێناون، ئەویش بەبێ ترس لە شاری کەرکووک سووڕاوەتەوە.

ئەوەی شایانی باسە، لەدوای پرۆسەی ئازادیی عێراق چەند کەسێکی نەناسراو عەلی مغاویر دەڕفێنن و پاشان لاشەکەی لە نزیک شارۆچکەی داقووق فڕێ ئەدەن.

بۆ ڕاستی ئەمەش کاک ئازاد پێش ڕۆیشتنی بۆ دەرەوە، کۆمەڵێ ناو و ناوی نهێنی پێ دام کە پاش ڕۆیشتنی پەیوەندییان پێوە بگرم، لەوانەی لەبیرم ماوە هەڤاڵان فایەق عومەر ڕەسووڵ و شیرین مەجید هەورامی و چەندانی تر کە بەداخەوە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە.

ئەو کەسانەی پەیوەندیم پێیانەوە هەبووە، یان لە ڕێکخستن بەرپرسم بوونە یان بۆ کۆمەڵە و یەکێتی و خوێندکاران موفاتەحەم کردوون زۆرن، لەڕاستیدا هەر بەشێکیانم لەیاد ماوە، داوای لێبووردن دەکەم. ئەوانەی ناویان دەهێنم و لە یادم ماون: شەهید مام بێستوون، شەهید عەلی نانەوا، نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا، مامۆستا شێرکۆ عەسکەری، شەهید پشتیوان، بەڕێز قادری حاجی عەلی، شەهید مامۆستا

جەمال تاهیر، دلێر ئەحمەد شۆ (هاورێ سەلیم)، فایەق عومەر رەسوول، کاکەڕەش سدیق، عومەر قادر، سەلام زەندی، مامۆستا جەلال برای شەهید حەمەڕەش، شەهید رێباز(سەمیم)، شەهید نوعمان کلاوقوتی، کوچکردوو مەلا ناسیح تۆماری، عوبێد خالید، هیوا هەورامی، سەباح حەسەن خورشید، جەمال خان، مامۆستا نەجم، هاورێ فەخرەدین، سالار سابیر و ئیسماعیلی گورگەیی سەرخاسە، فریاد، ئەحمەد قەمبەر، حوسێن سێودین، سوارە کەمال، خالیدی پەرستیار، شەهیدان حەمە غەریب (هیوا سوور) و سالحی برای، بەرێز ئاسۆ عەلی، شەهید ئەسعەد عەزیز، شەهید شوان تەپەیی، سەباح مەحموود، شەهیدان مامۆستا حەمید کاکەیی و مامۆستا مەدحەت کە لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا لەلایەن ئەمنی کەرکووکەوە ڕفێنران و تاکوو ئێستاش ونن و ڕێکخستنەکانیان قارەمانانە پاراست، ئازاد رەسوول، ڕێکەوتی خوێندکاران، کاک فەرهادی دەستگای شەهیدان، جەمال عەبدولا (هەڵکەوت)، دلاوەر ئەحمەد مەجید، شیرین عەبدولمەجید، لەمیعەی خێزانی نەجمەدینی فەقێ عەبدولا، سوهەیلە حەسەن خورشید، بەهار تاڵەبانی، پەروین فەتحولا، ناهیدەی خوشکی شەهید پشتیوان، عەبدولخالق خانەقینی، جەبار شۆڕیجەیی، سالح خەڵکی پیریادی، ئەحمەد کرێکار، مام حەمید، حەمەی ئایشە، هۆشیار عەبدولخالق شەدەڵەیی، ئەحمەد کاکە حەمە (هۆشمەند)، فەخرەدین رەحیماوا، عیسا توفیق سنەیی، شەهید نەجات خەیات، چەندانی تر کە ئێستا ناوەکانیانم لە یاد نەماوە.

**سالار رەشید:** ئەگەر بێتەوە یادت، ناوی تەواوەتی کۆمەڵە لەسەر دەستوورەکەی چی بوو؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** کۆمەڵەی مارکسی لینینی گۆشکراو بە بیری ماو تسیتۆنگ.

**سالار رەشید:** بە هۆی تێکچوونی دانووستانی نێوان پارتی و حکوومەتی عێراقی و هەڵگیرساندنەوەی شەڕ، ژمارەیەکی زۆری کۆمەڵەش چوونە دەرەوە و بوونە پێشمەرگە، ئەوەندەی خۆت ئاگادار بیت، وە یان بۆت باس کرابێت، بارودۆخی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک چۆن بوو؟ ژمارەی ئەندامانی لە دەوری چەند کەس

دەبوو؟ لەو دەمەدا کۆمیتەیەک هەبوو بۆ سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی ڕێکخستنەکان؟ ئەگەر بزانی کێ بوون و کێ بەرپرسی بوو؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** لەو دەمەدا ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە ڕوو لە گەشەیەکی بەردەوام بوو، بەڵام نازانم ژمارەیان چەند بوو. من تەنها ئەوەندە ئەزانم، سەرکردایەتیی ئەو کاتی کۆمەڵە خوێندنەوە و بەرنامەی بۆ بارودۆخی دوای تێکچوونی دانوستانی نێوان حکوومەتی عێراق و پارتی هەبوو، بەرپرسی بۆ شارەکان دانابوو، یەکێک لەوانە ئەبووشەهاب بوو بۆ کەرکووک، کە پاشان ئەویش چووە دەرەوە.

چوونە دەرەوەی زۆربەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە، پاش گەنگەشەکردنی ئەو بارودۆخەی کوردستان و ناوچەکە و جیهان بوو، کە دەرەنجامەکەی ئێستاش لەبیرمە، بڕیاری بەشداریکردنی کۆمەڵە بوو لەو شۆڕشەدا لەسەر ئەم بنچینەیەی خوارەوە گەر بە هەڵەدا نەچوبێتم، بە بەیاننامەش بۆ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە ڕوون کرایەوە، بەیاننامەکەش ئەوەندەی لە یادم مابێت، بەم شێوەیەی لای خوارەوە بارودۆخەکەی هەڵسەنگاندبوو:

حیزبی بەعس هەرگیز مافە ڕەواکانی خەڵکی کوردستان ناسەلمێنێت، خەڵکی کوردستان مافی ڕەوای خۆیەتی خەبات و شۆڕش بۆ بەدیهێنانی مافە ڕەواکانی خۆی بکات، بەڵام لە ئێستادا سەرکردایەتیی شۆڕشی گەلی کوردستان سەرکردایەتییەکی بۆرژوا و عەقڵ خێڵەکییە، ئەرکی کۆمەڵەیە وەک ڕێکخراوێکی چەپ و شۆڕشگێڕ لە شۆڕشی خەڵکی کوردستاندا بەشداری بکات، بە مەبەستی هۆشیارکردنەوەی خەڵکی کوردستان لەو سەرکردایەتییە و گۆڕینی بە سەرکردایەتییەکی گونجاو بۆ قۆناغەکە و گەیاندنی شۆڕشەکە بە ئامانجەکانی خۆی، کە دەبێت هەر ئەو سەرکردایەتییەش کۆمەڵە بێت، چونکە لەو دەمەدا تەنها ڕێکخراوی چەپ و بەدیسیپلین و بەهێز بوو لە کوردستاندا.

**سالار ڕەشید:** لەدوای شکستی بزووتنەوەی چەکداریی پارتی لە ساڵی ١٩٧٥ و گەڕانەوەی ئەندامان و کادران و ڕابەرایەتیی کۆمەڵە بۆ نێوشارەکان، چ ئاڵوگۆڕێک بەسەر ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووکدا هات؟ مەبەستم ئەوەیە، بە

هـۆی گەڕانەوەی ئەو ژمـارە زۆرەوە کـۆمەڵە لە شـاری کەرکـووک چـۆن خـۆی ئاراییش دایەوە و چ ئاڵوگۆڕێک بەسەر پێکهاتەی کۆمیتەکەیدا هات؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** من زۆر بەوردی ئاگاداری کارەکانی کۆمەڵە نیم لەو ساڵەدا، واتە، دوای نسکۆی ١٩٧٥. بەڵام ئەو کـاتە لە کەرکـووک نـاوی "کـۆمیتە" نەبوو، بەڵکوو ناوی "ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک" بوو.

سـەرکردایەتیی کـۆمەڵە لەپـاش ئەوە، لەگەڵ ڕێکخسـتنەکان بـارودۆخەکەی تـاوتوێ کـرد، کە ئایـا بەرگـری بـکەن و درێـژە بە شـۆڕش بـدەن، وە یـان بـۆ ناوشارەکان بگەڕێنەوە و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بەهێز بکەن و خۆیان بۆ شۆڕشی نـوێ ئامـادە بـکەن. هەرچەنـدە ئەو دوو بۆچـوونە جیـاوازە گفتوگۆی تێروتەسەلی لەبارەوە کرا و سروودی بەرگریش لەلایەن کاک ئازاد هەورامییەوە ئامادە و پاشان تۆمـاریش کـرا، بەڵام دەرەنجـام سـەرکردایەتیی کۆمەڵە بڕیـاری دواخسـتنی خەبـاتی چەکداری دا و بەیاننامەیەکیشـی نووسـییەوە و بـۆ ڕێکخسـتنەکانی نـارد، کە باسـی هۆیەکانی ئەو ئاشبەتاڵەی تێدا کردبوو و شۆڕشـەکەی بە هەرەمێک شـوبهاندبوو، سەرەوخوار دانرابێت، کە گوشـاری بۆ هـات بەسـانایی دەکەوێت، چونکە بنـاغەکەی بەتاڵە، واتە سەرکردایەتییەکەی.

هەرچەنـدە نسـکۆی شۆڕشـی گەلـی کوردسـتان ڕژێمـی بەعسـی فاشـی هـار و بـوغراتر کـرد و کـاریگەریی زۆر نێگەتیڤی لەسـەر گشـت چـین و توێژەکـانی خەڵکی کوردستان دانا، بەڵام تۆزقاڵێک ورە و گڕ و تینی بەهێزی ڕێکخسـتنەکانی کۆمەڵەی بـۆ درێـژەدان بە خەبـاتی نهێنـی و خۆئامـادەکردن بـۆ شۆڕشـی نـوێ نەهێنـایە خـوارەوە. هەر بـۆیە سـەرکردایەتیی کـۆمەڵە پلانـی نـوێی بـۆ کـارکردن بەپێـی ئەو هەلومەرجە نوێیەی هاتبووە کایەوە داڕشت.

**سالار ڕەشید:** ئەو دەمەی کە تۆ بوویتە ئەندامی کۆمیتەی شاری کەرکووک، ئەو کۆمیتەیە بێجگە لە سەرپەرشـتیکردنی ڕێکخسـتنەکانی نێوشـاری کەرکووک، ئایا لە شار و شارۆچکە و گوندەکانی دەوروپشتیدا هێڵی ڕێکخستنی هەبوو؟ ئەگەر بکرێ، لەو دەمەدا ژمـارەی ئەنـدامانی کـۆمەڵە لەنێـو شـاری کەرکـووک و پاشـان لە دەوروپشتیدا بە تەقدیری چەند دەبوون؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** بەڵێ جگە لەناو شاری کەرکووک، لە زۆربەی شارۆچکە و گوندەکانی دوروبەری شاری کەرکووک هێڵی ڕێکخستنمان هەبوو. شەهید مامۆستا حەمید کاکەیی سەرپەرشتیی ڕێکخستنەکانی هێڵی چەمچەماڵ و ئاغجەلەری ئەکرد. مامۆستا جەلال برای شەهید حەمەڕەش سەرپەرشتیی هێڵی ناوچەی سەنگاوی دەکرد. شەهید ڕێباز (سەمیع) و عوبێد خالید سەرپەرشتیی هێڵی ناوچەی شوانیان دەکرد. حوسێن سێودین هێڵی ڕێکخستنی بناری گلی گرتبووە ئەستۆ. چەند شانەیەکی ڕێکخستنمان لە خانەقین هەبوو، فایەق عومەر ڕەسوول سەرپەرشتی دەکردن. چەند شانەیەکی ڕێکخستنمان لە خورماتوو هەبوو، مامۆستا کاکەڕەش سەرپەرشتی دەکردن.

ئەوەی ڕاستی بێت، ناتوانم ژمارە بڵێم، بەڵام لەپاش دەستبەکاربوونی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە کە سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتییان دەکرد، ڕێکخستنەکان بە شێوەیەکی بەردەوام لە گەشە و هەڵداندا بوون.

**سالار ڕەشید:** کەی ناوی 'کۆمیتەی ئاگر'تان لە ڕێکخراوی کەرکووک نا و بۆچی ئەو ناوە؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** پرسیارێکی گرنگە بۆ مێژووی کۆمەڵە لە کەرکووک، چونکە تاکوو ئێستا لێرە و لەوێ چەندان باس دەربارەی کۆمیتەی ئاگر و مێژووی پێکهێنانی و چالاکییەکانی بڵاو کراونەتەوە و چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی و ڕۆژنامەوانی لەو بارەیەوە کراون، بەڵام وا دیارە تاوەکوو ئێستا چۆن و لە چ ساڵێکدا کۆمیتەی ئاگر پێک هات، یان ڕاستتر وایە بڵێم، لە چ ساڵێکدا ناوی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە یان ڕێکخراوی کۆمەڵە گۆڕدرا بە کۆمیتەی ئاگر؟ لای زۆربەی کادرە دێرینەکانی کۆمەڵە و کادرانی ئێستای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە کەرکووک ڕوون و ئاشکرا نەبێت. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کاری نهێنیی ئەو دەمە و بەنووسراونەکردنی کۆبوونەوەکان. ئەوەش لەبەر پاراستنی نهێنیی ڕێکخستنەکان لەلایەک و درندەیی ڕژێمی فاشیستی سەدام لەلایەکی تر. هەروەها بەشێکیشی پەیوەندی بە لەبیرچوونەوە هەیە، چونکە سی ساڵ زیاتری بەسەردا بووریوە.

له هەمان کاتدا بۆ ئەوەی ڕاستییەکان بۆ نەوەی ئاییندەمان ڕوون و ئاشکرا بێت و ئەو مێژووەش نەشێوێندرێ و وەک خۆی باس بکرێ، لێرەدا بە پێویستی ئەزانم ئەوە ڕوون بکەمەوە کە بەکارهێنانێکی هەڵە لەناو ڕێکخستنەکانی یەکێتی لە شاری کەرکووک دەربارەی ئەندامێتییان لە ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر هەیە، ئەویش ئەوەیە، لە هەر ئەندامێک بپرسیت بۆ هەر مەبەستێک بێت، دەڵێت: ئەندامی کۆمیتەی ئاگر بوومە! کەچی کۆمیتەی ئاگر لە ماوەی نزیکەی پێنج ساڵدا، تەنها لە پێنج ئەندام پێک هاتبوو: ئەحمەد کرێکار، مام حەمید، شەهید حەمەی ئایشە، محەمەد حەسەن خورشید، عەلی مغاویر. ڕاستییەکەی دەبێت بوترێت: ئەندامی ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر بوومە.

لەپاش گەڕانەوەی بەڕێزان مام جەلال و کاک نەوشیروان و هاوەڵانیان لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٧ بۆ کوردستان، زۆربەی زۆری پێشمەرگە و گشت سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتی، جگە لە شەهیدی سەرکردە کاک ئارام، بۆ پێشوازیکردنیان بۆ ناوچەی بادینان چوون. لە هەمان ساڵدا دەستگیرکردنی کۆمەڵێ هەڤاڵی تێکۆشەری ڕێکخستنە نهێنییەکانی کۆمەڵە لە شاری هەولێر و سلێمانی، وەک، بەڕێز کاک کۆسرەت ڕەسوول، هەروەها ئاشکرابوونی بەشێکی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتیی خوێندکاران، شەهید شامیل و دەربازبوونی بۆ ناو مەفرەزە سەرەتاییەکان و شەهیدبوونی[٢٥٥] لە ماوەیەکی زۆر کورتی تەمەنی پێشمەرگایەتییدا، دەستگیرکردنی کاک شێخ لەتیف ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتیی خوێندکاران و لە هەمووی کاریگەرتر شەهیدبوونی کاک ئارام، ئەمانە گشت بوونە هۆی کزبوون و لە هەندێک شوێندا پچڕانی پەیوەندی لەنێوان شاخ و ڕێکخستنەکانی شارەکان.

ئەوەندەی من ئاگادار بم، پەیوەندیی نێوان ڕێکخستنەکانی شاری کەرکووک لەگەڵ شارەکانی سلێمانی و هەولێر بۆ ماوەی زیاتر لە شەش مانگ پچڕا. لەو ماوەیەشدا لە ناوچەی هەکاری چەندان ڕووداوی دڵتەزێن ڕوویان دا، لەوانە شەهیدبوونی مولازم حەسەن خۆشناو و هاوڕێکانی و شەهیدبوونی نەجات نووری

٢٥٥. شەهید شامیل (شوان عەلی سەعید) لە ڕێکەوتی ١٩٧٧/٩/٣ لە گوندی قازانقایە گیانی بەخشی.

ناسراو به "چالاک" که یەکێک بوو لە پێشمەرگە هەرە چالاکەکانی مەفرەزە سەرەتاییەکان.

بەو شێوەیە ئێمە لە ڕێکخراوی کەرکووکدا هیچ زانیارییەکی باوەڕپێکراومان لەسەر کار و چالاکییەکانی پێشمەرگە و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتی لە شارەکانی تردا نەبوو. بۆیە لەگەڵ کاک ئەحمەد کرێکار قسەم کرد و پێشنیاری ئەوەم کرد، بەیاننامەیەک بەناوی ڕێکخراوی کەرکووکەوە بۆ ڕێکخستنەکان دەربکەین و ڕاستیی بارودۆخەکەیان بۆ ڕوون بکەینەوە.

هەر واشمان کرد و درێژەمان بە خەباتی نهێنیی خۆمان دا، تا لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٧ کاک ئەحمەد کرێکار پێی ڕاگەیاندم کە نامەیەکی دەربارەی چالاککردنەوەی یەکێتیی خوێندکارانی شۆڕشگێڕی کوردستان پێ گەیشتووە، کە پاش شەهیدبوونی شامیل و دەستگیرکردنی کاک کۆسرەت و کاک شێخ لەتیف، پەیوەندیی نێوان ڕێکخستنی شارەکان پچڕا بوون.

لە نامەکەدا باس لەوە دەکات، بەرپرسی خوێندکاران لە کەرکووک بە ناونیشانێکی نهێنی کە لە نامەکەدا دیاری کرابوو، بۆ سلێمانی بێت. ئەو دەمە من وەکوو بەرپرسی شاری کەرکووک چووم بۆ سلێمانی و شوێنی چاوەڕوانی من بۆ ئەو مەوعیدە، بەرامبەر بە مزگەوتی حاجی حەسەنی لۆکە بوو. وەکوو بێتەوە یادم، سەرچاوەی نامەکە مەفرەزەکەی کۆمەڵە بوو لە چەمی سوورقاوشان کە شەهید مام بێستوون سەرپەرشتی ئەکرد.

هەر لە ڕێی مام بێستوونەوە لە ساڵی ١٩٧٦ کاک مەلا بەختیار و کاک ئاوات قارەمانیم ناسی.

منیش لە ڕۆژی دیاریکراودا و بەئاگاداریی کاک ئەحمەد کرێکار و ڕێکخراوی کۆمەڵە لە کەرکووک، چووم بۆ سلێمانی بۆ شوێنی دیاریکراو و کەسێک هات خۆی پێم ناساند، ئەویش بەڕێز کاک قادری حاجی عەلی بوو. کاک قادر باسی چۆنیەتی بەگەڕخستنەوەی یەکێتیی خوێندکارانی کرد و کاتێکیش دیاری کرا بۆ کۆبوونەوەی فراوانی شارەکانی کوردستان و شارەکانی بەغدا و مووسڵ، لە شاری سلێمانی.

لە هەمان کاتدا لەگەڵ کاک قادر باسی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەمان کرد و پێم گوت، وا بۆ ماوەی شەش مانگ زیاترە ڕێکخراوی کەرکووک هیچ پەیوەندییەکی

لەگەڵ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شارەکانی سلێمانی و هەولێر و دەرەوە نەماوە. ئەویش وتی، لە کۆبوونەوەی ڕێکخراوی کەرکووکدا نوێنەری خۆتان دیاری بکەن، تاوەکوو پەیوەندیتان لەگەڵ سلێمانی و هەولێر بۆ دروست بکەینەوە. منیش لە کۆبوونەوەی ڕێکخراوی کەرکووک ئەم بابەتەم باس کرد و وایان بەچاک زانی، ئەو پەیوەندییە لەگەڵ کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ هەر لە ڕێگەی منەوە بێت. لە کۆبوونەوەی داهاتوودا ئەمەم بە کاک قادر ڕاگەیاند.

پاش نزیکەی مانگێک کاک قادر ناونیشانێکی پێ دام، کە هاوڕێیەک لە کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ بەو ناوەوە بۆ کەرکووک دێت. لە کات و ساتی دیاریکراودا لە گەراجی کۆنی سلێمانی بەو ناونیشانەی بۆمی دیاری کردبوو، لەگەڵ هاوڕێ دلێر ئەحمەد (کاک سەلیم) یەکمان ناسی و پاش کۆبوونەوەیەکی چەند سەعاتی، کۆبوونەوەی داهاتوومان لە سلێمانی دیاری کرد.

پاش دوو هەفتە بۆ سلێمانی چووم و لەگەڵ هاوڕێ سەلیم یەکمان بینی. لەو کۆبوونەوەیەدا شێوەی کارکردن و چالاکییەکانی ڕێکخراوی کەرکووکی کۆمەڵە و یەکێتیم باس کرد. ئەویش دەربارەی ڕێنماییەکانی ناوەندیی کۆمەڵە و کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ و شێوەی نوێی کارکردن بە گشتی ڕوونکردنەوەی دا و وتی، هەوڵ ئەدەین پەیوەندییەکان لەنێوان شارەکان و ناوەندیی کۆمەڵە و کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ توندوتۆڵتر بکەینەوە. هەروەها باسی ئەوەی کرد، ناوەندیی کۆمەڵە بە نیازە، بۆ هەر شارێک مۆرێکی تایبەت بە خۆی بۆ ئاڵوگۆڕی نامە لەنێوان ئەو شارە و کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ و ناوەندیی کۆمەڵە و هەرێمەکانی پێشمەرگە دروست بکات. بۆیە دەبێت ئێوەش وەکوو ڕێکخراوی کەرکووک ناوێک بۆ خۆتان دیاری بکەن، بۆ ئەوەی مۆرێکتان بۆ دروست بکەین و بەو ناوەوە ئاڵوگۆڕی نامە بکەن.

منیش لە کۆبوونەوەی ڕێکخراوی کەرکووکدا بەوردی باسی ئەو کۆبوونەوەیەی خۆمم لەگەڵ هاوڕێ سەلیم کرد و لەدوای گفتوگۆکردن لەگەڵ شەهید حەمەی ئایشە و کاک ئەحمەد کرێکار و مام حەمید، بەو ئەنجامە گەیشتین کە ناوی

ڕێکخراوی کەرکووک بکەینە "کۆمیتەی ئاگر". ئەم کۆبوونەوەیە لە سەرەتای مانگی ٣ یان ٤ی ساڵی ١٩٧٨ لەماڵی کاک ئەحمەد کرێکاردا بوو.

لە کۆبوونەوەی داهاتوو لەگەڵ هاوڕێ سەلیم لە هەمان مانگ و لە سلێمانی، ئەم ناوە نوێیەی ڕێکخراوی کەرکووکم پێ ڕاگەیاند. ئەم ناوە بەلای ئەوانیشەوە پەسەند بوو.

پاش ماوەیەک کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ مۆرەکەیان بۆمان نارد، بەڵام بەناوی ڕێکخراوی کەرکووکەوە! منیش لەدواییدا پرسیارم لێ کردن، بۆ مۆرەکەتان بەناوە کۆنەکەوە دروست کردووە؟ لە وەڵامدا وتیان: پێش ئەوەی وەڵامی ئێوەمان پێ بگاتەوە، مۆرەکە بە ناوی ڕێکخراوی کەرکووکەوە دروست کرابوو، ئیتر فریای ئەوە نەکەوتین کە بیگۆڕین، بەڵام ئەتوانن لە کاتی نامە ناردندا، لەپاڵ مۆرەکە، کۆمیتەی ئاگریش بنووسن. شێوەی مۆرەکە لاکێشەیی بوو، چەکوش و داس و ئەستێرەیەکی سووری تێدا بوو.

مۆرەکە لەلای من مایەوە و چەندین نامەمان بۆ ناوەندیی کۆمەڵە و هەرێمی قەرەداغ پێ نارد، کە ئەو کات شەهید ئازاد هەورامی بەرپرسی سیاسیی هەرێمەکە بوو.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠دا مۆرەکەم ڕادەستی کاک ئەحمەد کرێکار کرد، چونکە من لە ناوچەی دوکان بە مامۆستا دامەزرام و کاک ئەحمەدیش پەیوەندیی نێوان کەرکووک و کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆی لە ئەستۆ گرت.

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا باس لەوە کرا، بۆ ئاگاداربوونی زیاتر لە چالاکییەکانی ڕێکخستن و گەشەی ئەندامان، پێویستە هەر ئەندامێکی کۆمەڵە و یەکێتی پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی ئەو شارەوە بکات کە تیایدا نیشتەجێیە. کاک سەلیم وتی، ئەم کارە دەبێت بەوردی و بە شێنەیی ئەنجام بدرێت و هەوڵ ئەدەین لە داهاتوودا جێبەجێی کەین.

**سالار ڕەشید:** ئایا لەو پێنج ساڵەی کە تۆ ئەندامی ڕێکخراوی کەرکووک (و کۆمیتەی ئاگر) بوویت، تەنها هەر ئەو کۆمیتەیە لە شاری کەرکووکدا هەبوو؟

چونکه من دێتەوە بیرم، باسی ئەوە دەکرا، لە کەرکووک دوو کۆمیتە هەیە، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکیان بەر زەربەی دەستگا ئەمنییەکان کەوت، ئەوەی تریان بەردەوام بێت و درێژە بە کاری خۆی بدات؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** لەو ماوەیەی کە من ئەندامی کۆمیتەی ئاگر بووم، تەنها هەر ئەو کۆمیتەیە هەبوو.

**سالار ڕەشید:** ئایا ئەو کۆمیتەیە و ئەو پێنج کەسەی کۆمیتە لەو پێنج ساڵەدا، دانیشتن و کۆبوونەوەکانتان پێکەوە بوو، وە یان نەخێر بە جیا و مونفەسیل بوو؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** کاک ئەحمەد کرێکار وەک بەرپرسی کۆمیتەکە لەگەڵ شەهید حەمەی ئایشە و من پێکەوە کۆ دەبووەوە، لە لەلایەکی تر لەگەڵ مام حەمید و عەلی مغاویریش پێکەوە کۆ دەبووەوە.

دیارە کاک ئەحمەد کرێکار باسی ئەو هێڵانەشی دەکرد کە مام حەمید و عەلی مغاویر سەرپەرشتی دەکردن، بەڵام تەنها وەک چالاکیی ڕێکخراوەیی نەک ناوهێنان، ئەگەرچی بە هۆی هاتوچۆیان بۆلای کاک ئەبووشەهاب من ئەوانم دەناسی.

**سالار ڕەشید:** لەو دەمەدا ئایا ڕێکخستنەکانتان بەسەر کەرت و پۆل و شانەدا دابەش کردبوو، وە یان نەخێر هەر کۆمەڵێک خەت و هێڵی ڕێکخستن بوون، ئەگەر بەڵێ، ئایا هیچ ناوێکتان لێ نابوون؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** تەنها هەر شانە و هێڵی ڕێکخستنمان هەبوو، کەرت و پۆل و ئەو جۆرە ناوانە بەهیچ جۆرێک نەبوون.

**سالار ڕەشید:** هەر وەکوو باست کرد، لەو دەمەدا ئەحمەد کرێکار بەرپرسی کۆمیتەکە بوو، ئەو چوار کەسەی دیکەش ئەندامی کۆمیتەکە بوون، ئایا یەکێک لەو چوار کەسە وەک جێگری بەرپرسی کۆمیتەکە دەستنیشان کرابوو؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** ئێمە وەکوو یەک تیم کارمان دەکرد، بە دوو شانەی جیاواز، من نە جێگر و شتی وام بیستووە، نە هەشبوو.

**سالار ڕەشید:** "کۆمیتەی سەرکردایەتیی ناوخۆ" کەی پێک هات، هۆکارەکەی چی بوو، لە کێ پێک هاتبوو، کەی هەڵوەشایەوە و بۆ؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** بەوردی ساڵی دامەزراندنی نازانم، بەڵام لە سەرەتادا ناوی "کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆ" بوو، پاشان ناوەکەی گۆڕا بە "کۆمیتەی سەرکردایەتیی ڕێکخستنی ناوخۆ". لەو کۆمیتەیەدا تەنها شەهید مامۆستا جەمال تاهیر و کاک سەلیم و کاک قادری حاجی عەلیم دەناسی.

**سالار ڕەشید:** پێکهێنانی شانە و دەستەی چەکدار لەنێو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک لە سەردەمی ئەندامەتی تۆدا هەبووە؟ ئەگەر بکرێ باسی چۆنیەتی پێکەوەنانی ئەو شانانە لە هەر ساڵ و قۆناغێکدا بکەیت: ژمارەیان، فەرماندەکانیان، جۆری چەک و تەقەمەنییەکانیان، چالاکییەکانیان. ئایا ئەو شانە چەکدارانە هیچ ڕاهێنان و مەشقێکیان پێ دەکرا؟ ئەگەر بەڵێ، چۆن و چی بوون؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** لەساڵی ١٩٧٨دا یەکەم شانەی چەکدار لەدوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ لەناو شاری کەرکووک لە دوو کەس بە ناوەکانی سوارە کەمال و خالید مەجید (خالیدی پەرستیار) پێک هێنرا کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە منەوە هەبوو. لە ساڵی ١٩٧٩دا چالاکییەکیان لەدژی (ف.ش) سیخوڕی بەعس لەناو گەڕەکی سەی سەروەر ئەنجام دا.

هەر لە هەمان ساڵدا سێ شانەی تاکەکەسی تری چەکدار پێک هێنرا، لەوانە، شەهید نوعمان کلاوقوتی کە هەر پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە منەوە هەبوو، ئەویش هەر لە ساڵی ١٩٧٩دا چالاکییەکی بە نارنجۆک لە بازاڕی حەسیرەکە بۆ لەناوبردنی ستاری موختار ئەنجام دا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

پاشان شانەیەکی تاکەکەسی تر کە لە شەهید شوان تەپەیی پێک هاتبوو، پەیوەندی بە "فایەق عومەر ڕەسوول"ەوە هەبوو، هەروەها شانەیەکی تاکەکەسی تر لە نائیب زابتێک پێک هاتبوو، پەیوەندی بە مامۆستا کاکەڕەشەوە هەبوو.

چەک و تەقەمەنیمان لە کۆمیتەی ڕێکخستنی ناوخۆوە بۆ دەهات.

دوو دەمانچەمان هەبوو، یەکێکیان لامەی شۆڕش و ئەوەی تریان چواردەخۆر بوو، هەر یەکەیان تەنها یەک شانەی لەگەڵدا بوو، لە کاک قادری حاجی عەلیم وەرگرت و بۆ کەرکووک هێنامەوە.

جگە لەو دوو دەمانچەیە نارنجۆک و لوغمی شەخسیمان لە سلێمانییەوە بۆ دەهات. مەلایەکی نابینا و ژنێک دەیانهێنا کە پەیوەندییان بە کاک فەرهادی دەستگای شەهیدانەوە هەبوو. هەندێ کات کاک فەرهاد تەقەمەنی و بەیاننامەکانی لە لەشی مەلا نابیناکە دەشاردەوە و خۆی لەگەڵی دەهات بۆ کەرکووک. دەمانچە و تەقەمەنییەکانیش لەپاش ئەنجامدانی هەر چالاکییەک، لای خۆم دەمشاردنەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکمان لێ گیرا، هیچ بەڵگەیەک نەدەینە دەستەوە. ئێستاش هەردوو دەمانچەکە و هەندێک تەقەمەنی لەژێر داروپەردووی خانووەکەی ماڵی نەنکم (دایکی ئەبووشەهاب) هەر ماونەتەوە، چونکە کاتێک لەلایەن ئەمنی کەرکووکەوە دەستگیر کرام، سوهەیلەی خوشکم کە ئەویش هەر ئەندامی کۆمەڵە بوو، بەپەلە بۆ ماڵی نەنکمی گواستەوە و شاردینیەوە.

ئەوەی ڕاستی بێت، تا ئەو دەمەی من لە کۆمیتەی ئاگردا بووم، هیچ جۆرە مەشق و ڕاهێنانێک بەو شانە چەکدارانە نەکراون، تەنها ئەوە نەبێت کە خۆیان پێشمەرگەی ئەیلوول بوون. بۆ بەکارهێنانی لوغم و نارنجۆکیش منیان فێر دەکرد و منیش ئەوانم فێر دەکرد.

**سالار ڕەشید:** کەی و چۆن گیرایت و چ تۆمەتێکت لەسەر بوو؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** لە مانگی ٤ی ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووکەوە دەستگیر کرام. چۆنیەتی دەستگیرکردنیشم بەم شێوەیە بوو:

کەسێک بەناوی شێرکۆوە پێشمەرگە دەبێت، دەینێرنەوە بۆ کوشتنی قالە فەرەج، دەمانچە و تەقەمەنیشی پێ دەبێت. شێرکۆ پێش ئەوەی بگاتە کەرکووک، لە گوندی قەمەر لە ناوچەی شوان لا ئەدات و کەسێک بەناوی جەبارەوە دەناسێت و باسی کارەکەی خۆی بۆ دەکات. توومەزە ئەم جەبار ناوە سیخوڕی ئەمنی کەرکووک دەبێت و پێی دەڵێت، من ئەتوانم بۆ گەییشتن بە کەرکووک، هاوکاریت بکەم.

لەولاشەوە پەیوەندی بە ئەمنی کەرکووکەوە دەکات و بە ئاگاداریی ئەوان شێرکۆ دەگەیەنێتە کەرکووک و دوو ڕۆژ و دوو شەو لە کەرکووک دەمێنێتەوە. شەوێکیان لە ماڵی خۆیان و شەوێکی تریش لە ماڵی هاوڕێیەکی بەناوی عەلی سابیر لە گەڕەکی ئیمام قاسم. ئەم دوو ڕۆژ و شەوەش لەژێر چاودێریی ئەمنی کەرکووکدا دەبێت، بۆ ئەوەی بزانن پەیوەندی لەگەڵ کێدا دەکات. دوای ئەو دوو ڕۆژە بە دەمانچە و تەقەمەنییەکانەوە دەستگیری دەکەن. لە هەمان کاتدا باوکی شێرکۆ و عەلی سابیری هاوڕێیشی دەستگیر دەکەن. لەپاش ئەشکەنجەیەکی زۆر، بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووک پێی دەڵێن، دەبێت تۆ لەسەر محەمەد حەسەن خورشید ئیعتیراف بکەیت و بڵێیت، ئەم دەمانچە و تەقەمەنییانەم لای پێشمەرگەوە بۆ ئەو هێناوە، ئەگەر نا، بە جیا لەوەی کە خۆت هەر ئیعدام ئەکرێیت، ئەوا باوکیشت هەمان چارەنووسی تۆی دەبێت، هەرچەندە دەشزانین کە باوکت بێتاوانە. ئەویش نە منی دەناسی و نە دەیزانی من کێم، بۆ ڕزگارکردنی باوکی، ناچار لەسەر لاپەڕەیەک ئیمزای دەکات کە دەمانچە و تەقەمەنییەکانی بۆ من هێناوە.

ئەمەی سەرەوە دواوتەی شەهید شێرکۆ بوو لە زیندانی مووسڵ، پێش ئەوەی لە سێدارە بدرێ، بۆی گێڕامەوە و داوای لێبووردنی لێم کرد کە بە هۆی ئەوەوە تووشی ئەو هەموو ئازارە بووەمە، سووریش بوو لەسەر ئەوەی کە بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووک ئەم کارەی پێ کردووە. لە ڕۆژی دادگاییکردنیشدا لە هەیئەی کەرکووک بە دادوەرەکەی گوت: من ئەم محەمەد حەسەن خورشیدە نە دەناسم و نە بینیومە، ئەمنی کەرکووک ئەو ئیعتیرافەی بەزۆر پێم ئیمزا کردووە، ئەم پیاوە هیچ پەیوەندییەکی بەو شتانەوە نییە.

ئێستاشی لەگەڵدا بێت، نەمزانی چۆن لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووکەوە ئاشکرا بووم. لە کاتی ئەشکەنجەدانیشدا تەنها پێیان دەگوتم: ئێمە دەزانین تۆ لەگەڵ "عوسات" کار دەکەیت، دەبێت ئیعتیراف بکەیت! منیش هەموو ئەو قسانەم بەدرۆ ئەخستەوە، بەڵام دیارە لەناو ڕێکخستن، یان لە دەرەوە، واتە، کاتێک هاتوچۆی لای پێشمەرگەم کردووە، کەسێک خەبەری لێم داوە.

**سالار ڕەشید:** چ زانیارییەکت دەربارەی ئەو شانە چەکدارانەی دوای خۆت، مەبەستم، مەلا محێدین و هاوڕێکانی هەیە؟ ئەمانە چۆن پێک هاتن، پەیوەندییان بە کێ و بە کوێوە هەبوو، کەی درانە لای کۆمیتەی ئاگر؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** تاکوو سەرەتای ساڵی ١٩٨٠ ئەو هێل و شانە چەکدارانە پەیوەندییان بە کۆمیتەی ئاگرەوە نەبوو، چونکە ئێستاش لە یادم ماوە، پێش ئەوەی دەستگیر بکرێم بە یەک دوو هەفتە، چەند هاوڕێیەکی ڕێکخستن لە گەڕەکی ئیمام قاسم کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بە منەوە هەبوو، لە جموجووڵ و قسەکردنی ئاشکرای چەند کەسێک ئاگاداریان کردمەوە. منیش پرسیاری ئەو کەسانەم لەو هێڵانەی لای خۆم کرد، هیچ پەیوەندییەکیان بەوانەوە نەبوو. پاشان لە کۆبوونەوەی هەفتانە لەگەڵ کاک ئەحمەد و شەهید حەمەی ئایشە باسی ئەو چەند کەسەم کرد، ئەوانیش هەر وایان وت. بەڵام کاک ئەحمەد وتی، دەبێت لە مام حەمید و عەلی مغاویریش بپرسم، بەڵکوو پەیوەندییان بەوانەوە هەبێت. هەفتەی داهاتوو کاک ئەحمەد لە کۆبوونەوەی هەفتانەی خۆماندا وتی، ئەوانیش دەڵێن، پەیوەندییان بە ئێمەوە نییە. بەڵام کاک ئەحمەد وتی، ڕەنگە لەڕێی هاتوچۆی گوندەکانەوە پەیوەندییان بە پێشمەرگەوە هەبێت، پاشان لەو بابەتە ئەکۆڵمەوە. لەدوای ئەوە بە چەند ڕۆژێک من دەستگیر کرام.

لەپاشاندا و لەدوای ڕاپەڕینە پڕ شکۆکەی ساڵی ١٩٩١ لە هاوڕێیانم بیستەوە، لەوانە کاک ئەحمەد کرێکار: ئەو هاوڕێیانە لەدوای چوونە دەرەوەی هاوڕێیانی سەرکردایەتیی زیندان، پەیوەندییان بە هەرێمی دووی کەرکووکەوە هەبووە.

دیارە هەر وەکوو هاوڕێیانیش باسیان کردووە، دواتر ئەو هێڵە تەسلیم بە عەلی مغاویر کراوە و دواتر ئەوانە هەر هەموو لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دیکە کە بەهۆی تەشکیلەی تازەوە عەلی مغاویر ناسییانی، لەلایەن ئەمنی کەرکووکەوە دەستگیر دەکرێن.

هەرچی دەربارەی پێکهێنانی شانە چەکدارەکانی دوای مانگی ٤ی ساڵی ١٩٨٠یە، ئەوە چاکترە لە کاک ئەحمەد و مام حەمید و مامۆستا کاکە ڕەش و عومەر قادر و فایەق عومەر ڕەسوول بپرسی.

**سالار ڕەشید:** چ زانیارییەکت دەربارەی عەلی مغاویر و گرتنەکەی و ڕۆڵی ئەو لە شاڵاوی گرتنەکان بۆ سەر کۆمیتەی ئاگر هەیە؟ ئەو خەتەی ئەو لە کێ پێک هاتبوو، کێی ڕاستەوخۆ دەناسی ...؟

**محەمەد حەسەن خورشید:** باشتر وایە لەو برادەرانە بپرسی کە لە وەڵامی پرسیاری پێشوودا ناویانم هێنا، چونکە ئەوان وردەکاریی ئەوە دەزانن، ئەوەی منیش لەوانم بیستووە دەڵێن:

عەلی مغاویر پاش گرتنەکەی لەلایەن ئەمنی کەرکووکەوە بە یەک دوو هەفتە، ئازاد دەکرێت و لە بەرچاوی خەڵکی خۆی وەک شێت ئەنوێنێت، گوایە وای لە ئەمنی کەرکووک گەیاندووە، ئەم شێت بووە و ئەمنیش باوەڕی پێ کردووە و ئازادی کردووە.

هەرچەندە کاک ئەحمەد کرێکار بۆی گێڕامەوە، دوای ئازادبوونی عەلی مغاویر، زۆر هەوڵی داوە کە قسەی لەگەڵدا بکات، بەڵام ئەو خۆی لێ شاردووەتەوە. لە دواجاردا لە ماڵی مام حەمید دەی بینێت، وەکوو شێت خۆی نیشانی ئەویش دەدات، بەڵام کاک ئەحمەد پرسیاری زیندانیکردن و ئازادکردنەکەی لێ دەپرسێت، ئەویش پێی دەڵێت: من خۆم لێ کردن بە شێت و بەبێ ئەشکەنجە ئازادیان کردم. کاک ئەحمەد وتی: باوەڕم پێی نەکرد و ئەو هەستەم لەلا دروست بوو کە نهێنی ڕێکخستنی لای ئەمن درکاندبێت. ئیتر کاک ئەحمەد هەر ئەو جارە دەیبینێ و دەڕواتە دەرەوە. بەڵام برادەرانی تر، ئەوانەی پەیوەندییان بە عەلی مغاویرەوە هەبوو، هەموویان ئیعتیراف لەسەر عەلی دەکەن و دەڵێن ئەو بەرپرسمان بووە، کەچی ئەمن دەستگیری ناکات.

**فینلاند**

**٢٠١٦/١٠/٦**

# عومەر قادر عەلی (نەبەز)
# سەرنجێکی کورت لەسەر خەباتی نهێنیی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک

لە بەهاری ساڵی ١٩٧٤ لە ڕێگای هەڤاڵ "نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا"وە، کاتێک کە لە ئامادەیی کوردستان خوێندکاری پۆلی چوارەم بووم و تەمەنم تەنها ١٧ ساڵان بوو، سەرەتای پەیوەندیکردنم بوو بە ڕیزەکانی "کۆمەڵەی مارکسی-لینینی کوردستانی عێراق"ەوە.

لە ئەڵقەیەکی ڕۆشنبیری ڕێک خراین کە لەبەر هەلومەرجی سەختی ئەو سەردەمەی دەسەڵاتداریتی ڕژێمی بەعس، تەنها سێ کەس لە شانەیەکدا بووین. شانەکەی ئێمە پێک هاتبوو لە بەندە و حەمید فەرزە عەلی و نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا.

کۆبوونەوەی بەردەوامی هەفتانەمان هەبوو، بەزۆری کۆبوونەوەکانمان لە مالی هەڤاڵ نەجمەدین ئەنجام ئەدا کە کەوتبووە گەڕەکی ئیسکانی کەرکووکەوە. بابەتی کۆبوونەوەکانمان بابەتی خۆڕۆشنبیرکردن بوو بە ئەدەبیاتی مارکسیی لینینی بە تایبەتی نووسراوەکانی ماو تسیتۆنگ، سەرەڕای هەندێک بابەت لەسەر شێوازی ڕێکخستنی نهێنی و دیسیپلینی ڕێکخستن.

کاری ڕێکخستن لەناو هەوادارانی کۆمەڵە بۆ هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی کە ببن بە ئەندام، بە شێوەیەکی نهێنی درێژەی هەبوو. چونکە لەو دەورانەدا هەر کەسێک هەتا مەرجەکانی تێدا نەبووایە، بە ئاسانی نەیئەتوانی ببێت بە ئەندامی کۆمەڵە، لەوانە، ناو و ناوبانگی، ڕابردووی، ئاستی گەشەکردنی فکری و پاراستنی نهێنی و ئیلتیزامی بە ئەرکەکانی لەناو ڕیزەکانی ڕێکخستن.

لەپاش ڕێکەوتننامەی جەزائیر و هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول، هەندێک کە ئەندامی ئەو ئەڵقانە بوون، ڕیزەکانی ڕێکخستنیان بەجێ هێشت. ئەوانەی مانەوە بە بڕوایەکی پۆڵایین و بە حەتمییەتی سەرکەوتنی شۆڕش، لە جاران زیاتر سووربوون لەسەر بەردەوامیدان بە ڕێبازەکەی کۆمەڵە.

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٥ و لەدوای دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان خۆمان بۆ دەورانێکی نوێی خەبات و کاری ڕێکخراوەیی ئامادە کرد، لەوانە: بڵاوکردنەوەی بەیاننامەی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بڵاوکراوەکانی تر کە لەو کاتەدا هیچ جۆرە کەناڵ و میدیایەک نەبوو، تەنها ئەندامان و کادران بوون پەیامی شۆڕش و دامەزراندنی یەکێتییان لەنێو کۆمەڵانی خەڵکدا بڵاو دەکردەوە.

ئێمە لە گەڕەکی حەمام عەلی بەگ دادەنیشتین و لە حەوشێکی گەورەی چەند خێزانیدا بووین، بۆیە زەحمەت بوو لە کاتژمێری دوانزەی شەو بەدواوە دەست بە بڵاوکردنەوەی بەیاننامە بکەم، بەڵام هەرچۆنێک بێت بە هاوکاریی ڕاستەوخۆی خوشکێکی گەورەم بەناوی زەکییە، ئەو کارەم دەکرد.

زەکییە ئەندامی ڕێکخستن بوو، بەڕاستی دەورێکی گەورەی لە بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەکان دەبینی کە دەیخستە ژێر عەباکەیەوە و پێکەوە بەناو کۆڵانەکانی

حەمـــام عەلـــی بەگ و قـــۆریە و شـــاترلوو دەگەڕایـــن و لە زەرفـــی نـــامەدا بڵاوکراوەکانمـــان دەخســـتە ژێـــر دەرگـــای مـــاڵی کەســـە نـــاودار و کەســـایەتییە چاکەکانەوە، بە مەبەستی پڕۆپاگەندە بۆ دامەزراندنی یەکێتی و هەڵگیرساندنەوەی شـۆڕش. ئەم کارانەمـان سـاڵی چەنـد جارێـک دووبـارە دەکـردەوە، بـۆ نمـوونە: لە ساڵیادی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشـی ١٩٧٦، دامەزراندنی ڕێکخراوەکانی خوێندکاران و ژنان.

لە سـاڵی ١٩٧٦ لەگەڵ هەڵگیرسـاندنەوەی شـۆڕش و دروسـتبوونی مەفـرەزەی دیعایات موسەلەح، هەڤاڵ نەجمەدین فەقێ چووە دەرەوە و لە ناوچەی قەرەداغ بـوو بە پێشمەرگە، بۆیە پەیوەندیی بەندە گوازرایەوە بـۆ لای هەڤاڵ مـحەمەد حەسـەن ناسراو بە حەمەی سانییە.

لە ساڵی ١٩٨٠ گرتنی پچڕ پچڕ هەڤاڵانی ڕێکخستنی کۆمیتەی ئاگری گرتەوە. مامۆسـتا مەدحەت و مەلا مـحەمەد ناسـراو بە حەمەی ئایشـە و مامۆسـتا حەمیـد گیـران، بەڵام قارەمانـانە نهێنییەکانیـان لەگەڵ خۆیانـدا بـردە ژێـر گـڵەوە. هەروەهـا مـحەمەد حەسـەن دەسـتگیر کـرا و حـوکمی ئیعـدام درا، پاشـان حـوکمەکەی کـرایە زینـدانیی هەتاهەتـایی. لە هەمـان کاتـدا مامۆسـتا کـاکەڕەش دەسـتگیر کـرا و پـاش ماوەیەکی کورت بێ ئەوەی دان بەهیچ شتێکدا بنێت، ئازاد کرا.

شایانی باسە هەر لە کۆتـایی حەفتاکـان و سـەرەتای هەشـتاکاندا چەنـد هەڤاڵێکی تری ڕێکخستنم ناسی و پەیوەندییان بە خۆمەوە هەبوو لەوانە: سـەردار سـەعید کە ئێسـتا لە دانیمـارک نیشـتەجێیە، مامۆسـتا نەجمەدیـن کە ئێسـتا مامۆسـتای ئامـادەیی کوردسـتانە لە کەرکـووک، کـاک بەکـر مەعـاون تـوبییە لە نەخۆشـخانەی ئـازادیی کەرکووک، هەروەهـا فاریق حوسـێن دەرچـووی بەشـی کیمیـای زانکـۆی سـلێمانییە، مامۆستا ئەحمەد گۆگجەیی ئێستا سەرپەرشتیاری پەروەردەییە لە کەرکووک، مەلا ڕەشید کە سەرپەرشتی خەتێکی ڕێکخستنی فراوانی لە گوندی چیمەنی کەرکووک دەکرد.

ئەو خەتەی کە مەلا ڕەشید بەرپرسی بوو، لە ڕێکخستنی ژنان و پیاوان پێک هاتبوو، فەتحییە ئەحمەدی هاوسەری سەرپەرشتیی خەتی ژنانی دەکرد، پێک هاتبوو لە چەند مامۆستایەک بەم ناوانە: پرشنگ، پەخشان، ڕووناک، ئەڵماس.

هەروەها شەهید عەبدولخالق ناسراو بە شەهید چیا سەرپەرشتی چەند شانەیەکی ڕێکخستنی دەکرد، پاش گرتنی بەندە، چووە دەرەوە و بوو بە پێشمەرگە لە تیپی ۲۱ی کەرکووک و مەخابن تەمەنی پێشمەرگایەتی کورت بوو، لە شەڕی قازان شەهید بوو. شەهید زاهیر خوێندکاری کۆلێجی علووم بوو لە بەشی کیمیا لە زانکۆی سلێمانی، ئەویش پاش گرتنی ئێمە، چووە دەرەوە و لە پێشمەرگایەتی شەهید بوو.

**سەروبەندی ساڵانی ۱۹۸۰-۱۹۸۱**

ئەم دوو ساڵە لە مێژووی کۆمەڵە و کۆمیتەی ئاگردا بە ساڵانی پڕ لە قەیران دەژمێردرێن، لەبەر ئەوەی کۆمەڵێک هاوڕێی چالاکی تێدا دەستگیر کران کە هەندێکیان گیانیان لە دەست دا و هەندێکی تریان حوکمی جۆراوجۆریان بەسەردا درا. ڕێکخستنەکانیش بۆ ماوەیەک لێک ترازان و شارەکەش بۆشاییەکی ڕێکخستنی تێ کەوت.

لە بەهاری ساڵی ۱۹۸۱دا لە دەرەنجامی ئاشکرابوون و زیندانیکردن و چوونەدەرەوەی زۆربەی جەمسەرەکانی کۆمیتەی ئاگر و پەیوەندیکردنی کاک ئەحمەد کریکار وەکوو بەرپرسی ئەو کۆمیتەیە بە هێزی پێشمەرگەوە، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک پێویستیی بە ئاراییشدانەوەیەکی نوێ هەبوو. ئەوە بوو کۆمیتەی سەرکردایەتیی ڕێکخستنی ناوخۆ کە ئەو کات شەهید جەمال تاهیر بەرپرسی بوو، کاک دلێر ئەحمەد شوکری (سەلیم سەرسپی)یان بۆ کەرکووک نارد، بۆ پێکهێنانەوەی کۆمیتەی ئاگر. بۆ ئەو مەبەستە کۆبوونەوەیەکمان لە ماڵی ئێمە لە گەڕەکی شاترلوو بە ئامادەبوونی مامۆستا کاکەڕەش ئەنجام دا و کۆمیتە لەم کەسانە پێک هێنرایەوە:

۱) مامۆستا کاکەڕەش، بەرپرسی کۆمیتە.

٢) عومەر قادر، جێگر بۆ بەشی ڕۆژئاوای کەرکووک.
٣) ئەسعەد عەزیز ( شێخ دارا)، جێگر بۆ ڕۆژهەڵاتی کەرکووک.

هەر لە بەهاری ساڵی ١٩٨١دا کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە لە گوندی مالیمۆس بەڕێوە چوو. بەندە وەکوو نوێنەری کۆمیتەی ئاگر و ڕێکخستنەکانی کەرکووک و شەهید ئەسعەد عەزیز وەکوو نوێنەری لقی کەرکووکی کۆمەڵەی خوێندکاران بەشداری ئەو کۆنفرانسەمان کرد. واتە: لە کەرکووک دوو کەس بەشدار بووین.

لە مانگی ١٩٨١/١٠ شالاوی گرتنەکان بۆ سەر ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر دەستی پێ کرد و ژمارەیەکی زۆر گیران و ژمارەیەکیش هەڵهاتن.

**چۆنیەتی گرتنەکەم**

بەرەبەیانی ڕێکەوتی ١٩٨١/١٠/٢١ لە کاتێکدا چەند ڕۆژێک بوو مامۆستا کاکەڕەش لە ماڵی ئێمە ئیختیفا بوو، چەند مەفرەزەیەکی ئەمنی کەرکووک هەڵیان کوتایە سەر ماڵمان کە لە کۆلانێکی باریکی گەڕەکی شاترلوودا بوو و لە دەرگایان دا. کاتێک کە دەرگای ژوورەکەم کردەوە، دەبینم هێزێکی گەورە سەربانی خانووەکەیان گرتووە، کە بەشێکیان جامانەسوور بوون. گەڕامەوە بۆ ژوورەکە و مامۆستا کاکەڕەشم ئاگادار کردەوە. مامۆستا خۆی شاردەوە و خۆمیش چوومە دەرەوە بۆ ئەوەی نەچنە ژوورەوە و مامۆستا کاکەڕەش نەبینن. خۆم و برایەکی بچووکم بەناوی هادی دەستگیر کراین و بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووک گوێزراینەوە و پاشان دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدانمان.

پاش هەفتەیەک بردمانیان بۆ هەیئەی کەرکووک، بۆ ئەوەی دووبارە لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا بکەن. دوای ئەوە پەروەندەکانمانیان مۆر کرد و ڕەوانەی دادگای تایبەتیی کەرکووکیان کردین.

لە مانگی ١٩٨٢/١ لە ماوەی سێ ڕۆژدا دادگایی کراین:

**یەکەم:** ١٠ کەسمان حوکمی ئیعدام دراین کە ئەمە ناوەکانیانە:

ئەسعەد عەزیز سۆفی، محێدین حوسێن حەسەن، فارووق عومەر وەلی، فەهمی ئەمین ڕەشید، عەبدولقادر بەکر قادر، عەبدولجەبار فەرەج ساڵح، حەسەن محەمەد عەلی، ڕەشاد محەمەد ئەمین، جەنگی نەجمەدین، فەرهاد محەمەد سەعید.

**دووەم**: ٢١ کەسمان حوکمی جۆراوجۆر دران، ئەمەش ناوەکانیانە:

سەردار سەعید ئەمین، حەسەن محەمەد قادر، ڕەشید مەجید، موحسین عومەر سدیق، حەمید محەمەد کاکەمەند، عەلائەدین محەمەد قادر، عەبدولڕەحمان حەمید، حەبیب محەمەد حەبیب، سیروان ئەحمەد قادر، فایەق عومەر ڕەسوول، عومەر قادر عەلی، ئەنوەر محەمەد ئەمین، نامیق شەریف، حەسەن ئەحمەد محەمەد، سەعدوڵا ئەحمەد عەزیز، هیوا عەبدولعەزیز محەمەد، عەبدولسەلام قادر مستەفا، سابیر عەبدوڵا حەسەن، جەلیل حەمە مراد، سابیر مەحموود عەلی، عەسرییە ئەحمەد محەمەد.

**سێیەم**: ٤ کەسمان لێ ئازاد کران کە ئەمانەی لای خوارەوە بوون:

مفەوەز جەمال عەبدوڵا، چەتۆ مەجید، تەیب ڕەشید، نەجمە ئەحمەد.

**چوارەم**: ١٧ کەسمان بێسەروشوێن کران، هادی برام یەکێک بوو لەوان، پاشان بەپێی دۆکیۆمێنتەکانی سەردەمی بەعس بۆمان دەرکەوت، لە ساڵی ١٩٨٣ لە بەغدا ئیعدام یان گولەباران کراون.

دوای ئەوە ڕەوانەی زیندانی ئەبووغرێب کراین و لە ڕێکەوتی مانگی ٧ی ساڵی ١٩٨٢ بە لێبووردنی گشتی ئازاد کراین.

ئەو تۆمەت و تاوانانەی کە لەلایەن دەستگای ئەمنەوە خرابوونە پاڵ من، ئەمانەی لای خوارەوە بوون:

**یەکەم**: بەشداریکردنم لە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە.

**دووەم**: بەرپرسیارێتیم لە کۆمیتەی ئاگر.

بەڵام من توانیم لە کاتی لێکۆڵینەوەدا، ئەو تۆمەتانە ڕەت بکەمەوە و دانیان پێدا نەنێم، بەمەش خۆم لە حوکمی سێدارە ڕزگار کرد. بەڵام جەلادەکان قەناعەتیان نەبوو، بۆیە ڕق و قین و داخی دڵی خۆیان بەسەر هادی برامدا ڕژاند و پاش لێبووردنی گشتی ئازادیان نەکرد و لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێکانی بێسەروشوێن

کران و پاشان بۆمان دەرکەوت، لە سێدارە دراون (هەزار سڵاو و درووود بۆ گیانی پاکیان).

زیندانی ئەبووغرێب لە ڕووی پێداویستی و دیدارەوە زۆر لەگەڵ زیندانی ئەمن و هەیئە جیاواز بوو. هەر وەکوو دەڵێن، زیندان قوتابخانەیە لە هەموو ڕوویەکەوە، منیش لەو قوتابخانەیە زۆر شت لە خۆڕاگری و پشوودرێژی فێر بووم.

دەمەوێت سەرنجتان بۆ ڕۆڵی تێکۆشەرە ژنەکان لەو ڕۆژگارە سەخت و دژوارەدا ڕابکێشم کە بە ڕۆژانی دانانی بنەما و بناغەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ئەژمار دەکرێت. ئێمەی پیاوان ئەگەر ئەو ژنانە نەبوونایە، هەرگیز نەماندەتوانی درێژە بە کارەکانمان بدەین کە لە سەرەتاوە هەڤاڵان: لەمیعە خان، سوهەیلە حوسێن، بەهار تاڵەبانی، ناهیدە کەریم، زەکییە قادر، ژیان کەریم، وەردە خان، فەتحییە ئەحمەد، پرشنگ، پەخشان، ڕووناک، ئەڵماس ...هتد. دەوری باڵایان تێدا بینی. پاشان هەندێک لەو هەڤالانە لەگەڵ هەڤاڵانی تری ژنان لە سلێمانی و هەولێر ڕێکخراوی شەهید لەیلایان پێک هێنا و بوونە هەوێنی دروستبوونی ڕێکخستنی ژنانی یەکێتی.

ئەوەی شایانی باسە، پاش گرتن و لێکترازانی کۆمیتەی ئاگر، کەرتی شەهید سیروان کە پەیوەندی بە دەرەوە هەبوو، شەهیدی نەمر محەمەد ئەحمەد ڕەحمان بەرپرسی بوو، خۆی و هەڤاڵەکانی دەورێکی ئێجگار گرنگیان لە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە تەنزیمییەی کە لە کەرکووکدا هاتە کایەوە بینی.

لە کۆتاییدا سەری ڕێز و نەوازش بۆ گیانی پاکی شەهیدانی کوردستان بە گشتی و شەهیدانی کۆمیتەی ئاگر بە تایبەتی دادەنەوێنم.

ناویان هەر بەرز و پیرۆز بێت.

**کەرکووک**

**٢٠١٦**

## مەلا خەلیل (خەلیل عادیل سابیر)
## (یاداشت)

کاتێک کە پەیماننامەی جەزائیر لە ساڵی ١٩٧٥ لە نێوان عێراق و ئێران مۆر کرا، هێزێکی زۆری پێشمەرگە لە شەو و ڕۆژێکدا خۆیان ڕادەستی عێراق و ئێران کردەوە. ئا لەو کاتەدا خەڵکی بەتەواوی ورەیان بەردابوو و کەسانێکی زۆر هەبوون هیچ بڕوایەکیان بەسەرهەڵدانەوەی شۆڕش نەبوو. ئەو دەمە ڕژێمی فاشیستی بەعس زۆر بەهێز بوو، لە هەموو ناوچەکانی کوردستان، لە شار و گوند و لە چیاکان بنکەی سەربازی و سیخوڕی دائەمەزراند و دەستی لە هیچ شتێک نەدەپاراست.

ئا لەو کاتەدا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان زەنگی شۆڕشی لێ دا و مژدەی دەستپێکردنەوەی خەباتی گەیاندە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان.

ئێمە لەو کاتەدا کە کۆمەڵێک هاوڕێی خوێندکار (ئازاد فەقێ عەبدوڵا ڕەشید، نەوزاد محەمەد ساڵح، کەمال ئەمین، سەلاح ئیسماعیل، شەهید ئەسعەد عەزیز

سۆفی) جێگەمتمانەی یەکتری بووین، پەیوەندیمان بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کرد. ئێمە ئەو کۆمەڵە هاوڕێیە، پەیوەندیی ڕاستەوخۆمان بە یەکەوە هەبوو، بەنهێنی کۆبوونەوەمان لە ماڵی یەکتری ئەکرد، وە یان بەدەم پیاسەوە بۆ ڕێگای دوور ئەڕۆییشتین، بە تایبەتی بۆ ئەو شوێنانەی کە کەس نەیدەناسین.

لە کۆبوونەوەکانماندا باسی کتێبی جۆراوجۆری ئەدەبی و مێژوویی و سیاسیمان دەکرد و باسی ئەوەمان دەکرد کە چۆن بیروباوەڕەکەمان لەنێو خەڵکیدا بڵاو بکەینەوە و لەگەڵ خەڵکیدا چۆن ڕەفتار بکەین و کاتێکیش بووینە پێشمەرگە، دەبێت چۆن خۆشەویستی لای خەڵکی بین.

هەر لەو سەرەتایەدا بوو، بەیانی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانم بڵاو کردەوە.

پاش ماوەیەک پەیوەندییەکەم بۆ لای هاوڕێ سالار ڕەشید گوازرایەوە کە هاوگەڕەکیش بووین.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٩دا کە ئەو دەمە ئامادەیی پیشەسازیم تەواو کرد، لە پەیمانگای نەوتی بەغدا وەرگیرام، شەهید ئەسعەد عەزیز سۆفی کە پێشتر ئەمناسی و پەیوەندیمان پێکەوە هەبوو، ئەندامێکی چالاک و لەخۆبوردووی کۆمیتەی ئاگر بوو، داوای لێم کرد، ببمە پێشمەرگە. منیش سەرباری ئەوەی تازە لە پەیمانگای نەوت وەرگیرابووم و کوڕی گەورەی ماڵ و خاوەنی پێنج خوشک و چەند برا بووم، ڕەزامەندیم دەربڕی.

ماڵئاواییم لە هاوڕێ سالار کرد کە تا ئەو دەمە ئەو بەرپرسم بوو، بە چاوساغی هاوڕێ ئەسعەد لە ناوەڕاستی مانگی ١٢ی ساڵی ١٩٧٩دا گەییشتمە گوندی عەودالان و پەیوەندیم بە هەرێمی دووی هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کرد کە غەریب سەعید عەسکەری فەرماندەی بوو، پاشان هاوڕێ ئەسعەد خۆی گەڕایەوە.

چەند ڕۆژێک دوای ئەوە خۆفرۆشێک لە گوندی عەودالان هاتە ناومان و ڕێوشوێن و خەبەری ئێمەی بە سەربازگەکەی سووسێ گەیاندبوو.

دەمەو عەسری ڕێکەوتی ١٩٧٩/١٢/٢١ هێزێکی زۆری جەیش و جاش بە هێلیکۆپتەری جەنگییەوە لەنێو گوندەکە دەوریان گرتین و بووە شەڕ و پێکدادان. پێشمەرگەکان خۆیان دەرباز کرد و منیش نەشارەزا و بێ چەک، بریندار بووم و پاشان بەدیل گیرام. یەکسەر من بە ئەفسەرەکەم وت، من پێشمەرگە نیم، بەڵکوو

لەلای ئەوان دیل بوومە و گومانی ئەوەیان لەسەرم هەبووە کە من سیخوڕی حکوومەت بم.

ئیتر تاوەکوو منیان گەیاندە سەربازگەی قوات خاسەی تانجەڕۆ لە سلێمانی، لە چەند لاوە سەرمیان شکاند و بە شەق و کێبڵ کەوتنە گیانم و وایان لێم کرد، خۆم داوا بکەم کە بمکوژن. ئەو دەمە بەفر بارییوو و دنیا گەلێک سارد بوو، ڕووتیان کردمەوە، تەنها شەرواڵە کورتەیەکم لەبەردا مابوو، لەگەڵ لێدانی کێبڵ پێستەکەم هەڵدەستا و شوێنەکەی هەڵدەئاوسا، ئینجا ئەوان ئاوی سارديان بەسەردا دەکرد. ئەمە هەتا نیوەشەو درێژەی کێشا. دوای ئەوە بە دەستبەستراوی هەتاوەکوو بەیانی هێشتمیانەوە و هەر کەسێک بە تەنیشتمدا دەڕۆییشت، بە شەق ئەکەوتە لێدانم و بە تایبەتیش لە سەرمیان ئەدا.

دوای ئەوە بۆ دەستگای لێکۆڵینەوەی تایبەتیان (هەیئەی خاسە) گواستمەوە کە لەناو فەیلەقی کەرکووک بوو. لەگەڵ گەییشتنم بەوێ و هەر لەناو حەوشەکە، هەرچییەکم پێ بوو لێمیان سەند. سەربازەکان کە هەموویان قوات خاسە بوون، یەکسەر هاواریان لێم کرد، سەر بەرز نەکەمەوە و سەیری کەس و هیچ لایەک نەکەم. ئیتر بەگیرفانی خاڵی و بە سەری ڕووت و پێخاوسی کردمیانە ژوورەوە. سەیرێکی دەوروپشتم کرد، شوێنێکی ترسناک و کپ و خوێناوی بوو.

منیان بردە ژووری ژمارە ٢، کە چوومە ژوورەوە سەیرم کرد، پڕی لە زیندانییە و هەموویان ڕیشیان درێژ و جلوبەرگیان دڕاوە. ژوورێکی زۆر پیس بوو، بۆنێکی ناخۆشی لێ ئەهات کە باسکردنی زەحمەتە.

زۆربەی زیندانییەکان پێشمەرگە و ئەندامی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون، هەروەها پارتی و شیوعیشی تێدا بوو.

هاوڕێ یەکێتییەکان بە پلەی یەکەم لەناو ژوورەکە لێم کۆبوونەوە و پرسیاریان لێم کرد، لەسەر چی گیراوم، منیش وتم، پێشمەرگە بووم و بە برینداری گیراوم.

چەند هاوڕێیەک وەکوو شەهید ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال سووورداشی و بەرزان محەمەد کاکە و خەیروڵا تاڵەبانی و زیندانییانی دیکەی ناو ژوورەکە پرسیاریان کرد کە چیم لە ئیفادەکەمدا وتووە؟ وتم: وتوومە بۆ سەردانی خزمێکم چوومە، ناوی مارف مەولوودە و کچەکەی پێم داوە کە ناوی شلێرە، بەڵام پێشمەرگە منیان گرتووە و گومانی ئەوەیان لێم کردووە کە جاسووسی حکوومەت بم و

جانتایەکیشیان بە کۆڵمەوە بەستەوە و وتیان، ئەوە پڕی لە قومبەلەیە، ئەگەر ڕا بکەیت، ئەوا ئەتەقێتەوە و ئەتکوژێت. ئیتر خۆشبەختانە جەیش هات و ئەوان ڕایان کرد و منیش خۆم گەیاندە سەربازەکان و ڕزگارم بوو. وتیان ئیفادەیەکی باشت داوە، هەتا دوایی ئەو ئیفادەیە مەگۆڕە، هەرچەندە ئەشکەنجەشتیان کرد.

کاتێک کە گیرام، جانتایەک کتێبی مارکسیم پێ بوو، هیی خۆم بوو، ئەویشم پێ گیرا، بەڵام لە زیندان ئینکاریم کرد و وتم، هیی من نییە.

بۆ ڕۆژی دوایی سەرلە بەیانییەکەی، یەکەم کەس من بانگ کرام. چاومیان بەستەوە و بۆ ژووری ئەفسەری لێکۆڵینەوە کە ناوی نەقیب خەڵەف بوو بردمیان.

نەقیب خەڵەف کەوتە پرسیارکردن لێم، منیش هەمان ئیفادەم دایەوە. پرسیاری کرد و وتی: تۆ برینداری؟ وتم: نەخێر بریندار نیم، سەیرێکی کردم، منیش لەو کاتەدا زۆرم لە خۆم کرد، بەڕاستی بوەستم و هەستم پێ نەکات، شەرواڵەکەشم قوڕاوی بوو، چونکە کاتێک کە گیرام، بەفر بارییبوو، لە سلێمانی لەسەر زەوییە قوڕاوییەکە بە شەق ئەمدیو و ئەودیویان پێ ئەکردم، ئەو قوڕە برینداری و خوێنەکەمی شاردبووەوە.

پاشان منیان بردە ژووری ئەشکەنجە و هەردوو پێیان بەستمەوە و بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێک بە دوو کەس کەوتنە فەلاقە و لێدانی ژێرپێم. پاشان بەناو حەوشەکەدا کە تەڕ کرابوو، دەستمیان گرت و ئەمیان گێڕا، کە پێم لەسەر زەوییەکە دائەنا، ئێشی پێم زۆرتر ئەبوو، وام ئەزانی پێم ئەخەنە سەر پشکۆی ئاگر. ئەم شێوە ئەشکەنجەیەیان سێ جار دووبارە کردەوە. دوایی هەردوو دەستمیان لەپشتەوە بەستەوە و هەڵیان واسیم و کارەبایان لە شوێنی هەستیاری لەشم ئەدا. ئەم کارەبایە تەزوویەکی زۆر بەهێزی هەبوو. لە هەمان کاتدا کە ڕووت کرابوومەوە، بە کێبڵ و بە سۆندەی ئەستوور لە پشتم و لە نووکی پەنجەی پێیان ئەدام. ئەم ئەشکەنجەیە بۆ ماوەی یەک سەعات بوو، سنگ و قۆڵم بە جۆرێک ئازاریان پێ گەییشت کە مرۆڤ ناتوانێت وەسفیان بکات.

لەگەڵ هەموو ئەم ئەشکەنجانەدا تووڕە ئەبوون و هاواریان ئەکرد: ئیعتەریف یا گەواد، یا موخەریب! ئەم ئەشکەنجانە بەیانیان و ئێواران بوو، ماوەی چەند هەفتەیەکی خایاند.

ماوەیەک وازیان لێم هێنا. ڕۆژێکیان لەناکاو نزیکی نیوەڕۆ بوو، بانگیان کردم و بۆ ژووری لێکۆڵینەوەیان بردم. سەیرم کرد زەلامێک کە پانتۆڵێکی قەدیفە و قەمیسێکی لەبەردایە، بەچاوبەستراوی دانراوە. سەیری دەستیم کرد، پەنجەی چەپی مۆری پێوە بوو.

ئەفسەری لێکۆڵەر ڕووی لە من کرد و وتی: خەلیل ئەمە ئەناسی؟

وتم: نەخێر.

بە پێکەنین و بەفیزێکەوە وتی: چۆن ئەوە ناناسی، ئەوە هاوڕێی خۆتە؟!

وتم: نەخێر نایناسم.

ئەفسەرەکە وتی: تەها چاوت بکەوە!

(تەها تەیفوور فەتاح خەڵکی چەمچەماڵ بوو، لەگەڵ ئەو مەفرەزەیە پێشمەرگە بوو کە من پەیوەندیم پێوەی کرد)

تەها چاوی کردەوە و ڕووی لە من کرد: من تۆ ئەناسم.

وتم: من تۆ ناناسم.

وتی: تۆ خەلیل نیت، کوڕی مەلا عادیل؟! دەرچووی ئامادەیی پیشەسازیت،ماڵتان لەلای تەکیەی شێخ عەبدولکەریمە، باوکت لە شەریکەی نەوت ئیش ئەکات! من و تۆ لە گوندی عەودالان بەیەکەوە نانمان نەخوارد، کە قەلیان بۆمان سەربڕیبوو؟!

وتم: نەخێر! من تۆ ناناسم و تۆم نەبینیوە.

تەها وەکوو ئەوەی باوک و برایم کوشتبێ، ئەچوو بەگژما و بە ئەفسەری لێکۆڵەری ئەوت: سەیدی! ئەمە تازە هاتبوو ببێ بە موخەڕیب، چونکە سەربازی نەکردبوو و شارەزای کاری سەربازی نەبوو، نەیتوانی ڕا بکات و گیرا. باش بوو ئەوەی نەئەزانی کە من بریندار بوومە.

هەروەها تەها ئەسعەدی بینی و ئەیزانی کە ئەو منی بۆ پێشمەرگایەتی هێناوە، بەڵام باش بوو ناوی ڕاستەقینەی نەدەزانی، چونکە بە ناوی نهێنی "شێخ دارا"وە بانگ دەکرا.

نەقیب خەڵەف وتی: ئێمە هیچمان لە تۆ ناوێت، تەنها ناوی ئەو کەسەمان پێ بڵێ کە تۆی گەیاندە لای غەریب عەسکەری و ناوی هاوڕێکانت.

وتم: من هیچ کەسێک هاوڕێم نییە و لەگەڵ کەسدا تێکەڵاویم نییە.

نەقیب خەڵەف: ناوی ئەو کەسەمان پێ بڵێ کە لەگەڵتدا بوو! شوێن و ڕێگەی لە کوێیە، ئیشی چییە و پەیوەندی تۆ چییە لەگەڵیدا؟! دیار بوو تەها هەموو شتێکی بەپاککراوی خستبووە مستیانەوە.

وتم: ئەو کەسە چەند جارێک لەلای گەراجی سلێمانی بینیومە، چەند جارێک سڵاومان لەیەکتری کردووە.

نەقیب خەڵەف: ناوی چییە؟

وتم: ناوی "باهیر تاهیر"ە.

تەها وتی: سەیدی! تاهیر برایەتی، باوکی نییە.

بەو شێوەیە تەها بە جۆرێک وەڵامی منی ئەدایەوە و بەڕوومدا ئەهاتەوە، لە نەقیب خەڵەف بە پەرۆشتر بوو کە ناوی هاوڕێکانم بدرکێنم!

نەقیب خەڵەف: بۆچی باهیر تاهیر لەگەڵ تۆدا بوو؟

وتم: وتی، خەزوورت نەخۆشە، منیش کە شارەزا نەبووم، داوام لێی کرد، بەڵکوو یارمەتیم بدات.

نەقیب خەڵەف: خەزوورت ناوی "مارف مەولوود"ە و موخەڕیبە!

وتم: ئەو کچی بە من داوە و من پەیوەندیم بە کچەکەیەوە هەیە.

نەقیب خەڵەف هەستایە سەرپێ و بەتوندی زلەیەکی لێم دا و بە جوێن و ئیهانە بۆ ژووری ئەشکەنجەی بردم.

ئەشکەنجەکانی پێشوویان لەگەڵمدا دووبارە کردەوە و هەر داوای ناوی هاوڕێکانمیان دەکرد. ئەشکەنجەکانم زیادی کرد و بۆ ماوەی هەفتەیەک بەبێ نان و ئاو فڕێیان دامە ژووری ژمارە ٨، تەنها چەند جارێک بۆ سەرئاویان بردم، منیش لەوێ ئاوم ئەخواردەوە و پاشان دەمم ئەسڕییەوە، کە دەرئەچوومە دەرەوە، پاسەوانەکە پرسیاری لێم ئەکرد، ئاوم خواردووەتەوە یان نا؟ منیش ئەموت: نەخێر ئاوم نەخواردووەتەوە.

پاشان بۆ ماوەی یەک هەفتە بە عاموودی ناوەڕاست حەوشەکەیان بەستمەوە. لە ڕۆژی ٧ و ٨ی نیسان بوو، بە سۆندە ئاویان پێدا ئەکردم و لێمیان ئەدا و بە کارەبای دەستیش ئازاریان ئەدام.

وازیان لێم نەهێنا، هەتا خۆم کردە نەخۆش. منیان بۆ نەخۆشخانەی سەربازی برد. لەوێ دکتۆرەکە پرسیاری لێم کرد کە چیمە؟ وتم: قوڕگم ژان ئەکات. عیلاجی

بۆم نووسی، بریتی بوون لە: کەپسوولی لینکۆسین، پرۆڤین، پاراسیتامۆڵ. منیش بەدزیی پاسەوانەکانەوە، عیلاجەکانم کردە دوو بەشەوە، هەر بەشێکیم کردە گیرفانێکی شەرواڵەکەم، بۆئەوەی ئەگەر بەشێکیان لێم سەند، ئەو بەشەی تر بشارمەوە، ئەگەر کەوتمە حاڵەتی زۆر سەغڵەتی، ئەوا هەموو حەبەکان بخۆم، بۆئەوەی بمرم و ناوی کەس نەدەم.

پاش ماوەیەک بردمیانە ژوورێک، "تەها"ی لێ بوو. تەها بە سەرشۆڕییەوە هاتە لام و وتی: چیت وت؟

وتم: تۆ ئەو قسانەت بۆ کرد، خۆ من هیچ شتێکم لەگەڵ تۆدا نییە؟!

وتی: ناوت لە گیرفانمدا گیرا.

وتم: ئێ خۆ ئەم قسانەی کە کردت، لە گیرفانتدا نەگیران!

وتی: وام زانی کوژراوی.

وتم: هەتا ئەگەر کوژراویش بم، تۆ حەقی ئەم قسانەت چییە؟!

لەپاش ماوەیەک تەها وتی: منیان نارد کە قالە فەرەج بکوژم، بەڵام گیرام.

دوای ئەشکەنجەیەکی ئێجگار زۆر ناوی هیچ کەسێکم نەدرکاند و هیچ زانیارییەکم پێیان نەدا و لە سەرەتاوە چیم وتبوو، هەر ئەوەم وتەوە.

دوای ئەوەی لێم بێئومێد بوون، قۆناغی ئەشکەنجەم تەواو بوو، بردمیان بۆ دادگا، دوو جار دادگایی کرام، یەکەم دادگایی، حوکمی ئیعدامیان بەسەردا دام، دوایی حوکمی زیندانی ئەبەدی درام و ڕەوانەی بەندیخانەی ئەبووغرێب کرام.

پاشان لە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٧/١٩ بە لێبووردنی گشتی ئازاد کرام.

دوای ئازادبوونم لە زیندان، دووبارە لە ڕێگەی هاوڕێ "سالار"ەوە پەیوەندیم بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان کردەوە.

**کەرکووک**

**نیسانی ساڵی ٢٠١٨**

# حامید عەبدوڵا ڕەزا (وریا)
# (حامیدی شێخ عەبدوڵا عەسکەری)
## (یاداشت)

گەڕانەوە بۆ ٣٥-٤٠ ساڵێک لەمەوبەر کارێکی ئاسان نییە، لە کاتێکدا هیچ سەرچاوە و نوسراوێک نەبێ پشتی پێ ببەستی. بۆیە ئەبێ هەر پشت بە بیرەوەری ببەستین کە ئەویش لەوانەیە زۆر کات دروست دەرنەچن، یان هەندێک ناو و شوێن و کات وەک خۆی نەبن. بۆیە هەر لە سەرەتاوە داوای لێبووردن ئەکەم، ئەگەر کەموکوورییەک لە یاداشتەکەمدا هەبێ.

ساڵی ١٩٧٤ دوای ئەوەی گفتوگۆی نێوان پارتی و حکوومەت بە بنبەست گەیشت و شەڕ هەڵگیرسایەوە، ئێمەش وەک بەشێکی زۆری خەڵکی چووینە دەرەوە و هەتا ساڵی ١٩٧٥ کە سەرەنجام شۆڕش بە ئاشبەتاڵ کۆتایی پێ هات و گەڕاینەوە بۆ کەرکووک. کە گەڕاینەوە خانوو و هەر چییەکمان هەبوو لەلایەن حکوومەتی بەعسەوە دەستی بەسەردا گیرا و هیچمان نەما و لە سفرەوە دەستمان پێ کردەوە. دیارە کە باوکم لە شاردا کەسایەتییەکی زۆر ناسراو بوو و ڕێزی زۆری لای دۆست و ناسیاوەکانی هەبوو، دەستی بە کەسابەت کرد و سەرکەوتوو

بوو، بۆیە توانیمان بکەوینەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆمان و سەرەتا لە گەڕەکی ئازادی خانوویەکمان بەکرێ گرت.

ئەو کاتانە من لە پۆلی چوارەمی گشتی لە سانەویی ئیمام قاسم بووم، تەمەنم ١٥-١٦ ساڵان دەبوو، خەڵکی بەزۆری سەرقاڵی باس و هۆیەکانی تێکچوونی شۆڕش بوون، ماڵی ئێمەش هەمیشە ئەو کۆڕ و مەجلیسانەی زۆر بوون، چونکە باوکم هەموو تەمەنی هەر لە شەڕی دەربەندەوە لەناو شۆڕشدا بوو، خەڵکی زوو زوو لە دەوری کۆ ئەبوونەوە، ئیتر منیش لەو سەرەتایەوە تێکەڵی ئەو قسەوباسانە بووم.

ڕۆژێک باوکم وتی، بڕۆ بۆ ئاغجەلەر بۆ لای حەمەغەفوور ئاغجەلەری و پێی بڵێ: "نامەکە گەیشت". دیارە ئەمە نهێنییەک بوو من ئەو کاتە نەمئەزانی چییە، کاتێک چووم بۆ ماڵی کاک حەمەغەفوور، بە تەنها لە ماڵ بوو، پاش کەمێک لە گەیشتنم، پێم وت: باوکم منی ناردووە تا پێت بڵێم، "نامەکە گەیشت". دیار بوو پێشتر لە حاڵەتێکی دەروونی ناخۆشدا بوو، بۆیە دوای ئەو قسەیەی من ڕووی گەشایەوە. هەڵبەتە ئەم هەواڵە بۆ ئەو خۆش بوو، هەر بۆیە زوو هەستا و وتی، من ئەچمە دەرەوە، تۆش دوای من وەرە دەرەوە و دەرگاکە ڕاکێشە و یەکسەر بۆ کەرکووک بڕۆرەوە.

ئەوەندەی پێ نەچوو حەمەغەفوور چووە دەرەوە و لە ناوچەی قەڵاسێوکە مەفرەزەیان پێک هێنا کە لە مەفرەزە سەرەتاییەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو. دیارە ئەو کاتە باوکم بۆیە ئەو کارەی بە من سپاردووە، چونکە تەمەنم کەم بوو، کەس گومانی لێ نەئەکردم، بەڵام بۆخۆم بە ئیشێکی مەزن و گەورەم ئەزانی و زۆر دڵخۆش بووم کە کارێکی وام ئەنجام داوە، تا ڕادەیەکیش کاریگەری لەسەر ژیانم هەبوو.

هەر لەو ساڵەدا بوو ڕۆژێکیان کاک هۆشیار عەبدولخالق عەبدولکەریمی شەدەڵە کە پوورزامە و لە کەرکووک ئەیخوێند و هەر لە ماڵی ئێمە بوو، نامیلکەی "یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆچی؟"ی دامێ بۆ ئەوەی بیخوێنمەوە. منیش لێم وەرگرت و

خوێندمەوە، پاشان کاک هۆشیار وتی: پێت چۆنە؟ منیش وتم: زۆر باشە! ئیتر ئەویش وتی: ئەتەوێ ئیشمان لەگەڵدا بکەیت؟ منیش ڕەزامەندی خۆم دەربڕی. لەو کاتەوە کە ئەکاتە کۆتاییی ساڵی ١٩٧٦ پەیوەندیم بە یەکێتیی خوێندکارانەوە کرد.

هەتا ماوەیەک پەیوەندیم بە کاک هۆشیارەوە هەبوو، دوایی گۆڕانکاری لە ڕێکخستنەکاندا کرا و پەیوەندیم بە کاک "ئازاد فەقێ"وە کرد، لە هەمان کاتدا کاک سەلاحەدین ئیسماعیل جەباری (سەلاح ڕەنجدەر) درایە لای من. ماوەیەک بەم شێوەیە ماینەوە و ناوبەناو کۆبوونەوەمان ئەکرد، کاتی کۆبوونەوەکان دیاریکراو نەبوون، هەندێک جار هەفتانە و جاری واش هەبوو بە دوو هەفتە جارێک بوو. کۆبوونەوەکان لە ماڵی یەکێکمان، وە یان بەدەم پیاسەکردنەوە ئەنجاممان ئەدا و بابەتەکانیشی زیاتر باسی شۆڕشی نوێ و خۆهۆشیارکردنەوە بوو. لەو کاتانەدا بڵاوکراوە کەم بوو، جارجار "الشرارة"مان بەدەست ئەگەیشت و لە کۆبوونەوەکاندا تاوتوێمان ئەکرد.

دوای ماوەیەکی دیکە، جارێکی تر گۆڕانکاری لە ڕێکخستنەکاندا کرا و پەیوەندیم بە کاک "سالار ڕەشید"ەوە کرد کە وابزانم ساڵی ١٩٧٨ بوو، ئەو کاتە هێشتا ماڵمان لە ئازادی بوو. ماوەیەک دوای ئەوە جارێکی تر گۆڕانکاری کرا و من و کاک سالار ڕەشید و کاک ئەسعەد عەزیز سۆفی (شێخ دارا) شانەیەکمان پێک هێنا و هاوڕێ ئەسعەد سەر شانەمان بوو. لێرەوە ئەتوانم بڵێم کە کاری ڕێکخراوەییم چووە قۆناغێکی ترەوە، کۆبوونەوەکانمان چڕتر بوو، زیاتر باسی تیۆریی مارکسی و مەسەلە سیاسییەکانمان دەکرد، بۆیە دوای چەند دانیشتنێک، هاوڕێ ئەسعەد پێی ڕاگەیاندم کە ئێستا ئەندامی کۆمەڵەم و شانەکەمان یەکێک بوو لە شانەکانی کۆمەڵە و سەلاح جەباری پەیوەندی بە منەوە هەبوو، بۆیە بەویشم ڕاگەیاند کە ئەندامی کۆمەڵەیە، بەڵام لە کۆبوونەوەی داهاتوودا داوای دەست لە کار کێشانەوەی کرد! لە سەرەتادا نەمئەزانی هۆی چییە و هەرچەندە هەوڵم لەگەڵی دا، بۆ ئەوەی پەشیمانی بکەمەوە، بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر وازهێنان کە گوایە ئەترسێ و ئەیەوێ

بخوێنێ و توانای نییە خوێندن و ڕێکخستن لە یەک کاتدا بکات! بۆیە لە دانیشتنی خۆماندا باسی ئەوەم کرد کە کاک سەلاح ئەیەوێ واز بهێنێ.

وازهێنان چەند مەترسییەکی هەبوو: یەکێ لەوانە پەیوەندیکردن بە ڕێکخراو و ڕێکخستنێکی ترەوە. لەو کاتەدا باڵەکانی ناو کۆمەڵە سەری هەڵدابوو، نەماندەویست ڕێکخستنەکەمان لەناو شاردا لەت بن و لاواز بن، وە یان ئەو وازهێنانە ببێتە مەترسی بۆ سەر ژیانی من و درکاندنی ناوی من لە شوێنان بە مەبەست یان بێمەبەست. بۆیە هاوڕێ ئەسعەد کە ئەو کاتە "سەلاح"ی نەئەناسی، داوای ناوی کرد و وتی: هەڕەشەی لێ بکە و پێی بڵێ: هەر زیانێک بە هۆی تۆوە بە من بگات، ئەوا ڕێکخستنەکانی سەرەوە ئاگادارن و سزای توند ئەدرێیت!

وا دیار بوو ئەم هەڕەشەیە زۆری ترساندبوو، بۆیە دوای چەند ڕۆژێک نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا لە دەرگای دا، ئەو ڕۆژە بە تەنها خۆم لە ماڵ بووم، خۆی پێم ناساند، ئەگەرچی بەهۆی کاک هۆشیارەوە ئەمناسی و ئەمزانی کە لە دەرەوە بووە و گەڕاوەتەوە بۆ ناوشار، بەلام ئەو کاتە لە شێوەی گەڕانەوەکەی دڵنیا نەبووم، ئایا خۆی تەسلیم کردووەتەوە، یان چوونە دەرەوەکەی ئاشکرا نەبووە. بە هەر حاڵ، بۆ من جێی گومان بوو، فەرمووم لێ کرد و هاتە ژوورەوە. لە سەرەتادا وا تێگەیشتم کە بۆ لای کاک هۆشیار هاتووە، بەلام دوای تۆزێک لە دانیشتن، کەوتە باسی ڕێکخستن و کاری نهێنی و وتی، ڕەنگە هەموو کەسێک نەتوانێت لە کاری ڕێکخستن بەردەوام بێت، کە ئەوە شتێکی ئاساییە. لێرەدا وتم: کاک نەجمەدین نازانم باسی چی ئەکەیت، من هیچ پەیوەندییەکم بە ڕێکخستنەوە نییە و نازانم بۆ ئەم قسانە ئەکەی! بۆیە هەرچی هەوڵی دا، نەمهێشت بەردەوام بێت. دوای ئەوە چاری نەما، کەوتە باسی سەلاح بە ئاشکرا و وتی: هەڕەشەتان لێی کردووە! وتم: من سەلاح هەر ناناسم و تۆزێک تووڕە بووم و پێم وت: ئەگەر بۆ میوانی هاتووی سەرچاو، ئەگەر بۆ ئەم قسانەش هاتووی، ئەوا دەرگا کراوەیە، فەرموو بۆ دەرەوە، ئیتر لێرەدا کۆتاییمان پێ هێنا. دوایی ئەم بەسەرهاتەم لە کۆبوونەوەی داهاتوودا باس کرد و زانیمان، سەلاح پەیوەندی بە "نەجمەدین فەقێ عەبدوڵا"وە هەیە.

له هەمانساڵدا (١٩٧٨) ماڵمان چووە گەڕەکی ئیمام قاسم (فلکە)، لەو دەورانەدا یوسف حازم و حەسەن ئەبووبەکر (شاخەوان)، پەیوەندییان بە منەوە هەبوو.

لە مانگی ١٠ ساڵی ١٩٨١شاری کەرکووک لەپڕ تێک چوو، پڕ بوو لە ئەمن و سیخوڕەکانی ڕژێم، ئەو ڕۆژانە زۆر لە ڕۆژەکانی تر جیاواز بوو، لە ماوەیەکی کەمدا ژمارەیەکی زۆر خەڵک گیران. لەو دەمەدا ئێمە زۆر نیگەران بووین، چونکە نەمانئەزانی گیراوەکان کێن و ئەوانەی پەیوەندییان بە ئێمەوە هەیە، لە گیراوەکانن یان نا؟ بۆیە من و کاک سالار ڕەشید کەوتینە هەواڵپرسین و گەڕان بە دوای هەندێک زانیاریدا و لە پێشدا ئەو ئەندامانەی دەستمان پێیان گەیشت کە لە شانەکانی خوار ئێمەوە بوون، لە سەلامەتییان دڵنیا بووین و ئاگادارمان کردنەوە کە ئاگایان لە خۆیان بێت.

دوای ئەوە زیاتر ئەمانویست هەواڵی هاوڕێ ئەسعەد عەزیز بزانین، بەڵام گەڕان و هەواڵزانین زۆر سەخت بوو، بەهیچ شێوەیەکیش نەمانئەتوانی بچینە ماڵیان و پرسیار بکەین، چونکە ئەگەری ئەوە هەبوو، لەژێر چاودێریدا بێت و ببێتە هۆی ئاشکرابوونی ئێمەش. دواتر بڕیارمان دا بۆ دوکانی براکانی بچین، یەکێکیان دوکانی لێفەدووری و ئەوەی تریشیان دوکانی فیتەری هەبوو، هەردوو لامان تاقی کردەوە، بەڵام داخرابوون و هیچ هەواڵێکمان دەست نەکەوت. بۆیە زۆر ڕاڕا بووین و نەمانئەزانی بەتەواوی چی بکەین، تەنها دوو ڕێگامان لە بەردەمدا بوو: یەکەم، چوونە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی کە خۆمان بۆ ئامادە کردبوو (جلوبەرگ و پێڵاو ...)، ئەگەر لە گرتنی هاوڕێ ئەسعەد دڵنیا بووینایە، ئەوا یەکسەر شارمان بەجێ ئەهێشت. دووەم، لە شاردا بمێنینەوە، بەڵام زۆر بەوریایی و زۆر بەکەمی لە ماڵی خۆمان بین. هەڵبەت ئەو کاتە لە زانکۆ بووین، بۆیە لە بەشی ناوخۆیی لە شوێنەکانی خۆمان نەئەنووستین. من ئەچوومە بەشە ناوخۆییەکی تر، یان بۆ ماڵی چەند برادەرێک لە هەولێر و زۆر بەکەمی بۆ دەوامیش ئەچووین، واتە، لە ڕۆژێکدا سەعاتێک یان دوو سەعات، ئەوەش هەر بۆ ئەوەی دەرکەوین کە دەوام ئەکەین. بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک بەم شێوەیە بردمانە سەر، هەرچەندە پاش دوو هەفتەیەک

لە شالاّوی گرتنەکان هەواڵمان زانی کە هاوڕێ ئەسعەد لە ناو تاکسییەکدا و لەڕێی ئەشرەف چایچییەوە ناسراوەتەوە و گیراوە.

ئەو دەمە ئەگەر یەکێک بگیرایە، ئەوا لە دوو هەفتەی یەکەمی گرتنیدا ڕووبەڕووی ئەشکەنجەیەکی زۆر ئەبووەوە، ئەگەر لەو ماوەیەدا هیچی نەدرکاندایە، ئەوا دوای ئەوە ئەگەری ناودرکاندنی کەم ئەبووەوە، بۆیە لەدوای سێ هەفتەیەک دڵنیا بووین کە هاوڕێ ئەسعەد ناوی ئێمەی نەدرکاندووە، چونکە بەردەوام چاودێری دۆخەکەمان ئەکرد، ئایا لە ماڵەوە، یان لە زانکۆ، وە یاخود لە بەشی ناوخۆیی پرسیاری ئێمە کراوە یان نا.

دوای ئەوە کەوتینەوە کاری ڕێکخستن، بەڵام لە سەرەتادا بەسستی، چونکە هەموو ڕێکخستنەکان لێک ترازابوون و پەیوەندییەکان زۆر سەخت بوون، بە تایبەتی لەگەڵ سەرووی خۆمانەوە.

ئەتوانم بڵێم، بەگەڕخستنەوە و بووژاندنەوەی ڕێکخستن لەدوای ئەو زەبرە لە شاری کەرکووک بەزۆری کەوتە سەرشانی کاک سالار ڕەشید و ئەگەر ئەو نەبووایە هەر وا بەزوویی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک بەگەڕ نەدەکەوتنەوە. بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا ڕێکخستنەکان کەوتنەوە سەرڕێی خۆیان و گەرموگوڕییەکی باشی بە خۆیەوە بینی، هەتا گەیشتین بە مفاوەزات.

کاتێک مواجەهەی هاوڕێ ئەسعەد کرایەوە، لەگەڵ کاک سالار بڕیارمان دا بۆ سەردانی بچین. ئیتر لە مانگی تەممووزی ساڵی ١٩٨٣ لە کەرکووکەوە بەڕێ کەوتین و چووین بۆ مووسڵ. لە دەرگای زیندان لە کاتی چوونە ژوورەوەدا مۆرێکیان نا بە دەستمانەوە و چووینە حەوشەی زیندانەکەوە، دایکی ئەسعەدیشمان لەوێ بینی و لەپێش ئێمەوە گەیبیشتبوو.

ئیتر ئێمە و کەسوکاری هەموو زیندانییەکان لەو حەوشەیەدا چاوەڕێ بووین. پاش ماوەیەک هەموو زیندانییەکان کە وابزانم بەوانەی کەرکووکەوە ١٩ زیندانییەک ئەبوون، هاتنە دەرەوە و هەر کەسە چووە لای کەسوکاری خۆی. ئێمە لای دیواری دەرەوەی حەوشەکە دانیشتین، پاش ئەوەی ئەسعەد هەندێ دڵی دایکی دایەوە و

پێی وت کە جل و پێڵاو و پووزەوانەی بۆ حازر بکات، چونکە بەم زووانە بەرئەبێت و ئەچێتە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی.

دوای ئەوە هاوڕێ ئەسعەد لەگەڵ ئێمەدا کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهات و ناسۆرییەکانی خۆی. سەرەتا باسی ئەوەی بۆ کردین کە لە یەکەم لێپرسینەوە و ئەشکەنجەدا کلێشەی ناوە نهێنییەکانی ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگریان خستووەتە بەردەست و داوایان لێ کردووە، ئەو ناوانە بدرکێنێ کە پەیوەندییان پێوە بووە. ئەیوت، وێنەکانتان بە بەرچاومدا ئەهات، بە تایبەتی من و کاک سالار کە بە خۆراگری خۆی توانی ژیانی ئێمە بپارێزێ.

هاوڕێ ئەسعەد ئەیوت، کلێشەی ناوە نهێنییەکان بە مەرەکەبێکی سوور بە خەتی عەلی مغاویر نووسرا بوو کە خەتەکەیم بەباشی ئەناسییەوە. هەروەها وتی: ئاگاتان لە (ف) بێت، شتی لا مەدرکێنن، چونکە ڕژێم توانیویەتی وای لێ بکات، ئیشیان بۆ بکات و تەنانەت ئێستا ناتوانین بەئاسانی نامە بۆ دەرەوە بنووسین و بەدزی ئەوەوە شەوانە ئەینووسین، ئەوەش کارێکی قورسە، چونکە شوێنەکەمان زۆر بچووکە، بە شێوەیەک ئەگەر یەکێک بۆ لاکەی تر هەڵسووڕێ، ئەوا وەک پەڕەی کاغەز هەڵئەدرایەوە و هەموو هەڵئەسووڕان و جووڵەیان تێ ئەکەوت.

لەو ماوەیەدا دەنگۆی ئەوە هەبوو، بەر ئەبن و هەر واش بوو، زۆربەی زیندانییەکان بەربوون، ئەوان نەبێت! بۆیە ئەیوت، ئەگەر بەر بم، کۆمەڵە ڕەمیم نەکات، ئەوا بە ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕی نازانم، چونکە ئیعتیرافم لەسەر دوو کەس کردووە! دیار بوو زۆر زۆر پەشیمان بوو. هۆکاری بەرنەبوونەکەشیان بە قەناعەتی من، بەشێکی ئەگەڕێتەوە بۆ ئیزاعەکەی یەکێتی کە لەو ماوەیەدا بە دەنگی فەرهاد سەنگاوی ناوی هەموویان خوێندرایەوە و یەکێتی بە فەرمی خۆی کرد بە خاوەنیان و داوای بەربوونی کردن. هەڵبەتە ئەو کاتە ژێربەژێر و بەنهێنی یەکێتی لەگەڵ حکوومەتی بەعسدا چاوپێکەوتنەکانیان دەست پێ کردبوو، بەڵام هێشتا مفاوەزات ڕانەگەیەنرا بوو. بۆیە ئەو دیدارەی ئێمە دوادیدار بوو، ئیتر کەس جارێکی تر چاوی پێیان نەکەوتەوە و حکوومەت ونی کردن و لەوێوە بۆ ئەبووغرێبیانی برد

و له سێدارەی دان. هـاوڕێ ئەسـعەد باسـی زۆر جۆری ئەشکەنجەی کرد کە زۆر نامرۆڤـانە و دڕنـدانە بـووە و ئەیـوت، مـن لەسـەر ٩ شـت تەعزیـب ئەکـرام، لەوانە: ئەنـدامی کۆنفرانسـی یەکەمـی کـۆمەڵە لە مـالیمۆس، ئـامر مەفـرەزەی یەکێـک لە مەفرەزەکانی ناوشـار، گرتنی دەمـانچە و نـارنجۆک و هەندێک بەیاننـامە و کتێب لە ماڵمـان و سـاغبوونەوەی نـاوی شـێخ دارا کە نـاوی نهێنم بـوو، هەروەهـا ئەو نـاوە نهێنییانەی پەیوەندییان بە منەوە هەبوو ...

هەروەها ئەیوت: لە کاتی ئەشکەنجەدا هەموو جارێک ئەم وت، ئەوە تەواو بـووم و لە ژیانـدا نەمـام، بەڵام پـاش مـاوەیەک لەنـاو هاوڕێکانمـدا چـاوم هەڵئەهێنـایەوە و هەمـوو بەدەورمەوە بـوون، ئاویـان بەدەموچاومـدا ئەکرد، بۆ ئەوەی بەهـۆش خـۆم بێمەوە.

یەکێک لەو ئەشکەنجانەی کە بە لای هاوڕێ ئەسعەدەوە زۆر نـاخۆش بـوو، ئەوە بوو، بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەدەستەکانی و هەر لە پشتەوە لە ژوورێکی مەتر بەمەتر هەڵواسـراوە و پەنجەکـانی پێـی گەیشـتوونەتە نێـو گیراوەیەکـی شـل کە کارەبـای لەسـەر بـووە. ئەم شـێوە ئەشـکەنجەیە وای لـێ کردبـوو، یەکێـک لە شـانەکانی بـۆ ماوەی سێ مانگ بەباشی کار نەکات، هەڵبەتە ئەو شـانەی وەک جـاران هەر کـاری نەدەکرد.

دڵنیا نیم ماوەی چاوپێکەوتنەکە چەند بوو، وا بزانم یەک کـاتژمێر بـوو، بەڵام مـن هەستم بە کات نەدەکرد و زۆر بەخێرایی گـوزەرا. پاسـەوانەکان ڕایانگەیاند، مـاوەی چاوپێکەوتنەکە کۆتایی هات. ئیتر ماڵئاواییمـان کـرد و زۆر ئومێدمان هەبوو کە بەر بن، بەڵام سەرەنجام مواجەهەیان بڕا و پاشان لە سێدارە دران.

هەزاران سـڵاو لە گیـانی پـاکی هـاوڕێ ئەسـعەد، بەڕاسـتی نمـوونەی مرۆڤـی شۆڕشـگێڕ بـوو، دڵنیـام ئەگەر تەمەن مەودای بـدایە ئەیتـوانی خزمەتێکـی زۆری خەڵکی کوردستان و مرۆڤایەتی بکات.

لە سـاڵی ١٩٨١ بەدواوە، هەم ڕێکخسـتنەکان و هەم چەنـدایەتی هێـزی پێشـمەرگە لە کوردسـتاندا چـوونە پێشـەوە، دیـارە شـەڕی ئێـران-عێـراق لەم نێـوانەدا دەوری

زۆری هەبــوو، ئەمە وای کــرد کە نــاوچەیەکی زۆری ڕزگــارکراو لە ژێردەســتی یەکێتیدا بێت .

بەڵام بە هــۆی مفــاوەزاتی یەکێتــی لەگەڵ حکــوومەتی بەعســدا، جــارێکی تــر ڕێکخســـتنەکانی کــۆمەڵە لە سەرانســەری کوردســتان و بە تــایبەتی لە شـــاری کەرکووک گورزێکی کوشندەی بەرکەوتەوە، چونکە دوای ئەوە زیاتر ڕووە گەندەڵ و دواکەوتــووەکەی یەکێتــی ئاشــکرا بــوو، هەروەهــا ســەرانی یەکێتــی هەڵەی کوشــندەیان کــرد، ئەمەش بــوو بە هــۆی وازهێنــانی زۆر لە ئەنــدامان و کادرەکــانی کۆمەڵە چ لە شاخ و چ لە شار.

لە کۆتاییدا زۆر دەستخۆشــی لە کــاک ســالار ئەکەم، بەڕاسـتی بە نووسـینەوەی ئەم بیرەوەرییانە، بە ئەرکێکی جوان هەڵئەستێ و هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم.

**مانچستەر/ بەریتانیا**

**٢٠١٧/١/٢٥**

# ئەحمەد خورشید ڕەزا (ئاشتی)
## (یاداشت)

لە پایزی ساڵی ١٩٧٨ لەڕێگەی هاوڕێ و برای بەڕێزم کاک ساڵح عەزیز ڕەشید (سالار ڕەشید)، کە ئەو کات ناسرابوو بە "نەسرەوت" و دواتر بە "جووتیار" پەیوەندیم بە ڕێکخستنی کۆمەڵەوە کرد. تاریخ و ڕێکەوتەکەیم لەیاد نەماوە، بەڵام ئەو کاتەی من پەیوەندیم بە کۆمەڵەوە کرد، کۆمەڵە، کۆمەڵەی مارکسی لینینیی کوردستان بوو. دوای ماوەیەک لە کۆبوونەوەیەکدا هاوڕێ "نەسرەوت" باسی ئەوەی کرد کە کۆمەڵە لە کۆبوونەوەی فراوانی کادرەکانی، ناوەکەی بە "کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان" گۆڕاوە کە زۆرمان پێ ناخۆش بوو.

بە حوکمی ئەوەی لەگەڵ کاک ساڵح خەڵکی یەک گەڕەک بووین، ئیمام قاسم/ یادگار، جۆرێک لە پەیوەندیی هاوڕێیەتی و یەکتربینین و پەیوەندیی ئەدەبی لە نێوانماندا هەبوو. ڕۆمانی "ژانی گەل"ی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەلایەن ئەوەوە بەدەستم کەوت و خوێندمەوە. هەروەها چەپکێک لە قسەکانی ماو تسیتۆنگ "کتێبە سوورەکە" کاک ساڵح ناونیشانی کتێبخانەی هەندرێنی پێ وتم، تا بیکڕم.

جگە لە کاک سالْح من ئەڵقەی ڕۆشنبیریی هاوڕێیەکی تر بووم کە ئەویش شەهید جەواد بەهادین بوو، یادی بەخێر. هەر لە ڕێگەی شەهید "جەواد"ەوە زۆرێک لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵە و یەکێتی ئەگەییشتنە دەستم. لەگەڵ شەهید جەواد لە یەک قوتابخانە و هەر لە ئامادەییەوە هاوپۆلی یەک بووین. واتە لە یەک کاتدا من ئەڵقەی ڕۆشنبیری دوو هاوڕێ بووم، شەهید جەواد و کاک سالْح. شەهید جەوادیش بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵە موفاتەحەی کردم، بەڵام ئەبوو من بە شێوازێک خۆم ڕزگار بکەم، هەڵبەتە هەر واشم کرد.

کاک سالْح لە ڕاپەڕاندنی ئیشوکارەکانی ڕێکخستن کەسێکی ئازا و بوێر و ماندوونەناس بوو. لە سازدانەوە و جۆشدانی ئەو هاوڕێیانەی لەدوای گیرانی ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر دابڕان و هەندێکیان بزر بوون کە دۆزینەوە و ڕێکخستنەوەیان هەر وا ئاسان نەبوو، ئەرکە قورسەکە کەوتە سەرشانی ئەو و بەشێک لە هاوڕێکانی. هەروەها کاک سالْح دەورێکی گرنگ و کاریگەری لە دووبارە دروستکردنەوەی کۆمیتەی ئاگردا بینی.

من (ئەحمەد خورشید) لێپرسراوی پۆلی شەهید مام بێستوون بووم لە کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن. ئەم پۆل و کەرتەش بە هەوڵی کاک سالْح و هاوڕێکانی دروست کران.

کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن کاک سالْح لێپرسراوی بوو، هەروەها کاک تەحسین نامیق عەبدوڵا لێپرسراوی پۆلێک بوو لە کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن. کۆبوونەوەی هەرسێکمان (سالْح، تەحسین، ئەحمەد) بۆ ئەنجامدانی کۆبوونەوەی کەرت بوو. دواتر کاک سالْح خۆی چوو بۆ سەرپەرشتی کەرتێکی تر کە کێشە و گرفتی زۆریان هەبوو، بە مەبەستی چارەسەرکردنیان، ئێمەی لە کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن بەجێ هێشت.

ئەوە بوو کاک تەحسین نامیق عەبدوڵا بووە لێپرسراوی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن. ئەو کات کۆبوونەوەی من لەگەڵ کاک تەحسین نامیق بوو.

ئەوەی لە یادم بێت، پۆلی شەهید مام بێستوون ئەندامەکانی لەم هاوڕێیانە پێک هاتبوو، لەگەڵ داوای لێبووردن بۆ ئەو هاوڕێیانەی ئەوسا و ئێستاش نایانناسم، تەنها مەگەر بە ناوی نهێنی:

ئەحمەد خورشید ڕەزا (ئاشتی)، نەوزاد فەتحولا عەبدولڕەزاق (هیوا)، محەمەد خەیرولا ئەمین (ئاسۆ)، ئەسعەد کەریم (هاوڕێ)، عەلی قادر (ئارام)، کەریم حەمە عەلی (هۆگر)، موهەندیس ئازاد (بڕوا)، کاک سەردار (باوەڕ)، کاک ڕەشید.

ئەو ناوانەی پەیوەندییان بە کاک ڕەشیدەوە هەبوو، بێ ئەوەی پێویست بکات، لائیرادی لە دانیشتنەکانی دووبەدووی هەردووکمان ناوەکانی ئەوت و باسی ئەکردن، وەکوو عومەر کارەباچی و خالیدی برای کاک عومەر، وەستا مەناف، پۆلیسێک، برایەکی کاک ڕەشید.

کاک سەردار (باوەڕ) پەیوەندی بە شەهید هیواوە هەبوو، کە شەهید هیوا چووە دەرەوە بۆ پێشمەگایەتی، گوازرایەوە لای من. کاک سەردار هاوڕێ و خەڵکی ڕێکخستنی لەلا بوو، بەڵام نازانم کێ بوون و ناوی نهێنی و ڕێکخستنیانم لەیاد نەماوە.بە هەمان شێوە کاک ئازادی موهەندیس (بڕوا) کە شەهید هیوا بووە پێشمەرگە، ئەمیش گوازرایەوە لای من. ئەمیش خەڵکی ڕێکخستنی لەلا بوو، بەڵام بەداخەوە نازانم کێن و ناوی نهێنییانم لە یاد نەماوە. ئێستا لە یادم نییە و نازانم چۆن زانیم کە ستار عارف (ستارە ڕەش) پەیوەندی بە شەهید هیوا و هاوڕێکانییەوە هەبوو. هەروەها کەسێکی تر بەناوی "دیدار"ەوە پەیوەندی بەو خەتەی لای شەهید "هیوا"وە هەبوو.

ئەو هاوڕێیانەی لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا خۆم موفاتەحەم کردوون:

هاوڕێ ئەسعەد کەریم، کرێکار بوو لە کارگەی قیری لەیلان، خەڵکی گوندی کەوەڵە بوو، لە گەڕەکی شۆڕیجەی کەرکووک دائەنیشت، لە ساڵی ١٩٧٩ هاتە ناو ڕێکخستن. محەمەد خەیرولا ئەمین، خوێندکاری زانکۆی سلێمانی بوو، خەڵکی گەڕەکی ڕەحیماوا بوو لە کەرکووک، هاوڕێ عەلی قادر، جووتیار بوو، خەڵکی گوندی کەوەڵە بوو، ساڵی ١٩٨١، هاوڕێ کەریم حەمە عەلی، خوێندکاری ئامادەیی پیشەسازی بوو لە سلێمانی، ساڵی ١٩٨٢.

چەند کەسێکی تر ئەڵقەی ڕۆشنبیری من بوون، کە بریتی بوون لەمانە: نەجات حاجی ڕەشید، شەهید هیوا (نەوزاد فەتحوڵا)، مامۆستا ئارام، عومەر حەمەغەریب، نەجمەدین مەجید.

شەهید عومەر حەمەغەریب هەستم کرد پەیوەندی هەیە، وازم لێی هێنا، ئەویش گومانی هەبوو کە من لە ڕێکخستنم.

شەهید هیوا (نەوزاد فەتحوڵا)، ئەڵقەی ڕۆشنبیری من و کاک ساڵح بوو، بڕیار وابوو من موفاتەحەی بکەم، ئیتر نازانم کاک ساڵح پەلەی کرد، یان من شێوازی تایبەتیی خۆم هەبوو، زۆر پەلەم نەبوو ... کاک ساڵح پێش من شەهید هیوای موفاتەحە کرد. ئەو کاتە تۆزێک پێم ناخۆش بوو، بەڵام دەریشم نەبڕی. ئەوە بوو هەر یەکسەر دوای موفاتەحەکردنی بۆ کاری ڕێکخستن، شەهید هیوا گوازرایەوە بۆ لای من.

کە کۆمیتەی ئاگر ئاشکرا بوو، بۆ ماوەیەک تووشی خۆشاردنەوە بووم، هەتا هەواڵی کاک "ساڵح"م زانی.

دوای ئەوەی شەهید هیوا چووە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی لە تیپی ٢١ی کەرکووک، پاش ماوەیەک یەکێتی وتووێژی لەگەڵ حکوومەتی عێراقیدا کرد. لەو کاتەدا لەگەڵ کاک ساڵح بە مەبەستی بینینی شەهید هیوا و ئیشوکاری تایبەت کە پەیوەندی بە کاک ساڵح و شەهید هیواوە هەبوو، چووین بۆ گوندی جولحان لەناو شوان و شەوێک لەوێ ماینەوە.

کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٨٤ کە ئەبوو من بەشداری تێدا بکەم، بەڵام نەمتوانی بەهۆی ئەوەی، ڕۆژی بەستنی کۆنفرانس و ڕۆژی هاوسەرگیری و زەماوەندمان کەوتنە هەمان مانگ و ڕۆژەوە.

ئیبراهیم فەتحوڵا (ئاسۆ) برای شەهید هیوا لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠١ و سەرەتای ساڵی ٢٠٠٢ هاتە لام و وتی، بە نیازە لەسەر شەهید هیوای برای بە یارمەتی هاوڕێکانی نامیلکەیەک لەسەر ژیان و بەرهەمە شیعرییەکانی بڵاو بکاتەوە. بۆ ئەو مەبەستە پێویستی بە یارمەتی ئێمە هەیە. منیش ئامادەییم نیشان دا و ئەوەی

دەربارەی شەهید هیوا ئەمزانی، بە ئەمانەتەوە هاوکاریم کرد. بەڵام بەداخەوە ئەوان دەستکاری سەرلەبەری نووسینەکانی منیان کردبوو و هەموویان شێواندبوو. دواتر لە نامیلکەیەکدا بەناوی: "خۆرێک لە تاریکی، چەپکێ لە ژیاننامە و خەبات و شیعرەکانی شەهید نەوزاد فەتحوڵا" چاپیان کرد و بڵاویان کردەوە.

ئەو شتانەی ئەوان دەسکارییان کردبوو، دوور بوون لە ڕاستییەوە و بۆ مەبەست وایان لێ کردبوو، کە دواتر من لەڕێگەی برایم برای شەهید هیواوە پێم زانی کە نوورەدین ساڵحە ڕەش بەرپرسە و ئەو دەسکاری کردووە. دوای ماوەیەک نوورەدین ساڵحم بینی و ڕەخنەم لێ گرت و گلەیی ئەوەم لێ کرد کە بۆچی وای کردووە. داوای لێبووردنی کرد و وتی، لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ پۆزشت بۆ ئەهێنمەوە.

چەند نموونەیەک لەو دەستکارییانە:

لە نووسینەکەی مندا بەهیچ جۆرێک ناوی شەهید جەواد لە ئارادا نییە و نەهاتووە کە گوایە ئەو شەهید هیوای بۆ کۆمەڵە ڕێک خستبێت! کە من دڵنیام، ئەوان هەر یەکتریشیان نەدەناسی.

من لەگەڵ شەهید جەواد چوار ساڵ هاوپۆلی یەک بووین و زۆربەی کاتەکان شەو و ڕۆژ پێکەوە بووین و هاتوچۆی ماڵی یەکتریمان دەکرد و شەوانە زۆر جار لەگەڵ فەرمان ئەمین گۆگجەیی بۆ سەعیکردن و خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەکان لە ماڵی یەکتری ئەماینەوە، ئەگەر مەرحەباییەکیان هەبووایە من ئەمزانی.

شەهید هیوا کەسێکی حەماسی و ئازا و شۆڕشگێڕ بوو، من دەربارەی شەهید هیوا نووسیبووم: شەهید هیوا لە باخچەکەی ئیمام قاسم بە نارنجۆکێکەوە خۆی لە بۆسە نابوو، تاوەکوو بە جاش و خائینەکانیدا بتەقێنێتەوە، بەڵام باوەنوور ئەم قسانەی منی دەسکاری کردووە و نووسیویەتی، گوایە من نەمهێشتووە نارنجۆکەکە بتەقێنێ!

**سلێمانی**

**٢٠١٧**

# یوسف حازم محەمەد (هۆشمەند) [٢٥٦]

## (یاداشت)

لە ڕێکەوتـی ١٩٧٧/٤/٩ لـە ڕێـگەی شـەهید ئەسـعەد عەزیـزەوە پەیوەنـدیم بە ڕێکخسـتنەوە کـرد. مـاوەیەک پـێش شـاڵاوی گرتنەکـان بۆسـەر کـۆمیتەی ئـاگر پەیوەندیم بە کاک حامید عەبدوڵا عەسکەرییەوە هەبوو.

ئە وانەی پەیوەندییان بە منەوە هەبوو:

ئەبووبەکر سەی عومەر، کامەران ئەسعەد (دواتر لە پێشمەرگایەتی شەهید بوو)، حەسەن ئەبووبەکر، عومەر فەرەج. لە بیرم نەماوە، شـەهید "وەهـاب"ی بـرام دواتـر پەیوەندی بە منەوە هەبوو یان نا.

کـاتی شـاڵاوی گرتنەکـانی کـۆمیتەی ئـاگر مـن لـە خـوارووی عێـراق لە شـاری ناسرییە لە پەیمانگای تەکنەلۆجی ئەمخوێند. تەلەفۆنێکم بۆ ژووری عەمیدەکەمان بـۆ کرا و قسەم لەگەڵ باوکمدا کرد، هیچ باسی ئەوەی نەکرد کە وەهـابی بـرام گیـراوە، ویسـتی دڵنیـا بێـت کـە مـن نەگیـراوم (ئەیزانـی لـە ڕێکخسـتن کـار ئەکەم). هەمیشـە

---

٢٥٦. "یوسف حازم محەمەد" لە حوزەیرانی سـاڵی ١٩٨٧بەرپرسی ڕێکخستن و ڕابەر سیاسیی کۆمیتەی دهۆکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بووە. لەو دەمەدا ئازاد هەورامی بەرپرسی ئەو مەڵبەندە بووە.

ئەیوت، ئاگات لـە خـۆت بێت، بەڵام لەگەڵ حیزبـی شـیووعی کـار مەکە! بـاوکم لە گەنجیـدا لەگەڵ حیزبـی شـیووعی کـاری کردبـوو، زۆری زینـدان و لێـدان بینیبـوو، ئەیوت، بێورەن، زوو ئیعتیراف ئەکەن و ناو ئەدەن.

کە لـە ناسـرییە گەڕامەوە، زانیم ڕێکخستنەکانمان ئاشـکرا بـوونە، گەڕام بەدوای ئەو بـرادەرانەدا، بەشـێکیان وەک کـاک ئەبـووبەکر وتـی، دوورکەوە لـێم، مـن وازم هێناوە. کاک حامیدم بینی، پێی باش بوو ماوەیەک کارەکانمان خـاو بکەینەوە، منیش برادەرانی ترم بینییەوە. ئەوانەی لای مـن بـوون، جگـە لـە کـاک ئەبووبەکر کە وازی هێنا، دواتر لەگەڵ ئەوانی تر بەردەوامیمان بە چالاکی دا.

چۆنیەتی گرتنی شە هید "وەهاب"ی برام وە کوو لە برادەرە نزیکەکانیم بیستووە کە ئەو کاتە لەگەڵیدا بوون، بەم جۆرەیە:

کاک سلێمان عەبدولواحید و کـاک سـەڵاح وتیـان: هەرسـێکمان لە بەردەم تەکیـی شێخ عەبدولکەریمی قەرەچێوار وەستابووین، سـەیارەیەکی تاکسـی هـات، شـۆفێرەکە و ئەشـرەف چـایچی و ئەمنێـک و دەموچاوپێچراوێـک بـوون، ئەمنەکـە دابەزی و پرسـیاری لێمـان کـرد، کامەتـان "وەهـاب حـازم"ە؟ سـلێمان وتـی: مـن "سـلێمان"م، "سـەڵاح"یش وتـی: مـن "سـەڵاح"م، "وەهـاب"یش وتـی: مـن وەهـاب نـیم! بەڵام لەنـاو تاکسـییەکەوە دەموچاوپێچراوەکە ئیشـارەتی بۆ ئەمنەکـە کـرد کـە ئەوەیـان وەهابـە، ئەمنەکـان کیسـەیەکی ڕەشـیان کـردە سـەر وەهـاب و کردیانـە نـاو تاکسـییەکەوە و بردیـان. ئەوە دوازانیـارییە دەربـارەی شـەهید "وەهـاب"ی بـرام و هیچـی زیـاترم دەربـارەی دەسـت نەکەوتـووە، ئەوە نەبێـت، لـە وەزارەتـی شـەهیدانەوە وتیـان: گۆڕەکەی لە گۆڕستانێکی بەغدایە.

وە ک دەریش کەوت، کەسیان لەژێر ئەشکەنجەدا ناوی منیان نەدابوو.

شەهید "وەهاب"ی برام لە ١٩٨١/١٠/٢٢ دە ستگیر کرا، گەر لەبیرم مابێت شـەهید ئە سعەد لە ١٩٨١/١٠/١٩دە ستگیر کرا.

شـەهید ئەسـعەد هەواڵی بـۆم نـارد، بچـم لـە زینـدانی مووسـڵ سـەری لـێ بـدەم، ئەگەر ئەمنەکان پرسیاریان لێم کرد، بڵێم، بۆ لای (ف) هـاتووم. من نەمزانـی هـۆی ئەو قسەیەی شەهید ئەسعەد چی بوو، چونکە من شـەهید (ف)م نەدەناسی!

کـە چـوومە مووسـڵ و گەیشـتمە زینـدانەکە، پـاش هەنـدێک چـاوەڕێکردن لەگەڵ کەسـوکاری زینـدانییەکان، دەرگایـان بۆمـان کـردەوە و چـووینە ژوورەوە. هەر وا

دەوری ٥-٦ مەترێـک ڕۆییشـتم، یەکەم دیـمەن پشـیلەیەکم بینـی، ئەو زاڵمـانە بە پەتـێکەوە هەڵیـان واسـیبوو! دیـارە وەک حـاڵەتێکی سـایکۆلۆجی تـاکوو ئـازاری کەسوکاری زیندانییەکانی پێ بدەن.

ئەمنەکان پرسیاریان لێم کرد: بۆ لای کێ هاتوویت؟ وتـم: بـۆ لای (ف)، هەروەها برایەکیشم گیراوە، بەڵکوو سۆراخێکی ئەویش بزانم.

بە ڕاڕەوێکـدا چـوونە ژوورەوە، یەکەم کەس لەبەردەم ڕاڕەوەکە شـەهید (ف)م بینـی کە لەگەڵ کەسـوکارەکەیدا بـوو. مـن نەوەسـتام و بە ڕاڕەوەکەدا و بەدەسـتی ڕاسـت لام دا، شـەهیدان 'ئەسـعەد و مەلا محێـدین و فـارووق'م بینـی و بەرەو لای ئەوان ڕۆییشتم.

ئەمنەکە هات و وتی: تۆ وتت بۆ لای (ف) هـاتووم؟! وتـم: بەڵـێ، ئەم بـرادەرەش هاوڕێی تەلەبایەتیمە و ئەیناسم.

مەلا محێدین زۆر لاواز ببوو، شەهید فاررووق پەکی کەوتبوو.

پاشان پرسیارم لە شەهید ئەسعەد کرد و وتم: بۆچی وتبووت، ئەگەر ئەمنەکان پرسیاریان لێم کرد، بڵێم، بۆ مواجەهەی (ف) هاتووم؟ لە وەڵامدا وتی: لەبەر ئەوەی (ف) ئیعتیرافـاتی زۆری لەسـەرمان کـردووە، بەبـێ ئەوەی لێـی بـدەن! لێـرە لە زینـدانیش هەمـوو ورەمـان بەرزە و کۆبـوونەوەی خۆمـان ئەکەیـن، تەنهـا (ف) لـێ دەرچێـت. ئەو لێرەش ئیخباریمـان ئەکـات و بەو هـۆیەوە چەنـدین جـار دارکـاری کراوین. هەروەها ئەیوت: بە (ف) ئەڵێین، ئەو کارە نەکات و ئێمە هەمـوو هەر ئیعدام ئەکرێین، بـا بەپیـاوانە شـەهید بـین ... کەچـی ئەو شـکاتی لێمـان ئەکـرد و لە بەردەم ئەمنەکان ئەگریا و ئەپاڕایەوە کە ئیعدامی نەکەن.

لەو سـەردانەمدا مامۆسـتا ڕەشـاد و چەنـد دانەیەکیـانم ناسـی، گەر بیـرم مابێـت، قادر و جەنگە ناویـان تێدا بوو.دەربـارەی شـەهید 'وەهـاب'ی بـرام، شـەهید ئەسـعەد وتی: من تاوانبـارم و لەژێر ئەشکەنجەی زۆردا نـاوی دوو بـرادەرم داوە، یەکێکیـان 'وەهاب'ی براتە، ئیتر باسی دووەمیانی نەکرد کە کێیە. تەنـانەت وتـی: ئەگەر ڕۆژێـک هاتوو ئازاد بووین، کۆمەڵە لەسەر ئەم تاوانە نەمکوژێ، ئەوا مـن بـڕوام پێـی نـامێنێ و بە شۆڕشگێڕی نازانم. پرسیارێکم لێیـان کـرد، ئێسـتا چ هیوایەکتـان بە ئـازادبوون

هەیە؟ شەهید ئەسعەد هەر بەدەم گاڵتە و پێکەنینەوە وتی: مەگەر ئێران شەڕ و هێرشەکانی فراوانتر بکاتەوە و سەدام بڕووخێنێ! هەر بە پێکەنین و گاڵتەوە وتی: ئێمەش بە "ئەڵاهو ئەکبەر خومەینی ڕەهبەر" دێینە دەرەوە!

سڵاو بۆ گیانی پاکی ئەو ڕۆحە پاکانە، ئەو کوڕە دڵسۆزانە و هەموو شەهیدانی تری کوردستان و ئازادی لە هەر سووچێکی ئەم دنیایە. نەفرەت و ڕووڕەشی بۆ هەموو حیزب و لێپرسراوە خائینەکانی کوردستانی باشوور کە خوێنی شەهیدانیان بە پارە و نەوت و بازرگانی بە دوژمنان فرۆشت.

نازانم شەهید ئەسعەد بەشداریی شەخسی لە کارە سەربازییەکاندا ئەکرد، یان نا، بەڵام وای بۆ دەچووم کە بەشداری بکات. ئەو هیچ شتێکی لەو بارەیەوە لای من باس نەکردووە، بەڵام ئەو کاتەی لە بازاڕی حەسیرەکە بە تەمای کوشتنی ستار بوون، منیشی لەگەڵ خۆی بۆ ئەوێ برد و وتی، بە تەمای شتێکی وان. هەروەها وتی: دەمانچەیەکیشم بۆ حیمایەی ئەو برادەرە پێیە، بەڵام من دەمانچەم پێ نەبینی و ئەنجامدانی کارەکەشم هەر نەبینی و بەرەو لای تەکیی شێخ جەمیل یان شێخ عەلی تاڵەبانی ڕۆیشتین.

سەبارەت بە عەلی مغاویریش خیانەتی کردووە و کلێشەی ڕێکخستنەکانی تەسلیمی دەستگاکانی ئەمن کردووە. من کاتی خۆی و لە کاتی پێشمەرگایەتیی خۆم پرسیارم لە کاک ئەحمەد کرێکار و ئازاد هەورامیش کردووە و ئەوانیش هەر وایان ئەگوت. بەڵام نایاتەوە بیرم، شەهید ئەسعەد لەو مواجەهەیەدا ئەو بابەتەی بۆ من باس کردبێت. عەلی مغاویر وەک باسیان دەکرد، بۆ بەغدا ڕای کردبوو، لەوێ ئەژیا، وابزانم هەر لە کاک ئەحمەد کرێکارم بیست کە بە سزای خۆیان گەیاندووە.

برا! هیوادارم ئەگەر کەمیش بێت، سوودێکم بە یاداشتەکانت گەیاندبێت.

تەمەندرێژ بیت!

**ئیسپانیا**

**٢٠١٦/١٠/٩**

## ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد (سمکۆ شوانی)
### (یاداشت)

**چۆن پەیوەندیم بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد؟**

فەخرەدین عەلی ڕەزا کە لە پێشمەرگایەتی بە هەردی دەناسرا، زۆر هاوڕێم بوو. هەردی هەم پوورزا و هەم ئامۆزازام بوو. ئەو سەردەمەش لە گەڕەکی حەمام عەلی بەگ دراوسێی یەکتری بووین و هاموشۆی بەردەوامان بۆ ماڵی یەکتری هەبوو. من دوایی لە زاری خۆیەوە زانیم کە لە ساڵی (١٩٧٧)ەوە پەیوەندی بە ڕێکخستنی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە. ئەو پەیوەندییەش لە ڕێگای جومعە ئەنوەر ئۆمەرەوە کە لە پێشمەرگایەتی بە شێروان دەناسرا، دروست ببوو. شێروانیش هاوڕێم بوو، بەهۆی هەردییەوە هاموشۆی خێزانیمان لە نێواندا هەبوو. من ئاگاداری ئەوە نەبووم، باوکم لە ڕێگەی هەردییەوە لە ساڵی (١٩٧٨)ەوە پەیوەندی بە کۆمەڵەوە کردبوو. منیش بە حوکمی خوێندەوارییەکەم بۆ خوێندنەوەی چاپکراوەکان هاوکاری باوکم دەکرد، نەک وەک ئەوەی لە ڕێکخستنە، بەڵکوو وەکوو ئەوەی پێشمەرگەیەکی دێرینە و لە دروستبوونی شۆڕشی ئەیلوولەوە چەکی هەڵگرتووە و یەکێکە لە جەلالییە کۆنەکان، ئەوان ئاوها منیان حاڵی کردبوو.

لە ساڵی (١٩٨١)ەوە بەدڵنیاییەوە نازانم چ مانگێ بوو، تیکەڵی خوێندنەوەی چاپکراوەکانی کۆمەڵە بووم، بە تایبەتی گۆڤاری کۆمەڵە کە گۆڤارێکی زۆر خەت ورد بوو، زۆر بەزەحمەت دەخوێندرایەوە.

هەروەها لەگەڵ هاموشومان بۆماڵی شێروان، شێروان کتێبی بۆ خوێندنەوە پێم دەدا و کاتی بۆ دیاری دەکردم تا بۆی بگەڕێنمەوە. لەو کتێبانە کە لەبیرم ماوە، کتێبەکەی کوردستان و کوردی عەبدولڕەحمان قاسملۆ بوو. پێی وتم، ئەم کتێبە زۆر گرنگە بیخوێنیتەوە و وریابە دوایی پرسیارت لێ دەکەم، لە ترساندا لەگەڵ خوێندنەوە نووسیمەوە، تا زیاتر لێی حاڵی بم. کتێبێکی تری داپێم، دەربارەی "زێدەبایی" مارکس بوو. لە بیرم نەماوە، ئەو کتێبە کێ نووسیبووی، بەڵام بەلای منەوە زۆر قورس بوو، هەر دەمخوێندەوە و تەقەی سەرم دەهات، وام لێ هاتبوو، ماوەیەک لە ماڵەوە هەر بەدەستمەوە بوو، تا دواجار دامەوە و پێم وت، بە خوا یەک ساڵی تر بیخوێنمەوە، هیچی لێ هەڵناکرێنم. دەستنووسێکی شیعری پێم دا بەناوی "ملوانکەی شین"ەوە، هی شاعیر شەریف بوو، شیعرەکانی ئێستاش تام و چێژە کوردایەتییەکەی لەبیرم ماوە، ئەوەشم نووسییەوە تا لای خۆم بیپارێزم ...

من لە ڕێکەوتی ساڵی ١٩٦٥ لە دایک بووم و لە ساڵی ١٩٨١ پەیوەندیم بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کردووە. بەڵام دوای ئەوەی پچڕاومەتەوە بۆ جاری دووەم و سێیەم پەیوەندیم کردووەتەوە، بەم جۆرە:

دوای ئەوەی هەردی لە ڕێکەوتی مانگی ٦ی ساڵی ١٩٨١ لەلایەن کەسێکەوە (کە هەردی ویستبووی بۆ کۆمەڵە ڕێکی بخات و چەند جارێکیش کۆبوونەوەی لەگەڵدا کردبوو، لەدواییدا ئەو کەسە لای کەسێکی سەربە هەواڵگریی نەوتی کەرکووک کە هەر خزمی خۆی بوو، خەبەری لێ ئەدات) بەگرت ئەدرێت، دوای ماوەی ٤٠ ڕۆژ ئازار و ئەشکەنجە، بە واسیتە و هەوڵێکی زۆر، بە کەفالەتی باوکم ئازاد کرا.

ئەو ڕۆژەی هەردی ئازاد کرا، من و سەدرەدینی برای ڕاسپارد، بۆ ماڵی شێروان بچین و پێی بڵێین: ئاشکرا بووینە و من ناوم نەداوە، بەڵام زانیاری زۆریان لەسەر جووڵانەوەکانی من هەبووە، نەوەک بە هۆی هاتوچۆکانمەوە، ئەویش ئاشکرا بووبێت، بۆیە با ڕابکات. من و سەدرەدین بۆ ماڵی شێروان چووین کە لە گەڕەکی ئیمام قاسم لە پشت چایخانەکەی ئەشرەفەوە بوو، ڕاسپاردەکەمان پێ گەیاند. شێروان لە وەڵامدا وتی: من هەموو شتێکم ڕێک خستووە، با خەمی منی نەبێت، ئەمڕۆ سبەی بۆ پێشمەرگایەتی دەردەچم، با ئەویش پەیوەندیمان پێوە بکات، تازە ناتوانێت لە کەرکووک بژێت.

بەم شـێوەیە شـێروان دوای دوو ڕۆژ و هەردیـیش دوای ٢٠ ڕۆژ ڕۆییشـتن و پەیوەندییان بە هەرێمی دووی کەرکووکەوە کرد.

ئەوەنـدەی مـن ئاگـادار بـم، جگە لە شـانەکەی مـن کە پێـک هـاتبوو لە خـۆم و موئەیەد عەلی سادق و کاوە تەیفوور ئیبراهیم گەنیاکی، شانەیەکی تریشـی هەبوو، عیسـا عەبیـد ئەحـمەد کە لە پێشـمەرگایەتی بە جووتیـار ناسـرابوو. جووتیـار ئەو کاتەی کە هەردی لە زیندان ئازاد کرا و پەیوەندی بە پێشمەرگەوە کرد، خوێندکاری پۆلی شەشەمی ئامادەیی لە خوێندنگای عەبدولمەلیک بن مەروان بوو.

ڕۆژێکیـان چەنـد پیـاوێکی ئەمـن و هەواڵگـری بـۆ ئامـادەیی عەبـدولمەلیک بـن مەروان بـۆ گرتنـی جووتیـار دەچـن. ئەوان لە ئیـدارەی خوێنـدنگاکە دادەنیشـن و فەڕاشـەکە دەنێرن بە شوێن جووتیاردا. کاتێک جووتیار بۆ ئیدارە دەچێت، دەڕوانێ پیاوانی ئەمن و هەواڵگری لێیە، یەکسـەر لە فیکەی خـۆی تـێ دەگـات، بە تـایبەتی کە پێـی دەڵـێن: "لەگەڵمـان وەرە، هەنـدێک کـاری تایبەتیمـان پێـتە و دوایـی وەرەوە بـۆ دەوامـی خـۆت". جووتیـاریش پێیـان دەڵێت: باشـە، بـا بچـم کتێبەکـانم لە پـۆل بهێنم. بەڵام جووتیـار لە بنەڕەتەوە ئەم بیـرۆکەیەی بە مەبەسـتی ڕاکـردن بـوو، بـۆیە بـۆ پـۆلەکەی نـاچێتەوە و بەسـەر دیـواری خوێنـدنگاکە خـۆی هەڵـئەداتە چـۆڵاییەکەی پشـتەوە و لەوێشـەوە بەرەو گەڕەکی تەپەی مەلا عەبدوڵا ڕا دەکـات. ئیتر بـۆ مـاڵی خۆشـیان نـاچێتەوە و یەکسـەر بەرەو گونـدەکەی خۆیـان (حاجبێخـان) لە سـنووری ناحییەی شوان ئەڕوات. دوایـی پەیوەندی بە پێشـمەرگەوە دەکـات و تـا سـاڵی ١٩٨٨ لە ئەنفالەکە لە ڕێگەی ئامر مەفرەزە خاسەی جاش، فەتاح کتکەییەوە خـۆی تەسـلیم دەکاتەوە و پاشان سەرنگوون دەکرێت.

مـن هەر ئەو کـاتە لە ترسـی گـرتن، بـۆ مـاوەی دوو هەفتە چـووم بـۆ گوندەکەی خـۆمـان (دووشـیوان). لەڕاسـتیدا سـەردانیکردنی مـن بـۆ گونـدی دووشـیوان زۆر ئاسـایی بـوو، چـونکە مـاڵی بـاپیرم لەوێ بـوو. سـەرەتا بڕیـارم دا منیش بـبم بە پێشمەرگە، زۆر حەزم دەکرد نـاوی منیش لەو نـاوانە بووایە کە ئاشـکرا بوونە، تـا بیانووی تەواوم لەلا بێت، ببم بە پێشمەرگە.

لەو ماوەیەدا کە لە گوندەکەمان بووم، گوێم بە خورەی ئاودا ڕاگرتبوو، تـا بزانم کەس ناوم دەهێنێ، یان نا، وا دیار بوو هیچ نەبوو.

لەو ماوەیەدا کادر و پێشمەرگە وریا ئاغجەلەریم لە ماڵی ڕەمەزان سەفەر دووشیوانی ناسی. ڕەمەزان ماوەی دوو ساڵێک بوو، ببوو بە پێشمەرگە و بەدوای ئەویشدا عوسمانی برای و لەدواییدا لە ساڵی ١٩٨٠ لە شەڕی گوندی عەسکەر شەهید بوو. لەگەڵ وریا ئاغجەلەری زۆر قسەمان کرد و باسی ئەوەم کرد، بە نیازم ببم بە پێشمەرگە و چاوەڕێم هەردی یان شێروان ببینم. کاک وریا وتی، بڕۆرەوە بۆ کەرکووک و شانەکەت بەگەڕ بخەرەوە، خۆم وەکوو ڕێکخستن سەرپەرشتیتان دەکەم. ئیتر کاک وریا بۆ یەکجاری پەشیمانی کردمەوە و لەو دوودڵییە ڕزگاری کرد و بەو شێوەیە وەکوو ڕێکخستن مامەوە.

لەو ماوەیەدا چەند کەسێکم لە گوندەکە کردە ڕێکخستن، لەوانە، زرار ئەحمەد حەسەن (مامم) کە کردمانە ئەڵقەی گەیشتنی نێوان من و کاک وریا ئاغجەلەری. لەدوای کاک وریا ئاغجەلەریش شەهید ڕێباز کلاوقوتی و دوایی کاک مەلا شاخی و ماوەیەکش فەرەیدوون مام سەلام لێپرسراوی شانەکەی من بوون. تا لە ڕێگەی هەردی و شێروانەوە و بەهۆی کەرتی ڕێکخستنی چەمچەماڵەوە نامەیەکم نووسی و گەیشتە ڕێکخراوی کەرکووک. بۆ جاری سێیەم و لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٢دا پەیوەندییەکەم لە ڕێگەی کەسێکەوە بەناوی "دکتۆر خالید"ەوە گرێ دایەوە.

دکتۆر خالید کە بە سەمیر نووری دەناسرێت، خوێندکاری کۆلێجی پزیشکیی زانکۆی سەلاحەدین و دانیشتووی گەڕەکی شۆڕیجەی کەرکووک بوو.

هەر وەکوو زانیومە، لەدوای شالاوی گرتنەکان و لەبەر یەک هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاری کەرکووک، ڕێکخراوی کەرکووک پێک هاتبوو لە: شەهید مامۆستا قادر و شەهید محەمەد ئەحمەد ڕەحمان (محەمەد ئاڵتوونچی) و ساڵح عەزیز ڕەشید (سالار ڕەشید). هەر وەکوو باس دەکرێت، ئەمانە لە سەرکردەکانی پێکهێنانەوەی پەیکەری ڕێکخراوەیی تازەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بوون لە کەرکووک.

من کاک "سالار ڕەشید"م لە کۆنفرانسی سێیەمی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان لە تەمووزی ساڵی ١٩٨٤ لە خوێندنگاکەی گوندی خەتیی دۆڵی خۆشناوەتی ناسی. ئەو کاتەی ڕاپۆرتی یەکێتیی خوێندکارانی بە هاوبەشی لەگەڵ دکتۆر عیسام نامیق خوێندەوە. ئەو کاتە دکتۆر سکرتێری یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان و بەرپرسی لقی مووسڵ بوو، سالاریش بێجگە لەوەی ئەندامی کۆمیتەی

ڕێکخراوی کەرکووکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو، لێپرسراوی لقی هەولێر و زانکۆی سەلاحەدین و ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستانیش بوو.

ئەو کاتەی دکتۆرخالید هاتە لام و پەیوەندیمان بەست، لە سەروبەندی وازهێناندا بوو، چونکە وتی، من ڕەنگ بێت، وەکوو کۆمەڵە نا، بەڵکوو وەکوو ڕێکخستنی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان سەرپەرشتیت بکەم. مادام تۆ خوێندکاری، هەوڵ بدە ئەو ڕێکخستنانەی خوێندکارن و ئەوانەی خوێندکار نین، بە دوو لیستی جیاواز ئامادەیان بکە، تا ئەگەر بڕیار وا بوو، وەکوو دوو خەتی جیاواز کار بکەین، ئەوا تۆ هەوڵ بدە هەم وەکوو کۆمەڵە و هەم وەکوو خوێندکاران سەرپەرشتییان بکەیت.

دوایی نامەیەکم بۆ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە نووسی، بۆ ئەوەی وەکوو کۆمەڵە پەیوەندیم پێوە بکەن. ئەوە بوو ڕۆژێکیان شەهید هیوا "نەوزاد فەتحولا" هات بۆ لام. شەهید هیوا ماوەیەک لەگەڵیدا کاری ڕێکخراوەییم کرد، بەڕاستی نموونەی ئینسانی شۆڕشگێڕ و کادر و مامۆستا بوو.

ئەوەی من لەبیرم مابێت، ئەو پۆل و کەرتەی من کاری ڕێکخستنم تێدا کرد، ناوی پۆلی شەهید بێستوون و کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن بوو. بۆ یەکەم جاریش هەر لەو پۆلە و لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣دا پلەی ئەندامەتیی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانم پێ بەخشرا.

ئەو کات هاوڕێ عەزەدین مەجید (کرێکار) کە بە جەمال ئەیووب دەناسرێ، لێپرسراوم بوو، هەر خۆیشی پێشنیاری کردبوو، پلەی ئەندامەتیم پێ بدرێت و لە نامەیەکدا لەسەر وەرەقەی ڕایز کە ئاراستەی خۆم کرابوو، بە ناوی هاوڕێ "کاروان"ەوە، پیرۆزباییم لێ کرا بوو، وە لە خوارەوە بە ناوی ڕێکخراوی کەرکووکەوە مۆر کرابوو.

شانە و ڕێکخستنەکانی من و هەردی بەم شێوەیە بوو: من ڕاستەوخۆ پەیوەندیم بە "هەردی"یەوە هەبوو، هەردیش پەیوەندی بە شێروانەوە هەبوو، شێروانیش پەیوەندی بە "شێخ جەواد بەهادین عەلی"یەوە هەبوو، کە یەکێک بوو لە ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر.

جەواد، ئەو کات خوێندکاری پەیمانگای تەکنیکی کەرکووک بوو، هەروەها کوشکێکی چافرۆشتنیشی لەبەردەم دوکانەکەی ڕەزا کەبابچی لە حەسیرەکە

دانابوو. جەوادماڵیان هەر لە گەڕەکی ئیمام قاسم بوو، دراوسێی ماڵی شێروان بوو. من ئەم جۆرە پەیوەندییەی نێوان شێروان و شێخ جەوادم نەدەزانی، تا دوایی شێروان پێی وتم.

لە سەروبەندی گرتن و ڕاوەدوونانی ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی ئاگر، ئێوارانێکیان جەواد خۆی کرد بە ماڵماندا. سەرەتا من وام زانی هەر بۆ سەردانی هاتووە، چونکە هاوڕێیەتییەکی لە ڕادە بەدەر خۆشمان هەبوو. من جەوادم لە ئاهەنگی هاوسەرگیریی شێروان ناسی و بەدوای ئەوەشدا جەواد، گوڵەباخ خانی خوشکی شێروانی خواست. جەواد ئەو شەوە لە ماڵی ئێمە مایەوە. شەو بەدەم یاریی شەترەنجەوە (شەترەنجەکەی هەر لە ڕێگا کڕیبوو، کە بەرەو ماڵی ئێمە هاتبوو، هەر ئەو شەوەش فێری یاری شەترەنجی کردم) بۆی باس کردم، هەستی کردووە کە ئەمنەکان لە حەسیرەکە چاودێری ئەکەن و ئەترسێ بیگرن. منیش پێم وت: بۆ دەتگرن، خۆ تۆ پەیوەندیت بەوانەوە نییە کە لەم ماوەیەدا دەستگیر کران؟ وتی: نەخێر! بەڵام ڕاستییەکەی نەیدەویست من بزانم پەیوەندیی بەوانەوە هەیە، چونکە کەسێکی هەتا بڵێی نهێنیپارێز و لەسەرخۆ بوو. بەو شێوەیە شێخ جەواد ماوەیەک لەملا و ئەولا خۆی حەشاردا و ماوەیەکیش لە ماڵی خاڵی لە شارۆچکەی دوکان دەبێت. بەڵام لەوێش بە هەمان شێوە پیاوانی ئەمن چاودێری دەکەن، بۆیە بڕیار دەدات ببێتە پێشمەرگە و دەچێت بۆ سەرگەڵوو. لەوێش ماوەیەک گوێ بە خوڕەی ئاودا ڕادەگرێت و دوایی وەک لە شێخ لەتیفی برایەوە بیستم، کاک نەوشێروان پێی وتووە: وا دیارە کەس ناوی تۆی نەهێناوە، بۆیە بگەڕێوە بۆ کەرکووک و پەیوەندییەکانت دروست بکەوە! ئیتر بڕیار دەدات بگەڕێتەوە.

ڕژێم لەو ماوەیەدا چووبووە حاڵەتی سوباتەوە، بۆ ئەوەی جەواد هێور بێتەوە و گومانەکەی بڕەوێتەوە. تا لە ١٩٨١/١٢/٢١ بۆ پەیمانگا دەچێت و ئیتر ناگەڕێتەوە و هەتا ئێستا بێسەروشوێنە. ئەوەندە زانراوە، دوو شایەد بەسەرییەوە هەبووە، ئەویش هەر ئینکاری کردووە، بەڵام دوایی نەزانراوە چی بەسەردا هاتووە. ئەمە لە دەمی کەسێکی کۆییەوە بیستراوە کە لەگەڵیدا سجن بووە.

**مانگرتنی خوێندکارانی ئامادەیی سەورە**

ساڵی ١٩٨٤ ساڵی گفتوگۆی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەگەڵ ڕژێمی عێراق بوو، بە نیسبەت گەلی کوردەوە ساڵێکی پڕ خۆشی و گەشت و سەیران و هەڵپەڕکێ بوو. ئەو ساڵە زۆربەی خوێندکارە کوردەکانی زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر مانیان گرتبوو، چونکە ئامادە نەبوون، مەشقی جەیشی شەعبی بکەن.

من ئەو کاتە لەگەڵ دکتۆر خالید پەیوەندیی ئاسایی و هاموشۆمان هەبوو، خۆیشی ئەندامی لیژنەی ناوخۆی خوێندکاران (ل.ن.خ.) بوو، ئەو لیژنەیەی کە ڕابەرایەتیی مانگرتنی خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدینی کرد. دکتۆر هاتەماڵەوە بۆ لام و باسی ئەوەی کرد، بە نیازن لە ئامادەیی سەورە مانگرتن ڕێک بخەن. من ئەو کاتە پۆلی سێیەمی ناوەندیی خوێندنگای ئەبووئەیووب ئەلئەنساریی ئێواران لە گەڕەکی ئیمام قاسم بووم. ئەم قوتابخانەیە لە حەسیرەکەوە نزیک بوو. شانەیەکی ڕێکخستنی بەهێزم لە دواناوەندیی سەورە هەبوو کە کامەران حاجی عوسمان سەرپەرشتی دەکرد و سەرداری برای و فەلاح دوو ئەندامی ئەو شانەیە بوون و ناوی ترم نەئەناسی لەگەڵیان. بەڵام ئەمانە کەسە سەرەکییەکان بوون. بۆیە منیش کامەران حاجی عوسمانم بۆ کات و ساتی مانگرتنەکە ڕاسپاردبوو کە هەر خۆیان ڕۆژی ١٩٨٤/٥/١٣یان دەستنیشان کردبوو. ئەو ڕۆژە دەبوو لە تاقیکردنەوەی زارەکی بەشدارییان بکردایە. وا ڕێکەوتبوون کە لە حەوشەی خوێندنگاکە گرد ببنەوە و بەشداری تاقیکردنەوە نەکەن، تا بەرپرسانی ڕژێم نەیەن و داخوازییەکانیان بەوان ڕانەگەیەنن.

١٩٨٤/٥/١٣ من میوانێکی پێشمەرگەم هەبوو، بە مۆڵەت بۆ کەرکووک هاتبوو، ئەویش نووری عەلی ڕەزای پوورزام برای شەهید هەردی بوو. لەگەڵ خۆم بۆ حەسیرەکەم برد، بۆ ئەوەی بزانم مانگرتنەکە چی بەسەر هاتووە، ئەنجام درا یان نا. کاتێک کە گەییشتینە ئەوێ، سەیرم کرد جارێ هەر کۆبوونەتەوە و هێشتا وەڵام نەدراونەتەوە. لەگەڵ کامەران حاجی عوسمان کەمێک ڕاوەستام و کامەران پێشنیاری کرد بمێنمەوە، منیش بڕیارم دا تا کۆتایی بمێنمەوە.

ئەگەرچی بۆ من نەبوو بەشداری لەو مانگرتنەدا بکەم، چونکە ئەوە تایبەت بە خوێندکارانی ئامادەیی سەورە بوو، نەک خوێندنگایەکی تر، بەڵام پێم باش بوو بمێنمەوە، چونکە وام لێک دایەوە، ئەگەر بڕۆم و بەجێیان بهێڵم، ڕەنگ بێت بە

ترسنۆکم لەقەڵەم بدەن و بڵێن، ئێمەی بۆ ئەم بەزمە ڕێک خستووە و خۆی ئامادە نییە بەشداری تێدا بکات.

سەرباری ئەوەش، ئێمە ئەم مانگرتنەمان بە مانگرتنێکی ئاسایی دەزانی و تەنها بە نیازی ئەوە بووین، بەرپرسانی ڕژێم بێن و داواکارییەکە بگەیەنن کە ئەوەی من لە یادم مابێت لە ٥-٦ خاڵێکدا ڕێک خرابوو. لەوانە: بەشداری پێ نەکردنی خوێندکارانی زانکۆ بە مەشقی جەیشی شەعبی و گەڕاندنەوەی خوێندکارە دەرکراوەکان و حیساب نەکردنی ساڵی کەوتن بۆ خوێندکارە دەرکراوەکان و چەند خاڵێکی تر کە من لەبیرم نەماوە.

ئەگەری گرتن و لێدان و گەورەبوونەوەی مانگرتنەکە لای ئێمە، ئەگەرێکی زۆر لاواز بوو. نووری پوورزامم بەڕێ کرد، چونکە ئەویش دەیویست بمێنێتەوە و بەشداری بکات. بەڵام ئێمە پێمان وت، مانەوەی تۆ بۆ ئێمە باش نییە، چونکە تۆ پێشمەرگەیت و بە مۆڵەتی لیژنەی تەنسیق بۆ کەرکووک هاتوویت، ڕەنگ بێت بۆ خۆشت خراپ بێت.

ئیتر منیش وەک خوێندکارەکانی تر لە ڕیز وەستام و کەوتینە قسەوباسی مانگرتنەکە. بەڕێوەبەری خوێندنگاکە، مامۆستا سەرتیب هات و داوای لە خوێندکارەکان کرد بچنە پۆلەکانەوە و تاقیکردنەوەکە بکەن، بەڵام کەس بە داواکەی ڕازی نەبوو. مامۆستا سەرتیپ تکای لە خوێندکاران کرد کە واز لەم بەزمە بهێنن و ئەنجامەکەی باش نابێت، بەڵام خوێندکارەکان سوور بوون لەسەر نەچوونە ژوورەوە و داوایان کرد، بەرپرسانی ڕژێم ببینن. چەند جارێک مامۆستا سەرتیپ چووە ژوورەوە و هاتەوە بۆلای ئێمە، بەڵام سوودی نەبوو. تا دواجار مامۆستا بڕیاری دا تەلەفۆن بۆ بەرپرسان بکات. لە ماوەیەکی کورتدا، هەموو سەربانەکان و دەوروبەری خوێندنگاکە بە پیاوانی ئەمن و جل زەیتوونی گیران.

من ئەوەی لە بیرم بێت، کەسێکی خڕەی گرپن بە ناوی ئەبووئەوس لێپرسراوی ئیتیحادی تەڵەبە و شەبابی کەرکووک بوو، لەگەڵ بەرپرسی ئەمنی ناوچەکە لێمان هاتنە پێشەوە. ئەبووئەوس هەندێ قسەی کرد و پاشان بەجوانی ڕیزیان کردین و کەوتنە پشکنینمان. لە کاتی پشکنین لە گیرفانی مندا وێنەیەکی داواکارییەکانیان پێم گرت. ئەو کەسەی کە لە گیرفانمدا وێنەکەی دۆزییەوە لێمی پرسی: ناوت چییە؟

منیش هات بە ئەقڵمدا، ناوێکی هەڵەم وت و لەسەر پەڕەکە ناوەکەی نووسی و ئیتر بەجێمی هێشت و کەوتە پشکنینی خوێندکارەکانی تر.

دوای ئەوە بە کێبڵ و دۆنکی کەوتنە گیانمان، کەس نەبووە برای کەس و بەپاڵ خستمانیانە ناو سەیارەکانیانەوە. بەڵام هەشبوو لە خوێندکارەکان دەستگیر نەکرا و گەڕێندرایەوە بۆ پۆلەکان.

نازانم ژمارەمان چەند بوو کە دەستگیر کراین، من لەگەڵ کۆمەڵێک خوێندکاری تردا سواری لاندکرۆزێکی سپیی مۆدیل ٧٩ کرام. سەرەتا بردمانیان بۆ بەردەم ئەمنی کەرامە، بەڵام لەوێ دایان نەبەزاندین و بەرەو بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی کەرکووک بردمانیان کە ئەو کات لە نزیک فەرمانگەی ژووری بازرگانی بوو. هەموومانیان لە حەوشەی ئەمن کۆ کردەوە و ئینجا ئەمریان کرد ڕیز ببەستین و بە سەرنەویکردنەوە بەرەو ژوورە تاکەکەسییەکان بڕۆین. پێنج و شەش پەستێنراینە ژوورە تاکە کەسییەکانەوە. هەتا گەیشتینە ناو ژوورەکان، وەکوو ساوەری خێر کێبڵ و دۆنکی و شەق و زلەباران کراین.

ئەو ژوورەی منی تێدا بووم، جگە لە خۆم پێنج خوێندکاری تری لێ بوو. یەکێک لە خوێندکارەکان وتی، کوڕینە من ئەمە جاری یەکەمم نییە بگیرێم و جاری دووەممە، لە بیرتان نەچێت، بەس ئیعتیراف نەکەن و هەڵتان نەخەڵەتێنن، بە شەرەفم ئەوەی ئیعتیراف بکات، یان بە قەول و قسەیان باوەڕ بکات، تا ماوە دەرەوە نابینێ و لەوانەیە ئیعدامیش بکرێت.

من هەرچەندە ئێستاشی لەگەڵدا بێت، نەمزانی ئەو خوێندکارە کێ بوو، بەڵام وەک نموونەی کەسی سەرکردە هاتە بەرچاوم و لە قسەکانی ورە و خۆڕاگری و قارەمانێتیم دەخوێندەوە.

من لەگەڵ لێدان و سەرشکان و خوێنی دەموچاوم زۆر هیلاک بووم و تاقەتی هیچم نەمابوو. لەوێش دیسانەوە بە هۆی زلی هەیکەل و ئەو ڕیشەی کە ئەو کات باو بوو، بە تایبەتی لەناو گەنجەکانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، پشکی من لە لێدان و کێبڵ و دۆنکی لە هەمووی زیاتر بوو.

ئەو کاتەی لە ژوورە تاکە کەسییەکە بووم، گوێم لێ بوو بەدوای ئەو ناوەدا دەگەڕان، من بە هەڵە بەو ئەمنەم دا کە پەڕەکەی لە گیرفانمدا گرت. هاتنە

ژوورەکەی ئێمەش و سۆراغی ئەو ناوەیان کرد. لە دڵی خۆمدا وتم، خودایە لێت بەزیاد بێت، لەو مەترسییە ڕزگارت کردم.

دوای ئەوە هاتن، یەک یەک چاویان بەستینەوە بۆ لێکۆڵینەوە و لێدان بردمانیان. ئیتر جگە لە هەرا و نەڕەنەڕی ئەمنە جەلادەکان و هاوار وناڵەی خوێندکارەکان، هیچت نابیست و کەس ئاگای لە کەس نەبوو.

هەموو ئەو پرسیارانەی لە کاتی ئەشکەنجە لە من دەکرا، ئەمانە بوون: بەرپرسەکەت کێیە لەم مانگرتنە؟ پەیوەندیت بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە هەیە؟ کێ دەناسی پەیوەندی هەبێت؟ تۆ کە خوێندکاری ئامادەیی سەورە نیت، چۆن هاتی بەشداری مانگرتن بکەیت؟ مادام خوێندکاری ئەبوولئەیووبی شەوانیت، دانی پێدا بنێ کە خۆت ڕێکخەری ئەم مانگرتنەیت ...هتد.

هەموو وەڵامەکانی من ئەمانە بوون: من لەو خوێندنگایە نەگیراوم، لەسەر جادەی حەسیرەکە گیراوم، لەو کاتەدا من بۆ خوێندن دەمویست بۆ باخچەکەی ئیسکان بڕۆم کە کەتووەتە بەرانبەر وێنەگری ٧نیسان (ئەم دوکانی وێنەگرییە ئەوەندەی من بزانم، موڵکیماڵێک بوو لەسەر کوردایەتی دەستی بەسەردا گیرابوو، درابوو بە کەسێکی باوەڕپێکراوی خۆیان) دەستگیریان کردم، من هیچ نازانم، ئاگام لە هیچ نییە، پەیوەندیم بەهیچ حیزبێکەوە نییە و لەناو یەکێتی کەس ناناسم و پەیوەندیم پێیانەوە نییە.

ئەوان دەیانویست بە فرتوفێڵی ئەوەی دانوستانیان لەگەڵ یەکێتی هەیە، وایان نیشان ئەدا، ئەگەر پەیوەندیت بەوانەوە هەبێت، بەرت دەدەن و کێشەت نامێنێ. بەڵام من ڕەتم دەکردەوە کە پەیوەندیم پێیانەوە هەبێت، لەبەر دوو هۆکار: یەکەمیان، خۆم باوەڕم بە دانووستان نەبوو، ئەوەندەم لەسەر بابەتی دانووستان لەگەڵ پێشمەرگە و کادرەکان موناقەشە کردبوو و باسم لە کۆتاییەکی خراپی دانوستانەکە دەکرد. دووەمیش ئەوە بوو، وام لێک دەدایەوە کە هەر مەبەستیانە هەڵم بخەڵەتێنن، چونکە قسەی ئەو خوێندکارەی یەکەم جار لە ژوورە تاکەکەسییەکەدا بوو، هەر لە مێشکمدا دەزرینگایەوە.

بۆ لێدانی من، جەلادەکانیان دەگۆڕی و تا دەهات لەشم لەگەڵ لێداندا سڕ دەبوو و ئازارەکان کەمتر دەبوونەوە. هیچ لێدانێک بەقەد لێدانی ژێرپێم ئازاری نەبوو، چونکە لەگەڵیدا هەموو بەدەنم زیڕەی دەکرد بە سەریشمەوە. هەردوو پێمیان بە

بەرزییەوە بەستبووەوە، هەتا ئەو کاتە نەمدەزانی چییە و لەتاو ئازارەکەی هێزێکی وەحشییانەم بۆ پەیدا بوو، بەرەو لای خۆم کێشم کرد و بەسەر خۆممدا ڕووخاند. ئینجا زانیم کورسییە و لەلایەن جەلادێکەوە گیراوە، بۆ ئەوەی لە کاتی لێدانی من هەم نەجووڵێ و هەم من ڕاینەپسکێنم.

لێدانێکی تر کە تاقییان کردەوە، بەستنی کارەبا بوو بە گوێچکەکانمەوە و بە هەردوو مەچەکمەوە و بە پەنجەکانی پێمەوە. کاتێک کە ڤۆلتییەی کارەباکەیان دەکردەوە، ئیتر نەمدەزانی من هەم، هەستم دەکرد وام لەناو مەنجەڵێک ئاوی گەرم و لەسەر ئاگرێکی بەهێز، لەگەڵ قوڵتی ئاوەکە من هەڵدەپەڕم. تا ڤۆلتییەکەیان دەکوژاندەوە ئیتر من وەکوو ئەوە وابوو، لە بەرزییەکەوە فڕێ بدرێمە خوارەوە و بدرێم بەسەر زەویدا. جار لەدوای جار دەمگوت، با ئەمجارەش خۆم بگرم و هیچ نییە، ئێستا کۆتایی دێت. ئەوانیش تا دەهات تووڕەتر دەبوون لێم و جنێوبارانیان دەکردم. تا دواجار پانتۆڵەکەیان لە پێ داکەندم و خەریکی ئەوە بوون، ئەو وایەرانەی پێشتر لە مەچەکیان بەستبووم لە زەکەرمی ببەستن. گوێم لێ بوو سۆراخی ناوەکەم کرا، وتم، بەڵێ منم. من بەس دەنگ دەبیستم، چاوەکانم بەسترابوونەوە. وتیان، یەکێک وەک ئاییدی یەکێتیی نیشتمانی لە لیژنەی تەنسیقەوە هاتووە، دەڵێت: ئەوە ئەندامی ئێمەیە و هاتووە بۆ بەردانت. منیش وتم: من نایانناسم و پەیوەندیم پێیانەوە نییە. ئیتر کەسەکە بەجێی هێشتین و جەلادەکانیش وازیان هێنا لەوەی کارەبا لە زەکەرم بدەن.

دوای ئەوەی لە لێدانم بێزار بوون، بردمیان فڕێمیان دایە ژوورێکی گەورەوە کە دەوروبەری ٢٠ خوێندکارێکی تێدا دەبوو. من زۆر هیلاک بووم و هەر ئەوەتا ئاگام لە خۆم بوو، زەرداوم هەڵدەهێنایەوە. یەکێک لە خوێندکارەکان کە دواتر و لەدوای بەربوونم سەردانی کردم و زانیم ناوی عەلییە، سەرمی خستە سەر ڕانی و گرنگی زۆری پێ دام. کە خواردنیان بۆ هێناین، وتیان، ئەمە هیی عیشایە، ئینجا زانیم درەنگانی شەوە و ئەمە خواردنی ئێوارەیە. خواردنەکە شلەیەکی سارد و سەمموونێک بوو، من هێزم تێدا نەبوو، بۆیە هیچم نەخوارد، بەڵام خوێندکارەکانی تر بەدەم نوکتە و پێکەنین و فشقیاتەوە کەوتنە خواردنی.

**کەرکووک**

**٢٠١٧**

## عەزەدین مەجید محەمەد (جەمال ئەیووب)

### (یاداشت)

**لە ڕیزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا چیمان کرد؟**

هاوینی ئەم ساڵ (٢٠١٩) "سالار ڕەشید"ی هاوڕێم پێی ڕاگەیاندم کە پرۆژەی کتێبێکی دۆکیۆمێنتی بە شێوەی وەبیرهێنانەوەی یاداشتەکانی خۆی لەسەر ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران لە نێوان ساڵانی کۆتایی هەفتاکان تا ناوەڕاستی هەشتاکان بەدەستەوەیە کە بەڕێزیان کارەکتەر و کاریزمایەکی گرنگی ئەو سەردەمە بوون لە شاری کەرکووک. پاش تەواوبوونی پرۆژەکە و ئامادەکردنی بۆ چاپ لە هەفتەکانی کۆتایی ئەم ساڵ لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنی داوای ئەوەی لێ کردم کە بۆچی منیش بە شتێکی بچووک لەو یادەوەرییانەی خۆم کە لەگەڵ هاوڕێ سالار لەو سەردەمە لە ڕیزەکانی کۆمەڵەدا پێکەوە کارمان تێدا کردووە بەشدار نەبم، تا لە پاشکۆی ئەو کتێبە لە بەشی یاداشتەکان بە شێوەی چەندین هاوڕێی تر کە لەو مێژووە بە جۆرێک لە جۆرەکان بەشدارییان بووە بڵاو بکاتەوە.

من بەو داوایە خۆشحاڵ بووم، بەو هۆکارەی کە چەند ساڵێک و لە ڕۆژگارێکی گەلێک تایبەت و مەترسیداردا لەو ڕێکخراوە کارم کردووە و لە ڕێکخستنەوە و هەڵسانەوەی ئەو ڕێکخراوە لە شاری کەرکووک لەدوای گرتن و ئیعدامکردنی ژمارەیەک لە هاوڕێیانی کۆمیتەی ئاگر ڕۆڵی خۆمان تێدا گێڕاوە.

**چۆن بووم بە کۆمەڵە؟**

بەر لەوەی لە ڕیزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە ڕێی سالار ڕەشید پلەی ئەندامەتی وەربگرم، ئاشنایەتی و بەدواداچوونم بۆ کۆمەڵە بۆ یەک دوو ساڵ بەر لەوە دەگەڕێتەوە.

کۆتایی هەفتاکان لەگەڵ چەند هاوڕێیەک لە گەڕەکی شۆڕیجەی شاری کەرکووک کەوتینە ناو دنیای خوێندنەوە و هاتوچۆی کتێبخانەکان و موناقەشە فیکری و ئەدەبی و سیاسییەکانەوە.

ئێمە ڕۆژانە سەردانی کتێبخانە و کۆڕ و کۆمەڵە فیکری و ڕۆشنبیری وهونەرییەکانی شاری کەرکووک و شارەکانی دیکەی عێراق و کوردستانمان دەکرد. بیرمە هەر ئەو دەمە گۆڤاری ڕزگاری کە لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان لە بەغدا چاپ دەکرا، لە کتێبخانەکان کەم و زۆر چەند دانەیەکیان لێ مابووەوە، ئێمەش بیستبوومان کە بابەتی باشی تێدایە، دەمانکڕی و دەمانخوێندەوە کە پڕ بوو لە باسی بیری نەتەوایەتی و سیاسی و مارکسیستی.

موتابەعەی گۆڤار و بڵاوکراوەکانی جەبهەی تەحریری فەلەستین و ڕێکخراوە چەپ و ماوییەکانی ئەو سەردەمەمان دەکرد، لەوانە: حەرەکەی فەتح و جەبهەی شەعبی. بەدوای ئەو کتێبانەدا دەگەڕاین کە دەربارەی بیروباوەڕی ماوی و مارکسیستی بوون، وەکوو: کتێبەکانی فرانس فانوون و جۆرج پۆلیتزەر و ماو تسیتۆنگ و مونیر شەفیق و نائیف حەواتمە و جۆرج حەبەش ...هتد. دەمانخوێندنەوە و موناقەشەمان دەکردن.

لە ڕێگەی نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد و ئازادی برایەوە ژمارە دوو و سێی گۆڤاری کۆمەڵەم بەدەست گەییشت کە ئۆرگانی کۆمەڵەی مارکسیی لێنینی کوردستان بوو. بیرمە یەکێک لەو ژمارانەی کۆمەڵەم لە ڕێگەی کاکە عەبەی کاریکاتێریست کە هاتوچۆی ماڵی نەوزادی دەکرد پێ گەییشت. هاوکات شەویکیان هەر لە ماڵی نەوزاد لەگەڵ کاکە عەبە هەتا درەنگانێک لەسەر کۆمەڵە موناقەشەی سیاسیمان کرد، دیارە دوای ئەوە ئەو چووە شاخ و لە مەڵبەندی چوار لە ڕاگەیاندن کاری کرد.

هەر لەو دەمانەدا بڵاوکراوەی ئەلشەرارە و هەندێک لە نووسراوەکانی تری یەکێتیی نیشتمانی کە بە زمانی عەرەبی دەردەچوون، پێ گەییشت.

ساڵی ١٩٨١ ناوم لە کۆلێجی پەروەردە لە زانکۆی سەلاحەدین دەرچوو. یەکەم ساڵی خوێندن ناوم لە بەشی ناوخۆیی خوێندکاران دەرنەچوو، بەدوای شوێنێکەوە بووم تیایدا بمێنمەوە. بەڕێکەوت هاوڕێیەکم بەناوی سەباح عەبدوڵا (سەباحە سوور)ەوە بینی، ئەو لە کۆلێجی زانستەکان بەشی کیمیا بوو، لە کاتی خۆیدا لە پۆلی چوارەمی ئامادەیی لە دواناوەندیی شۆڕیجە پێکەوە بووین. دوای چاکوچۆنی و هەواڵپرسی، داوای لێم کرد، بۆ ژوورەکەیان بچم. منیش چووم سەردانییانم کرد و وەزعی خۆمم بۆ ئەو برادەرانەی، لە ژوورەکە لەگەڵ ئەودا بوون، باس کرد. ئەوانیش وتیان ئەتوانی لای ئێمە بمێنیتەوە. هاوڕێیانی ئەو ژوورە جگە لە سەباح، ساڵح عەزیز (سالار ڕەشید)، حیکمەت حەکیم، عەلی مەحموود (عەلی سیاسی) بوون. ئیتر لەو ژوورە و لە ناوەڕاستی ئەو دوو قەرەوێڵە دووقاتییە و هەر لە عەرزەکە، لە جێگایەکی تەنگ و سەرەڕێ ساڵێکی پڕ لە یادەوەری و تایبەت بە کار و هەڵسووڕانی سیاسیم تەواو کرد .

هەر لەو ژوورە و لە ڕێگەی هاوڕێ "سالار"ەوە بۆ کۆمەڵە موفاتەحە کرام و بەناوی نهێنیی "کرێکار"ەوە کارم کرد، هەر زوو پرۆسەی پەیڤەکانی گەییشتن بە ئەندامێتیم بڕی و بووم بە ئەندام. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە هەم ئاشنایەتیم بە مارکسیزم و هەم ئاشنایەتیم بە کۆمەڵە و یەکێتی، پێشینەیەکی هەبوو.

ئیدی لەو ڕۆژەوە لەگەڵ هاوڕێ سالار و هاوڕێیانێکی دیکە کە من لێرەدا ئەوەندەی لەیادم مابن، باسیان دەکەم، کارمان لەسەر ڕێکخستنەوە و توندوتۆڵکردنەوەی ڕیزەکانی کۆمەڵە و یەکێتیی خوێندکاران کرد. تا ئەو ڕۆژەی کە من و هاوڕێ سالار و چەندانی تر بە هۆکاری فیکری و سیاسی، ڕیزەکانی ئەو دوو ڕێکخراوەمان بەجێ هێشت.

**کۆمەڵە و خوێندکاران**

بەو سیفەتەی کە خوێندکاری زانکۆ بووم، شانبەشانی کاری ڕێکخراوەیی لە ڕیزەکانی کۆمەڵە لە پۆلی شەهید بێستوون و کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن، لە ڕیزەکانی یەکێتیی خوێندکارانیش کارم کرد.

لەدوای ئەو حەملە فراوانەی کە بەر کۆمیتەی ئاگر کەوت، کۆمیتە و ڕیزەکانی ڕێکخستن لەبەریەک هەڵوەشابوونەوە و ژمارەیەکی زۆر لەو هاوڕێیانەی بەر ئەو شاڵاوە نەکەوتبوون لە ڕێکخستن پچڕابوونەوە. ئەوە بۆ ڕێکخستنەکانی خوێندکارانیش هەر وا بوو. بۆیە دەستمان دایە دروستکردنەوەی شانە و بەستنەوەی ڕیزەکانی ڕێکخستن.

لە ڕێکخراوی یەکێتیی خوێندکاران سەرەنجام بوومە بەرپرسی کۆمیتەی لقی کەرکووک و لە ڕیزەکانی کۆمەڵەش بەرپرسی پۆلێکی فراوانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بووم. بەو هۆیەشەوە بەشداریم لە ڕێکخستنەوە و لێک هەڵپێکانەوەی چەندین شانە و پەیوەندیی پچڕاوی کۆمەڵەدا کرد.

ڕێکخستنەوەی ڕیزەکان لە کۆمەڵەدا بە پێی گەڕەک و پۆست و کۆن و نوێیی نەبوو. من خۆم لە گەڕەکی حوڕییە دادەنیشتم و لە هەولێریش دەمخوێند، بەڵام جگە لە حوڕییە و شۆڕیجە، لەگەڵ هاوڕێیانێک لە ڕەحیماوا و حەمام عەلی و ئازادی و ئیسکان ...هتد. شانە و هێڵەکانی ڕێکخستنمان ساز دایەوە.

لە گەڕەکی ڕەحیماوا پەیوەندیم بۆ بەهرۆز خالید (هەوراز شوانی) دروست کردەوە کە ژمارەیەک هاوڕێی پێوە بوو، هەندێکیان لە دواناوەندیی زێوەر بوون. لە

گەڕەکی حەمام عەلی پەیوەندیم بۆ ئیسماعیل مەحموود (سمکۆ شوانی) دروست کردەوە کە ئەو کات ناوە نهێنییەکەی کاروان بوو. کادرێکی چالاک بوو، پەیوەندییەکی فراوانی هەبوو، ژمارەیەکی زۆر هاوڕێی پێوە بوو، چ وەک خوێندکاران لە دواناوەندیی سەورە و چ وەک کۆمەڵە لەناو شار و لە دەرەوەی شار. هاوڕێ ئیسماعیل ئەندامی کۆنفرانسی سێی خوێندکاران بوو، دواتر بە سکرتێری ئەو ڕێکخراوە هەڵبژێردرا.

لە شۆڕیجە غازی عاسی و لە حەی عەسکەری نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد و عەزەدینی برای کە بە ئاوات ناسراوە، لە حوڕییە هاوڕێیەکی سەرباز بە پلەی نائیب زابت بەناوی مستەفا عومەر، لە دواناوەندیی سەورە وەحدەدینی برام کە ئەویش ژمارەیەک هاوڕێی بە دەورەوە بوو، پەیوەندییان بە منەوە هەبوو. ئەوەی شایانی باسە، وەحدەدین ئەندامی کۆنفرانسی سێی یەکێتیی خوێندکاران بوو لە خەتێ. بەداخەوە لە شەڕی نەگریسی ئێران و عێراق لە ساڵی ١٩٨٦ بێسەروشوێن بوو.

وەحدەدین (توانا) پێش ئەوەی پەیوەندی بە منەوە هەبێت، لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٨٢ لەگەڵ چوار هاوڕێی خۆی بە ناوەکانی: عەلی بەکر، گۆران، یاسین و کەسێکی دیکە بەهۆی چالاکییەکەوە دەگیرێن. ئەمانە خەتێکی ڕێکخستنی کۆمەڵە دەبن و پەیوەندییان بە کەرتی شەهید سیروانەوە دەبێت. ئەم هاوڕێیانە نامەی هەڕەشە بۆ مامۆستایەک یان ئەگەر هەڵە نەبم مەسئوول حیزبییەکی بەعس لە گەڕەکی ئازادی فڕێ ئەدەن. لە هەمان کاتدا بەیاننامە یان نووسراوێک بڵاو دەکەنەوە کە هەر بە دەست نووسیبوویانەوە. پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە، ئەو خەتەی کە نامەکەی پێ نووسراوەتەوە، هەمان ئەو خەتەیە کە بەیاننامەکەی پێ نووسراوە. بە هۆی ئەوەی نامەکە ئاراستەی مامۆستایەکی دواناوەندیی سەورە کراوە، گومانی ئەوە دەکەن کە ئەو کارە لەنێو خوێندکارانی ئەو قوتابخانەیەدا تێ ناپەڕێت. بۆیە داوا لە خوێندکاران دەکرێت لەسەر بابەتێک ئینشایەکی کورت بنووسن، بەو شێوەیە خەتی یەک بەیەکی قوتابییەکان لەگەڵ خەتی ئەو نامە و نووسینانە بەراورد دەکەن و دەتوانن خاوەنی خەتەکە بدۆزنەوە. ئەو کەسە دەگرن

و لەژێر ئەشکەنجە و لێکۆڵینەوەدا ناوی هاوڕێکانی ئاشکرا دەکات و بەو شێوەیە هەموو ئەندامانی ئەو شانەیە دەگیرێن.

وەحدەدین بە بیست ساڵ و شەش مانگ، یاسین و گۆران و عەلی بە دە تا پانزە ساڵ حوکم دەدرێن و ڕەوانەی زیندانی ئەبووغرێب دەکرێن. دواتر لە کۆتایی هەمان ساڵدا بە بڕیارێکی عەفوو ئازاد دەکرێن. پاش ئازادبوونی وەحدەدین لە زیندان، دووبارە خۆم پەیوەندیم لەگەڵ ڕێکخستن بۆ دروست کردەوە.

جگە لەو پەیوەندییانە دەبێت ئاماژە بە چەند هاوڕێیەکی دیکە بکەم کە لە پەیوەندیی بەردەوامدا بووین و نووسراو و بڵاوکراوەمان دەگۆڕییەوە. لە گورگەیی سەرخاسە پەیوەندییەکی توندم لەگەڵ شەهید ئەیووب حەمەڕەشید هەبوو، هەمیشە سەردانم دەکرد و نووسراوەکانم بۆی دەبرد، یان ئەگەر ئەو نووسراوێکی دەست بکەوتایە، بۆمی دەهێنا بۆ شار.

هەروەها ئەکبەر ئەحمەد ناسراو بە ئەکبەری ئەحەخانە کە ئەویش دانیشتووی گورگەیی بوو کە بەداخەوە لە پرۆسەی ئەنفال لە چەمچەماڵ بەردەستی ڕژێم دەکەوێ و ئەنفال دەکرێت. ئەکبەر لە هێنانوبردنی نووسراوەکاندا هاوکاری زۆری پێ دەکردین. لە شۆڕیجەش لەگەڵ هەندێک هاوڕێ پەیوەندیم هەبوو، پێکەوە باسی مارکسیزم و کۆمەڵەمان دەکرد کە بەداخەوە ئەوانیش هەر بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن، ئەوانەش سەرکەوت ئەمین، پێشکەوت کە خزمی سەرکەوت بوو.

لە زانکۆش هاوڕێ خۆشناو جەمال کە خەڵکی سلێمانی بوو، لە ڕێگەی منەوە هاتە نێو کۆمەڵەوە. هاوڕێیانێکی دیکە کە لە ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی دەوری خۆمان بوون، لەوانە حەمەزەکی شاعیر (کە بەداخەوە لەژیاندا نەماوە)، سەلام سدیق لە هەندەسە، هاوڕێیانی بەشی ناوخۆیی ژوورەکەم (زانا جەلال، هیوا ئیسماعیل، سەردار عەبدوڵا) کە لە قسەوباس و موناقەشە و بڵاوکردنەوەی بەیان و نووسراوەکان و زۆرێک لە چالاکییەکانی نێو زانکۆ لە هەولێر لەگەڵماندا بوون.

**هەواڵی کوژرانی هاوڕێ سەردار ماوەتی**

ئەو ساڵەی لە بەشی ناوخۆیی قادر بلە لەگەڵ هاوڕێیان: سالار، سەباح، حیکمەت، عەلی مامەوە، ساڵێکی پڕکار و یادەوەریی تاڵ و شیرینە. ڕێکەوتی ساڵیادی بۆردوومانی شاری قەڵادزێ بوو کە خۆپیشاندانەکانی زانکۆی بەخۆوە گرت. من لەسەر ئەو ڕووداوە هیچ یاداشت ناکەم، چونکە دەزانم هاوڕێم سالار ڕەشید بەوردی دەچێتە سەر ئەو ڕووداوانە. ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە، ئەو ساڵە ئەو ژوورە بچووکە و ژوورەکەی تەنیشتمان کە ئەم هاوڕێیانەی تێدا بوو: عوسمان غەریب، سەرداری ماوەت، لوقمان سدیق، یاسین حوسێن، مەڵبەندی کۆبوونەوەی هەموو ڕۆژەمان و ژووری عەمەلیاتی ئەو چەند ڕۆژەی خۆپیشاندانەکان بوو. لەوێ تەنانەت شەڕی ئێمە و لیژنەکانی ئەمن و بەعسی سەر بەو بەشە ناوخۆییە ئاشکرا و ڕووبەڕوو بوو. نووسراو و بڵاوکراوە و بەیاننامەکان لەو بەشە ناوخۆییەوە بۆ دەرەوە دەبران و بڵاو دەکرانەوە.

ئێوارەیەکی ڕۆژی پێنجشەمە بوو، زۆربەی هاوڕێکانمان گەڕابوونەوە بۆ کەرکووک و سلێمانی، من هەر لە بەشی ناوخۆیی بووم و نەگەڕابوومەوە، هاوڕێ سەرداریش نەگەڕابووەوە. سەردار لە قۆناغی سێیەم لە کۆلێجی زانستەکان بەشی جیۆلۆجی بوو. من بۆ ئێوارەکەی ساوەرێکی سوورم ئامادە کردبوو، لە دەرگای ژوورەکەی هاوڕێ سەردارم دا و پێم گوت کە خواردنم ئامادە کردووە و بێتە لای من و پێکەوە نانێک بخۆین. زۆری پێ خۆش بوو، بەڵام وتی، کارێکی بەپەلەم هەیە، دەچمە دەرەوە، نیو سەعاتێکم پێ دەچێت، ئینجا دێمەوە پێکەوە نان دەخۆین.

سەردار ئیزنی لە من خواست و چووە دەرەوە و منیش هەر چاوەڕێ بووم. نزیکەی دە خولەک یان چارەگێکی پێ چوو، گوێم لە دەنگی چەند تەقەیەک بوو، تەقەکان بە دەنگی تەقەی دەمانچە و کلاشینکۆفی دەکرد. سەردار هەر نەهاتەوە و منیش تەواو کەوتمە دڵەڕاوکێوە! دوای ماوەیەک خەبەر هات، کەسێک لەو نزیکانە لە ئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ تیمێکی جەیشی شەعبی کوژراوە. هاوڕێ سەردار بەوە دەچوو، دەمانچەی پێ بووبێ، لە کاتی شیعارنووسین دەکەوێتە کەمینی جەیش شەعبییەکانەوە و تەقەی لێ دەکەن، ئەویش دەست بە تەقە دەکات و

سەرەنجام هاوڕێ سەردار پێوە دەبێت. دوای دوو ڕۆژ تەرمەکەی لە توب عەدلی بە خۆپیشاندان و کۆبوونەوەی خوێندکاران بەزۆر وەردەگیرێتەوە. خوێندکاران بە چەندین کۆستەر کە خۆم یەکێک بووم لەو کەسانە، لەگەڵ تەرمەکەی بەرەو ماوەت بەڕێ کەوتین. لەوێش بە سروودی ڕێی خەباتمان چەندە سەخت و دوور بێت ... لە مەراسیمێکی گەورەدا بە خاکمان سپارد .

**کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە و خوێندکاران**

ساڵی ١٩٨٤ ڕێکەوتی دوو ڕووداوی سیاسیی گرنگ بوو بۆ من. کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە لە هاوینی ئەو ساڵە لە مێرگەپان بەڕێوە چوو، کە دەکاتە نزیکەی دوو ساڵ دوای پەیوەندیم بە کۆمەڵەوە، ئەو کاتانە بە هۆی باسەکانی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ کە لە ڕێگەی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی ئێران و حیزبی کۆمۆنیستی ئێران هاتبوونە ناو گرووپ و ڕێکخراوە چەپەکانی کوردستانی عێراقەوە، پێ بەپێ لە بیروباوەڕی ناسیۆنالیستیی کۆمەڵە دوور دەکەوتمەوە. بەر لە کۆنفرانس من نامەی وازهێنانی خۆم لە کۆمەڵە دابووە دەست هاوڕێ سالار، بەڵام نەمدەزانی بۆ وەڵامەکەی بۆ نەدەناردمەوە. ڕۆژێک هاوڕێ سالار پێی ڕاگەیاندم کە کۆمەڵە کۆنفرانسی سێ دەبەستێت و منیشی وەک ئەندامێکی کۆنفرانس دیاری کردبوو. منیش پێم ڕاگەیاند کە شتی وا چۆن دەبێت، من نامەی وازهێنانم نووسیوە؟! وتی بە مەبەستەوە وەڵامی نامەکەت نەدراوەتەوە، تا بتوانیت بەشداری لەو کۆنفرانسەدا بکەیت. هەروەها وتی کە ئەویش وەک من بەو بڕیارە گەیشتووە. ئەوەشی وت کە ئێمە تەنها نین، بەڵکە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامان و کادرانی کۆمەڵە لە کەرکووک بەو بڕیارە گەیشتووین و ئەو ئیستیقالەیە جەماعی دەبێت، تەنها چاوەڕێی تەواوبوونی کۆنفرانسین. ئەوەشی درکاند، ئومێد بە ئاڵوگۆڕ لەنێو کۆمەڵە لە کۆنفرانس زۆر زەحمەتە، بەڵام تەنها هەوڵێکە کە مابێت .

من بێئومێد بووم بە خودی کومەڵە، بەڵام داواکەی هاوڕێ سالارم قبوول کرد و حەزیشم دەکرد بزانم ئەو گردبوونەوە سیاسییە بەچی کۆتایی دێت.

له کەرکووکەوە لەگەڵ هاوڕێ سالار بەرەو سووورداش بەڕێ کەوتین. لەوێش هەندێ لاندگرۆز هاتن و سوار بووین و بەنێو بازگەی ڕژێم بەرەو مێرگەپان چووین. لە بازگەی ڕژێم وتیان: سەرتان داخەن، با جەماعەتی سەیتەرەکە نەتانبینن! ئێمەش قیناعمان بەسەرەوە بوو، بۆ ئەوەی یەکتر نەناسینەوە. گەییشتینە جێ، چادرەکەی من و سالار پێکەوە بوو، بەڵام دیار بوو ئەو جگە لە من، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تر چادری هاوبەشی هەبوو.

ڕووداوەکانی کۆنفرانس و کێشەکانی هەردوو باڵی نەوشیروان و مەلا بەختیار (ئالای شۆڕش) بەم کورتە یاداشتە تێر ناکرێت، بۆیە ناچمە نێو ئەو بابەتەوە. تەنها ئەوەندە دەڵێم کە ڕووداوەکانی نێو کۆنفرانس ئەوەندەی تر باوەڕمی بە وازهێنان لێ تۆختر کرد. لە کۆنفرانس کۆمەڵێک کەسایەتیی سەرکردایەتیی ئەو سەردەمەی کۆمەڵە و یەکێتی و ڕێکخراوە ئێرانییەکانم بینی: مام جەلال، قاسملو، سەید برایمی عەلی زادە ...هتد. هەروەها کۆمەڵێک هاوڕێی گەڕەک و قوتابخانەم بینی کە ئەندامی کۆنفرانس یان پێشمەرگە بوون و لە گرووپی تەداروکاتی کۆنفرانس یان لە بەشی پارێزگاریی کۆنفرانسدا بوون.لە کۆتایی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٤دا بوو، کۆنفرانسی سێیەمی یەکێتی خوێندکارانمان ئەنجام دا. کۆنفرانس بە بەشداری زیاتر لە پانزە ئەندام دەستی پێ کرد. من لە ژمارە و ناوی ئەندامانی بەشدار بوو ڕەنگە زۆر ورد نەبم، هاوڕێم سالار ڕەشید ڕەنگە وردەکاری زیاتری لەو بارەوە لە بەردەستدا بێت، بەڵام ئەوانەی کە ناوەکانیانم لەبیر ماوە، بریتیبوون لە: سالار ڕەشید، ئیسماعیل مەحموود، عیسام نامیق، هەژار تەها، فازڵ عوسمان، وەحدەدین مەجید، ئەحمەد مەحموود، جەزا، ئەبووزێد، عیدۆ (شوان)، ئاسۆ، ڕەئووف ...هتد.

کۆنفرانس لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی لە گوندی خەتێی سەر بە دۆڵی ئالانە بەسترا. ئەو گوندە لە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا بوو. بەڵام دەگوترا کە مەفرەزەکانی پارتی جار جار بە جەولە بەو ناوانەدا تێ دەپەڕن. بۆیە بۆ ئێمەیەک کە هەموو کادری کۆمەڵە و هەڵسووڕاوی خوێندکاران بووین، بەستنی کۆنفرانس لە شوێنێکی وادا بڕێک مەترسیدار بوو، بۆیە شەوان بە نۆرە حەرەسیاتمان دەگرت.

بەر لە کۆنفرانس ئێمە، هاوڕێیانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی، واتە: عەزەدین مەجید، سالار ڕەشید، دکتۆر عیسام نامیق ... بۆ ئامادەکاریی کۆنفرانس چەند جارێک سەردانی بارەگای سکرتاریەتی یەکێتیی خوێندکارانمان لە بالیسان کرد، کە پێک هاتبوو لە هاوڕێیان: ئەبووزێد، ئاوات، شوان. لەو کۆبوونەوانەدا قسەمان لەسەر چۆنیەتی ئامادەکاری بۆ کۆنفرانس کرد، وەکوو: دیاریکردنی شوێنی کۆنفرانس و ئامادەکاری بۆ هێنانی هاوڕێیانی شار و ئامادەکردنی زاد و زەخیرەی ئەو چەند ڕۆژەی کۆنفرانس، تا دەگات بە ئامادەکاریی سیاسی بۆ کۆنفرانس لەوانە: پێداچوونەوە بە پەیڕە و پرۆگرامی یەکێتیی خوێندکاران و گۆڕینی چەندین خاڵ کە لەگەڵ گەشە و شێوەی ڕێکخستنی خوێندکاراندا نەدەهاتنەوە و لەباری ڕێکخراوەییەوە ئاستەنگیان بۆ ڕێکخراوەکە پێک دەهێنا. دێتەوە بیرم تەنانەت لە ناساندنی ئەندام و مەرجەکانی ئەندامبوون، موناقەشەیەکی زۆرمان کرد. پێڕەوی ناوخۆ زیاتر لە پێڕەوی ناوخۆی ڕێکخراوێکی سیاسی دەچوو و لە مەسەلەی ئەندامەتیدا ئاستەنگی زۆری تێدا بوو، ئێمە هەوڵمان دا زیاتر لەگەڵ شکڵ و شێوەی ڕێکخراوێکی جەماوەریدا بیگونجێنین. تەنانەت ئامانجی سیاسیی ڕێکخراوەکە کە لە بەرنامەدا هاتبوو، زیاتر بە هیی ڕێکخراوێکی سیاسی دەکرد وەک لە ڕێکخراوێکی پیشەیی! ئێمە هەوڵمان دا برێک دابڕان لە نێوان شێوەی ڕێکخراوێکی پیشەیی لەگەڵ ڕێکخراوێکی سیاسیدا بکەین.

لەڕاستیدا بەستنی کۆنفرانسی ڕێکخراوێک لە ناوچەیەکی ئازادکراو کە ئەندامانی کۆنفرانس لە شارەکانەوە بۆی بێن، کارێکی سەخت و پڕ لە مەترسی بوو. دێتەوە بیرم، بردنی ئەو هاوڕێیانە بە بازگەکانی ڕژێم و گەڕانەوەیان بۆ شارەکان، هەتا بڵێی قورس بوو، نەتدەتوانی بەهانەیەکی وا بدۆزیتەوە تا لە چوون و گەڕانەوەدا ئەوانی پێ قانع بکەیت. ئەو کارە لە ئەستۆی ئێمە، ئەندامانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیدا بوو، بۆیە زەحمەتی زۆرمان دەهاتە بەردەم.

**سوێد**

**٢٠٢٠/٣/٦**

# ئاوات ناسیح حەبیب (ئارام)[257]
## (یاداشت)

### ئاشنایەتی و پەیوەستبوونم بە کۆمەڵەوە

من لە ساڵی ١٩٧٩ لە ڕێگای مامۆستا مارفەوە بەرە بەرە بە یەکێتیی نیشتمانی و کۆمەڵە ئاشنا بووم. لە سەرەتادا من هیچ ئاشنایەتی و دۆستایەتییەکم لەگەڵ مامۆستا مارفدا نەبوو، ئەو بە بۆنەی مامۆستا "جومعە فاتیح"ی ئامۆزامەوە هاتوچۆیماڵمانی دەکرد. مامۆستا مارف و مامۆستا جومعە لە دێی چۆڵمەک و ژاڵەی ناوچەی هەمەوەند مامۆستا بوون و پەیوەندیی ڕێکخستنیان بە مامۆستا "نووری حەمە عەلی"یەوە هەبوو. مامۆستا نووری کادری ڕێکخستنی ناوچەی جەباری و هەمەوەند بوو .

بەم جۆرە مامۆستا مارف بۆ ماڵمان دەهات و لەگەڵ باوکم پێکەوە گفتوگۆی سیاسییان دەکرد. مارف لایەنگری یەکێتی و باوکم لایەنگری پارتی بوو. منیش زۆر

---

٢٥٧. ئاوات ناسیح حەبیب لەدوای وازهێنانی لە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بێلایەن مایەوە، تا لە ساڵی ١٩٨٧ لەگەڵ سالار ڕەشید و کەسانێکی تر "کۆمەڵەی تێکۆشەرانی کۆمۆنیست"یان دامەزراند. دوای ئەوە "یەکێتی خەباتی کۆمۆنیزمی کرێکاری". لە ساڵی١٩٩٣ یەکێک بووە لە ١٠ کەسی دامەزرێنەری حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق و لە ساڵی ١٩٩٧ بووە بە سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی حیزب، لە ساڵی ١٩٩٨ لە کۆنگرەی دووەمی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی ئێران بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی ئەو حیزبە. لە ساڵی ٢٠٠٥ لەگەڵ زۆرینەی کۆمیتەی ناوەندیی حککا لەو حیزبە جیابوونەوە و حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی حیکمەتیستیان دامەزراند. لە ساڵی ٢٠٠٨ یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی کوردستان.

بە تامەزرۆییەوە گوێم لە گفتوگۆکانیان دەگرت. باوکم پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە یەکێتی، جەلالیە و جەلالییەکانیش لە ساڵی ١٩٦٦ جاش بوون و خراپەکاری نەما نەیکەن، هەرگیز نابێ باوەڕ بە جەلال تاڵەبانی بکرێت، ئەو دەسیسەی حوکمەتە و ڕاسپێردراوە بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵک و دژایەتیکردنی پارتی و بارزانی. مامۆستا مارفیش باسی ئەوەی دەکرد، ئەم شۆڕشە نوێیە پشتی بە جەماوەری گەلەکەی خۆی بەستووە و پاشکۆی هیچ دەوڵەتێک نییە و ڕابەرایەتییەکەی جەماعییە و تاکەکەس (واتە: مام جەلال) بڕیار نادات .

لەو دەرفەتانەدا مارف لەگەڵ من قسەی دەکرد و ئەدەبیاتی بۆم دەهێنا. یەکێک لەوانە، نووسراوی "یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆچی؟" بوو .

ئیتر تا ماوەیەکی زۆر هەر وا مامەوە و جگە لە خوێندنەوەی ئەو نووسراوانە، لەگەڵ مامۆستا جومعە و مامۆستا مارف قسەوباسیشمان دەکرد. ی‌ەڵام چونکە هەموو بنەماڵەکەمان لایەنگری پارتی و مەلا مستەفا بوون بە تایبەت باوکم، فەزای بنەماڵە کاریگەری بەسەر منیشەوە هەبوو، بۆیە ماوەیەکی پێ چوو، هەتا من وەکوو لایەنگری کۆمەڵە و یەکێتی یەکلا بوومەوە. لەڕاستیدا مارف تۆڕی بۆ باوکم هەڵدابوو، چونکە لە ڕابردوودا هەڵسووڕاوێکی سیاسی بوو، بەڵام من بە تۆڕەکەیەوە بووم. ئەو کاتە من هەرزەکارێکی ١٦-١٧ ساڵان دەبووم .

دوای ماوەیەک مامۆستا مارف منی بۆ ئەندامەتی کۆمەڵە دەعوەت کرد و وتی، ماوەیەکە ئێمە تۆمان وەکوو پاڵێوراو تەماشا کردووە، منیش بە خۆشحاڵییەوە قبووڵم کرد.

پاش ماوەیەک کرام بە بەرپرسی شانەیەک کە پێک هاتبوو لە مامۆستا جومعە و ئەحمەدە سوور (کە بە ئەحە سوور دەناسرا و کەسێکی زۆر تێکۆشەر و میهرەبان و خۆشەویست بوو، دواتر بوو بە پێشمەرگە و بەداخەوە لە شەڕێکدا گیانی سپارد) و جەژنی بیلال و کەسێکی تر کە هاوڕێی جەژنی و ناوی محەمەد بوو .

ئیتر لەو کاتەوە وەکوو بەرپرسی شانە، بووم بە ئەندامی لیژنەی پۆلێک، کە لە مامۆستا مارف و سەلاح حەسەن پاڵەوان و من پێک هاتبوو.

**هەوڵی کوشتنی مامۆستا قاسم**

دەمانچەیەکی چواردەخۆر و نارنجۆکێکیان بۆ سەلاح حەسەن پاڵەوان و من نارد، بۆ ئەوەی مامۆستایەکی بەعسی چەپەڵ هەبوو لە شۆڕیجە بیکوژین. بەڵام کەسمان هیچ شارەزاییەکمان نە لە کاری سەربازیدا هەبوو، نە لە بەکارهێنانی دەمانچە و نارنجۆک. ئەو کەسەی کە دەبوو بیکوژین، لام وابێت ناوی مامۆستا قاسم بوو، ماڵەکەیان لەناو بازاڕە قەرەباڵغەکەی شۆڕیجەدا بوو. پلانەکەمان وابوو، یەکێکمان لە دەرگای ماڵی مامۆستا قاسم بدات و بانگی بکاتە دەرەوە، لەو کاتەشدا ئەوی ترمان بە دەمانچە لێی بدات و بیکوژێ. من لەو کاتەدا زۆر دوودڵ و ڕاڕا بووم، بیرم لەوە دەکردەوە پاش چەند خولەکێکی تر منداڵەکانی ئەو مامۆستایە بەسەر لاشەی باوکیانەوە شیوەن دەکەن. سەرباری هەموو چەپەڵکارییەکانی ئەو مامۆستایە، کاتێک ئەو دیمەنەم ئەهێنایە پێشچاوی خۆم، لە ئاست کوشتنی مرۆڤێک دەستم دەلەرزی. بێگومان نەشم دەوێرا ئەم هەستەی خۆم بۆ سەلاح دەربڕم، چونکە وەکوو خاڵی لاواز و دوودڵیم لە خەبات و "بڕیاری شۆڕش" لێک دەدرایەوە. شۆڕشێک کە ئەگەر تۆزقاڵێک بایەخی بۆ ژیانی ئێمە دابنایە، نەدەبوو ئەو کارەمان پێ بسپێرێت. لەڕاستیدا لە ترسی ئەوەی بە ترسنۆک لە قەڵەم نەدرێین، ملمان نابووە بەر ئەو کارە. کە لە دەرگامان دا، باش بوو مامۆستا قاسم لە ماڵ نەبوو. بەو جۆرە ئەو کارەمان لە کۆڵ بووەوە. هیچ گومانێکم نییە، ئەگەر بهاتبایە و لە ماڵ بووایە و بمانتوانیبایە بیشیکوژین، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەگیراین و هەر لەناو ئەو بازاڕە گولەباران دەکراین، چونکە هیچ پلانێکمان نەبوو بۆ ئەوەی دوای کوشتنی، چۆن خۆمان دەرباز بکەین.

بەڵام لە ترسی ئەوەی سەرزەنشت نەکرێین، هەر دەبوو چالاکییەک ئەنجام بدەین. پێکەوە بە دەمانچەیەک و نارنجۆکێکەوە کەوتینە ناو بازاڕی شۆڕیجە، کات دەوری ٩ی شەوی ١٤/١٣ تەمووزی ساڵی ١٩٨١ بوو، مەیدانەکەی شۆڕیجە لە پیاوانی ڕژێم جمەی دەهات کە خەریکی هەڵواسینی وێنەی "سەرۆک" و لافیتە و ڕازاندنەوەی شەقامەکان بوون بۆ پێشوازی لە بۆنەکانی ١٤و ١٧ی تەمووز. ئێمە لە کاتێکدا کە ترسی ئەوەمان لێ نیشتبوو، بمانپشکنن و بەو نارنجۆک و دەمانچەیەوە بمانگرن، لە هەمان کاتدا بیریشمان لەوە دەکردەوە کە نارنجۆکەکە بەواندا

بتەقێنینەوە. زۆر نەشارەزا و ناشی بووین. لەو کاتەدا هاتە بیرم و وتم، مالّی هاورێیەکمان (ئەحمەدە سوور) لەو نزیکانەیە، ئەو تەمەنی سەرووی ٣٠ ساڵە و پێشمەرگایەتی کردبوو، لەگەڵ سەلاح ڕێکەوتین کە ئەو بانگ بکەین، تا هاوکاریمان بکات. چووین لە دەرگای مالّی ئەحمەدمان دا و لەگەڵمان هاتە دەرەوە و حاڵ و مەسەلەمان تێگەیاند. پاشان لەسەر ئەوە بڕاینەوە کە نارنجۆکەکە بخەینە مەقەڕی جەیش شەعبییەکەی شۆڕیجەوە کە لەو کاتەدا جمەی دەهات لە ئەمن و بەرپرسانی حیزبی. ئەحمەد دەمانچەکەی لە سەلاح و نارنجۆکەکەی لە من وەرگرت و وتی، من دەیکەم. چووین لە پشتی مەقەڕەکەوە، واتە لە بەردەم فیتەرەکانی بەرامبەر قوتابخانەی سەلاحەدینەوە، ئەحمەد نارنجۆکەکەی فڕێ دا و لە بەردەرگای مەقەڕەکە کەوتە خوارەوە و نالّەیەکی یەکجار گەورەی کرد و یەک دوو ئەمنی بریندار کردبوو. پاشان ئەحمەد بەرەو ئیسکان هەڵهات و من و سەلاحیش پێکەوە بە پێش قوتابخانەی سەلاحەدیندا هەڵهاتین و لەپشتەوە گەڕاینەوە بۆ کۆلانەکەی ئێمە کە دەکەوتە نزیکی مەعدەنەکانی شۆڕیجە و کۆلانی پشتی حەمامەکە و بە چەند خولەکێک گەیشتینە مالّی ئێمە. ئینجا لەوێوە سەلاح بەرەو مالّی خۆیان ڕۆیشت و منیش خۆم تێکەڵ ئەو حەشاماتە کرد کە بەرەو شوێنی تەقینەوەکە دەچوون.

### تێداچوونی دەمانچەکەم، بەر لەوەی تەقەی پێ بکەم

لەو ماوەیەدا کە سەلاح و من وەکوو دوو بەرپرسی شانە و ئەندامی پۆل پێکەوە کارمان دەکرد، من لە ئامادەیی ئەبووئەیووبی ئەنساری بە شەوان دەمخوێند و بە ڕۆژ کارم دەکرد. ئەو کات هیچ بایەخێکمان بە خوێندن نەئەدا، خوێندن بۆ ئێمە تەنها هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی بانگ نەکرێین بۆ سەربازی. بیریشمان لەوە ناکردەوە، پاش تەواوکردنی خوێندن لەسەر بناغەی بڕوانامەکەمان لەسەر کارێک دابمەزرێین. بۆ هەمووان قۆناغی دوای تەواوکردنی خوێندن پێشمەرگایەتی بوو. لەو کاتەدا من وەستای کۆنکرێت بووم، خۆمان هەم تەختەبەست و هەم حەدادی و هەم سەبمان دەکرد. ماوەیەک کارم باش بوو، بە تایبەتی بە هۆی شەڕی عێراق-ئێران و مەترسی بۆمبارانەوە، دەوڵەت ٢٠٠٠ دیناری بۆ دروستکردنی پەناگە دەدا.

لای بەلێندەرێک بەناوی نیزام کارم دەکرد و بەزۆری خەریکی دروستکردنی پەناگەی کۆنکریتی بووین، ئەوەندە کارمان زۆر بوو، فریا نەدەکەوتین. بۆیە وەزعی مالیم باش بوو، یارمەتی زۆری ڕێکخستن و کۆمەڵەم دەدا. لەو کاتەدا بە ئاگاداریی سەلاح، دەمانچەیەکی لامەی شۆڕشم بە ٥٠٠ دینار کڕی. پێکەوە لەگەڵ سەلاح چووین دەمانچەکەمان هێنایەوە. ئەو بڕە پارەیە بۆ ئەو کات زۆر بوو. دەمانچەکە زۆر تازە و جوان بوو، وەکوو ڕەشمار بریقەی دەهات و لە دەستەسڕێکی سوور پێچرابوو. دوو سێ ڕۆژێک لەلام بوو، لە خۆشیدا کە دەچوومە دەرەوە دەمکرد بە پشتێنی پانتۆڵەکەمدا و کراسەکەم دەدا بەسەریدا. دوو سێ ڕۆژ دوای کڕینی دەمانچەکە، سەلاح هات بۆ لام و وتی، ئەو شانەیەی لای من لە شاری دووزخورماتوو، پلانیان داناوە کە سەرەک جاشێک بکوژن، بۆ ئەو کارە پێویستیان بە دەمانچەکەی تۆیە، بەڵکوو بۆ چەند ڕۆژێک بماندەیتێ! منیش دەمانچەکەم پێی دا. دوای دوو ڕۆژ سەلاح هاتەوە بۆ لام و وتی، ئەزانی جەماعەت بە دەمانچەکەوە گیراون! باش بوو توانیویانە لە دەست ئەمن هەڵبێن، بەلام دەمانچەکە کەوتووەتە دەست ڕژێم! واتە لەو ماراسۆنەدا هەموویان دەرچوون، تەنها دەمانچەکەی من تێدا چوو!

**ناسینی محەمەد و دامەزراندنی کەرتی شەهید سیروان**

دوای ماوەیەک کار و هەڵسووڕان و پەرەپێدانی کاری ڕێکخستن، مامۆستا مارف پێی ڕاگەیاندم کە کاندید کراوم بۆ بەرپرسی پۆل. ئیتر لەو کاتەوە من بووم بە بەرپرسی پۆلێک، پێک هاتبوو لەو شانەیەی کە خۆم بەرپرسی بووم، لەگەڵ ئەو شانەیەی کە سەلاح حەسەن پاڵەوان بەرپرسی بوو.

کە بووم بە بەرپرسی پۆل، مارف، "محەمەد ئەحمەد ڕەحمان"ی پێ ناساندم کە پێم وابێت، لە ساڵی ١٩٨١دا بوو. ئیتر محەمەد و مارف و من "کەرتی شەهید سیروان"مان دامەزراند و مارف بەرپرسی کەرتەکەمان بوو. بەلام لە ڕووی عەمەلییەوە، ئەو تەنها کەناڵی پەیوەندیمان بوو لەگەڵ بەرپرسی سیاسیی ناوچەی جەباری و هەمەوەند و ئەوانیش بە سەرکردایەتییەوە. ئیتر تێکڕای کاروباری

ڕێکخراوەیی کەرتەکە محەمەد و من ڕامان دەپەڕاند. تەنانەت جگە لە دیداری سەرپێیی و هێنان و بردنی هەواڵێک، لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی کەرتیش بەشداری نەدەکرد. بەڵام لەڕاستیدا یەکترناسینی من لەگەڵ محەمەد، دەستپێکی قۆناغێکی تازە بوو لە کاری فکری و سیاسی. محەمەد پێنج ساڵێک لە من گەورەتر بوو، کاتێک من لە ئامادەیی بووم، ئەو لە زانکۆی تەکنەلۆجی بەغدا لە قۆناغی سێیەمدا بوو. ئەو لە کاری سیاسیدا لە من خاراوتر و بەئەزموونتر بوو. زۆر بەخێرایی لەگەڵ محەمەددا بووین بە هاوڕێی گیانی بەگیانی. هەموو کۆتایی هەفتەیەک دەگەڕایەوە، هەر لەو ساتەوە کە دەگەیشتەوە کەرکووک، تا کاتی ڕۆیشتنەوەی سەعاتێکمان بە قەرز نەئەدا. تەواوی ئەو کاتانەی کە پێکەوە بووین، باسی فکری و سیاسی و ڕێکخراوەییمان دەکرد.

ئێمە کە کۆمیتەی کەرت بووین، لە نەبوونی هیچ ڕێنماییەکدا تەنها بە دەرک و لێکدانەوەی خۆمان کارمان دەکرد. چەند جار لە بۆنەکانی وەکوو نەورۆزدا، هەر محەمەد و من بە ناوی کۆمیتەی ناوەندیی یەکێتییەوە بەیانمان دەنووسی و بە ڕۆنیۆی دەستکردی خۆمان چاپمان دەکرد و بڵاومان دەکردەوە. خۆمان کە بەرپرسی ڕێکخستنێکی فراوان بووین، بەشی زۆری بەیانەکانمان بڵاو دەکردەوە. تا جارێک بەڕای خۆمان بە شانازییەوە لە ڕاپۆرتەکەماندا باسی ئەوەمان کردبوو، بە ناوی کۆمیتەی ناوەندیی یەکێتییەوە بەیانمان بڵاو کردووەتەوە، کەچی بە توندی ڕەخنەمان لەسەر ئەوە لێ گیرا، یەکەم: یەکێتی کۆمیتەی ناوەندی نییە و کۆمیتەی سەرکردایەتی هەیە، دووەم: ئێمە چۆن مافی ئەوەمان بە خۆمان داوە، بە ناوی ڕابەرایەتیی یەکێتییەوە بەیان دەر بکەین؟! ئەو کاتە زانیمان یەکێتی لە جیاتی کۆمیتەی ناوەندی، کۆمیتەی سەرکردایەتی هەیە .

### خۆپیشاندانی ساڵی ١٩٨٢ لە کەرکووک

ماوەیەک بوو خۆپیشاندان لە شارەکانی کوردستان دەستی پێ کردبوو، ڕێکخستنەکان و لایەنگرانی کۆمەڵە و یەکێتی لە کەرکووکیش سەرقاڵی فەزاسازی و ئامادەکاری بووین بۆ خۆپیشاندان. بەڵام دیارە ئەم کارە لە کەرکووک لەچاو

شارەکانی دیکەی کوردستاندا دژوارتر بوو. چەند جار کات و شوێن دادەنرا، بەڵام ئامادەکارییەکـان نەیانـدەتوانی دژوارییەکـان ببەزێـنن. سـەرەنجام دوانیـوەڕۆیەکی زوو، دەیان لاو لە گۆڕستانی شێخ محێدین کە وەکوو جێگای کۆبوونەوەی بەر لە خۆپیشاندان دیاری کرابوو، ئامادە بووین. لە کاتێکدا دەیـان لاو لەسـەر هەر گۆڕێک دوو دوو و سـێ سـێ و زیـاتر مقۆمقـۆی ئەوەمـان بـوو، کەی دەسـت پـێ بکەیـن، قەرەبـاڵغییەک لەسـەر یەکێـک لە گۆڕەکـان پەیـدا بـوو. بـۆیە ئەو قەرەبـاڵغییە کـرایە دەرفەت و دەسـت بە جـووڵە کـرا. بەشـێک لە ئامــادەبووانی سـەر گـۆڕەکە، بە خۆپیشـاندانەکەوە پەیوەسـت بـوون. بە تـایبەت دوو کچـی گەنـج و دایکیـان کە کەسوکاری مردووەکە بوون، زۆر بە حەماسەوە پێمانەوە پەیوەست بوون.

بە ڕێڕەوەکەی ناوەڕاستی گۆڕسـتانەکەدا شـۆڕ بووینەوە. پاشـان کەوتینە سـەر ئەو شەقامەی کە دەکەوتە نێوان ماڵەکانی شێخ محێدین و قوتابخانەی سەورە و بە دروشـمی، یەکێتیـی نیشـتمانی ئـاگرە بـۆ دوژمنـانی، بەهێـزی مـامە ڕیشـە، دوژمـن دەکەین بە شیشا ...هتد. تا گەییشـتینە چوارڕێیـانی حەسیرەکە و سـەرەتای بازاڕی گەورە بەرەو جووتقاوە. لەو چوارڕێیانەدا هەندێک کاری شێتانە لە بـابەت شـکاندنی جـامی ئەو ئۆتـۆمبیلانەی بەوێـدا تـێ دەپەڕیـن ئەنجـام درا. ژمارەکەمـان بە کەمـی زیادی دەکرد، ڕەحیم قادر دانساز بە باڵابەرزەکەیەوە لە ڕیزی پێشـەوە بـوو، ئێمە جەمـاعەتی بەشـی پێشـەوە نیـوەی یەکەمـی دروشـمەکە "یەکێتیـی نیشـتمانی"مان دەوت، باقی خەڵکەکەش نیوەی دووەم "ئاگرە بۆ دوژمنانی"یان دەوتەوە.

هەموو خۆمـان ئامـادە کردبوو بۆ شـەڕی دەستەویەخە و کەرەسـتەی شـەڕمان پێ بوو. من کێبڵێکی ئەسـتوورم لە پشـتم بەسـتبوو. سـەیر بوو وامـان دەزانـی ئیتر ڕژێم بەو خۆپیشاندانە چەندسەد کەسییە خەریکە دەڕووخێ. وامـان دانـابوو ئەگەر بەکرێگیراوانی ڕژێم بێنە سەرمان، شەڕی دەستەویەخەیان لەگەڵدا دەکەیـن. ڕادیـۆی یەکێتی بە هەموو توانـاوە فووی دەکردە خەڵکی بۆ خۆپیشـاندان، وێنـایەکی وای لا دروسـت کردبـووین کە ڕژێـم بەرەو لەنـاوچوون دەڕوات. سـەرجەم ئەم حیزبـانەی کوردایەتی هیچ باکیان لە بە کوشتدانی خەڵکیدا نەبوو. بـۆ ئەوان خۆپیشـاندان ئەگەر بە نرخی کوشتارێکی زۆریش بێت، هۆکارێـک بـوو بـۆ تونـدکردنەوەی فشـار لەسـەر

ڕژێم، تا مفاوەزاتیان لەگەڵدا بکات. پەنجا تا سەد مەترێکمان مابوو بگەینە جووتقاوە، لەو کاتەدا هەم لە پێشەوە و هەم لە دواوە هێرشمان کرایە سەر. من ئاگام لەوە نییە لە دواوە چی ڕووی داوە، بەڵام لە پێشەوە پیکابێکی شۆفرلێتی سوور، پڕ لە پیاوانی قوەی تەواری خۆی کرد بەناو خۆپیشاندانەکەدا و کۆمەڵێکی شێلا. هێرشەکەیان ئەوەندە توند و وەحشییانە بوو، فەزای بەرگری نەهێشتەوە. بڵاوەمان لێ کرد و کوڕ ئەو کوڕە بوو، خۆی دەرباز بکات. من خۆم کرد بەو تاقە کۆڵانەی کە بەر لە گەیشتن بە جووتقاوە، خۆی دەکرد بەناو ماڵەکانی بڵاخدا، ئەمە یەکێک بوو لە ڕێگا قەدبڕەکانی قوتابخانەم. کۆڵانەکە ئەوەندە تەسک بوو، تەنها ڕێگای پیادە بوو. سەد مەترێک ڕام کرد و بە دیوارێکدا هەڵگەڕام کە وەکوو شوورە بۆ پارچە زەوییەک دروست کرابوو کە هێشتا نەکرابوو بە بینا. بۆ ساتێکی کورت، ڕەنگە کەمتر لە یەک خولەک لەوێ خۆم حەشار دا. بەڵام یەکسەر تێگەیشتم کە دۆخەکە لەوە جددیترە کە بە خۆحەشاردان لە دووری ۱۰۰ مەتر دەرباز بم. بۆیە دووبارە بە دیوارەکەدا هەڵگەڕامەوە و خۆم فڕێدایە خوارەوە، لەو کاتەدا پاژنەم وەرچەرخا و ئازارێکی زۆری لێ بەرز بووەوە کە زۆر بە زەحمەت دەمتوانی بڕۆم. هەر چۆنێک بوو، تا دوو کۆڵان ئەولاتر ڕۆیشتم. ناوچەکە هەموو شڵەژا بوو، دەرگای ماڵێک کرابووەوە، لە دەرگاکە خۆم ئاودیو کرد، ژنێکی گەنج لەبەر بەلووعەی ناو حەوشەکە خەریکی جلشتن بوو، وتم ببوورە دەتوانم لێرە ڕابوەستم، تەوارییەکان دوامان کەوتوون؟ ئینکاری و خۆگێلکردن کەڵکی نەبوو، سەر و ڕووخسارم شایەتی حاشاهەڵنەگری بەشداربوونم بوو لە خۆپیشاندانەکە، بە هۆی هاواری هوتافدان و هەڵاتنەوە ئارەقی شین و مۆرم دەردابوو. ژنە گەنجەکە زۆر میهرەبانی نواند و وتی وەرە ژوورەوە! من هاتمە ژوورەوە و ئەو دەرگاکەی داخست. پاشان ژنێکی تر کە لە تەمەنی دایکمدا دەبوو، دەرپەڕییە ناو حەوشەکە و وتی: ئەوە چییە؟ ژنە گەنجەکە وەڵامی دایەوە و وتی، ئەو کوڕەیە، لە دەست ئەمن و تەواری ڕای کردووە. ژنە بە تەمەنەکە کە بەڕاستی ئەو ڕۆژە دایکایەتی بۆ کردم، بەوپەڕی میهرەبانی و دڵسۆزییەوە وتی: وەرە ژوورەوە کوڕم، لە حەوشەکە مەوەستە! چوومە ژوورەوە، دوو ژنی تریشی لێ بوو، لەوە دەچوو

میوان بن. هەموو جەستەم ئارەق بوو. ئەمن و تەواری ماڵ بەماڵ لەگەڵ موختاری گەڕەک کەوتنە گەڕان. ژنە گەنجەکە لە بەردەرگا چاودێری دۆخەکەی دەکرد. وتی هەموو ماڵەکان دەگەڕێن. بۆیە ئیتر دانیشتن لە ژوورەوەش فایدەی نەبوو. بەڕاستی ئەو ماڵە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە منیان پاراست. هەر لەو هۆڵەی کە ژنەکان تیایدا دانیشتبوون، جێگایەکیان بۆم ڕاخست و بەتانییان پێدا دام و وەکوو نەخۆش لێی درێژ بووم. ئەوەندەی پێ نەچوو، چەند کەسێک لە بەکرێگیراوانی ڕژێم لەگەڵ موختاری گەڕەک خۆیان کرد بە ماڵدا، سەرنجێکی منیان دا و وتیان کەسی لێیە؟ ژنە بەتەمەنەکەی کە ئەو ڕۆژە دایکایەتی بۆ کردم، موختاری دەناسی و ڕووی تێ کرد و وتی، نە بەخوا کەسی لێ نییە، هەر ئەو کوڕەی برازامە نەخۆشە و لە جێگادا کەوتووە! پاشان سەیرێکیان کرد و ڕۆییشتن. بەو جۆرە مامەوە تا دەمی ئێوارە .

دوای خۆرئاوابوون پیاوێکی گەنج، مێردی ژنە گەنجەکە و کوڕی ژنە بە تەمەنەکە خۆی کرد بە ماڵدا، پرسیاری منی کرد و وەڵامیان دایەوە. ئیتر من زۆر سوپاسم کردن و وتم ئەڕۆم. دایکەکە وتی، کوڕم حەز ئەکەم شەویش بمێنیتەوە، بەڵام خۆم دایکم و ئەزانم ئێستا دایکت ئارامی لێ هەڵگیراوە، لە هەمان کاتدا ڕەنگە بڕۆیتە دەرەوە بتگرن. پیاوە گەنجەکە شۆفێری تاکسی بوو، دایکەکە ڕووی تێ کرد و وتی: هەستە با بچین ئەم کوڕە بگەیەنینەوە ماڵی خۆیان، منیش لەگەڵتاندا دێم! هەرسێکمان سواری تاکسییەکە بووین، کە گەیشتینە لای نەخۆشخانەی دانەکەی پریادی و بینیم دۆخەکە ئارامە، دنیایەک سوپاس و قەدردانیم لێ کردن و وتم ئیتر ئیرە بۆ من باشە، دامگرن و خەمی منتان نەبێت.

### دۆستایەتی من لەگەڵ مامە ڕیشەدا

ماڵی مامم یەکێک بوو لەو ماڵانەی کە مامە ڕیشە زۆر متمانەی پێ دەکردن. لەو کاتانەی کە بە ڕۆژ بەنهێنی لە باخەکانی خاڵۆبازیانی دەمایەوە، جێگای خۆی بەوان، بە تایبەت بە ئەرشەدی ئامۆزام دەگوت .

ئەرشەد ئەندامی کۆمەڵە و پەیوەندی بە منەوە هەبوو. لە یەکەم دیداری مامە ڕیشەدا کە لەگەڵ ئەرشەد خواردنمان بۆ باخەکەی ماڵی مامم بۆ بردن، لە

دوانیوەڕۆوە هەتا ئێوارە پێکەوە بووین. قسەوباسمان زۆر کرد و یەکترمان زۆر خۆش ویست. لە دوای ئەوەوە، هەر ماوە جارێک بە تایبەتی بۆ دیداری ئەو بۆ خاڵۆبازیانی ئەڕۆییشتم. جارێکیان دەستێ جلی شاڵ (مەرەز) و کراسێکی تریکۆی زابتیم بۆ برد. زۆری پێ خۆش بوو، یەکسەر لە ماڵی مامم لەبەری کرد و وتی، وەڵا ئاواتی برام بەم جلەوە عەرز ئەدڕم! هەر کاتێک لە خاڵەبازیانی یەکمان بگرتایە، بەتەنیا بۆ ماڵی مامم دەهات و کەسی لەگەڵ خۆی نەئەهێنا، بۆ ئەوەی بتوانین بە ئیسراحەت پێکەوە قسە بکەین. زۆربەی هەرەزۆری پرسیارەکانی ئەو دەربارەی ئەوە بوو، کە چۆن مارکسییەکان دەڵێن خودا نییە؟! ئەی دنیا چۆن دروست بووە؟! واتە ئەو پرسیارانەی کە خەڵکی ئاسایی وا دەزانن مارکسییەت دەربارەی ئەم شتانەیە! مامە ڕیشە تا ئەو کات نوێژی دەکرد، بەرەبەرە باوەڕی لەق بوو. شەوێکیان لە دیوەخانەکەی ماڵی مامم پێکەوە بووین، تا دەمەو بەیان قسەمان کرد، لە کۆتاییدا وتی، ئاواتی برام ئەوە من نوێژم تەرک کردووە، بەڵام بە خوا ئەترسم خواش هەبێت!

بەو شێوەیە لەگەڵ مامە ڕیشە دۆستایەتییەکی زۆر بەهێزمان هەبوو، جارێک لەو جارانەی لە خاڵۆبازیانی چاوم پێی کەوت، دەمانچەیەکی میکارۆڤی دەسک سووری وەکوو دیاری پێم بەخشی. منیش نەمهێنایەوە بۆ شار و دامە ئەرشەد بۆم هەڵبگرێ. ئەو دەمانچەیە وەکوو یادگارییەکی مامە ڕیشە زۆر حەزم دەکرد بمێنێ، بەڵام بەداخەوە لە ساڵی ١٩٨٧ لە کارەساتی گیان لەدەستدانی ئەرشەد بە بۆردوومانی کۆپتەر و پاشان ڕووخاندنی دێی خاڵەبازیانی و دەستپێکردنی شاڵاوی ئەنفالەکان کە چەک ببووە تەوق بەسەر خەڵکەوە، ئەویش فەوتا.

لەو دەورانەی کە لە ڕوانگەی "ڕێبازی شەهید ئارام"ەوە کەوتینە ڕەخنەگرتن لە دۆخی کۆمەڵە، مامە ڕیشەش سۆز و خۆشەویستیی زۆری بۆ شەهید ئارام و ڕێبازەکەی دەردەبڕی، بەڵام وەکوو خۆی ڕاشکاوانە دەیگوت: من زۆر سەر لە سیاسەت دەرناکەم. بەڵام وەکوو فاکت، نیگەرانیی زۆری لە سەرکردایەتی بە هەردوو باڵەکەیەوە هەبوو.

لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێیان و دۆستانی ئێمە کە لە عێراقییەکانی ئەو کاتە بوون، وەکوو: سەلاح چاوشین (جەمال ئەحمەد یوسف) و کرمانج (ئیبراهیم مستەفا) و سیروان واحید خەیات و مەجید ...هتد. هەموویان سەربازی هەلاتوو بوون و لە مەکتەبەکەی خالۆبازیانی دانیشتبوون. کادرێکی ئەو کاتەی ناوچەی جەبارى ئەو هاوڕێیانەی لەسەر ئەوەی عێراقیین هەراسانی کردبوون. تەنانەت جارێک دوای وازهێنانم لە کۆمەڵە و تەبەنیکردنی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ، پەیامێکی بۆ منیش نارد و وتبووی: ئەگەر لە هەر جێگایەک بیگرم، حیسابی جاشی بۆ دەکەم! لەو کاتەوە من لە هاتوچۆی خالۆبازیانی حەزەرم دەکرد .

جارێکیان بۆ کارێکی تایبەتی من و محەمەد ئەحمەد و فوئاد سادق (ستار محەمەد کەریم) پێکەوە بۆ خالۆبازیانی چووین، بە رێکەوت لەناو کۆلانێکدا مامە ڕیشە بەرامبەرمان هات. دیارە پاش وازهێنانمان لە کۆمەڵە، دۆستایەتییەکەمان لەگەڵ مامە ڕیشە هەر وەکوو خۆی مابووەوە. زۆر بەگەرمی یەکمان لە ئامێز گرت و وتی: ئەوە بۆ دیار نیت، زۆر دەمێکە نەتم بینیوە؟! دەستێکم هێنا بە لاملیدا، وەکوو شەقازلەیەکی نەرمی خۆشەویستانە و ڕیشەکەیم گرت و ڕام تەکاند و وتم، کوڕی باش! تۆ خۆت ئەزانی من هیچ نەما بۆ کۆمەڵەی نەکەم، کەچی ئێستا فلانە کادر پەیامی بۆ ناردووم و ئەڵێ بیگرم، حیسابی جاشی بۆ دەکەم! جگە لەوە ئەم هاوڕێیانەم کە لە مەکتەبەکە دانیشتوون، هەموو کەسی باش و خەباتکارن، کەچی ئەو هەراسانی کردوون، ئەویش لە ناوچەیەکدا کە ئێستا تۆ تیایدا حاکمی، ئێمە چەند ساڵە بۆ ئەمە خەبات دەکەین؟! فیداکاری ئێمە بۆ ئەوە بوو کە لە جیاتی ئەمن و ڕەفیق حیزبی، کادری کۆمەڵە چاومان لێ سوور بکاتەوە؟! وتی: حەدی چییە و چۆن کاری وا دەکات! وتم: فایدەی نییە وای کردووە و واش دەکات. وتی باشە تۆ دەڵێی چی، چی لێ بکەم؟ وتم: کەیفی خۆتە، بەلام ڕێگا مەدە ئەم خەڵکە شەریف و خەباتکارە، نارەحەت بکات! وتی: دەری بکەم لێرە باشە؟ وتم: بەڵێ زۆر باشە! وتی: ئەگەر ئەمەم نەکرد، ئەم ڕیشەم، ڕیشی مامە ڕیشە نەبێت.

دواتر له تیپ و پاشان له مه‌ڵبه‌ند هه‌وڵی دابوو که ئه‌و کادره نه‌قڵ بکات، به‌ڵام به قسه‌یان نه‌کردبوو. وه‌کوو دواتر خۆی بۆی گێڕامه‌وه، وتی: من ئه‌ڵێم ئه‌م کابرایه لای من لابه‌ن، نامه‌وێ لێره بێت! ئه‌ڵێن: به‌ڵام بۆچی؟ وتم: له‌به‌ر ئه‌وه‌ی من نامه‌وێ لێره بێت! که‌چی پێم ده‌ڵێن: شتی وا نابێت، "قه‌ڵه‌م چه‌ک ئاراسته ده‌کات، نه‌ک چه‌ک قه‌ڵه‌م ئاراسته بکات"، ئه‌و بۆ کاری سیاسی له‌وێیه و لای نابه‌ین! وتی، منیش پێیانم وتووه: ده باشه با تاقی بکه‌ینه‌وه، بزانین قه‌ڵه‌م چه‌ک ئاراسته ده‌کات، یان چه‌ک قه‌ڵه‌م ئاراسته ده‌کات! که ئه‌و کادره‌م بینی، پێم وت: برۆ له‌م ناوچه‌یه مه‌مێنه و نامه‌وێ لێره بتبینم! که‌چی ئه‌و وتی: ناڕۆم، بۆ بڕۆم؟! وتی: منیش ڕێکوڕاست پێم وت: باشه! به‌ڵام ئه‌وه بزانه، له هه‌ر جێگایه‌ک له‌گه‌ڵ جه‌یش و جاش بکه‌وینه شه‌ڕه‌وه، یه‌که‌م فیشه‌ک ده‌نێم به تۆوه! پاش ئه‌و قسه‌یه نه‌هاته‌وه به‌و ناوچه‌یه‌دا.

که ئه‌م باسه‌ی بۆم گێڕایه‌وه، وتم: باشه ڕیشه گیان! به‌ڕاستی تۆ به نیاز بووی، ته‌قه‌ی لێ بکه‌ی؟! وتی: نه به گیانی تۆ، ته‌نها ویستم بیترسێنم و بڕوات، ده‌مزانی به چ زمانێک قسه‌ی له‌گه‌ڵدا بکه‌م.

ماوه‌یه‌ک به‌ر له‌وه‌ی مامه ڕیشه گیانی بسپێرێت، ئه‌و کاته من لایه‌نگری مارکسیزمی شۆڕشگێڕ و حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بووم، ئه‌ویش زۆر بێزار بوو له یه‌کێتی، وتی: تاقه‌تی کارم نه‌ماوه له‌گه‌ڵیان، ئه‌مه ئه‌و یه‌کێتی و کۆمه‌ڵه‌یه نییه که خه‌ومان پێوه ده‌بینی، به‌ڵام ناشتوانم دابنیشم، ئه‌وه‌نده جاش و خه‌ڵکی خراپم کوشتووه و ئه‌وه‌نده زه‌ربه‌م له ڕژێم داوه، ئه‌گه‌ر دابنیشم و واز له پێشمه‌رگایه‌تی بهێنم، هیچ ئه‌منییه‌تێکم نییه. دواتر قسه‌یه‌کمان له‌وه کرد، بڕوات ببێت به پێشمه‌رگه‌ی کۆمه‌ڵه، به‌ڵام ئه‌ویش بۆ ئه‌و ئاسان نه‌بوو.

ئه‌و له‌م فه‌زای دوودڵییه‌دا بوو له‌گه‌ڵ یه‌کێتی، به داخێکی گرانه‌وه به‌پێی پلانێکی ده‌زگای هه‌واڵگریی سه‌ربازیی ڕژێم و به‌هۆی بێده‌ربه‌ستیی سه‌رکردایه‌تیی یه‌کێتییه‌وه، ته‌حسین شاوه‌یس به شێوازێکی ڕه‌زیلانه غافڵگیری کرد و کوشتی.

ئه‌و کات من له ڕومادی له په‌یمانگا ده‌مخوێند، له‌وێ هه‌واڵه‌که‌ی له‌ناو خوێندکاره کورده‌کان بڵاو بووه‌وه، زۆر ناڕه‌حه‌ت بووم، به‌ڵام باوه‌ڕم نه‌ده‌کرد، چونکه چه‌ندین جار به درۆ پڕۆپاگه‌نده‌ی کوشتنی کرابوو. له ڕومادییه‌وه زۆر هه‌وڵم دا به ته‌له‌فون له‌گه‌ڵ ماڵه‌وه‌دا قسه بکه‌م، به‌ڵام بۆم وه‌رنه‌گیرا. دواتر سواری

پاس بووم و هاتمەوە بۆ کەرکووک، ڕێگاکە دووورودرێژ بوو، نزیکەی ٨ سەعات دەبوو، بەڕێگاوە بەردەوام بیر و خەیاڵم لەلای یادگارییەکانی خۆم بوو لەگەڵ مامە ڕیشەدا. کە گەییشتمەوە ماڵ، یەکسەر بە پەری خوشکم وت: ڕاستە؟ ئیتر زانی چی دەڵێم، پێویست نەبوو لەوە زیاتر پرسیارەکەم ڕوون بکەمەوە. بە پەژارەیەکی زۆرەوە وتی: بەڵێ! ئیتر ژانی لەدەستدانی هاوڕێیەکی ئازیز هەموو جەستەمی هەژاند.

**کەرتی شەهید سیروان و سازدانەوەی کۆمیتەی کەرکووک**

ئەگەر هەڵە نەبم، ساڵی ١٩٨٢مامۆستا مارف بە هۆی ئەوەی ناوی بۆ خزمەتی سەربازی هاتبوو، ناچار بوو، بڕواتە دەرەوە. بەڵام نەبووە پێشمەرگە و لە گوندێکی ناوچەی هەمەوەند (پێم وابێت گوندی مەملەحە بوو) دانیشت. دواتر زۆر بەداخەوە لەلایەن کۆپتەری ڕژێمەوە کرایە ئامانج و گیانی لەدەست دا. بەڵام بەر لەوەی بڕواتە دەرەوە، پەیوەندییەکانی خۆی تەسلیم بە من کرد. شانەیەکی لەلا بوو، بەرپرسەکەیان سابیر چاوشین و ئەندامەکانی نەجات خەیات و عەباس حەسەن (ئاڵتوونچی) ...هتد. بوون.

تا ئەو کاتە من دوو کەسی ترم بە ڕێکخستنەوە پەیوەست کردبوو، "نەوزاد شەفیق و هۆشیار عەبدولڕەحمان" کە هەردووکیان خەڵکی دێی خاڵەبازیانی بوون. لە ڕێگای ئەوانیشەوە کەسانێکی تر ڕێک خرابوون کە بە هەموویانەوە شانەیەکی پێنج کەسی بوون و نەوزاد بەرپرسی شانەکە بوو. جگە لەو چەند شانەیە فاتمە ئەحمەد (ئالا)یش پەیوەندیی ڕاستەوخۆی لەگەڵ مندا هەبوو. فاتمە کچێکی زۆر چالاک و هۆشیار و ڕۆشنبیر بوو، دەوروبەرێکی باشی هەبوو. بەڵام ئەو کات هێشتا فاتمە بە فەرمی ڕێک نەخرابوو، تەنها لە ئەڵقەی ڕۆشنبیریدا بوو. دواتر شەهید نەجات سلێمان بە ڕەسمی ئەوی دەعوەت کرد بۆ پەیوەستبوون بە ڕێکخستنی کۆمەڵەوە.

پەیوەندییەکانی محەمەد هەندێکی لە کەرکووک و هەندێکی لە زانکۆی تەکنەلۆجی بەغدا بوو، لە ڕێگای ئەو خەتەوە پەیوەندی لەگەڵ قەڵادزێ و سلێمانیش دروست کردبوو. تەرتیباتی شانەکەی ئەوم لەبیر نییە، بەڵام کەسە دیارەکانی

پۆلەکەی بریتی بوون لە: شەهید نەجات، سەردار عومەر، محەمەد ئەحمەد حوسێن (محەمەد باجی عاسم)، تۆفیق (شوانەی کادر)، محەمەد حوسێن تەپە، تاریق، کەریم و عومەر لە قەڵادزێ، کاروان ئەسعەد و مامۆستا بەهادینی سەرتاش لە کەرکووک ...هتد. محەمەد کادرێکی زۆر ڕۆشنبیر و هۆشیار و چالاک و جەسوور و نەترس بوو. ئاشنایەتییەکی باشی بە مارکسیزم هەبوو، کەسێکی زمانشیرین و خۆشڕەفتار و خاوەن پەیوەندییەکی فراوان بوو، لەناو خەڵکیدا خاوەنرێز و خۆشەویست بوو. زۆر کات کە لە دێهاتەکان دیدارمان لەگەڵ تەها دەبوو، بڵاوکراوەمان لێ وەردەگرت و لەگەڵ خۆمان دەمانهێنایەوە. محەمەد زۆر پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە هەموو بڵاوکراوەکان لە لەشی خۆیدا بشارێتەوە و لەسەر ئەمە لەگەڵ مندا ئەیکرد بە کێشە.

ماوەیەک دوای ئەوەی من و محەمەد یەکمان ناسی و پێکەوە دەستمان بە کارێکی زۆر چڕوپڕ کرد، خەتێکی تر کە لە کۆمیتەی ئاگر پچڕابوون و قادری سەی مستەفا (سەید قادر ئاڵتوونچی) بەرپرسیان بوو، بە ئێمەوە پەیوەست کرا. قادر وەکوو بەرپرسی پۆل هاتە ناو لیژنەی کەرتی شەهید سیروانەوە. کەرتی شەهید سیروان گەورەترین کەرتی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بوو لەدوای کۆمیتەی ئاگر. لە سەردەمێکدا ژمارەی ئەندامانی گەییشتە دەوری ٧٠ کەس.

بەو جۆرە بەردەوام بووین، تا کۆمیتەی تازەی ڕێکخراوی کەرکووک دوای ئەوەی کۆمیتەی ئاگر کەوتە بەرشاڵاوی گرتن، بە بەشداری سالار ڕەشید، محەمەد ئەحمەد ڕەحمان، مامۆستا قادر دروست کرایەوە.

### بەشداریمان لە کۆنفرانسی دوو و کێشەی عادیل نامیق

ئێمە لە کەرکووکەوە ٦ کەس وەکوو نوێنەری کەرکووک بەشداریی کۆنفرانسی دوومان کرد، محەمەد ئەحمەد، سەردار عومەر، کەریم قەڵادزێ، کەریم حەمید و مامۆستا قادر و من. ئێمە پێنج کەسی کەرتی شەهید سیروان پێکەوە لە ڕێگای قەڵادزێوە تا گوندێکی ڕووخاوی نزیک قەڵادزێ بە ناوی "شێخ فەرخ" ڕۆیشتین و

پاشـان قاچـاغچی بردینـی تـا لە مەترسـی ڕژێـم دەرچـووین. دوای ئەوە خۆمـان تـا نێوزەنگ بە پرسیار ڕۆییشتین. مامۆستا قادریش خۆی بە جیا هاتبوو بۆ ناوزەنگ.

ئێمە لە هـاوینی سـاڵی ١٩٨٢ لە کـۆنفرانس بـووین، وا بـزانم ١٩یـان ٢٠ی ئـاب گەییشتینە ناوزەنگ. دوای کۆنفرانس بە ماوەیەک کەسێک بە نـاوی عادیل نـامیق کە لە کاتی کۆنفرانسدا محەمەدی بینیبوو تەسلیم بووەوە و نـاوی محەمەدی دابـوو بە ڕژێم. بۆیە محەمەد ناچار بوو بڕواتە دەرەوە. ماوەیەک لە دێی تیلەکۆ دانیشت. دواتـر وەکوو لە خـۆیم بیسـت فەتـاح جـاف مەسـەلەکەی بـۆ حەل کـرد و مـحەمەد گەڕایەوە بـۆ شـار. بەڵام زۆر بـاوەڕی بەوە نەبوو کە ڕژێم وازی لـێ بهێنێت. بـۆیە زۆر بە حەزەر بـوو و خـۆی دەرنەئەخسـت. کاتێـک کە دواتـر چـوو بـۆ زانکـۆ بـۆ ئیمتیحـانی دوو مـادە کە لێـی دەرنەچووبـوو، زۆر دەترسـا لەوەی بیگـرن. مـن ئەو ماوەیە هەمیشە لەگەڵیدا بووم و لە بەردەرگـا چـاوەڕێم دەکرد، هەتـا ئیمتیحـانەکەی تەواو دەبوو. سەرەنجام هەردوو ئیمتحانەکەی دا و هیچ ڕووی نەدا.

ئـێمە بە ئومێـد و شوڕوشـەوقێکی زۆرەوە ڕێگـایەکی سـەخت و پڕمەترسـیمان بەرەو کـۆنفرانس دەبـڕی. ئەو دەم بـاوی مارکسـییەت بـوو، مـن لە بیـری خۆمـدا وێنـایەکم بـۆ ڕابەرانـی کـۆمەڵە کێشـابوو کە مارکسـیزمیان لـێ بچـۆڕێ. کاتێـک لە نزیکەوە بینیمن، لەگەڵ ئەوەی وەکوو گەنجێکی ١٨-١٩ ساڵان، دیدار و بەشداری لە کۆنفرانسـێک لەگەڵ کەسـانێک کە دەمـێکە لە بارەیـانەوە دەبیسـتین، خـۆدی فەزاکە جۆرێک لە سەرسامی بە ئێمە بەخشی، بەڵام لە هەمـان کاتدا چاویشمانی لە ئاست ئەو وێنـا خەیـاڵییەی لە بیـری خۆمانـدا دروسـتمان کردبـوو، کـردەوە. واقـیعەکە جیـاوازییەکی یەکجـار زۆری هەبـوو، وەکـوو ڕاسـتییەک مـحەمەد ڕۆڵـی هەبـوو لە چاوکرانەوەمـان. ئەو ئەنـدامی ئەو لیـژنەیە بـوو کە کـۆنفرانس ڕایسـپاردبوو بـۆ ئامادەکردنی ڕەشنووسـی بەرنـامە. مـن و محەمەدیش بـاوەڕێکی تەواومـان بە یەک هەبوو، هەموو ڕۆژێک نیگەرانی خۆی لە فەزای زاڵ بەسـەر کارەکـانی ئەو لیژنەیەدا بۆ من باس دەکرد .

دوای بەشـداریمان لە کۆنفرانس، هەم ناکۆکییەکـانی نـاو کـۆمەڵە زەقتـر بـوەوە و هەم ئـێمەش ئاشـنایەتییەکی زۆرترمـان بەو ناکۆکیـانە پەیـدا کـرد. ئیتـر کەوتینـە

ڕەخنەگرتن لە کۆمەڵە، لە ڕوانگەی ئەو باڵەی بە ڕێبازی شەهید ئارام و داش عێراقی دەناسرا و هەتا دەهات نیگەرانییەکانمان لە کۆمەڵە و باڵادەستی نەوشیروان و مام جەلال و بەرەو ڕاستچوونی کۆمەڵە زیادی دەکرد. ئێمە بەشی هەرە زۆری کەرتی شەهید سیروان لایەنگری ئەو باڵە بووین و تەنها سەلاح و ڕەنگە ئەندامانی شانەکەی، لایەنگری خەتی ڕەسمی بووبن، واتە، ئەو باڵەی کە لە گرووپی زیندان و نەوشیروان پێک هاتبوون .

**نامەی فەرەیدوون بۆ تەجمیدکردنی من**

لەگەڵ سەلاح حەسەن پاڵەوان تا ئەو کاتەی هەردووکمان بەرپرسی شانە و ئەندامی پۆل بووین، نێوانمان زۆر خۆش و زۆر کات پێکەوە و مونسەجیم بووین. بەلام بوونی من بە بەرپرسی پۆلێک کە یەکێک لە شانەکانی، شانەکەی سەلاح بوو، واتە بووم بە بەرپرسی سەلاحیش، ئیتر جۆرێک ساردی لە نێوانماندا دروست بوو.

کاتێک ئامادەکاری بۆ کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە دەستی پێ کرد، ئەم ساردییەی نێوانمان زیادی کرد. چونکە من وەکوو یەکێک لە نوێنەرانی ڕێکخراوی کەرکووک بۆ کۆنفرانس دەستنیشان کرام. من ئەو کاتە بە شانەکەی سەلاحەوە بەرپرسی ٥ شانە بووم، سەرجەم ئەندامەکانی خەتەکەی من زیاتر لە ٢٠ کەس دەبوون، شانەکەی سەلاح و شانەیەک کە خۆم ڕاستەوخۆ بەرپرسی بووم و شانەیەک کە نەوزاد شەفیق بەرپرسی بوو و شانەیەک کە سابیر چاوشین بەرپرسی بوو، هەروەها ئەرشەدی ئامۆزام و دوو کەسی تر کە پەیوەندییان بەوەوە هەبوو.

ماوەیەکی زۆر دوای کۆنفرانس ئەو کاتەی محەمەد چووبووە دەرەوە، ڕۆژێک قادر مستەفا، نامەیەکی هێنا و وتی: ئەم نامەیە لە ناوەندییەوە بۆ کۆمیتەی کەرکووک هاتووە، لەسەر کەسێک کە ناوی "ئارام"ە، بە ناونیشانەکەیدا دیارە کە لەسەر خۆتە! نامەکەم لێ وەرگرت و کە گەییشتمەوە ماڵ، کردمەوە خوێندمەوە. نامەکە بە خەتی فەریدوون عەبدولقادر لەسەر من نووسرابوو، داوای کردبوو من تەجمید بکەن.

سەلاح لە بارەی منەوە ڕاپۆرتی دابوو بە فەرەیدوون کە من (ئارام) کەسێکی عێراقچیم و کراوم بە بەرپرسی ئەوان. هەڵبەت وەکوو حەقیقەتێک بۆ مێژوو، هیچ

ڕاستییەک لەم قسەیەدا نەبوو، ئەمە بەتەواوی بوختان بوو، من هیچ کاتێک عێراقی نەبووم. تا لەناو کۆمەڵە بووم، لایەنگری ئەو باڵە بووم کە بە پێداگری لەسەر ڕێبازی شەهید ئارام دەناسرا. دوای وازهێنانم لە کۆمەڵەش تەبەنی مارکسیزمی شۆڕشگێڕم کرد کە ئەویش جیاوازی هەبوو لەگەڵ عێراقیدا. نامەکە لە ڕێگای ئەندامێکی خەتەکەی قادرەوە ڕەوانە کرابوو، بەڵام لە کۆتاییدا هەر هاتەوە بۆ کۆمیتەی کەرتی شەهید سیروان، واتە هاتەوە بەردەستی خۆم. نازانم بۆچی، بەڵام بە خەتی پەری خوشکم نوسخەیەکم لەبەر نامەکە گرتەوە و پاشان وەکوو خۆی پێچامەوە و دامە دەست سالار کە ئەو کاتە پەیوەندەری کەرتەکەی ئێمە بوو لەگەڵ کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک.

### کەرتی شەهید سیروان دوای چوونەدەرەوەی محەمەد

لەدوای چوونەدەرەوەی محەمەد، من بووم بە بەرپرسی کەرتی شەهید سیروان. بەڵام ئەو کات لە کۆمەڵە زۆر دڵسارد بووم و ئامادە نەبووم لە جیاتی ئەو بڕۆمە ناو کۆمیتەی کەرکووک. دیار بوو کۆمیتەش کە لە سالار و مامۆستا قادر پێک هاتبوو، مەیلی نەبوو یەکێک لە ئێمە سەربخەن بۆ کۆمیتە. بۆیە سالار بوو بە پەیوەندەری ئێمە لەگەڵ کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک و ماوەیەکی کەم لەگەڵ سالار کارمان کرد .

سالار کەسێکی زۆر جددی و وردبین و لە کاری ڕێکخراوەییدا خاراو بوو. ئێمە ئەو کاتە بەپێی فەزای ناو کەرتی شەهید سیروان لە ڕوانگەی ئەو خەتەی کە بە پێداگری لەسەر ڕێبازی شەهید ئارام ناسرابوو، دیدێکی ڕەخنەگرانەمان بەرامبەر بە دۆخی ئەو کاتەی کۆمەڵە هەبوو، لەناو خۆماندا هەر کەس ڕەخنەیەکی بگرتایە، ئەوەی تر بۆی تەئید ئەکرد، بەڵام فەزا و شێوازی قسەوباس لەگەڵ سالاردا جیاواز بوو، هەر سەرنجێکم دەربڕیبایە، بە پرسیار گێژی دەکردم، لێ ناگەڕا هیچ قسەیەک بەبێ بەڵگە و ڕوونکردنەوە تێپەڕێت، لەگەڵ یەک زۆر بەحەزەر بووین. لای منەوە هۆیەکەی ئەوە بوو کە لەسەر قسەی محەمەد ئەوم بەلایەنگری باڵی نەوشیروان و گروپی زیندان دەزانی، بۆیە وردبوونەوەی لە هەموو قسەیەک کە لە دەمم

دەردەچوو، لەلای من پەیوەست دەکرا بە لایەنگری باڵی باڵادەستی ناو کۆمەڵە و کۆڵینەوە لە بۆچوون و نیازی ئێمە وەکوو باڵی شەهید ئارام. بەڵام لای سالارەوە حەزەرکردنەکە وەکوو لەم کتێبەدا باسی کردووە، لەبەر ئەوە بوو کە زانیویتی کەرتی شەهید سیروان کێشەی تێدایە.

### وازهێنان لە کۆمەڵە

بڕیاری وازهێنان لە کۆمەڵە، بڕیارێکی سانا و کوتوپڕ نەبوو. وازهێنان لە پرۆژەیەک کە چەندین ساڵ فیداکاریت بۆ کردووە و زەحمەتت بۆی کێشاوە، دەیان جار ریسکت بە ژیانی خۆت و خێزان و دەوروبەرتەوە کردووە، بە درێژایی چەندین ساڵ کە پەیوەندی و هەڵسووڕانمان فراوان و لە کۆنترۆڵی خۆمان دەرچووبوو، من هەمیشە لە پۆل ئاگام لە دەرس نەبوو، هەر چاوم لە دەرگا بوو، کەی پیاوانی ڕژێم دێن و راپێچم دەکەن. شەوانە بە نیگەرانی ئەوەوە سەرم دەخستە سەر سەرین کە ڕەنگە لە شیرینی خەودا پیاوانی ڕژێم بێدارم بکەنەوە و بمبەن. ئەو ماوانە هەمیشە بە ئەندازەی هەڵماتێک ژەهری "مەرگەمووش"م بە شێوەی هەویر لە نایلۆندا لە گیرفان نابوو، بۆ ئەوەی ئەگەر گیرام و لەژێر شکەنجەدا خۆم ڕانەگرت، بەر لەوەی ئیعتراف لەسەر نهێنییەکان بکەم، ئەو ژەهرە بخۆم و کۆتایی بە ژیانم بهێنم. بۆیە بێگومان وازهێنان بڕیارێکی سەخت و دژوار و بەئازار بوو. بۆیە یەکلابوونەوە لەسەر ئەم بڕیارە، چەندین مانگ بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندن و هێنان و بردنی پێویست بوو. دوای کۆنفرانسی دووەم و قووڵبوونەوەی ناکۆکییەکان، لە کاتێکدا ئێمە ئومێدێکمان بە باڵی لایەنگری ڕێبازی ئارامەوە گرێ دابوو، ڕۆژ بەڕۆژ ئەم باڵە ناکارامەیی خۆی دەردەخست. محەمەد پێش من وازی هێنا، چونکە کێشەکەی عادیل نامیق و چوونەدەرەوە و گەڕانەوەی بۆ شار، پرۆسەکەی بۆ ئەو خێرا کردەوە.

لەو دەورانەدا یەک دووجار لە دێی داریکەلی تەهای مەلا وەهاب و مامۆستا موحسینمان بینی کە ئەوانیش سەر بە هەمان باڵ بوون، هەستمان کرد ئەوانیش ئومێدێکیان نییە. من بۆ دیداری مەلا بەختیار سەردانێکی مەڵبەندی یەکم لە حاجی

مامەندە کرد، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بزانم بە نیازی چین و پلانیان بۆ کۆنفرانسی سێ چییە. کاتێک کە گەیشتمە مەڵبەندی یەک، مەلا بەختیار لەوێ نەبوو، شەوێک لەگەڵ مامۆستا پشکۆ نەجمەدین دانیشتین و قسەوباسمان کرد، سیروان واحید خەیاتیش (پۆلا) کە ئەو کات لەوێ دانیشتبوو، ئامادەی قسەوباسەکانمان بوو. هەڵسەنگاندنم بۆ قسەوباسەکان ئەوە بوو کە ناکرێت چاوەڕوانییەکی ئەوتۆ لەم باڵەش بکرێت. دوای ئەوەی گەڕامەوە وەکوو دواهەوڵ لە ڕێگای ئازاد قادر (پێشمەرگەی دانیشتوو لە گوندی خاڵەبازیانی کە سەفەرێکی هەبوو بۆ سەرکردایەتی) نامەیەکم بۆ ئازاد هەورامی نووسی. وەزعەکە و بیروبۆچوونی خۆمانم سەبارەت بە نیگەرانی لە ڕاستڕەوی و بەرەو ناسیۆنالیزمچوونی کۆمەڵە باس کرد. ئازاد هەورامی لەسەر باڵی شەهید ئارام حیساب دەکرا، بۆیە دەربارەی پلان و ئامادەکاری ئەم باڵە بۆ کۆنفرانس پرسیارم لێ کردبوو. هەر ئازاد قادر خۆی وەڵامی نامەکەی بۆم هێنایەوە. ئازاد هەورامی لە وەڵامدا نەک هەر بەلای پلان و ئامادەکاریدا نەچوو بوو، بەڵکوو پاساوی بۆ ڕاستڕەوی کۆمەڵە و باڵی نەوشیروان و جەماعەتی زیندان هێنابووەوە. ئیتر من تێگەشتم، ئەم باڵە و خودی ڕێبازی شەهید ئارامیش هیچی لێ هەڵناکرێت و بەتەواوی لەسەر دەست لە کار کێشانەوە یەکلا بوومەوە .

دوای دەست لە کار کێشانەوەش هەر لە نزیکەوە چاودێری دۆخی کۆمەڵەمان دەکرد. لە کاتی مفاوەزاتدا محەمەد ئەحمەد و من جارێک لە سلێمانی لە ماڵێک کە پشتی بە جادەی سجنەوە بوو، چاومان بە سالار عەزیز کەوت و یەک دوو سەعاتێک قسەوباسمان کرد، ویستمان بزانین ئەو چی دەڵێت. پاشانیش هەر لە سلێمانی مامۆستا موحسینمان بینی کە عیماد ئەحمەدی خوشکەزاشی لەگەڵدا بوو.

هەرچەندە زیاتر لە دۆخەکە ورد دەبوویتەوە، زیاتر لەو ڕاستییە دەگەیشتی، کەسانێکی مارکسیست ناکرێ هیچ ئومێدێک لەسەر کۆمەڵە بینا بکەن.

**سوید**

**مارتی ٢٠٢٠**

## گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز:
## سەلاح حەسەن پاڵەوان (سەلاح حەسەن عەبدولکەریم)
## دەربارەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە کەرکووك

**سالار ڕەشید:** بەڕێز سەلاح حەسەن! سەرەتا پێم باشە بپرسم، کەی پەیوەندیت بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد، لە لایەن کێوە ئەو پەیوەندییەت کرد و ناوی نهێنیت چی بوو؟

**سەلاح حەسەن پاڵەوان:** من لە ساڵی ١٩٧٩ لە ڕێگای هاوڕێیەکەوە بەناوی مەهدی بێکەس لە گوندی قەشقەی سەر بە ناحییەی قادر کەرەم پەیوەندیم بە کۆمەڵەوە کرد و هەر لە ڕێگای ئەویشەوە پەیوەندیم بە کادرانی دەرەوە هەبوو، پاشان مەهدی لە شالاوێکی جاش بۆ سەر گوندی قەشقە شەهید دەکرێ. دوای

ئەوە لە ڕێکخستن دابڕام و لە ڕێگای مامۆستا مارفەوە کە هاوڕێی دڵسۆزی ئاوات ناسیح حەبیب بوو، پەیوەندیم دروست کردەوە و ناوی نهێنیم "ئاسۆ" بوو.

من و ئاوات و مامۆستا مارف لە پۆلێکدا بووین. لەو ماوەیەدا زۆربەی کارەکانمان بە فەردی و لە ڕێگای مامۆستا مارف و من و ئاواتەوە بەڕێوە دەچوون. کۆبوونەوەمان زۆر کەم بوو، ئەو نووسراو و نامیلکانەی لە کادرانی دەرەوە بۆمان دەهاتن، دەست بەدەست دەمانخوێندەوە، شێوازی کارکردنی ڕێکخراوەییمان سادە بوو، سەرەڕای هەڵەی زۆری ڕێکخستن. هەندێ جاریش ئێمە لای خۆمانەوە یارمەتی دارایی و دەرمانمان بۆ دەرەوە دەنارد و ئەوانیش نووسراو و بڵاوکراوەکانیان بۆ دەناردین. جارێکیان مامەڕیشە دەمانچەیەک و هەندێک فیشەکی دابوو بە ئاوات، پاشان نەمانزانی چارەنووسی ئەو دەمانچەیە چی لێ هات.

**سالار ڕەشید:** ئەو هاوڕێیانەی لە لایەن خۆتەوە بۆ کۆمەڵە ڕێک خران، کێ بوون و ناوی نهێنییان چی بوو؟

**سەلاح حەسەن پاڵەوان:** ئەوانەی ڕاستەوخۆ لەلایەن خۆمەوە پەیوەندییان بە ڕیزەکانی کۆمەڵەوە کردبێت و لە یادم بێت، بریتی بوون لە: خەلیل دەروێش عەبدوڵا (بێستوون)، سابیر ڕەشید، فەلاح حەسەن پاڵەوان، ئازاد کاکەیی، تەیب سەیدەلی، سەردار سابیر سۆفی، شێخ کاوە، جومعە کە دواتر بووە پێشمەرگە و شەهید بوو. دیارە هەر یەک لەو برادەرانەش کەسانی دیکەیان لەگەڵدا بووە، بۆ نموونە: محمەد کاکەیی (سەرتیپ)، سەدرەدین ئەمین ...

ئەوەی شایانی باسە، ئەم هاوڕێیانە سەرباری ئەوەی پەیوەندییان لەگەڵ ئەواندا هەبوو، لە لایەکی دیکەوە پەیوەندییان لەگەڵ منیشدا هەبوو. چەند کەسێکی تریش هەن کە ناویانم لەیاد نەماوە. زۆربەی ئەمانە پاش دروستبوونی کەرتی شەهید سیروان بوون بە ئەندام.

**سالار ڕەشید:** چ زانیارییەکت دەربارەی کەرتی شەهید سیروان هەیە؟

**سەلاح حەسەن پاڵەوان:** لە سەرەتادا کارەکانمان زۆر بە سادەیی دەڕۆیشتن، چالاکییەکان زۆربەیان فەردی بوون، بیرمە جاریکیان هەندێ بەیاننامەیان بۆ ناردین، تاوەکوو لە قوتابخانەیەکی شۆڕیجە بڵاوی بکەینەوە، ئەو شەوە من و شێخ کاوە کە ئێستە پێشمەرگەی دێرینە، چەند سپرایەکمان کڕی و نووسراوەکانمان لە باخەڵ خۆمان نا و شەوێکی درەنگ دەرچووین بڵاومان کردەوە. ئینجا بە سپرای دروشمی کۆمەڵەمان لە چەند پۆلێکی قوتابخانەی "الرسالة" نووسییەوە. پاشان ئەو شەوە هەر بۆ حەزەر لە ماڵی خۆمان نەخەوتین. بۆ سبەی کە هەواڵی ئەو بڵاوکراوانە بڵاو بووەوە، ئەمن و پیاوانی ڕژێم نەیانهێشتبوو هیچ قوتابییەک بچێتە ژوورەوە، تا هەموو نووسینەکانیان سڕیبووەوە. دەکرێ بڵێم، ئەمە یەکەمین چالاکیی من و کاک کاوە بوو، ئەو کاتە هێشتا باسێک لە کەرت و ڕێکخراو نەبوو. پاشان کاوە چووە دەرەوە و بووە پێشمەرگە.

ئیتر لە سەرەتاکانی هەشتا و یەکدا، وردە وردە جۆرێک لە ڕێکوپێکی هاتە نێو بونیادی کاری سیاسیمانەوە. کاتێ پۆلەکەی ئێمە گەشەی کرد، ئاوات لە هەندێ لە وردەکارییەکان ئاگاداری دەکردمەوە، ئینجا زانیم شتێک هەیە بە ناوی "ڕێکخراوی کەرکووک"ەوە .

ئێمە لە چوارچێوەی کەرتی شەهید سیروان کەوتینە کارکردن، ئەو کاتە من تەنیا "ئاوات"م دەناسی، ئەویش پەیوەندی بە سەرووی خۆیەوە هەبوو کە نەمدەزانی کێن. شانەی بچووکی سێ تا چوار کەسی بووین، من بۆ خۆم بەرپرسی سێ شانە بووم، بەرپرسی شانەکان بە فەردی پەیوەندییان بە منەوە هەبوو، پاشان پۆل هەبوو کە من و ئاوات و مامۆستا مارف بووین. کە مامۆستا مارف ڕۆییشتە دەرەوە، تەنیا من و ئاوات ماینەوە، ئەمانە هەمووی لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨١ تا ١٩٨٣دا بوون.

**سالار ڕەشید:** ئایا لە کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەدا بەشداریت کردووە، ئەگەر بەڵێ، لە کام کۆنفرانس و هاوڕێیانی دیکەی کەرتەکە کێ بوون کە بەشدارییان تێدا کرد؟

**سەلاح حەسەن پاڵەوان:** بەڵێ، لە کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٨٤ کە لە هەواری کانیی سێو لە مێرگەپان بەسترا، بەشداریم کرد. ئێمە لە کەرکووکەوە بۆ سووورداش چووین، لەوێ ڕووپۆشیان پێمان دا، تا کەس نەماننناسێتەوە. هەر ئەو کاتە ئێمە و هەندێ لە ئەندامانی ڕێکخراوی هەولێر بە ئۆتۆمبیل بردینیان بۆ ناوچەی مێرگەپان.

ئەوانەی لەم کۆنفرانسە لەگەڵ مندا بوون: سەردار سابیر سۆفی، کەریم حەمید ... لەوێ هەندێ برادەری ترم ناسییەوە کە لەگەڵ ئێمەدا نەهاتبوون و پەیوندییان بە ئێمەشەوە نەبوو، وەک: محەمەد خەیروڵا ئەمین. کەسانی دیکەش لە ڕێگای ترەوە هاتبوون وەک: مامۆستا قادر و شێرزاد جەباری، سالار ڕەشید ... هەر ئەو کاتەش مامە ڕیشە لەگەڵ عومەر عەلی (عومەرە ڕەش) سەردانی چادرەکەی ئێمەی کرد.

چۆنیەتی بەشداریکردنی ئێمە لە کۆنفرانس پەیوەندی بە گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکانەوە هەبوو کە لەنێو ڕێکخستندا روویان دا. چەند مانگێک پێش کۆنفرانس پەیوەندیی من و ئاوات بەتەواوی تێک چوو، ئیتر ئەو لە ئێمە جیابووەوە، بەبێ ئەوەی بزانین چی دەکەین! تا یەکەمین دانیشتنم لەگەڵ کاک سالار ڕەشید لە ماڵی خۆمان کرد.

ئەو کاتە سالار هاتە ماڵمان شەڕواڵێک و کراسێکی لەبەر بوو، نامیلکەیەکیشی پێ بوو لەسەر یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان، کوڕێکی هێمن بوو، هەستم کرد هەندێک تایبەتمەندی تێدایە، ئەوە بوو لەوەوە، هەندێک ڕووناکیمان دەستکەوت بۆ بەستنەوەی ئەو کەسانەی پەرتەوازە ببوون.

هەندێ برادەری تریش کە پەرتەوازە ببوون، لە چەند ڕێگایەکەوە پەیوەندییان بە پۆلەکەی ئێمەوە کرد. هەر بۆ نموونە، پۆلی شەهید دڵشاد، بەرپرسی پۆلەکەیان عەباس حەسەن (دیار) بوو، ئێستە لە دانیمارک دادەنیشێت کە چەند کەسێکی لەگەڵدا بوو، لەوانە: نەجات حەمە ساڵح (شەپۆل)، ڕەمەزان جەباری (هاوتا)، بورهان نانەوا (بڵند) ...هتد.

ئەوەی شایانی باسە، کاتێک کە ئاوات لە کۆمەڵە وازی هێنا، ئەم کۆمەڵە ئەندامە دەپچڕێنەوە، چونکە بێ ئەوەی گرێیان بداتەوە، بەجێیانی هێشت. بەڵام دواتر بەرپرسی ئەو هێڵە (عەباس) پەیوەندی بە ناوەندیی کۆمەڵەوە دەکات و خۆی دەگەیەنێتە لای فەرەیدوون عەبدولقادر و وازهێنانی ئاواتی پێ ڕادەگەیەنێت. دوای ئەوە نامەیەکم لە ناوەندییەوە پێ گەییشت کە پەیوەندی بۆ ئەو هێڵە درووست بکەمەوە. هەرچەندە من زۆر بە حەزەر بووم، بەهۆی شڵەژاویی بارودۆخەکەوە، بەڵام پەیوەندیم هەر بۆیان درووست کردەوە.

بەسەرهاتی کۆنفرانسیش بۆ خۆی چەند ڕووداوی گرنگی تێدا بوو. ئەو کاتانە کێشەی ئاڵای شۆڕش و باڵی نەوشیروان و کێشەی نێوان فەرەیدوون عەبدولقادر و مەلا بەختیار لە ئارادا بوون کە من بۆ خۆم تا ڕادەیەک لایەنگری ئاڵای شۆڕش بووم و هەر ئەو کاتەش لە کۆنفرانس وەک جۆرێک لە نارەزایەتی دژ بە باڵی جەلالی و نەوشیروان مستەفا، لەگەڵ هاوڕێکانم ساباتی کۆنفرانسەکەمان بەجێ هێشت و چووینە دەرەوە.

**سالار ڕەشید:** ئەو دەمە لەنێو کۆمەڵەدا کێشەی کوردستانی و عێراقی پەرەی سەند، لێکدانەوەت بۆ ئەو پرسە چییە؟

**سەلاح حەسەن پاڵەوان:** هەر پاش هاتنی ئەو بیروبۆچوونانە شیرازەی ڕێکخستنەکان ڕووی لە تێکچوون کرد و کێشەی جۆراوجۆر سەریان هەڵدا. کۆمەڵێ برادەر لە ڕووی هەرزەکاریی سیاسییەوە ئەوەیان کرد و هەندێکیشیان مەبەستی شەخسیان هەبوو، بڕێکی زۆر کەم لە ڕووی ی‌ڕوا و ئایدیۆلۆجییەوە ئەو بۆچوونانەیان هێنایە ناو ڕێکخستنەوە. دیارە کاریگەری دیکەش هەبوو، وەک بوونی کاری نەرێنی لەنێو سەرکردایەتیی کۆمەڵە و ململانێی نێوان باڵی زیندان و باڵی ئارام ...هتد. ئەمانە تا ساڵی ١٩٨٣ ئەوەندە تیژ نەبوون، پاشان زیاتر گەشەی کرد .

بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم، زۆربەی ئەندامەکان لەو کاتەدا بە خۆشمەوە، هێشتا لە ڕووی سیاسی و ئایدیۆلۆجییەوە کامڵ نەبووین و لە ئاستێکی باشی تێگەییشتندا نەبووین. زۆر جار لە ڕووی سۆزداری و شەخسییەوە ڕەدووی شتەکان دەکەوتین، نەک لە ئەنجامی قووڵبوونەوە و توێژینەوە.

لەو دەمەدا چەپەکان لە گەشەکردندا بوون، بوونی پارت و گرووپە مارکسییەکانی ئێرانیش کاریگەرییان هەبوو، گەندەڵی پارتە ناسیۆنالیستەکانیش زیاتر دەرکەوتبوو، هەموو ئەمانە ڕێخۆشکەربوون بۆ سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئەو بیروبۆچوونانە.

دیارە زۆرێک لە ئێمەش بە هیوای بیری مارکسی- لینینی هاتبووینە نێو کۆمەڵەوە، بەڵام کاتێ باڵی کوردایەتی لەنێو کۆمەڵەدا زاڵ بوو، زۆر لە هاوڕێیان تووشی نائومێدی بوون. بەڵام وازهێنانی ئەوانە و بەجێهێشتنی کۆمەڵە، کۆمەکی بەهیچ شتێک نەکرد، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ڕێگای بۆ ناسیۆنالیستەکان خۆش کرد، واتە، زیانی لە سوودەکانی زیاتر بوو.

ئەمانە هەموو پێکەوە نائومێدییەکی زۆریان لەنێو ڕێکخستنەکاندا هێنایە کایەوە و تەنانەت هێندێک لەوانە هەر بە یەکجاری وازیان لە کاری سیاسی هێنا.

ئەم دیاردەیە تەنها لەنێو شارەکاندا نەبوو، بەڵکوو لەنێو هێزی پێشمەرگەشدا هەبوو، بۆ هەر کەرت و تیپێکی پێشمەرگە دەڕۆییشتین، هەستمان پێی دەکرد و دەمانبینی. دۆخەکە بە جۆرێک تێک چووبوو، تەنانەت هەندێک جار دژایەتییەکە دەچووە ئاستی شەخسییەوە.

**سالار ڕەشید:** هەر وەکوو باست کرد، کێشەیەک لە نێوان ئێوە و بەڕێز "ئاوات ناسیح"دا هەبوو، ئەکرێ کێشەکە و هۆکارەکانی ڕوون بکەیتەوە؟

**سەلاح حەسەن پاڵەوان:** من ڕاشکاوانە دەیڵێم، ناکرێ لەنێو پارتێکدا کار بکەیت و ببیتە سێبەری پارتێکی تر، ئەمە پرەنسیپی سیاسەتە. من وەک لاوێکی ١٨-٢٠ ساڵی بڕوای تەواوم بە خەباتکردن لەنێو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا هەبوو،

ژیانی خۆم و کەسوکارەکەشم خستبووە مەترسییەوە، بۆیە هەموو هەوڵێکم بۆ پاراستنی یەکڕیزیی ڕێکخراوەکە بوو. هەروەها بڕوام بەهیچ توندڕەوییەکی کۆمۆنیستی نەبوو، بڕوام بە ئازادیی بیروباوەڕیش هەبوو، بەڵام دژ بەوە بووم، تۆ ڕێکخراوی کۆمەڵە بکەیتە سێبەر بۆ ڕێکخراوێکی تری وەک: ڕەوتی کۆمۆنیست، کۆمەڵەی ئێران، حزبی کۆمۆنیستی ئێران ... کە ئەو کاتە محەمەد کەلارە و ئاوات و کەسانی تر کە ناوەکانیان نازانم، هەوڵی ئەوەیان دەدا.

من هەر لە سەرەتای کارکردنم لە ڕیزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا بڕوام بەوە نەبوو، بەرپرسەکەمان کارێکی وا بکات، چونکە ئەو تاقە کەس بوو ئێمەی بە سەرووی خۆمانەوە دەبەستەوە.

بە هەر حاڵ ئەوان سەرقاڵی شتێک بوون، پێچەوانەی ئەو ڕێبازە بوو کە من کارم بۆی دەکرد، هەروەها لە ڕووی سیاسی و مۆراڵیشەوە دوو شتی دژ بەیەک بوون.

بەڵام گرفتەکە تەنیا هەر ئەوە نەبوو، بەڵکوو ئاوات لە ئەرکەکانی ڕێکخستنیش ساردی دەنواند و جۆرە مامەڵەیەکی سەیری دەکرد، وەکوو: جێبەجێنەکردنی ئەرکەکانی ناو ڕێکخستن، بەرەڵاکردنی ئەندامەکان و بەدەنگەوەنەهاتنیان ... زۆر هەڵسوکەوتی تر کە بوونە جێگەی نیگەرانی زۆر لە برادەرانی نێو شانەکانی من. ئەمانە ناکۆکی و ساردیی سیاسی (نەک شەخسی) خستە نێوان من و ئاواتەوە، بێجگە لەمانە، هیچ شتێکی دیکە نەبوون.

پێشتر من و ئاوات لە هەموو پەیوەندییە شەخسی و فیکرییەکاندا ڕێک و تەبا بووین، هاوڕێی نزیک و دڵسۆزی یەکتری بووین، لە دەرەوەی ڕێکخستنیش شتێک نەبوو بەناوی من و تۆ، نە پلە و پایە و نە بەشداریکردن و نەکردن لە کۆنفرانس. بەڵام دواتر ئەو ئاواتەی من سەرەتا مامەڵەم لەگەڵدا دەکرد، زۆر جیاواز بوو. هەرچەندە زۆر هەوڵی دا کاریگەریم لەسەر دابنێ و بمگۆڕێ و لەبەرامبەر کۆمەڵەدا ساردم بکاتەوە، بەڵام بێسوود بوو .

به هەر حاڵ، چەند هاوڕێیەک لە ڕێکخستنەکانی ئێمە پێشتر چووبوونە دەرەوە و یەکێک لەوانە، بێستوون (خەلیل دەروێش عەبدوڵا کە لە ساڵی ١٩٨٨ ئەنفال کرا) بوو. بێستوون لە ناوەندی کۆمەڵە لەلای فەرەیدوون عەبدولقادر بووە پێشمەرگە و منیش زوو زوو لەگەڵ کەسوکارەکەیدا سەردانیم دەکرد و لای ئەو گلەیی و گازندەی خۆم لەبارەی ڕێکخستن و ئاواتەوە دەکرد. ئەویش لەلای خۆیەوە ئەو گلەیی و گازندانەی بە ناوەندیی کۆمەڵە گەیاندبوو، ناوەندیش لە ڕێگای بێستوونەوە نامەیەکیان بۆ ناردم و باسی ئەوەیان کردبوو کە ئەوان ئاگاداری ئەو کێشانەن و بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی ١٩٨٢دا داوایان کرد کە سەردانی ئازاد هەورامی بکەم. کاتێک ئازادم بینی، ئەویش هەر باسی ئەو مەسەلەیەی کرد و تەنانەت لە یادمە گوتی: ئەوەی ئەو برادەرانە دەیکەن، کارێکی باش نییە و ئێوەش ئاگاداری خۆتان بن.

پاش ئەمە کارەکان هەر وا بە خراپی دەڕۆیشت و سەرەنجام چەند برادەرێ لە ڕێکخستن تەکینەوە و هیچ کارێک نەدەچووە پێشێ، تەنانەت نووسراو و بڵاوکراوەکانیشمان پێ نەدەگەیشت. ئاوات هەوڵی دەدا قەناعەت بە من بهێنێت کە واز لەو جۆرە ڕێکخستنە بهێنم، بەڵام ئەرگیۆمێنتەکانی لاواز و بێهێز بوون، کاریان لە من نەدەکرد. بۆ جاری دووەم پێش مفاوەزاتی یەکێتی و حکومەت لە ساڵی ١٩٨٣دا، بێستوون نامەیەکی بۆم نارد و داوای کردبوو بۆ کۆبوونەوەیەک لەگەڵ ناوەندیی کۆمەڵە بۆ گوندی خەتێ بچم. لە کەرکووکەوە بە نهێنی گەیشتمە ئەوێ و بۆ شەوەکەی لەوێ مامەوە و بۆ ڕۆژی دوای ئەوە چووم بۆ ماڵی سەید کەریم و لەگەڵ مامۆستا جەمال تاهیر و فەرەیدوون عەبدولقادر دانیشتم. ئەوانیش هەر وەک ئازاد هەورامی ئاگاداری کێشەکانی ناو ڕێکخستن بوون و هەر لەوێش تێگەییشتم کە مەسەلەکە لەوە گەورەترە کە من پێشبینیم دەکرد و لەوێ پرسیاری محەمەد کەلارەیان لێم کرد! بەڵام من هیچ زانیارییەکم دەربارەی ئەو نەبوو، لەوێ زانیم ئەویش هەیە.

هەر بۆ زانیاریی زیاتر، عەباس حەسەن، بەپێی گێڕانەوەی خۆی، لە سەردانێکدا بۆ ناوەندی کۆمەڵە، چاوی بە فەرەیدوون عەبدولقادر دەکەوێت و سەبارەت بە بارودۆخی ڕێکخستن و گرفتەکانی ئەو کاتە قسەی لەگەڵدا دەکات.

لەپاش کۆنفرانسی سێ شیرازەی ڕێکخستن ئیتر بەتەواوەتی تێک چوو، بەڵام هەموو ئەو هاوڕێیانەی کە لەگەڵ مندا بوون، هەتا ئەو ڕۆژەی من بەردەوام بووم، ئەوانیش وازیان لە کۆمەڵە نەهێنا.

**سالار ڕەشید:** دوای ئەوەی ئەو هاوڕێیانە وازیان هێنا، بەڕێزتم وەک بەرپرسی ئەو هاوڕێیانە ناسی کە مابوونەوە و سەرەنجام من کەرتەکەم ڕێکخستەوە و لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێی دیکە کە پێشتر لە کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن پەیوەندییان هەر بە خۆمەوە هەبوو، لەگەڵ ئەو هاڕێیانەی لای ئێوە کەوتینە کار و من بوومە بەرپرسی کەرتی شەهید سیروان. بەڵام لەدوای کۆنفرانسی سێ ئێمە وازمان هێنا ... پاش ئێمە، ئێوە ڕێکخستنەکانتان چۆن ساز دایەوە؟ ژمارەی ئەو ئەندامانەی کە مابوونەوە چەند دەبوون؟

**سەلاح حەسەن پاڵەوان:** پاش وازهێنانی ئاوات، بیرمە بەڕێزت لە ماڵەوە سەردانت کردم، لەو بارەوە قسەمان کرد، هەندێ ئەندامی نوێشت پێ ناساندم. لە پاش کۆنفرانس پێت ڕاگەیاندم کە پەیوەندی بە کەسێکی ترەوە بکەم، ئیتر پەیوەندیم بە مامۆستا قادرەوە کرد. کارەکان بەچاکی دەچوونە ڕێوە، بەڵام جۆرێک لە پەرتەوازەیی دروست بوو، کەسانێک لەنێو ڕێکخستنەکانی کەرکووک هەبوون، وەک مەڕی بێ شوانیان لێ هاتبوو، نەیاندەزانی چۆن دووبارە پەیوەندی دروست بکەنەوە، بۆیە زۆربەیان دەچوونە دەرەوە و لەوێوە لە ڕێگای نامەوە دووبارە پەیوەندییان بە ئێمە دەکردەوە، من بۆخۆم چەند حاڵەتێکی وام بینی، دواجار ژمارەی ئەو کەسانەی کە مانەوە ١٥ تا ١٨ کەسێک دەبوون.

**سالار ڕەشید:** کەی وازتان لە کۆمەڵە هێنا و بۆچی؟

**سەلاح حەسەن پاڵەوان:** لە ساڵی ١٩٨٥ چووم بۆ لای مامۆستا قادر و داوای وازهێنانم کرد، تەنانەت لەسەر هۆکاری وازهێنانەکەم نامەیەکیشم پێی دا، بەڵام نامەکەی بە هەند وەرنەگرت و گوتی من ڕازی نابم واز بهێنیت، دەتوانی ماوەیەک پشوو بدەیت، دەزانم ماندوویت، بەڵام نابێ ورە بەر بدەیت. بەڵام دوای ئەو چاوپێکەوتنە، جارێکی تر من مامۆستا قادرم نەبینییەوە، ئیتر ئەوە بوو دواتر گیرا و لە سێدارە درا.

ئەوەی شایانی گوتنە، کۆمەڵێک برادەر لە ناوچەی کاکەییەکان و لە گوندەکانی دەوروبەری داقووق ڕۆڵی زۆر گەورەیان لە دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی نەخۆشخانەی شۆڕش و یارمەتیدانی پێشمەرگە لە ڕووی داودەرمانەوە گێڕا. هەروەها چەند هاوڕێیەکمان چەندین ڕۆژ پێشمەرگەی برینداریان لەو دەرودەشتەی گەرمیان تیمار کردووە و تەنانەت جارێکیان تەیب و خەلیل دەروێش ئامێرێکی موخەدیریان لە نەخۆشخانەی کۆماری کەرکووک هێنایە دەرەوە و هەر بۆخۆشیان بۆ ناوچەی گەرمیان گواستیانەوە.

ئێمە نەک هەر خۆمان، بەڵکوو لە دەرەوەی ڕێکخستنیش کەسوکارمان وەک کەسانێکی ناڕێکخراو لە شاردنەوەی نووسراوە و چاپەمەنی و ڕۆنیۆی دەستی یارمەتییان دەداین، لە بازگەکانی حکوومەت نامە و نووسراویان بۆ دەگواستینەوە .

داوای لێبوردن لەو برادەرانە دەکەم کە ناویانم لە یاد کردووە، ئەم بابەتە بەجددی لە مێشک و هزری مندا دەمێکە کاڵ بووەتەوە و سیاسەت لای من جێگەیەکی ئەوتۆی نەماوە. هەر بۆیەش لەگەڵ ڕووداوەکاندا نەژیاوم و لە بەرچاوم کاڵ بوونەتەوە.

**هۆڵەندا**

**٢٠٢٠/٤/١٤**

# قادر سەی مستەفا (توانا)[٢٥٨]

## (یاداشت)

بە پێی زانیارییەکانی من سەبارە ت بە ئەسعەد حاجی عەزیز (شێخ دارا)، کومیتەی ئاگر و گرتن و ڕووداوەکانی کەرکووک: من و جەواد شێخ بەهادین پەیوەندیی ڕاستەوخۆمان لەگەڵ شەهید ئەسعەد هەبوو، هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠وە هەتا مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٨١ کە کۆمیتەی ئاگر کەوتە بەر پەلامار و گرتن و ڕاوەدوونانی ئەندامەکانی.

ئەسعەد دوای چەند ڕۆژێک کەوتە بەر شاڵاوی گرتنەکان و لەلای "ناوەندیی مەیسەلوون"ی کچان گیرا و زۆربەی ئەندامانی کۆمیتەی ئاگر گیران.

حەز دەکەم بۆ مێژوو بڵێم کە ئەسعەد ناوی منی نەدا و ئیعتیرافی لەسەر من نەکرد، لە کاتێکدا ئاگاداری پەیوەندییەکانی من بوو، وە ئاگادار بوو لەوەی چەند شانەیەک لای من هەیە، بەڵام هیچی لەسەر خۆم و پەیوەندییەکانم نەدرکاند.

---

٢٥٨. قادر سەید مستەفا (قادر مستەفا قادرئەمین) ناسراو بە قادر ئاڵتوونچی، لەدوای وازهێنانی لە کومەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، هەڵسووڕاوێکی ئەڵقە چەپەکانی شاری کەرکووک و ڕێکخراوی بەرەی ڕزگاریی زەحمەتکێشان (بەرزە) و یەکێتیی خەباتی کومۆنیستی بوو. لەدوای ڕاپەڕینەوە دووبارە پەیوەندی بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەکاتەوە و دواتر دەبێتە کارگێڕی بەشی پەیوەندییەکان لە مەڵبەندی دووی کەرکووک.

پەیوەندییەکانی من لەو دەمە دا بەم شێوەیە بوو:

یەکەم: شانەیەکمان لە گوندی "تەپەلوو"ی سەربە ناحییەی لەیلان هەبوو، کە پێک هاتبوو لە: شەهید محەمەد نازم (چیا)، ڕزگار سەعید و چەند برادەرێکی تر.

دووەم: بەختیار شێخ محەمەد کە بە بەخە بچکۆل ناسرابوو (کە دواتر و لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا، ئامر مەفرەزە بوو لە کەرتی چواری جەباری لەگەڵ مامە ڕیشەدا و پێشمەرگەیەکی ئازا و دیار بوو)، ئەحمەد شێخ حەسەن پەلکانەیی قەرەحەسەن کە لە ئەنفالەکاندا تێدا چوو.

ئەوەی شایانی باسە، هەر بە هۆی بەختیار و "محەمەد نازم"ەوە، گوندی تەپەلوو بووە قەلای پێشمەرگەکانی کەرتی چواری جەباری، بە شایەدی خەڵکی ناوچەکە.

سێیەم: خدر خورشید (شوان)، خەڵکی گوندی "جەوەجەوە"ی ناحییەی شوان بوو لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە.

دوای شاڵاوی گرتنەکانی کۆمیتەی ئاگر ئێمە بەرنەکەوتین و ماینەوە، پاشان پەیوەندیمان لەگەڵ کەرتی شەهید سیروان دروست کردەوە کە ئەو دەمە پەیوندییان بە تەهای "مەلا وەهاب"ەوە هەبوو.

دەستمان کردەوە بە کارکردن و من بوومە ئەندامی کۆمیتەی ئەو کەرتە لەگەڵ ئاوات ناسیح حەبیب و محەمەد ئەحمەد ڕەحمان.

لەسەروبەندی هەوڵدان بۆ دامەزراندنەوەی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک، داوایان لە کەرتەکەی ئێمەش کرد کە پەیوەندی بەوانەوە بکەین و لە دامەزراندنەوەی کۆمیتەدا بەشداری بکەین. سەرەنجام محەمەد ئەحمەد ڕەحمان وەک بەرپرسی کەرتەکەی ئێمە، لە پێکهێنانی کۆمیتەدا بەشداری دەکات و دەبێتە ئەندامی کۆمیتەی ڕێکخراوی کەرکووک و ئیتر پەیوەندیی ئێمە بە لادێوە کۆتایی هات.

**کەرکووک**

**٢٠١٨/٦/٩**

## فاتمه ئەحمەد محەمەد (ئالا ئەحمەد)

### (یاداشت)

ساڵی ١٩٧٠ کە بەیانی ١١ی ئازار درا، من تەمەنم شەش ساڵان بوو، ئەو کاتە لە قوتابخانەی شۆرجەی سەرەتایی لە شاری کەرکووک دەستم بە خوێندن کرد. بۆیە دەسپێکی خوێندم بە کوردی بوو.

هەر بەو بۆنەیەوە، ئاهەنگێکی زۆر گەورە لە نزیک گوندی حەسار ڕێک خرا و لەگەڵ کۆمەڵێک خزم و ناسیاو سواری پشتی گەلابەیەک بووین و ڕۆیشتین. لەوێ حەشاماتێکی یەکجار زۆری خەڵک و پێشمەرگەم بینی. ئەمە بۆ منی منداڵ زۆر جێی سەرنج و تێڕامان بوو، چونکە یەکەم جار بوو شتێکی وا ببینم.

لەگەڵ دەسپێکردنی دەوامدا، لە گۆڕەپانی قوتابخانەکە هەموو ڕۆژێ بە ڕیز ئەوەستاین و سروودی "ئەی ڕەقیب" و "خوایە وەتەن ئاوا کەی" و ئەوانی دیمان بە یەک ئاواز و پێکەوە دەوتەوە و ئیتر بەو جۆرە هەتا پۆلی پێنجەم بەردەوام بووین.

دواتر دۆخەکە تەواو گۆڕا، وردە وردە سروودە کوردییەکان قەدەغە کران. ئەو سروودانەی کە هەتا دوێنێ دەمانوتنەوە و بە چەپڵەڕێزان ئافەرین ئەکراین، کەچی

ئێستا کە ئەیلێینەوە، بەڕێوەبەر و یاریدەدەرەکەی بەسەرماندا هاوار ئەکەن: نەخێر ئەمە نا! "مرحبا یا معارک المصیر"! یان "وطن مجدا و ..." بلێن!

بۆ ئێمەی منداڵ ئەم گۆڕانە کتوپڕ و لەناکاوە زۆر ناخۆش بوو، زەحمەتیش بوو لێی حاڵی بین. بەڵام ئەم بەزۆر سەپاندن و دۆخە تازەیە، هۆش و بیری ئێمەی تا ڕادەیەک چالاک و هەستیار کردەوە و بەبێ ئەوەی بە خۆمان بزانین بەو منداڵییە خستمانییە نێو ململانێیەکی سیاسییەوە!

دوای ئەوە تەلەبەکان بووین بە دوو بەشەوە، بەشێکمان پێداگریمان لە وتنەوەی سروودە کوردییەکان دەکرد و هەتا هێزمان تێدا بوو دەنگمان هەڵدەبڕی، تا بتوانین بەسەر دەنگی ئەو بەشەی تردا زاڵ بین کە ملیان دابوو بە وتنەوەی سروودە عەرەبییەکان.

سەرەتای خوێندنی ساڵی ١٩٧٦ کە من لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم، چووینە قۆناغێکی تری سەرکوتکردنەوە، ئەویش ناونووسکردنی تەلەبەی پۆلی پێنجەم و شەشەم بوو بۆ دەورەی تەلایع.

ئەم دەورەیە ئەگەرچی خۆبەخشانە بوو، بەڵام بۆ من و چەند خوێندکارێکی دیکە، بەزۆر بوو. چونکە دەیانگوت ئێوە لە تەلەبە زیرەکەکانن و هاوڕێکانتان چاو لە ئێوە ئەکەن. من هەرچەندە بە نابەدڵی هاتبووم و هەستم بە شەرمەزاری دەکرد، بەڵام کاتێک کە چووم و ئەو کەشوهەوایەم بینی، ئەو هەموو کچ و کوڕە بەو جلوبەرگە نیزامییەوە مەشق ئەکەن، بەلامەوە خۆش بوو.

دوای ئەوەی کە بۆ ماڵ گەڕامەوە و بۆ باوکمم باس کرد، باوکم زۆر لە بەڕێوەبەرەکەمان و لەو زۆرداریەی کە "عەرەب" دەرهەق بە کورد ئەیکات تووڕە بوو. وتی: کچم قەینا، بەیانی خۆم دێم بۆ لای بەڕێوەبەرەکەتان و جلوبەرگەکەیان ئەدەمەوە، چۆن قبووڵ ئەکەم!

ئیتر هەر ئەو ڕۆژە بوو و جارێکی تر نەچوومەوە، خۆشییەکەی منیش کۆتایی پێهات!

دۆخەکە لە شاری کەرکووک هەتا دەهات خراپتر و هێرش و پەلامارەکانی بەعس توندتر دەبوونەوە. بەرە بەرە خوێندن کرا بە عەرەبی و خوێندن بە زمانی کوردی قەدەغە کرا، سەرەتا لە چەند وانەیەکەوە دەستیان پێ کرد.

بێگومان خوێندکار و مامۆستا گشت پەست، بێتاقەت و ناڕازی بوون، بەڵام کێ دەیوێرا بە ئاشکرا قسە بکات و شتێک بڵێ؟! دۆخەکە زۆر ناسک و دژوار بوو. بەعس وەک گورگی هار پەلاماری دەدا و باکی بەهیچ نەبوو .

لە ناوەندیی ١١ی ئازار مامۆستایان ست پەرژین و ست پەروین کە لەناو خوێندکاراندا یەکجار خۆشەویست بوون و ڕۆڵ و کاریگەری زۆریان بەسەرمانەوە هەبوو، گشت فرسەتێکیان دەقۆستەوە تا گیانی بەرەنگاربوونەوە و خۆشەویستی نەتەوە و نیشتمانمان تێدا بچێنن.

من ست پەروینم زۆر خۆش ئەویست و زۆر حەزم بە وانەکەی ئەو، زمانی کوردی بوو، بۆیە کاریگەری زۆری بەسەرمەوە هەبوو و یەکێک بوو لەو کەسانەی کە خستمییە نێو دنیای کتێب و خوێندنەوەوە .

یەکەمین کتێب لە ساڵی ١٩٧٨ 'تاریک و ڕوون'ی هێمن بوو کە لە پشووی نیوەی ساڵی پۆلی دووەمی ناوەندی خوێندمەوە. دواتر شیعرە حەماسییەکانی 'کوردم ئەمن، ڕقی پیرۆز ...'م لەبەر کرد و لە پۆلدا بۆ ست پەروینم خوێندەوە و ئەویش نیگایەکی پڕ لە خۆشحاڵی و ئافەرینی کردم.

لە هەمان کاتدا لەژێر کاریگەری خاڵۆم مستەفا گەرمیانی (مستەفا محەمەد خالید)[٢٥٩] کەوتمە نێو کەش و ناوەندێکی ڕۆشنبیریی ئەدەبیی سیاسییەوە. ڕۆڵی ئەو تەنها هەر ئەوەندە نەبوو کە ڕوو لە دنیای کتێب و خوێندنەوە بکەم، بەڵکوو فێری کردم چۆن خۆم و دەوروبەرەکەم بناسم و چۆن هەڵوێست لە هەر شتێک وەربگرم. فێری کردم لەبەرامبەر زوڵم و زۆر و بێدادیدا بوەستمەوە و وەک ئافرەتێک مافەکانم بناسم و بۆ بەدەستهێنانی تێ بکۆشم .

---

٢٥٩. مستەفا گەرمیانی، دوای بیست و پێنج ساڵ ژیانی ئاوارەیی و دەربەدەری لە دەرەوەی وڵات، بۆ کوردستان گەڕایەوە و وەک ڕۆژنامەنووسێک لە مەڵبەندی ڕووناکبیریی کەرکووک دەستی بە کار کرد. لە ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٧/١٦ و لە تەقینەوەیەکی تیرۆریستی گەورەدا پارچەیەکی بچکۆلە بەر دڵە گەورەکەی کەوت و بۆ هەمیشە بەجێی هێشتین.

بێگومان خۆمیش ئامادەیی و زەمینەی زۆرم تێدا بوو، تەنها لە مەسەلەی ئاین و بوون و نەبوونی خودادا نەبێ کە بە زەحمەت و دوای نموونە هێنانەوەیەکی زۆر تا قەناعەتم کرد. کە وازیشم لە دین و نوێژ و ڕۆژوو هێنا، ترسێکی کەمم هێشتا هەر مابوو!

ئێمە تەمەنمان هەر دوو ساڵێکی نێوان بوو، هاوڕێیەتیمان یەکجار بەتین و خۆشەویستیمان بێئەندازە بوو. ئەو پەیتا پەیتا کتێبی بۆم دەهێنا و منیش بە پەرۆش و ئارەزوویەکی زۆرەوە دەمخوێندەوە.

پێکەوە دەچووینە کتێبخانەی گشتی و کتێبخانەی ئاسۆ و زۆر هانی ئەدام کە خەڵکانی تر بناسم و تێکەڵییان بکەم. ڕۆژێکیان پێی وتم: پێکەوە ئەچین بۆ کتێبخانەی گشتی و هەندێ هاوڕێت پێ ئەناسێنم. من ئەگەرچی پێم خۆش بوو، بەڵام ترسێک دامی گرت و لەولاشەوە شەرمم دەکرد. بە هەر حاڵ پێکەوە چووین و هاوڕێکانی خۆی پێم ناساند. لەگەڵ هەر یەکەیان تەوقەم کرد و لەسەر مێزێک لەگەڵیان دانیشتم. کتێبێکم بەدەستەوە گرت و ئیدی هەتا هەستاین، سەرم لەسەر کتێبەکە هەڵنەبڕی و سەیریانم نەکرد!

ئەو جارە نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد و چەند هاوڕێیەکی تری پێم ناساند کە دواتر لەگەڵ نەوزاد نامەگۆڕینەوە و گفتوگۆ و ناردنی کتێب و نامیلکە لە نێوانماندا دروست بوو و پەیوەندیمان بەرەبەرە بەتینتر بوو، ئینجا هاتووچۆیماڵیانم دەکرد و لەگەڵ هەموو ئەندامانی خێزانەکەیاندا تێکەڵ بووم. لەگەڵ ئازادی برایشی بە هەمان شێوە نامەمان دەگۆڕییەوە و گفتوگۆمان دەکرد و هۆنراوەکانی خۆیشی بۆم دەنارد، تا ئەو دەمەی چووە دەرەوە و لە ڕاگەیاندنی مەڵبەندی چوار لە بالیسان بوو بە پێشمەرگە.

یەکێک لە هاوڕێکانی تری خاڵۆم، عەزەدین مەجید محەمەد (جەمال ئەیووب) بوو کە ئەو دەمە ناویم زۆر دەبیست و تەعاروفێکی کورتمان لە نێواندا هەبوو، بەڵام ساڵانێ درەنگتر لە نزیکەوە بووین بە هاوڕێ و پێکەوە کاری سیاسیمان دەکرد.

خاڵۆم و من بەردەوام پێکەوە بووین و گفتوگۆمان لەسەر بابەتی ئەدەبی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئایین و ژن و مافەکانی ...هتد. دەکرد.

هەر ئەو دەمە و هاوکات لە قوتابخانە و لەگەڵ بەشێک لە هاوڕێکانم، ئەوانەی کە گیانی بەرگری و کوردایەتییان تێدا بوو، دەستم بە ئاڵوگۆڕی کتێب کرد و چەند کۆڕ و کۆمەڵێکمان بۆ خۆمان دروست کرد. ئیدی هاوڕێم لە پۆلەکانی تریش هەبوو و لە کاتی پشووی نێوان وانەکانماندا پێکەوە دەوەستاین و قسەوباسمان دەکرد و کتێبمان دەگۆڕییەوە .

لە هەمـــان کاتـــدا وەک هەر گەنجێکـــی ئەو ســـەردەمە، شـــیعر و چیـــرۆک و پەخشـانمان بـۆ خۆمـان دەنووسـی و لە نێـوان خۆمانـدا دەمـانگۆڕینەوە و ڕەخنە و هەڵسەنگاندنمان بۆ دەکردن!

هەتا دوایی نزیکەی ٣٠ پارچە هۆنراوەم نووسـی و تەنهـا یەکێکیـانم بـۆ گۆڤـاری "کاروان" بۆ بڵاوکردنەوە نارد، ئەویش بە هاندانی هـاوڕێم نەوزاد ئەحمەد ئەسـوەد بوو، کە لە ژمارە ١٤یدا بڵاو کرایەوە .

هەر شتێکم کە ئەنووسی پێش هەموو کەس پیشـانی خـاڵۆمم ئەدا، ئەویش خـۆی شیعر و هـۆنراوەی دەنووسـی و بەنـاوی مسـتەفا گەرمیـانییەوە بـڵاوی دەکـردنەوە، منیش هەر نازناوی گەرمیانیم بۆ خۆم دانا.

ئیـدی کـاریگەریی ئەو کتێبـانەی کە دەمخوێنـدنەوە و بارودۆخێـک کە پیایـدا تـێ دەپەڕین، گشت وایان کرد، گیانی یاخیبوون و بەرگریم تێدا دروسـت بێت. یـاخی لە دژی بێدادی و چەوساندنەوە و زوڵم و زۆری بەعس. بۆیە پێم خـۆش بـوو شـتێک بـکەم، بەڵام نەمئەزانـی چـی و چـۆن! ڕۆژێـک بە خـاڵۆمم وت: ئەمەوێ نەشـرە بـڵاو بکەمەوە! خاڵۆم وتی: کچێ دانیشە، نەشرەی چی؟! بەڵام من ئەم خولیـایە مـاخۆلانی تـێ خسـتبووم، تـا ڕۆژێکیـان کە لە پـۆلی سـێی ناوەنـدی بـووم، دوای تەواوبـوونی دەوامـی مەکتەب، چـاوەڕێم کـرد و مـامەوە هەتـا دڵنیـا بـووم کە هەمـوو تەلەبەکـان ڕۆییشتوون و کەس لەو دەوروبەرە نەماوە، ئینجا وێنەیەکی ئەحمەد حەسـەن بەکر (سەرکۆماری عێراق) کە بە دیواری پۆلەکەمـانەوە هەڵواسـرابوو، دامگـرت و پـارچە پـارچەم کـرد! دڵـم ئـۆخەی کـرد و هەسـتم بە ئـارامییەکی زۆر کـرد، پـێم وابـوو چالاکییەکی گەورە و باشم ئەنجام داوە!

ڕۆژی دوایی کە چووینەوە بۆ دەوام، مەکتەب و ئیدارە گشت شڵەژا بوون، مەسەلەکە گەورەوە ببوو! ئیتر لیژنەی ئەمن و بەرپرسانی بەعس هاتن و کەوتنە لێکۆڵینەوە، هەتا ماوەیەکی باش وازیان نەئەهێنا و ئەیانویست بزانن کێ ئەو "تەخریب"ەی کردووە.

هەر ئەو ساڵە، کاتێک مەلا مستەفا (بارزانی) مرد و هەواڵەکە بڵاو بووەوە، پۆلەکەی ئێمە هەموو قسەمان کردە یەک و ڕێکەوتین کە بۆ ڕۆژی دواتر هەموومان جلی ڕەش بپۆشین و خوێندن ڕابگرین، چونکە ئەمانگوت، مەلا مستەفا سەرۆکی کوردە و ئەبێ هەموو پرسەی بۆ بگێڕین !

ڕۆژی دواتر، وانەی یەکەممان عەرەبی بوو، مامۆستای ئەو وانەیە، ست فاتمە خەڵکی باشووری عێراق بوو، هاتە پۆلەوە و ویستی دەست بە وانەوتنەوە بکات، یەکێک لە تەلەبەکان کە ناوی ئەمیرە کاکەخان بوو، وتی: ست! ئێمە پرسەمان هەیە و دەرس ناخوێنین، باوکی کورد مردووە! ئێمەش هەموو بە دوایەوە بۆمان سەندەوە! ست فاتمە زۆر بەئارامی لەگەڵمان دوا و هەوڵی زۆری لەگەڵمان دا کە واز بهێنین و خۆمان و کەسوکارمان تووشی کێشە نەکەین. بەڵام سوودی نەبوو و ئێمە لەسەر هەڵوێست و قسەی خۆمان هەر سوور بووین! ئیتر دوای ئەوە ئیدارەی ئاگادار کردەوە و ست گوڵاڵەی بەڕێوەبەر هات، دواتر لیژنەی حیزبی ئاگادار کرایەوە و مەسەلەکە زۆر گەورەوە بوو. هەتا ماوەیەکی باش کەوتنە بگرەوبەردە لەگەڵ ئەو تەلەبانەی کە گومانیان لێیان دەکرد و لە پشتی ئەم بەزمەوە بوون .

جا ئەو ڕۆژە کە گەڕامەوە بۆ ماڵ، زۆر بە شانازییەوە بۆ باوکمم باس کرد و وتم: ئەمڕۆ وامان کردووە. باوکم هەر ئەوەندە گوێی لەو قسەیە بوو، زۆر تووڕە بوو! وتی: تۆ سەرمان ئەکەی بە قوڕا، شتی وا چۆن ئەبێ، ئێستا کەی کاتی ئەمەیە؟! من چاوەڕێی ئەوە بووم ئافەرینم کات! ئێ چووزانم، ئەو چەندەها جار وەک بۆ کەسێکی گەورە قسە بکات، ئاوا قسەی بۆم دەکرد، باسی کورد و کوردایەتی و ستەمگەریی "عەرەبی" بۆم دەکرد!

دوتر لە ئامادەیی فەلەستینی کچان، ئێمە، خوێندکارە کوردەکان دۆخێکی زۆر تایبەت و ناخۆشمان هەبوو. قوتابخانەکە لە گەڕەکێکی عەرەبی بوو و زۆربەی

مامۆستا و تەلەبەکان عەرەب و تورکمان بوون و کەشێکی میلیتاری و بەعسییانە بەسەر قوتابخانەکەماندا زاڵ بوو. ئەوانە گشت ئەگەرچی فەزای ترس و خۆفی دروست کردبوو، بەڵام لای بەشێک لە خوێندکارانیش گیانی یاخیبوونی بەهێز دەکرد.

لەبیرمە ڕۆژێکیان هەڵبژاردنی لیژنەکانی ئیتیحاد تەلەبە بوو، دەبووایە هەموو بەشداری تێدا بکەین. منیش بەو هاوڕێیانەی خۆم کە زۆر متمانەم پێیان هەبوو، وت: وەک نارەزایەتییەک، کاغەزی دەنگدانەکە بە سپێتی بخەنە ناو سەندووقەکەوە! یەکێکیان، دیار بوو زۆر ئەترسا، وتی: دە لا لا فاتمە، ئەمەی تۆ ئەیڵێی ئیشی کوڕە!

لە ڕێکەوتی ١٩٨١/١٢/٢٦دا خاڵۆم بەناوی ئەوەی بۆ تەواوکردنی خوێندن، بۆ دەرەوەی وڵات ئەچێت، ماڵئاوایی لێمان کرد. بەڵام لەڕاستیدا بە نیازی پێشمەرگایەتی چووبووە شاخ و چیرۆکی چوونە خاریجەکەیشی هەر لەبەر ئێمە داهێنابوو. ئیتر لەو ماوەیەدا ئەو نامەی بۆ من و من بۆ ئەوم دەنارد. ئەو نامەکانی خۆی لە ئێرانەوە بۆ هاوڕێکانی خارجی دەنارد و نامەکانی منیش هەر لەوێوە دەگەییشتنە دەستی، بەڵام بە جۆرێک ئەم کارەی ڕێک خستبوو، من هەر وام دەزانی بەراستی ئەو نامانە لە خاریجەوە دێن. ئەوەی شایانی باسە، من لە نامەکانمدا ڕەخنەم لێ دەگرت و پێم دەگوت، ئەو دەبوو بۆ شاخ بچووبایە و ڕێگای خاریجی نەگرتایەتە بەر.

لەدوای حەوت مانگێک هەواڵمان پێ گەییشت کە خاڵۆم لە گوندی "نۆدێ"یە و ئەیەوێت بمانبینێ. ئەم هەواڵە ئێمەی تووشی شۆک کرد! بە هەر حاڵ چووین بۆ لای و بینیمان. ئیتر ئەو دەمە باسی ڕاستیی سەفەرەکەی بۆمان کرد و وتی: هەر لە سەرەتاوە من بۆ پێشمەرگایەتی هاتم، بەڵام لە وەزعەکە ڕازی نیم و ئەوەی لە دوورەوە دەمانبیست، زۆر لە ڕاستییەوە دوورە و هەتا لە نزیکەوە نەیبینی، نازانی چۆنە! بۆیە ئێستا ئەمەوێت بەڕاستی بۆ خاریج بچم و هەر بۆ ئەو مەبەستەش ئێوەم بانگ کرد، تاوەکوو پێش سەفەرەکەم چاوم پێتان بکەوێت.

ساردینی هاوڕێم (ساردین محەمەد جەبار) کە پێکەوە لە ئامادەیی فەلەستینی کچان دەمانخوێند. دەیزانی من بایەخ بە کتێب و خوێندنەوە دەدەم، ڕۆژێکیان وەک

بزانم سەرەتای ساڵی ١٩٨٢بوو، هات بۆ لام بۆ پۆل و پێمی وت: فاتمە هاوڕێیەکم هەیە کتێبی زۆری هەیە، ئەگەر ئەتەوێت، بۆت ئەهێنم. منیش گوتم: بەڵێ، بەخۆشحاڵییەوە! دوای ئەوە لیستێکی گەورەی لە ناوی ئەو کتێبانە بۆم هێنا. منیش کە تەماشام کرد، بەشێکی کەمی نەبێ، زۆربەیانم خوێندبووەوە.

ئیتر هاوڕێکەی ئاگادار کردەوە و ئەویش چەند جارێک کتێبی بۆم نارد. دواتر نامە و نامەگۆڕینەوە کەوتە نێوانمان و لە نامەکاندا گفتوگۆمان دەکرد .

لەدوای چەند مانگێک لە یەکێک لە نامەکاندا بۆمی نووسیبوو کە پێویستە گرنگی زیاتر بە خوێندنەوەی کتێب و بابەتە سیاسییەکان بدەین، کتێبی ئەدەبی، شیعر و چیرۆک و ڕۆمان ڕۆڵ و کاریگەرییەکی ئەوتۆی بەسەر کۆمەڵگەوە نییە و گۆڕانکاری دروست ناکات. منیش لە نامەیەکی دووروودرێژدا ڕەخنەم لە بۆچوونەکەی گرت و ڕۆڵی ڕۆمانی "دایک"ی ماکسیم گۆرکیم بە نموونە بۆی هێنایەوە.

بە دوای ئەم نامەیەدا، ساردین وتی: ئەو هاوڕێیە پێی خۆشە لە نزیکەوە یەکتری ببینن. ئەگەرچی ئەو داوایە منی خستە قەلەقییەوە، بەڵام سەرەنجام قبووڵم کرد و مەوعیدێکمان لە بەردەم کتێبخانەی گشتی دانا و ناونیشانی منی بەو و هیی ئەوی بە من دا .

بۆ ئەو مەوعیدە ساردین نەهات و ئەو هاوڕێیە وای پێ باش بوو تەنها هەردووکمان بین. دواتر زانیم، ئەم هەنگاوانە گشت بە مەبەستی کاری سیاسی و ئامادەکاری بۆ کاری ڕێکخستن بووە.

لە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٤/٢٢دا، کە دێتەوە بیرم دوو ڕۆژی مابوو بۆ یادی بۆمببارانی شاری قەڵادزێ، لەگەڵ ئەو هاوڕێیە یەکترمان ناسی، ئەویش ئاوات ناسیح حەبیب بوو .

لەگەڵ ئاوات بەدەم گفتوگۆ و قسەوباسی جۆراوجۆرەوە کەوتینە ڕێ بەنێو کۆڵانە پێچاوپێچەکانی لای زیووت نەباتی و ئەڵماس و ئەمە چەند سەعاتێکی خایاند.

یەکێک لەو بابەتانەی دێتەوە بیرم کە گفتوگۆی زۆرمان لەسەر کرد، باسی مارکسیزم و کۆمۆنیزم بوو. من وتم: مارکسیزم و سۆشیالیزمم قبووڵە، بەڵام شیووعییەت نا! ئاوات بزەیەک گرتی و وتی: ئێ شیووعییەتیش هەر ئەوەیە، بەڵام پلەیەک بالاتر ... کەمێک لەسەر ئایینیش قسەمان کرد، بەڵام لەو بارەیەوە هاوڕا بووین و هیچ ناکۆکییەک لە نێوانماندا نەبوو.

لەدوای ئەوەوە بە بەردەوامی و زوو زوو یەکمان ئەبینی و تا دەهات قسە و گفتوگۆ و هاوڕێیەتییەکەمان چڕتر و بەتینتر دەبوو. دوای ماوەیەک دانیشتنەکانمان بردە ماڵەوە. لەگەڵ پەری خوشکی و ساردینیش کە لەگەڵ یەک دراوسێ بوون، دانیشتن و گفتوگۆم دەست پێ کرد و ئەوانیش هاتوچۆی منیان دەکرد و بۆ ماڵمان دەهاتن.

ئەو ساڵە ئاوات و من لە پۆلی شەشەمی ئامادەیی بووین، بارودۆخی سیاسی جۆشی سەندبوو، بەردەوام گوێمان لە ڕادیۆی یەکێتی دەگرت، نزیک تاقیکردنەوەکانی بەکەلۆریی پۆلی شەشەم، لە گەلێک لە شار و شارۆچکەکانی کوردستان و لە کەرکووکیش خۆپیشاندان دەستی پێ کرد. ئێمە ئەوەندەی فکرمان لەلای ئەم بارودۆخە بوو، چارەکی ئەوە لەلای خوێندن و دەرس و دەور و موراجەعە نەبوو.

پەیوەندیی ئاوات و من ڕۆژ لەدوای ڕۆژ نزیکتر دەبووەوە و هەتا دەهات باسەکانمان لە ڕووی سیاسییەوە چڕتر دەبوونەوە و شکڵی ڕێکخستنی وەردەگرت کە من زۆر پێی دڵخۆش بووم.

ئاوات بە حوکمی ئەوەی بنەیەکیان لە خاڵۆبازیانی بوو و هاتووچۆی ئەوێی دەکرد، جارێکیان باسی مامە ڕیشەی بۆم کرد و وتی: ئەگەر حەز بکەیت نامەی بۆ بنێری، ئەوا ئەتوانم بیگەیەنمە دەستی، منیش زۆرم پێ خۆش بوو. لەدوای ئەوە دەستم بە نامەناردن کرد، نامەی گڕدار و حەماسی، کە سروودی "ڕێی خەباتمان"، شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس، ڕەفیق سابیر و زۆری دیم تێدا دەنووسییەوە.

جارێکیان ئاوات گێڕایەوە و وتی: مامە ڕیشە بە نامەکانت زۆر دڵخۆشە، ئەمجارەیان کە بۆیم خوێندەوە، کێشای بە ڕانی خۆیدا و وتی: پەکووووو ئاوەی برام، ئەمە بەرد ئەتاوێنێتەوە!

ئیتر بەو جۆرە نامەیەکی زۆرم بۆ مامە ڕیشە نارد و ئەویش نامەی بۆ من دەنارد. دیارە مامە ڕیشە خوێندەواری نەبوو، ئاوات نامەکانی منی بۆ دەخوێندەوە و پاشان مامە ڕیشە چی بگوتبایە، ئەو بۆی دەنووسی و بۆ منی دەهێنایەوە. سەرەنجام جارێکیان داوای کردبوو کە ببینم. چەند جارێک ویستمان بۆ ئەو مەبەستە سەفەرێک لەگەڵ پەری و ساردین ڕێک بخەین، بەڵام هەر نەگونجا و نەمانتوانی.

هەر لەو ماوانەدا و چەند مانگێک بەر لە خۆپیشاندانی (١٩٨٢/٥/٦)ی شاری کەرکووک، شەهید نەجات (نەجات سلێمان ڕەحمان) کە هاوڕێی سەمەدی برام بوو، هاتوچۆی ماڵمانی دەکرد و بۆ لای ئەو دەهات. بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، وردە وردە تێکەڵی و ئاشنایەتی لەگەڵ منیشدا زیادی کرد و زۆر جار پێکەوە گوێمان لە ڕادیۆی یەکێتی و هەواڵەکان دەگرت و دەکەوتینە نێو قسەوباس و گفتوگۆوە.

لەو ماوەیەدا هەستم بە گۆڕانێک لە سەمەددا دەکرد، دەستی کردبوو بە خوێندنەوەی کتێب و زۆر کات خەریک بوو، کاتێکیش دەچووم بەسەردا، شپرزە دەبوو. هەستم بە شتێکی نوێ و شاراوە دەکرد.

نەجات کەسێکی ئارام و سەنگین و کۆمەڵایەتی بوو، هەر زوو بوو بە یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەمان و دایک و باوکم وەک منداڵەکانی خۆیان خۆشیان دەویست.

لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٨٢دا پەیوەندیم بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد. بە هۆی ئەوەی نەجات و سەمەد و من زۆر پێکەوە دادەنیشتین و قسەوباسمان دەکرد، ئێستا زۆر لەلام ڕۆشن نییە کە لەلایەن کامیانەوە موفاتەحە کرام. بەپێی بیرەوەری سەمەد بێت، من لە لایەن سەمەد خۆیەوە موفاتەحە کراوم، کە ئەویش پێش من بە چەند مانگێک لە لایەن نەجاتەوە ڕێک خراوە. دوای ئەوە منیش چوومە پاڵیان و شانەیەکی سێ کەسیمان پێک هێنا، کە نەجات بەرپرسی بوو. ناوی نهێنی من، ئاڵا و نەجات، خەبات و سەمەد، هەتاو بوو.

شانەکەمان سەر بە ڕێکخستنەکانی کەرتی شەهید سیروان بوو کە من درەنگتر زانیم محەمەد ئەحمەد ڕەحمان (دەرسیم) بەرپرسی بوو .

ئەو دەمە سەمەد ١٧ ساڵ و من تەمەنم ١٨ ساڵ بوو.

زۆری پێ نەچوو ئاواتم بینی، زۆر پەست و بێتاقەت بوو و وتی، لە کۆبوونەوەی خۆماندا زانیومە کە هاوڕێ نەجات تۆی موفاتەحە کردووە و

پەیوەندیت بە ڕێکخستنەوە کردووە. لە کاتێکدا تۆ چەند وەختە ئەڵقەی ڕۆشنبیری منی و ویستوومە موفاتەحەت بکەم، بەڵام ئەو هاوڕێیانە (مەبەستی نەجات و محەمەد بوو) پێشم کەوتوون و پەیوەندییەکەی منیان بۆ خۆیان بردووە و ئەمەش نائوسوولییە! ئەوان ئاگاداری پەیوندیی من و تۆ هەن، چونکە لە کۆبوونەوەی خۆماندا باسی تۆم کردووە و ئەوان بە مەبەستەوە خۆیان لە تۆ نزیک کردووەتەوە، تا موفاتەحەت بکەن!

دوای ئەوە من لەو مەسەلەیەم نەکۆڵییەوە هەتا ماوەیەک بەر لە ئێستا و لە گفتوگۆیەکدا سەمەد وتی: کاتی خۆی من خۆم بۆ کۆمەڵە موفاتەحەتم کردووە، ئینجا نەجاتم لێ ئاگادار کردووەتەوە. کەواتە: ئەوەی ئاوات بۆی چووە، هەر گومان بووە و لەڕاستیدا وا نەبووە.

بەو جۆرە من لە دوو لاوە پەیوەندیم هەبوو! لەگەڵ ئاوات زوو زوو یەکترمان دەبینی و لەسەر زۆر مەسەلە و بابەتی کۆمەڵە گفتوگۆ و قسەوباسمان دەکرد، لەولاشەوە لەگەڵ سەمەد و نەجات کۆبوونەوەی دەوریمان دەکرد و ئابوونەم ئەدا و بابەتەکانی کۆمەڵەمان دەخوێندەوە و تاوتوێمان دەکردن.

زۆری بەسەردا تێ نەپەڕی کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە هاتە پێشەوە کە دەبوو لە مانگی ئابی ئەو ساڵە (١٩٨٢)دا ببەسترێت. ئاوات وتی: پێم باشە و زۆر گرنگە تۆ وەک ئافرەتێک بەشداری کۆنفرانس بکەیت، لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەش باسی ئەکەم، چی ئەڵێی؟ منیش وتم: لە کوێ و چەندمان پێ ئەچێ؟ وتی: دوو هەفتەیەک! وتم ئەو ماوەیە زۆر زۆرە، چی بە ماڵەوە بڵێم؟ هیچ فێڵ و درۆیەک نایخوا و زەحمەتە.

بێگومان زۆر حەزم دەکرد ئەو هەلەم لە دەست نەچێت و بەشداری بکەم، بەڵام سەخت و مەحاڵ بوو. ئەگەرچی من لەناو شارەکەی خۆماندا ئەمسەر و ئەوسەری زۆرم دەکرد و چوونەدەرەوەم زۆر بوو، بەڵام لە سنووری ئەودیوی شار نەترازابوو، بۆیە وازمان لەوە هێنا.

هەر ئەو کاتە ئاوات پرسیاری لێم کرد، بەڕای تۆ مەیدانی کار و خەباتی کۆمەڵە، کوردستانی گەورە بێت؟ یان کوردستانی بەشی عێراق (کوردستان-عێراق)؟

منیش کە تازە چووبوومە ریزی ڕێکخستنەوە و هێشتا شتێکی ئەوتۆم لەو بارەوە نەدەزانی، هەر بە فکر و لێکدانەوەی خۆم، کوردستانی بەشی عێراقم بە

ڕاست و باش دەزانی و هەندێ هۆکار و بنەمای سادەشم بۆ قسەکانم هەبوو. ئاوات ئەمەی پێ خۆش بوو، چونکە قسەکانی من لەگەڵ ڕا و بۆچوونی ئەو یەکیان دەگرتەوە. بۆیە گفتوگۆیەکی باشمان لەو بارەیەوە کرد و لە دواییدا وتی: بۆچی ئەم ڕا و بۆچوونەی خۆت ناکەیت بە ڕاپۆرتێک و بۆ سەرەوەی بەرز ناکەیتەوە؟ ئێستا لەبیرم نییە و نازانم ئایا ئەوەم کرد، یان نا؟

دوای ماوەیەک، ئیتر چوونە دەرەوە و هاتوچۆم زۆر بوو. ڕۆژێکیان ئاوات بە بزە و پێکەنینەوە پێمی وت: ئاڵا جووڵەت زۆرە، ئەترسم ئیختیتافت بکەن! ئینجا وتی: وام پێ باشە ناوی نهێنیت بگۆڕی، ئەگەر پێت خۆش بێ، من ناوی (تانیا)ت بۆ دائەنێم. وتیشی، تانیا کچە شۆڕشگێڕێکی ڕووسی بووە. منیش ئەو پێشنیارەم پێ باش بوو، ئیدی ناوە نهێنییەکەم گۆڕی بە تانیا.

ئێمە هەر لە سەرەتاوە وەک کەسانی کۆمۆنیست و چەکدار بە بیروباوەڕی مارکسیی لینینی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە پەیوەست بووین. ڕزگاری چینی کرێکار و خەڵکی زەحمەتکێش و دامەزراندنی سۆشیالیزم و کۆمۆنیزم ئامانج و ئاواتمان بوو، چارەسەری کێشەی میللی و مافی دیاریکردنی چارەنووس بۆ گەلی کورد، بە مافی خەڵکی کوردستان و خەبات لەو پێناوەدا بە ئەرکی خۆمانمان دەزانی.

پاش ماوەیەک بابەتی پۆپۆلیزم و ڕیڤیژینیزم بوون بە بابەتی گەرمی کۆبوونەوەکانمان و کەوتینە ڕەخنەگرتن و ناڕەزایەتی لە بەرنامە و سیاسەتی کۆمەڵە و پێمان وابوو لە مارکسیزم لای داوە. تا گەیشتین بەوەی لە تەمووزی ساڵی ١٩٨٣دا نامەی وازهێنانمان لە کۆمەڵە نووسی و بەکۆمەڵ کشاینەوە.

ئێمە (نەجات و سەمەد و من) لە شانەکەی خۆمان قسەوباسمان زۆر کرد، سەمەد قەناعەتی بە وازهێنان نەبوو و زۆری پێ ناخۆش بوو، ئەو لە بنچینەدا بیرکردنەوەی لەسەر بنەمای نەتەوەیی و کوردایەتی بوو، نەک مارکسیزم-لینینیزم و مەسەلەی چینایەتی، هەر بۆیە زۆر گیر بوو و لە دواییدا بەناچاری لەگەڵ ئێمەدا وازی هێنا، بەڵام نامەی وازهێنانی هەر نەنووسی!

هاوڕێیەکی تر بە ناوی دڵشاد ئەحمەد کە پەیوەندی بە منەوە هەبوو، وە پێشتر پەیوەندی بە محەمەد ئەحمەد ڕەحمانەوە هەبوو، لە وازهێناندا گیر بوو و پێی قبووڵ نەدەکرا، بەڵام دوای هەندێک گفتوگۆ، قەناعەتی کرد.

دڵشـاد کچێکـی خەڵکـی سـەرکارێز بـوو، لەگەڵ مـحەمەد ئەحـمەد خوێنـدکاری کـۆلێجی ئەنـدازیاریی بـوو لە زانکـۆی تەکنەلـۆجی لە بەغـدا. سـاڵانی دواتـر بـوو بە ئەندازیار و لە شەریکەی مەنسوور یەکمان گرتەوە، کە من ئەو دەمە لەو شـەریکەیە لە بەشی ژمێریاری فەرمانبەر بووم .

ئەو کاتـانەی دڵشـاد و مـن لە ڕێکخسـتنەکانی کـۆمەڵەدا پەیوەنـدیمان بە یەکەوە هەبـوو، برایەکـی بەنـاوی فەخـرەدین بـۆرپچی لەلایەن ڕژێمـی بەعسـەوە گیرابـوو، دواتر بێ سەروشوێن کرا.

لە سـاڵی ١٩٨٢-١٩٨٣ کە چـوومە پەیمانگـای تەکنیکی کەرکـووک، لەوێ کـۆمەڵە کەسـێکم ناسـی و لێیـان نزیـک بـوومەوە و گفتوگـۆی ئەدەبـی و سیاسـیمان دەکـرد. هەنـدێک لەوانەم وەک ئەڵـقەی ڕۆشـنبیری لەبەرچـاو گرتبـوو و زیـاتر لێیـان نزیـک بـوومەوە، ئەوانەش: نیهـایەت سـەعید خەڵکـی کەرکـووک و نـازەنین مـحەمەد کە کچێکی وریا و هۆشیار و ڕۆشنبیر و خەڵکی هەولێر بوو، بەداخەوە ساڵانێ دواتـر بیستم کە بە نەخۆشی شێرپەنچە و زۆر بە گەنجی گیانی لەدەست داوە. هەروەهـا خوشک و برایەک بە ناوەکانی کەوسـەر و قاسـم، نـاوی باوکیـانم بـاش بیر نییە کە خەڵکی کۆیە بوون. هەریەک لەم هاوڕێیـانەم بەجیا دەبینی و قسەوباسـم لەگەڵیاندا دەکرد.

کەسـێکی تـر کە هەر خزمـی خۆمـان بـوو بەنـاوی نەجیبە فەتـاح، خوێنـدکاری کـۆلێجی ئیـدارە و ئیقتیسـاد بـوو لە زانکـۆی بەغـدا، بە شـێوەی دەوری هـاتوچۆی یەکتریمـان دەکـرد و کتێبمـان دەگـۆڕییەوە و لەبـارەی مارکسـیزمەوە گفتوگـۆمـان دەکرد.

ئەم هاوڕێیـانە هەریەک بە پـلەی جیـاواز پەیوەنـدیم لەگەڵیانـدا هەبـوو و بەو نیازەی کە بۆ ڕیزەکانی کۆمەڵە ڕێکیان بخەم. بەڵام پێش ئەوەی بگەم بەوە، خۆمـان لە کۆمەڵە بێئومێد بووین و وازمان هێنا .

دوای وازهێنانمـان لە کـۆمەڵە لە خەبـات و کـار و چـالاکی خۆمـان هەر بەردەوام بووین، بەڵام بە شێوازێکی تر و بە گوڕ و تینێکی نوێوە.

ئـێمە ئەو دەمە کەوتیـنە ژێـر کـاریگەریی مارکسـیزمی شۆڕشـگێڕی ئێـران و دەستمان کرد بە پێکهێنانی ئەڵقەی ڕۆشنبیری و کەوتینە خوێندنەوەی نووسراوە ئەسڵییەکانی مارکسیزم و دیراسەکردنی نووسراوەکانی مەنسوور حیکمەت .

پاشان ئەڵقە و گرووپە کۆمۆنیستییەکان هاتنە کایەوە کە هەر گرووپێک نووسین و بڵاوکراوەی خۆی هەبوو، ناوەڕۆکی زۆربەیان لەیەک دەچوو، ئەم دەست و ئەو دەستیان پێ دەکرا.

مـــن لەو دەورانەدا پەیوەنـــدی و کۆبـــوونەوەم لەگەڵ ژمـــارەیەکی فـــراوان لە هەڵسـووڕاوانی ئەو کـاتەدا هەبـوو کە لەنێو ئەڵقەی دوو کەسـی و سـێ کەسـیدا بە شـێوەی دەوری کـۆ دەبـووینەوە و تـاوتوێی ئەو بیروبۆچـوون و نووسـراوانەمان دەکرد کە ئەو دەمە لەنێو بزووتنەوەکەدا بڵاو بوون.

محەمەد ئەحمەد ڕەحمـان یەکێک بوو لەو هاوڕێیانە و پەیوەندی زۆر نزیکمـان هەبـــوو. بە جۆرێـــک کە بە شـــێوەیەکی دەوری کـــۆ دەبـــووینەوە و لەنێـــو کۆبوونەوەکانماندا نووسراوە و کتێبمان دەخوێندەوە و لەسەر بابەتی تیۆریی گرنگ بۆ ئەو دەمە گفتوگۆمان دەکرد .

محەمەد ئینسانێکی زۆر ئارام، بەڕێز، خۆشەویست، بەتوانا و زیرەک بوو.

هەروەها ئەوەنـدەی بێتەوە یـادم، لەگەڵ ئەم هاوڕێیـانەی خـوارەوەش لەو جۆرە ئەڵقانەدا قسەوباسم هەبووە:

مەلا ئەمین و فەریدە و پیرۆزی خوشکەزای، کاروان ئەسـعەد و پشـتیوان (فەتـاح ناسیح حەبیب) کە ئێستا هاوسـەری نەجیبەی خوشکمە، جوان ئەمین عەبـدولڕەحمان کە لە پەیمانگـای تەکنیکـی کەرکـووک پـێکەوە بـووین و هـاتوچۆی مـاڵی یەکتریمـان دەکـرد و بەو هـۆیەوە جەمیـل (جەمیـل ئەمـین)م ناسـی و لەگەڵ ئەویشـدا کـۆڕی سیاسـی و قسەوباسـمان هەبـوو. سـوزان مەولـوود مـحەمەد، نەوزاد مەلا عـومەر، نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد و عەزەدین مەجید (جەمال ئەیووب)، ئازاد مەجید، نەجیبەی خوشکم.

دیارە هەر لە سـەرەتاوە نزیکترین پەیوەنـدییەکانی مـن لە کـاری سیاسـیدا لەگەڵ ئـاوات ناسـیح بـوو، بـۆیە کاتێک لە ناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٨٦ بـۆ خـولێکی سیاسـی-

نیزامی بۆ لای حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و کۆمەڵە ڕۆییشت، پێمی وت: بە هاوڕێیەکت دەناسێنم، تا لەگەڵ ئەودا کۆببوونەوە و دانیشتن بکەن، ئەویش سالار ڕەشید بوو کە دواتر پەیوەندیی خۆشەویستی لە نێوانماندا دروست بوو و هاوسەرگیریمان کرد، ئێستا کوڕ و کچێکی گەنج و جوانمان بە ناوی "ئۆژین و ڕێڤین"ەوە هەیە.

جگە لەم هاوڕێیانە کە بە شێوەیەکی دەوری یەکترمان دەبینی و نووسراو و بڵاوکراوەمان دەخوێندەوە و گفتوگۆمان لە بارەیانەوە دەکرد. هاوڕێیانێکی تریشم بە بەردەوامی دەبینی و گفتوگۆی سیاسیمان لە بارەی دۆخی ئەو کاتەوە دەکرد، باسی مەسەلەی ژنان و هەوڵ و تێکۆشان لە پێناوی بەدەستهێنانی مافەکانیدا دەکرد. هەروەها دەربارەی خێزان و کێشە کۆمەڵایەتییەکان دەدواین. لەوانە: ساردین محەمەد جەبار، پەری (خوشکی ئاوات ناسیح) کە ئێستا هاوسەری سەمەدی برامە، شلێر ڕەشید (خوێندکاری کۆلێجی ئاداب، بەشی کوردی لە زانکۆی سەلاحەدین)، ژیان ئەحمەد ڕەحمان (کرێکاری کارگەی کاشیی لەیلان)، ئەدیبە ئەحمەد ڕەحمان، شوکرییە مەجید (کریکاری کارگەی کاشیی لەیلان، ئێستا هاوسەری جەمال ئەیووبە)، سەمیرە سلێمان ڕەحمان (کرێکاری کارگەی کاشیی لەیلان و خوشکی شەهید نەجات).

نزیکەی دوو ساڵ دوای وازهێنانی ئێمە لە کۆمەڵە، هەستم دەکرد عەبدولخالق (ئاسۆ)ی برام کە دوو ساڵ لە من منداڵتر بوو، پەیوەندی بە کۆمەڵەوە هەیە. ئەو چونکە گەنجێکی دڵگەرم و حەماسی بوو، بە جموجووڵ و هاتوچۆی خۆی و هاوڕێکانی و هەڵسوکەوت و قسەکانیدا هەستم پێ دەکرد. بۆیە زۆر جار بە تایبەتی لەگەڵی دادەنیشتم و لەو بارەیەوە گفتوگۆم لەگەڵدا دەکرد و ڕاوبۆچوونی خۆم لەسەر کۆمەڵە دەدا و ڕەخنەم لێ دەگرت، هەوڵم دەدا کە واز لە کۆمەڵە بهێنێت .

ئەو لەنێو هاوڕێکانیدا کراوە و پڕ لە وزە و جووڵە بوو، بەلام لەماڵەوە زۆر ئارام و لەسەرخۆ و تا ڕادەیەک شەرمن و بێدەنگ بوو، حیسابی بۆ قسەی من دەکرد و خۆشەویستی و ڕێزێکی زۆری بۆم هەبوو، منیش مەگەر هەر خۆم بزانم، چەندەم خۆش دەویست، ئەو پاکی و بەرائەتەی کە لەودا هەبوو، لە کەم کەسدا هەبوو، هەتا بڵێی ئینسان، دڵپاک و میهرەبان بوو، دەستی یارمەتی بێسنوور بوو.

ئەو خوێندکاری شەوان بوو، بە ڕۆژیش ئیشی قورسی کرێکاری دەکرد، پارەیەک کە دەهاتە دەستی، بەسەر خوشک و برا و کەسانی کەمدەرامەت و دەستکورتدا دەیبەخشییەوە.

بە هەر حاڵ ... من زۆر هەوڵم لەگەڵ ئەدا و هەموو جارێک دوای چەندین سەعات گفتوگۆ، قەناعەتی بە قسەکانم ئەکرد و لە دڵی خۆمدا دەمگوت، ئیتر تەواو ... بەڵام کاتێک ئەچووەوە لای هاوڕێکانی، دیسانەوە گەرموگوڕ ئەبووەوە!

پاشان لە سەرەتای ساڵی ۱۹۸٦دا دوو هاوڕێی بە ناوەکانی نەجات خەیات و لوقمان گیران و لەژێر ئەشکەنجەدا ئیعتیرافیان لەسەر ئەم کرد. دوای ئەوە ئەمن چەند جارێ هاتنە سەر ماڵمان و پرسیاریان کرد. جارێکیان لە نیوەشەودا بە هێزێکی زۆرەوە بۆ گرتنی هاتن، بەڵام ئەو لە ماڵ نەبوو و چەن ڕۆژێک بوو لە ماڵ میمکم خۆی حەشاردابوو.

دوای ئەوە چووە دەرەوە و بوو بە پێشمەرگە، کە بەداخەوە زۆری نەخایاند و لە شەڕێکی گەورە و لە ڕزگارکردنی شارۆچکەی سەنگاودا لە ڕێکەوتی ۱۹۸٦/۳/۱۰ گیانی بەخشی و برینێکی قووڵیشی خستە دڵی ئێمەوە. ئەو کاتە ئەو تەمەنی تەنها بیست ساڵ بوو.

هەر ئەو دەمە لە بەهاری ساڵی ۱۹۸٦ ئیلهام (ئیلهام ڕەحیم محەمەد)م ناسی کە کچێکی (تورکمان-عەرەب) زمان بوو، لەو فەرمانگەیەی کە منی لێ بووم دامەزرا و لە ژوورەکەی من دایاننا. دوای ئەوەی ماوەیەک پێکەوە بووین و لەسەر گەلێک بابەتی جۆراوجۆر و وردە وەردە قسەمان دەکرد و ڕای خۆمان لەسەریان دەردەبڕین، هەستم کرد کەسێکی نەک هەر دژ بە ڕژێمە و جێگەی متمانەیە، بەڵکوو تەنانەت ئەویش کەسێکی چەپ و مارکسییە و لە گەلێک مەسەلەدا هاوڕاین.

ئیلهام لە ماڵەوە و لەلای زەینەبی خوشکی و قەیس (سەمیر عادیل) و مونا (لەیلا محەمەد)ی خوشکەزای باسی منی کردبوو. بۆیە زۆری پێ نەچوو قەیس بۆ دائیرە هات بۆ لامان و یەکتریمان ناسی. دوای ئەوە ئیتر پەیوەندییەکەمان زیادی کرد و هاتوچۆی ماڵی یەکتریمان دەکرد. هەر جارە کە یەکتریمان دەبینی، قسەوباسی هەمە جۆرمان دەکرد .

لەگەڵ قەیس گفتوگۆکانمان زۆر چڕ و پڕ بوو و مشتومڕی گەورەمان لەسەر یەکێتیی سۆڤیەت بوو. من دەمگوت: یەکێتیی سۆڤیەت دەوڵەتێکی سەرمایەداریی

دەوڵەتییە و سۆشیالیستی نییە، ئەو دەیگوت: نەخێر سۆشیالیستی و کۆمۆنیستییە! لەدوای موناقەشەیەکی زۆر و سەرەنجام دەیگوت: تۆ لە جەماعەتی کۆمۆنیستی، بۆیە وا دەڵێیت! مەبەستی لە ڕەوتی کۆمۆنیست بوو .

هەروەها لەسەر بەشداریکردن یان نەکردنی جەیشی شەعبی دیسانەوە دەبووە موناقەشەمان، ئەو پێی ئاسایی بوو و من لە دژی بووم.

دواتر زانیم قەیس و ئەم هاوڕێیانە لەو سەردەمەدا لە ئەندامانی حیزبی شیوعیی عێراقی بوون.

لەناو ئەو پەیوەندییانەدا لەگەڵ زەینەب زۆر نزیک بووینەوە و دەهات بۆماڵمان و بە شێوەی دەوری قسەوباسمان لەسەر بابەتی هەمە جۆری چەپ و کۆمۆنیستی دەکرد.

زەینەب ئەو دەمە خوێندکاری زانکۆ بوو لە بەغدا، دواتر وازی هێنا و بوو بە کرێکار لە کارگەی کاشی لەیلان.

لە مانگی تەمووزی ساڵی ٢٠٠٢دا لە کۆڕی ماتەمینی مەنسوور حیکمەت لە لەندەن کە ئەو کات من هێشتا ئەندامی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق بووم (لە کاتێکدا ئێستا تەنها وەک کەسێکی مرۆڤدۆست و ئازادیخواز بیر دەکەمەوە)، لەگەڵ قەیس جارێکی تر یەکترمان بینییەوە و لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی حیزبیدا ڕووی لە من کرد و وتی: فاتمە ئەزانی ئەو کاتانە ئێمە کەر بووین، بۆ مەسەلەی سۆڤیەت تۆ ڕاستت کرد!

**سویسرا**

**٢٠٢٠/٣/٢٠**

## محەمەد خەیرولڵا ئەمین (ئاسۆ)
### (یاداشت)

رابردووی ئێمە بەشێکە لە پێناسەی کەسایەتیی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی ئێمە، نووسینەوە و بە دیکۆمێنتکرنی ئەو رابردووە بە شێوەیەکی نۆیترال و دوور لە ویستی کەسەکان و لایەنەکان، ئەرکێکی گرنگ و پێویستی ئەو کەسانەیە کە لەو ماوەیەدا و لە رووداوەکان بەشدار بوونە.

ئێمەی رۆژهەڵاتی و ئەوروپییەکان لە نووسینەوەی مێژوودا، مەودایەکی گەورەمان لە نێواندایە. ئەورووپییەکان ۳۰۰ ساڵ پێش ئێستا لە رێگای کەنیسەوە هەڵساون نەک تەنها بە تۆمارکردنی رووداوەکان، بەڵکوو داتای تەواویان لەسەر هەموو ئەو کەسانەی کە لەو سەردەمەدا ژیاون (ناو، رۆژی لەدایکبوون، پیشە، خزمایەتی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان) تۆمار کردووە، کەچی لای ئێمە بە سەدان هەزار کەس کە لەدایکبووی پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی رابردوون، دڵنیا نین لە رۆژی لەدایکبوونیان! لەوەش کارەساتتر ئێمەی کورد تا ئێستا زانیاریی تەواومان دەربارەی ژمارەی تەواوی رەگەز و تەمەنی قوربانییەکانی ئەنفال و هەڵەبجە و تەنانەت شەهیدانی شۆرشەکانی بزووتنەوەی سیاسیی کوردستان نییە!

لەو ڕوانگەیەوە، بۆ ئەوەی ڕابردوو ون نەبێت و تەپوتۆزی لێ نەنیشێت، بەباشی دەزانم هەندێک لە ڕووداو و باروودۆخی سەرەتای هەشتاکان کە سەردەمێکی گرنگ و پڕ لە ململانێی سیاسی بوو، بنووسمەوە. جیاوازی ئەو سەردەمە لەوەدا بوو، جیاواز لە ڕابردوو، بابەتە فکری و تیۆرییەکان لە سەرووی ڕیزبەندییەکانەوە بوون و ململانێکان لەنێو شارەکاندا زۆر گەرمتر و پڕ خرۆشتر بوون وەک لە شاخ. دەبێت ئەوەش بۆ هەندێ لە هاوڕێیانی ئەو سەردەمە کە ئێستا تەنها برادەرین ڕوون بکەمەوە کە باسکردن لەو بابەتە بەهیچ شێوەیەک لە دژی بەرژەوەندییەکانی ئێستای ئێوە نییە، بەڵکوو تەنها بۆ پاراستنی بەشێکی کلتووری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی کۆمەڵگای کوردستانە و دەبێت بەبایەخەوە بڕوانینە ئەو ڕابردووەی کە ئێمە خاوەنین و بەشێک لە بەرپرسیارێتییەکەی هەڵگرین و کارە باشەکانمان دەبێت جێی شانازی بێت و بۆ خراپەکانیش خۆمان بە خاوەنی بزانین.

### پەیوەندیکردن بە ڕیزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانەوە

سەرەتای وەرچەرخانی ژیانی سیاسیی من بۆ ساڵی ١٩٧٩دەگەڕێتەوە، ئەو ساڵەی کە هەموو قوتابخانە ئامادەییە کوردییەکانیان کرد بە یەک و هەموو خوێندکارەکانیان لە قوتابخانەی عەبدولمەلیک بن مەروان (پێشتر ئامادەیی کوردستان بوو) کۆ کردەوە.

ئەو کاتە بازنەی هاوڕێیەتیی هەر یەکێک لە ئێمە بە شێوەیەکی بەرچاو فراوانتر بوو. پەیوەندییەکانمان لە سنووری گەڕەکی ڕەحیماوا و تەپە نەمایەوە، بەڵکوو بازنەکە بۆ گەڕەکەکانی ئازادی و ئیمام قاسم و شۆڕیجە فراوانتر بوو.

ئەو کاتە جگە لە کتێب خوێندنەوە وهەندێ بڵاوکراوە و کاسێتی سروودی سیاسی و جاروباریش هەواڵی بوونی پێشمەرگە شتێکی تر نەبوو. ئەو دەمە من پەیوەندیی ڕێکخراوەییم نەبوو. ساڵی دواتر من چوومە زانکۆ و لەوێدا ئاڵوگۆڕێک بەسەر چەندایەتی و چۆنایەتیی پەیوەندییەکانمدا هاتە ئاراوە و کۆمەڵێ برادەری چەپم ناسی و قسەوباس و گفتوگۆکان گەرمتر و سەرنجڕاکێشتر بوون. هەر ئەو

کاتە جگە لە سیاسەتی ڕووت، بابەتە هونەری و ئەدەبییەکانیش وەک هەموو دیاردەکانی تر بەسەر دوو بەرەدا دابەش دەبوون.

لە سلێمانی کەش و هەوای سیاسی تەواو جیاواز بوو، شەوانی پێشمەرگە (لە بەشی ناوخۆیی دارول تولاب دەنگی تەقەکانمان تۆمار دەکرد و دواتر بۆ برادەرانی ترمان لێ دەدایەوە)، نووسینی قەد دیوارەکان، کتێبەکانی ڕێجێس دۆبریە، تا دەهاتیش گیانی بەرەنگاربوونەوەی بەعس لای خەڵک زیادی دەکرد و ڕەتکردنەوەی سەربازی و پەیوەندیکردن بە هێزی پێشمەرگەوە لە هەڵکشاندا بوو. ئەوەی جێی سەرنجە لەگەڵ ئەوەشدا خۆمان لە بەرەی چەپ دەبینییەوە، بەڵام هێشتا لە زۆر ڕەفتاردا هزری ناسیۆنالیستی بەسەرماندا زاڵ بوو، وەک نوکتەکردن لەسەر عەرەب و بە سووک ڕوانین لە کلتوورەکەی، هاوسۆزی لەگەڵ لایەنگرانی حیزبی دەعوە تەنها لەبەر ئەوەی ئۆپۆزیسیۆن بوون، یان هەڵچوون بەوەی کچێکی کورد پەیوەندی لەگەڵ کوڕێکی عەرەب هەبووایە.

ساڵی دووەمی زانکۆ سەرەتاکەی بە دوو کارەساتی گەورە دەستی پێ کرد، یەکەم، گواستنەوەی زانکۆ بۆ هەولێر و دابڕانی کۆلێجەکەی من (کشتوکاڵ) لە کۆلێجەکانی تر بوو، چونکە ئێمە بۆ کەلەک یاسین ئاغا گوێزراینەوە. ئەم کارەساتەیان گشتی بوو، بەڵام بۆ کەرکووکییەکان کارەسات و ماتەمێکی گەورەتر ڕووبەڕوومان بووەوە، ئەویش ئاشکرابوون و گرتنی ئەندامانی کۆمیتەی ئاگر لە پایزی ئەو ساڵەدا.

ئەو ڕووداوە بۆ ئێمە شکستێکی گەورەی سیاسی بوو، بەڵام بێزاربوونی خەڵکی لە سیاسەتەکانی بەعس و بابەت و کێشمەکێشە سیاسییەکان هەمیشە لە گەرمبووندا بوون.

ئەو کاتە جگە لە ناکۆکیی نێوان یەکێتی و لایەنەکانی تر لە شاخ، لەناو شاریشدا بەرەیەکی تری ناکۆکیی سیاسی هاتە ئاراوە، ئەویش خۆی لە پێویستیی کوردستانیبوون یان عێراقیبوونی حیزبێکی کرێکاری دەبینییەوە. هەڵبەت ئاشکرایە کە کۆمەڵەی ڕەنجدەران بڕوای بە کوردستانی گەورە هەبوو، لە بەرامبەر ئەوەشدا ئەو کاتە سەرەتا دوو گرووپی عێراقی (کە پێیان دەوترا، عێراقچی و ئەم ناوە

لەلایەن سەرکردایەتیی کۆمەڵەوە بۆ سووکایەتی لەسەر کێشی: چەرچی، قاچاخچی، عارەبانەچی ...هتد بۆیان دروست کرابوو) بوونیان هەبوو، یەکێکیان "کار" بوو کە بە ناوی ئۆرگانەکەیانەوە دەناسرایەوە، ئەوەی دیکە، "کارگەران" بوو. ئیتر بەردەوام لەناو ئەو خەڵکانەی سەرقاڵی سیاسەت بوون، ئەو گفتوگۆیانە بازاڕی گەرم بوو.

ڕۆژێکیان لەناو زانکۆ لەگەڵ کاک ئەحمەد خورشید پیاسەمان دەکرد و گفتوگۆمان بوو، وتی حەز دەکەم ئەو وزەیەی کە هەتە بیخەیتە کار و پەیوەندی بە کۆمەڵەوە بکەیت. سەرەتا هەندێ توشی حەپەسان بووم، چونکە پێشبینی ئەوەم نەدەکرد کاک ئەحمەد پەیوەندیی ڕێکخراوەیی هەبێت، کەسێکی زۆر هێمن و بێدەنگ بوو، ماوەی دوو ساڵ لە بەشی ناوخۆیی پێکەوە بووین، بەهیچ شێوەیەک هەستم پێ نەکردبوو، بەڵام ئەو خۆی هەر خەسڵەتی ئاوابوو، تەنانەت دواتر لەگەڵ کاک تەحسین نامیق ناومان لێ نابوو کورە خاکییەکە. منیش وتم، کاک ئەحمەد خۆت دەزانیت ئێستا کێشمەکێشێکی زۆر لەناو کۆمەڵەدا هەیە و نازانین بارودۆخەکە چۆن دەڕوات، حەز دەکەم ماوەیەک دەرفەتم هەبێت، دواتر بڕیار دەدەم. ئەوە بوو پاش ماوەیەکی کەم پەیوەندیم بە کۆمەڵەوە کرد و کاک ئەحمەد ناوی نهێنیی "ئاسۆ"ی بۆم هەڵبژارد. پاش دوو کۆبوونەوە گوێزرامەوە بۆ لای کاک تەحسین نامیق (هەردی) و لەگەڵ کاک فەتاح کوێخا ڕەزا (پشتیوان) لە پۆلی شەهید عەلی ساڵح بووین و کاک تەحسین بەرپرسی پۆلەکە بوو، کاک فەتاح و منیش ئەندام پۆل بووین. پاش ماوەیەک ئەو پۆلە بوو بە کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن.

لە کۆمیتەی کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن هەر وەک پێشوو کاک تەحسین نامیق بەرپرسی کەرتەکە بوو، کوێخا فەتاح و منیش ئەندامی کەرت بووین.

ئەو هاوڕێیانەی لە کەرتی شەهید ئەنوەر حەسەن ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە منەوە هەبوو ئەمانە بوون: ئازاد، خوێندکاری زانکۆی تەکنەلۆجی بوو، ئەندامی کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە بوو. بەهرۆز خالید، خوێندکاری کۆلێجی ئیدارە و ئیقتیساد لە زانکۆی سەلاحەدین بوو، ئێستا لە ئەڵمانیایە. تەیب ماڵیان لە ڕەحیماوا بوو، ناوە نهێنییەکەیم لە یاد نییە، خزمی شەهید بەکر تەلانی، حیزبی شیوعیی عێراقی بوو. کامەران (ناوی باوکی ئیبراهیم یان شوکور بوو) ماڵیان لە تەپە بوو، خوێندکاری

کـۆلێجی پەروەردەی زانکـۆی مووسـڵ بـوو، وابـزانم ئێسـتا لە زانکـۆی کـۆیە مامۆستایە. تەحسین (دارا)، ماڵیان لە ڕەحیماوا بوو، خوێندکاری ئامادەیی زێوەر بوو، گەر هەڵە نەبم شەهید مەلا هۆشیار خاڵۆی بوو. نووری، کوڕێکی گەنج لە تەمەنی هەرزەکاریدا بوو، ماڵیان لە ڕەحیماوا بوو، یەکجار بینیم، ئیتر خۆم لێی دزییەوە، چونکە کێشەی زۆر بوو، بۆ ئێمە جێگای مەترسی بوو. فەرهاد مەحموود عەزیز (هەڵکەوت)، ماڵیان لە ڕەحیماوا بوو، ئێستا لە کەرکووکە.

من لەگەڵ هەر کەسێک پەیوەندیم بگرتایە، سەرەتا چەند جارێک لە ماڵی هاوڕێ نوێکە شوێنی دانیشتنمان دادەنا، بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنی بۆ بکەم. پاش ئەوەی چەند جارێک کاک فەرهادم بینی، ئیتر لە ماڵی ئێمە دانیشتنێکمان دانا، من هەوڵم دەدا، تا لە توانادا بێت، ماڵەوەمان هیچ شتێک لە بارەی ئەو کەسەوە نەزانن، هەمیشە ناو و زانیاری هەڵەم بە ماڵەوە دەدا، بۆ ئەوەی لە کاتی تەنگانەدا هیچ شتێک دەربارەی ئەو کەسە نەزانن. کاتێک لە کۆبوونەوەکە تەواو بووین و کاک فەرهادم بەڕێ خست، نەجاتی برام (هەرگیز پاڵپشتییەکان و هەڵوێستە جوانەکانی لە یاد ناکەم و تا ئێستا لە ژیانمدا کەسێکی ڕۆح سپی وەک نەجاتم نەبینیوە) لێمی پرسی، محەمەد ئەو کوڕە کێ بوو، منیش وتم، برادەرمە و ناو و ناونیشانێکی هەڵەم پێی وت، هەندێک سەیرمی کرد و زەردەخەنەیەکی کرد و وتی، ئەوە ناوی فەرهاد مەحموودە، لە پۆلی ئێمەیە لە زێوەر، بەڵام دڵنیابە کوڕی چاکە.

هەتا دەستپێکردنی دانوستانی یەکێتی و بەعس کاروباری کەرتەکە زۆر بەباشی دەڕۆیشت، گیانی هاوکاری و پێکەوە کارکردن بە مۆراڵێکی زۆر بەرزەوە بەدی دەکرا و هیچ کارێک دوا نەدەخرا، تەنانەت هەندێک کەس کە ئەو کاتە دژ بە کۆمەڵە بوون، بە منیان دەوت، گوایە من سەر بە دەستگای کۆکردنەوەی دەنگوباس (دکد)م!

کاری ڕێکخستن لەو ماوەیەدا بریتی بوون لەم کارانە:

١) کۆبوونەوەی مانگانە لەگەڵ هاوڕێیانی خوارەوە و لیژنەی کەرتەکە. ٢) گەیاندنی بڵاوکراوە بە ئەندامانی خوارەوە.

٣) گەیاندنی ڕاپۆرتەکانیان بۆ لیژنەی کەرت.

٤) باسکردنی بابەتی ڕۆشنبیری.

٥) کۆکردنەوەی ئابوونەی مانگانە.
٦) وەرگرتنی سەرنج و ڕەخنە و باسکردنی کێشە و گرفتەکان.

**دانوستانی یەکێتی و ڕژێمی بەعس و بوومەلەرزەی ڕێکخستنەکان**

لەدوای هەندێک ڕووداوی تراجیدی و هەندێکیشیان گرنگ لە سەر گۆڕەپانی سیاسیی کوردستان لەوانە، شەڕی ناوخۆ و گرتنی بێتواتە لە ساڵی ١٩٨٣، یەکێتی بە شێوەیەکی کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراو، دەستی بە دانوستان لەگەڵ حکوومەتی بەعس کرد. دەتوانم بڵێم بۆ زۆربەی ئێمە شۆکێکی گەورە بوو، چونکە نە ئاگادار بووین و نەهیچ پاساوێکی لۆژیکیش بۆ ئەو هەنگاوە هەبوو. بیرمە لە کۆلێج بووم، برادەرێکی شیووعی کە ئەو کاتە بەهۆی کارەساتی قڕناقا و پشتاشان بەرامبەر یەکێتی زۆر داخ لەدڵ بوو وتی، ئەوە سەرکردەکانتان لە بەغدان مفاوەزات دەکەن! منیش وتم، درۆیە ئەوە دیعایەی ئێوەیە. ئەم هەواڵە تا دەهات گەرمتر دەبوو، پاشان ئێمەش بۆمان دەرکەوت، ڕاستە یەکێتی بەبێ هیچ پاساوێکی لۆژیکی و بێ پرسوڕا بە ڕێکخستنەکان لەگەڵ بەعس دەستیان بە دانوستان کردووە.

من بۆخۆم هەر لە سەرەتاوە بڕوام بە زەروورەتی ئەو ڕێکەوتنە نەبوو و ئاسۆیەکی ڕوونم تێدا نەدەبینی. سەرەتا وەک پەیوەستبوونێکی حیزبی دەستمان کرد بە هێنانەوەی پاساو بەوەی کە کاتی خۆیشی (١٩١٨) لینین لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیا ڕێکەوتننامەی "برێست لیتۆڤسک"ی ئیمزا کردووە، گەر بتوانین لەم ڕێگایەوە هەندێک دەسکەوت بەدەس بهێنین، بۆچی ئێستا بۆ ئێمە ڕێکەوتن لەگەڵ بەعس حەرام بێت؟

دەبێت ئەوەش بڵێم هەندێ کەس ئێستاشی لەگەڵدا بێت، وا دەزانن ئەو ڕێکەوتنە لە نێوان هیتلەر و لینین بووە، چونکە دەیانوت، لینین لەگەڵ ئەڵمانیای نازی ڕێکەوتووە!

لەمیانەی ڕێکەوتن وردە وردە ماسکەکان دەکەوتن و دەموچاوە ڕاستییەکان بەدەر دەکەوتن. دەرکەوت کە ئەو بۆچوونەی ئێمە پێشتر لەسەر شۆڕش و سەرکردەکان هەمان بوو، تەنها دروستکراوی هزر یان خواستی خۆمان بوو، ئەگینا

نە شۆڕش قوتابخانەی دروستکردنی شۆڕشگێڕان بوو، نە سەرکردەکانیش ئەو سوپەرمانانە بوون کە پێشتر لای خۆمان وێنامان کردبوون.

تا دەهات بەعس سووکایەتی بە هەست و کەرامەتی خەڵک دەکرد و یەکێتیش زیاتر ڕۆحی سازشکارانەی بەدەر دەکەوت. سەدام حوسێن بە ئاشکرا و ڕاستەوخۆ لە تەلەفزیۆن وتی: بە سەرکردەیەکی کوردم وتووە، ئەوەی ڕۆژێ زووتر هاتەوە، لە تۆ شەریفترە. لێرەدا بەڕوونی مەبەستی جەلال تاڵەبانی بوو. کەچی تاڵەبانی لە چاوپێکەوتنێکی هەفتەنامەی "الطليعة العربية"دا وتبووی، سەدام ناوبژیوانە و خومەینی دوژمنە. هەر لەو کاتەدا بەعس بڕیاری جەیشی شەعبی بۆ زانکۆکان دەرکرد، زۆربەی خوێندکارانی کورد نەیاندەویست بەشداری ئەو بەرنامەیەی بەعس بن، بەڵام یەکێتی نەک هەر هەڵوێستی نەبوو، تەنانەت ناڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەوەدا بوو کە خوێندکاران جەیشی شەعبی بکەن و ئاسایی وەری بگرن. تەنانەت فوئاد مەعسووم وتبووی، چی تێدایە؟! ئێمەش کاتی خۆی کەشافەمان کردووە، لە جیاتی یەحیال بەعس بڵێن، یەحیەل شەعب!

هەستم دەکرد تا دێت لەناوەوە هەڵوێستم بەرامبەر بە یەکێتی و کۆمەڵە دەگۆڕێت و گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە من خۆم لەناو ئەو بازنەیەدا نابینمەوە و کۆمەڵەش نە لە دوور و نە لە نزیک پەیوەندی بە چینی کرێکاری کوردستانەوە نییە. هەروەها مارکسیزم لینینیزم تەنها وەک بۆیە و میکیاج بەکار دێت و بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵەش هیچ پەیوەندییەکیان بەو ئایدیۆلۆجیایەوە نییە.

ڕۆژێکی دوانیوەڕۆ زۆر پەست بووم، چووم بۆلای کاک تەحسین و پێم وت، من لەم چرکەیەوە هیچ پەیوەندییەکم بە کۆمەڵەوە نییە و پەشیمانم لەوەی کە ڕۆژێک کارم بۆ کۆمەڵە کردووە، ئەمە مفاوەزات نییە، بەڵکوو سازشکردنە لەگەڵ بەعس و خواحافیز! کاک تەحسین زۆر هێمن بوو، هەندێ هەوڵی دا کە بمێنمەوە، بەڵام من نەمامەوە.

بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ تەحسین هات بۆ ماڵمان، وتی حەز دەکەم هەندێ قسە بکەین. منیش وتم: فەرموو! وتی: ڕاستییەکەی ئەوانەی کە تۆ باسی دەکەیت، منیش هەستم پێ کردووە، بەڵام نەمویستووە کاریگەری بەسەر کەرتەکەوە هەبێت و

ویستوومه هەر کەسە لای خۆیەوە بگاتە قەناعەتێک. ئیتر باسی کۆمەڵێک کێشە و گرفتی ئەو کاتەمان کرد، هەستم کرد لە زۆر شتدا لە یەکتری نزیکین، بڕیارمان دا بمێنینەوە تا ئەو کاتەی کۆنفرانس دەبەسترێت و بزانین بە کوێدا دەشکێتەوە.

بۆ من ئیتر سەخت بوو لەناو کۆڕ و کۆبوونەوەکان و لەناو خەڵکدا پاساو بۆ هەڵوێستەکانی یەکێتی بهێنمەوە، نەک هەر ئەوەندە تەنانەت بە ئاشکرا وەک دژە کۆمەڵەیەک قسەم دەکرد، بە تایبەتی لە بەرامبەر ئەوانەی کە یەکێتی بوون، یان بە کوردستانی ناسرابوون.

کاتێک دەنگۆی بەستنی کۆنفرانس گەرم بوو، کاک تەحسین وتی، حەز دەکەم بەشدار بیت و خۆت لە نزیکەوە لەناو ڕووداوەکاندا بیت، منیش وتم: کاک تەحسین بەشداریکردن بۆ من ئاسان نییە، من ئێستا لەناو خەڵکی وەک دژە یەکێتییەک ناسراوم و کێشەم لەگەڵ یەکێتییەکان زۆرە، لەوێ گەر ئاشکرا بم، زۆر لەسەرم دەکەوێت! بە هەر حاڵ، لە کۆتاییدا بڕیارم دا بەشدار بم.

ئێوارەیەکیان بۆ کاک خەلیل سابیر (جووتیار) یادی بەخێر لە ئاهەنگی مارەکردن بووین، کاک تەحسین هات بەشوێنمدا و وتی: سبەی کۆنفرانس دەبەسترێت و دەبێت کوێخا فەتاح و بروا و پۆلا ئاگادار بکەیتەوە. منیش ئاهەنگەکەم بەجێ هێشت، بەڵام هەستێکی نامۆ دامی گرت، لە خۆمم دەپرسی، بۆچی دەبێت سبەی لەگەڵ ئەم برادەرانەی ئێستا لە ئاهەنگەکەدان و تێکەڵی یەکترین، خۆمان لە یەکتر بشارینەوە و ببینە دوو بەرەی جیاوازەوە؟!

**کۆلن/ ئەڵمانیا**

**٢٠١٦/٣/٢٣**

## گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێز:
## تەیب تەلانی (تەیب عەزەدین سادق)(سمکۆ)
## (پۆستەچیی ڕێکخراوی کەرکووك)

**سالار ڕەشید:** بەڕێز تەیب تەلانی! چۆن تێکەڵی کاری سیاسی بوویت و پەیوەندیت بە ڕیزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد؟

**تەیب تەلانی:** من کە قوتابی پۆلی چوارەمی دواناوەندی بووم، هەستم بە زوڵم و چەوساندنەوە لە هەردووک ڕووی نەتەوایەتی و چینایەتییەوە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەکرد. هەر بۆیە پەلە بووم بەدوای ڕێکخراوێکەوە کە کاری تێدا بکەم. هەرچەندە من لە خاڵم (بەکر تەلانی)ەوە زۆر نزیک بووم و زۆر شتی لێوە فێر بووم، بەڵام ئەو ئەندامی حیزبی شیووعیی عێراقی بوو، زۆر جاریش داوای لێ دەکردم، گوێ لە ئامۆژگارییەکانی بگرم، بەڵام وەکوو گەنجێکی ئەو سەردەمە لایەنە نەتەوایەتییەکە زیاتر بەسەر مندا زاڵ بوو، هەر بۆیە لە ماوەیەکی کورتدا خۆم لەناو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا دۆزییەوە.

بەهۆی کەسێکی ناسیاومەوە برادەرێکم بە ناوی "مەلا ئەحمەد"ەوە ناسی، لە ڕێگای ئەم برادەرەوە پەیوەندیم کرد کە ئەو کاتە کۆمیتەی ئاگر لە کەرکووکدا هەبوو.

لە پاش مەلا ئەحمەد کەسێکی ترم لە گەڕەکی بڵاخ ناسی، ناوی پشتیوان بوو. هەر لەگەڵ ئەودا خۆمان گەیاندە ناو هێزی پێشمەرگە لە ناوچەی چەمی ڕەزان، ئەو کات غەریب عەسکەری فەرماندەی هەرێمی ٢ی کەرکووک بوو، هەر ئەو ڕۆژە پشتیوان بە پێشمەرگە وەرگیرا، بە منیشیان گوت، ئەبێت بگەڕێیتەوە بۆ ناوشار و بەردەوامی بە کاری ڕێکخستن بدەیت. من گەڕامەوە بۆ کەرکووک، بەڵام زۆر بەداخەوە پشتیوانی هاوڕێم لە شەڕێکدا لە دێیەکی ناو شوان بە دەستی جاشەکانی قالە فەرەج شەهید دەکرێت.

ماوەیەکی زۆر بێ پەیوەندی مامەوە. هەر لە هاوینی ئەو ساڵەدا پێم وابێت ساڵی ١٩٨٢ بوو، من و جەماڵ کە ئێستا لە سوێدە بە ناوی شوان ئاوارە، لەگەڵ برادەرێک خەڵکی شۆڕیجە کە ناوی سامان بوو، بە یەکەوە پەیوەندیمان بە کەرتی ڕێکخستنی تیپی ٩٣ی کۆیەوە کرد. سەرەتا لەگەڵ شەهید شەماڵ کۆبوونەوەیەکمان کرد و باسی ڕێکخستن و پەیوەندیی تازەکردنەوەمان کرد. من بە ناوی سمکۆ، کاک جەلال کە خەڵکی شۆڕیجە بوو، هەر لە بنکەی تەندروستی شۆڕیجەش برینپێچ بوو بە ناوی سامان، لە بیرم نەماوە شوان ئاوارە چ نازناوێکی وەرگرت.

ئێمە ماوەیەکی کەم پەیوەندیمان بەو تیپەوە هەبوو، چەند جارێکی تر لەگەڵ مام باپیر کە ڕابەر سیاسیی تیپەکە بوو، کۆبوونەوەمان کرد و باسەکانمان زیاتر بریتی بوون لە خۆپەروەردەکردن و باسی پرەنسیپەکانی کۆمەڵە و زانستە سەرەتاییەکانی مارکسیزم.

ئێمە کە سێ کەس بووین، نیازمان وا بوو، بەجیا لە کۆمیتەی ئاگر کۆمیتەیەکی تر دروست بکەین کە نەمانزانی چی ڕووی داوە و بێ ئاگا بووین لە چالاکییەکانیان. بەڵام ئێمە دوای ماوەیەکی کورت بۆمان ئاشکرا بوو کە زۆربەی ئەندامە چالاکەکانی کۆمیتەی ئاگر گیراون و بەشێکیشیان بۆ ناو هێزی پێشمەرگە ڕایان کردووە. هەر لەبەر ئەو هۆیە ئێمە هیچ جووڵانەوەیەکمان نەکرد، جگە لە

خـۆپەروەردەکردن و هەڵسـوکەوتکردن وەکـوو دژە بەعـس لەنـاو هـاوڕێ نزیکەکانماندا، بەبێ ئەوەی ناوی کۆمەڵە بهێنین.

لەدوای کۆمیتەی ئاگر، کۆمیتە دامەزرایەوە، ئەوەیان جەنابت زیاتر ئاگاداریی وردەکارییەکانییت و پێم وایە زۆربەی ئەرکەکان بۆ دامەزراندنەوەی کەوتبووە سەر شانی جەنابت.

من بەباشی بە بیرم نایەتەوە، لەو زەمەنەدا کێ پەیوەندی پێوە کردم، ئیبراهیم نوورەدین نەسرەت (پۆلا)، یان "لوقمان" (لوقمان عەزیز ڕەشید)ی برات. بە هەر حاڵ ئەو ئەرکانەی بە من ئەسپێردران زۆر بەباشی جێبەجێم دەکردن.

ئەوەی شایانی باسە، بە هۆی کاری ڕێکخستنەوە ئەوەندە سەردانی ماڵی ئێوەم کردبوو، لەگەڵ زۆربەی ئە ندامانی خانەوادەکەتاندا ئاشنایەتیم پەیدا کردبوو. زۆربەی شەوان بۆ ماڵتان دەهاتم و لە ژووری کتێبخانەکە دادەنیشتین کە لە سەرەوە لە نزیک دەرگای حەوشە بوو، لە ژوورەکانی خوارەوە دوور بوو.

بەڕاستی یادگاری ئەو ژوورە هەرگیز لەیاد ناچێت، بە تایبەتی ئەو هەموو کتێبە بەنرخە کە بۆ خۆپەروەردەکردن وەکوو فێرگەیەک وابوون. پاشان لەگەڵ لوقمان دانیشتنەکانمان بۆ ماڵی کەماڵ (کەماڵ مەحموود محەمەد)ی خاڵت گواستەوە، کە ئەو کات لە قەڵاکەی دارەمان سەرباز بوو.

**سالار ڕەشید:** لەو دەورانەدا ئێوە بەرپرسی کاری هێنان و بردنی پۆستی ڕێکخراوی کەرکووک بوون و پەیوەندیتان بە لوقمان و لوقمانیش پەیوەندی بە منەوە هەبوو، ئەو کارەش بێگومان لە قورسترین و ترسناکترین کارەکانی ڕێکخستن بوون. ئەگەر بکرێ وەکوو یادەوەری، چەند نموونەیەک لەو کارانەی لەو ڕۆژگارەدا بەجێت گەیاندوون و ئەو مەترسییانەی بۆت هاتنە پێش باس بکەیت.

**تەیب تەلانی:** بەڵێ! ماوەیەکی باش کاری پۆستم ئەکرد. بە حوکمی ئەوەی تاکسیم هەبوو و شارەزای تەواوی شار و لادێکانی کوردستان بووم. دێتەوە یادم، ساڵی ١٩٨٣ بوو، مانگەکەیم لەبیر نەماوە، دەبوو پۆستێک کە هێندێک گۆڤار و بڵاوکراوە و پارەشی لەگەڵدا بوو، بە هەولێر بگەیەنم. لەو نامەیەی بۆ من هاتبوو

نووسرابوو سەعات ٩:٥ لە بەردەمی کۆلێجی علووم ڕابوەستە، بۆنیتی سەیارەکەت بەرز بکەرەوە تاوەکوو ئافرەتێکی عەباڵەسەر دێت بۆ لات و پێت دەڵێت: تۆ مام حەسەنی؟ ئەو کات شتەکانی پێ بدە، ئەوەی لای ئەویش بوو، وەری بگرە و بیهێنەوە بۆ کەرکووک. بەڵام من وا حاڵی بووم، کە ٩:٥ مەبەستی سەعات نۆ و پێنج دەقیقەیە، ئەوەی نامەکەشی نوسیبوو، مەبەستی نۆ و نیو بوو، هەر بۆیە من ٢٥ دەقیقە لەسەر ئەو جادەیە ڕاوەستام، تا ئافرەتەکە هات، شتەکانمان گۆڕییەوە و بەپەلە بۆی دەرچووم. لەدوای دووسەد مەترێک ئەملا و ئەولام بە دوو سەیارەی قوات خاسە گیرا و بە دەستیش ئیشارەتیان بۆم دەکرد کە ڕابوەستم. منیش هەتاوەکوو توانیم خێرایی ئۆتۆمبیلەکەم زیاد کرد و بەنێو گەڕەکە تەنگ و باریکەکان و بەسەر شۆستەی شەقامەکاندا لێم خوڕی. پاش نیو سەعاتێک بەخێرایی لێخوڕین کە زانیم ئیتر منیان ون کردووە، هاتمەوە سەرخۆم و پاشان چوومە ماڵی خوشکێکی عەدنان میسری لە گەڕەکی ئیسکان. دوایی بە نەفەرات شتەکانم هێنایەوە و ڕۆژی دوایی بە ڕێگەی قاچاغ سەیارەکەشم هێنایەوە.

جارێکی تر پۆستێکیان پێم دا، بۆ قەڵادزێی ببەم کە زیاد لە ٤ کیلۆ دەبوو، لە زەرفێکی گەورەدا پێچرابوو، نەمدەزانی چی تێدایە، لەو نامەیەی بۆ من هاتبوو، ئەدرێس و ناونیشانی دوکانێکی تێدا بوو، کە چووم زۆر بەئاسانی دۆزیمەوە، کوڕێکی گەنجی لێ بوو، دوکانی داخست و وتی با بڕۆینەوە بۆ ماڵ. پاش چاخواردنەوە، شتەکانم دایە دەستی و ئەوەی لای ئەویش بوو لێم وەرگرت و لەژێر کوشنی پیرە بیجۆ قایمم کرد، ماڵئاواییم کرد و بەرەو کەرکووک بەبێ نەفەر بەڕێ کەوتم.

لە ڕێگە لەڕاست حاجیاوا مەفرەزەی پۆلیس ڕامیان گرت. ئەو کات بۆ شتی قاچاخی ئێرانی دەگەڕان، سودفە ئەو مفەوەزەی بەر ماشێنەکەی من کەوت، کورد بوو، پاش ئەوەی بۆنیت و دەشپوولی ماشێنەکە گەڕا، دەستی بۆ کوشنی دواوە برد، وتم: ئەوە چی ئەکەی؟ وتی: ژێر کوشنی بیجۆ ٥٠ کیلۆ شت دەگرێت. چەند هەوڵم دا، سوودی نەبوو، لە دڵی خۆمدا وتم، تازە کار لە کار ترازا، چی ئەبێت با ببێت. لەو لەحزەیەدا بیرم لەوە دەکردەوە، چۆن لەژێر ئەشکەنجەدا خۆڕاگر بم و

ناوی هاوڕێکانم نەدەم. کاتێک کابرای پۆلیس کوشنی دواوەی بیجۆی هەڵدایەوە، چی ببینێت! لەجیاتی کەلوپەلی ئێرانی، چەک و بڵاوکراوەی کۆمەڵە! هەر کە بینی، وتی: ئەمە چییە؟ وتم: ئەوە بۆ تۆ و هە موو کوردی دەکەم! زۆر بەخێرایی کوشنەکەی داخستەوە و وتی: بە پەلە دەرچۆ! ئەوەم لەو پیاوە مەردە بینی. پاشان بەسەلامەتی گەیشتمەوە کەرکووک.

**سالار ڕەشید:** ئێوە بە جیا لەوەی خەتێکی ڕێکخستن بوون، لە گرتنەوەی ئەندام و شانە پساوەکانیشدا ڕۆڵتان هەبوو، ئەگەر بتوانیت لەو ڕووەوە هەندێک زانیاریمان بۆ بخەیتە ڕوو.

**تەیب تەلانی:** ڕۆژێکیان نامەیەکم بۆ هات کە کاکەمەد هەیە لە گەڕەکی ڕەحیماوا، لە کۆمیتەی ئاگر بووە و دابڕاوە، بەڵکوو پەیوەندیی پێوە بکەیت و هێندێک چەک و تەقەمەنی لەلایە، لێی وەربگریتەوە. منیش ئێوارەیەکی درەنگ بۆماڵیان چووم. ئەو هەستی کرد، بۆچی چوومە، هەر بۆیە خۆی دەربارەی کۆمیتەی ئاگر هەندێک قسەوباسی کرد. منیش وتم: تۆ لەمەودوا پەیوەندیت بە منەوە دەبێت. بەڵام سەبارەت بە چەکەکان، هەمووی لە چاڵێک نابوو لە حەوشەکەی خۆیان، کاتێک دەریهێنان، هەمووی ژەنگ گرتبوونی و بە کەڵک نەدەهاتن.

کاکەمەد کاکەڕەش قەساب، پیاوێکی زۆر بەجەرگ و ئازا بوو، هەر کارێکمان پێی بدایە، زۆر بەجوانی جێبەجێی دەکرد.

پاش ماوەیەکی تریش پەیوەندیم بە شێخ باهیر (باهیرعەبدوڵا جەعفەر)ەوە کرد. هەردووکیان بوونە دوو ئەندامی چالاکی کۆمەڵە. ماوەیەک شێخ باهیر لەلایەن ڕژێمەوە ئەگیرێت، هەرچەندە ئەمزانی خۆڕاگریشە، بەڵام بۆ ماوەی دوو هەفتە لە گەڕەکی عەرەفە لە ماڵی خاڵم خۆم شاردەوە، هەتا بەر بوو.

سێ کەسی تر کە پەیوەندییان بە منەوە هەبوو، بە ناوەکانی سەلام فازڵ سادق (ئاسۆ)، عەبدولخالق (جووتیار)، لوقمان محەمەد کەریم. سەلام فازڵ هەتا ئێستاش لە (ی. ن. ک.) دانەبڕاوە، عەبدولخالق لە ساڵی ١٩٨٣ بووە پێشمەرگە و پاشان بە جەڵدەی دڵ کۆچی دوایی کرد. لوقمان کەریم خۆم لەلای مامۆستا ئارام و ئەحمەد

کرێکـار تەزکیـیەم بـۆ کـرد، بەڵام لەدوای ئەنفـال ئەبێـتە سـەرباز و لە شـەڕدا ئەکوژرێت. ئەم سێ هاوڕێیە خەڵکی ڕەحیماوا بوون.

ببوورە ئەوەم لەبیر چوو، لەپاش ئیبراهیم مـن پەیوەندیم بە "محەمەد خەیروڵا ئەمین"وە هەبـوو، بەڵام پەیوەنـدیم بە کەرتـی ڕێکخسـتنی تیپـی ٢١ی کەرکـووک و تیپی ٩٣ی کۆیەشەوە هەر مابوو.

**سالار ڕەشید:** لەم دواییـانەدا و لەنێو قسـەکانی خۆتدا باسـی ئەوەت کرد، لەو سەردەمانەدا لیژنەیەکی ئیغتیالاتتان پێک هێنـاوە و هێندێک جـاریش بە هاوئـاهەنگی لەگەڵ پێشـمەرگەی تیپەکـان کـاری پێشـمەرگانە و ئیغتیـالاتی نێـو شـارتان ئەنجـام داوە. دیـارە ئەم کـارانە بەبـێ ئاگـاداریی کـۆمیتەی ڕێکخـراوی کەرکـووک کـراون، ئەگەر بکرێت باسێکی ئەو کارانەی خۆتانمان بۆ بکەیت.

**تەیب تەلانـی:** بەڵێ! لیژنەیەکی ئیغتیالاتمـان لەژێر چاودێری خۆمـدا دامەزرانـد. ئەو کات جەماڵ عەزەدین و عوسمان عەسکەری و من بووین. دوو دەمانچە و یەک کلاشـینکۆفمان هەبـوو، بەڵام ئەم لیـژنەیە دوای مـاوەیەکی کـورت هەڵوەشـایەوە و هیچ چالاکییەکیشمان ئەنجام نەدا.

لەپـاش ئەوە لەگەڵ عەبـدولخالق (جووتیـار) کە لە تیپـی ٢٣ی سـووورداش پێشـمەرگە بـوو، بە هاوکـاری کەرتـی ڕێکخسـتنی تیپەکە مەفرەزەیەکمـان پێک هێنـا، قەراریش وەها بوو، تەنها هەردووکمان بین و زۆریش بەنهێنی بێت.

ئەوەی شایانی باسە، جووتیار دوو جار بە دوو دەمانچەوە هاتەوە نێوشار و بۆ شەوەکەی هەر لە مـاڵی ئێمە مـایەوە و بـۆ ڕۆژی دوایـی پلانەکەمـان جێبەجێ کـرد. هەردوو جارەکە لە کارەکەماندا سەرکەوتوو بووین و پیـاوانی ڕژێمـی تێدا کـوژران، یەکێکیان لە شۆڕیجە، ئەوەی تریان لە ئەلفێندار لە گەڕەکی عەرەفە.

جارێکیـان جووتیـار لە مـاڵی ئێمە بـوو، هەردووکمـان لە ژوورێکدا خەوتبـووین، ئەوەندەم گوێ لێ بوو، باوکم وتی: هە ستن! سـەعات ٢ی شـەو بـوو، کە هەسـتاین، چـی ببینـین! چـوار لە قـوات خاسـەکان لە ژووری خەوەکەمانـدا بەبـان سـەرمانەوە بوون، حەوشەکەشمان پڕ ببوون لە سـەرباز، داوای ناسـنامەیان لێمـان کرد، مـن لە

نــاوقەدەوە پچــرام، دەترســـام جووتیــار ناســـنامەی پــێ نەبێــت، بەڵام عــاقڵانە ناســنامەیەکی زانکـۆی مووسـڵی دەرهێنـا و دایە دەسـتیان، بەوەی بـاش بـوو کە نەگەڕان، چونکە دوو دەمانچە لەناو سەندووقەکەی ژوور سەرمان بوو.

دایک و باوکم دەیانزانی ئێمە چ کارەین و جووتیار بۆچی هاتووەتەوە، هەر بۆیە ڕۆحیان تێدا نەمابوو، زەرد هەڵگەڕان. هەر هەموو وامانزانی کە ئیخباری کراوین، توومەزە بۆ فیرار ئەگەڕێن و پشکنینی هەموو گەڕەکی ڕەحیماوا بوو. دوای ئەوەی هێـزەکە ڕۆییشـت، بـاوکم وتـی: چـایەک لـێ بنـێن! ئیتـر هەتـا ڕۆژ بـووەوە ئـێمە نەخەوتین.

ببـوورە کە هێنـدێک نـاو نـابەم، چـی ئەوانەی لە ئەنجـامی کارەکـانی ئـێمەدا تێـدا چـوون، چ هێنـدێک هـاوڕێی دیـکە کە لە ڕێکخسـتن نەبـوون، بەڵام هەمـوو کاتێـک هاوکاری من بوونە.

**سـالار ڕەشـید:** ئـێمە ئەگەر پۆسـتمان بـۆ بهاتبـایە، وە یـان پۆسـتمان هەبـووایە، بەزۆری لە ڕێـگەی گونـدی چـاڵاو و "چـیمەن"ەوە بـوو. جارێکیـان لەگەڵ لوقمـان (لوقمان عەزیز ڕەشید) پۆستێکتان لە گوندی چاڵاوەوە بۆمان هێنا کە بریتی بوو لە بڵاوکراوەکـانی کـۆمەڵە و یەکێتـی. جـارێکی دیـکەش بـارێکی گەورەی دەرمانـت لە قوشـتەپەوە بـۆ تیپـی ٢١ی کەرکـووک بـرد، لێـرەدا ئەوەم بـۆ بـووەتە پرسـیار: ئەو پۆســـتانەی بـــۆ هەولێـــر و قەڵادزێ بـــوون، پەیوەنـــدییان هەر بە ڕێکخـــراوی کەرکووکەوە هەبوو؟

**تەیـب تەلانـی:** بەڵـێ! ئەوانەی هەولێـر و قەڵادزێ کـاری ڕێکخـراوی کەرکـووک بـوون. مـن لە خەتـی چـاڵاو و چـیمەن کـارم ئەکـرد، بە هەمـان شـێوە لە گـۆپتەپە و ئەوبەر زێی دێی کانیبی.

**سالار ڕەشید:** وەکوو دەرئەکەوێت، تۆ لە یەک کاتدا پەیوەندیی ڕێکخراوەییت بە چەنـد لاوە هەبـووە، چ لەگەڵ ڕێکخسـتنەکانی نـاوچە جیاوازەکـانی دەرەوە، چ لەگەڵ چەند هاوڕێیەک لەنێو شاردا کە دیارە ڕێکخراوی کەرکووک بەمەی نەزانیوە، وایە؟

**تەیب تەلانی:** بەڵێ! لە هەمان کاتدا پەیوەندیم بە پۆلا و محەمەدیشەوە هەبوو.

**سالار ڕەشید:** زۆر سوپاس، ماندووتم کرد.

**تەیب تەلانی:** سوپاس بۆ تۆش، خوشحاڵم کە زۆر بەپەرۆشەوە لە خەمی ئەو مێژووە دایت کە کۆمەڵێک گەنج و لاوی ئەو سەردەمەی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، لە پێناوی خزمەتکردن بە گەل و نیشتمان، لە پێناوی ئازادی و وەستانەوە لەدژی زوڵم و زۆر و ستەم، ئامادەی هەموو جۆرە گیانبازی و فیداکارییەک بوون. دیارە جەنابت لە نووسینەوەی ئەو مێژووەدا ئەرک و زەحمەتییەکی زۆر دەکێشن، هەر سەرکەوتوو بن!

**سوێد**

**حوزەیران/ ٢٠١٧**

# ئازاد غەریب (سیروان)
## (یاداشت)

ئەسعەد، ئەندامی کۆمیتەی ئاگری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان بوو.

لە ساڵی ١٩٧٩دا کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بڕیاری دا، خوێندکاران ڕیزەکانیان لەناو ڕێکخراوێکدا کۆ بکەنەوە، لەڕاستیدا هەر هەموو خوێندکارەکان ئەندامی کەرتەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوون، بەڵام وەک باو بوو، دەبێ خوێندکاران ڕێکخراوی تایبەتی خۆیان هەبێت.

من، ئازاد غەریب، خەڵکی شاری سلێمانی، ناوی نهێنیم، سیروان بوو، سەرەتای پۆلی دووەمی کۆلێجی ئەندازیاری بووم لە زانکۆی سلێمانی. ژمارەیەکی زۆر خوێندکاری شاری سلێمانی (ئامادەییەکان و زانکۆ) بە من سپێردران سەرپەرشتییان بکەم.

پاشان کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتیی خوێندکارانیش کرا، کە پێک هاتبوو لە: شاری کەرکووک، زانکۆی مووسڵ، زانکۆکانی بەغدا و بەسرە و هەڤاڵێکی شاری هەولێریش بەشدار بوو (هەموو لە ماڵی ئێمە لە شەقامی سابوونکەران)، ڕۆژێکی هەینی بوو، ژمارەمان ٦ کەس بوو. ئەسعەد لە کۆلێجی زانستەکان بەشی فیزیا خوێندکار بوو، یەکەم جار ناوەکەیان بە من دا، لە بەشی ناوخۆیی خوێندکاران

لەسەر بازاڕی عەسری لە سلێمانی لە ژوورەکەی خۆیدا یەکتریمان ناسی، داوای کرد بچینە دەرەوە و بەرەو کۆڵانەکانی پیرمەسوور ڕۆیشتین. زوو هەستم کرد، ئەم هەڤاڵە شارەزای ناوشاری سلێمانییە و وریایە، لەو ڕۆژەوە لە نێوانماندا دڵنیایی پەیدا بوو.

بۆ گفتوگۆکردن کەم یەکتریمان لەناو زانکۆ دەبینی. بە درێژایی ۲ ساڵ و نیو بەوریاییەوە کارمان بە یەکەوە دەکرد. بە هۆی ئەوەوە هەواڵەکانی ناو شاری کەرکووکیشم دەزانی، زۆر کات کە بیویستایە بەهێمنی و لە نێوان چوار چاودا گفتوگۆ بکەین، دەیگوت: دەتوانم بێم بۆ ماڵتان؟ تا کاتژمێرێکی درەنگ لە ماڵەوە گفتوگۆمان دەکرد و زیاتر بەگیانی نیشتمانپەروەری و کوردپەروەریی ئەم مرۆڤە سەرسام بووم کە پێیەکی لە کەرکووک و پێیەکی لەناو پێشمەرگە و لە هەمان کاتدا خوێندکاریش بوو!

ئەسعەد لە خێزانێکی هەژار و کەمدەرامەت بوو، ماڵەکەیان لە ئیمام قاسم لەنێو کۆڵانە تەسکەکاندا بوو، لەڕاستیدا شوێنی کۆبوونەوە لە ماڵەکەیاندا نەبوو، تەنها جارێک لەوێ کۆبوونەوەمان کرد، ئەویش لە باڵەخانەکەیان و لەسەر فەردە گەنم دانیشتین، هەموو دراوسێکان سەیریان دەکردین. بۆیە زوو بڕیارم دا، هەموو کۆبوونەوەیەک لە سلێمانی لە ماڵەکەی ئێمەدا بێت و پێویست ناکات بۆ کەرکووک بچین.

کاتی کۆنفرانسی کۆمەڵە ئەسعەد وتی، من لە کۆمیتەی ئاگرەوە وەک ئەندامی کۆنفرانس هەڵبژێردراوم و بۆ سەرکردایەتی دەچم. وتم، باشە من کارم بەوە چییە؟ وتی، دەبێ لە سلێمانییەوە بڕۆم، ئێ؟ کاکە بە کوردی دەبێ ڕێگەی چوونە دەرەوەم بۆ مسۆگەر بکەی.

دەستێ جلی کوردی ڕەنگ شینمان لە بازاڕ کڕی و جامانەکەی بەست، وتم هەر بە شارباژێری دەچی، هەتا سنووری هەناران (ڕۆژئاوای سلێمانی) لەگەڵیدا ڕۆیشتم و وتم، فەرموو ...

ئەوەی ڕاستی بێ ئەو لە ئاخجەلەر و چەمچەماڵەوە زۆر شارەزابوو، لە بەری سلێمانی نەیدەزانی چۆن بڕوا، پاش گەڕانەوەی وتی، ئازاد هەرگیز نەمزانیبوو پێشمەرگە ئەوەندە لە سلێمانییەوە نزیکە. هەناران تەنها ۲۰ خولەکێک لە سەرچنارەوە دوور بوو کە سنووری هەرێمی چواری یەکێتی بوو.

بەیانییەکی زوو لە دەرگایان دا، هێشتا کەس لەخەو هەڵنەستابوو، دایکم دەرگای کردبووەوە و منیشی هەڵسان و وتی ڕیشە هاتووە و جلوبەرگی کوردی لەبەرە، کە بینیم دیار بوو لە کۆنفرانس گەڕابووەوە و زۆر چڵکن بوو. دیار بوو ماوەیەک خۆی نەشتبوو، وتی پانتۆڵێکی خۆتم بدەرێ، دەچمەوە بۆ بەشی ناوخۆیی لەوێ خۆم دەشۆم، ئیتر جلەکانی گۆڕی و ڕۆیی، دایکم یەکسەر جلە کوردییەکانی سووتاند. ئەو ڕۆژە نزیکی نیوەڕۆ بوو، لە زانکۆ بینیم، باسی کۆنفرانسەکەی بۆ کردم، ئەوەندە بەخۆشییەوە باسی دەکرد، دەتگوت لەسەر مانگ گەڕاوەتەوە.

ساڵ ڕۆیی و لە کارەکانی خۆمان بەردەوام بووین، بەعس بڕیاری دابوو زانکۆی سلێمانی بۆ هەولێر بگوێزێتەوە، چونکە دەسەڵاتی بەسەرییەوە نەمابوو، سلێمانیش ببوو بە دۆزەخ، بەشەو بە دەست پێشمەرگەوە بوو، بەڕۆژیش ئەمن و سەرباز ناوشاریان گرتبوو، شەڕی ئێران و عێراق لە گەرمەی خۆیدا بوو، سەرەتای پۆلی چوارەمی من و پۆلی دووەمی ئەو بوو، لەبەر کەمی سەرباز و بۆ پاراستنی ئاسایش، ژمارەیەکی زۆر لە جەیشی شەعبی هێنرابوونە سلێمانی، هەموو کۆڵان و سەرەڕێگایەکی شار بەڕۆژ بەوانە تەنرا بوون، بەڵام هەموویان عەرەب بوون و هیچ شارەزاییەکیان لە شاری سلێمانیدا نەبوو، ببوونە نێچیری پێشمەرگەی شار و دەرەوە، هەر ڕۆژەی لە سەرەکۆڵانێکدا لێیان دەکوژران و چەکەکانیان دەفڕێنران. ئێوارەیەک پێش تاریکبوون لە شەقامی ئیبراهیم پاشا پێشمەرگەکانی هەرێمی سێ قڕیان خستە زیاتر لە ١٥ دانەیانەوە، مولازم موحسین کە سەر بە قوات خاسە بوو، بە زەحمەت لێیان دەرباز بوو.

خوێندکاران بە فەرمی بۆیان نەبوو چەک بەکار بهێنن (سەرکردایەتی، نەوشیروان بەکاری ئەوانی نەدەزانی)، ئێمەش ئەوەمان بەباش دەزانی کە ئەو کارە نەکەین. ڕۆژێک ئەسعەد کامێرەیەکی بچووکی بۆ هێنام و وتی، پێویستم بە وێنەی ژمارەیەک مامۆستای بەعسی هەیە، ئەوانەی لەگەڵ کورددا زۆر توند بوون و بە ئاشکرا ڕقی خۆیان نیشان دەدا. بە هۆی ڕێکخستنەکانمانەوە ناوی ١٠ مامۆستای عەرەبمان بۆ هات و بە هاوکاریی هاوڕێکانم وێنەی هەر هەموویانم گرت، عەمید و دکتۆر و خاوەن ماستەری تێدا بوو، عەمیدی کۆلێجی کشتوکاڵ، مامۆستای کۆلێجی پزیشکی، مامۆستای سەقافەی قەومی، هەموو وێنەکانم دایە دەست ئەسعەد، سێ ڕۆژی پێ نەچوو، لە بەردەم مزگەوتی قامیشانی کانیی ئاسکان عەمیدی کۆلێجی

کشتوکاڵ و هاوڕێکەی لەناو بران. دوو ڕۆژی تر دکتۆرێکی کۆلێجی پزیشکی کە پێیان دەوت، دکتۆر بۆق فت کرا. هەر لە فولکەی کانێسکان تا ماوەی هەفتەیەک ٥ بەعسی گەورە لەناو بران.

ئەوەی من بزانم و دواتر ئەسعەد بۆی باس کردم، ڕێکخستنەکانی کەرکووک بە جلوبەرگی جەیشی شەعبییەوە ئەو کار و چالاکییانەیان ئەنجام ئەدا و هەمووشیان عەرەبییان دەزانی و کارەکەیان ئاسان بوو.

ئەگەر ئەسعەد خۆی بەشدار بووبێ یان نا، نازانم! بەڵام ئەو لە سلێمانی چاوساغیان بوو، بە هۆی منەوە زۆربەی کۆڵانەکان شارەزا بوو و دەیزانی چۆن دەرباز بێت.

ساڵمان تەواو کرد، دەبوو من بچمە دەرەوە، ئەسعەدیش دەبوو بۆ هەولێر بڕوات و خوێندن لەوێ تەواو بکات. مانگی ١١ ی١٩٨١ هەواڵم بۆ هات، هاوڕێکانمان لە کەرکووک گیراون، ژمارە تەلەفونی ماڵی ئێمە لە گیرفانی ئەسعەددا بوو، لەگەڵ ناوی ڕێکخستنی من (سیروان)، دیار بوو کە ئەسعەد بەهیچ شێوەیەک ناوی ڕاستی منی نەوتبوو، بۆیە کە ئەمن لە هاوینی ساڵی ١٩٨٢ دێنە سەر ماڵی ئێمە، دەزانن کە کەسمان نییە، ناوی سیروان بێت و منیش ئەو کاتە گەیشتبوومە سوید.

یادی بەخێر ... کوردپەروەر و دڵسۆزی وا، ژمارەیان کەم بوو.

ئازاد

هاوخەباتی ئەسعەد (ڕیشە).

**سوێد**

**٢٠١٧/١/١٥**



زانکۆی سلێمانی، ساڵی ١٩٨٠، لە ڕاستەوە: ئەسعەد عەزیز سۆفی (شێخ دارا)، حامید عەبدوڵا ڕەزا (وریا)، سالار ڕەشید (نەسرەوت)

((( بسم الله الرحمن الرحيم)))

الأمن العامـــــة
مديرية أمن منطقة الحكم الذاتـــي

ابن الشهداء اكرم منا جميعاً

ـ سري شخصي ـ

العدد / ش٠ س / ٠ / ٧٥٢٠
التاريخ: ٩ / ٧ / ١٩٨٣

الى / كافة مديريات امن منطقة الحكم الذاتـــي

م / تنفيذ حكـــم

فيما يلي برقية رئاسة محكمة الثورة ٣٢٧٢ في ٢/٥/١٩٨٣ ابتداء
تنفيذاً للمراسيم الجمهورية المرقمة ٦١٦ لسنة ٩٧٩ و ٨٠٨ و ٨٠٩ و ٨١٠ و ٨١١ و ٨١٢ و ٨١٣ و ٨١٤ و ٨١٧ و ٨١٩ و ٨٢١ و ٨٢٠ و ٨٢٢ و ٨٢٣ و ٨٢٤ و ٨٢٥ و ٨٢٦ لسنة ١٩٨٢ تقرر تنفيذ حكم الاعـــــدام :ـ

شنقاً حتى الموت بالمدانين كل من محو حومحو وتوفيق محمد سعيد نجم الدين واحمـــد باقي علي مصطفى ولطيف محمد امين ومحمد شريف امين وعبد المقصود محمد طـــــه وعبد الوهاب حازم محمد وعدنان محمد امين وسيروان محمد امين وقهرمان كاكه حســـن وعبد الغني احمد حمه خان وعبد الجبار علي طه وسيروان احمد قادر وعطا عبد الرحمـــن فتاح وعبد الله وهاب عارف وسعيد فرج غفور وشاباز حسين عبد الله ومجدي عبد اللـــه حمه كريم وعلي عبد الله علي وعارب عبد القهار مصطفى وتوفيق رسول حسن وعبد الكريـــم محمد عمر وعبد الله خورشيد رشيد وهادي قادر علي وحسين عارف مجيد وصديق حمـــه امين محي الدين وعلي محمد حسن صفر وخالد كريم حمه عزيز وهيرش محمد سعيـــد وسرور محمد امين مصطفى واردلان محمد امين حمه مراد وسرور سعيد علي وكاوه محمـــد امين حمه مراد ومحمد صابر شريف واحمد عزيز كريم زمان وابراهيم محمد عمر خضـــر استناداً للمواد ١٥٧ / ١ و ١٩٤ ق ٠ع ٠

رمياً بالرصاص حتى الموت بالمدانين كل من ج٠م ازاد سيده محمد خضــــر وج٠م جبار محمد شريف وج٠م عبد العزيز بكر قادر وج٠م نعمان انــور احمد وج٠م محمد عبد الله كريم وج٠م ناظم عثمان محمد وج٠م نجم الدين فرج اغا وج٠م ح انـــور ابراهيم عبد الله وج٠م اسماعيل خضر محمد وج٠م يوسف خضر صادق ون٠ع الشــــرطه نوزاد حسن كاكه برا استناداً للمادة ٥٩ / ١ من ق٠ع٠ع٠ يرجى اتخاذ ما يلزم لطفـــاً

اللواء
د. عبد الحسن
م٠م٠ع لمنطقة الحكم الذاتـــي

٩٤

## سەرچاوەکان


- ئازاد ئەحمەد ئەسوەد، هاوڕێیانی شەقامی جمهووری، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٥.
- ئەمیرە محەمەد، ئازاد هەورامی کەرکووکییەکی کوردستانی، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٨.
- ئەمیرە محەمەد، هەستنامەی زیندان، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠١٧.
- ئەنگلس، لودڤیگ فۆیەرباخ و کۆتاییی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی، وەرگێڕانی: سالار ڕەشید، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی.ن.ک.)، ساڵی ٢٠٠٥.
- أيوب بارزاني، الحركة التحررية الكوردية وصراع القوى الاقليمية والدولية ١٩٥٨-١٩٧٥، دار النشر حقائق المشرق-جنيف، الجزء الثاني.
- برایم جەلال، چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، چاپخانەی ڕوون، ساڵی ٢٠١١.
- پشکۆ نەجمەدین، لە پەراوێزی مێژووی کۆمەڵەدا، خوێندنەوەیەک بۆ کتێبی "کۆمەڵە لە سێدارەوە بۆ ڕاپەڕین"، فێبریوەر و مارسی ٢٠١٣.
- د. عەبدولستار تاهیر شەریف، ململانێ لەگەڵ ژیاندا، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی ئارابخا، کەرکووک، ٢٠٠٨.
- د. محمود عثمان، تقييم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها والدروس والعبر المستخلصة منها، الطبعة الثانية، ١٩٧٧.
- دەرسیم دیبەگەیی، پلانی شکاندنی بەشی سێدارەی زیندانی موسڵ ١٩٨١، کتێبی ئەلیکترۆنی.
- سالار ڕەشید، مێژوویەک لە یادەوەریدا، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠١٥.
- شەهید ئارام، هەڵبژاردەیەک لە نووسینەکانی، بەشی یەکەم، کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان-عێراق، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، کانوونی دووەم ١٩٨٠.

- شەهید نەوزاد فەتحولا، خۆرێک لە تاریکی، چەپکێ لە ژیاننامە و خەبات و شیعرەکانی، چاپخانە و ئۆفسێتی ئاسا، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٢.
- عادیل ڕەفیق، هەندێک لە دیکۆمێنتەکانی ئاڵای شۆڕش، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٧، کتێبی ئەلیکترۆنی.
- عارف کەریم، کۆمەڵە و یەکێتی، چاپخانەی ڕەنج، ستۆکهۆلم، ٢٠٠٨-٢٠٠٩.
- فازڵ نیزامەدین، فەرهەنگی شیرین، عەرەبی-کوردی، چاپی سێیەم، چاپخانە و ئۆفسێتی شڤان، سلێمانی ٢٠٠٣ .
- کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، چاپ: دەستگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٢.
- کەمال عەبدولا، حەسیرەکە، دە چرکە پێش مردن، ڕۆمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی رؤى للطباعة والنشر، کەرکووک، ساڵی ٢٠١٧.
- مامۆستا جەعفەر، بە خەونی گەورەوە کەوتینە ڕێ، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی تاران، ساڵی ٢٠١٩.
- مامۆستا جەعفەر، هەورێکی نەزۆک و مێژوویەکی ناکۆک، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ساڵی ٢٠١١.
- محەمەد شێخ عەبدولکەریم سۆڵەیی، ئارام و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کورد، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٧.
- مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، گفتوگۆی شۆڕش لەگەڵ میری، چاپخانەی شەهید جەعفەر، کانوونی دووەمی ١٩٨٥.
- مەلا بەختیار، چۆن چەپکێک و کام مێژووی کۆمەڵە؟! بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٢.
- نەوزاد عەلی ئەحمەد، بیبلیۆگرافیای کتێبی نهێنیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، چاپخانەی دلێر.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، چاپی سێیەم، سلێمانی، ساڵی ١٩٩٨ .

- نەوشیروان مستەفا ئەمین، خولانەوە لەناو بازنەدا، چاپ و بڵاوکردنەوەی مەڵبەندی ئاوەدانیی کوردستان، ساڵی ١٩٩٩.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین، لە کەناری دانووبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، ساڵی ١٩٩٧.
- هەژار (عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی)، هەنبانەبۆرینە، فرهنگ کردی-فارسی، چاپی سێیەم، سروش، تهران، ١٣٨١.
- هەڤاڵ کوێستانی، ئەو ڕۆژانەی نیشتمان هێی هەمووان بوو، چاپی دووەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٨.


## گۆڤار و ڕۆژنامەکان:


- ئاڵای شۆڕش، ژمارە ١، ئەیلوولی ١٩٧٧، ئارام.
- دەزگای شرۆڤە، ٨/١٦/ ٢٠٠٨، سەلامی خەیات.
- ڕووداونێت، ٢٠٠٩/٣/٢، فەرەیدوون عەبدولقادر.
- ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژمارە ٤١١، ٢٠٠٨/٤/٦، فوئاد قەرەداغی.
- ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژمارە ٤١٢، ٢٠٠٨/٤/٩، فوئاد قەرەداغی.
- ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژمارە ٤٣٦، ٢٠٠٨/٧/٢، فوئاد قەرەداغی.
- ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژمارە ٤٣٧، ٢٠٠٨/٧/٦، فوئاد قەرەداغی.
- ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژمارە ٤٥٣، ٨/٣١/ ٢٠٠٨، حاجی مەمۆ.
- ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ٢٠٠٨/٨/٢٩، فەرید زامدار.
- ڕۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٢٧٨، ٥/١٠/ ٢٠٠٨.
- ڕۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٢٨٠، ٥/٢٤/ ٢٠٠٨.
- کوردستانی نوێ، ٢٠١١/١٢/٨، ئاسۆی شێخ نووری شێخ ساڵح.
- گۆڤاری جیهان، ڕەفعەتی مەلا، نهێنییەکانی ژیانی نەوشیروان مستەفا.
- گۆڤاری سڤیل، ژمارە ٢٠٨، ٢٠١٣/١١/٣٠، فوئاد قەرەداغی.
- گۆڤاری سڤیل، ژمارە ٢٠٩، ٢٠١٣/١٢/٧، فوئاد قەرەداغی.

- گۆڤاری سڤیل، ژمارە ٢١٠، ٢٠١٣/١٢/١٤، فوئاد قەرەداغی.
- گۆڤاری سڤیل ، ٢٠١١/٤/١٧، حاجی مەمۆ.
- گۆڤاری گوڵان، ژمارە ٧٠٧، ٢٠٠٨/١١/٣، نەوشیروان مستەفا ئەمین.

## سوپاس و پێزانین

سوپاسی زۆرم بۆ ئەو هاوڕێ و دۆستانەی، ناویان لێرەدا هاتووە کە هەر یەکەیان بە شێوەیەک لە شێوەکان کۆمەکیان کردووم، بە تایبەتی ئەو هاوڕێ و دۆستانەی ئامادە بوون چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ساز بکەم، وە یان یاداشتەکانی خۆیان بۆم نووسییەوە و بەو هۆیەوە بوومە ئەرک بەسەریانەوە و وەختم لێیان گرت. هەروەها سوپاسی زۆرم بۆ ئەو هاوڕێیانەی دەستنووسەکەیان خوێندەوە و بە تێبینی و سەرنجەکانیان کتێبەکەیان پوختتر کرد:

ئاوات ئەحمەد عەلی، تەحسین نامیق عەبدوڵا، درەخشان حوسێن محەمەد، کامەران حوسێن محەمەد، ڕەمەزان ئەحمەد محەمەد، محەمەد تاهیر ساڵح (مامۆستا محەمەد)، جەنگی عەزەدین مەحموود خانە (جەنگی پاشا)، کامەران عوسمان فەقێ، فازڵ عوسمان فەقێ، ئیسماعیل مەحموود ئەحمەد (عەمید سمکۆ)، خالید محەمەد فاتیح (سەمیر نووری)، عەزەدین مەجید محەمەد (جەمال ئەیووب)، ئازاد مەجید عەبدوڵا، جەمال مەحموود محەمەد (جەمال کرێکار)، محەمەد حەسەن خورشید (حەمەی سانییە)، فایەق عومەر ڕەسوول، نەوزاد بەهائەدین محەمەد، خالید محەمەد ئەمین (عەبدولخالق)، لوقمان عەزیز ڕەشید، تەیب تەلانی (تەیب عەزەدین سادق)، ڕەحمان داود سلێمان، ئەنوەر محەمەد ئەمین ڕەحمان، عومەر قادر عەلی، دەرسیم دیبەگەیی، بەهرۆز خالید، فەتاح ڕەزا محەمەد ساڵح (فەتاح کوێخا)، فاتمە ئەحمەد محەمەد، سەفەر چالاوی، نەوزاد عەلی ئەحمەد، نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، نەوزاد محەمەد ساڵح عومەر، دیمەن ئیسماعیل ڕۆژبەیانی، یوسف حازم محەمەد، فەرهاد هەمزە محەمەد، ژیان ئەحمەد ڕەحمان، جەلال حەمید ڕۆستەم، عەبدولقادر جیهان شاسوار، عەبدولڕەحمان زەنگەنە، سەباح عەبدوڵا حەمەدین (سەباحە سوور)، حامید عەبدوڵا ڕەزا (عەسکەری)، مەحموود ئەسعەد پەری، هەژار تاها ئەحمەد (کاوانی)، هونەر تاها ئەحمەد (کاوانی)، عوسمان غەریب محەمەد ئەمین، کەریم حەمید ڕەسوول (بەختیار)، سەلمان کەریم شەریف، نەبەز

محەمەد قادر، فەرمان ئەمین ئەحمەد (فەرمان ئەمین گۆگجەیی)، سەمەد ئەحمەد محەمەد، مستەفا فەتحولآ عەبدولڕەزاق، ڕووناک عوسمان عەبدولآ (ڕووناک شوانی)، ئەحمەد خورشید ڕەزا، نەسرەدین کەریم عەبدولآ (کەمال عەبدولآ)، قادر مستەفا قادر ئەمین (قادر سەی مستەفا)، حەمەکەریم عەلی ڕەزا (ئەحمەد کرێکار)، فەرهاد ئەحمەد کرێکار، عەلی محەمەد قادر (عەلی بچکۆل)، ئاوات ناسیح حەبیب (ئارام)، ئەنوەر عومەر شەریف (حاجی ئەنوەر)، عوسمان غەفوور محێدین (مەریوان چیمەنی)، مەلا فایز ئیبراهیم چیمەنی، نەوزاد عەبدولآ کەریم، عەبدولڕەحمان ڕەسوول، حەکیم هەتووتی، حەلیمە سلێمان ڕەحمان، ئەبووزێد سەمەد شەریف، فەرەیدوون عەلی ئەحمەد، لوقمان سدیق ڕەسوول، کەمال مەحموود محەمەد (مەلا کەمال)، محەمەد کەمال مەحموود (مەلا محەمەد)، سەردار عەبدولآ کەریم، شلێر ڕەشید (شلێرعەزیز ڕەشید)، ئازاد ئەسوەد (ئازاد ئەحمەد ئەسوەد)، سەلاح حەسەن پالەوان (سەلاح حەسەن عەبدولکەریم)، سەلاح فەتحولآ.



# THE CONVOY THAT DID NOT ARRIVE HOME

## MEMOIR

خوێنەری ئازیز! ئەوەی لە دووتوێی ئەم پەڕاوەدا ڕاکشاوە، کۆڵێک بیرەوەریی خۆش و ناخۆش، تاڵ و شیرینە. وەلێ ئەمانە بە تەنها هەر بیرەوەریی خودی نووسەر خۆی نییە، بەڵکوو تەنانەت بیرەوەریی هاوڕێ و دەوروبەرەکەیشی نییە بە تەنها. ئەمانە لەڕاستیدا بیرەوەریی شارێک و سەربووردە و بەسەرهاتەکەیەتی لە برگە و دەورانێکی مێژوویی خۆیدا. ئەم بیرەوەرییانە حیکایەتی کۆمەڵێک گەنج و لاوی شاری کەرکووکە لە سالانی هەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، کە تۆ هەندێکت لێرە و لەوێ لێیان ژنەوتووە، وەلێ ئەمە پەڕاوی حیکایەتە تەواونەکراوەکانە.

SALAR RASHEED